
مختصر احياء علوم الدين
کورتە و پوختەی
ئیحیا عولوومودین
کورتکردنەوەی دانەر:
ئیمام موحەممەدی غەززالی
خوای لێ رازی
وەرگێڕ:
سەعید کەرەمی

| | | |
|---|---|---|
| سرشناسه | | غزالی، محمد بن محمد، ۴۵۰ - ۵۰۵ق. |
| عنوان قراردادی | | مختصر احیاء علوم‌الدین ـ کردی |
| عنوان و نام پدیدآور | | موخته‌سه‌ری احیاء علوم‌الدین/ کورتکردنه‌وه و دانانی ئیمام موحه‌ممه‌دی غه‌ززالی؛ وه‌رگیران سه‌عید که‌ره‌می. |
| مشخصات نشر | | سنندج : انتشارات کردستان، ۱۳۹۱. |
| مشخصات ظاهری | | ۵۶۸ ص. |
| شابک | | ۹۷۸-۹۶۴-۹۸۰-۱۴۴-۵ |
| وضعیت فهرست نویسی | | فیپا |
| یادداشت | | کردی. |
| موضوع | | اخلاق اسلامی -- متون قدیمی تا قرن ۱۴ |
| موضوع | : | عرفان -- متون قدیمی تا قرن ۱۴ |
| موضوع | : | تصوف -- متون قدیمی تا قرن ۱۴ |
| شناسه افزوده | : | کرمی، سعید، ۱۳۶۳ -، مترجم |
| رده بندی کنگره | : | ۱۳۹۱ ۷ ۳۰۴م۴غ/BP۲۴۷/۳۵ |
| رده بندی دیویی | : | ۲۹۷/۶۱ |
| شماره کتابشناسی ملی | : | ۲۸۶۰۱۷۱ |

مختصر احیاء علوم الدّیـن

## کـورته و پوختەی

# ئیحیـا عولوومودديـن

کـورتکردنەوەی دانەر:

ئیمام موحەممەدی غەززالی رَضِیَ اللّٰهُ عَنْهُ

وەرگێڕ:

سەعید کەرەمی





سـنه




سنندج، پاساژ عزتی، تلفن: ۲۲۶۵۳۸۲

# کورته و پوختەی ئیحیا عولوومودین

کورتکردنەوی دانەر (تألیف و اختصار):

ئیمام موحەممەدی غەززالی رحمه الله

وەرگێڕ (مترجم):

سەعید کەرەمی

کەڕەتی چاپ (نوبت چاپ):
یەکەم (اول) ۱۳۹۳
ژمارەی چاپکراو (تیراژ):
۳۰۰۰ بەرگ (جلد)
ژمارەی لاپەڕەو قەوارە (تعداد صفحه و قطع)
۵۶۸ صحفەی وزیری

بڵاوکەرەوە (ناشر):

بڵاوکردنەوەی کوردستان ( انتشارات کردستان)

شابک: ۵ - ۱۴۴ - ۹۸۰ - ۹۶۴ - ۹۷۸

نرخی: ۳۴۰۰۰ تمەنە

## پێشەکیی وەرگێڕ

### بە نێوی خودا

غەزالی، غەزالییە و ئەبێ وەك غەزالی سەیری بکرێ و لە ڕوانگە و دەلاقەی کەسایەتیی خۆیەوە بسەنگێندرێ و لێکۆڵینەوە و ڕەخنە و باسی لەسەر بکرێ.

نە وەك موحەددیسێ کە چاوەڕوانی ئەوەی لێبکرێ کە ڕەچاوی مەرجەکانی حەدیس بکات و بە پێوەری ئەهلی حەدیسەوە نەقڵی حەدیس بکات.

نە وەك فەقیهێ کە چاوەڕوانی ئەوەی لێبکرێ کە بە موو لە سەرچاوەکان نەترازێ و تەنیا لە نێو ئەو بازنەیەدا فتوا بدات.

نە وەك فەیلەسووفێ کە هەر شتێك عەقڵ پەسەندی نەکات قەبووڵی نەکات و نەیپەزێرێ.

نە وەك سۆفی و موریـدێ کە چاوی بە دەم مورشیدەکەیەوە بێت و وەك مەڕی بەردەستی قەساب وا بێ.

نە وەك موجتەهیدێ کە بیەوێ مەزهەبێ دابمەزرێنێ و خەڵك وەدووی کەون.

نە وەك موفەسسیرێ کە لە بازنەی بەرتەسکی ئەلفازدا ڕاڤە و شرۆڤە بکات و خۆی تێدا قەتیس بکات.

نە وەك...

بەڵکوو وەکوو غەزالی ئەبێ بیناسین و ڕەچاوی ڕێچکەی خۆی بکەین.

غەزالی، لە ناخ و ناوەڕۆك و کرۆکە و کاکڵە و مەغزی دین تێگەیشتووە و ڕۆحی ڕاستەقینەی ئیسلامی دەرك کردووە و کەسایەتیی پێغەمبەری ناسیوە و کەلامی خودای خوێندۆتەوە و سەیری نوسخەی ئەووەڵی دینی کردووە. هێندە چاوی بەسیرەتی ڕووناك بووە کە وەکوو ئەوەی بە چاوی سەر هەموو کارەسات و ڕووداوەکانی سەردەمی پێغەمبەر و پێش ئیسلامیشی دیبێ، وایە. هیچ پێویستی بەوە نەبووە کە بۆ ڕاستی و دروستیی حەدیس و ڕیوایەت و نەقڵەکان پشت بە سەنەدی سینە بە سینە و عەن‌عەنی موحەددیسەکان ببەستێ، تا بسەلمێنێ کە ڕاستە.

ئەو، چەشنی مووسا گڕی مەعریفەتی لە کێوی تووردا چاو پێکەوتووە و ئیدی گوێی بە سووسە سووسی چرا بێ‌نوور و کەم نوورەکانی‌تر نەداوە. ئەو تازە دڵی لەو نوورە چلۆسکی وەرگرتووە و خۆی خەریکە نوور ئەبەخشێتەوە، وەك خۆی بەرانبەر بە دڵی ئەفەرمێ: «يَكَادُ زَيْتُهَا يُضِيءُ».

ئەو، بە ئازادیی عیرفان گەیشتووە و خۆی لە بەندی قیل و قالی شەریعەت ڕەهاکردووە، ئەو ئازادییەی کە خزر ئەیویست مووسای لێ تێ‌بگەیەنێ و تێ‌نەئەگەیشت، ئەو بۆ دۆزینەوەی خودا لە ئاسمانەکان و زەمیندا بە شوێنیدا ناگەڕێ و بەڵکوو لە دڵیدا سەراسۆی دەکات؛ چونکە پێغەمبەرەکەی وای فێرکردووە، کە خودا (لە حەدیسی قودسیدا) فەرموویەتی: «لَمْ يَسَعْنِي أَرْضِي وَ سَمائِي وَ وَسِعَنِي قَلْبُ عَبْدِي الْمُؤْمِنِ». ئیدی چونکە مۆسیقا و ئاهەنگ و سەما شەوقی پێ‌دەدەن و لە خوا نزیکی ئەکەنەوە، بۆی گرینگ نییە زانایانی شەرع چییان گوتووە و بە حەڵاڵ، یان حەرامیان زانیوە، ئەو ئەڵێ: من ڕۆحم پێی دەگەشێتەوە و خەریکە دڵم قۆناغەکانی عیرفانی پێ‌ئەبڕێ و بە خودام نزیك ئەکاتەوە، کەوایە مۆسیقا نەك حەرام نییە، بەڵکوو بۆ من واجبە و ئەگەر ئینکاری بکەم گێژ و گەمژەم.

ئەو وەك فەیلەسووفێ بیر ناکاتەوە، بە بیانووی ئەوەی کە لەگەڵ عەقڵدا جۆر نییە، حیساب و کیتابی قیامەت و پشتی پەردەی غەیبی بەلاوە فشە بێ، ئەو باوەڕی بە پردی سیرات و تەرازووی ئەعماڵ و حوور و غیلمانی بەهەشت و سزای دۆزەخ هەیە.

ئیمامی غەزالی وێڕای ئەوەی کە هۆگری تەسەووفە، بەڵام ئەو سۆفیەتییە ڕواڵەتییە کە ڕیش و پەشم و لە خەڵوە خزان و دوورەپەرێزیی کردۆتە پیشە و بووەتە سەرباری کۆمەڵگا،

بەلایەوە هەڵەیە و بە ئەوپەڕی خۆفریواندن و خۆخەڵەتاندن دەزانێ، کە نەك خێری پێوە نییە، بەڵکوو گوناح و تاوانیشە.

ئایەتەکانی قورئان لە بەردەستی غەزالیدا مانایێکی‌تریان هەیە کە زۆر جیاوازن لەگەڵ ئەو مانایەی کە زانایانی تەفسیر لێکیان داوەتەوە، بە جۆرێ پەردەی لەسەر هەڵدەداتەوە کە مرۆڤ سەرسام ئەمێنێ و بەو قەناعەتە دەگات کە بشێ و نەشێ هەر ئەم مانا مەبەستە و ئەوانی‌تر هەڵەن. بۆ نموونە خودا لەبارەی حەزرەتی ئیبراهیمەوە ئەفەرموێ:

«كَذٰلِكَ نُرِيٓ إِبْرٰاهِيمَ مَلَكُوتَ السَّمٰوٰاتِ وَ الْأَرْضِ ...» «فَلَمّٰا جَنَّ عَلَيْهِ اللَّيْلُ رَأَىٰ كَوْكَباً قٰالَ هٰذٰا رَبِّي، فَلَمّٰا أَفَلَ قٰالَ لا أُحِبُّ الْآفِلِينَ ﴿٧٦﴾ فَلَمّٰا رَأَى الْقَمَرَ ...» «فَلَمّٰا رَأَى الشَّمْسَ ...» «قٰالَ يٰا قَوْمِ إِنِّي بَرِيءٌ مِمّٰا تُشْرِكُونَ ﴿٧٨﴾ إِنِّي وَجَّهْتُ وَجْهِيَ لِلَّذِي ...»[١]

موفەسسیرەکان بە شێوەی ڕواڵەتی و بە پێی لەفزەکان مانای لێك دەدەنەوە کە زۆر گرینگ نییە، بەڵام بە ڕای غەزالی ئەم جۆرە تەفسیرە سووکایەتییە بە ساحەتی مەزنی پێغەمبەرێکی وەك حەزرەتی ئیبراهیم‌عَلَيْهِالسَّلَام. ئاخر کەی شیاوی ئەوە کە هێندە ساویلکانە بیری کردبێتەوە کە ئەستێرە و مانگ و خۆر بۆ پەرستن ئەبن، بەڵکوو ئەم ئایەتە تەفسیری بڕینی قوناغەکانی مەعریفەتە لەلایەن ئیبراهیمەوە، بەم چەشنە کە هەوەڵجار ڕێبواری ڕێی حەقیقەت نوورێکی بۆ دەردەکەوێ کە وادەزانێ ئەو نوورە خودایە کەچی ئەگەر تاقەت بهێنێ و هەڵنەخەڵەتێ پاش ماوەیێك تێدەگات کە ئەو نوورە خودا نییە، تا نووری گەورەتر ئەبینێ، ئەمجار وادەزانێ کە ئەمە دیسان خودایە، کەچی ئەگەر نەخەڵەتێت، تێدەگات وەها نییە، ئەدی ئەم نوورە پلە بە پلە گەورەتر ئەبێتەوە تا بە نووری بێ‌کۆتایی کە خودایە دەگات. ئەو کات تێدەگات ئەو نوورە پێشوانە هەموویان پووچەڵ بوون و بە هەڵە وای‌زانیبوو. جا خوداش بۆ تەعبیردانەوە لەم پلە نهێنییانە کە سالیك و ڕێڕەو ئەیانبڕێ و لەناو عیرفاندا باوە، لە ئەستێرە و مانگ و خۆر کەڵکی وەرگرتووە.

غەزالی پێی وایە هەموو چینەکان و هەموو ڕێبوارانی ڕێی حەقیقەت بە هەڵەدا چوون، نەك لەبەر ئەوەی کۆتاهییان کردبێت، بەڵکوو لەبەر ئەوەی چونکە کەرەستەی پێویستیان بۆ تێگەیشتن پێ نەبووە، تێنگەیشتوون، نموونە بەو کۆمەڵە کوێرە ئەهێنێتەوە کە هەر لە

---

١. الأنعام: ٧٩ ـ ٧٥.

ناویان بیستبوو و نەیاندەزانی چییە، کاتێك کە فیل ئەهێننە شارەکەیان، ئەیانەوێ بچن فیل بناسن و لە نزیکەوە لێی تێبگەن، ئەچن بۆ لای فیل و یەکێکیان دەست لە پێی ئەدات و یەکیان لە عاجەکانی و یەکیان لە گوێیەکانی. ئەڵێن تێگەیشتین و دەگەڕێنەوە، کوێرەکانی‌تر کە نەهاتوون، پرسیاریان لێ‌دەکەن کە فیل چییە؟ هەرکامیان بە جۆرێ وەڵام ئەدەنەوە؛ ئەوەیان وا پێی فیلەکەی گرتبوو ئەڵێ: فیل وەکوو کۆڵەکەی حەرەمە، ئەوەیان وا عاجەکەی گرتبوو ئەڵێ: نەخێر، فیل دار و چێوی ڕەقە، ئەوەیشیان وا گوێیەکانی گرتبوو، ئەڵێ: وەکوو پاڵتاو وایە. کەچی هەموویان بە پێی ئەوە دەستیان لێداوە ڕاست ئەکەن، بەڵام چونکە کوێرن و لە چاوی ساغ بێ‌بەشن، ناتوانن تێبگەن کە فیل چلۆنە؟.

غەزالی خۆی خاوەنی چاوی ساغە و بۆ هەر شتێ بەو شێوەیە کەوایە دەڕوانێ و تیشکی عیرفان ڕێی بۆ ڕووناك ئەکاتەوە.

لەم کتێبەدا ئەگەر ناوی کەسانێك کە ونارا دێنێ و وردەکاریگەلێکیان لێوە دەگێڕێتەوە کە تا ئەندازەیەك دوورە لە عەقڵەوە و هەر ئەم چیرۆکانەش بوونەتە داردەستی هەندێ کە خراپەی «ئیحیا» بڵێن و تەنانەت هەندێ سەیرکردنیشی بە حەرام دابنێن. بە شێوەیێ نەقڵی ئەوانەی نەکردووە کە وەك حەدیسێکی سەحیح و سەنەدێکی حاشا هەڵنەگر چاویان لێ‌بکرێ و ئەگەر ڕەخنەیێك لە سەنەدەکەیدا بێت بۆ وەرگرتن نەشێ؛ بەڵکوو غەزالی بەشوێن عیرفان و تەریقەتێکەوەیە کە بۆ تێگەیاندن و فاماندنی بە خەڵك پێویستی بە تەمسیل و چیرۆکگەلێك هەیە کە ئەو مەبەستەی خۆی پێ ڕوون بکاتەوە، وەکوو چۆن لە باسی تەوحید و تاكپەرستیدا بۆ ڕوون‌کردنەوەی ئەو باسە گرینگە دەستەوداوێنی تەمسیلی قەڵەم و دەست و قاقەز و... بووە و لە نێو ئەم چیرۆکەدا کەسایەتیی خۆی شاردۆتەوە و تەنانەت هەر بە یارمەتی ئەم تەمسیلە جۆرێ مانای قەڵەم لە ئایەتی «اَلَّذي عَلَّمَ بِالْقَلَمْ»دا لێك‌دەداتەوە کە تا ئەو کاتە هیچ‌کەس ڕێی لێ نەکەوتووە. ئەمەش ڕێبازی زۆربەی ئەوانەن کە هۆگری عیرفانن، ئەدی ئەگەر وابێ ئەبێ تەواوی ئەو چیرۆکانەی مەولانا جەلالەددینی ڕۆمی لە مەسنەویدا هێناونی قەبووڵیان نەکەین، بە بیانووی ئەوەی کە سەنەدیان نییە. بەڵکوو زۆر ڕێی تێ‌ئەچی کە غەزالی لەبەر ئەوەی کەرامەتەکان و حاڵەتە عیرفانییەکان لە خۆی نیسبەت نەدات، هاتووە لیباسی کەسایەتییەکی کەونارای وەك حەزرەتی داوودی لەبەر کردووە و بە ناوی ئەوەوە زۆربەی

حاڵەتەکان شەرح دەکات. ئەهلی عیرفانیش کە بە ئازادییەکی تەواو گەیشتوون دەستیان باز و کراوەیە و بە ئاسانی ئاوەها کارگەلێکیان لێ دەخێزێ. یان بە واتایەکی‌تر، غەزالی بۆیە وای‌کردووە تا ئەوە بسەلمێنێ کە ئەم عیرفانە بنجی لە مێژوودا بەستووە و شتێکی تازەی دروستکراوی ئەم نییە، بەڵکوو مێژینەیێکی دوور و درێژی هەیە، تەنها ئەوەندە هەیە لە بیرە چووەتەوە و ئەم خەریکە ئەیخاتەوە ڕوو.

بە کورتی ئەڵێین: بازاڕی غەزالی بازاڕی عیرفانە و ئەو کاڵا و مەتایە کە غەزالی بانگەواز و هاواری بۆ دەکات جیاوازە و لە هیچکام لەوانەی کە ناومان بردن ناچێ. عیرفان ئازادییەکە لە تەواوی ئەو یاسایانەی کە باوە و خۆی بۆ خۆی یاسای جیاوازی هەیە. ئەوەی لای ئەهلی عیرفان گوناحە لای ئەهلی شەرع گوناح نییە، وە ئەوەیش وا شەرع بە گوناحی دەزانێ ئەهلی عیرفانیش بە گوناحی ئەزانن.

عیرفان ئیلهامێکی نوێ و داهێنانێکی تازەیە کە ئەبێتە هۆی ڕەهایی و بەزاندنی زۆرێك لە سنوورەکان، هاوکاتیش سنوور و چوارچێوەی تایبەت بۆ خۆی دادەڕێژێ.

کەوابوو ڕۆڵی کەسایەتیی غەزالی لە ئیحیادا ڕۆڵی عیرفانییە و بەس...

ئەم وەرگێڕانەم بە پێشنیاری بڵاوکردنەوەی کوردستان دەست پێ‌کرد و زۆریش ئەستەم بوو، چونکە ئیمامی غەزالی چەند جەڵد کتێبی تێك ترینجاندووە و ویستوویەتی لە یەك کتێبی کورتدا تەواوی ئەو مەبەستانەی کە لە ئیحیادا هەن بیانگەیەنێ کە ئەمە خۆی باری ئەم کتێبەی قورس کردووە. ئەمە لە لایەك، لە لایەکی‌ترەوە ئەو نوسخانە کە لەبەردەستی ئێمەدا بوون دوو نوسخە بوون، یەکیان نوسخەی "مؤسسة الكتب الثقافية"ی بەیرووت کە بە سەرپەرشتی ناشرەکەی لە ساڵی ١٩٩٠ز چاپ کراوە. نوسخەی دووهەم، نوسخەی "دارالسلام"ی قاهیرەیە کە بە لێکۆڵینەوەی "أحمد عبدالرزاق البكري" لە ساڵی ٢٠٠٨ز دا چاپ کراوە، هەردووکیان بە تێکڕا هەڵەی چاپییان زۆر بوو، بە تایبەت نوسخەکەی "دارالسلام" کە تەژی هەڵە بوو. هەردووکیان جیاوازی زۆریان پێکەوە هەبوو کە دایمە وە شکیان دەخستین، بەم‌بۆنەوە نەهاتین یەکیان بە ئەسڵ دابنێین و ئەوی‌تر بنێینە لاوە، بەڵکوو ئەوەی کە وەکوو یەك بووە وەرمان‌گێڕاوە و ئەوەشی وا جیاواز بوون، هەرکامیان وا بە لامانەوە باشتر بوو وەرمان‌گێڕاوەتەوە.

خاڵێك كە جێی سەرنجە ئەوەیە كە ئیمامی غەزالی تەنیا دەقی ئیحیای كورت نەكردۆتەوە، بەڵكوو حەدیسەكانیشی تا جێگەیەك كە زەرەر بە مەبەستەكەی نەگەیەنێ كورت كردۆتەوە، لەم سۆنگەوە لەوانەیە كە تووشی زۆر حەدیس بن كە لەگەڵ ئەو حەدیسەی كە وا لە ئیحیادا جیاوازی ببێ، ئێمەش تا بۆمان كرابێ هەر دەقی كورتكراوەكەمان بە ئەسڵ داناوە و بۆ سەر ئیحیا لامان نەداوە.

ئەم بەرهەمە، لەبەر ئەو گیرو گرفتانەی سەرەوە كە باسمان كرد، وێڕای ماندووبوونێكی زۆر، خۆم دانی پێدا دەنێم كە لە هەڵە پارێزراو نییە، هیوادارم بە چاوی ڕەخنەوە سەیری بكەن و هەڵەكانم بژار بكەن و پیشانمی بدەن تا خۆم لە دووپاتبوونەوەیان بپارێزم و ئینشائەڵڵاهـ لە چاپەكانی داهاتوودا ڕاستیان بكەمەوە.

شیاوی باسە كە لە زۆر شوێندا كە وە شك دەكەوتم سەیری تەرجەمەی فارسی مامۆستا ساڵح سەعیدیم دەكرد و كەڵكم لێوەردەگرت، لە خوای مەزن داوای تەمەندرێژییان بۆ دەكەم. هەروەها سوپاس و ڕێزم هەیە بۆ ئەو برادەرانەی كە بۆ ئەنجامگەیاندنی ئەم بەرهەمە یارمەتییان داوم. بەتایبەت برای بەڕێزم كاك مەلا ڕەفیق ڕۆستەمی كە بۆ دۆزینەوەی سەرچاوەی حەدیسەكان زۆر كۆششی كرد و پەراوێزێكی زۆری بۆ ئەم مەبەستە تەرخان كرد.

**چواردەی خەزەڵوەری ١٣٩٠**

**شەوی جێژنی قوربانی ١٤٣٢**

**سنە ـ سەعید كەرەمی**

# پێشەکیی نووسەر

سپاس و ستایش بۆ خودا لەسەر تێکڕای نیعمەتەکانی، بەتایبەت لەسەر ئەوەی کە یارمەتی داین سپاس و ستایشی بکەین، ڕەحمەتی خودا لەسەر سەرداری پێغەمبەران، کە موحەممەدە ﷺ و پێغەمبەر و نێردراو و بەندەی خۆیەتی، هەروەها لەسەر ئال و بنەماڵە و هاوەڵەکانی لەپاش خۆی...

لەپاشان، بەڕاستی لە تاوتوێکردنی هەندێ لە کتێبەکانمەوە بۆم دەرکەوت کە ئەو دوڕڕە [بە نرخانە]ی کە لە کتێبی «إحياء العلوم الدّين»دا هەن دەریان بهێنم؛ چونکە لەبەر زۆری و ئەستووربوونی ئیحیا، بەدەسهێنانی کارێکی ئەستەم بوو، بۆیە بە یارمەتی خوای مەزن و بە هیوای ئەوەی خودا ڕێگەمان بۆ خۆش بکات و بە ناردنی درووود و سەلام لەسەر پێغەمبەر، دەستم دایە بەر ئەمکارە. هەر خوایە کە یارمەتیدەری مرۆڤە بۆ گەیشتن بە ڕاستی.

# بابەتی یەکەم: زانیاری و فێربوونی زانست

ئەم بابەتە حەوت بەشە:

## بەشی یەکەم: لە بارەی زانین و فێربوون و فێرکردنەوە:

### گەورەیی زانین:

لە قورئاندا بەڵگەی زۆر لەسەر زانین هەیە، یەکێ لەو بەڵگانە ئەم فەرموودەیەی خودای مەزنە: ﴿يَرْفَعُ اللهُ الَّذِينَ آمَنُوا مِنكُمْ وَالَّذِينَ أُوتُوا الْعِلْمَ دَرَجَاتٍ﴾[1].

واتە: «خودا، ئەوانەی وا لەنێو ئێوە بڕوایان هێناوە و ئەوانەی وا زانستیان خەڵات کراوە، پلەگەلێك [لە چاوی کەسانیتر] بەرز دەکاتەوە».

ئیبنوو عەبباس فەرموویەتی: «فَضْلُ الْمُؤْمِنِ الْعَالِمِ عَلَى الْمُؤْمِنِ الْعَابِدِ سَبْعُونَ دَرَجَةً».[2]

واتە: «پلەی موسڵمانی زانا حەفتا پلە لە سەرەوەی موسڵمانی خواپەرستدایە».

خوا فەرموویەتی: ﴿هَلْ يَسْتَوِي الَّذِينَ يَعْلَمُونَ وَالَّذِينَ لا يَعْلَمُونَ﴾[3].

واتە: «ئاخۆ ئەوانەی وا دەزانن لەگەڵ ئەوانەی وا نازانن هاوچەشنن؟»

خوا فەرموویەتی: ﴿إِنَّمَا يَخْشَى اللهَ مِنْ عِبَادِهِ الْعُلَمَاءُ﴾[4].

واتە: «بەس ئەو بەندانەی وا زانان لە خودا دەترسن».

خوا فەرموویەتی: ﴿و تِلْكَ الْأَمْثَالُ نَضْرِبُهَا لِلنَّاسِ وَ مَا يَعْقِلُهَا إِلَّا الْعَالِمُونَ﴾[5].

واتە: «ئەو مەسەلانە بۆ خەڵك دێنینەوە، جگە لە زانایان نەبێ کەس لێیان تێناگات».

---

١. المجادلة: ١١.
٢. كنز العمال: ٢٨٧٩٧.
٣. الزمر: ٩.
٤. فاطر: ٢٨.
٥. العنكبوت: ٤٣.

لە نێو فەرموودەکانی پێغەمبەریشداﷺ هاتووە: «أَفْضَلُ النّاسِ: اَلْمُؤْمِنُ الْعالِمُ الَّذِي إِنِ احْتَيْجَ إِلَيْهِ نَفَعَ وَ إِنِ اسْتُغْنِيَ عَنْهُ أَغْنىٰ نَفْسَهُ»[1]

واتە: «مەزنترین مرۆڤ ئەو ئیماندارەیە کە ئەگەر کەلی لێ بخرێ، خێری لێ بخێزیێ، ئەگەریش کەس نیازی پێی نەبوو، خۆی بێ‌نیاز بکا لە خەڵك».

پێغەمبەرﷺ فەرموویە: «اَلْإِيمانُ عُرْيانٌ وَ لِباسُهُ التَّقْوىٰ، وَ زِينَتُهُ الْحَياءُ وَ ثَمَرَتُهُ الْعِلْمُ»[2].

واتە: «ئیمان بە تەنیا ڕووتەڵە، پۆشەنی لە خواترسییە، خشڵی حەیایە، بەریشی زانینە».

پێغەمبەرﷺ فەرموویە: «أَقْرَبُ النّاسِ مِنْ دَرَجَةِ النُّبُوَّةِ أَهْلُ الْعِلْمِ وَ أَهْلُ الْجِهادِ، أَمّا أَهْلُ الْعِلْمِ: فَدَلُّوا النّاسَ عَلىٰ ما جاءَتْ بِهِ الرُّسُلُ وَ أَمّا أَهْلُ الْجِهادِ: فَجاهَدُوا بِأَسْيافِهِمْ عَلىٰ ما جاءَتْ بِهِ الرُّسُلُ»[3]

واتە: «نزیکترین کەس بە پلەی پێغەمبەرایەتییەوە، زانایان و جیهادگەرانن: لەبەر ئەوەی زانایان، ئەوی وا پێغەمبەران هێناویانە پیشانی خەڵکی دەدەن، هەروەها جیهادگەرانیش: بە شمشێرەکانیان دەجەنگێن لەسەر ئەوەی وا پێغەمبەران هێناویانە».

پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «اَلْعالِمُ أَمِينُ اللهِ فِي الْأَرْضِ»[4] واتە: «زانا ئەمینداری خودایە لەسەر زەویدا».

پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «يَشْفَعُ يَوْمَ الْقِيامَةِ اَلْأَنْبِياءُ ثُمَّ الْعُلَماءُ ثُمَّ الشُّهَداءُ»[5] واتە: «لە پاشەڕۆژدا پێغەمبەران، پاشان زانایان، پاشان شەهیدان تکا دەکەن [بۆ خەڵکی گونەهبار]».

لەم‌بارەوە فەتحی مووسڵی گوتوویە: «مەگەر نەخۆش کاتێ خۆراك و ئاو و دەوای لێ قەدەغە بکرێ، نامرێ؟» لە وەڵامیدا گوتیان: بەڵێ. فەرمووی: «دەیسا دڵیش ئاوەهایە، هەرکاتێ سێ ڕۆژ حیکمەت و زانینی لێ بگیرڕێتەوە، دەمرێ».

---

١. كنزالعمال: ٤٢٤٦٣. جمع‌الجوامع: ٣٧٩٦. و بيهقى برواية أخرى: ١٥٩١.

٢. ابن‌ابی‌شيبه: ١٩١/٧. كنزالعمّال/٨٧.

٣. كنزالعمال: ١٠٦٤٧. سير أعلام النّبلاء: ٥٢٤/١٧.

٤. فيض القدير للمناوى: ٥٦٥٥. كنزالعمال: ٢٨٦٧١. جامع بيان العلم: ٥٢/٢.

٥. ابن‌ماجه: ٤٣١٣. بيهقى: ١٦٦٨. حاكم: ٥٤٧٢.

بەڕاستی، ڕاستی فەرمووە کە بژیوی دڵ حیکمەت و زانینە، بەڵام مرۆڤ، هەست بەمە ناکات چونکە سەرقاڵییەکانی دونیا هەستیان زایەکردووە و هەرکاتێ مەرگ بەسەر ئەو سەرقاڵییانەوە پەردە لابدا، ئەو کاتە هەست بە ئازارێکی بەسۆ دەکات و ئاه و حەسرەتی بێبڕانەوەی بۆ هەڵدەکێشێ.

ئەمەیە مانای ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەرﷺ کە فەرموویەتی: «اَلنّٰاسُ نِیٰامٌ، فَإِذٰا مٰاتُوا اِنْتَبَهُوا».[1] واتە: «مرۆڤەکان خەوتوون کاتێ کە دەمرن ڕادەچڵەکێن».

## نرخ و خێری خوێندن:

پێغەمبەرﷺ لەمبارەوە فەرموویەتی: «إِنَّ الْمَلائِكَةَ لَتَضَعُ أَجْنِحَتَهٰا لِطٰالِبِ الْعِلْمِ رِضاءً بِمٰا يَصْنَعُ»[2] واتە: «فریشتەکان بە ڕەزامەندییەوە باڵ ڕادەخەن بۆ شوێنکەوتوانی زانین».

پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «لَئِنْ تَغْدُوَ فَتَتَعَلَّمَ بٰاباً مِنَ الْعِلْمِ خَيْرٌ مِنْ أَنْ تُصَلِّيَ مِائَةَ رَكْعَةٍ»[3] واتە: «ئەگەر سەرلەبەیانی هەستیت و بەشێك لە عیلم فێر ببیت، ئەوە چاترە لەوەی سەد ڕەکعەت نوێژ بخوێنی».

ئەبوو دەرداء رضي الله عنه ئەفەرمێ: «مَنْ رَأَىٰ أَنَّ الْغَدْوَ إِلَى الْعِلْمِ لَيْسَ بِجِهٰادٍ فَقَدْ نَقَصَ فِي رَأْيِهِ وَ عَقْلِهِ»[4] واتە: «ئەگەر کەسێك وا بیر بکاتەوە کە ڕۆیشتن بەدوای زانیندا جیهاد نییە، ئەوە کەمعەقڵ و ئاوەزە».

## نرخ و خێری فێرکردن:

خودای گەورە لەمبارەوە فەرموویەتی: ﴿وَ إِذْ أَخَذَ اللهُ مِيثٰاقَ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتٰابَ لَتُبَيِّنُنَّهُ لِلنّٰاسِ وَلا تَكْتُمُونَهُ﴾[5] واتە: «[بێنەوە بیر] ئەو دەمەی کە خودا پەیمانی لەو کەسانە کە کتێبیان خەڵاتکرابوو، وەرگرت کە ئەو کتێبانە ڕوون بکەنەوە بۆ خەڵك و لێیان مەشارنەوە».

---

١. کشف الخفاء٢/٤٣٢.

٢. ابوداود: ٣١٥٧. ترمذی: ٢٦٨٢. ابن‌ماجە: ٢١٩. احمد: ٢٣٩/٤.

٣. ابن‌ماجە: ٢١٩. کنزالعمال: ٢٨٧٦٢.

٤. جامع بیان العلم و فضلە لابن‌عبدالبر: ١٢٩.

٥. آل‌عمران: ١٨٧.

پێغەمبەریش ﷺ کاتێك ئەم ئایەتەی خوێندەوە فەرمووی: «مٰا آتَى اللّٰهُ عٰالِماً عِلْماً إِلّا أَخَذَ عَلَيْهِ الْمِيثٰاقَ، مٰا أَخَذَ عَلَى النَّبِيِّينَ أَنْ يُبَيِّنَهُ وَلا يَكْتُمَهُ».[1]

واتە: «خودای [مەزن] زانستی بە هیچ زانایێك خەڵات نەکردووە، مەگەر ئەوەی بەڵێنی لێ وەرگرتووە هەر بەو بەڵێنەی کە لە پێغەمبەرەکانی سەندووە کە ئەو کتێبانەی شی بکەنەوە، و لە خەڵکی نەشارنەوە».

پێغەمبەر ﷺ ئەو دەم کە مەعازی نارد بۆ یەمەن فەرمووی: «لَئِنْ يَهْدِيَ اللّٰهُ بِكَ رَجُلاً وَاحِداً، خَيْرٌ إِلَيْكَ مِنَ الدُّنْيٰا وَ مٰا فِيهٰا».[2]

واتە: «ئەی مەعاز! ئەگەر خودا تاکە کەسێك بە بۆنەی تۆوە بخاتە سەر ڕێی ڕاست، ئەوە قازانجی لە دونیا و لەوەی وا لەنێو دونیادا، زۆرترە بۆت».

حەزرەتی عومەریش ﵁ فەرموویەتی: «مَنْ حَدَّثَ بِحَدِيثٍ فَعُمِلَ بِهِ، فَلَهُ مِثْلُ أَجْرِ ذٰلِكَ الْعَمَلِ»[3] واتە: «ئەگەر کەسێك وتەیێکی پێغەمبەر بگێڕێتەوە بۆ کەسێ، ئەو کەسەش بەو وتەیە ڕەفتار بکات، ئەوە بەقەد ئەو کردەوە خێری دەس دەکەوێ».

مەعازی کوڕی جەبەل ﵁ لەمەڕ فێربوون و فێرکردنەوە دەفەرمێ: ـ دیسان خۆیشم ئەم وتەیەم بینیوە کە نیسبەتیان لە پێغەمبەر ﷺ داوە ـ : «فێری زانین ببن کە بەڕاستی زانیاری بەدەسهێنان لە ڕێی خوا چاکەیە، بەدووکەوتنی عیبادەتە، خوێندنەوەی زیکر و ویردە، لێکۆڵینەوەی جیهادە و فێرکردنی بەکەسانێك کە نایزانن، خێراتە، خاو و خێزان فیرکردنی مایەی نزیکییە لە خواوە، زانیارییە هاودەنگی تەنیاییە، هاوەڵی چۆڵاییە، شایەتی دینداریە، لە شایی و شیوەنا سوکناییە. [زانین]، پشتیوانە لەناو دۆستانا، خزمە لەنێو نامۆیانا، تیشکی ڕۆشنکەرەوەی ڕێی بەهەشتە، خودا لە سایەی زانیارییەوەیە هۆزێك بەرز دەکاتەوە و دەیانکاتە پێشەنگ و ڕێخۆشکەر تا شوێنیان بکەون و چاکە نیشانی خەڵك بدەن، شوێنی شوێنەواریان بکەون، چاو لە کردەوەکانیان بکەن، پەرییانی ئاسمان حەز لە دۆستایەتییان

---

١. ابن‌الجوزی فی العلل المتناهیة: ١٤١. ابن‌حجر فی القول المسدّد: ٥/١. فتح الکبیر للسیوطی: ١٠٤١٧.

٢. لە ڕیوایەتی بوخاری ژمارە ٢٩٤٢ و موسلیم ژمارە ٣٤دا ئەم حەدیسە بەم جۆرە هاتووە: «لِأَنْ يَهْدِيَ اللّٰهُ بِكَ رَجُلاً وٰاحِداً خَيْرٌ لَكَ مِنْ أَنْ يَكُونَ لَكَ حُمُرُ النَّعَمِ» ئەم حەدیسە لێرەدا خیتابە لە حەزرەتی عەلی نەك مەعازی کوڕی جەبەل.

٣. شرح صحیح البخاری لشمس‌الدین السفیری. جامع بیان العلم و فضله لابن‌عبدالبرّ/٢١٠.

بکەن و باڵیان بەسەرا بکێشن، هەرچی تەڕ و وشکە لەلای خوداوە داوای لێبوردنیان بۆ بکەن، تەنانەت ورد و درشتی زیندەوەرانی نێو بەحر و دڕندە و چوارپێیانی دەشت و هەروەها ئاسمان و ئەستێرانی».

چونکە بەڕاستی زانیاری ژیانی دڵە کوێرەکانە، سۆمای چاوە لە تاریکاییدا، هێزی جەستەیە لە بێهێزیدا، بە زانینە کۆیلە دەگاتە تەشقی پیاوچاکان و پایەبەرزان، خێری ڕامان لە زانیندا بارتەقای ڕۆژووگرتنە، دەورکردنەوە هاوچەشنە لەتەك شەوبێداریدا، گوێڕایەڵی بۆ خوا، خواپەرستی، تاکەپەرستی، خۆپارێزی، سەردان لە خزم و خوێش هەموو ئەمانە تەنها بە زانیاری جێبەجێ دەبن، زانین پێشەوایە، کردار شوێنکەوتوویەتی، بە بەختەوەران خەڵات دەکرێ و ڕۆژڕەشانی لێ بێبەشە.

## زانین لە ڕوانگەی عەقڵەوە:

گەورەیی زانین شتێکی دوورەچاو نییە، چونکە گەیشتن و نزیکبوونەوە و چوونە ژێر سایەی خودا بەس بە زانینە. تەنیا زانینە دەبێتە هۆی بەختەوەری هەتاهەتایی و چێژێکی بێکۆتایی. سەربەرزی دنیا و خۆشبەختی دواڕۆژ لە زانیندایە. دنیا کێڵگەی دواڕۆژە، چونکە زانا بە زانیارییەکەی تۆمی بەختەوەری هەتاهەتایی بۆ خۆی دەچێنێ و بەگوێرەی زانین دەروون و ئاکاری خۆی پاڵفتە دەکات. پاشان بەفێرکردنی کەسانیتریش، تۆمی خۆشبەختی دواڕۆژ بۆ ئەوان دەچێنێ. مرۆڤی زانا بەهۆی زانیارییەکەیەوە، ئاکاری ئینسانەکان دەپاڵێوێ و بەرەو کردارێ کە بەخواوە نزیکیان بکاتەوە بانگهێشتیان دەکات.

خودا لەمبارەوە فەرموویە: ﴿أُدْعُ إِلَىٰ سَبِيلِ رَبِّكَ بِالْحِكْمَةِ وَ الْمَوْعِظَةِ الْحَسَنَةِ وَ جَادِلْهِمْ بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ﴾.[1]

واتە: «[ئەی پێغەمبەر!] بە حیکمەت و کارزانی و بە ئامۆژگاری جوان بۆ سەر ڕێبازی پەروەردگارت بانگەشە بکە و بە باشترین شێوە لەگەڵیان بدوێ».

مرۆڤی زانا لەگەڵ ئینسانە ناوازەکان (خوّاص)دا بەحیکمەت، لەگەڵ خەڵکی ڕەشۆکیدا بە ئامۆژگاری، لەگەڵ ناحەزاندا بە وتوویێژ و جەدەل دەدوێ، ئەم چەشنە ئینسانە هەم خۆی و هەم خەڵکیش ڕزگار دەکا، دەسا ئەوەیە تەواوەتی و بێنەقسی مرۆڤ.

---

١. النحل: ١٢٥.

## بەشی دووهەم: ڕوونکردنەوەی زانستی چاك و خراپ و باسی فەرزی عەین (تاکەکەسی) و فەرزی کیفایە:

پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «طَلَبُ الْعِلْمِ فَرِيضَةٌ عَلَىٰ كُلِّ مُسْلِمٍ»[1] واتە: دووی زانینکەوتن فەرزە لەسەر هەموو موسڵمانێ.

زانستی فەرز، ئەو زانستەیە کە بە [مەرجی] موسڵمانبوون و باڵقبوون فەرز دەبێ، کە بریتییە لە شادە هێنان و تێگەیشتن لە ماناکەی، ئیدی لەسەری نییە بۆ سەلماندنی پشتی بە بەڵگە و سەنەد پتەو بکات، هەر ئەوەندەی کە ـ بە بێشك و دوودڵی ـ بڕوای پێ بێ، بەسە، هەرچەندەش ئەو بڕوایەی لە ڕووی لاساییکردنەوە و شوێنکەوتن بێت، پێغەمبەریش ﷺ لەگەڵ ئەو عەرەبە دەشتەکییە نەخوێندەوارانەدا ئاوەها دەجووڵایەوە.

پاشان [ئەو موسڵمانە] پێویستە خۆی خەریك بکات بەو دەستوورانەی خودای مەزنەوە کە ڕووی تێدەکەن وەك: نوێژ و ڕۆژوو، بەگوێرەی هاتنەبەرەوەیان.

هەرکات کە نوێژی لەسەر فەرز دەبێ، نوێژخوێندن فێر بێت و پێش ئەوەی لەسەری فەرز بێت، خۆی بۆ تەیار بکات، ڕۆژوویش هەروەها، ئەگەریش خاوەنی ئەوەندە ماڵ بوو ـ کە پاش تێپەڕینی ساڵێك لە موسڵمانبوونی ـ زەکاتی لەسەر فەرز بێت، ئەوە پێویستە فێری زەکات دەرکردن ببێت، هەروەها بەو ئەندازەی پێویست لەسەر واجبە کە فێر ببێت.

هەرکاتێکیش حەجی لەسەر فەرز بوو [لەلایەن موسڵمانەکانیترەوە] ئاگادار بکرێتەوە ئیدی پێویست ناکا بۆ فێربوونەکەی پەلە بکات، هەر وەکوو چۆن لەسەری نییە بۆ بەجێهێنانەکەی بەتاو بێت.

لەسەر مرۆڤی موسڵمانە کە بەپێ ڕۆژ و بەپێی نیاز فێری ئەو شتانە بێت کە ئەنجامدانیان گوناحە و پێویستە دووری لێ بگیردرێ.

ئەگەریش لەسەر ئەو شتانەوە کە بڕوای پێیە، وەشك کەوت، ئەوە لەسەریەتی ـ تا ئەو ئاستەی کە شك لە دڵیا نەمێنێتەوە ـ لەفێربوون و بیرکردنەوەدا دابچێ.

هەروەها پێویستە فێری ئەو زانستە ببێت کە تەنیا بە هۆی ئەوەوە ئەتوانێ لە دەستی ئافەتە کوشندەکان ڕزگاری ببێت و بە ئاستێکی بەرز بگات.

---

١. ابن‌ماجە: ٢٢٤. طبرانی: ١٠/١٩٥. بیهقی: ١٦١٤.

هەروەها بشزانە کە نرخی هەر زانستێ بە ئەندازەی دووری و نزیکییەتی بە زانستی دوارۆژەوە، هەر وەکوو چۆن زانستی یاساکانی ئیسلام نرخیان لە غەیری خۆیان، پترە، ئەو زانستانەی کە پێوەندییان بە بنەڕەت و حەقیقەتی یاساکانی ئیسلامەوە بێت، نرخیان لەوانەی کە پێوەندییان بە ڕواڵەتی یاساکانەوە هەیە زۆرترە. زانای فیقهی بەگوێرەی ڕواڵەتی کارەکە لەبارەی دروستی و نادروستییەوە دەدوێ، [بەڵام] جگە لەمە زانستێ‌تر هەیە کە بەپێی ئەو دەزاندرێ کە ئاخۆ ئەو عیبادەتەی لێ وەرگیراوە یان بەسەریدا دراوەتەوە، ئەمەش بەشێك لە زانستی تەسەووفە کە باسی دێت.

ئەو زانا ناودارانەش کە خەڵکی شوێنیان کەوتوون و وە دوویاندا ڕۆیشتوون، هەم زانستی ڕواڵەتی (فقه) و هەم زانستی ناوەڕۆکی (علوم الحقائق) و هەم عەمەڵ پێکردنیان پێکەوە کۆ کردۆتەوە.

ئەمەش تەنیا بە لێکدانەوەی شێوەی ژیانیان پەی پێ‌دەبرێ. ئەم زانایانە پێنجن و بریتین لە ئیمامی شافیعی[1] و ئیمامی مالیك[2] و ئیمامی ئەبووحەنیفە[3] و ئیمام ئەحمەدی کوڕی حەنبەل[4] و سوفیانی سەوری[5] ـ ڕەحمەتی خوایان لەسەر ـ جا هەرکامیان هەر وەکوو چۆن لێزانی بواری فیقهی زاهیرین ـ کە پێوەندی بە بەرژەوەندی خەڵکەوەیە ـ هەروەهاش هاوکات لێزانی زانستی پاشەڕۆژ و لەخواترس و خواپەرستیش بوون. ئەم زانایانە بە هەموو زانیارییانەوە تەنیا مەبەستیان خوا بووە و بەس.

---

١. ناوی موحەممەدی کوڕی ئیدریسی کوڕی عەبباسی کوڕی شافیع، سەرمەزهەب و ئیمام و پێشەوای شافیعی مەزهەبەکانە. ١٥٠ ـ ٢٠٤ ك. سیر أعلام النّبلاء: ١/١٠

٢. ناوی «ابوعبداللّه»ی مالیکی کوڕی ئەنەسی کوڕی مالیکی کوڕی ئەبی‌عامیرە، سەرمەزهەب و پێشەوای مەزهەبی مالیکییە. ٩٥ ـ ١٧٩ ك. سیر أعلام النّبلاء: ١٠/٨

٣. نوعمانی کوڕی سابتی کوڕی زووتی کووفییە، سەرمەزهەب و پێشەوای مەزهەبی حەنەفییە. ٨٠ ـ ١٥٠ك. سیر أعلام النّبلاء: ١٦٣/٦

٤. «ابوعبداللّه» ئەحمەدی کوڕی موحەممەدی کوڕی حەنبەلی کوڕی هیلالی کوڕی ئەسەدە، سەرمەزهەب و پێشەوای مەزهەبی حەنبەلییە. ١٦٤ ـ ٢٤١ ك. سیر أعلام النّبلاء: ٧٨/١١

٥. «ابوعُبیداللّه»ی سوفیانی کوڕی سەعیدی کوڕی مەسرووقی سەوری ـ کووفییە، زانایەکی موحەددیس موجتەهیدێکی ناودارە، لە ساڵی ١٦١ك وەفاتی فەرمووە. طبقات ابن‌سعد: ٣٧١/٦، سیر اعلام النّبلاء: ٨٢، وفیات الأعیان٢/٢٨٦.

ئەم پێنج تایبەتمەندییە [کە ڕامان بوارد[1]] کە زانایانی ئەو سەردەمە بوویانە جگە لە یەکێکیان نەبێ ـ ئەویش پەرەدان و داچوون لە بوارە فیقهییەکاندایە ـ ئەو چوارەکەی‌تر بەس بەکاری دوارۆژ دێن، [بەڵام] ئەو تاکە تایبەتمەندییە هەم بە کەڵکی دونیا دێ، هەم بۆ پاشەڕۆژ دەگونجێ.

جا ئێستا با بێینە سەر شێوەی ژیانی ئەو زانایانە کە داکۆکی لەسەر ئەو چوار تایبەتمەندییە دەکەن:

ئیمامی شافیعی رَحِمَهُ ٱللَّهُ هەر ئەوەی کە شەوی بە سێ پارچە دابەش دەکرد: سێیەکی لە زانیندا، سێیەکی لە نوێژخوێندندا، سێیەکیشی لە خەوتندا، خۆی بەڵگەیە لەسەر خواپەرستی و خواشناسیی ئەو زاتە.

ڕەبیع [لەم بارەوە] دەڵێ: ئیمام شافیعی رَحِمَهُ ٱللَّهُ هەرچی ڕۆژە خەتمێ قورئانی دەکرد.

حوسێن کەڕابیسی[2] دەڵێ: زۆرتر لە جارێ لەگەڵ ئیمام شافیعیدا شەو پێکەوە بووین، کە شەوانە نوێژی دەخوێند، نزیکەی سێیەکی شەوەکە خەریکی نوێژخوێندن دەبوو. نەمدیبوو کە لە پەنجا ئایەت پتر بخوێنێ، ئەگەریش لە پەنجا لای بدایە ئەوە سەد ئایەتی دەخوێند. هەروەها بەسەر ئایەتێ کە مانای ڕەحمەتی تێدا بوایە تێ‌نەدەپەڕی، مەگەر داوای ئەو ڕەحمەتەی دەکرد بۆ خۆی و تەواوی موسڵمانەکان، هەروەها بەسەر ئایەتی عەزابدا تێ‌نەئەپەڕی مەگەر داوای لەخودا دەکرد کە لەو عەزابە پەنای بداو لە خوداش دەپاڕایەوە کە خۆی و تەواوی موسڵمانانی لێ ڕزگار بکات. ئەڵێی [بەردەوام] لە بەینی ترس و ڕجادا بووە. جا تێ‌فکرە هەر ئەوەی کە پەنجا ئایەتی خوێندووە داکۆکی لەسەر لێزانی و تێڕامانی لە نهێنییەکان قورئان دەکات.[3]

ئیمامی شافیعی رَحِمَهُ ٱللَّهُ دەفەرمێ: من لە شازدە ساڵییەوە قەت تێر نانم نەخواردووە؛ چونکە تێری جەستە قورس دەکات، دڵ ڕەق دەکات، وریایی لادەبات و خەو بەسەرا دێنێ و مرۆڤ

١. مەبەست: خواترسی، خواپەرستی، زانا بە زانستی دوارۆژ، زانا بە زانستی دونیا، زانیاری خالس بۆ خودا.

٢. «ابوعلی» حوسەینی کوڕی عەلی و کوڕی یەزیدی بەغدادی شافیعییە، ٢٤٥ ك. سیر أعلام النّبلاء١٢/٢٣، وفیات الأعیان: ١/١٤٥.

٣. معرفة السّنن والآثار للبیهقی: ٧٩، تاریخ بغداد للخطیب البغدادی: ٢/٦٣.

لە عیبادەتکردن شل دەکاتەوە.[١] جا بڕوانە بۆ ئەو لێزانییەی ئیمامی شافیعی لە هەڵدانی ئافەتەکانی تێریدا پاشان بۆ هەوڵدانی لە عیبادەت کە وا لە کەم قنیاتیدا.

ئیمامی شافیعی رَحِمَهُ اللَّهُ دەفەرمێ: قەت ـ نە بە درۆ نە بە ڕاست ـ سوێندم بەخوای مەزن نەخواردووە.[٢]

هەروەها لەبارەی مەسەلەیەکەوە لە شافیعی پرسیار کرا، بێ‌دەنگ بوو، پێی گوترا: ئەرێ [قوربان] ئەوە وەڵام نادەیتەوە ڕەحمەتی خودات لێ بێ؟

فەرمووی: تا نەزانم بێ‌دەنگبوون باشترە یان وڵامدانەوە [وەڵام نادەمەوە].

ئەحمەدی کوڕی یەحیا کوڕی وەزیر دەڵێ: ئیمام شافیعی رَحِمَهُ اللَّهُ لە بازاڕی چرافرۆشەکانەوە هاتەدەر، ئێمەش شوێنی کەوتین، کوتوپڕ پیاوێ دەستی کرد بە خراپە وتن بە پیاوێکی زانا، شافیعیش ئاوڕی لە ئێمە دایەوە و فەرمووی: گوێتان لە بیستنی قسەی پیس بپارێزن وەکوو چۆن زمانتان لە دەربڕینی قسەی خراپ دەپارێزن، چونکە بیسەر هاوبەشی وێژەرە، پیاوی بێ‌عەقڵ سەیری پیسترین شتێك دەکات کە لە کاسەی سەریدایە و حەز دەکات لە دەفری ئێوەی بڕێژێ، دەی ئەگەر قسەی ئەو کابرا گەوجە بەسەریدا بدرێتەوە، ئەوا ئەو کەسەی وا گلی نەداوەتەوە بەختەوەرە و ئەوی وا گوتوویەتی بەدبەختە.[٣]

دیسان ئیمام شافیعی رَحِمَهُ اللَّهُ دەفەرمێ: حەکیمێك [لە نامەیێکدا] بۆ حەکیمێ‌تر دەنووسێ: ئەتۆ زانستت خەڵات کراوە، دەی ئەو زانینەت بەلیلاوی گوناح پیس مەکە تا وات پێ نەیێ لەو ڕۆژەوا زاناکان لەبەر تیشکی زانینیانەوە بەتاو دەچن، تۆ لەنێو تاریکاییدا شەوارەت بێت و بمێنیتەوە.[٤]

١. إعانة الطالبين البكرى الدّمياطى، حلية الأولياء ابونعيم اصفهانى، جامع العلوم والحكم: حديث ٤٧، تاريخ الإسلام للإمام الذّهبى: ٣٢٢/١٤.

٢. كشف الخفاء: ٢٤٦٩، تحفة المحتاج: حروف القسم المشهورة، سير أعلام النّبلاء: ج١٠ ص٢٥، تاريخ الإسلام للذهبى: ٣٢٣/١٤، حليه‌الأولياء: ١٢٨/٩.

٣. حليه‌الأولياء١٢٣/٩.

٤. حليه‌الأولياء: ١٤٦/٩، فتح القدير للشّوكانى: ٣٦٤/٢.

## دونیا نەویستیی ئیمام شافیعیرَحِمَهُ‌اللَّهُ:

ئیمام شافیعیرَحِمَهُ‌اللَّهُ فەرموویەتی: هەرکەس بڵێ کە خۆشەویستی خودا و خۆشەویستی ماڵی دونیای پێکەوە کۆ کردۆتەوە، ئەوە درۆ دەکا.[1]

[دەگێڕنەوە جارێ] شووڵێك لە دەستی ئیمامی شافیعی دادەکەوێ، نەفەرێك بەرزی دەکاتەوە و ئەیداتەوە دەستی، ئەویش دەسبەجێ لە پاداشدا پەنجا دیناری دەداتێ.[2]

## سەخاوەتی ئیمامی شافیعیرَحِمَهُ‌اللَّهُ لە خۆر، ئاشکراترە:

لە نەقڵێکدا هاتووە کە ئیمامی شافیعیرَحِمَهُ‌اللَّهُ حەدیسێکی دڵتەزێنێ لە "سەفیانی کوڕی عویەینە"وە بیست، دەسبەجێ لەسەر خۆی چوو تا جێگەیێك وتیان بە سەفیان کە فەوتی کردووە؛ ئەویش فەرمووی: ئەگەر ڕاست بێ کە فەوتی کردبێ، ئەوا بەڕێزترین کەسی سەردەمی خۆی فەوتی کردووە.[3] ئەمەش ـ بەڕوونی ـ هێزی دونیا نەویستی و لە خواترسی و پاشەڕۆژ ویستیی ئیمامی شافیعی دەگەیێنێ.

یەکێك ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿هَذا يَوْمُ لا يَنْطِقُونَ ۝٣٥ وَلا يُؤْذَنُ لَهُمْ فَيَعْتَذِرُونَ ۝٣٦﴾[4] واتە: «ئەوڕۆ ڕۆژێکە نایەڵین [کافرەکان] قسە بکەن، هەروەهاش ئیزنیان پێ نادرێ تا داوای لێبوردن بکەن»، ئیمامی شافیعیرَحِمَهُ‌اللَّهُ ڕەنگی گۆڕا و موچرك بە لەشیدا هات و لەرزێکی سەختی کرد و لەسەر خۆی چوو، کاتێ هاتەوە هۆش ئەم دوعایەی خوێند: خوایە پەنا دەگرم بەتۆ لە پشتهەڵکردنی بێخەبەران و لەوەی کە بمخەیتە ڕیزی درۆزنەکانەوە، خوایە! دڵی عارفان تەنیا لەبەردەم تۆدا خۆیان دەشکێننەوە، تاسەباران بەس لەبەر تۆ ملکەچن، خوایە! بمخە بەر بەخششی خۆتەوە، لە سایەی خۆتا داميۆشە، بە گەورەیی خۆت خۆش بە لە هەرچی کەم و کورتیمە.

---

١. فیض القدیر للمناوی: ٤٢٦٩، شرح صحیح البخاری لشمس الدّین السفیری: ٥/٦.

٢. تهذیب الاسماء للنووی١/٧٢.

٣. سیر أعلام النّبلاء للذهبی: ١/١٠، تهذیب الأسماء للنووی: ٧٤/١، ترتیب المدارك و تقریب المسالك للقاضی عیاض: ١/١٤٠.

٤. المرسلات: ٣٦ ـ ٣٥.

## باسی ئاگاداربوونی ئیمام شافیعیرَحِمَهُ اللَّهُ لە نهێنییەکانی دڵ و دەروون:

ئیمام شافیعیرَحِمَهُ اللَّهُ لە بارەی ڕیاوە پرسیاری لێکرا، ئەویش گورج فەرمووی: ڕیا ئافەتێکە، هەواو هەوەس لە دەوری چاوی دڵی زانایاندا هۆنیویەتەوە، بە دڵێکی چەپەڵەوە دەڕوانن، بۆیە هەرچی کاری چاکەیانە دەیسووتێنێ.[1] دیسان فەرمووی: ئەگەر دەترسی تووشی دەمار زلی و خۆ بەزلزانی بیت، ئەوە بڕوانە بزانە دەتەوێ کێ لێت دڵخۆش بێت؟ هەروەها دڵت بۆ چ نەعمەتێك لێ دەدا؟ لە دەستی چ سزایێکەوە ڕادەکەی؟ لە بەرانبەر چ جۆر ساغییێکەوە شوکرانەبژێری؟ لە چ بەڵاییێکدا خودات دێتەوە بیر؟[2].

ئەوەیە کە ئیمام شافیعیرَحِمَهُ اللَّهُ فەرموویەتی: «ئاواتم ئەوە بوو خەڵك لەم زانستەم کەڵك وەرگرن و هیچی وەلای من نیسبەت نەدەن»[3]. بە تەواوی ئەوە دەگەینێ کە مەبەستی لە زانینەکەیدا ناوبانگی نێو خەڵك و کڕینی کاڵای دەمارزلی نەبووە و تەنیا خودای مەبەست بووە.

دیسان ئیمام شافیعیرَحِمَهُ اللَّهُ فەرموویەتی: قەت لەگەڵ کەسێك چەنە بە چەنەم نەکردووە و حەزم کردبێ بە هەڵەدا بڕوا.[4] هەروەها لەگەڵ کەس نەدواوم مەگەر ئەوەی کە حەزم کردووە سەرکەوتووبێ و یارمەتیم دابێ و فێرم کردبێ ڕێکوپێك قسە بکات و وەبەر بەزەیی و چاوەدێری خودا بکەوێ. هیچ کاتێ لەگەڵ کەسێك وەقسە نەهاتووم مەگەر حەزم کردبێت کە خودای مەزن لەسەر زمانی من یان زمانی ئەو حەق ئاشکرا بکات.

ئیمامی ئەحمەدرَحِمَهُ اللَّهُ دەفەرمێ: من چلساڵی ڕەبەقە تا دوعای خێرم بۆ ئیمامی شافیعی نەکردبێ، نوێژم نەخوێندووە.[5]

---

١. تاريخ دمشق ابن‌عساكر فی ذکر الشافعی: ٣٣٤.

٢. تاريخ دمشق ابن‌عساكر فی ذکر الشافعی: ٤١٣.

٣. سير اعلام النبلاء: ١/١٠.

٤. صحيح ابن‌حبان: ٢١٥٩، معرفه‌السنن والآثار للبيهقی: ٩٦.

٥. تاريخ دمشق: ذكر الشافعی: ٣٤٦.

**باسی ئیمامی مالك رَحِمَهُ اللَّهُ:**

جەنابیشیان هەر بەو پێنج تایبەتمەندیەی کە ناوبرا خۆی ڕازاندۆتەوە. بە ئیمامی مالك وترا: ئەتۆ لەبارەی چوون بە شوێن زانیاریدا چی دەڵێی؟ فەرمووی: کارێکی جوان و بەجێیە، بەس ئەوەندە هەیە کە چاك چاو ورد بکەیتەوە بزانی چی لە بەیانییەوە تا ئێوارە لەگەڵتدایە، ئەتۆش لەگەڵ ئەوا ببە.[1]

ئیمامی شافیعیش رَحِمَهُ اللَّهُ لەم بارەوە دەفەرمێ: ئیمامی مالیکم دیت کە لەبارەی چل‌وهەشت مەسەلەوە پرسیاری لێ کرا، لە وڵامی سی و هەشتیاندا فەرمووی: نازانم.

ئیدی تەرکی دونیا و خۆپارێزیی ئیمامی مالك رَحِمَهُ اللَّهُ لەوە ڕۆشنترە کە جێی باس بێت.

**باسی ئیمامی حەنەفی رَحِمَهُ اللَّهُ:**

لەم بارەوە، نەقڵە کە ئیمامی حەنەفی رَحِمَهُ اللَّهُ [بەردەوام] نیوەیەك لە شەو وەخەبەر بوو تا جارێك لە کابرایێکی بیست کە گوتی: ئەم ئیمامە تەواوی شەو بێدارە، ئیتر لەو ساتەوە تەواوی شەو بێدار بوو و فەرموو بووی: ئەمن شەرم دەمگرێ بە شتێ تاریفم بدەنەوە کە لە مندا نەبێ.

ئیمامی ئەحمەدی کوڕی حەنبەل و سەفیانی سەوریش هەروەکوو ئەم سێ ئیمامە پێشووە وان، دونیانەویستی و خۆپارێزی ئەمانیش لەوە ڕوونترە کە باسی بکرێ. لە دووتۆی ئەم کتێبەشدا هەندێ چیرۆك و بەسەرهاتیان باس دەکەین کە ئەم ڕاستییەمان بۆ ڕوون دەکەنەوە.

## بەشی سێهەم: باسی ئەوە دەکات کە هەرچی زانستە باش نییە:

مەبەست لە زانستی خراپ: سیحر و تەلیسم و ئەستێرەناسی و فەلسەفە و هەرچی هاو وێنەی ئەمانەیە.

جا سیحر و تەلیسم بۆیە خراپن چونکە هەموو جۆرە زەرەر و زیانێکیان لێ دەکەوێتەوە.

بەڵام "ئەستێرەناسی" بۆیە خراپە، چونکە لەلایەن پێغەمبەرەوە صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قەدەغە کراوە، پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دەفەرمێ: «إِذَا ذُكِرَتِ النُّجُومُ فَأَمْسِكُوا»[2] واتە: "هەرکات باسی ئەستێرەناسی

---

١. سير أعلام النّبلاء للذهبي: ١٠/٨، حليه‌الأولياء: ١١٠/٦.

٢. المعجم الكبير للطبراني: ١٤١١ ـ ١٠٢٩٦، جمع الجوامع للسيوطي: ١٩٦٢.

هاتە پێش، ئەوە دەس ڕاگرن"، جا بۆیە قەدەغە کراوە، چونکە مرۆڤ عاشقی ئەوەیە کە ڕووداوەکان بباتەوە سەر هەندێ هۆکار کە بەرچاوە و لە خەیاڵی خۆیدا بۆی داناوە، دەی ڕێی تێ‌ئەچێ کە بەم بۆنەوە لە خودا ـ کە هەموو سەبەبەکان وان لەژێر دەسەلاتیدا ـ غافڵ ببێ.[1]

بەڵام فەلسەفە بۆیە خراپە چونکە مرۆڤ بەرەو بێ‌دینی ڕادەکێشێ. شك لەوەدا نییە کە عیلمی حیساب و هیندەسە دروستە و جێی ئینکار نییە، بەڵام هێندەی هەیە ئەم زانستە شتانی‌تری بە دواوەیە کە بەرەو ڕووی ئەوانە ئەکرێتەوە. با هەر بە ئەندازەیێ کە نیازە بخوێندرێ؛ [بۆ وێنە] لەو زانستە تەبیعییانە بەو ئەندازە کە بۆ دوکتۆری پێویستە بخوێندرێ لە زانستی ئەستێرەناسیشدا بەو ئەندازەیە بۆ ناسینی منازل و جێگاکانیان و بۆ دۆزینەوە قیبلە و... پێویستە بخوێندرێ[2].

## بەشی چوارەم: لەمەڕ ئاداب و ئاکاری مامۆستا و قوتابی:

ئەرك و ئادابی قوتابی زۆرە بەڵام لە حەوت ڕستەدا پێناسەی دەکەین:

**ئەرکی یەکەم:** ئەبێ لە خاوێن‌کردنەوەی دڵ لە ئاکاری نالەبار دەس پێ بکات. چونکە پێغەمبەرﷺ دەفەرمێ: «بُنِيَ الدِّينُ عَلَى النَّظافَةِ».[3] واتە: «بناغەی دین لەسەر پاك و خاوێنی دانراوە».

جا لێرەدا مەبەست لە خاوێنی، تەنیا خاوێنی جلوبەرگ نییە، بەڵکوو خاوێنی دڵیش مەبەستە. فەرموودەی خودای مەزن ئەمە دەگەیێنێ: ﴿إِنَّمَا الْمُشْرِكُونَ نَجِسٌ﴾[4]. واتە: «بێ‌گومان ئەوانەی وا هاوەڵ بۆ خودا دادەنێن پیسن».

[لەمەوە] دەردەکەوێ کە پیسی تەنیا بۆ جلوبەرگ نییە، چونکە تا دەروون لە پیسی خاوێن نەکرێتەوە قەت ناتوانێ زانستێ کە بەرژەوەندی هەبێت بۆ دین، وەری‌گرێ و بە تیشکی زانین ڕووناك ببێتەوە.

---

١. مەبەست لەم ئەستێرەناسییە، ئەستێرەناسیی کۆنە کە پڕ لە خورافات بووە و بە شکڵ و شێوازی ئەستێرەکان بەخت و ئیقباڵیان پێش‌بینی ئەکرد ـ وەرگێڕ.

٢. بۆ ڕوونبوونەوەی زیاتری ئەم باسە سەیری ئیحیا هەر لەم باسەدا بکە ـ وەرگێڕ.

٣. الدرر المنتثرة للسيوطي: ٥٩.

٤. التوبة: ٢٨.

ئیبنوو مەسعوودرَضِيَ ٱللَّهُ عَنْهُ دەفەرمێ: زانست بەوە نییە زۆر شت بگێڕیتەوە، بەڵکوو زانین تیشکێکە خوا دەیخاتە نێو دڵەوە.

هەندێ لە توێژینەران وتوویانە: ویستمان زانست بۆ غەیری ڕێی خوا فێر بین، کەچی زانین خۆی نەیهێشت کە بۆ غەیری خودا بێت، کەواتە هەرکاتێ عیلم خۆی لێمان بشارێتەوە و خۆی لێمان قەدەغە بکات، قەت ناوەڕۆکی بۆمان ڕوون نابێتەوە و ئەوەی کە دەستمان دەگرێ تەنیا قسە و لەفزی ڕووتە.

ئەرکی دووهەم: پێویستە قوتابی سەرقاڵیی بۆ خۆی دروست نەکات و لە وڵاتی خۆی دوورکەوێتەوە تا دڵی خۆی یەکلا کاتەوە بۆ خوێندن، چونکە خودای مەزن دوودانە دڵی لە دەروونی یەك کەسدا دانەناوە[1]. جا هەر بەم بۆنەوەیە کە وتوویانە: زانین بەشێك لە خۆی نادا پێت تا تۆ بە تێکڕا خۆتی پێ نەدەی.

ئەرکی سێهەم: پێویستە قوتابی بە عیلمی خۆیەوە نەنازێ، نابێ بەسەر مامۆستاکەیدا دەستوور بدات، بەڵکوو خۆی لە بەردەستیدا چەشنی نەخۆشێکی تەواو دابنێ کە ئیختیاری هەموو کارێکی بە دوکتۆرەکەی دابێ، بەبێ ئەوەی کە زۆر بکات بەسەریداو پێی بڵێ: ئەم دەوایەم بۆ بنوێنە و ئەویترم بۆ مەنوێنە.

هەروەها پێویستە قوتابی بەردەوام لە خزمەتی مامۆستاکەیدا بێت، چونکە لەمبارەوە حەدیس هاتووە کە: زەیدی کوڕی سابیترَضِيَ ٱللَّهُ عَنْهُ دەچوو نوێژ بەسەر تەرمێکەوە بخوێنێ، چارەوێیەکیان هێنا نزیکیەوە تا سواری ببێ، لەوکاتەدا ئیبنوو عەبباسرَضِيَ ٱللَّهُ عَنْهُمَا هات و ئاوزەنگی چارەوێکەی گرت، زەید فەرمووی: بەریبدە، ئەی ئامۆزای پێغەمبەر! ئیبنوو عەبباسیش فەرمووی: پێغەمبەرصَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فەرمانی داوە پێمان ئاوەها لەگەڵ زانایان و گەورەکانماندا بجووڵێنەوە، پاشان زەیدیش دەستی ماچ کرد و فەرمووی: ئێمەش دەستوورمان پێدراوە کە لەگەڵ بنەماڵەی پێغەمبەردا ئاوەها هەڵسوکەوت بکەین.

پێغەمبەرصَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فەرموویەتی: زمانلووسی و ڕیایی دروست نییە مەگەر بۆ بەشوێنی عیلمدا چوون. دەڵێن: زانین لەگەڵ مرۆڤی دەمارزلدا شەڕ دەکات، وەکوو چۆن لافاو کۆسپەکانی سەر ڕێی خۆی تێك دەڕووخێنێ.

---

١. ئەم عیبارەتە بەشێکە لە ئایەتی ٤ی سوورەتی ئەحزاب: ﴿مَّا جَعَلَ ٱللَّهُ لِرَجُلٍ مِّن قَلْبَيْنِ فِي جَوْفِهِۦ﴾.

**ئەرکی چوارەم:** پێویستە قوتابی بۆ گرمە و قاڵ و کێشەی نێوان خەڵکی، گوێ شل نەکات، چونکە سەرسوڕماوی و سەرلێشێواوی بە دواوەیە. ئەوەیە قوتابی لە هەوەڵەوە دڵی لێ دەدا بۆ تەواوی ئەو قسانەی کە پێی دەڵێن، بە تایبەت بۆ ئەو پێشنیارانەی کە بەرەو دەس کێشان لە خوێندن ئەیبەن و لەگەڵ [ڕۆحییەی] تەنبەڵی و تەوەزەلیدا جۆر دەبێت، لەم سۆنگەوەیە کە نابێ قوتابیی پلەی سەرتایی، شوێنی ڕەفتاری خوێندکاری پلەی کۆتایی بکەوێ. تەنانەت هەندێ گوتوویانە: «مَنْ رَءٰانٰا فِي الْبِدٰايَةِ صٰارَ صِدِّيقاً وَ مَنْ رَءٰانٰا فِي النِّهٰايَةِ صٰارَ زِنْدِيقاً» واتە: «هەرکەس لە سەرەتاوە ئێمەی بینی، بە دروستکار دەرچوو، هەرکەسێکیش لە ئاخرەوە چاوی پێمان کەوت، بە خراپەکار دەرچوو»؛ چونکە ئەوان (خوێندکاری پلەی کۆتایی) جەستەیان ـ جگە لە نوێژە فەرزەکاندا نەبێ ـ لە جووڵە دەکەوێت [حەز بە کرِدانیشتن دەکەن] و بەجێی سوننەت ئەنجامدان خەریکی سەیرو سلووکی قەلبی دەبن و بەردەوام وان لە حاڵەتی موشاهەدەدا و ئینسانی گێل و بێخەبەر وا دەزانێ بەتاڵ و تەنبەڵن. ﴿وَ تَرَى الْجِبٰالَ تَحْسَبُهٰا جٰامِدَةً وَ هِيَ تَمُرُّ مَرَّ السَّحٰابِ﴾.[1] واتە: «کاتێ تۆ سەیری کێوەکان دەکەی وا تێ دەگەی کە کڕ ڕاوەستاون، کەچی ئەو کێوانە بە چەشنی هەورەکان لە جووڵەدان».

**ئەرکی پێنجەم:** لەسەر قوتابییە سەر لە تەواوی زانستەکان بدات و ئەوەندە دابچێ کە لە ئامانجی هەرکام لەو زانستانە تێ بگات، جا ئەگەر تەمەن یارمەتی دا، لە هەموویاندا ببێ بە لێزان؛ وەگەرنە هەرکامیانی بەلاوە گیرنگتر بوو، هەڵیبژێرێ و خۆی پێوە ماندوو بکات، شتێکی ئاشکرایە چاك هەڵبژاردن کاتێ بۆ مرۆڤ دەلوێ کە ئاگاداری تەواوی زانستەکان بێت.

**ئەرکی شەشەم:** لەسەر قوتابییە خۆی بەگیرنگترین زانست کە زانستی پاشەڕۆژە ماندوو بکات، جـا مەبەستمان لەم زانستە دوو بەشی موعامەلە[2] و موکاشـەفەیە،[3] جـا ئەگەر هەڵسوکەوتی بەپێی یاسای شەرع بێت هەر ئەمە خۆی دەبێتە هۆی خوداناسی، (واتە موعامەلە ئەبێتە هۆی موکاشەفە). [جا پێویستە بزانین] کە ئەم هێزی ڕوونکارییە [لەخۆڕا نییە و] بەڵکوو تروسکەیێکە کە خودا دەیخاتە دڵی ئەو بەندانەی کە دەروونیان

---

١. النمل: ٨٨.

٢. موعامەلە: واتە: جووڵانەوە بەپێی یاسای شەرع، لە کاروباری دونیاییدا.

٣. موکاشەفە: واتە: پەردە لابردن لەسەر نهێنییەکان و ناسینی خوا.

بە عیبادەت و بەرخۆدان، خاوێن کردبێتەوە. جا سەرەنجامی ئەم موکاشەفە قەلبییە ئەوەیە کە ئەوەندە دەڕواتە پێشەوە تا دەگاتە ئیمانی حەزرەتی ئەبووبەکر رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ ئەو ئەبووبەکرەی کە پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لەبارەیەوە دەفەرمێ: «لَوْ وُزِنَ إِيمَانُ أَهْلِ الْأَرْضِ بِإِيمَانِ أَبِي بَكْرٍ لَرَجَحَ».[1] واتە: «ئەگەر ئیمانی ئەبووبەکر لەگەڵ ئیمانی تەواوی ئەهلی زەمیندا کێشیان بکرێ، هی ئەبووبەکر قورسترە». ئەمەش نەك لەبەر ئەوەی ئەبووبەکر رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ بۆ سەلماندنی خوا بەڵگە و سەنەدی زۆری ڕیز کردبێ، بەڵکوو لەبەر ئەو ڕازەیە کە لە سینەیدا بوو.

سەیر لەوەدایە هەندێ کەس ئەم فەرموودانە لە پێغەمبەرەوە صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ئەبیسن و هەروەها بڕێ وتە و قسەی سۆفییانەی ئا لەم چەشنەیان بەرگوێ ئەکەوێ، وا بۆی دەچن کە ئەمانە هەموویان ژاوەژاو و قسەی بێ‌نرخی سۆفییانەن. جا تۆ ئا لێرەدا پێویستە هێمن و لە سەرخۆ بیت چونکە [گەر هۆشت نەبێ] ئا لێرەدایە سەرمایەکەیشت دەدۆڕێنی. تۆ پێویستە بە دووی زانستێکەوە بیت کە لە زانستی فەیلەسووف و مەلا شەرعزانەکان بەولاوەترە. وە ناتوانی ئەو زانستەش وەدەس خەی مەگەر زۆر بە تەماحەوە لە دووی گەڕێی.

جا بزانە مەزنترین عیلم، عیلمی خواناسییە، ئەمەش بەحرێکە بنی نییە و بانترین دەرجەیێکە بەشەر دەستی پێ ڕاگەیشتووە، پلەی پێغەمبەرەکان و دۆستانی خودایە و پاشان ئەو کەسانەی وا شوێن ئەوان کەوتوون.

دەگێڕنەوە کە دوو حەکیمی خواناس هەبوون کە بەدەستی یەکێکیانەوە پەڕە کاغەزێك بووە کە تێدا نووسرا بوو: «ئەگەر هەموو شتێکت باش ئەنجام دا و بە باشت زانی، ئەوە وا مەزانە کە هەموو شتێکت بە باشی ئەنجام داوە و بە جوانی دیتووتە، مەگەر کاتێ کە خوا بناسی و بزانی کە هەر خوایە هەرچی ئەسبابە لە ژێر دەستیدایە و بەدیهێنەری هەموو شتێکە»، بەدەستی ئەوی‌تریشیانەوە پەڕەیێکی‌تر هەبووە کە تیا نووسرابوو: «ئەمن پێش ئەوەی خوا بناسم، هەرچی ئاوم دەخواردەوە هەر تینووتر دەبووم، تا ئەوەی کە خوام ناسی، ئیدی تێراو بووم بە بێ‌ئەوەی ئاو بخۆمەوە».

**ئەرکی حەوتەم:** [قوتابی پێویستە نیەتی خۆی خاوێن بکات] و بەو ئامانجەوە دەرس بخوێنێ کە دەروونی خۆی بەو زانستە بڕازێنێتەوە کە بە خوای دەگەیێنێ و لەگەڵ خێڵی لە

---

١. بیهقی: ٣٥، احمد بن حنبل فی فضائل الصحابة: ٦٢٦، الدرر المنتثره فی الأحادیث المشتهره للسیوطی، حرف المیم.

خوانزیکان ببێ بە هاونشین، نەك بەشوێن پووڵ و پارە و دەسەڵات و مەقامی دونیاییەوە بێت.

**ئەرکی مامۆستا:** جوانترین تایبەتمەندی مامۆستا ئەوەیە کە لەبارەیەوە وتوویانە:

مامۆستا کەسێکە: بزانێ و بە زانینەکەی ڕەفتار بکات و خەڵکیش فێری ئەو زانستەی بکات، جا ئەگەر ئاوەها بوو ئەوە فریشتەکان لە ئاسماندا بەڕێزەوە ناوی دەبەن، نابێ مامۆستا چەشنی دەرزی بێت کە خەڵك پۆشتە بکات و خۆی ڕووت بێت، یان وەکوو فتیلە چرابێت خۆی بسووتێت و تیشك بۆ غەیر خۆی بداتەوە؛ وەك چۆن لەمبارەیەوە شاعیر دەڵێ:

«صِـــرْتُ كَأَنِّي ذُبَالَةٌ نُصِبَتْ    تُضِيءُ لِلنَّاسِ وَ هِيَ تَحْتَرِقُ»[1]

واتە: «چەشنی فتیلەی هەڵکراوی چراییکم کە ڕووناکی دەبەخشێ بە خەڵك و خۆی دەسووتێ».

بێ‌شك هەرکەسێ ئەرکی فێرکاری وەئەستۆ بگرێ ئەوە ئەرکێکی مەزنی گرتۆتەبەر، جا پێویستە ڕەویە و ڕێباز و ئەرکەکانی بزانێ:

**ئەرکی یەکەم:** پێویستە مامۆستا لەگەڵ قوتابیدا میهرەبان و دڵسۆز بێت و لەجێی منداڵی خۆیدا دایبنێ، چونکە پێغەمبەرﷺ لەمبارەوە دەفەرمێ: «إِنَّما أَنا لَكُمْ كَالْوالِدِ لِوَلَدِه»[2].

واتە: «ئەمن بۆ ئێوە بە چەشنی باوکم بۆ منداڵەکەی». بەڵکو ئەو [مامۆستا] باوکی ڕاستەقینەیە، چونکە باب ژیانێك خەلاتی منداڵەکەی دەکات کە زوو تێدا ئەچێ، بەڵام مامۆستا هۆی ژیانێکی هەرمان و نەبڕاوەیە، لەم سۆنگەوەیە کە مافی مامۆستا لە پێش مافی باوك و دایکەوەیە.

فێرکاری ئەگەر لەبەر دەستخستنی ماڵی دونیا بێت، ئەوە فێرکاری نییە بەڵکوو تێداچوون و تێدابردنە، بەڵام ئەگەر لەبەر ڕەزای خوا بێت، پێویستە ئەو قوتابییانەی کە لای یەك مامۆستا دەرس دەخوێنن، یەکتریان خۆش بوێت؛ چونکە ئەو مامۆستا و قوتابیانەی کە ڕێی پاشەڕۆژیان گرتووەتە بەر، ڕێبواری ڕێی خودان و بەرەو لای ئەو ڕێ دەپێون، دونیا و مانگ وساڵیش دەبنە مسافرخانە و جێ حەسانەوەییکی کاتی، جا دۆستایەتی لە نێوان ئەو

---

١. أدب الدنيا والدين: ٢٤٦، وفيات الأعيان لابن‌خلكان في ترجمة عباس بن الأحنف.

٢. ابوداود: ٧، نسائي: ٤٠، ابن‌ماجه: ٣٠٩، احمد: ٧٠٦٤.

ڕێبوارانەی کە لەشارێکەوە بۆ شارێکیتر دەچن دەبێتە مایەی خۆشەویستی و یەکتروویستی.
دەی ئیتر ئەبێ سەفەرێك کە بۆلای خوا و بەهەشتی بەرینێك ـ کە هیچ تەنگانەیێکی تێدا نییە ـ چلۆن بێت؟

دەی با ئەم سەفەرە دوور بێ لە ڕقەبەرایەتی و کێشەسازکردن بۆیەکتر، چونکە فەرموودەی خودایە کە: ﴿إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ﴾[1] واتە: «ئیمانداران پێکەوە بران».

**ئەرکی دووهەم:** لەسەر مامۆستایە کە چاو لە پێغەمبەر ﷺ ببڕێ، وە بۆ فێرکارییەکەی چاوڕوانی پارە نەبێت. خودای مەزن لەمبارەوە دەفەرمێ: ﴿لا نُرِيدُ مِنكُمْ جَزَاءً وَلا شُكُورًا﴾[2] واتە: «لە ئێوە پاداش و شوکرانەبژێریمان ناوێ». جا هەرچەندەش کە مامۆستا مننەتی بەسەر قوتابییەکانەوە هەیە [بەڵام با مامۆستایش بزانێ] کە ئەو قوتابییانەش مننەتیان هەیە بەسەر مامۆستاکەیانەوە چونکە ئەوان ـ لەبەر ئەوەی مامۆستاکەیان نەمامی زانین و ئیمانی لەدڵیاندا چاندووە ـ بوونەتە هۆی نزیکبوونەوەی لە خواوە.

**ئەرکی سێهەم:** پێویستە مامۆستا ئامۆژگارییەکانی پاشکەوت و زەخیرە نەکات و بەردەوام چاودێری خوێندکارەنی بێت؛ وەکوو ئەوەی نەهێڵێ شاگردەکان مەقامێ بگرنە ئەستۆ کە هێشتا شیاوی ئەوەیان نەبێت، یان بە زانستە نادیارەکانەوە (العلوم الخفية) خۆبخەجڵێنن پێش ئەوەی زانستە پێویست و بەرچاوەکان بەباشی بزانن.

**ئەرکی چوارەم:** لەسەر مامۆستایە کە ئامۆژگاری قوتابییەکانی بکات و نەهێڵێ فێری ئاکاری نالەبار بین، جا ئەم ئامۆژگارییەی بەشێوەی ڕاستەوخۆ نەبێ، بەڵکوو بە شێوەی ناڕاستەوخۆ و کینایە بێت، چونکە ڕووت قسەکردن و بێڕوودەربایسیانە ئامۆژگاریکردن، پەردەی سام و شکۆ دەدڕێ [و قوتابی لە ئاست مامۆستا ڕوودار دەکات]. پێویستە مامۆستا خۆی لەسەر ئەرکەکانی بەردەوام بێت پاشان داوای بەردەوامبوونیش لە قوتابییەکەی بکات، ئەگینا ئامۆژگاری ڕووت و بێڕەفتار بێهوودەیە، چونکە چاولێکەری لە ئاکار و ڕەفتاردا زۆرترە تا لە قسە و نەسیحەت.

---

١. الحجرات: ١٠.

٢. الإنسان: ٩.

## بەشی پێنجەم: بەڵا و ئافەتەکانی زانین و شیکردنەوەی نیشانەی زانایانێ کە بۆ پاشەڕۆژ تەقالا ئەدەن و نیشانەی زانایانێ کە خراپ و دنیاویستن

پێغەمبەرصَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فەرموویەتی: «أَشَدُّ النَّاسِ عَذاباً يَوْمَ الْقِيامَةِ عالِمٌ لَمْ يَنْفَعْهُ اللّٰهُ بِعِلْمِهِ»[١] «سەختترین ئەشکەنجە لە ڕۆژی قیامەتدا بۆ ئەو زانایەیە کە خوا بە هۆی زانیارییەکەی کەڵکی پێ نەگەیاندبێ».

پێغەمبەرصَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فەرموویەتی: «مَنْ إِزْدادَ عِلْماً وَ لَمْ يَزْدَدْ هُدَىً؛ لَمْ يَزْدَدْ مِنَ اللّٰهِ إِلَّا بُعْداً»[٢] واتە: «کەسێك شان بە شانی عیلمەکەی هیدایەتی نەڕواتە سەر، ئەوە جگە لە دووربوونەوە لە خوا هیچیتر زیادی نەکردووە».

جا بزانە ئەو زانایە وا داچووە لە زانیاریدا و ژیانی لە خۆی تاڵ کردووە لە دوو شێوە بەدەر نییە، یان [بەو زانینەی]خۆی لەناو دەبا، یان بۆ هەتا هەتا بەختەوەر دەبێ.

**خەلیلی کوڕی ئەحمەدرَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێ: پیاوان چوار بەشن:**

**یەکەم:** پیاوێك کە ئەزانێ و ئەیشزانێ کە دەزانێ، ئەوە زانای ڕاستەقینەیە و ئێوە شوێنی کەون.

**دووهەم:** پیاوێك کە ئەزانێ بەڵام نازانێ کە دەزانێ، ئەوە خەوتووێکە و پێویستە بانگی کەن با هەستێ.

**سێهەم:** پیاوێك کە نازانێ و دەیشزانی کە نازانێ، ئەوە وا بە شوێن زانینەوە دەبێ فێری کەن.

**چوارەم:** پیاوێك کە نازانێ و نایشزانێ کە نازانێ، ئەوە نەزانێکی لاسارە و پێویستە خۆتانی لێ بپارێزن.

**سەفیانرَحِمَهُ اللَّهُ فەرموویە:** زانین بانگی کردەوە دەکات جا ئەگەر وڵامی دایەوە [ئەوە جێگیر دەبێ] بەڵام ئەگەر وڵامی نەدایەوە، ئەوە بار دەکات، لەمبارەشەوە خوای مەزن فەرموویەتی:

---

١. المعجم الكبير للطّبراني: ١٥١، شعب الإيمان للبيهقي: ١٧٣٢.

٢. المجالسة و جواهرالعلم للدينوري المالكي: ١٢٨٧، الفتح الكبير الى جامع الصغير للسيوطي: ١١٣٤٨.

«وَاتْلُ عَلَيْهِمْ نَبَأَ الَّذِي آتَيْنَاهُ آيَاتِنَا فَانْسَلَخَ مِنْهَا».[1] «[ئەی پێغەمبەر!] باسی ئەو کەسەیان بۆ بکە وا شارەزای کتێب و ئایەتەکانی خۆمانمان کردبوو، کەچی ئەو خۆی لێ داماڵی و دوورەپەرێزی گرت [ئیدی شەیتان شوێنی کەوت و چووە ڕیزی سەرلێشێواوەکانەوە]».

زانایانێ کە هەوڵ بۆ دوارۆژ دەدەن، ئەوانەن وا دونیا بە دین ناخۆن، پاشەڕۆژیش بە دونیا نافرۆشن چونکە ئاگاداری ئەوەن کە پاشەڕۆژ سەربەرزی پێوەیە و دونیاش سەرشۆڕی، هەرکەسێکیش زەرەر و بەرژەوەندی دنیا و قیامەتی خۆی نەزانێ، ئەوە لە ڕیزی زانایان بەدەرە.

جا هەرکەسێك باوەڕی بەمە نەبێ، ئەوە باوەڕی بە قورئان و فەرموودەکانی پێغەمبەر و بە تەواوی کتێبە ئاسمانییەکان و وتەی پێغەمبەرانیش نییە، هەرکەسیش ئەمە بزانێ و بەپێی ئەمە نەجووڵێتەوە، ئەوە وا لە داوی شەیتانا و حەز و ئارەزوو لەناوی بردووە و بەدبەختی و چارەڕەشی هاتووە بە سەریدا. هەرکەسیش وەدووی [ئەم بەناو زانایانە] بکەوێ، تیا دەچێ، جا ئیتر کەسێك پلەی ئاوەهابێت چلۆن لە ڕیزی زانایان ئەژمێردرێ؟!

**لە سکاڵاکانی حەزرەتی داوود**عَلَيْهِ السَّلَامُ **هاتووە:** [خوا بە داوود ئەفەرمێ:] ئەی داوود! ئەمن کەمترین کارێك کە ئەیکەم لەگەڵ ئەو زانایەدا کە هەوەسی بەسەر خۆشەویستی مندا زاڵە، ئەوەیە کە لە سکاڵا و پاڕانەوە بەسۆزەکانی خۆم بێبەشی ئەکەم. ئەی داوود لەبارەی زانایێکەوە کە دنیا سەرخۆشی کردووە لێم مەپاڕەرەوە، چونکە تۆیش لە خۆشەویستی من دوور دەکاتەوە، ئەوانە چەتەی ڕێگای بەندەکانی منن. ئەی داوود! ئەگەر کەسێکت دی کە بە دوای مندا وێڵە، ئەوە ببە بە خزمەتکاری. ئەی داوود! ئەگەر کەسێك مرۆڤێك بەرەو من بگێڕێتەوە کە هەڵاتووە ئەوە لە ڕیزی جیهادکەراندا نێوی دەنووسم، هەرکەسێکیش نێوی بخەمە نێو جیهادکەرانەوە ئەوە قەت سزای نادەم.

**هەروەها حەسەنی بەسری**رَحِمَهُ اللَّهُ **دەفەرمێ:** سزای زانا لە دنیادا بەوە دەدرێ کە دڵی بمرێ؛ دڵمردنیش ئەوەیە کە ئەو زانا دنیا بە دوارۆژ بستێنێ.

**حەزرەتی عومەر**رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ **دەفەرمێ:** ئەگەر دیتان زانایێك دونیا خۆشەویستە، ئەوە بە گومانەوە لەمەڕ مەسائیلی دینییەوە سەیری بکەن، چونکە هەرکەس هەرچی خۆش بوێت، تێیدا نوقم دەبێت.[2]

---

١. الأعراف: ١٧٥.

٢. فتح القدير للشوكاني: ١١٩/١.

**یەحیای کوڕی مەعاز**رَحِمَهُ اللَّهُ ڕووی دەمی لە زانا دونیاویستەکان دەکرد و دەیگوت: ئەی زانایان! کۆشکەکانتان قەیسەرییە، خانووەکانتان کەسرائییە، جل‌وبەرگتان زاهیرییە،[1] پێڵاوتان جالووتییە، چارەوێتان قاروونییە، دەفرەکانتان فێرعەونییە، پرسەو سەرەخۆشیتان جاهیلییە، ڕێبازتان شەیتانییە، ئەی چیتان موحەممەدییە؟![2] پاشان ئەم شیعرەی دەخوێندەوە:

«وَ رٰاعِي الشّٰاةِ يَحْمِي الذِّئْبَ عَنْهٰا فَكَيْفَ إِذَا الرُّعٰـاةُ لَـهٰـا ذِئٰـابُ؟!»

«شوان، ڕان لە گورگ دەپارێزێ، ئاخۆ ئەو ڕانە حاڵی چ‌بێ کە گورگی شوانە؟!»

دیسان شاعیر دەڵێ:

«يٰا مَعْشَــرَ الْقُرّٰاءِ يٰا مِلْحَ الْبَلَدِ مٰا يُصْلِحُ الْمِلْحَ إِذَا الْمِلْحُ فَسَدَ؟!»

«ئەی هۆزی خوێنەران! ئەی کەسانێ بە چەشنی خوێن لە شارا. ئاخۆ ئەگەر خوێ بگەنێ چی چارەسەری دەکات؟!»

دەسا بزانە بۆ زانای دین وا شیاوە کە جلوبەرگ و خورد و خۆراك و خانووبەرەی و هەرچی کە پێوەندی بە ژیانی دنیایەوە بێت، دەبێ لە ئاستێکی ناونجیدا بێت، ئیدی بەرەو خۆشگوزەرانی و لەشپەروەری نەڕوات، با ئەگەر بەرەو دونیا نەویستی ناڕوات بەرەو خۆشگوزەرانیش نەڕوا. زانای ڕاستەقینە پێویستە بۆ ئەوەی تووشی گێچەڵ نەبێت، خۆی لە سەردانی دەسەڵاتدارەکان و دەوڵەمەندەکان بپارێزێ.

## بەشی شەشەم: نرخ و بایەخی عەقڵ:

عەقڵ سەرچاوەی زانینە. ئەو فەرموودەی پێغەمبەرصَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ گەورەیی عەقڵ دەگەیێنێ کە دەفەرموێ:

«أَوَّلُ مٰا خَلَقَ اللهُ الْعَقْلَ فَقٰالَ لَهُ أَقْبِلْ فَأَقْبَلَ ثُمَّ قٰالَ لَهُ: أَدْبِرِ فَأَدْبَرَ فَقٰالَ: وَ عِزَّتِي وَ جَلالِي مٰا خَلَقْتُ خَلْقًا أَكْرَمَ عَلَيَّ مِنْكَ، بِكَ آخُذُ وَ بِكَ أُعْطِي وَ بِكَ أُثِيبُ وَ بِكَ أُعٰاقِبُ»[3].

---

١. زاهیر یان تاهیر بە عەبدوڵڵای کوڕی تاهیری کوڕی حوسەین نەڵێن کە جلکی زۆر شۆڕ بووە.

٢. نضرة النّعيم فى مكارم أخلاق الرسول الكريم: حرف القاف / من الآثار و اقوال العلماء فى ذم القدوة السّيئة.

٣. المعجم الكبير: ٤٤٨ والأوسط: ١٩١٤ للطبراني، شعب الإيمان للبيهقى/٤٤٥٧.

واته: «هەووەڵین شتێ کە خوا دروستی کرد عەقڵ بوو، جا پێی فەرموو: ڕووم تێ بکە! ئەویش ڕووی لە خوا کرد، پاشان پێی فەرموو: پشتم لێ بکە! ئەویش پشتی لێ کرد. پاشان خودا فەرمووی: سوێندم بە مەزنی و گەورەیی خۆم، تا ئێستا هیچ شتێکم دروست نەکردووە بە قەدەر تۆ بەلامەوە بەڕێز بێت، بەپێی تۆ لە خەڵك دەستێنمەوە و بەپێی تۆ پێیان دەبەخشم، بە گوێرەی تۆ لە قیامەتدا پاداش دەدەمەوە و بە گوێرەی تۆ سزاش دەدەم».

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «سَأَلْتُ جِبْرِيلَ: مَا السُّؤْدَدُ؟ قَالَ: اَلْعَقْلُ»[1]: «پرسیارم لە جوبرەئیل کرد: گەورەیی چییە؟ فەرمووی: عەقڵە».

حەقیقەتی عەقڵ ئەوەیە کە: هێزێکی سروشتییە کە بە هۆی ئەوەوە دەتوانرێ زانیارییە نەزەرییەکان دەرك بکرێ، عەقڵ ڕووناکییێکە کە هاوێژراوەتە نێو دڵەوە کە توانایی دەرکی شتەکانی هەیە، عەقڵیش کەم و زیاد دەکات بە کەم و زیادبوونی ئەو هێزە سروشتییە [کە خودا دەیرژێنێتە دڵی مرۆڤەوە].

والله أعلم

١. بغية الحارث للحارث بن‌ابی‌اسامة: ٨٤٦، المطالب العالية لابن‌حجر العسقلانی: ٢٧٧٦.

# بابەتی دووهەم: عەقیدە و باوەڕ

## بەشی یەکەم: بیر و بڕوای ئەهلی سوننەت

ئەهلی سوننەت لەسەر ئەو باوەڕەن کە خوای گەورە و مەزن: تاك و بێ هاوەڵە، یەکە و بێ وێنەیە، بێ دژ و بێ نیازە، تاقێکی بێ هاوتایە، قەدیمێکی بێ هەووەڵە، هەربووە و بوونی بێ سەرەتایە، بەردەوامیش دەبێ و بوونی بێ کۆتاییە، هەردەبێ و بێ دواییە، ڕاگر و سەرپەرشتیارێکی بێ بڕانەوەیە، بەردەوامێکە بێ دابڕانە، هەمیشە خاوەنی سیفەتە گەورەکانە، وێڕای بڕانەوەی زەمان و لەناوچوونی کەوناراکان قەت وەبەر یاسای لەناوچوون و بڕانەوە ناکەوێ، بەڵکوو ئەو خۆی ئەووەڵ و ئاخرە، دیار و نادیارە.

### بەری بوونی خودا لە عەیب:

خودای مەزن جەستەی نییە و بێ نیگارە، نە جەوهەری ئەندازەدارە، نە جێی جەوهەرەکانە، نە عەرەزە و نە جێی عەرەزەکانە، بەڵکوو: بێ وێنەیە، نە بوونەوەر لە ئەو دەچێ، نە ئەو لە بوونەوەر دەکا، نە ئەندازە لەبەری دەگرێ نە چوار قوڕنە لەخۆی دەگرێ، بێ سووچ و بێ سەر و ژێرە، نە ئاسمان، نە زەوییەکان خۆیان وەپاڵی نەداوە، بەڵکوو بەسەر عەرشی خۆیدا ـ بەو شێوە کە خۆی گوتوویە و بەو ماناکە خۆی ویستوویە ـ زاڵە، ئەو زاڵبوونەشی لە جێگیربوون و جێ گۆڕکێ و دابەزین و وێکەوتن و مانەوە لە شوێنێکدا بەدوورە، عەرش ئەوی هەڵنەگرتووە، بەڵکوو عەرش و ئەو مەلائیکانەی عەرشیان هەڵگرتووە، هەموویان بە لوتفی قودرەتی خوا ڕاگیراون و لە ژێر دەسەڵاتی ئەودان.

خودای مەزن وا لە سەرەوەی عەرشەوە، وا لەسەری هەموو شتێکەوە، لە بنی زەویـەوە [تا سەری ئاسمانەکان]، کەچی ئەم لە سەرەوەبوونەشی نە لە عەرش و ئاسمان نزیـکی ئەخاتەوە نە لە زەوی و خاك دووری دەخاتەوە، بەڵکوو ئەو هەر بەو ئەندازە کە لە عەرشەوە بەرزە لە زەوینیشەوە بەرزە، جا خوا لەگەڵ ئەوەشدا کە چەندە بەرزە، نزیـکە بە هەموو بوونەوەرێکەوە، بە بەندەکانیەوە لە ڕەگی بناگوێ نزیـکترە. خودای مەزن ئاگاداری هەموو شتێکە، چونکە دوور و نزیـکی ئەو چەشنی دوور و نزیـکی جیسم نییە، هەر وەکوو چۆن زاتی [پیرۆزی] لە جیسم ناچێ، ئەو نە جێیە بۆشت و نە شت لەوا جێ دەگرێ، ئەو مەزنترە لەوە شوێن لە خۆیـدا دایبگرێ، هەر وەکوو چۆن گەورەترە لەوەی کە زەمان لە نێوی جەغزی خۆی باوێ، بەڵکوو خوا پێش‌بوونی زەمان و مەکان بووە، ئێستاش وا لەسەر ئەو شێوەیە کە لەسەری بووە، ئەو لەبەر ئەو سیفاتانەی کە هەیەتی، لە تەواوی دروست‌کراوەکانی خۆی جیایە، لە زاتی ئەودا جگە لە زاتی نەبێ چیتری تێدا نییە و زاتی ئەو لە غەیری خۆیـدا نییە.

خوای مەزن لە هەموو ئاڵوگۆڕ و گۆڕانکاری بەدوورە، تازەکاری بەسەریـدا نایـێ و جێی هیچ عەرەزێ نییە، بەڵکوو لە ئەوپەڕی گەورەییدا دوورە لە فەوتان، بە بۆنەی سیفاتە تەواوەکانیەوە بێ‌نیازە لە هەر تەواوبوونێك، خودای مەزن بە گوێرەی زاتی خۆی [لە دونیادا] بە عەقڵ دەرك ئەکرێ و لە بەهەشتدا بە چاوی سەر ئەبینرێ، ئەمەش لوتفێکە خودا لەگەڵ بەندە چاکەکانی خۆیـدا کردوویـەتی و بۆ تەواوکردنی نیعمەتەکانی خۆی بەسەریانەوە، ڕێی داوە بۆ زاتی پیرۆزی بڕوانن.

## دەسەڵات و هەمیشە زیندووبوونی خوا:

خودای مەزن هەمیشە زیـندوویـێکە کە بەسەر هەمووشتێکدا دەسەڵات و قودرەتی هەیە و زاڵە، هیچ‌کاتێ کەم‌وکووڕی و ناتەوانی نایێتە بەر کاری، نە خەو و نەخەوەنووچکە نایباتەوە، نەمان و مەرگ بۆی لەگۆڕێدا نییە، خوای مەزن، خاوەنی ئەم دنیا و ئەو دنیایە، گەورە و بە شکۆیـە، دەسەڵات و هێز هەمووی هی ئەوە، عالەمی دیار و عالەمی نادیار هەر هی ئەوە، تەنیا خۆی بە تەنیایی ئەم بوونەوەرەی خستۆتە ڕوو و دای‌هێناوە، هەر ئەوە داهێنەر و بەدیهێنەر، بوونەوەر و کردەوەکانیان ئەو هێناونی و [بۆ هەرکامیان بەتایبەتی] بژێو و کات و ساتی مەرگیشی دیاری کردووە. نە دەسەڵاتی دوایـیی بۆ هەیە و نە زانیاریشی لە ئەژمار دێ.

## عیلم و زانیاری خوا:

خودای مەزن ئاگاداری هەموو شتێکە، پانتای زانینی، هەمووشتێك لە بنی زەوینەوە تا سەری ئاسمانەکان لەبەر دەگرێ، هیچ شتێك تەنانەت وردە زەڕڕەی بەر خۆرەتاویش چ لە زەوین و چ لە ئاسماندا لە قەڵەمی عیلمی خوادا ناکەوێ. خوا لە تەقەی پێی مێلوورە ڕەشە لە تاریکە شەودا بە سەر بەردی سافەوە ئاگادارە. ئاگای لە جووڵەی ئەو زەڕڕاتە کە لە ئاسماندا وێڵن هەیە، ئاگایە لە هەرچی ڕاز و نهێنییە، خەبەری لە خەڵێڵەی دڵ و هەرچی بە دڵ و مێشکدا تێپەڕێ و هەرچی ڕازی شاراوە هەیە. جا ئەم زانینەی خوا کە باسمان کرد لە ئەزەلەوە بووە و زانیارییێك نییە کە بەهۆی گۆڕانکاری و ئاڵوگۆڕەوە لە زاتی خودا پەیدا بووبێت.

## ویستی خودا (الإرادة):

خودای مەزن ئەم بوونەوەرەی ویستووە و تەگبیری هەموویانی کردووە، لە عالەمی جیسمدا و لە عالەمی ڕۆحدا هیچ شتێ نە کەم نە زۆر، نە چووکە نە گەورە، نە خێر نە شەڕ، نە زەرەر نە بەرژەوەندی، نە ئیمان نە کوفر، نە ناسین و نە نەناسین، نە بەزین و نە سەرکەوتن، نە کەم و نە زیاد، نە تاعەت و نە گوناح، هیچکامیان بەبێ ویستی خودا و بەبێ دەسەڵات و حیکمەتی ئەو، پێکیان نایێت. هیچ شتێ تەنانەت چاوترووکان و خەیاڵی دڵیش لە ژێر ویستی خوا دەرناچن. هەرچی ویستبێت بووە و هەرچیشی نەویستبێت نەبووە، چونکە هەر خۆیە هەمووشتی هێناوەتە بوون و هەرخۆشی پاش مەرگ هەمووکەس زیندوو دەکاتەوە، هەر ئەوە هەرچی بیەوێ دەیکات.

هیچ هێزێ بەر فەرمانی ناگرێ و فەرمانی وەدوا ناخات. ئەگەر بەندەیێ تاوانێ بکات هیچ ڕێیێکی بۆ دەربازبوون لە ئەنجامی ئەو تاوانەی نییە، جگە بەزەیی و یارمەتی خۆی نەبێت، هەروەها هیچ بەندەیێ هێزی عیبادەتکردنی نییە مەگەر بە ویست و خۆشەویستی ئەو.

ئەگەر سەرجەمی جنۆکە و بەشەر کۆببنەوە و پاڵ ڕێك بدەن لەسەر ئەوەی بەبێ ویستی خوا زەڕڕەیێك بخەنە جووڵە یان لە جووڵەی بخەن، ئەوە ناتوانن و دائەمێنن. ئیرادە

و ویستی خوا وێڕای سیفەتەکانیتری لەگەڵ زاتی خوا تێکەڵە و بەردەوام وا لەگەڵیدا. بەو شێوە کە خوای مەزن لە ئەزەلەوە ویستوویەتی، بەبێ پاش و پێش هاتۆتەدی. خودای مەزن تەگبیری تەواوکردنی کارەکان بە تەرتیب و نەزمی فیکر و چاوەڕوانی زەمان ناکات [واتە وەکوو مرۆڤ نییە کە بە پێی زەمان و بە پێی هەلومەرجی بیرکردنەوە، لەبارەی کارەکانەوە تەگبیر بکات] هەر بەم بۆنەوەیە ئیشێك لەگەڵ ئیشێکیتردا تێکەڵ نابێت و سەرقاڵبوون بە کارێکەوە لە کارێکیتری ناکات.

## هێزی بیستن و بینین:

خودای مەزن بیسەر و بینەرە و دەبیسێ و دەنوارێ، هیچ لە بەرگوێی داناکەوێ هەرچەندەش بێدەنگ بێ، هەروەها هیچ شتێ لە بەرچاوی ون نابێت هەر چەندەش ورد بێت، نە دووری بەری بیستنی دەگرێت و نە تاریکی بەری دیتنی. بەبێ گلێنە و پێڵوو دەڕوانێ و بەبێ گوێ دەبیسێ وەکوو چۆن بەبێ دڵ شت دەزانێ و بەبێ دەس، دەس ئەوەشێنێ. بەبێ کەرستە و ئامراز شت بەدی ئەهێنێ، چونکە نە سیفاتی لە سیفاتی بوونەوەر دەچێ نە زاتیشی لە زاتی ئادەمیزاد دەچێ.

## ئاخاوتن (سیفەتی کەلام):

خودای مەزن بە کەلامی ئەزەلی خۆی دەئاخێوێ و ئەمر و نەهی و مزگێنی و هەڕەشە دەکات و ئەو فەرموودانەشی قەدیمین و لە زاتی خۆین و گوفتار و قسەی وەکوو قسەی ئادەمیزاد نییە، واتە: ئاخاوتنی ئەو دەنگێك نییە کە بە هۆی شکانەوەی هەواییك یان پێوە تەقینی جیسمێ لەگەڵ جیسمێتردا پەیدا ببێت، یان پیتێ نییە کە بەهۆی وێکەوتنی لێوەکان یان زمانجووڵانەوە دروست ببێت.

سەرجەمی قورئان و تەورات و ئینجیل و زەبوور و ئەو کتێبانەی کە بۆ سەر پێغەمبەرەکان هاتوونەتە خوار کەلامی خودان. قورئان وێڕای ئەوەی کە بە زمان ئەخوێنرێتەوە و لەنێو پەڕاودا ئەنووسرێ و لە مێشکدا لەبەر دەکرێ، قەدیمە و لەگەڵ زاتی خودادایە، ئەو خوێندنەوە و نووسینەوەش لە ئەوی جودا ناکاتەوە.

حەزرەتی مووساش عَلَيْهِ السَّلَامُ قسەی خودای ئەبیست بەبێ ئەوەی ئەو قسانە دەنگ و پیت و وشە بن، هەروەکوو چۆن پیاوچاکان بە چاوی سەر خوا دەبینن بەبێ ئەوەی خوداش جەوهەر و عەرەز بێت و لەم جیسمانە بچێت. جا وەختێ خودای مەزن خاوەنی ئاوەها سیفاتێ بێت، دیارە بەردەوام زیندووە و زانایە و دەسەڵاتدارە و بینەر و بیسەر و وێژەرە. [جا لێرە پێویستە ئەوە ڕوون بکرێتەوە کە] ئەم سیفەتانە لەبەر ئەوەیە سەرچاوەکەیان کە دەبێتە: (حياة، علم، قدرة، إرادة، سمع، بصر، كلام) لەزاتی خودا هەیە نەك تەنیا بوونیان بەسرابێتەوە بە زاتی خواوە.

## ئیشەکانی خوا:

ئەوە بزانە کە هیچ شتێ بوون پەیدا ناکا مەگەر ئەوەی بە دەستی خوا هاتۆتە دی و لە عەدڵ و دادپەروەری خوداوە بە جوانترین و تەواوترین و ڕێکوپێکترین شێوە سەرچاوەی گرتووە. خودای مەزن کاربەجێیە و لە ئەو حوکمانە کە بۆ بوونەوەر دەری دەکات، دادپەروەرە، عەداڵەت و دادپەروەری خواش بە شێوەی دادپەروەری مرۆڤ نییە، چونکە لە مرۆڤەوە چاوەڕوانی زوڵم و دەستدرێژی بۆ ماڵ و موڵکی خەڵك دەکرێ، بەڵام بۆ خوا شتی ئاوەها بەدی ناکرێ چونکە غەیرەیێك نییە تاخوا بەسەر موڵکی ئەودا دەستدرێژی بکات. ئەو شتانەی کە جگە خودان واتە: ئینسان و جنۆکە، شەیتان و پەری، ئاسمان و زەوی، زیندەوەران و گیاو شتە بێگیانەکان، جەوهەر و عەرەز، ئەو شتانەی کە لە مێشك‌دان و ئەوانەش کە لە دنیای دەرەوەدان، ئەمانە هەموویان خوا بەهێزی بەدیهێنەری خۆی، لە نەبوونەوە هێناونیە بوون و لە پاش ئەوە کە هەر نەبوون دروستیانی کردووە.

ئەم کارانەی سەرەوە بۆیە ڕەوایە چونکە تەنیا خودای مەزن لە ئەزەلدا بووە و کەسی لەگەڵدا نەبووە. جا لەبەر ئەوەی دەسەڵاتی خۆی بنوێنێ و ئەو شتەی وا پێشتر ویستبووی بەدی بێنێ، ئەم گەردوونەی هێناوەتە گۆڕ. جا نەك لەبەر ئەوەی پێویستی پێ بێت بەڵکوو بۆ ئەوەی ئەو ئیرادە و ویستە ئەزەلییەی بێنێتە دی. خودای مەزن ئەم خەلق و داهێنان و سەرجەمی ئەم ئیشانەی کە ئەنجامی داون لەبەر ئەوە نەبووە کە پێی مەجبوور بووە، بەڵکو لە ڕووی لوتف و گەورەیی خۆیەوە کردوویە، هەر وەکوو چۆن ڕزق و ڕۆزی و چاك و پوختکردنی ئەم بوونەوەرانە لەسەری پێویست نییە و بەس بە کەرەمی خۆی دەیکات. جا

خۆ ئەگەریش ـ هەر وەکوو چۆن ڕزق و ڕۆزییانی داوە ـ بەڵا بەسەریاندا ببارێنێ هەر بە عەدڵ و دادپەروەری حەسابی بۆ دەکرێ.

خودای مەزن ئەو بەندانەی کە تاعەت و عیبادەتیان بۆ کردووە بە کەرەم و فەزڵی خۆی پاداشیان ئەداتەوە نەك لەبەر ئەوەی ئەوان حەقیان بەسەر خواوەوە بێت، یان خوا لەسەری بێت کە پاداشیان بداتەوە. خودای گەورە تاعەت و عیبادەتی لەسەر زوانی پێغەمبەرانەوە بەسەر بەندەکانیدا واجب کردووە، نەك تەنها لەبەر داخوازی و داکۆکی کردنی عەقڵ لەسەر ئەو عیبادەتانە؛ بەڵکوو خوا پێغەمبەرەکان و نوێنەرەکانی خۆی نارد و بە موعجیزە ئاشکراکانیان، ڕاستییانی وەدەرخست و ئەمر و نەهی و مزگێنی و هەڕەشەکانی لە زوان ئەوانەوە بە خەڵك ڕاگەیاند، جا بەمپێیە لەسەر مرۆڤی واجب گێڕا کە ئیمان و باوەڕیان بە وتەی ئەو پێغەمبەرانە ببێت.

## مانای وشەی دووهەم لە ڕستەی پیرۆزی «شهادتین»

مانای ئەم وشە دووهەمینە ئەوەیە کە "شایەتی بدەی کە حەزرەتی موحەممەد ﷺ نێردراوی خودایە و خودا ئەوی کە نەخوێنەوار بوو و سەر بە هۆزی قوڕەیش بووە بە نوێنەرایەتی خۆی ناردووە تا بە قورئان هیدایەت و ڕێنوێنی تەواوی گەلی عەرەب و عەجەم و جنۆکە و بەشەری پێ بدا. خوای مەزن بە شەرعی ئەم پێغەمبەرە دین و یاساکانی باقی پێغەمبەرەکانی‌تری بەتاڵ کردەوە، جگە ئەو باسانەی کە خۆی دایناوە کە هەڵنەوەشێنەوە. هەروەها حەزرەتی موحەممەدی کردووە بە گەورەی بەشەر و پلەی لە تەواوی پێغەمبەرەکان بەرزتر کردۆتەوە، تەنانەت ئیمانی بە تەنها وتنی وشەی تەوحید «لا إِلٰهَ إِلَّا اللّٰهُ» ناتەواو داناوە، مەگەر ئەوەی کە شایەتی لەسەر نێردراوی پێغەمبەر بدرێ واتە: ئەم وتەیە: «مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللّٰهِ» بخرێتە پاڵیەوە. هەروەها خوای گەورە لەسەر جنۆکە و بەشەری واجب کردووە کە باوەڕیان بە تەواوی ئەو هەواڵانەی کە پێغەمبەر لە بارەی دونیا و قیامەتەوە هێناویە، ببێت. ئیمانی ئیماندار تەواو نابێت مەگەر ئەوەی کە باوەڕی بە تەواو ئەو هەواڵانەی کە پێغەمبەر لەبارەی پاش مەرگەوە هێناویە، ببێت. ئەووەڵین ڕووداوی پاش مەرگیش، کە پێویستە ئیمانمان پێ هەبێ: پرسیاری "منکر و نکیر"ە، ئەم دوانەش: جووتێ مەلائیکەن کە زۆر بەسام و ترسناکن،

دێنە نێو قەبرەکە و مردووەکە ـ کە بووەتەوە خاوەنی ڕۆح و جەستە ـ ڕاست دەکەنەوە و دەست دەکەن بە پرسیارکردن لەبارەی تەوحید و ڕیسالەتەوە، لێی دەپرسن: خوات کێیە؟، لەسەر چ دینێکی؟، پێغەمبەرت کێیە؟.[1] ئەم دوو فریشتەیە دوو پرسیارکەری نێو گۆڕن، پرسیارەکانیشیان ئەووەڵین تاقیکاریی پاش مەرگە.

هەروەها پێویستە ئیماندار باوەڕی بە ئەشکەنجە و جەزرەبەی نێو گۆڕ ببێت و لەسەر ئەو باوەڕە بێت کە ئەو ئەشکەنجانە حەقن و حوکمێکی دادپەروەرانەیە کە لەسەر جەستە و ڕۆح ـ بەویستی خودا ـ بەڕێوە دەچێ. هەروەها پێویستە باوەڕی بە زیندووبوونەی پاش مەرگ ببێت و لەسەر ئەو باوەڕە بێت کە خوای گەورە ئەو ئێسکە پورتووکاوانە زیندوو دەکاتەوە هەر وەکوو چۆن سەرەتا لە هیچەوە دروستیانی کردووە. ڕۆحیش دەگەڕێتەوە بۆ نێو جەستە، هەر بەو شێوەی کە پێش مەرگ تێیدا بوو و دەبێتەوە ئینسانێکی ساغ و ڕێکوپێك.

هەروەها پێویستە باوەڕی بە تەرازووی بازاڕی قیامەت ببێ کە دوو کەفە و زوانەیێکی هەیە، ئەم دوو کەفەیە لە گەورەییدا بە قەدەر حەوت تەبەقەی ئاسمان و زەوین دەبێ و لەنێویاندا ـ بە هێز و دەسەڵاتی خوا ـ کردەوەی ئینسان و جنۆکە کێشانە دەکرێ. جا بۆ ئەوەی دادپەروەریی خوا بە بەندەکانی بسەلمێ، ئەو تەرازووە وردە زەڕڕەی بەرخۆرەتاو و دانەی خەردەل (واتە: هەموو شتێکی سووك) کێشانە ئەکات.

جا لاپەڕەی کردەوە چاکەکان دەخرێتە نێو تای نوور و بە ئەندازەی پلەی ئەو چاکانە کە خوا دیاری کردوون، تەرازووەکە بە فەزلی خودا قورس دەیکێشێ. لاپەڕەی کردەوە خراپەکانیش لە تای تاریك دەهاوێژرێ و تەرازووەکە ـ بە هێزی دادپەروەرانەی خوا ـ سووك دەیکێشێ.

[واتە: کردەوە چاکەکان لەنێو نوور دەخرێ تا هەموان چاویان پێوە بێ، کردەوە خراپەکانیش لەنێو تاریکی دەخرێ تا دیار نەبێت، وە هەردوو ئەمانە لە ڕۆی فەزل و عەدلی خودایە].

ئینسانی ئیماندار پێویستە باوەڕی بە ڕۆژی قیامەت ببێت و باوەڕی بە پردی سیرات ببێ. پردی سیرات: پردێکە لەسەری جەهەننەم خراوە و لە شیر تیژتر و لە موو باریکترە،[2] پێی کافرەکان لە سەری دەخلیسکێت و بەرەو ناو ئاوری جەهەننەم شۆڕ دەبنەوە، بەڵام پێی ئینسانە ئیماندارەکان مەحکەم لەسەری ڕادەوستێ و بەرەو بەهەشت ڕوانە دەکرێن.

---

١. احمد: ١٧٨٧٢، مسلم: ٥١١٧، ابوداود: ٤١٢٧، ترمذی: ٣٠٤٥، نسائی: ٢٠٣٠، ابن‌ماجە: ٤٢٥٩.

٢. مسلم: ٢٦٩، احمد: ٢٣٦٤٩، بیهقی: ٣٨٥، ابن‌حبان: ٧٥٠١.

مرۆڤی ئیماندار پێویستە باوەڕی بە "حەوزی مەورووود" ببێت و بزانێ کە ئەو حەوزە تەنها خەڵاتی پێغەمبەری ئێمە حەزرەتی موحەممەدصَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ کراوە و بڕواداران پێش ئەوەی بڕۆنە نێو بەهەشت و پاش ئەوەی لە پردی سیرات تێپەڕێن، لەو حەوزە دەخۆنەوە. هەرکەسیش لەو ئاوە بخواتەوە قەت تینووی نابێ، پانایی ئەو حەوزە مانگە ڕێیەکە، ڕەنگی لە شیر سپیترە، لە هەنگوێن شیرینترە، پەرداخ و جامۆڵە بە ئەندازەی ئەستێرانی ئاسمان بە دەوریدا داچنراون، دوو پلووسکی لێیە کە لەنێویانەوە ئاو لە حەوزی کەوسەرەوە دێت و دەڕژێتە ناوی.[1]

مرۆڤی بڕوادار پێویستە باوەڕی بە حسێب و کتێبی قیامەت ببێت و لەو باوەڕەدا بێت کە جیاوازی لە حیساب و کیتابا هەیە بەم شێوە: هەندێك لەسەر حسێبەکەیان کێشەو گیروگرفت هەیە، هەندێك چاوپۆشی لێ‌دەکرێ، هەندێکیش بە بێ‌ئەوە لێیان بپرسرێتەوە دەچنە بەهەشتەوە، ئەم چینەش موقەڕڕەبین و نزیکانی بارەگای خوان. لەو ڕۆژەدا لە پێغەمبەران پرسیار دەکرێ کە چلۆن تەبلیغیان کردووە؟ هەروەها خوای گەورە لە هەر کافرێکیش کە مەیلی هەبێ پرسیار دەکات کە بۆچی بە وتەی پێغەمبەران باوەڕتان نەکرد؟ لە ئەهلی بیدعەت لە بارەی سوننەتەکانی پێغەمبەرەوە پرسیار دەکرێ و سەرجەم لە تەواوی موسڵمانەکان بە تێکڕا لە بارەی کردەوەکانیانەوە پرسیار دەکرێ.

پێویستە مرۆڤی ئیماندار بڕوای بەوە بێت کە ئەوانە خواپەرست بوون پاش ئەوەی تۆڵەی کردەوە خراپەکانیان لێ سنرایەوە لە جەهەننەمدا نایانهێڵنەوە و ڕزگاریان ئەبێ، بەجۆرێ کە لە سایەی ڕەحمی خواوە هیچ بڕوادارێ لە جەهەننەمدا نامێنێتەوە. پێویستە باوەڕی بەوە هەبێت کە پێغەمبەران لە پێش هەموو کەسدا شەفاعەت دەکەن پاشان زانایان جا شەهیدان جا هەرکام لە موسڵمانان بەپێی پلە و پایەی خۆی بۆ گونەهباران تکا دەکات.

هەر موسڵمانێکیش بمێنێتەوە و کەس نەبێ تکای بۆ بکا ئەوە بە کەرەمی خوا لە جەهەننەم ڕزگاری دەبێ و تێدا نامێنێتەوە، بەڵکوو هەر کەسێك بە زەڕڕە ئیمان لە دڵیدا بێت لە جەهەننەم [درەنگ یان زوو] ڕزگاری دەبێ.

پێویستە [بڕوادار] لەسەر ئەو باوەڕە بێت کە هاوەڵەکانی پێغەمبەرصَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بە تێکڕا هەموویان خاوەن ڕێزن و هەرکامیان پلەی تایبەتی خۆیان هەیە. بڕوای بەوە بێت کە

---

١. مسلم: ٣٦٦_٤٢٥٥، ترمذی: ٢٣٦٨، ابن‌ماجه: ٤٢٩٣، احمد: ٢١٣٢٣.

مەزنترین مرۆڤ پاش پێغەمبەرﷺ ئا بەم ڕیزەیە: ئەبووبەکر جا عومەر جا عوسمان جا عەلی - ڕەزاو ڕەحمەتیان لەسەر بێت -.[1] هەروەها پێویستە بەچاوی ڕێزەوە سەیری هەموو سەحابەکانڕضي الله عنهم بکات و باسی چاکیان بکات هەر وەکوو چۆن خوا و پێغەمبەر تاریفی ئەوانیان کردووە.

سەرجەمی ئەم باسانە کە کردمان پشتی بە حەدیس و فەرموودەکانی پێغەمبەرﷺ ئەستوورە. کە وابوو هەرکەس بە دڵدامەزراوییەوە بڕوای بە تەواوی ئەمانە هەبێت، ئەوە دڵنیا بێت کە لە ڕیزی ئەهلی حەق و لە کۆمەڵەی شوێنکەوتوانی پێغەمبەرﷺ دەژمێردرێ و لە دەستەی ئەهلی بیدعەت دوورە. لە خوا داواکارین دڵی ئێمەو سەرجەمی موسڵمانەکان دابمەرزێنێت و بە یەقینێکی تەواومان بگەیێنێ، بەڕاستی هەر خۆیە لە هەموو کەس بەزەیی زۆرترە.

## بەشی دووهەم: پەروەردە و ڕێنوێنی، پلە بە پلە

پێویستە بزانی کە خوا وا مرۆڤی خولقاندووە کە لە سەرەتای منداڵییەوە بە بێ‌ئەوەی دەلیل و بەڵگەی بۆ بهێنیتەوە، ئامادەیە بۆ ئەوەی حەق و ڕاستی قەبووڵ بکات. جا با هەر لەو سەردەمەدا مەسائیلی عەقیدەیی لە بەردەس بخرێ و بۆی مانا بکرێتەوە تا لەبەری بکات.

ئیدی لەوە بەدوا وردە وردە خۆی لێی تێدەگات و لەدڵیدا جێگیر دەبێت، ئیتر نیازی بە بەڵگە و سەنەد نییە بۆی بسەلمێنی. پێویستە مرۆڤی عاقڵ بەو ئەندازەی کە قەناعەتی پێ بکا بە شوێنی بەڵگەهێنانەوە بێت و زۆر تێیدا دانەچێت. قەناعەتیش بەوە دەڵێن کە ئەگەر چەند جۆر باس هاتە پێشەوە ئەوەندە بەڵگەی بە دەستەوە بێت کە شك و گومان لە دڵیدا لاببات.

بەڵام ئەو شێوە کە هەر لە سەرەتاوە لە عیلمی کەلامدا دابچێ، وەکوو ئەو پیاوە وایە [هەوەڵ جار، پێش ئەوەی تا ئێستا مەلەی کردبێ] خۆی لە بەحرێك باوێژێ و بیەوێ مەلە بکات. ئەوە هەرکاتێ گوێ بۆ شوبهەیێك شل بکات سەری لێ ئەشێوێ و بڕوای ئەگۆڕێ. بەڵێ ئەوە ڕاستە کە پێویستە هەندێ کەس زۆر بە عیلمی کەلامەوە خۆیان ماندوو بکەن

---

١. ابوداود: ٤٠١٢، بخاري: ٣٣٨٢، شرح النووي على مسلم: في فضائل الصحابة.

بۆ ئەوە ئەگەر پێویست بوو، وڵامی بێدینی پێ بدرێتەوە و ئەگەر شك و دڕدۆنگی پەیدا بێت، لەناوی ببات.

## بەشی سێهەم: مانای ئیسلام و ئیمان

ئیسلام واتە: دانپێدانان و ملکەچ بوون. ئیمانیش واتە: بە دڵ قەبووڵکردن. خوای گەورە لە قورئاندا یەکجار باسی کردوون و مەبەستی یەك مانا بووە؛ فەرموویەتی: ﴿فَأَخْرَجْنَا مَنْ كَانَ فِيهَا مِنَ الْمُؤْمِنِينَ ۝ فَمَا وَجَدْنَا فِيهَا غَيْرَ بَيْتٍ مِنَ الْمُسْلِمِينَ ۝﴾.[1]

واتە: «ئێمە سەرجەمی ئیماندارانێك كە لە [شارەکەی هۆزی لووتدا] بوون هێنامانە دەر. دەی جگە لە ماڵێك نەبێ کە موسڵمان بوون کەسمان دەس نەکەوت».

خۆ دیارە جگە لە ماڵێکیش نەبێ چیدی تێدا نەبووە. جاریێتر لە شوێنێکیتر بە دوو مانای جیاواز باسیان دەکات: ﴿قَالَتِ الْأَعْرَابُ آمَنَّا قُلْ لَمْ تُؤْمِنُوا وَلَٰكِنْ قُولُوا أَسْلَمْنَا﴾.[2]

واتە: «عەرەبە دەشتەکییەکان گوتوویانە: ئێمە ئیمانمان هێناوە، تۆ پێیان بڵێ: ئێوە ئیمانتان نەهێناوە بەڵکوو بڵێن: موسڵمان بووین».

واتە ئێوە دانتان بەوە ناوە بەڵام دڵتان دانەمزراوە.

---

١. الذاريات: ٣٥.

٢. الحجرات: ١٤.

# بابەتی سێهەم: ڕاز و نهێنییەکانی تەهارەت و خاوێنی

پێغەمبەرصَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فەرموویەتی: «اَلْوُضوءُ شَطْرُ الْإِيمٰانِ»[1] واتە: «دەستنوێژ بەشێکە لە ئیمان».

هەروەها پێغەمبەرصَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فەرموویەتی: «مِفْتٰاحُ الصَّلاةِ الطُّهُورُ»[2] واتە: «کلیلی نوێژ پاکی و دەسنوێژە».

دیسان پێغەمبەرصَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فەرموویەتی: «بُنِيَ الدِّينُ عَلَى النَّظٰافَةِ»[3] واتە: «بناغەی دین لەسەر پاك و خاوێنبوون دامەزراوە».

خوای گەورەیش فەرموویەتی: ﴿فِيهِ رِجٰالٌ يُحِبُّونَ أَنْ يَتَطَهَّرُوا﴾[4]. واتە: «لەوێدا پیاوانێك هەن حەز دەکەن [ڕواڵەت و دەروونی] خۆیان خاوێن ڕابگرن».

## خاوێنی چوار پلەی هەیە:

**یەکەم:** خاوێنکردنەوەی ڕواڵەتی ئەندامەکان لە پیسی.

**دووهەم:** خاوێنکردنەوەی ئەندامەکان لە گوناح و تاوان.

**سێهەم:** خاوێنکردنەوەی دڵ لە ئاکاری دزێو و نالەبار.

**چوارەم:** خاوێنکردنەوەی دەروون لە غەیری خوا. ئەم جۆرە تەهارەتە تایبەتی پێغەمبەران و پیاوچاکانە.

---

١. ترمذی: ٣٤٣٩، نسائی: ٢٣٩٤، ابن‌ماجە: ٢٧٦. و فی روایة مسلم و احمد: «الطُّهُورُ شَطْرُ الْإِيمٰانِ».

٢. ابوداود: ٥٦ ـ ٥٢٣، ترمذی: ٣، ابن‌ماجە: ٢٧١، احمد: ٩٥٧.

٣. کشف الخفاء للعجلونی: ٩٢٢.

٤. التوبة: ١٠٨.

جا هەرکام لەم جۆرە تەهارەتانە، نیوەی کردەوەکەیە. لە هەر پلەیێکدا ـ بە گوێرەی ئەو پلەیە ـ خۆ ڕازاندنەوەییێك و خۆ خاڵیکردنەوەییێکی تێدایە. خۆ ڕازاندنەوەکە نیوەی کردارەکەیە چونکە ئەو نیوەکەیتر لەسەر ئەم بەستراوەتەوە. خوای مەزن بەمە ئاماژە دەکات کە دەفەرمێ: ﴿قُلِ اللَّهُ ثُمَّ ذَرْهُمْ فِي خَوْضِهِمْ يَلْعَبُونَ﴾.[1]

واتە: «لە وڵامیاندا تۆ بڵێ: خوا، پاشان لێیان گەڕێ با لەناو بەتاڵی و پووچی خۆیاندا ڕۆ بچن و بگەوزێن».

ئەوە کە خوا فەرموویەتی: «ذَرْهُمْ» واتە: وێڵیان بکە و لێیان گەڕێ، ئەوە خاڵیکردنەوەی دەروونە لە غەیری خوا. دڵیش هەروەها ئەیەوێ لە ئاکاری نالەبار خاوێن بکرێتەوە، دوایە بە ئاکاری جوان و لەبار برازرێتەوە. ئەندامەکانیش دیسان پێویستان هەیە کە لە گوناح خاوێن بکرێن و بە تاعەت و عیبادەت بخەملێنرێن. بۆ ئەوەی لە هەرکام لەو پلانەوە بچێتە پلەی پاش خۆی پێویستە کە پلەی پێشوو تێپەڕێنی؛ واتە: لە پێشدا خاوێنکردنەوەی ڕواڵەت لە پیسی، جا ئەندامەکان لە گوناح، جا دڵ لە ئاکاری ناپەسەند، جا دەروون لە غەیری خوا.

ئینجا وا بیر نەکەیتەوە کە تەنها بە خاوێنکردنی ڕواڵەتی، گەیشتووی بە تەهارەتی ڕاستەقینە و بەمبۆنەوە مەبەستەکەت لە دەس دەربچێ. هەروەها وا بیر نەکەیتەوە کە ئەم چوار پلەی تەهارەتە بەو شێوەی وا ئارەزوو بکەیت و دڵت بخوازێ پێی دەگەی!، بەڵکوو ئەگەر قۆڵی لێ هەڵماڵی و تەواوی تەمەنی بۆ تەرخان بکەیت، لەوانەیە بە بەشێکی بگەی.

## بەشی یەکەم: خۆ پاککردنەوە لە پیسی (طهارة الأحداث)

ئەم بەشە بریتییە: لە دەسنوێژ، غوسڵ، تەیەمموم، لە پێش هەموویانەوە سەر ئاودەس چوون.

ئێستا باس و شێوازی هەرکامیان جیا جیا دەهێنین. جا لە پێشدا باسی سەر ئاودەس چوون دەکەین چونکە هۆی واجببوونی دەسنوێژە.

---

١. الأنعام: ٩١.

## [١.] شێوازی چوونە سەر ئاودەس:

پێویستە ئەگەر لە دەشت و دەردا بوو لە چاوی خەڵکەوە دوور بێت، ئەگەر شتێکی پەیدا کرد خۆی پێ داپۆشێ، شەرمگای خۆی تا ئەو وەختەی کە دائەنیشێ وەدەر نەخات.[١]

ڕوو بە قیبلە و پشت بە قیبلە دانەنیشێ، نابێ ڕوو و پشت بکا لە مانگ، مەگەر لەنێو ماڵدا بێت.[٢] خۆ وەرچەرخان و ڕوو و پشت نەکردن لە قیبلە و لە مانگ و خۆر لەنێو ماڵدا واجب نییە بەڵام سوننەتە. مێز و پیسی نەکاتە نێو ئاوی وەستاو،[٣] ژێرداری سەمەر و نێو کونی جانەوەرەوە.[٤] هەروەها خۆی بپارێزێ لەوەی کە لە شوێنی ڕەقڤانیدا و لەبەر باوە مێز بکات، مەبادا پرژەی لێ بکەوێ. جا کاتێ دەڕواتە نێو ئادەدەسخانەوە پێی چەپی وەپێش بخات و کاتێکیش دێتە دەرەوە پێی ڕاستی.[٥] نابێ بەپێوە مێز بکات.[٦]

لەنێو حەمام و جێی خۆشۆرتندا مێز نەکات. چونکە پێغەمبەر ﷺ لەم بارەوە دەفەرمێ: «عٰامَّةُ الْوَسْوٰاسِ مِنْهُ»[٧] واتە: «زۆربەی وەسواسییەکان لەوێوە پەیدا دەبێ». هەروەها شتێ لەگەڵ خۆیدا هەڵنەگرێ کە نێوی خودا و پێغەمبەری پێوە بێ.[٨] چاك وایە بە سەری ڕووتی نەڕواتە ئاودەسخانە.

کاتێ ئەچێتە ئاودەسەوە بڵێ: «بِسْمِ اللهِ أَعُوذُ بِاللّٰهِ مِنَ الْخُبْثِ وَ الْخَبٰائِثِ أَوْ مِنَ الْخَبِيثِ الشَّيْطٰانِ الرَّجِيمِ»[٩] واتە: «بەنێوی خوا پەنا ئەگرم لە پیسی و شتە پیسەکان یان لە شەیتانی پیسی وەدەرکراو».

---

١. ترمذی: ١٤، المعجم الأوسط للطبرانی: ١٤٨٨.

٢. مسلم: ٣٨٨، ابوداود: ٧، نسائی: ٢٠، ابن‌ماجه: ٣١٨، احمد: ٢٢٤١٤.

٣. مسلم: ٤٢٣، ابوداود: ٦٣، ترمذی: ٦٣، نسائی: ٣٥، ابن‌ماجه: ٣٢٧، احمد: ٧٥٢٩.

٤. نسائی: ٣٤، احمد: ١٩٨٤٧، بیهقی: ٢٢٩.

٥. مسلم: ٣٩٥ و شرحه للنووی، بخاری: ٥٤٠٦، المجموع للنووی: ج١ ص٣٨٤.

٦. ترمذی: ١٢، ابن‌ماجه: ٣٠٤.

٧. ابوداود: ٢٥، ترمذی: ٢١، نسائی: ٣٦، ابن‌ماجه: ٣٠٠، احمد: ١٩٦٥٤.

٨. ابوداود: ١٨، ترمذی: ١٦٦٨، نسائی: ٥١١٨، ابن‌ماجه: ٢٩٩.

٩. کذا فی روایة ابن‌ابی شیبة: ٥ و الطبرانی: ٢٩١٠ فی الأوسط. أما فی روایة بخاری: ١٣٩ و مسلم: ٥٦٣ و ابوداود: ٤ و ترمذی: ٥ و نسائی: ١٩ و ابن‌ماجه: ٢٩٢ و احمد: ١١٥٠٩، لم یذکر «بسم اللّه» فی أوله و «شیطان الرجیم» فی آخره.

کاتێکیش دێتە دەرەوە بڵێ: «اَلْحَمْدُ لِلّٰهِ الَّذِي أَذْهَبَ عَنِّي مٰا يُؤْذِينِي وَ أَبْقىٰ مٰا يَنْفَعُنِي»[1] واتە: «سپاس و ستایش بۆ ئەو خوایەی کە ئەوەی وا ئازاری ئەدام لە کۆڵی کردمەوە و ئەوی وا بەسوودە بۆ لەشم دێت هێشتوویەتیەوە».

لە کاتی چوونە ناو ئاودەست و هاتنەدەرەوەدا زیکری خوا بکات.

هەروەها پێش ئەوەی دابنیشێ ئاو و بەرد ئامادە بکات. لەو شوێنەی وا پیسیی کردووە خۆی پاك نەکاتەوە.

پێویستە دەس بە خۆدا بهێنێ و بکۆکێ تا پاشماوەی مێزەکە لە خۆی وەدەرکات.[2] هەروەها پیاو بۆ ئەوە بە تەواوی لە مێز پاك بێتەوە دەست بە بنی گونیدا بهێنێ. ئەگەریش وەسواسی زۆری بۆ هێنا، ئاو بپژێنێ بە دەرپێکەیدا با دڵنیا بێت. پێغەمبەرﷺ دەفەرمێ: «فَعَلْتُ ذٰلِكَ» واتە: «من ئەوەم کردووە»، مەبەستیشی ئاو پرژانەکەیە.

پێغەمبەرﷺ نەهی کردووە لەوەی کە بە ئێسقان و شیاکەی وشکەوەبوو خۆ پاك بکرێتەوە. ئەگەر بە بەرد خۆی پاك کردەوە دەبێ سێ بەرد بێت.[3]

بەڵام سوننەتە کە هەم بە ئاو هەم بە بەرد خۆی پاك بکاتەوە. شێوازی خۆ بە بەرد پاککردنەوە ئاوەهایە: بەردەکە لە پاشەوە بەرەو پێشەوە بهێنێ.

جا پێویستە بە تەواوی پاك بێتەوە [دەنا دەبێ تا بە تەواوی پاك دەبێتەوە بەرد بەکار بهێنێ] جا سوننەتە بەردەکان تاق بن.

## [٢.] شێوازی دەسنوێژگرتن:

پێغەمبەرﷺ بەردەوام پاش ئەوەی دەچووە دەسئاو دەسنوێژی دەگرت. خۆی لەمبارەوە دەفەرمێ: «لا يُحٰافِظُ عَلَى الْوُضُوءِ إِلّٰا مُسْلِمٌ».[4]

واتە: «تەنها موسڵمانی ڕاستەقینە هەمیشە دەسنوێژی هەیە».

---

١. ابن‌ماجە: ٣٠١ بلفظ: «اَلْحَمْدُ لِلّٰهِ الَّذِي أَذْهَبَ عَنِّي الْأَذىٰ وَ عٰافٰانِي» و ابن‌ابی‌شیبە: ٦ بلفظ: «و أَمْسَكَ عَلَيَّ مٰا يَنْفَعُنِي».

٢. دارقطنی: ٤٦٩، مسلم: ٤٣٩، ابوداود: ١٩، ابن‌ماجە: ٣٢١.

٣. بخاری: ١٥٢، ابوداود: ٧، نسائی: ٤٠، ابن‌ماجە: ٣٠٩، احمد: ٧١٠٢.

٤. ابن‌ماجە: ٢٧٣، احمد: ٢١٣٤٤، طبرانی فی الکبیر: ١٤٢٧، بیهقی: ٢٥٩٩.

سوننەتە پێش دەسنوێژ سیواك بدات. پێغەمبەرﷺ دەفەرمێ: «صَلاةٌ عَلَىٰ إِثْرِ سِوَاكٍ أَفْضَلُ مِنْ خَمْسٍ وَ خَمْسِينَ صَلاةً بِغَيْرِ سِوَاكٍ».[1]

واتە: «نوێژێ کە پاش سیواکدان خوێندرابێ سەوابی لە پەنجاوپێنج نوێژ کە بێ‌سیواك خوێندرابێ زۆرترە».

پاشان دابنیشێ بۆ دەسنوێژگرتن و بڵێ: «بِسْمِ اللّٰهِ الرَّحْمٰنِ الرَّحِيمِ». پێغەمبەرﷺ لەمبارەوە دەفەرمێ: «لا وُضُوءَ لِمَنْ لَمْ يُسَمِّ اللّٰهَ تَعَالَىٰ»[2] واتە: «کەسێ کە «بسم الله الرحمٰن الرحيم» نەڵێت دەسنوێژەکەی دروست نییە».

پاشان [سوننەتە] بڵێ: «أَعُوذُ بِكَ مِنْ هَمَزَاتِ الشَّيَاطِينِ وَ أَعُوذُ بِكَ رَبِّ أَنْ يَحْضُرُونَ» واتە: «پەنا دەگرم بە تۆ لە وەسوەسەی شەیاتین و پەناشت پێ دەگرم لەوەی ئەو شەیتانانە بخرێنە تەکم».

پاشان دەسوپلی ـ پێش ئەوە لە کاسە، یان لە حەوزەکەی چەقێنێ ـ سێ جار بشۆرێ و بڵێ: «اَللّٰهُمَّ إِنِّي أَسأَلُكَ الْيُمْنَ وَ الْبَرَكَةَ وَ أَعُوذُ بِكَ مِنَ الشُّؤْمِ وَ الْهَلَكَةِ» واتە: «خوایە داوای پیت و بەرەکەتت لێ دەکەم و پەنات پێ دەگرم لە بەدیومنی و بەدبەختی».

جا بەم دوو شێوە نیەت بهێنێ: نیەتم هەیە بێ‌دەسنوێژی لەسەر خۆم لائەبەم، یان نیەتم هەیە نوێژخوێندن لەسەر خۆم مەباح ئەکەم. پێویستە ئەو نیەتە لە دڵیدا تا شوشتنی دەم و چاوی دەوامی ببێ. جا لەوێچێ ئاو بە دەستی ڕاستی بدا بە دەمیدا و سێ جار لە دەمیدا سووڕی بدا.

سوننەتە ئاو زۆر بەدەم و لووتیدا بدا مەگەر بە ڕۆژوو بێت، ئەوە ئەبێ زیادەڕەوی نەکات و بە هێمنی ئاو بەدەم و لووتیدا بدا[3] پاشان بڵێ: «اَللّٰهُمَّ أَعِنِّي عَلَىٰ تِلاوَةِ كِتَابِكَ و كَثْرَةِ الذِّكْرِ لَكَ» واتە: «خوایا یارمەتیم بدە قورئانەکەت بخوێنمەوە و یاد و زیکر تۆ زۆر بکەم». پاشان لەوێچێ ئاو بدا بە لووتیدا و سێ جار بە هەناسە لە لووتیدا هەڵیمژێ و هەرچی لە لووتیدا

---

١. احمد: ٢٥١٣٥ بلفظ: «سبعين ضعفاً»، بیهقی: ٢٥١٨، الحاکم: ٤٦٩ بلفظ أخری، صحیح ابن‌خزیمه: ١٣٨.
٢. ابوداود: ٩٣، ترمذی: ٢٥، ابن‌ماجه: ٣٩١، احمد: ٩٠٥٠ کلهم بلفظ: «لَمْ يَذْكُرِ اسْمَ اللّٰهِ عَلَيْهِ».
٣. بخاری: ١٨٠، ابوداود: ٩٦، احمد: ١٣٠٨.

هەیە دایبوەرێنێ و بڵێ: «اَللّٰهُمَّ أَوْجَدْنِي رٰائِحَةِ الْجَنَّةِ وَ أَنْتَ عَنِّي رٰاضٍ» واته: «خوایه لەسەر ڕەزامەندی خۆت بۆنی بەهەشت بده به لووتمدا». کاتێکیش لووتی دادەوەرێنێ بڵێ: «اَللّٰهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ رَوٰائِحِ النّٰارِ وَ مِنْ سُوءِ الدّٰارِ». واته: «خوایه به تۆ پەنا دەگرم له بۆنی ئاوری جەهەننەم و له ماڵی شەڕی قیامەت».

پاشان مشتێ ئاو هەڵگرێ بۆ ڕوومەتی و له تەختی تەوێڵیەوه تا ئاخری چەناگه ـ لەباری درێژای ـ و لەم گوێ بۆ ئەو گوێ ـ لەباری پانایيەوه ـ بەو مشته ئاوه بشۆرێ. ئەو دوو سپاییه که وان له دوو سووچی سەرەوه پێویست نییه بشۆرێ چونکه لەسەر سەر حەسێب نین. بەڵام پێویسته ئەو شوێنه وا به زۆری ژنان مووی سەریان لەوێوه بەرەودوا هەڵدەدەنەوه بشۆرێ چونکه لەسەر سەر حەسێبه. هەروەها پێویسته شوێنی سەوزبوونی ئەم چوار بەشه مووه بشۆرێ: سمێڵ و برۆ و برژانگ و لاجانگ. دەبێ ئەگەر ڕیش تەنك بوو ئاو به تەواوی ئەو بەشەیەی که له ڕوومەتیدایه بگەیێنێ. مووی ژێر لێوی خواروو ـ لەپڕی و تەنکیدا ـ وەکوو ڕیش وایه. ئەگەر ڕیش درێژ بوو ئەوه دەبێ ئاو به سەریدا برژێنێت و [پێویست نییه بنەکەی تەڕ بێت]، دەس بخاته نێو کاسەی چاو و دەور و بەری و ئەو شوێنانه وا کڵه تێیدا دەمێنێتەوه و خاوێنیان بکاتەوه، جا بڵێ: «اَللّٰهُمَّ بَيِّضْ وَجْهِي بِنُورِكَ يَوْمَ تَبْيَضُّ وُجُوهُ أَوْلِيٰائِكَ وَلا تُسَوِّدْ وَجْهِي بِظُلُمٰاتِكَ يَوْمَ تَسْوَدُّ وُجُوهُ أَعْدٰائِكَ».[1]

واته: «خوایه به تیشکی خۆت ڕوومەتم سپی بکه لەو ڕۆژەدا وا ڕوومەتی خاسانی خۆت سپیه. خوایه ڕووم ڕەش نەکەی لەو ڕۆژەدا وا ڕوومەتی دوژمنانت ڕەشه». جا سوننەته دەس بخاته نێو ڕیشیەوه.

پاشان هەر دوو دەستی سێ جار تا ئەنیشکی بشوات، ئەگەر ئەنگوستیلەی له پەنجەدا بوو بیجووڵێنێ،[2] درێژه به شۆردنی دەست و پێی لەو ئەندازەی که واجب کراوه بدات، چونکه له پێغەمبەرەوەﷺ دەگێڕنەوه که: تا هەر کوێ ئاوی دەسنوێژ بڕوات تا ئەوێ له قیامەتدا سپی و جوان دەکرێتەوه.[3]

---

١. المجموع للنووي: ج١ ص٤٦٣، الحاوي للماوردي: ج١ص ٢١٣، البجيرمي على الخطيب: ج٢ ص٨٦.

٢. ابن‌ماجه: ٤٤٣، طبراني في الكبير: ٩٤٩، دارقطني: ٣٢٠.

٣. بخاري: ١٣٣، مسلم: ٣٦٧، ابن‌ماجه: ٢٨٠، احمد: ٨٠٦١.

لە دەستی ڕاستیەوە دەست پێ بکا و بڵێ: «اَللّٰهُمَّ أَعْطِنِي كِتٰابِي بِيَمِينِي وَ حٰاسِبْنِي حِسٰابا يَسِيراً»[١] واتە: «خوایە کتێبی کردەوەکانم بدە بە دەستی ڕاستمەوە و بە ئاسانی حیسێب و کیتێبم لەگەڵدا بکە».

کاتێکیش لای چەپی دەشوات بڵێ: «اَللّٰهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ أَنْ تُعْطِيَنِي كِتٰابِي بِشِمٰالِي أَوْ مِنْ وَرٰاءِ ظَهْرِي»[٢] واتە: «خوایە پەنات پێ دەگرم لەوەی کە کتێبی کردەوەکانم بدەیتە دەستی چەپمەوە یان لە پشتەوە بمدەیتێ».

پاشان تەواوی سەری بە ئاو مەسح بکات؛ بەم شێوەیە: هەر دوو دەستی تەڕ بکات و سەری پەنجەکانی دەستی ڕاست و سەری پەنجەکانی دەستی چەپ، پێکەوە بلکێنێ و بەو شێوە بیهێنێت بە بەری سەریدا تا بناملی و دیسان لەوێوە تا پێشی سەری بیانهێنێتەوە. سێ جار ئاوەها بکات و بڵێ: «اَللّٰهُمَّ غَشِّنِي بِرَحْمَتِكَ وَ أَنْزِلْ عَلَيَّ مِنْ بَرَكٰاتِكَ وَ أَظِلَّنِي تَحْتَ عَرْشِكَ يَوْمَ لا ظِلَّ إِلّا ظِلُّكَ».[٣]

واتە: «خوایە بەری ڕەحمەتی خۆتم بخە و لە بەرەکەتی خۆت برژێنە بە سەرما و بمخەرە ژێر سێبەری عەرشت، لەو ڕۆژەدا وا هیچ سێبەرێ نییە جگە سێبەری بەزەیی تۆ نەبێت».

پاش دیوی دەرەوە، دیوی ناوەوەی هەر دوو گوێیەکانی بە ئاوێکی تازە مەسح بکات. جا هەر دوو ئەنگوستی شادەی بخاتە نێو گوێیەکانی و ئەنگوستی گەورەشی لە پشتی گوێی بنێ و بیانسوورێنێ. پاشان لەپی دەستی لەسەر هەر دوو گوێی بنێ و سێ جار ئەمە بڵێ: «اَللّٰهُمَّ اجْعَلْنِي مِنَ الَّذِينَ يَسْتَمِعُونَ الْقَوْلَ فَيَتَّبِعُونَ أَحْسَنَهُ، اَللّٰهُمَّ أَسْمِعْنِي مُنٰادِيَ الْجَنَّةِ مَعَ الْأَبْرٰارِ».[٤]

واتە: «خوایە بمخەرە ڕیزی ئەوانەوە وا فەرموودەکانی تۆ ئەبیسن و شوێنی چاکترینیان ئەکەون، خوایا وێڕای پیاو چاکان، دەنگی جارچی بەهەشتیش بەگوێی من بگەیێنە.

---

١. المجموع للنووی: ج١ ص٤٦٣، الحاوی للماوردی: ج١ص ٢١٣.

٢. البجیرمی علی الخطیب: ج٢ ص٨٦، مغنی المحتاج: ج١ ص٢٨٧ کلهم بلفظ: «اَللّٰهُمَّ لا تُعْطِيَنِي كِتٰابِي بِشِمٰالِي وَلا مِنْ وَرٰاءِ ظَهْرِي».

٣. و فی کتب الفقهیّة الدعاء عند مسح الرأس: «اَللّٰهُمَّ حَرِّمْ شَعْرِي و بَشَرِي عَلَى النّٰارِ» البجیرمی علی الخطیب: ج٢ ص٨٦، مغنی المحتاج: ج١ ص٢٨٧.

٤. المجموع للنووی: ج١ ص٤٦٢، البجیرمی علی الخطیب: ج٢ ص٨٦، مغنی المحتاج: ج١ ص٢٨٧.

پاشان ئەستۆشی مەسح بکات، چونکە پێغەمبەرصَلَّاللَّهُعَلَيْهِوَسَلَّمَ دەفەرمێ: «مَسْحُ الرَّقَبَةِ أَمَانٌ مِنَ الْغُلِّ يَوْمَ الْقِيَامَةِ» واتە: «مەسحی گەردن لە ڕۆژی قیامەتدا دەبێتە هۆی پاراستنی لە زەنجیر».

جا لەم کاتەدا سێ جار بڵێ: «اَللّٰهُمَّ أَعْتِقْ رَقَبَتِي مِنَ النَّارِ، وَ أَعُوذُ بِكَ مِنَ السَّلاسِلِ وَالْأَغْلالِ» واتە: «خوایە گەردنم لە ئاوری جەهەننەم ڕزگار بکە. خوایە پەنا بەتۆ دەگرم لە کۆت و زنجیری قیامەت».

پاشان سێ‌جار پێی ڕاستی بشوات و بە ئەنگوستە بچکۆلەی دەستی چەپی پەنجە بخاتە نێو ئەنگوستەکانی پێی ڕاستی؛ لە ئەنگوستە چکۆلەی پێی ڕاستیەوە دەست پێ بکات و لە ئەنگوستە چکۆلەی پێی چەپیەوە دوایی پێ بهێنێ و بڵێ: «اَللّٰهُمَّ ثَبِّتْ قَدَمِي عَلَى الصِّرَاطِ يَوْمَ تَزِلُّ الْأَقْدَامُ فِي النَّارِ».[1]

واتە: «خوایا! پێم لەسەر پردی سیرات پتەو کە لەو ڕۆژەدا وا پێیەکان دەخلیسکێن و دەکەونە نێو ئاگرەوە».

هەروەها لە کاتی شوشتنی پێی ڕاستدا بڵێ: «اَللّٰهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ أَنْ يَزِلَّ قَدَمِي عَنِ الصِّرَاطِ يَوْمَ تَزِلُّ أَقْدَامُ الْمُنَافِقِينَ».

واتە: «خوایا! پەنات پێ دەگرم لەوەی کە پێم لە سەرپردی سیراتەوە بترازێ لەو ڕۆژەدا وا پێی دووڕوو و مونافقەکان لە سەریەوە دەترازێتە خوارەوە». جا [سوننەتە]تا نیوەی پووزی بشوات.

جا هەرکاتێ دەستنوێژەکەی تەواو کرد بڵێ: «أَشْهَدُ أَنْ لا إِلٰهَ إِلَّا اللّٰهُ وَحْدَهُ لا شَرِيكَ لَهُ وَ أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَ رَسُولُهُ».[2]

واتە: «شایەتی دەدەم کە هیچ خوایێك شیاوی پەرەستن نییە جگە لە ئەڵلاهی تاك و بێ‌هاوەڵ نەبێ، هەروەها شایەتی ئەدەم کە موحەممەد نێردراو و بەندەی خودایە».

---

١. المجموع للنووی: ج١ ص٤٦٢، البجیرمی علی الخطیب: ج٢ ص٨٦.

٢. ترمذی: ٥٠، ابن‌ابی‌شیبة: ٢، نسائی: ١٤٨.

پاشان بڵێ: «سُبْحَانَكَ اللّٰهُمَّ وَ بِحَمْدِكَ لا إِلٰهَ إِلّا أَنْتَ عَمِلْتُ سُوءًا وَ ظَلَمْتُ نَفْسِي، أَسْتَغْفِرُكَ وَ أَتُوبُ إِلَيْكَ فَاغْفِرْ لِي وَتُبْ عَلَيَّ إِنَّكَ أَنْتَ التَّوّابُ الرَّحِيمُ[1]، اَللّٰهُمَّ اجْعَلْنِي مِنَ التَّوّابِينَ وَاجْعَلْنِي مِنَ الْمُتَطَهِّرِينَ[2]، وَاجْعَلْنِي مِنْ عِبٰادِكَ الصّٰالِحِينَ وَاجْعَلْنِي صَبُوراً شَكُوراً وَاجْعَلْنِي أَذْكُرَكَ ذِكْراً كَثِيراً وَ أُسَبِّحَكَ بُكْرَةً وَ أَصِيلاً»

واتە: «خوایا! پاك و بەریت لە هەرچی ناتەواوییە، سپاس و ستایش هی تۆیە، هیچ خوایەکی ڕاستەقینە نییە جگە لە تۆ، ئەمن کرداری ناپەسەندم ئەنجام داوە و لە ئاست خۆمدا ستەمم کردووە، ئێستا داوای لێبوردنت لێ دەکەم و لە گوناحانم پاشگەز دەبمەوە. ئەدی خوایە لێم خۆش بەو تەوبەکەم لێ وەرگرە، چونکە هەر تۆی بەخشندە و تەوبەوەرگر. خوایە! بمخە ڕیزی ئەوانەوە وا زۆر تەوبە دەکەن و خۆیان خاوێن ڕاگرتووە، خوایە! منیش بخەرە ڕیزی بەندە چاکەکانی خۆتەوە و [لەسەر بەڵا و موسیبەت] خۆڕاگرم بکە و شوکرانەبژێری [نیعمەتەکانتم] فێر بکە. یارمەتیم بدە زیکر و ویردت بۆ بخوێنم و بەیانی و ئێواران تەسبیحاتت بۆ بکەم».

جا هەر کەسێك ئاوەها دەستنوێژەکەی تەواو بکات، دەسنوێژەکەی بۆ مۆر دەکرێت و بۆ ژێری عەرش بەرز دەکرێتەوە و تا ڕۆژی قیامەت تەسبیح و تەقدیسی خوا دەکات و خێراتەکەشی بۆ ئەو دەنووسرێ.

لە دەسنوێژگرتندا ناپەسەندە لە سێ جار زیاتر ئەندامەکان بشۆرێ و ناپەسەندە لە ئاودا زیادەڕەوی بکات، هەروەها کەراهەتی هەیە [دەستەکانی ڕاوەشێنێ و] بە دەستی ئاو بپرژێنێ و لەکاتی دەسنوێژگرتنەکەدا قسە بکات.

## [٣.] چۆنێتی غوسڵ کردن:

[سوننەتە پێش غوسڵکردن] خۆی پاك بکاتەوە و ـ بەو شێوە کە ڕابوورا ـ دەسنوێژ بگرێ. جا لەو دەسنوێژەدا پێی نەشۆرێ و دوای بخات تا دوای غوسڵەکەی. لە پێشدا سێ جار ئاو بکات بە سەر لای ڕاستیدا پاشان بە سەر لای چەپیدا، جا دەست بهێنێ بە بەر و دوای خۆیدا.

١. ابن‌ابی‌شیبة: ٢٠، نسائی: ١٠٢٦٠، بیهقی: ٦٩١٣.

٢. ترمذی: ٥٠، ابن‌ابی‌شیبة: ٢، نسائی: ١٤٨.

دەست بخاتە نێو مووەکانی. بنی مووکان پڕ بێ یان تەنك، بشوات؛ چونکە لە ژێر هەر موویێکدا جەنابەتێك هەیە.[1] بۆ ژنان پێویست نییە پەلکەکانیان بکەنەوە، مەگەر بزانن تا نەیکەنەوە ناوەکەی تەڕ نابێت.

جا ئاگادار بێت دەست نەدا بە شەرمگایەوە و دەسنوێژەکەی بشکێ. چرچ و لۆچی جەستەی بە دەست ساف بکات [تا ئاوی بەرکەوێ]، هۆشی بێت نیەتی لەبیر نەچێ لە هەوووڵی غوسڵەکەوە.

## فەرزەکانی دەستنوێژ:

١. نیەتهێنان لە کاتی شوشتنی ڕوخساردا؛

٢. شوشتنی هەر دوو دەست تا ئەنیشك؛

٣. مەسحی سەر؛

٤. شوشتنی هەردوو پێی تا قولە قاپە [پێویستە بزانین کە] پێویست نییە ئەم ئەندامانە بێوەستان خیرا بشۆردرێت.

## ئەو غوسڵانەی کە واجبن پێنجدانەن:

١. غوسڵی لەشپیسی کە بەهۆی ئاوهاتنەوە یان بەهۆی بە یەك تێکەڵبوونی ئەندامی مێرد و ژنەوەیە؛

٢. حەیز و عادەتی مانگانەی ژن؛

٣. هاتنی خوێنی دوای منداڵبوون؛

٤. منداڵبوون، هەرچەند هیچ تەڕیشی لەگەڵدا نەبێ؛

٥. مەرگ.

وە هەندێ غوسڵەکانی‌تر هەن کە سوونەتن؛ وەکوو: غوسڵی جومعە، غوسڵی دوو جێژنەکان، غوسڵی ئیحرام دابەستن، غوسڵی وەستان لە عەرەفە و موزدەلیفە، غوسڵی چوونە نێو شاری مەککە، سێ غوسڵی سێ ڕۆژەی پاش جێژنی قوربان، غوسڵی ئاخرین تەوافی ماڵی خوا

---

١. ابوداود: ٢١٦، ابن‌ماجه: ٥٨٩، طبرانی فی الکبیر: ٣٨٩١.

ـ لەسەر قەوڵێك ـ ، هەر کافرێ موسڵمان بێت سوننەتە غوسڵ بکا. ئەگەر جەنابەتی لەسەر نەبێ [وەگەرنە غوسڵ لەسەری واجبە]، شێت وەختێ چاك دەبێتەوە، هەروەها کەسێکیش مردوو بشۆرێ، ئەمانە هەموویان سوننەتن.

## [٤.] چۆنێتی تەیەمموم‌کردن:

هەرکەسێ نەتوانێت ئاو بەکار بێنێ لەبەر نەبوونی ئاو، یان لەبەر ئەوەی لەمپەرێکی لە ڕێدایە و ناتوانێ دەستی بە ئاوەکە ڕابگات؛ وەکوو ئەوەی دڕندەیێ ناو ڕێی گرتووە، یان بەرئاوەکە گیراوە، یان زیندانی کرابێت، یان ئاو ببێت بەڵام بۆ خواردنەوەی خۆی، یان هاوڕێکەی پێویستی بێت، یان ئاوەکە هی کەسێکە و ئەویش لە نرخی خۆی گرانتر دەیفرۆشێ، یان برینێ یا نەخۆشینێکی پێوەیە و ترسی ئەوە دەچێ ئەگەر ئاو بەکار بهێنێ، ئەندامەکەی لەکار بەکەوێ، یان ئێشەکەی زۆر بسێنێ و ئەندامەکە لاواز ببێ.

جا ئەو کەسەی وا تەیەمموم دەکا پێویستە ڕاوەستێ تا وەختی نوێژەکە دێ، پاشان خاکێکی پاك و خاوێن و نەرم کە تۆزی لێ هەڵبستێ، وەدەست بخات و پەنجەکانی دەستی پێکەوە بلکێنێ و دەست بدا بە سەر ئەو خاکەدا و نیەت بهێنێ و بڵێ: نیەتم هەیە نوێژخوێندن لەسەر خۆم مەباح ئەکەم، جا بە هەردوو دەستەکەی تەواوی ڕوخساری یەك جار مەسح بکات، پێویست نییە خۆی بخاتە زەحمەتەوە بۆ ئەوەی کە خاك بگەیەنێ بە بنی تەواوی مووەکانی، بەڵام تەواوی پێستی ڕوخساری پێویستە بە خاك یان بە تۆز تەیەمموم بکات.

ئەمەش بە یەك جار پێك دێت، ئەگەریش ڕوومەتی پان بوو ئەوە هەر بە ئەندازەی ناو هەردوو دەستی پێویستە مەسح بکات و لەوە زیاتر نەڕوا. جا ئونگوستیلەکەی دەربێنێ و بۆ جاری دووهەم دەست بدا بەزەویدا. بەڵام ئەمجار پەنجەکانی بڵاو بکاتەوە، پاشان پشتی پەنجەکانی دەستی ڕاستی بنێتە نێو بەری پەنجەکانی دەستی چەپی، بەجۆرێ لە هەردوو لاوە لە پەنجەی شادەی ئەو دەستەکەی‌تر تێنەپەڕێتە دەر. جا دەستی چەپی هەر لەو شوێنەوە کە دایناوە بە سەر پشتی باسکی دەستی ڕاستیدا تا ئەنیشکی بهێنێ. پاشان لەپی دەستی بەسەر دیوی ناوی باسکی دەستی ڕاستیدا وەرچەرخێنێتەوەو تا جومگی بیهێنی پیادا و بە پەنجە گەورەکانی هەردوو دەستی ئەوی‌تریان مەسح بکات، پاشان مەسحی هەردوو

دەستی بکات و پەنجە لەنێو پەنجەکانی بخات. بۆیە هێندە توند دەیگرین چونکە دەبێ بە یەكجار تەواوی ئەندامەکە دابگرێ. جا ئەگەر نەیدەتوانی بە یەكجار، هیچ قەیدی نییە کە بە دوو جار یان زیاتر خاك بە تەواوی ئەندامەکەی بگەیێنێ.

بە یەك تەیەمموم تەنها دەتوانێ یەك نوێژیی فەرز بخوێنێ، بەڵام هەرچی مەیلی هەبێ ئەتوانێ سوننەت بخوێنێ.

## [بەشی دووهەم] خۆ خاوێن ڕاگرتن:

سوننەتە چڵك و چەوری سەر و نێو گوێ و لووت و سەر پەنجە و ژێر ناخوون پاك بکرێتەوە. ناپەسەندە نینۆكگرتن و تاشینی مووی بەر و بن باڵ زیاتر لە چل ڕۆژ دوا بخرێت.[1] کاتێك ئەچێتە حەمام شەرمگای خۆی داپۆشێ و خۆی بپارێزی لە سەیرکردنی عەورەتی خەڵك. جا ئەگەر لەبەر ئەوەی نوێژ بکات حەمامی کرد، سوننەتە ئەو زیکر و ویردانەی کە بۆ چوونە دەسئاو و هاتنەدەرەوە دەیخوێند بۆ چوونە حەمام و هاتنەدەرەوەش بیخوێنێ.

هەرکاتێ بیەوێ نینۆکی بگرێ بەم شێوە سوننەتە: لە ئەنگوستی شادەی دەستی ڕاستەوە دەس پێ بکات پاش گرتنی ئەو سێ پەنجەکەیتر بە ئەنگوستی گەورەی دەستی ڕاست دوایی پێ بهێنێ. بۆ دەستی چەپیش لە ئەنگوستی چکۆلەوە دەست پێ بکات و لە ئەنگوستی گەورەوە تەواوی بکات.

سوننەتە بەشێوەی تاق چاوبڕێژێ، بەم شێوە کە لە حەدیسێکدا ڕوایەت کراوە کە پێغەمبەرﷺ سێ جار کلەی دەخستە چاوی ڕاستی و دوو جار لەچاوی چەپی بۆ ئەوەی سەرجەم بەتاق دەرچێ.[2]

نابێ هیچ کردەوەیێکت خاڵی لە نەزم و تەرتیب بێت. ئەو نەزم و تەرتیبەش بەگوێرەی ڕێکەوت نەبێ، چونکە جیاوازیی مرۆڤ و چوارپایان لەوەدایە ئەوان بەوجۆرە وا بۆیان ڕێك بکەوێ، دەجووڵنەوە؛ بەڵام مرۆڤ دەبێ بەو شێوە وا دەستووری پێدراوە بجووڵێتەوە.

---

١. «قَالَ أَنَسٌ: وُقِّتَ لَنَا فِي قَصِّ الشَّارِبِ وَ تَقْلِيمِ الْأَظْفَارِ وَ نَتْفِ الْإِبْطِ وَ حَلْقِ الْعَانِةِ أَنْ لا نَتْرُكَ أَكْثَرَ مِنْ أَرْبَعِينَ لَيْلَةً». مسلم: ٣٧٩، ابوداود: ٣٦٦٨، ترمذی: ٢٦٨٣، نسائی: ١٤، ابن‌ماجە: ٢٩١، احمد: ١١٧٨٥.

٢. «إِذَا اكْتَحَلَ أَحَدُكُمْ فَلْيَكْتَحِلْ وِتْراً». احمد: ٨٢٥٧: طبرانی: ١٠٦١٥، ابوداود: ٣٢، ابن‌ماجە: ٣٣٢.

پێویستە خەتەنەکردنی منداڵ لە حەوت ڕۆژەی لە دایکبوونی دوا بخرێ، تا هاوچەشنیی جوولەکەکانی نەکردبێ [چونکە ئەوان لە ڕۆژی حەوتەمدا خەتەنەی منداڵ دەکەن].

پێغەمبەرصَلَّىٰاللَّهُعَلَيْهِوَسَلَّمَ لەمبارەوە دەفەرمێ: «اَلْخِتٰانُ سُنَّةٌ لِلرِّجٰالِ وَ مَكْرَمَةٌ لِلنِّسٰاءِ»[1] واتە: «خەتەنەکردن بۆ پیاوان سوننەتە و بۆ ژنان ڕێز و حورمەتە».

نەخەعی فەرموویەتی: «لە عەقڵ و ئاوەزی پیاوی ڕیش درێژ سەرسام ئەمێنم کە بۆچی ڕیشی کورت ناکاتەوە تا بێتە ئەندازەیێکی ناونجی؛ نە زۆر کورت، نە زۆر درێژ، چونکە میانەڕەوی لە هەموو شتا جوانە».

ناپەسەندە بەڕەنگی ڕەش ڕیش ڕەنگ بکرێ،[2] هەروەها بە جنسی گۆگرد سپی بکرێتەوە، ناپەسەندە ئەوتاڵە موانەی وا سپیە هەڵبکەنرێ،[3] یان کەم و زیادی پێبکرێ. هەروەها داهێنان و پەرێشان و شپرزەکردنی مووی سەر و ڕیش بە ڕیاوە و بۆ ئەوەی وەك زاهید بنوێنێ کەراهەتی هەیە.

لەمبارەوە کەعبرَضِيَٱللَّهُعَنْهُ ئەفەرمێ: «يَكُونُ فِي آخِرِ الزَّمٰانِ أَقْوٰامٌ يَقُصُّونَ لَحٰاهُمْ كَأَذْنٰابِ الْحَمٰامِ، يُعَرْقِبُونَ نِعٰالَهُمْ كَالْمَنٰاجِلِ أُولٰئِكَ لا خَلاقَ لَهُمْ».

واتە: «لە ئاخر زەماندا کەسانێك پەیدا دەبن کە ڕیشیان وەکوو کلکی کۆتر لێئەکەن و پاژنەی کەوشەکانیان وەکوو قازان وایە، ئەوە ئەوانە هیچ بەشێکیان لە ئیسلامدا نییە».

---

١. احمد: ١٩٧٩٤، ابن‌ابی‌شیبة: ٣/٦، سنن الکبری للبیهقی: ٣٥٢/٨، طبرانی: ١١٤٢٥.

٢. «يَكُونُ قَوْمٌ فِي آخِرِ الزَّمٰانِ يَخْضِبُونَ بِهٰذَا السَّوادِ كَحَوٰاصِلِ الْحَمٰامِ لا يَرِيحُونَ رٰائِحَةَ الْجَنَّةِ». نسائی: ٤٩٨٨، احمد: ٢٣٤١، مسلم: ٣٩٢٥ و ابوداود: ٣٦٧٢ بلفظ آخر.

٣. «نَهَىٰ رَسُولُ اللّٰهِصَلَّىٰاللَّهُعَلَيْهِوَسَلَّمَ عَنْ نَتْفِ الشَّيْبِ وَ قٰالَ: إِنَّهُ نُورُ الْمُسْلِمِ». ترمذی: ٢٧٤٦، ابوداود: ٣٦٧٠، نسائی: ٤٩٨٢، ابن‌ماجه: ٣٧١١.

# بابەتی چوارەم: ڕاز و نهێنییەکانی نوێژ

ئەم بابەتە بریتییە لە چەند بەش:

## بەشی یەکەم: گەورەیی و فەزیلەتی نوێژ و سوجدە و جەماعەت و بانگ و...

### فەزیلەت و گەورەیی بانگ:

پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «ثَلاثٌ يَوْمَ الْقِيامَةِ عَلَىٰ كَثِيبٍ مِنْ مِسْكٍ أَسْوَدَ وَلا يَهُمُّهُمْ حِسابٌ وَلا يَنالُهُمْ فَزَعٌ حَتَّىٰ يَفرُغَ مِمّا بَيْنَ النّاسِ: رَجُلٌ قَرَأَ القُرْآنَ ابْتِغاءَ وَجْهِ اللهِ تَعالَىٰ وَ رَجُلٌ ابْتَلَىٰ بِالرِّقِ فِي الدُّنْيا فَلَمْ يَشْغَلْهُ ذٰلِكَ عَنْ عَمَلِ الْآخِرَةِ وَ رَجُلٌ أَذَّنَ لِلصَّلاةِ».[1]

واتە: «لە ڕۆژی قیامەتدا سێ گرووپ هەن کە لەسەر تەپۆڵکەیێك لە میسکی ڕەش ڕاوەستاون، حیسێب و کیتێب بەلایانەوە گرینگ نییە و ترس و لەرز دایان ناگرێت تا خەڵك لە حیسێب و کیتێب ئەبنەوە، ئەوانە بریتین لە: پیاوێك کە لەبەر ڕەزای خوا قورئانی خوێندبێ، پیاوێك تووشی کۆیلەتی بووە بەڵام ئەو کۆیلەتییە نەبووەتە هۆی خەریك‌نەبوونی بە کاروباری ئاخیرەتەوە، پیاوێك بۆ نوێژ بانگ بدا».

پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «يَدُ الرَّحْمٰنِ عَلَىٰ رَأْسِ الْمُؤَذِّنِ حَتَّىٰ يَفْرُغَ مِنْ أَذانِهِ»[2] واتە: «دەستی خوای میهرەبان وا بەسەر بانگوێژەوە تا لە بانگەکە ئەبێتەوە».

---

١. بیهقی: ١٩٤٦، طبرانی: ١١١٢ برواية أخرى.

٢. طبرانی: ٢٠٦١ بلفظ آخر.

هەندێك وتوویانە مەبەست لەو فەرموودەیەی خوا: ﴿وَ مَنْ أَحْسَنُ قَوْلاً مِمَّنْ دَعٰا إِلَى اللّٰهِ﴾[1] واتە: «کێ قسەی جوانترە لەو کەسەی وا بۆلای خوا بانگەواز دەکات»، بانگوێژە.

هەرکاتێ گوێت لە بانگ بوو، هەرچی کە بانگوێژەکە دەیڵێ تۆش دووپاتی بکەوە جگە «حَيَّ عَلَى الصَّلاةِ، حَيَّ عَلَى الْفَلاحِ» نەبێ ئەوە لە وڵامیاندا بڵێ: «لا حَوْلَ وَلا قُوَّةَ إِلّا بِاللّٰهِ».[2] هەروەها لە وڵامی «قَدْ قٰامَتِ الصَّلاةِ»دا بڵێ: «أَقٰامَهَا اللّٰهُ وَ أَدٰامَهٰا مٰادٰامَتِ السَّمٰوٰاتُ وَالْأَرْضُ»[3]. لە وڵامی «اَلصَّلاةُ خَيْرٌ مِنَ النَّوْمِ»دا [لە بانگی بەیانیدا] بڵێ: «صَدَقْتَ وَ بَرَرْتَ».

هەرکات بانگی تەواو کرد [سوننەتە ئەم دوعایە بخوێنێ]: «اَللّٰهُمَّ رَبَّ هٰذِهِ الدَّعْوَةِ التّٰامَّةِ وَالصَّلاةِ الْقٰائِمَةِ آتِ مُحَمَّدا الْوَسِيلَةَ وَالْفَضِيلَةَ والدَّرَجَةَ الرَّفِيعَةَ وَالْمَقٰامَ الْمَحْمُودَ الَّذِي وَعَدْتَهُ».[4]

واتە: «خوایە! ئەی خاوەنی ئەم بانگەوازە بەشکۆیە و ئەم نوێژە بەرپابووە، بە موحەممەد ﷺ پلەی بەرز و گەورەیی و وەسیلەتی خۆت ببەخشە و ئەو مەقامە ستایش کراوە (کە زۆربەی موفەسیرین لەسەر ئەوەن مەقامی شەفاعەتە) کە خۆت بەڵێنیت پێ داوە، پێی ببەخشە».

## خێری نوێژی فەرز:

پێغەمبەر ﷺ دەفەرمێ: «اَلصَّلَوٰاتُ كَفّٰارٰاتٌ لِمٰا بَيْنَهُنَّ مَا اجْتَنَبْتَ الْكَبٰائِرَ»[5] واتە: «نوێژە فەرزەکان دەبنە کەفارەی گوناحی نێوان خۆیان مادامێ خۆت لە گوناحی هەرە گەورە بپارێزی».

هەروەها پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «بَيْنَنٰا وَ بَيْنَ الْمُنٰافِقِينَ شُهُودُ الْعَتَمَةِ وَالصُّبْحِ، لا يَسْتَطِيعُونَهُمٰا»[6] واتە: «لە نێوان ئێمە و مونافیقەکاندا ئامادەبوون بۆ نوێژی عیشا و نوێژی بەیانییە، کە مونافیقەکان ناتوانن ئەو دوو فەرزە بەجێ بێنن».

---

١. فصلت: ٣٣.

٢. بخاری: ٥٧٨، مسلم: ٥٧٨، ابوداود: ٤٤٣، نسائی: ٦٧٠، احمد: ١٦٢٢٥.

٣. ابوداود: ٤٤٤، سنن الكبرى للبيهقی: ٤١١/١، جامع الكبير: ٢.

٤. بخاری: ٥٧٩، ابوداود: ٤٤٥، ترمذی: ١٩٥، نسائی: ٦٧٣، ابن‌ماجه: ٧١٤، احمد: ١٤٢٨٩.

٥. مسلم: ٣٣٩، ترمذی: ١٩٨، نسائی: ١٤٥، ابن‌ماجه: ٤٥٢ كلهم بألفاظ أخر و احمد: ٨٣٥٨ بلفظه.

٦. الموطأ للامام مالك: ٢٦٨، شعب الإيمان للبيهقی: ٢٧٢٨، مسند الشافعی: ٢٠٤.

پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «اَلصَّلٰاةُ عِمٰادُ الدِّينِ فَمَنْ تَرَكَهٰا تَرَكَ الدِّينَ»[١] واتە: «نوێژ کۆڵەکەی دینە، کەواتە، هەرکەس نوێژ تەرك بکات دینی تەرك کردووە».

هەروەها ڕیوایەت کراوە کە: هەوەڵین شتێ کە لە قیامەتدا دەخرێتە بەرباس، نوێژە؛ جا ئەگەر تەواو بوو ئەوە هەم نوێژەکە هەم پاشماوەی کردەوەکانی لێ وەردەگیرێ، بەڵام ئەگەر نوێژەکەی ناتەواو بێت هەم نوێژەکەی هەم پاشماوەی کردارەکانی بەسەریدا دەدرێنەوە.

## خێری چاكبەجێهێنانی ڕوکنەکان:

پێغەمبەرﷺ لەمبارەوە فەرموویەتی: «مَثَلُ الصَّلاةِ الْمَكْتُوبَةِ كَمَثَلِ الْمِيزٰانِ مَنْ أَوْفَى اسْتَوْفَى»[٢] واتە: «نوێژی فەرز بەچەشنی تەرازوو وایە، هەرکەس لە کێشانەدا چاك و پڕ بیکێشێ لە کاتی وەرگرتنیشدا چاك و پڕی دەست دەکەوێ».

دیسان پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «إِنَّ الرَّجُلَيْنِ مِنْ أُمَّتي لَيَقُومٰانِ إِلَى الصَّلاةِ وَ رُكُوعُهُمٰا وَ سُجُودُهُمٰا وٰاحِدٌ وَ إِنَّ بَيْنَ صَلاتِهِمٰا مٰا بَيْنَ السَّمٰاءِ وَ الْأَرْضِ»

واتە: «دوو پیاو لە نێو ئوممەتمدا هەن کە پێکەوە هەڵدەستن بۆ نوێژ و هەروەکوو یەك ڕوکووع و سوجدە دەبەن، کەچی نوێژەکەیان بە قەد نێوان ئاسمان و زەوی فەرقی هەیە».

پێغەمبەرﷺ لەمبارەوە بۆ خشووع و خۆ بە کەمزانین لە نوێژدا ئاماژەی کردووە.

حەدیسی پێغەمبەرﷺ دەفەرمێ: «أَسْوَأُ النّٰاسِ سِرَقَةً مَنْ يَسْرِقُ مِنْ صَلاتِهِ»[٣] واتە: «خراپترین دز ئەو دزەیە کە لە نوێژەکەی بدزێتەوە».

## خێری نوێژی جەماعەت:

پێغەمبەرﷺ دەفەرمێ: «صَلاةُ الْجَمٰاعَةِ تَفْضُلُ صَلاةِ الْفَذِّ بِسَبْعٍ وَ عِشْرِينَ دَرَجَةً»[٤] واتە: «نوێژی جەماعەت بیست و حەوت کەڕەت لە نوێژی تەنیا خێری زۆرترە».

---

١. بیهقی: ٢٦٨٣ و السیوطی فی جامع الکبیر: ٧٠٩ بلفظ: «الصَّلاةُ لِوَقْتِهٰا وَ مَنْ تَرَكَ الصَّلاةَ فَلا دِينَ لَهُ، وَالصَّلاةُ عِمٰادُ الدِّينِ».

٢. مسند الشهاب القضاعی: ١٢٧٤.

٣. احمد: ٢١٥٩١، بیهقی: ٢٩٧٢، حاکم فی المستدرك: ٧٩٩، طبرانی فی الکبیر: ٣٢٠٧، ابن خزیمه فی صحیحیه: ٦٤٣.

٤. بخاری: ٦٠٩، مسلم: ١٠٣٨، ترمذی: ١٩٩، نسائی: ٨٢٨، احمد: ٥٠٨٠ و فی روایة للشیخان والترمذی والنسائی و احمد: «بخمس و عشرین درجة».

ئیبنوو عەبباس رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا دەفەرمێ: «مَنْ سَمِعَ فَلَمْ یَجِبْ لَمْ یَرِدْ خَیْراً أَوْ لَمْ یُرَدَّ بِهِ»[١] «هەرکەس دەنگی بانگوێژ ببیسێ و نەڕوا بە دەمیەوە ئەوە نە خێری ویستووە، نە خێری بۆ ئەوێ».

هەروەها پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لەمبارەیەوە فەرموویەتی: «مَنْ صَلّیٰ أَرْبَعِینَ یَوْماً الصَّلاةَ فِي جَمٰاعَةٍ لا تُفُوتُهُ فِیهَا تَكْبِیرَةُ الْإِحْرٰامِ كَتَبَ اللهُ لَهُ بَرٰاءَتَیْنِ بَرٰاءَةً مِنَ النِّفٰاقِ وَ بَرٰاءَةً مِنَ النّٰارِ»[٢].

واتە: «هەرکەسێ چل ڕۆژ نوێژ بە جەماعەت بخوێنێ و «الله أكبر»ی نیەتی لە دەست درنەچووبێت ئەوە خوا لە دوو شت دەیپارێزی: لە نیفاق و دووڕوویی و لە ئاوری جەهەننەم».

## خێری سوجدەبردن:

پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دەفەرمێ: «مٰا تَقَرَّبَ الْعَبْدُ إِلَی اللهِ تَعٰالَیٰ بِشَيْءٍ أَفْضَلَ مِنْ سُجُودٍ خَفِيٍّ»[٣] واتە: «هیچ شتێ لە سوجدەی پەنامەکی بەندە بەخواوە نزیک ناکاتەوە».

دەگێڕنەوە کە پیاوێک بە پێغەمبەری صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ گوت: داوام بۆ بکە کە خوا بمخاتە ڕیزی ئەوانەوە تۆ شەفاعەتی بۆ دەکەی، هەروەها بمکاتە هاوڕێ تۆ لە بەهەشتدا.

پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فەرمووی: «أَعِنِّي بِكَثْرَةِ السُّجُودِ» واتە: «بە زۆر سوجدەبردن، یارمەتیم بدە [تا بتوانم بەو ئامانجەت بگەیێنم]»[٤].

ئەبووهورەیرە رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ فەرموویەتی: «أَقْرَبُ مٰا یَكُونُ الْعَبْدُ مِنْ رَبِّهِ وَ هُوَ سٰاجِدٌ فَأَكْثِرُوا الدُّعٰاءَ»[٥] «کاتێ عەبد سوجدە دەبات لە هەموو کاتێ بەخواوە نزیکترە، کەوابوو لەکاتی سوجدەدا زۆر دوعا بکەن».

---

١. ابن‌ابی‌شیبة: ٥، بیهقی فی السّنن: ج٣ ص٥٧. و فی روایة: «مَنْ سَمِعَ النِّدٰاءَ فَلَمْ یُجِبْ فَلا صَلاةَ لَهُ» ترمذی: ٢٠١، ابن‌ماجه: ٧٨٥، حاكم: ٨٥٤، طبرانی فی الكبیر: ١٢١٠٠.

٢. ترمذی: ٢٢٤، طبرانی فی الكبیر: ١٥٣١٦، بیهقی فی شعب الإیمان: ٢٦١٢. و فی روایة: «مَنْ صَلّیٰ فِي مَسْجِدِي أَرْبَعِینَ ...» احمد/١٢١٢٣، طبرانی فی الأوسط: ٥٦٠٢.

٣. مسند الشّهاب القضاعی: ١١٩٦، جامع الكبیر للسیوطی: ٦٣١، كنز العمال للهندی: ٥٢٦٩.

٤. احمد: ١٥٤٩٦ بلفظ: «... حٰاجَتِي أَنْ تَشْفَعَ لِي یَوْمَ الْقِیٰامَةِ ...» و مسلم: ٧٥٤ و ابوداود: ١١٥٢ و النّسائی: ١١٢٦ بلفظ: «... أَسْأَلُكَ مُرٰافَقَتَكَ فِي الْجَنَّةِ ...».

٥. مسلم: ٧٤٤، ابوداود: ٧٤١، نسائی: ١١٢٥، احمد: ٩٠٨٣.

## خێری خوشووع و ملکەچی لە نوێژدا:

خوای مەزن لەمبارەوە دەفەرمێ: ﴿أَقِمِ الصَّلَوٰةَ لِذِكۡرِيٓ﴾[1] واتە: «نوێژ بخوێنە تا بەردەوام منت لەیاد بێت».

پێغەمبەرﷺ دەفەرمێ: «إِنَّمَا الصَّلاةُ تَمَسْكُنٌ وَ تَوَاضُعٌ وَ تَضَرُّعٌ وَ تَنَاسٍ وَ تَنَدُّمٌ وَ تَضَعُ يَدَكَ فَتَقُولُ: اَللّٰهُمَّ اَللّٰهُمَّ! فَمَنْ لَمْ يَفْعَلْ فَهِيَ خِدَاجٌ»[2].

واتە: «نوێژ، خۆفەقیرکردنە، خۆکەمگرتنە، ملکەچییە، لەبیرەوەبردنە، پەشیمانییە، دەست دانان و وتنی: خوایە! خوایەیە، جا هەرکەس ئاوەها نوێژ نەکات ئەوە نوێژەکەی ناتەواوە».

پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «إِذَا صَلَّيْتَ صَلاةً فَصَلِّ صَلاةَ مُوَدِّعٍ»[3] واتە: «هەرکاتێ کە نوێژ دەخوێنی وەکوو کەسێك نوێژ بکە کە ماڵاوایی دەکا». یانێ: ماڵاوایی لە نەفس و هەوا و هەوەسی خۆی دەکات و بۆ لای خوا دەگەڕێتەوە.

دیسان پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «مَنْ لَمْ تَنْهَهُ صَلاتُهُ عَنِ الفَحْشَاءِ وَالمُنْكَرِ لَمْ يَزْدَدْ مِنَ اللّٰهِ إِلَّا بُعْداً»[4] واتە: «کەسێك نوێژخوێندن لە خراپەکاری دووری نەخاتەوە ئەوە جگە ئەوە نەبێ لە خواوە دوور بووەتەوە چیتر زیادی نەکردووە».

بزانە! کە نوێژ نزا و پاڕانەوەیە ئیتر کەی لەگەڵ غەفڵەتدا ڕێکیان دێت.

پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «لا يَنْظُرُ اللّٰهُ إِلَىٰ صَلاةٍ لَمْ يَحْضُرِ الرَّجُلُ فِيهَا قَلْبَهُ مَعَ بَدَنِهِ» واتە: «خوا ناڕوانێ بۆ نوێژی ئەو پیاوەی کە دڵی لەگەڵ جەستەیدا لە نوێژەکا نەبووبێ».

ئەڵێن: حەزرەتی ئیبراهیمعليه السلام کاتێ هەڵدەستا بۆ نوێژ دەنگی تەپەی دڵی لە دوو میلەوە ئەبیسرا.

---

١. طه: ١١.

٢. ابوداود: ١١٠٤ و احمد: ١٦٨٦٧ بلفظ: «اَلصَّلاةُ مَثْنَىٰ مَثْنَىٰ أَنْ تَشَهَّدَ فِي كُلِّ رَكْعَتَيْنِ وَ أَنْ تَبَاءَسَ وَ تَمَسْكَنَ وَ تُقْنِعَ بِيَدِكَ وَ تَقُولَ: اَللّٰهُمَّ...»، ترمذي: ٦٥١ و زاد فيه: «وَ تَخَشَّعُ وَ تَضَرَّعُ و تَمَسْكَنُ وَ تَذَرَّعُ وَ تُقْنِعُ يَدَيْكَ...».

٣. ابن‌ماجه: ٤١٦١، احمد: ٢٢٤٠٠، طبراني في الكبير: ٣٨٩٠.

٤. طبراني في الكبير: ١٠٨٦٢، مسند الشّهاب القضاعي: ٤٨٠، جامع الكبير للسيوطي: ٦٥٦٠.

## خێری مزگەوت‌کردنەوە:

پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «مَنْ بَنَىٰ مَسْجِداً لِلّٰهِ وَ لَوْ كَمَفْحَصِ قَطَاةٍ بَنَى اللهُ لَهُ قَصْراً فِي الْجَنَّةِ»[1] واتە: «کەسێك لەبەر ڕەزای خوا مزگەوتێ بکاتەوە با بە ئەندازەی هێلانە پەلەوەرێکیش بێت، ئەوە خوای گەورە لە بەهەشتدا کۆشکێکی بۆ دروست دەکات».

خوای گەورە [لە حەدیسی قودسیدا] فەرموویەتی: «إِنَّ بُيُوتِي فِي أَرْضِي الْمَسَاجِدُ وَ إِنَّ زُوَّارِي فِيهَا سُكَّانُهَا وَ عُمَّارُهَا فَطُوبَىٰ لِعَبْدٍ تَطَهَّرَ فِي بَيْتِهِ ثُمَّ زَارَنِي فِي بَيْتِي فَحَقٌّ عَلَى الْمَزُورِ أَنْ يُكْرِمَ زَائِرَهُ».

واتە: «ماڵەکانی من لە زەویدا مزگەوتەکانن، ئەوانەی کە دانیشتووی مزگەوت یان ئاوەدانکەری مزگەوتن ئەوە سەردانی من دەکەن. دەی خۆش بە حاڵی ئەو کەسەی کە لە ماڵی خۆیدا خۆی خاوێن ئەکات و جا ئێت سەر لە من ئەدات، لەسەر میوانداره کە ڕێزی میوانەکەی بگرێ».

پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «إِذَا رَأَيْتُمُ الرَّجُلَ يَعْتَادُ الْمَسْجِدَ فَاشْهَدُوا لَهُ بِالْإِيمَانِ».[2]

واتە: «هەر پیاوێکتان دیت کە خووی بە مزگەوتەوە گرتووە ئەوە شاهیدی ئیمانی بۆ بدەن».

ئەنەس رضي الله عنه دەفەرمێ: هەرکەس چراییك لە مزگەوتدا هەڵبکا، تاکاتێ کە لەو مزگەوتەدا تیشکی هەبێت مەلائیکەکان و ئەو فریشتانەی عەرشیان لە سەرشانە، داوای لێبوردنی لەلای خوا بۆ دەکەن.

## بەشی دووهەم: شێوەی ئەنجامدانی ئەرکانی نوێژ

نوێژخوێن هەرکاتێ کە دەسنوێژی تەواو کرد و خۆی لە پیسی زاهیری و دەروونی پاك کردەوە و شوێنی نوێژەکەشی خاوێن کرد و نێوان ناوك و چۆکی داپۆشی، پێویستە ڕوو لە قیبلە ڕاوەستێ و پێیەکانی جووت لە پاڵ یەك بە بڵاوی دابنێ و نەیانلکێنێ بە یەکەوە.

---

١. ابن‌ماجە: ٧٣٠ و زاد فيه: «أو أصغر»، احمد: ٢٠٥٠ و زاد فيه: «لِبَيْضِها»، طبرانى فى الكبير: ٦٧٠، ابن‌حبان فى صحيحه: ١٦٦٧، بيهقى: ٢٦٨١.

٢. ترمذى: ٣٠١٨، ابن‌ماجە: ٧٩٤، احمد: ١١٣٠٠، دارمى: ١٢٧٠، ابن‌حبان: ١٧٤٩، ابن‌خزيمه: ١٤٢٢، بيهقى: ٢٦٨٠.

چونكه پێغه‌مبه‌رﷺ، مه‌نعی كردووه له «الصفن والصفد» له نوێژدا. «صَفْد» واته: پێكه‌وه‌لكانی هه‌ردوو پێ، به‌و واتایه‌ش خوا به‌كاری هێناوه له «مُقَرَّنِينَ فِي الْأَصْفَادِ»[1] واته: «[تاوانباران له‌و ڕۆژه‌دا] به‌كۆت و زه‌نجیر پێكه‌وه به‌ستراون». هه‌روه‌ها «الصفن» واته: به سه‌رپێوه وه‌ستان، ئه‌م ئایه‌ته‌ش به‌م مانا هاتووه: ﴿إِذْ عُرِضَ عَلَيْهِ بِالْعَشِيِّ الصَّافِنَاتُ الْجِيَادُ﴾[2]. واته: «[بهێنه‌وه بیر] ئه‌و كاته‌ی كه شه‌وانه ئه‌سپگه‌لێكی ڕێكوپێك و جوان پیشانی ده‌درا».[3]

نوێژخوێن پێویسته سه‌ری دابخات و بۆ به‌رده‌م خۆی بڕوانێ و نیه‌ته‌كه‌ی له دڵدا بێت.- بۆ وێنه - نیه‌تی نیوه‌ڕۆ بهێنێ و به دڵ بڵێ: «أُؤَدِّي فَرْضَ الظُّهْرِ لِلّهِ» واته: نیه‌تم هه‌یه نوێژی فه‌رزی نیوه‌ڕۆ به‌ئه‌دا بخوێنم. با به وشه‌ی «أداء» له قه‌زا جیا ببێته‌وه هه‌روه‌ها به وشه‌ی نیوه‌ڕۆ له عه‌سر و به فه‌رز له سوننه‌ت جیا ببێته‌وه. جا ئه‌م نیه‌ته‌ی تا دوایی هاتنی «اللّٰه أَكْبَر» هه‌ر له دڵدا درێژه پێ بدا. هه‌ر دوو ده‌ستی بباته ئاستی هه‌ردوو شانی و دوو ئه‌نگوسته گه‌وره‌كه‌ی بلكێنێ به نه‌رمی هه‌ردوو گوێیه‌وه و سه‌رپه‌نجه‌كانی بباته لای ژووررووی گوێیه‌وه. ئه‌مه كۆی ئه‌و حه‌دیسانه بوو كه له‌م باره‌وه هاتبوون.

ئیدی بۆ بڵاوكردنه‌وه و به‌ستنی په‌نجه‌كانی له‌خۆی زۆر نه‌كات [هه‌ر جۆر بۆی ئاسان بوو وا بكات]. «اللّٰه أَكْبَر» بكات له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌یدا نیه‌ته‌كه‌ی - وه‌ك گوتمان - له دڵدا بێت. پاشان له‌گه‌ڵ «اللّٰه أَكْبَر»دا ده‌ستی به‌ربدا و ده‌ستی ڕاستی له‌سه‌ر ده‌ستی چه‌پی،[4] له سه‌ر ناوك و له ژێر سینگی‌دا، دابنێ.[5] به ده‌ستی ڕاستی ده‌ستی چه‌پی بگرێت و ئه‌نگوستی شاده و ئه‌نگوستی ناوه‌ڕاستی ده‌ستی ڕاست به‌سه‌ر باسكی ده‌ستی چه‌پیدا بڵاو بكاته‌وه و تووته و برا تووته‌ش به‌سه‌ر مه‌چه‌كی ده‌ستی چه‌پیدا بنووقێنێ. پاشان ده‌ست بكات به دوعای «إستفتاح» (وَجَّهْتُ وَجْهِيَ).

---

١. ابراهیم: ٤٩.

٢. ص: ٣١.

٣. «الصافن من الخيل الذي يرفع إحدى يديه أو رجليه و يقف على مقدم حاضرها» واته: سافن ئه‌و ئه‌سپه‌یه كه ده‌ستێكی یان پێیێكی به‌رز ده‌كاته‌وه و له‌سه‌ر نووكی سمی ڕاده‌وه‌ستێ - ته‌فسیری ئالووسی.

٤. مسلم: ٦٠٨، بخاري: ٦٩٨، ابوداود: ٦٤٤، احمد: ١٤٥٥٨.

٥. ابوداود: ٦٤٨، احمد: ٢٠٩٦١، ابن‌خزیمه: ٤٦٣.

سوننەتە پاش وتنی «الله أكبر» بڵێ: «اَللّٰهُ أَكْبَرُ كَبِيراً وَالْحَمْدُ لِلّٰه كَثِيراً وَ سُبْحَانَ اللّٰهِ بُكْرَةً وَ أَصِيلاً»[١].

پاش ئەوە دوعای دەسپێك بخوێنێ: «وَجَّهْتُ وَجْهِيَ لِلَّذِي فَطَرَ السَّمٰوٰاتِ وَ الْأَرْضَ حَنِيفاً وَ مٰا أَنَا مِنَ الْمُشْرِكِينَ إِنَّ صَلاتِي وَ نُسُكِي وَ مَحْيٰايَ وَ مَمٰاتِي لِلّٰهِ رَبِّ الْعٰالَمِينَ. لا شَرِيكَ لَهُ وَ بِذٰلِكَ أُمِرْتُ وَ أَنَا مِنَ الْمُسْلِمِينَ»[٢].

پاشان بڵێ: «سُبْحٰانَكَ اللَّهُمَّ وَ بِحَمْدِكَ وَ تَبٰارَكَ اسْمُكَ وَ تَعٰالَىٰ جَدُّكَ وَلا إِلٰهَ غَيْرُكَ»[٣].

پاشان بڵێ: «أَعُوذُ بِاللّٰهِ مِنَ الشَّيْطٰانِ الرَّجِيمِ»[٤] و بە خوێندنی سوورەتی حەمد دەست پێ بکات[٥] و تەواوی تەشدید و پیتەکانی بەجێ بێنێ و بۆ جیاوازی نێوان پیتی "ضاد" و "ظاء" تێبکۆشێ. پاش خوێندنی ئەلحەمد بڵێ: ئامین[٦] وکێشی بهێنێ و هۆشی ئەوەی بێ کە نەیلکێنێ بە ﴿وَ لَا الضّٰالِّينَ﴾ەوە.[٧]

لە نوێژی بەیانیدا سووورە درێژەکان بخوێنێ و لە مەغریب و باقی فەرزەکانیتردا سوورە کورتەکان وەکوو: ﴿وَالسَّمٰاءِ وَالطّٰارِقِ﴾[٨] یان وەکوو: ﴿وَالسَّمٰاءِ ذٰاتِ الْبُرُوجِ﴾[٩] و هەرچی بە قەدەری ئەمانە بێت بخوێنێ.

لە نوێژی بەیانییکدا کە لە سەفەردا بێت، ﴿قُلْ يٰا أَيُّهَا الْكٰافِرُونَ﴾[١٠] و ﴿قُلْ هُوَ اللّٰهُ أَحَدٌ﴾[١١] بخوێنێ. هەروەها ئەم دوو سوورەتە لە نوێژی سوننەتی بەیانیدا و لە سوننەتی تەواف و سوننەتی هاتنەناو مزگەوتدا بخوێنێ.

---

١. مسلم: ٩٤٣، ابوداود: ٦٥١، ترمذى: ٣٥١٦، نسائى: ٨٧٥، ابن‌ماجه: ٧٩٩، احمد:٤٣٩٩.

٢. أنعام: ٧٩ و ١٦٣ ـ ١٦٢. بلفظ: «وَ أَنَا أَوَّلُ الْمُسْلِمِينَ». مسلم: ١٢٩٠، ابوداود: ٢٤١٣، ترمذى: ٣٣٤٣، نسائى: ٨٨٦، احمد: ٦٩١.

٣. مسلم: ٦٠٦، ابوداود: ٦٥٨، ترمذى: ٢٢٦، نسائى: ٨٨٩، ابن‌ماجه: ٧٩٦، احمد: ١١٢٣٠.

٤. ـالنحل: ٩٨.

٥. بخارى: ٧٠١، مسلم: ٥٩٨، ابوداود: ٦٦٤، ترمذى: ٢٢٩، نسائى: ٨٩٣، ابن‌ماجه: ٨٠٤، احمد: ٦٩٩٠.

٦. بخارى: ٧٤٠، مسلم: ٦١٢، ابوداود: ٧٩٧، ترمذى: ٢٣١، نسائى: ٨٢١، ابن‌ماجه: ٨٣٧، احمد: ٦٨٩٠.

٧. الفاتحه: ٧.

٨. الطارق: ١.

٩. البروج: ١.

١٠. الكافرون: ١.

١١. الإخلاص: ١.

## ڕوکووع:

پاشان کڕنۆش بیات و پێویستە چەند شتێکی تێدا لەبەرچاو بگرێ:

لەکاتی چوونە ڕکووعدا «اللە أَکْبَر» بکات[1] و هاوکات دەستیشی بەرز بکاتەوەو «اللە أَکْبَر»ەکەشی هەر لە ئەووەڵەوە تا تەواو دەچەمێتەوە درێژە پێ بدا، هەر دوو دەستی لەسەر چۆکی دابنێت و قامکەکانی بەسەر چۆکیدا ڕوو بە پووزی بکاتەوە. چۆکی ڕاست بووەستێنێ و پشتی ساف ڕابگرێت بەشێوەیێ کە گەردن و سەر و پشتی وەکوو یەك ڕێك بێنەوە.

پیاو دەبێ ئەنیشکی هەر دوو دەستی لە پاڵووەکانی جیا بکاتەوە، بەڵام ژن پێویستە بیانلکێنێ بە خۆیەوە. جا سێ جار «سُبْحَانَ رَبِّيَ الْعَظِيمْ وَ بِحَمْدِهِ»[2] بخوێنێ. ئەگەریش بە تەنیا نوێژی دەخوێند هەرچەند کە مەیلی هەبێ ئەتوانێ ئەو زیکرە زیاد بخوێنێ.

پاش [ئەوەی کە بەم شێوە کە باسمانکرد کڕنۆشی برد] پشتی ڕاست بکاتەوەو ڕاست ڕاوەستێ و بڵێ: «سَمِعَ اللّٰهُ لِمَنْ حَمِدَهُ، رَبَّنا لَكَ الْحَمْدُ مِلْءَ السَّمٰوٰاتِ وَ مِلْءَ الْأَرْضِ وَ مِلْءَ مٰا شِئْتَ مِنْ شَيْءٍ بَعْدُ»[3] نابێ درێژە، بدا بەم ڕاوەستانەی، مەگەر بۆ قنووتی نوێژی بەیانی.

## سوجدە:

پاش ئەو ڕاوەستانە، دابنەوێتەوە بۆ سوجدە و لەکاتی نەوی بوونەوەکەیدا «اللە أَکْبَر» بڵێ[4] و تا دەگاتە سوجدە درێژەی پێ بدا. جا لە پێشدا چۆکی لە زەوی بنێ و جا هەر دوو دەستی پاشان لووت و تەوێڵی لە عەرز دابنێ. هەر دوو لەپی دەستی بەسەر زەویەکەدا بە بڵاوی دابنێ و ـ هەروەکوو ڕکووع ـ پیاو ئەنیشکی بەتەنشتیەوە نەلکێنی بە پێچەوانەی ژن. هەروەها پیاو پێکانی بە کراوەیی بهێڵێتەوە بەڵام ژن بیانبەستێ.[5] پیاو لە سوجدەدا سنگ و زگی بەرز ڕابگرێ بەڵام ژن تا دەتوانێ خۆی بە عەرز نزیك بکاتەوە.

---

١. بخاری: ٦٩٣ ـ ٦٩٤، مسلم: ٥٨٧، ابوداود: ٦٢٠، نسائی: ٨٦٧، ابن‌ماجە: ٨٥٤، احمد: ٦٧٩.

٢. مسلم: ١٢٩١، ابوداود: ٧٣٧ ـ ٧٣٦، ترمذی: ٢٤٣، نسائی: ١٠٣٦، ابن‌ماجە: ٨٧٨، احمد: ٣٣٣٤.

٣. مسلم: ٧٢٥، ابوداود: ٧٢٠، ترمذی: ٣٣٤٤، نسائی: ١٠٥٨، احمد: ٢٣١٤.

٤. بخاری: ٧٥٣، ابوداود: ٦٢٧، ترمذی :٢٨٠، احمد: ٧٩٠٥.

٥. بخاری: ٧٦٧ ـ ٧٧٠، مسلم: ٧٥٨، ابن‌ماجە: ٨٧٤، ترمذی: ٢٥٢، نسائی: ١٠٨١، احمد: ٢٥٢٦.

جا هەر دوو دەستی لە بەرانبەر شانیەوە لەسەر عەرز دابنێ و قامکەکانی بلکێنی بەیەکەوە. نابێ هەر دوو باسکی ـ بەو شێوە کە سەگ دەخەوێ ـ لەسەر عەرز دابنێ، چونکە پێغەمبەر مەنعی کردووە[١].

جا سێ جار بڵێ: «سُبْحَانَ رَبِّيَ الْأَعْلَىٰ وَ بِحَمْدِهِ»[٢]. ئەگەریش بە تەنها نوێژی کرد هەرچەند جار بیڵێ دروستە.

جا پاش ئەو سوجدە «اللّٰه أَڪْبَر» بڵێ و سەری بەرز بکاتەوەو بە هێمنی لەسەر پێی چەپی دابنیشێ و پێی ڕاستی قوت دابنێ و هەر دوو دەستی بخاتە سەرڕانی و قامکەکانی بەو شێوە وا ڕاحەتن دابنێ و بە زۆر پێکەوە نەیانلکینێ.[٣] جا بڵێ: «رَبِّ اغْفِرْ لِي وَارْحَمْنِي وَارْزُقْنِي وَاهْدِنِي وَ عَافِنِي فَاعْفُ عَنِّي»[٤].

پاشان سوجدەی دووهەم هەر بەو شێوە کە وتمان بیات و جا پاش ئەوە لە سوجدە هەستاوە، تۆزێ بۆ پشوو دەرکردنێ دابنیشێ و جا دەستی لەسەر عەرز دابنێ، بەڵام نابێ بۆ ئەوەی هەستێتەوە پێیەکی وە پێش بخات. پاشان بە دەم وتنی «اللّٰه أَڪْبَر»ەوە هەڵبستێتەوە.

## تەحیات:

لە ڕەکعەتی دووهەمدا پاش سوجدەکان دابنیشێ و تەحیات بخوێنێ. [جیاوازی تەحیاتی ئەووەڵ و دووهەم لەوەدایە] کە لە تەحیاتی ئەووەڵدا لەسەر پێی چەپی سوننەتە دابنیشێ و بەس سەڵوات لەسەر پێغەمبەر ﷺ بدات و لەسەر ئال و ئەسحاب سوننەت نییە. بەڵام لە تەحیاتی دووهەمدا سوننەتە لەسەر کەفەڵ (لاقنگ)ی دابنیشێ و سەڵوات لەسەر ئال و ئەسحاب بدات و دوعا سوننەتەکان بە تەواوی بخوێنێ. جا هەردوو دەستی لەسەر ڕانی

---

١. پێغەمبەر ﷺ لەمبارەوە دەفەرمێ: «لا يَفتَرِشْ أَحَدُكُمْ ذِرَاعَيْهِ فِي السُّجُودِ اِفْتِرَاشَ الْكَلْبِ» واتە: کەستان باڵی لە زەمین دانەنێ بەو شێوە وا سەگ باڵی دادەنێ. نسائی: ١٠٩١، احمد: ١٢٩٣٩، بخاری: ٧٧٩ و مسلم: ٧٦٢ بلفظ آخر ـ وەرگێر.

٢. ابوداود: ٧٣٦، مسلم: ١٢٩١، ترمذی: ٢٤٢، نسائی: ١٠٣٦، ابن‌ماجه: ٨٧٨، احمد: ٣٣٣٤.

٣. ابوداود: ٦٢٧، ابن‌ماجه: ١٠٥١.

٤. ابن‌ماجه: ٨٨٨، احمد: ٣٣٣٤، ترمذی: ٢٦٢، احمد: ٢٧٤٥.

دابنێ و قامکەکانی دەستی ڕاستی بنووقێنێ، جگە ئەنگوستی شادەی نەبێ[1] کە بە کراوەیی بیهێڵێتەوە و لەکاتی وتنی «لا إِلٰهَ إِلَّا اللّٰهُ» ئاماژەی پێ بکات و بی‌جووڵێنێ.[2]

پاش ئەوەی کە تەحیاتی دووهەمی تەواو کرد بڵێ: «اَلسَّلامُ عَلَيْكُمْ وَ رَحْمَةُ اللهِ وَ بَرَكَاتُهُ» و سەر بەرەولای ڕاست وەرچەرخێنێ تا ئاستێ کە لە پشتەوە گۆنای ببینرێ و بەم شێوەش بەلای چەپدا سەلام بداتەوە.[3] جا بەم سەلامدانەوە مەبەستی ئەوە بێت کە سەلام لەسەر فریشتە و موسڵمانان بکات، جا با زۆر سڵامەکەی درێژ نەکاتەوە.

## هەڵاواردنی فەرزەکانی نوێژ لە سوننەتەکانی:

نوێژ دوازدە ڕوکنی فەرزی هەیە:

١. نیەت؛

٢. وتنی «اللّٰه أَكْبَر»؛

٣. ڕاوەستان؛

٤. خوێندنی ئەلحەمد؛

٥. چەمینەوە بۆ ڕوکووع تا ئاستێ دەستی بگاتە سەر چۆکی و تۆزێ ڕابووەستێ؛

٦. ئیعتیدال [واتە: ڕاستبوونە لە ڕکووع]؛

٧. سوجـدە بردن، بە تۆزێ ڕاوەستانەوە؛

٨. دانیشتن لە نێوان دوو سوجدەدا؛

٩. دانیشتن بۆ تەحیاتی ئاخر؛

١٠. تەحیاتی ئاخر؛

١١. سەڵوات لەسەر پێغەمبەر صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ؛

١٢. سەلام بەلای ڕاستدا.

---

١. مسلم: ٩١٢.

٢. ترمذی: ٢٧١، ابوداود: ٦٢٤، نسائی: ٨٧٩، احمد: ١٨١١٥.

٣. ابوداود: ٨٤٦ ـ ٨٤٥، نسائی: ١١٣٠، احمد: ٣٥١٩، مسلم: ٩١٦.

# بەشی سێهەم: مەرجە دەروونییەکانی دڵ

## یەکەم: خوشووع و ملکەچی:

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿أَقِمِ الصَّلاةَ لِذِكْرِي﴾[1] واتە: «نوێژ بخوێنن بۆ ئەوەی منتان لەبیر بێت».

پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «كَمْ مِنْ قَائِمٍ حَظُّهُ مِنَ الصَّلاةِ التَّعَبُ وَالنَّصَبِ» واتە: «زۆر نوێژخوێن هەیە کە لە نوێژدا تەنها ماندوویەتی و ڕەنج و سەختی بۆ دەمێنێتەوە».

جا بزانە نوێژ جگە لە زیکر و قورئانخوێندن و تکا و پاڕانەوە وتووێژ لەگەڵ خودادا نەبێ هیچیتر نییە، بەڵام ئەمە بە تەواوی جێ ناگرێ مەگەر بە حوزووری قەلب و بە تێگەیشتن و ڕێزنان لە خوا و سام و هەیبەت لێبردن و بە شەرم و حەیا بوون. بە کورتی هەتا نوێژخوێن خوا باشتر بناسێ، ترس و ئاگاداری دڵی زیاتر دەبێ.

جا هەرکاتێ کە دەنگی بانگت بیست، ترسی جاڕی ڕۆژی قیامەتت بێ بە دڵاو بە ڕواڵەت و بە دڵ خۆتی بۆ ئامادە بکە و وڵامی بدەرەوە و بە پەلە بچۆ بە دەمیەوە. چونکە ئەوانەی وا ئازا دەچن بە پیری ئەم بانگەوازەوە، هەر ئەوانەن وا لە ڕۆژی قیامەتی گەورەدا بە نەرم و نیانی بانگیان لێ دەکرێ. جا ئەگەر دڵت لە وەختی بانگدا پڕ بوو لە خۆشی و شادمانی و بە تاسە و حەزەوە چوویت بەرەو پیرییەوە، ئەوە حاڵەتت لە وەختی ئەو بانگهێشتەی قیامەتیشەدا ئاوەهایە. بۆیە پێغەمبەرﷺ بە بیلال دەفەرمێ: «أَرِحْنَا يَا بَلَالُ» واتە: «ئەی بیلال [بە بانگەکەت] بمانخەرە ڕەحەتییەوە»[2]. چونکە پێغەمبەرﷺ فەرحانەتی دڵ و چاوڕۆشنی لە نوێژدا بوو.[3]

خۆ خاوێنکردنەوەی ڕاستەقینە بریتییە لە خاوێنکردنی دەروون لە غەیری خوا، چونکە بە ئەم خاوێنیە دەروونییە بە نوێژ دائەمەزرێ. ئەگەر شەرمگات بە جلوبەرگی زاهیری داپۆشی ئەدی ئەی بەچی شەرمگای دەروونت لەخوا دادەپۆشی. کەوابوو لە بەردەم خوا بە

---

١. طه: ١٤.

٢. ابوداود: ٤٣٣٣، احمد: ٢٢٠٠٩، طبراني: ٦٠٩٠.

٣. نسائي: ٣٨٧٨، احمد: ١١٨٤٥.

ئەدەب بە و بزانە کە خوا ئاگای لە خۆت و دەروونت هەیە و بە ڕواڵەت و بە دڵ مل کەچ بە و بڕوانە ئەگەر لە بەردەم پاشاییَکدا بوویتایە چلۆن دەوەستای، لە بەردەم خواشدا هەر ئاوا بووەستە. دەی‌خۆ لە بەینی خوا و پاشای دونیاییدا، حاشای گەرەکە. ئەمان پاکیان بەندەی خوان و لە خزمەتی ئەودان.

جا ئەگەر ئاوەهات کرد ئەوە لەوا کە وتووتە: «وَجَّهْتُ وَجْهِيَ لِلَّذِي فَطَرَ السَّمٰوٰاتِ وَ الْأَرْضَ حَنِيفاً مُسْلِماً وَ مَا أَنَا مِنَ الْمُشْرِكِينَ» ڕاستت کردووە و درۆت نەداوە.

جا بترسە لەوەی کە کاتێ ئەڵێی: «إِنَّ صَلاتِي وَ نُسُكِي وَ مَحْيٰايَ وَ مَمٰاتِي لِلّٰهِ» درۆ بکەیت چونکە ماڵوێران ئەبی.

پێویستە لە کاتی سوجدە و ڕوکووعدا بیر لە مەزنی و گەورەیی خوا بکەیتەوە و وێڕای ئەوەش چاوت بە پەستی و خواری خۆتەوە ببێت. خوای گەورە بە ڕەحم و بەزەیی خۆی تۆی کردۆتە شیاوی ئەوەی عیبادەتی بۆ بکەی و عیبادەتی خواش شتێك جگە لەوەی کە بە ئەدەب و بە حوزووری قەلبەوە بچیتە خزمەتی، نییە.

پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «إِنَّ اللّٰهَ تَعٰالَىٰ مُقْبِلٌ عَلَى الْمُصَلِّي مٰا لَمْ يَلْتَفِتْ»[1] واتە: «تا نوێژخوێن ڕوو وەرنەچەرخێنی خوا چاو لە نێو چاوی داناخات» ئەدی تۆش هۆشت بێ ڕواڵەت و دەروونی خۆت لە ئاوڕدانەوە و ڕوو وەرچەرخان بپارێزی.

پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «إِنَّ الْعَبْدَ لَيُصَلِّي وَلا يُكْتَبُ لَهُ مِنْ صَلاتِهِ لا نِصْفُهٰا وَلا ثُلُثُهٰا وَلا رُبْعُهٰا وَلا خُمْسُهٰا وَلا سُدُسُهٰا وَلا عُشْرُهٰا، إِنَّما يُكْتَبُ لِلرَّجُلِ مِنْ صَلاتِهِ مٰا عَقَلَ مِنْها»[2].

واتە: «کاتی وا هەیە نوێژخوێن نوێژ دەکات کەچی هیچ کە خێری تەواوی نوێژەکەی بۆ نانووسرێ بەڵکە نە خێری نیوەی، نە سێیەکی نە چواریەکی، نە پێنجیەکەی، نە شەش یەکی، نە دەیەکی نوێژەکەی بۆ نانووسرێ. بەڵکوو تەنها خێری ئەو بەشەی بۆ دەنووسرێ کە وا ئاگای لێ بووە و لێی تێگەیشتووە».

هەندێ گوتوویانە: جاری وا هەیە بەندەیێك سوژدە دەبات و بەلای خۆیەوە وا دەزانێ کە بەو سوژدەیە بەخواوە نزیك بۆتەوە، کەچی ئەگەر گوناحی ئەو سوژدەیە بەسەر خەڵکی شارەکەیدا دابەش بکرێ بە تێکڕا لەناو دەچن.

---

١. ابوداود: ٧٧٥، نسائی: ١١٨٢، احمد: ٢٠٥٣١.

٢. احمد: ١٨١٢٢، ابوداود: ٦٧٥، بیهقی: ٢٨٥٢، نسائی: ٦١٢ ـ ٦١١.

پرسیاریان لێ کرا: ئەدی ئەوە چلۆنە؟!

فەرموویان: ئەوە لەو وەختەدا خەریکی سوژدەیە لە خزمەتی خوا، دڵی داوەتە هەوا و هەوەسی دونیایی و خەریکی سەیری کارهاییکی پووچ و بەتاڵە کە زاڵبوون بە سەریدا.

## بەشی چوارەم: پێشنوێژی و ئیقتیدا

پێغەمبەرصَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فەرموویەتی: «اَلْأَئِمَّةُ ضُمَنَاءُ»[1] واتە: «پێشنوێژان زامنی نوێژی خەڵکین».

پێشنوێژ پێویستە ئیمامەت نەکات بۆ کەسانێ وا ڕقیان لێیەتی. کاتێ کەسێ تەرخان بکرێ بۆ بانگوێژی ئیدی بۆ پێشنوێژی هەڵنابژێررێ، چونکە بانگوێژی سالمتر و خێری زۆرترە؛ بەڵام وتەی ڕاست ئەوەیە: کە ئیمامەت لە بانگوێژی بۆ کەسێ کە بتوانێ ئەرکەکانی جێ بەجێ بکات، خێری زۆرترە بۆیە پێغەمبەر لەسەری بەردەوام بووە. هەروەها پێویستە کە هۆشتان بە وەختی نوێژەکانەوە بێت واتە: نوێژ لە ئەووەڵی وەختدا بخوێنن، چونکە نوێژی ئەووەڵی وەخت، خوا پێی ڕازییە؛ بەڵام نوێژ ئاخری وەخت ئەوەندەی هەیە خوا ئینسانی پێ ئەبەخشێ [دەنا پێی ڕازی نییە]. خۆ دیاریشە دڵی خوا ڕازی بێت باشترە تا ئەوەی تەنها خوا ئینسان ببەخشێ.

پێویستە پێشنوێژ سێ کورتە ڕاوەستانی هەبێ: ـ ئاوا لە پێغەمبەرەوە نەقڵ کراوە ـ.

**یەکەم:** لەکاتی بێدەنگ خوێندنی دوعای "استفتاح" ئەمە درێژترین بێدەنگ ڕاوەستانە.

**دووهەم:** دوای خوێندنی ئەلحەمد و پێش دەستپێکردنی سوورەتیتر، ئەمەش نیوەی وەستانی ئەووەڵە.

**سێهەم:** پاش ئەوەی سوورەتی دوای ئەلحەمدی تەواوکرد، ئەمە دەبێتە کەمترین ڕاوەستان.[2]

مەئموم نابێ بەهیچ شێوەی پێش ئیمام بکەوێ، یانی نابێ پێش ئیمام بڕوا بە ڕوکووعدا، هەروەها بۆ تەواوی ڕوکنەکانیتریش [واتە: تا ئیمام پێش نەکەوێ ئەم وەدووی نەکەوێ].[3]

---

١. بیهقی فی معرفة السّنن والآثار: ٦٦٢، ابن‌خزیمه: ١٤٤٧، شافعی فی مسنده: ١٢٠.

٢. دارمی: ١٢٩٠، دارقطنی: ١٢٩٠، و فی بعض روایات سکتتین: ابوداود: ٦٦٠، ترمذی: ٢٣٣، ابن‌ماجه: ٨٣٦، احمد: ١٩٣٧٤ و فی بعض سکتة واحدة: نسائی: ٨٨٤، احمد: ٩٤٠٥.

٣. ابوداود: ٥٢٤ ـ ٥٢٧، ابن‌ماجه: ٩٥٣، ١٦٢٣٥، مسلم: ٧٣٠.

هەندێ گوتوویانە: ئەو نوێژخوێنانەی سەلامی نوێژ دەدەنەوە سێ بەشن:

بەشێکیان، خێری بیست و پێنج نوێژیان بۆ نووسراوە، ئەوانەش کەسانێکن وا پاش ئیمام «اللّٰه أَكۡبَر» ئەکەن و دەچن بە ڕکووعدا.

دووهەم: خێری یەك نوێژیان بۆ نووسراوە، ئەوانەش کەسانێکن وا هاوشان لەگەڵ ئیمامدا ڕوکنەکان ئەنجام دەدەن.

سێهەم: هیچ خێری نوێژیان بۆ نەنووسراوە، ئەویش ئەوانەن وا پێش ئیمام کەوتوون.

**[خاڵێکی گرینگ]**: زانایان لەسەر ئەوەی کە ئایا پێویستە ئیمام لە شوێنی کەسێکی تازە هاتوو ڕابووەستێ بۆ ئەوەی خێری جەماعەتی دەست بکەوێ، یان نە؟ ناکۆکی و جیاوازییان هەیە. وا دیارە ئەوەیان باشتر بێ کە ڕاوەستی بە مەرجێ تەنها لەبەر خوا بێ و فەرقی کەسی تێدا نەخات.

لە نوێژی بەیانیدا ئیمام و مەئمووم بەم شێوە قونووت بخوێنن: ئیمام بە دەنگی بەرز «اَللّٰهُمَّ اِهْدِنٰا فِيمَنْ هَدَيْتَ ... تا «إِنَّكَ تَقْضِي وَلا يُقْضىٰ عَلَيْكَ»[1] بخوێنێ و مەئموومەکان ئامین بکەن جا لەوە بەدوا مەئموومەکان وێڕای ئیمام بەهێمنی پاشماوەی قنووتەکە بخوێنن یان ئیمام بە دەنگی بەرز بیخوێنێ و ئەمان بڵێن: «أَشْهَدُ» [یان «صَدَقْتَ وَ بَرَرْتَ].

## بەشی پێنجەم: خێری جومعە و فەرز و سوننەت و شێوازی بەڕێوەبردنی

پێغەمبەرﷺ دەفەرمێ: «مَنْ تَرَكَ الْجُمُعَةَ ثَلاثاً مِنْ غَيْرِ عُذْرٍ طَبَعَ اللّٰهُ عَلَىٰ قَلْبِهِ»[2] واتە: «هەرکەس بە بێ‌عوزر، سێ جار نوێژی جومعە تەرك بکات خوای گەورە مۆر دەکوتێ بە سەر دڵیدا. یان بە عیبارەتێکی‌تر هاتووە: «نَبَذَ الْإِسْلامَ وَرٰاءَ ظَهْرِهِ»[3] واتە: ئەوە ئیسلامی خستووەتە پشت سەری.

---

١. تمامه: «اَللّٰهُمَّ اهْدِنٰا فِيمَنْ هَدَيْتَ وَ عٰافِنٰا فِيمَنْ عٰافَيْتَ وَ تَوَلَّنٰا فِيمَنْ تَوَلَّيْتَ وَ بٰارِكْ لَنٰا فِيمٰا أَعْطَيْتَ وَقِنٰا شَرَّ مٰا قَضَيْتَ إِنَّكَ تَقْضِي وَلا يُقْضىٰ عَلَيْكَ وَ إِنَّهُ لا يَذِلُّ مَنْ وٰالَيْتَ وَلا يَعِزُّ مَنْ عٰادَيْتَ تَبٰارَكْتَ رَبَّنٰا وَ تَعٰالَيْتَ» ابوداود: ١٢١٤، ترمذی: ٤٢٦، نسائی: ١٧٢٥، ابن‌ماجه: ١١٦٨، احمد: ١٦٢٥.

٢. احمد: ١٤٠٣٢، ابوداود: ٨٨٨، ترمذی: ٤٦٠، نسائی: ١٣٥٢، ابن‌ماجه: ١١١٦ بروایات مختلفة.

٣. بیهقی فی شعب الإیمان: ٢٨٧٢، عبدالرّزّاق فی مصنّفه: ٥١٦٩، ابی‌یعلی الموصلی فی مسنده: ٢٦٥١ بلفظ: «مَنْ تَرَكَ أَرْبَعَ جُمَعٍ مُتَوٰالِيٰاتٍ....».

لە حەدیسێکدا ئەنەس رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ لە پێغەمبەرەوە صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ گێڕاویەتەوە کە فەرموویەتی: «أَتَانِي جِبْرَائِيلُ عَلَيْهِ السَّلَامُ وَ فِي كَفِّهِ مِرْآةٌ بَيْضَاءُ، وَ قَالَ: هٰذِهِ الْجُمُعَةُ يَفْرِضُهَا عَلَيْكَ رَبُّكَ لِتَكُونَ لَكَ عِيداً وَ لِأُمَّتِكَ مِنْ بَعْدُ، قُلْتُ: فَمَا لَنَا فِيهَا، قَالَ: لَكُمْ فِيهَا خَيْرُ سَاعَةٍ، مَنْ دَعَا فِيهَا بِخَيْرٍ هُوَ لَهُ قَسَمٌ، أَعْطَاهُ اللّٰهُ سُبْحَانَهُ إِيَّاهُ، أَوْ لَيْسَ لَهُ، قَسَمٌ ذُخِرَ لَهُ مَا هُوَ أَعْظَمُ مِنْهُ، وَ هُوَ سَيِّدُ الْأَيَّامِ عِنْدَنَا و نَحْنُ نَدْعُوهُ فِي الْآخِرَةِ يَوْمَ الْمَزِيدِ، قُلْتُ: وَ لِمَ، قَالَ إِنَّ رَبَّكَ اِتَّخَذَ فِي الْجَنَّةِ وَادِياً أَفْيَحَ مِنَ الْمِسْكِ الْأَبْيَضِ، فَإِذَا كَانَ يَوْمَ الْجُمُعَةِ نَزَلَ مِنْ عِلِّيِّينَ عَلَىٰ كُرْسِيِّهِ فَيَتَجَلَّىٰ لَهُمْ حَتَّىٰ يَنْظُرُونَ إِلَىٰ وَجْهِهِ الْكَرِيمِ»[1].

واتە: جوبرەئیل عَلَيْهِ السَّلَامُ هات بۆلام ئاوێنەیەکی سپی بەدەستیەوە بوو. فەرمووی: ئەمە جومعەیە، خوا لەسەر تۆ فەرزی کردووە تا ببێتە جێژن بۆ تۆ و بۆ ئومەتەکەت لە پاش خۆت. منیش گوتم ئەدی چی تێدایە بۆ ئێمە؟ گوتی: سەعاتێکی پڕخێر و بەرەکەتی تێدایە. هەرکەس دوعای خێری تێدا بکات، خوای گەورە بەشێکی گەورەی پێ دەدا، ئەگەریش بەشی پێ نەدرێ، ئەوە بۆ قیامەتی بەشێ گەورەتر پاشەکەوت دەکات. جومعە بەلای ئێمەوە گەورەی ڕۆژەکانە و لەو دونیاش بە «یوم المزید» [واتە: ڕۆژی زۆر بوون] ناوی دەبەین. منیش لێم پرسی: بۆچی؟ جوبرەئیل فەرمووی: خوای گەورە لە بەهەشتدا شیوێکی هەیە بۆنی لە میسکی سپی خۆشترە، لە ڕۆژانی هەینیدا نووری عەزەمەتی خوا لە عیلليینەوە دێتە خوارەوە بۆ سەر کورسی و لەوێ خۆی وەدەردەخا تا بۆی بڕوانن.

جا بزانە جومعە دانامەزرێ مەگەر بە چل پیاو کە تەکلیفیان لەسەر بێ و کۆیلە نەبن و خەڵکی ئەو شوێنە بن و هاوین و زستان هەر لەوێ بمێننەوە.[2] پێویستە بۆ ئەوە جومعە دابمەزرێ جومعەیتری وە پێش نەکەوێ، مەگەر لە شارێکی گەورەدا کە گومانی ئەوە هەبێ کە خەڵك لە مزگەوتی جامیعەدا جێیان نابێتەوە، ئەوە دروستە بە ئەندازەی پێویست: دوان و سیان و... جومعەی تێدا بخوێندرێ.[3]

---

١. طبرانی فی الأوسط: ٢١٦٥ برواية أخرى، مجمع الزّوائد للهيثمي ج١٠ ص٤٢١.

٢. هذا قول الشّافعي رَحِمَهُ اللَّهُ باجتهاده، الأم للشافعي: ج١ ص٢١٩، الحاوي الكبير للماوردي: ج٢ ص٩٢٥، المجموع للنووي: ج٤ ص٥٠٢.

٣. المجموع للنووي: ج٤ ص٥٨٥ باب صلاة الجمعة.

## فەرزەکانی نوێژی جومعە:

لە نوێژی جومعەدا دوو خوتبە فەرزە و پێویستە ئیمام بە پێوە بیانخوێنێ و لە نێوانیاندا دابنیشێ. خوتبەی ئەوەڵ چوار فەرزی تێدایە:

**یەکەم:** حەمد و ستایشی خوا کە لانی کەم ئەبێ ئیمام بڵێ: «الحمد لله».

**دووهەم:** سەڵاواتدان لەسەر پێغەمبەر.

**سێهەم:** ئامۆژگاری بۆ خۆ پارێزی و تەقوا.

**چوارەم:** خوێندنی لانی کەم ئایەتێ لە قورئان.[1]

هەروەها لە خوتبەی دووهەمدا هەر ئەو چوار شتە فەرزە جگە لەوە نەبێ لەباتی قورئانخوێندن دوعای خێر بخوێنێ دروستە.

ئەو چل نەفەرە واجبە گوێ شل کەن بۆ هەر دوو خوتبەکە.[2]

## سوننەتەکانی نوێژی جومعە:

هەرکاتێ خۆر لە نێوەڕاستی ئاسمان لای دا و بانگوێژ بانگی دا و ئیمام بەسەر مینبەرەوە دانیشت، سوننەتە هیچ نوێژێ نەخوێندرێ، مەگەر سوننەتی هاتنە نێو مزگەوت. لە کاتی دەستپێکردنی خوتبەوە سوننەتە بێدەنگی ڕابگیرێ و کەس قسە نەکات. لە ڕۆژی جومعەدا عەتر و حەمامکردن و جلوبەرگی سپی لەبەرکردن و خۆ بۆنخۆشکردن سوننەتە.[3]

پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «مَنْ رٰاحَ فِي السّٰاعَةِ الْأُولٰى فَكَأَنَّمٰا قَرَّبَ بَدَنَةً وَ مَنْ رٰاحَ فِي السّٰاعَةِ الثّٰانِيَةِ فَكَأَنَّمٰا قَرَّبَ بَقَرَةً، وَ مَنْ رٰاحَ فِي السّٰاعَةِ الثّٰالِثَةِ فَكَأَنَّمٰا قَرَّبَ كَبْشاً أَقْرَنَ، وَ مَنْ رٰاحَ فِي السّٰاعَةِ الرّٰابِعَةِ فَكَأَنَّمٰا قَرَّبَ دَجٰاجَةً، وَ مَنْ رٰاحَ فِي السّٰاعَةِ الْخٰامِسَةِ فَكَأَنَّمٰا قَرَّبَ بَيْضَةً، فَإِذٰا خَرَجَ الْإِمٰامُ طُوِيَتِ الصُّحُفُ وَ رُفِعَتِ الْأَقْلامُ وَاجْتَمَعَتِ الْمَلائِكَةُ عِنْدَ الْمِنْبَرِ يَسْتَمِعُونَ الذِّكْرَ،[4] فَمَنْ جٰاءَ بَعْدَ ذٰلِكَ فَإِنَّمٰا جٰاءَ لِحَقِّ الصَّلاةِ لَيْسَ لَهُ مِنَ الْفَضْلِ شَيْءٌ».

---

١. المجموع للنووی: ج٤ ص٥١٩ باب صلاة الجمعة.

٢. روضة الطّالبین للنووی: ج١ ص١٧٢.

٣. روضة الطّالبین للنووی: ج١ ص١٦٢.

٤. بخاری: ٨٣٢، مسلم: ١٤٠٣، ابوداود: ٢٩٧، ترمذی: ٤٥٩، نسائی: ١٣٧١، احمد: ٩٥٤٦.

واتە: «هەرکەس لە ساعەتی هەووەڵی ڕۆژدا بڕوات بۆ نوێژی جومعە وەکوو ئەوە وایە وشترێکی قوربانی کردبێ، هەرکەسێ لە ساعەتی دووهەمدا بڕوات وەکوو ئەوە وایە گایێکی قوربانی کردبێ. هەرکەسێ لە ساعەتی سێهەمدا بڕوات ئەوە وەکوو ئەوە وایە بەرانێکی شاخداری قوربانی کردبێ. هەرکەسێ لە ساعەتی چوارەمدا بڕوات وەکوو ئەوە وایە مریشکێکی لە ڕێی خوادا سەر بڕیبێ. هەرکەسێ لە ساعەتی پێنجەمدا بڕوات وەکوو ئەوە وایە هێلکەیێکی بەخشیبێ. جا هەرکاتێ ئیمام بێ بۆ نوێژ، فریشتەکان دەفتەر و قەڵەمەکانیان ئەپێچنەوە و لەبەر مینبەرەکەدا کۆ دەبنەوە و گوێ بۆ خوتبەکە ڕادەدێرن. جا هەرکەس پاش ئیمام بێت، ئەوە تەنها هاتووە نوێژەکەی بخوێنێ و خێری زیاتری بەرناکەوێ».

سەعاتەکانی ڕۆژی جومعە بەم شێوە دابەش دەکرێ: یەکەم: لە بەیانیەوە[1] تا خۆرکەوتن. دووهەم: تا بەرزبوونەوەی خۆر، سێهەم: تا گەرمبوون و بڵاوبوونەوە تیشکی خۆر، چوارەم و پێنجەم: پاش چاشت تا خۆر لە نێوەڕاستی ئاسمان لادەدا.

پێویستە نوێژخوێن کاتێ دەڕواتە نێو مزگەوت بە سەر و ملی خەڵکدا هەنگاو نەنێ و نەدا بە بەردەمیاندا. لە شوێنێکیش دابنیشێ ڕێی کەس نەگرێت و بدەن بە بەردەمیدا. هەتا بۆی بکرێ بڕواتە سەفی هەووەڵەوە. هەرکاتیش کە نوێژ تەواو بوو، دەست بکا بە ویرد و زیکر خوێندن و ئاگادار بێت خێری ئەو سەعاتە ـ کە باسمان کرد ـ لە ڕۆژی هەینیدایە لە دەستی نەدات.[2]

بە زۆری لەسەر پێغەمبەرﷺ سەڵوات بدات.[3] چونکە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «أَكْثِرُوا الصَّلاةَ عَلَيَّ فِي اللَّيْلَةِ الغَرَّاءِ وَالْيَوْمِ الْأَزْهَرِ»[4].

واتە: «لە شەو و ڕۆژی پیرۆزی هەینیدا لەسەرم زۆر سەلەوات بدەن».

سوننەتە لەم ڕۆژەدا بەتایبەتی خێرات و بەخشش بکات.[5] هەروەها سوننەتە دانەنیشێ لە مزگەوتدا تا چوار ڕەکعەت نوێژ دەخوێنێ و لەهەر ڕەکعەتێکدا پەنجا جار سوورەتی ﴿قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ﴾ دەخوێنێ.

---

١. شرح النووی علی مسلم: ١٤٠٣.

٢. روضة الطّالبین: ج١ ص١٦٢ ـ ١٦٣.

٣. ابن‌ماجه: ١٦٢٧، ابوداود: ٨٨٣ ـ ١٣٠٨، نسائی: ١٣٥٧، احمد: ١٥٥٧٥.

٤. بیهقی: ٢٧٧٢.

٥. نسائی: ١٣٩١، ابن‌ماجه: ١٠٧١.

جا ئەگەر بۆی لوا با ڕۆژی جومعە تایبەت بکات بە ئەرك و بەرنامەی قیامەتەوە و خۆی بە کار و باری دونیایی نەخجڵێنێ. چونکە ڕۆژی هەینی کەفارەتە بۆ گوناحانی بەینی هەر دوو جومعە. نەقڵکراوە: هەرکەس لە شەوی جومعەدا بڕوات بۆ سەفەر هەردوو فریشتەکەی سەرشانی دوعای شەڕی دەکەن.[1] بەڵام پاش خۆرکەوتن حەرامە سەفەر بکات مەگەر لە کاروانی ڕەفیقانی جێ بمێنێ.[2]

## بەشی شەشەم: سوننەتەکان

نابێ سوننەتەکان تەرك بکرێ، چونکە ئەو سوننەتانە قەرەبووی ناتەواوی فەرزەکان دەکەنەوە.[3] نوێژی فەرز وەکوو سەرمایە وایە و نوێژی سوننەت وەکوو خێری ئەو سەرمایەیە.

سوننەتی ڕەواتیب ـ بەو شێوە لە کتێبە فیقهییەکاندا باسی کراوە ـ نابێ تەرك بکرێت. سوننەتی چاشت کە بریتییە لە دوو ڕەکعەت یان چوار یا زۆرتر، تەرككردنی دروست نییە.[4] نابێ شەونوێژ و شەوبێداری و دوو ڕەکعەتی سوننەتی سوبح تەرك بکرێت. [چونکە پێغەمبەرﷺ لەمبارەوە دەفەرمێ]: «رَكْعَتَا الصُّبْحِ خَيْرٌ مِنَ الدُّنْيا وَ مٰا فِيهٰا»[5] واتە: «خێری دوو ڕکعەتی سوننەتی بەیانی چاکترە لە دنیا و ئەوەی لە دنیادایە». کاتەکەشی لە کازیوەوە کە بریتییە لەو ڕووناکییە کە ئاسۆی ئاسمان دادەگرێ نەك ئەو ڕووناکییەکە شێوەی موستەتیلی هەیە [واتە: ڕووناکییەکە ئاسۆییە نەك ستوونی].

## بەشی حەوتەم: نوێژی جەژنان:

نوێژی جەژنان سوننەتێکە کە پێغەمبەرﷺ زۆر داکۆکی لەسەری کردووە و یەکێکە لە دروشمەکانی دین.

پێویستە چەند شتێکی تێدا لەبەرچاو بگیرێ:

---

١. کزالعمال للهندی: ١٧٥٤٠، جامع الکبیر للسیوطی: ٥٠٩٠، تحفة الاحوذی شرح سنن الترمذی: ٤٨٥.

٢. ترمذی: ٤٨٥، احمد: ١٨٦٥.

٣. ابوداود: ٧٣٣، ابن‌ماجه: ١٤١٥، احمد: ٩١٣٠، نسائی: ٤٦٣.

٤. نسائی: ١٧٧٩، احمد: ٢٤٦٣٥، ترمذی: ٥٤٤.

٥. مسلم: ١١٩٣، ترمذی: ٣٨١، نسائی: ١٧٣٨، احمد: ٢٥٠٨٣.

یەکەم: سێ جار لە سەریەك بڵێ: «اَللّٰهُ أَكْبَرُ، اَللّٰهُ أَكْبَرُ، اَللّٰهُ أَكْبَرُ كَبِيراً وَالْحَمْدُ لِلّٰهِ كَثِيراً وَ سُبْحَانَ اللّٰهِ بُكْرَةً وَ أَصِيلاً، لا إِلٰهَ إِلَّا اللّٰهُ وَحْدَهُ لا شَرِيكَ لَهُ، مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ وَ لَوْ كَرِهَ الْكَافِرُونَ»[1].

پێویستە لە جێژنی ڕەمەزاندا لە شەوی جێژنەوە «الله أَكْبَر»[2] وتن دەست پێ بکات و تا نوێژی جێژن درێژەی پێ بدات. بەڵام لە نوێژی جێژنی قورباندا لە تۆزێ پاش نوێژی بەیانی عەرەفەوە تا سێ ڕۆژ پاش جێژن درێژەی پێ بدات.[3]

پاش نوێژە فەرزەکان «الله أَكْبَر» بکات، هەندێکیش ئەڵێن: پاش نوێژە سوننەتەکان.[4]

## سوننەتەکانی نوێژی جێژن:

یەکەم: خۆی بشۆرێ و عەتر بدا لە خۆی و خۆی بڕازێنێتەوە[5].

دووهەم: منداڵ و پیرەژنان بیات بۆ مزگەوت.[6]

سێهەم: بە ڕێگەیێکدا بڕوات و بە ڕێگەیێکی‌تردا بگەڕێتەوە.[7]

چوارەم: جگە لە مەککە و بەیتولموقەددەسدا نەبێ سوننەتە لە دەشتدا نوێژی جێژن بخوێنرێ، مەگەر باران بباریێت، لەو وەختەدا لەنێو شاردا سوننەتە.[8]

کاتی نوێژی جێژن لە خۆرکەوتنەوە تا لادانی خۆر لە ناوەڕاستی ئاسمانەوە درێژەی هەیە.[9]

کاتی قوربانی‌کردن لە دوای نوێژی جێژنەوە تا ڕۆژی سێزدەهەمی زیلحەججەیە.[10]

١. معرفة السنن والآثار للبیهقی: ٢٠٠٢.

٢. بهذه العبارة: «اللّه أکبر، اللّه أکبر، اللّه أکبر، لا إِلٰهَ إِلَّا اللّٰهُ وَاللّٰهُ أَكْبَرُ اللّٰهُ أَكْبَرُ وَ لِلّٰهِ الْحَمْدُ» ابن‌ابی‌شیبة: ٧٢/٢، طبرانی: ٩٤٢٣، دارقطنی: ١٧٥٦، بیهقی فی معرفة السنن: ٢٠٠٢.

٣. قاله المالك فی الموطأ: ٨٠٣، ابن‌ابی‌شیبة فی مصنفه: ٧٢/٢، السنن الکبری للبیهقی: ٣١٣/٣.

٤. المجموع: ٣١/٥ ـ ٣٣ ـ ٣٦ ـ ٣٧.

٥. ابن‌ابی‌شیبة: ٨٦/٢، معرفة السنن والآثار للبیهقی: ١٨٨٥، سنن الکبری للبیهقی: ٢٧٨/٣، عبدالرّزّاق فی مصنفه: ٥٧٥٠.

٦. الحاوی الکبیر للماوردی: ١١٢٣/٢.

٧. بخاری: ٩٣٣، ابوداود: ٩٧٦، ترمذی: ٤٩٦، ابن‌ماجه: ١٢٩١، احمد: ٨١٠٠.

٨. السّنن الکبیری للبیهقی: ٣١٠/٢، جامع الأصول من احادیث الرّسول لابن‌الأثیر: ٤٢٣٦، المجموع: ٥/٥، شرح الوجیز للرافعی: ٣٨/٥.

٩. المجموع للنووی: ٣/٥.

١٠. حاشیة البجیرمی علی الخطیب فی الاضحیة: ص٢٣٥، حاشیة الجمل: ٢٨٤/٩.

سوننەتە نوێژی جێژنی قوربان زوو بخوێنرێ تا بگەن بە قوربانییەکەدا. بە پێچەوانەوە سوننەتە نوێژی جێژنی ڕەمەزان دوا بخرێ تا سەرفیترە بڵاو بکرێتەوە.[١]

سوننەتە نوێژخوێنەکان کاتێ کە دێنەدەرەوە «الله أَكْبَر» بڵێن. جا هەر کە ئیمامەکە گەیشتە ناو مزگەوت سوننەتە دانەنیشێ و سوننەتی‌تر نەخوێنێ و ڕاستەوخۆ دەست بکات بە نوێژی جێژن و ئەوانەی وا سوننەت ئەخوێنن نوێژەکانیان ببڕن و یەکێکیان بەم شێوە قامەت بڵێ: «الصَّلاة جامعة»[٢]. ئیمامیش دوو ڕەکعەتی نوێژی جێژن دەست پێ بکات و لە ڕەکعەتی ئەووەڵدا حەوت «الله أَكْبَر» بڵێ،[٣] ئەم حەوت‌دانە جگە لە «الله أَكْبَر»ی ئیحرام و چوون بە ڕوکووعدا بێت. پاش هەرکام لەو «الله أَكْبَر»انە بڵێ: «سُبْحَانَ اللهِ وَالْحَمْدُ لِلّٰهِ وَلا إِلٰهَ إِلَّا اللهُ وَاللهُ أَكْبَرُ»[٤] پێش ئەم حەوت تەکبیرە سوننەتە دوعای ئیستیفتاح بخوێنێ، بەڵام «أَعُوذُ بِاللهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ» لەم حەوت‌دانە دوا بخات. لە ڕەکعەتی ئەووەڵدا لە پاش ئەلحەمد سوننەتە، سوورەتی «ق» بخوێنێ و لە ڕکعەتی دووهەمدا سوورەتی ﴿إِقْتَرَبَتِ السَّاعَةُ﴾ سوننەتە.[٥] لە ڕکعەتی دووهەمدا ژمارەی تەکبیرەکان دەبنە پێنج‌دانە. لەدوای ئەم دوو ڕکعەتە نوێژە ئیمامەکە دوو خوتبە بخوێنێ و لەنێوانیاندا دابنیشێ.[٦]

هەرکەسێ نوێژی جێژنی لەدەس دەرچوو، دەتوانێ قەزای بکاتەوە.[٧]

جا هەرکە نوێژی تەواو کرد سوننەتە بە پەلە بڕوات قوربانی بکات. پێغەمبەرﷺ بەرانێکی کردە قوربانی و فەرمووی: «بِسْمِ اللهِ وَاللهُ أَكْبَرُ هَذٰا عَنِّي وَعَمَّنْ لَمْ يُضَحِّ مِنْ أُمَّتِي»[٨].

واتە: «بەنێوی خودا و هەر خوا گەورەیە، ئەمە دەکەمە قوربانی بۆ خۆم و بۆ تەواوی ئەو کەسانەی لە ئوممەتم کە قوربانییان نەکردووە».

---

١. المجموع للنووي: ٤/٥.

٢. الأم للشافعي: ٢٦٩/١، المجموع: ١٤/٥ ـ ١٥.

٣. ابن‌ابی‌شیبة فی مصنفه: ٨١/٢، حاكم فی المستدرك: ٦٦٣١، طبرانی فی الكبير: ٥٣١٣، معرفة السنن والآثار للبیهقی: ١٩٩٣.

٤. المجموع للنووي: ١٧/٥ قال: هذا لفظ الشافعی لكن ليس فی الأم.

٥. احمد: ٢٠٨٩١، ترمذی: ٤٩٠، نسائی: ١٥٤٩، ابن‌ماجه: ١٢٧٢، المجموع للنووي: ١٩/٥.

٦. نسائی: ١٥٦١، بخاری: ٥٤٣٣، احمد: ٣١٤٤، بیهقی فی سنن الكبرى: ٢٩٩/٣.

٧. بخاری: باب «إذا فاته العيد يصلی ركعتين»، السنن الكبير للبیهقی: ٣٠٥/٣، ابن‌ابی‌شیبة فی مصنفه: ٨٨/٢ و قال «من فاته العيد فليصل أربعا».

٨. ابوداود: ٢٤٢٧، ترمذی: ١٤٤١، احمد: ١٤٣٦٦ ـ ١٤٣٦٤.

هەروەها پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «مَنْ رَأَىٰ هِلالَ ذِي الْحَجَّةِ وَ أَرٰادَ أَنْ يُضَحِيَ فَلا يَأْخُذْ مِنْ شَعْرِهِ وَلا مِنْ أَظْفٰارِهِ»[1].

واتە: هەرکەس مانگی "ذیالحجە"ی ببینێ و بیەوێ قوربانی بکات، ئەوە با لەو ماوەیەدا موو نەتاشێ و نینووك نەگرێت.

## بەشی هەشتەم: نوێژی مانگ و خۆرگیران

پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «إِنَّ الشَّمسَ وَالْقَمَرَ آيَتٰانِ مِنْ آيٰاتِ اللهِ لا يَخْسِفٰانِ لِمَوْتِ أَحَدٍ وَلا لِحَيٰاتِهِ فَإِذَا رَأَيْتُمْ ذٰلِكَ فَافْزَعُوا إِلَىٰ ذِكْرِ اللهِ وَ إِلَى الصَّلاةِ»[2].

واتە: «خۆر و مانگ دوو نیشانەن لە نیشانەکانی خوا، بە بۆنەی مەرگ یان ژیانی کەسێکەوە ناگیرێن هەر کاتێك ئەوەتان بینی (مانگ‌گیران یان ڕۆژگیران) پەنا بەرنە بەر یادی خودا و نوێژکردن.

هەرکاتێ خۆر یان مانگ گیرا بەم شێوە بانگ بکرێت «الصلاة جامعة» و ئیمام دوو ڕەکعەتیان بە جەماعەت لە مزگەوتدا بۆ بخوێنێ و لە هەر ڕەکعەتێکدا دوو ڕوکووع ببات بەچەشنێ ڕوکووعی ئەووەڵ لە ڕوکووعی دووهەم درێژتر بێت، بە دەنگی بەرز نوێژەکە بخوێنێ و درێژەی پێ بدا تا خۆر و مانگ ڕووناك دەبنەوە.[3]

## بەشی نۆهەم: نوێژی باران

[بۆ ئەوەی داوای بارینی باران لە خوا بکرێ] ئیمام بە خەڵکەکە دەستوور بدات سێ ڕۆژ ڕۆژوو بگرن و هەرچی لە توانایاندا هەیە سەدەقە و خێرات بکەن و بە تێکڕا تەوبە بکەن و لە گوناح خۆیان خاوێن بکەن، پاشان ڕۆژی چوارەم، ئیمام تەواوی خەڵکەکە وێڕای منداڵ و پیرەپیاو و پیرەژن، لە لیباسێکی فەقیرانە و هەژارانەدا ـ بە پێچەوانەی نوێژی

---

١. ترمذی: ١٤٤٣، نسائی: ٤٢٨٥، ابن‌ماجە: ٣١٤١ بروایة أخری، نسائی: ٤٤٥١.

٢. بخاری: ٩٨٤ ـ ٩٩٨ ـ ١٠٠٠، مسلم: ١٤٩٩ ـ ١٥٠٠، ابوداود: ٩٩٥، نسائی: ١٤٤٤، ابن‌ماجە: ١٢٥٣، احمد: ٢٥٧٦ ـ ١٦٤٨١ بروایات مختلفة.

٣. بخاری: ٩٨٨ ـ مسلم: ١٥٠٠، ابوداود: ٩٩٧، ترمذی: ٥١٤، نسائی: ١٤٥٥، احمد: ٢٥٧٦.

جێژن ـ بە سەرکزی و ملکەچییەوە، لە شار، یان دێ بباتە دەر و دوو ڕەکعەت نوێژ وەکوو نوێژی جێژنیان بۆ بخوێنێ، پاشان دوو خوتبە بدات و لەنێوانیاندا تۆزێ دابنیشێ. پێویستە زۆربەی دوو خوتبەکەی لەبارەی تەوبە و داوای لێخۆشبوون بێت.[١]

لە خوتبەی دووهەمدا ئیمام سوننەتە: پشت لە خەڵکەکە وەرچەرخێنێ و ڕوو لە قیبلە بکات و لەم حاڵەدا ئەو عەبایەی بەسەرشانیدا داوە ئاوەژووی بکاتەوە، بە نیەتی ئەوەی کە خوای گەورە حاڵ و وەزع لەم حاڵەوە بۆ حاڵەتێکی‌تر وەرچەرخێنێ بەم شێوە لای ژووررووی بکاتە لای خوار و لای ڕاستی بێنێتە لای چەپی و لای چەپی بێنێتە لای ڕاستی، چونکە پێغەمبەر ئاوەهای کردووە.[٢]

خەڵکیش لەگەڵ ئیمامدا ئەو کارە ئەنجام بدەن و هەر بەم حاڵەتەوە و لەم کاتەدا، لە دڵەوە دەست بکەن بە دوعا و پاڕانەوە. پاشان ئیمام ڕوویان تێ بکات و دوایی بە خوتبەکەی بهێنێ و عەباکانیان هەر بەو شێوە بە پێچەوانەیی بهێڵن تا وەختێ لەگەڵ جلوبەرگەکەی‌تریاندا دەیگۆڕن. ئەم دوعایەش بخوێنن:

«اَللّٰهُمَّ إِنَّكَ أَمَرْتَنٰا بِدُعٰائِكَ وَ وَعَدْتَنٰا بِإِجٰابَتِكَ فَقَدْ دَعَوْنٰاكَ كَمٰا أَمَرْتَنٰا فَأَجِبْنٰا كَمٰا وَعَدْتَنٰا، اَللّٰهُمَّ فَامْنُنْ عَلَيْنٰا بِمَغْفِرَةِ مٰا قٰارَفْنٰا وَ إِجٰابَتِكَ في سُقْيٰانٰا وَ سَعَةِ أَرْزٰاقِنٰا بِرَحْمَتِكَ يٰا أَرْحَمَ الرّٰاحِمِينَ»[٣].

واتە: «خوایا! ئەتۆ دەستوورت بە ئێمە داوە کە داوات لێ بکەین و هەروەها بەڵێنیشت داوە کە وڵاممان بدەیتەوە، ئەدی خوایە! ئێمە داوامان لێت کردووە بەو شێوە کە خۆت دەستوورت فەرمووە، ئەتۆش وڵامان بدەرەوە وەك چۆن بەڵێنت داوە، خوایە! بە گەورەیی خۆت لە ئەو گوناحانەی کە کردوومانە، خۆش ببە و باران و ڕزق و ڕۆزی خۆت برێژە بە سەرمانا، ئەی کەسێ کە لە هەموو بەڕەحمێ بە ڕەحمتری».

---

١. الأم للشافعي: ٢٨٣/١، روضة الطّالبين للنووي: ج١ ص١٧٧، مختصر المزني: ٣٣/١، حاشية البجيرمي على الخطيب: ٤٧٧/٥.

٢. بخاري: ٩٧٢، مسلم: ١٤٨٨ ـ ١٤٨٩، ابوداود: ٩٨٤، ترمذي: ٥١٢، احمد: ١٩٣٥.

٣. الأم للشافعي: ٢٨٦/١، مختصر المزني: ٣٣/١، مغني المحتاج في صلاة الاستسقاء: /١٧٩.

# بابەتی پێنجەم: ڕاز و نهێنیەکان زەکات

خوای گەورە دەفەرمێ: ﴿وَ الَّذِينَ يَكْنِزُونَ الذَّهَبَ وَ الْفِضَّةَ وَلا يُنْفِقُونَهٰا فِي سَبِيلِ اللّٰهِ فَبَشِّرْهُمْ بِعَذٰابٍ أَلِيمٍ﴾.[1]

واتە: «ئەوانەی وا زێڕ و زیو کۆدەکەنەوە و لە ڕێی خودا نایبەخشن ئەوە مزگێنی ئەشکەنجەیێکی هەرە سەخت و دەردناکیان پێ بدە».

لەم ئایەتە پیرۆزەدا مەبەست لە ئینفاق‌نەکردن، زەکات دەرنەکردنە؛ زەکاتیش یەکێکە لە پێنج کۆڵەکە و بنەما سەرەکییەکانی دینی ئیسلام.

ئەبووزەرﷺ فەرموویەتی: گەیشتمە خزمەتی پێغەمبەرﷺ، لە سێبەری ماڵی کەعبەدا دانیشتبوو، کاتێ کە چاوی پێم کەوت فەرمووی:

«هُمُ الْأَخْسَرُونَ وَ رَبِّ الْكَعْبَةِ، قُلْتُ: مَنْ هُمْ؟ قٰالَ: «اَلْأَكْثَرُونَ أَمْوٰالاً إِلّٰا مَنْ قٰالَ هٰكَذٰا وَ هٰكَذٰا مِنْ بَيْنِ يَدَيْهِ وَ مِنْ خَلْفِهِ وَ عَنْ يَمِينِهِ وَ عَنْ شِمٰالِهِ وَ قَلِيلٌ مٰا هُمْ، مٰا مِنْ صٰاحِبِ إِبِلٍ وَلا بَقَرٍ وَلا غَنَمٍ وَلا يُؤَدِّي زَكٰاتَهٰا إِلّٰا جٰاءَتْ يَوْمَ الْقِيٰامَةِ أَعْظَمَ مٰا كٰانَتْ وَ أَسْمَنُهُ وَ تَنْطَحُهُ بِقُرُونِهٰا وَ تَطَؤُهُ بِأَظْلافِهٰا كُلَّمٰا نَفِدَتْ أُخْرٰاهٰا عٰادَتْ إِلَيْهِ أُوْلاهٰا حَتّٰى يُقْضىٰ بَيْنَ النّٰاسِ».[2]

واتە: «بەخوای کەعبە سوێند، ئەوانە زەرەر و زیانی زۆر دەکەن. منیش گوتم: ئەوانە کێن؟ فەرمووی: ئەوانە کە ماڵ و دارایی زۆریان هەیە. مەگەر کەسانێکیان کە بەمشان و بەوشانیاندا و بەر و پشتیاندا شت ئەبەخشن. وێنەی ئەم کەسانەش زۆر کەمە. هەرکەس خاوەنی وشتر و مانگا و مەڕ و ماڵات بێت و زەکاتیان دەرنەکات، ئەوە لە ڕۆژی قیامەتدا

---

١. التوبة: ٣٤.

٢. مسلم: ١٦٥٢، بخاري: ٦١٤٧، ترمذي: ٥٦٠، نسائي: ٢٣٩٧، احمد: ٢٠٣٨٩.

ئەو ئاژەڵانە پتەوتر و چاختر لەوەی دونیا ئەبن و کابرای خاوەنیان ئەدەنە بەر شاخ و دەیخەنە ژێر سمیان و بەسەریدا ئەڕۆن. هەرکاتێ ئاخردانەیان شاخی لێدا و پێ بەسەریا نا دیسان ئەوڵدانەیان دەگەڕێتەوە سەری؛ ئەمە درێژەی هەیە تا لەلایەن خواوە بڕیاری [بە بەهەشت یان بە دۆزەخ ]لە نێو خەڵکدا دەدرێ». ئەم حەدیسە لە بوخاری و لە موسلیمدا هاتووە.

## بەشی یەکەم: هۆکارەکانی واجببوونی زەکات

زەکات لەم چەند شتەدا واجب دەبێ:

١. زەکاتی ئاژەڵ کە بریتییە لە وشتر و گا و مەڕ و بزن؛

٢. زێڕو زیو و پارە؛

٣.ماڵی بازرگانی؛

٤. خەزێنە و کانی زێڕ و زیو؛

٥. دانەوێڵە و ترێ و خورما؛

٦. زەکاتی جەستە (سەرفیترە).

### زەکاتی ئاژەڵ:

ئەم جۆرە زەکاتە تەنها لەسەر مرۆڤی موسڵمان کە کۆیلە نەبێ واجب دەبێ، ئیتر باڵغبوون مەرج نییە کە وابوو لە ماڵی منداڵ و شێتیشدا زەکات واجب دەبێ.

**مەرجەکانی واجببوونی زەکات لە ئاژەڵدا پێنجن:**

١. ئەم ئاژەڵانە بن: وشتر و گا و مەڕ و بزن؛

٢. ئاژەڵەکان لە گیای دەر و دەشت، بلەوەڕن و پێویست بە هەمارکردنی ئالیك و ئاڵف نەبێ بۆیان؛[1]

٣. ساڵێکی تەواویان بەسەردا تێپەڕ ببێ؛[2]

٤. بەتەواوی لە ژێر ملکایەتی خاوەنەکەیاندا بن؛

٥. گەیشتبنە ڕادەی زەکات.

---

١. ابوداود: ١٣٤٤.

٢. ابن‌ماجە: ١٧٨٢، المالك فی الموطأ: ٥١٧، ابوداود: ١٣٤٢، ترمذی: ٥٧٢، احمد: ١٢٠٠.

بەگوێرەی مەرجی ئەوەڵ کە گوتمان ئەشێ ئەو ئاژەڵانە: وشتر و گا و مەڕ و بزن بن؛ کە وابوو زەکات لە ئەسپ و گوێدرێژدا نییە و هەروەها لەو ئاژەڵە کە لە نێوان ئاسك و مەڕدا لەدایك بووبێ زەکات نییە.[1] بەپێی مەرجی دووهەمیش ئەو ئاژەڵەی بە ئالیکی هەمبارکراو لە ماڵدا بژی، زەکاتی ناکەوێ.

پێویستە بۆ ئەوەی زەکات لە ئاژەڵدا واجب بێت، ڕادەیان بەو ئەندازە کە دیاری کراوە بگات:

**زەکاتی وشتر:**

لە وشتردا زەکات نییە تا نەگەیێتە پێنج سەر. [لە پێنج سەرەوە بەرەوژوور بەم شێوەی خوارەوە واجبە]:

پێنج وشتر: مەڕێکی دوو ساڵان یان بزنێکی سێ ساڵان؛

دە وشتر: دوو مـەڕ؛

پازدە وشتر: سێ مـەڕ؛

بیست وشتر: چوار مـەڕ؛

بیست و پێنج وشتر: وشترێکی مێی دوو ساڵان. (بنت مخاض) بەڵام ئەگەر وشتری مێی دوو ساڵان نەبوو ئەوە وشترێکی نێری سێ ساڵان (ابن لبون) بدات؛

سی و شەش وشتر: وشترێکی مێی سێ ساڵان (بنت لبون)؛

چل و شەش وشتر: وشترێکی مێی چوار ساڵان (حقه)؛

شەست و یەك وشتر: وشترێکی مێی پێنج ساڵان (جذعه)؛

حەفتاد و شەش وشتر: دوو وشتری مێی دوو ساڵان (بنتا لبون)؛

نەوەد و یەك وشتر: دوو وشتری مێی چوار ساڵان (حقتان)؛

سەد و بیست و یەك وشتر: سێ وشتری مێی دوو ساڵان؛

سەد و سی وشتر: هەرکاتێ ڕادەی زەکات گەیشتە سەدو سی وشتر بەرەو سەر ئەوە لە هەر چل سەردا سەرێ وشتری مێی سێ ساڵە یان لەهەر پەنجا سەردا سەرێ وشتری مێی چوار ساڵە دەدات.[2]

---

١. المجموع للنووی: ٣٣٩/٥.

٢. بخاری: ١٣٦٢، ابوداود: ١٣٣٩، نسائی: ٢٤٠٤، احمد: ٦٨.

**زەکاتی ڕەشەوڵاخ:**

ڕەشە وڵاخ بگاتە سی سەر زەکاتی تێدا واجب دەبێ [بەم شێوە]:

سی سەر: پارینەیێکی یەك ساڵە کە پێ نابێتە نێو دوو ساڵ (تبیع)؛

لە چل سەردا: مانگاییێك کە پێ ناوێتە نێو سێ ساڵان؛

لە شەست سەردا: دوو پارینەی دوو ساڵان؛

لە شەست سەر زیاتر، بۆ هەر چل سەر: مانگاییێك سێ ساڵان یان لە هەر سی سەر: پارینەییێك دوو ساڵان، واجبە زەکات بدرێ.[1]

**زەکاتی مەڕ و بزن:**

مەڕ و بزن بگاتە چل سەر زەکاتی تێدا واجب ئەبێ [بەم شێوە]:

چل سەر: کاوڕێکی مێی یەك ساڵە یان چتیرێکی دوو ساڵان، ئیتر زەکاتی تێدا نییە تا دەگاتە سەد و بیست و یەك سەر، لە سەد و بیست و یەك بەرەو سەر دوو مەڕی تێدا واجبە، تا دەگاتە دووسەد و یەك سەر سێ مەڕی تێدا واجبە، تا دەگاتە چوارسەد سەر، چوار مەڕی تێدا واجبە. لەمە زیاتر بۆ هەر سەد سەر، مەڕێ واجبە بدرێ.[2]

[تێبینی]: زەکاتی دوو نەفەر شەریك لە گەیشتنی مەڕو ماڵاتیان بە ڕادەی زەکات هەر وەکوو یەك نەفەر وایە؛ بە مەرجی ئەوەی مەڕو ماڵاتیان لە تەواوی شت و شوێنەکاندا هاوبەش بن [مۆڵگە و جێی ئاوخواردنەوە و جێی لەوەڕ و حەیوانی نێر و شوان...[3]].

هاوبەشی لە پێکەوەبوونی مەڕو ماڵاتەکەدا هەر وەکوو هاوبەشییە لە ملکایەتی مەڕو ماڵاتەکەدا[4].

---

١. ابوداود: ١٣٤٢، ترمذی: ٥٦٧، ابن‌ماجه: ١٧٩٤، احمد: ٣٧١٠.

٢. بخاری: ١٣٦٢، ابوداود: ١٣٣٩، نسائی: ٢٤٠٤، احمد: ٦٨.

٣. بیهقی فی السنن الکبری: ١٠٦/٤، دارقطنی فی سننه: ١٩٦٦، المجموع للنووی: ٤٣٤/٥.

٤. دوو جۆر هاوبەشی هەیە: یەکەم: «جوار» واتە: ئەو دوو نەفەرە هەردوکیان بۆ خۆیان بە جیا مەڕ و ماڵاتیان هەیە، بەس ئەوەندەی هەیە کە شوێنی خەوتن و جیلەوەر و ئاوخواردنەوە و... بەیەکەوەیە. دووهەم: «شیوع» واتە: ئەو دوو نەفەرە یان چەند نەفەرە لە مەڕوماڵاتەکەدا هاوبەشن بەبێ ئەوەی بەشەکانیان دیاری بێ، وەکوو ئەوەی بە میرات پێیان گەیشتبێ ـ وەرگێڕ.

## زەکاتی زێڕ و زیو:

ئەگەر ساڵ هاتەوە بەسەر دووسەد دیرهەم زیوی خالسدا بەکێشانەی مەککە ئەوە پێنج دیرهەم زەکاتی ئەو دووسەد دیرهەمەیە.[١] زێڕیش ئەگەر بگاتە بیست دیناری خالیس بە کێشانەی مەککە چواریەکی دەیەکی [واتە $\frac{1}{40}$] دەکەوێ[٢]. میشود

جا ئەگەر زێڕ و زیو لەم ئەندازە زیاتر بوو - باگرەمێکیش بێ - ئەبێ بەگوێرەی ئەو زیادبوونەش "ربع‌العشر" [واتە $\frac{1}{40}$] لێ بدرێ بە زەکات.[٣]

هەروەها زەکات لە شووشی تەڵا و نوقرەدا واجبە هەروەك چۆن ئەگەر خشڵی زینەتی حەرام بێت [وەکوو زێڕ بۆ پیاو یان ئەندازەی زۆر بۆ ژن] زەکاتی دەکەوێ.

لەو شتانەی کە لە کانەوە وەدەر ئەهێنرن زەکات نییە جگە لە کانی زێڕ و زیودا نەبێ.

ئەویش دوای کەندن و دەرهێنان و هاڕین و خاوێن‌کردنەوەکەی - بەگوێرەی فەرموودەی بەهێزتر - چواریەکی دەیەکی [واتە $\frac{1}{40}$] دەکەوێ. لەوەشدا کە ئایا پێویستە بگاتە ئاستی زکاتدان [واتە: ١٤٠ میسقاڵ زیو یان ٢٠ میسقاڵ زێڕ] یان ئایا پێویستە ساڵی وەسەردا بسووڕێ دوو فەرمووده هەیە [کە بە گوێرەی یەکیان پێویستە هەم بگاتە ئاستی زەکات هەم ساڵی بەسەردا بسووڕێ]. لە فەرموودەیێکی‌تردا کە بەرانبەر بە فەرموودەی بەهێزە پێویستە پێنج‌یەکی ($\frac{1}{5}$) دەسبەجێ لێ دەربکرێ و نایەوێ - لەسەر ئەم فەرموودەیە - ساڵی بە سەردا بێتەوە؛ بەڵام لەوەدا کە ئایا ڕادەی زەکات پێویستە یان نە دوو فەرمووده هەیە.[٤]

---

١. ابوداود: ١٣٤٣، ترمذی: ٥٦٣، احمد: ٦٧٣.

٢. ابوداود: ١٣٤٢، الأم للشافعي: ٤٣/٢. دووسەد دیرهەم دەبێتە ١٤٠ میسقاڵ کە دەبێتە نزیکەی ٧٠٠ گرەم، بیست دینار دەکاتە ٢٠ میسقال کە دەبێتە نزیکەی ١٠٠ گرەم، ئەندازەی زەکاتی زێڕ و زیو لە سەدا دوو و نیوە - وەرگێڕ.

٣. روضة الطالبين للنووي: ٢٣٦/١، شرح الوجيز للرافعي: ٢/٦، المجموع للنووي: ٢/٦، حاشية البجيرمي على الخطيب: ٢٦١/٦.

٤. بخاری: ١٤٠٣، مسلم: ٣٢٢٦، ابوداود: ١٤٥٥، ترمذی: ٥٨١، نسائی: ٢٤٥٠، ابن‌ماجه: ٢٥٠٠، احمد: ٢٧٢٣، الأم للشافعي: ٤٥/٢، شرح الوجيز لرافعي: ٨٨/٦.

**سەرفیترە:**

سەرفیترە لەسەر زوانی پێغەمبەرەوەصَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَسَلَّمَ واجب کراوە لەسەر هەموو موسڵمانێ کە لە ئەندازەی خۆراکی شەو و ڕۆژی جێژنی خۆی و ئەوانەی خەرجیان لەسەریە، زیاتری هەبێ. ئەندازەکەشی ساعێکە، بە ساعی سەردەمی پێغەمبەرصَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَسَلَّمَ کە دەبێتە: دوو مەن و دوو سێیەکی (٢⅔) مەنێ [بەکیلۆ بەرانبەرە بە دوو کیلۆ و سەد و حەفتاد و شەش گرەم].

پێویستە ئەم سەرفیترەیە لە جۆری قووت و بژیوی خۆی یان لە باشترین قووتی شارەکەی بێت. دابەشکردنەکەشی هەر وەکوو دابەشکردنی زەکاتی ماڵە.[1]

پێغەمبەرصَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَسَلَّمَ فەرموویەتی: «أَدُّوا زَكَاةَ الفِطْرِ عَمَّنْ تَمُونُونَ»[2] واتە: «سەرفیترەی ئەوانەی خەرجیان لەسەرتانە، بیدەن».

## بەشی دووهەم: چۆنیەتی زەکاتدان و مەرجەکانی

**مەرجی یەکەم: نیەت**[3]؛ نیەت بریتییە لەوەی کە بە دڵ بیەوێ سەرفیترە دەربکات.

بۆ شێت و منداڵ، سەرپەرشتەکانیان لەجێیان نیەت بهێنن، هەروەها دروستە حاکم لەجێی ئەو کەسەی وا بەزۆر زەکاتیان لێ ساندووە، نیەت بهێنێ.

**دووهەم:** نابێ زەکات لە وەختی خۆی دوا بکەوێ و سەرفیترەش نابێ لە ڕۆژی جێژن دوا بخرێ، وەختی زەکاتی سەرفیترە بەم شێوەیە: بە ئاوابوونی خۆری ئاخرین ڕۆژی ڕەمەزان واجب دەبێ؛ بەڵام هەر لە هەوەڵ ڕۆژی ڕەمەزانەوە تا ئاخر ڕۆژی دەتوانی سەرفیترەکەی دەر بکات.

هەرکەسێك بە ئەنقەست زەکات دوا بخات؛ تاوانبار ئەبێ و ئەگەریش لەو ماوەدا ماڵەکەی تیا بچێ، هەر زەکاتی لە کۆڵ ناکەوێ. بەڵام ئەگەر دواخستنەکەی لەبەر ئەوە

---

١. بخاري: ١٤٠٨، مسلم: ١٦٣٥ ابوداود: ١٣٧٧، ترمذي: ٦١٢، نسائي: ٢٤٥٦، ابن‌ماجه: ١٨١٥، احمد: ٥٠٨٧.

٢. معرفة السنن والآثار للبیهقی: ٢٥٤٠، دارقطني: ٢١٠٠، مسند الشافعي: ٣٨٦ بلفظ: «فَرَضَ زَكَاةَ الْفِطْرِ عَلَى الصَّغِيرِ وَالْكَبِيرِ وَالذَّكَرِ وَالْأُنْثَىٰ مِمَّنْ تَمُونُونَ».

٣. بخاري: ١، مسلم: ٣٥٣٠، ترمذي: ١٥٧١، نسائي: ٧٤، ابوداود: ١٨٨٢، ابن‌ماجه: ٤٢١٧، المجموع للنووي: ٣١٦/١، الحواشي الشيرواني: ٣٤٦/٣، تحفة المحتاج و مغني المحتاج في بحث الزكاة.

بووبێ کە نیازمەندی دەست نەکەوتبێ و لەو ماوەدا ماڵەکەی تیا چووبێ ئەوە لەسەری نییە زەکات بدا.

سێهەم: پێویستە زەکاتەکەی بەسەر ئەو نیازمەندانەدا دابەش بکات کە لە شارەکەی خۆیدا هەن و جۆرێکیش دابەشی بکات کە بە هەموویاندا بگات.

[جا پێویستە ئەوە بڵێین:] کە لە ئێستادا دوو بەش لەو هەشت بەشە کە زەکاتیان پێ دەگات لە زۆربەی شارەکاندا نییە؛ کە بریتین لە:

١. ئەوانەی وا تازە موسڵمان بوون؛

٢. ئەوانەی وا سەرپەرشتکاری زەکاتن [و لە نوێنەرایەتی حکوومەتەوە زەکات کۆ دەکەنەوە].

هەروەها چوار بەش لەو هەشتە لە زۆربەی شارەکاندا هەن:

١. هەژار (فقیر)؛

٢. نەدار (مسکین)؛

٣. قەرزدار؛

٤. موسافری لێقەوماو.

هەروەها دووبەش لەو هەشتە لە هەندێ شاردا هەن و لە هەندێکیاندا نین.

١ـ جەنگاوەران؛

٢ـ کۆیلەی کاغەز بۆ نووسراو [واتە ئەو بەردەیە کە ئاغاکەی کاغەزی بۆ نووسیوە کە ئەگەر ئەوەندە پارەم بۆ بهێنی ئازادت ئەکەم].

جا مرۆڤی زەکاتدەر هەرچەند بەشی لەو هەشت بەشە لە وڵاتی خۆیدا دەسکەوت ئەو بە سەر هەموویاندا زەکاتەکەی دابەش بکات. ئەگەریش تەنیا بە یەك بەشی دەدات، پێویستە لانی کەم بەسەر سێ نەفەر، یان زیاتر، دابەشی بکات. لەم دابەشکردنەدا، واجب نییە بەشی هەموویان وەکوو یەك بدا.

ئەگەر کەسێکی دەسکەوت کە خاوەنی تایبەتمەندیی باش بوو و لەوانەبوو کە زەکاتی پێ دەشیا، ئەوە باشترە زەکاتەکەی بەو بدا. ئەو تایبەتمەندییانە بریتین: لە زانابوون، ئەهلی وەرع و خۆپارێزی بوون، بێدەنگ و نادیار بوون لە نێو خەڵکدا، خزمبوون. هەرکەسێ ئەم تایبەتمەندییانەی تێدا هاتەجێ ئەوە بۆ زەکات وەرگرتن شیاوترە.

## بەشی سێهەم: ئەوانەی وا شیاوی زەکات وەرگرتنن

کەسێ کە زەکاتی پێ دەدرێ پێویستە: موسڵمان بێ، ئازاد بێت [واتە: کۆیلە نەبێ] لە بنەماڵەی سەییدی هاشمی و موتەلیبی نەبێ. دروستە زەکات بە منداڵ و شێت بدرێ بەو مەرجەی سەر پەرشتەکەیان وەری بگرێ.

ئەو هەشت بەشەی کە زەکاتیان پێ دەگات بریتین لە:

یەکەم: هەژار؛ واتە: ئەو کەسەی نە ماڵی هەیە نە توانای کار.

دووهەم: نەدار؛ واتە: ئەو کەسەی دەخڵی لە خەرجی کەمترە.

سێهەم: سەرپەرشتکاری زەکات؛ واتە ئەوانەی نوێنەری کۆکردنەوەی زەکاتن بۆ بەیتولماڵ.

چوارەم: تازە موسڵمان؛ واتە: ئەو پیاوماقووڵەی کە تازە موسڵمان بووە و لەناو خزم و عەشرەتیدا جێی ڕێزە و بەگوێ دەکەن. ئەوە ئەگەر زەکاتی پێ بدرێ ئەبێتە هۆی هەڵنانی خزمەکانی بۆ دینی ئیسلام.

پێنجەم: کۆیلەیێ کە لەلایەن ئاغاکەیەوە بەرگەی ئازادبوونی ـ بە مەرجی پووڵ بۆهێنان ـ بۆ نووسراوە. ئەوە دروستە بەشە زەکاتەکەی هەم بە دەستی خۆی بدات، هەم بەدەستی ئاغەکەی، بەڵام دروست نییە ئاغایێك کە خۆی کاغەزی بۆ کۆیلەکەی نووسیوە، زەکات بدا بەو کۆیلەیە.

شەشەم: قەرزدار؛ واتە: ئەوانەی وا لەڕێی کارێکی دروستدا قەرزدار بوون و ناتوانن قەرزەکەیان بار بکەن؛ بەڵام ئەگەر لەڕێ کاری حەرامدا قەرزدار بوون، ئەوە زەکاتیان پێ نادرێ تا تۆبە نەکەن و پەشیمان نەبنەوە. ئەگەر ئەو قەرزدارە، دەوڵەمەند بوو بەڵام لەبەر کارێك کە بەرژەوەندی گشتی تێدا بوو، یان لەبەر کوژانەوەی فیتنە، قەرزدار بووبوو ئەوە دروستە زەکاتی پێ بدرێ.

حەوتەم: جەنگاوەران؛ واتە: ئەو سەربازانەی کە لە لایەنی حکوومەتەوە، مووچەیان بۆ دیاری نەکراوە؛ ئەوە زەکاتیان بۆ دەشێ هەرچەندەش دەوڵەمەند بن.

هەشتەم: موسافر؛ واتە: ئەو ڕێبوارەی کە پارەی پێ نەمابێ بۆ خەرجی سەفەرەکەی. بەو مەرجەی سەفەرەکەی حەڵاڵ بێت، زەکاتی پێ دەگات.

[تێبینی:] ئەو کەسەی کە ئیدیعای ئەوە بکات کە هەژارە یان نەدارە، باوەڕ بە وتەکەی ئەکرێ. هەروەها بە موسافیر و جەنگاوەریش باوەڕ ئەکرێ، بەڵام ئەگەر لەپاشان ڕوون بووەوە موسافیر و جەنگاوەر نەبووە ئەوە زەکاتەکەی لێ دەستێنرێتەوە. بەڵام غەیری ئەمان [واتە: ئەو چوارەکەیتر] پێویستە بەڵگە لەسەر وتەکەیان ببێت و تەنیا بە قسەکەیان باوەڕ ناکرێ.[1]

## بەشی چوارەم: بەخشش و خێرات

پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «اِتَّقُوا النّارَ وَ لَوْ بِشِقِّ تَمْرَةٍ فَإِنْ لَمْ تَجِدُوا فَبِكَلِمَةٍ طَيِّبَةٍ»[2]. واتە: «خۆتان لە ئاگری دۆزەخ بپارێزن، با بە لەتێ خورماش بووە؛ ئەگەریش ئەوەشتان نەبوو، بە قسەی خۆش خۆتان بپارێزن لەو ئاورە».

دیسان پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «ما أَحْسَنَ عَبْدٌ الصَّدَقَةَ إِلَّا أَحْسَنَ اللهُ الْخِلافَةَ عَلَىٰ ذُرِّيَّتِهِ»[3] واتە: «ئەگەر عەبدێك ئیحسان و خێراتی باش بکات ئەوە خوا ئەولادی باش وەشوێنی ئەخا».

دیسان پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «اَلصَّدَقَةُ تَسُدُّ سَبْعِينَ باباً مِنَ الشَّرِّ»[4] واتە: «بەخشش و خێرات بەری حەفتا جۆر بەڵا دەگرێ».

لە پێغەمبەرﷺ پرسیار کرا: «أَيُّ صَدَقَةٍ أَفْضَلُ» واتە: «چ جۆر بەخششێ باشترە». فەرمووی: «أَنْ تَصَدَّقَ وَ أَنْتَ صَحِيحٌ شَحِيحٌ، تَأْمُلُ الْبَقاءَ وَ تَخْشَى الْفَقْرَ وَلا تُمْهِلُ حَتَّىٰ إِذا بَلَغَتِ الْحُلقُومُ، قُلْتَ لِفُلانٍ كَذا وَ لِفُلانٍ كَذا»[5].

«باشترین جۆری بەخشش ئەوەیە کە لەو وەختەدا بیدەی کە لەشت ساغ بێت و تەماعی ماڵی دونیا و هومێدت بە ژیان و ترسی هەژاربوونت هەبێت؛ هەروەها دەست لەمجۆرە

---

١. ﴿إِنَّمَا الصَّدَقاتُ لِلْفُقَراءِ وَالْمَساكِينِ وَالْعامِلِينَ عَلَيْها وَالْمُؤَلَّفَةِ قُلُوبُهُمْ وَ فِي الرِّقابِ وَالْغارِمِينَ وَ فِي سَبِيلِ اللهِ وَ ابْنِ السَّبِيلِ فَرِيضَةً مِنَ اللهِ وَاللهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ﴾ ـ التوبة: ٦٠.

٢. بخاری: ٥٥٦٤، مسلم: ١٦٨٩، ترمذی: ٢٨٧٨، نسائی: ٢٥٠٥، ابن‌ماجه: ١٨١، احمد: ١٧٥٣٧.

٣. مسند الشّهاب القضاعی: ٧٣٦، جامع الکبیر للسیوطی: ٣٤٣، کنز العمال: ١٦٠٧١، بلفظ: «تَرِکَتِهِ».

٤. طبرانی فی الکبیر: ٤٢٧٦، مجمع الزوائد للیهثمی: ١١/٤، کشف الخفاء للعجلونی: ٢٢/٢، کنزل العمال للهندی: ٣٤٥/٦ بلفظ: «...مِنَ السُّوء».

٥. مسلم: ١٧١٤، نسائی: ٢٤٩٥، احمد: ٧١٠٠.

بەخششە هەڵنەگری، تا مەرگ ئێخەت پێ دەگرێ و تۆ هەر بڵێی ئەوەندە بۆ فڵانەکەس و ئەوەندە بۆ فڵانەکەس».

هیچ تاوان لەوەدا نییە کە بە ئاشکرا و لەبەر چاوی خەڵکەوە بەخشش بکرێ، یان بەشێوەی نهێنی و پەنامەکی؛ هەر جۆر خۆی بیەوێ دروستە.

## [وەرگرتنی زەکات باشە یان بەخشش و ئێحسان؟]

ئیبراهیمی خەوواس و شێخ جونەید رَحِمَهُمَاٱللَّهُ فەرموویانە:

سەدەقە و خێرات وەرگرتن باشترە لە وەرگرتنی زەکات؛ چونکە لە وەرگرتنی زەکاتدا بەشی هەژارەکان دەخورێ و بۆ وەرگرتنی زەکات مەرجی زۆر هەیە و زۆر جار ئەو مەرجانە لە زەکات وەرگردا نایێتە جێ. هەندێ‌تریش [بە پێچەوانەوە] لەسەر ئەو باوەڕەن کە زەکات وەرگرتن باشترە؛ چونکە یارمەتیی داوە واجبێ بەجێ بهێنرێ. هەروەها خۆبەکەمزانی و نەفس‌شکێنی تێدایە. بە کورتی بۆ هەرکامیان تایبەتمەندییێك هەیە.

والله أعلم

# بابەتی شەشەم: ڕازو نهێنییەکانی ڕۆژوو

پێغەمبەرﷺ لە خواوە ئەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: «كُلُّ حَسَنَةٍ بِعَشْرِ أَمْثَالِهَا إِلَىٰ سَبْعِمِائَةِ ضِعْفٍ إِلَّا الصَّوْمَ فَإِنَّهُ لي وَ أَنَا أَجْزِي بِهِ»[1].

واتە: «هەر چاکەیێك دە بەرانبەر تا هەفتا بەرانبەری خۆی خێری هەیە جگە لە ڕۆژوو نەبێ؛ ڕۆژوو تایبەتی بۆ خۆم دەبێ و خۆم پاداشی ئەدەمەوە».

هەروەها پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «وَ الَّذي نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ لَخَلُوفُ فَمِ الصَّائِمِ أَطْيَبُ عِندَ اللهِ مِنْ رِيحِ الْمِسْكِ، يَقُولُ اللهُ تَعَالَىٰ: إِنَّمَا يَذَرُ شَهْوَتَهُ وَ طَعَامَهُ وَ شَرَابَهُ لِأَجَلي فَالصِّيَامُ لي وَ أَنَا أَجْزِي بِهِ»[2].

واتە: «سوێند بەوکەسەی واگیانی موحەممەدی بە دەستە، بۆنی ناخۆشی دەمی ڕۆژووەوان، لەلای خواوە، لەبۆنی میسك خۆشترە. خوای گەورە ئەفەرمێ: ئەم بەندەی منە تەرکی شاوەت و نان و ئاوی لەبەر من کردووە؛ کە وابوو ڕۆژوو تایبەتی منە و ئەمن خۆم پاداشی ئەدەمەوە».

دیسان پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «إِنَّ الشَّيْطَانَ لَيَجْرِي مِنِ ابْنِ آدَمَ مَجْرَى الدَّمِ[3] فَضَيِّقُوا مَجَارِيَهُ بِالْجُوعِ».[4]

واتە: «شەیتان لە جەستەی مرۆڤدا، بە هەرکوێ خوێن بڕوا ئەویش ئەڕوات، کەوایە ئێوە بە برسیەتی ڕێ پێ بگرن».

---

١. مسلم: ١٩٤٥، ترمذی: ٦٩٥، ابن‌ماجه: ١٦٢٨، احمد: ٤٠٣٦.

٢. بخاری: ١٧٦١ ـ ٦٩٣٨، الموطأ لمالك: ٦٠٣، مسلم: ١٩٤٤ ـ ١٩٤٥، نسائی: ٢١٨٣، احمد: ٦٨٧٧.

٣. بخاری: ١٨٩٧ ـ ٣٠٣٩، مسلم: ٤٠٤١، ابوداود: ٢١١٣، ترمذی: ١٠٩٢، ابن‌ماجه: ١٧٦٩، احمد: ٢٥٦٣٠.

٤. كشف الخفاء للعجلونی: ٦٧١.

بەمبۆنەوە پێغەمبەرﷺ بە حەزرەتی عائیشەرضي الله عنها فەرمووی: «دٰاومي قَرْعَ بٰابِ الْجَنَّةِ قٰالَتْ: بِمٰاذٰا قٰالَ: بِالْجُوعِ»[1] «بەردەوام دەرگای بەهەشت بکوتە، فەرمووی: بەچی؟ فەرمووی: بە برسیەتی».

هەروەها پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «لَوْلا أَنَّ الشَّیاطِینَ یَحُومُونَ عَلَىٰ قُلُوبِ بَنِي آدَمَ لَنَظَرُوا إِلَىٰ مَلَكُوتِ السَّمٰاءِ»[2] واتە: «ئەگەر شەیاتینی دەوری دڵی بنیادەمیان نەدابا ئەوە دەیانتوانی عەجاباتی ئاسمان سەیر بکەن».

کەوابوو ڕۆژوو یارمەتی مرۆڤ ئەدا تا شەهوەتی لەناو بیات. ئەمەش لە داهاتوودا لە بابەتی "شکاندنی دوو شەهوەتدا" ڕوون دەکەینەوە.

## بەشی یەکەم: واجباتی ڕۆژوو

### [یەکەم: دیتنی مانگ[3]]:

بزانە: دیتنی مانگی ئەووەڵی ڕەمەزان بە قسەی شاهیدێکی عادڵ سابیت ئەبێ. بەڵام بۆ مانگی شەشەڵان (شەووال) دوو شاهید پێویستە؛ ئیدی بێفەرقە کە قازی ئەو شوێنە دەستووری بدات یان نە، هەرکەس بە پێی بڕوا و دڵنیایی دڵی خۆی بجووڵێتەوە.

### [دووهەم: نیەت]:

لەسەر ڕۆژووەوان واجبە هەموو شەوێ نیەت بهێنێ کە سبەی بە ڕۆژوو بێت. پێویستە بەم شێوە نیەت بهێنێ: نیەتمە ڕۆژووی فەرزی مانگی ڕەمەزان بگرم.[4]

---

١. کشف الخفاء للعجلونی: ١٣٢٨.

٢. احمد: ٨٢٨٦، ابن‌ابی‌شیبة فی مصنفه: ٤٤٦/٨، جامع الکبیر للسیوطی: ١٢٧٨٤، کنز العمال للهندی: ٣١٨٦١ جمیعهم بلفظ: «هٰذِهِ الشَّیٰاطِینُ یَحُومُونَ عَلَىٰ أَعْیُنِ بَنِيآدَمَ أَنْ لا یَتَفَكَّرُوا مَلَكُوتِ السَّمٰوٰاتِ وَالْأَرْضِ وَ لَوْلا ذٰلِكَ لَرَأَوُا الْعَجٰائِبَ».

٣. «إِذٰا رَأَیْتُمُ الْهِلالَ فَصُومُوا وَ إِذٰا رَأَیْتُمُوهُ فَأَفْطِرُوا»، بخاری: ١٧٦٧، مسلم: ١٧٩٦، ابوداود: ١٩٨٢، ترمذی: ٦٢٤، نسائی: ٢٠٩٠، ابن‌ماجه: ١٦٤٥، احمد: ٢٢١٩.

٤. روضة الطالبین للنووی: ٢٦٨/١، المجموع للنووی: ٢٨٩/٦، مغنی المحتاج: فی الصّوم.

[خاڵێکی گرینگ:] ئەگەر ڕۆژووەوان شەوی "یوم‌الشك" وەها نیەت بهێنی کە ئەگەر سبەی ڕەمەزان بێت ئەوە بە ڕۆژوو دەبم، ئەوە دروست نییە.

## [سێهەم: بەرخۆگرتن]

ڕۆژوو؛ واتە: خۆگرتنەوە لەوەی شتێ بگاتە ناو بۆشایی جەستە. کە وابوو ڕۆژوو بەمانە دەشکێ:

خواردن، خواردنەوە، دەواکردنە نێو لووت، عیمالە [واتە: دەوا لەڕێ پێشەوە بکرێتە نێو ڕیخۆڵە]؛ بەڵام ڕۆژوو بە حیجامەت[1] و ڕەگ لێدان بۆ خوێن‌گرتن و چاوڕشتن،[2] ناشکێ.

هەرچی بەبێ ویستی ڕۆژووەوان بێت وەکوو ئەوەی تۆزی ڕێگە، یان مێشێك بڕواتە نێو بۆشایی جەستەیەوە، ئەوە ڕۆژوو ناشکێنێ.

هەروەها ئاو ڕادان لە دەم و لووت ڕۆژوو ناشکێنێ، مەگەر ئەوەی زۆر زیادەڕەوی بکات. ئەگەر لەبەیانی و ئێواراندا شتێ بخواتەوە بە گومانی ئەوەوە کە شەوە، دوایی دەرکەوت کە ڕۆژ بووە، ئەوە ڕۆژووەکەی باتڵە. بەڵام ئەگەر شتێ بخوات، یان بخواتەوە، یان نزیکی خێزانەکەی بکات و لەبیری بچێ کە ڕۆژووە، ئەوە ڕۆژووەکەی ناشکێ.[3]

## [چوارەم: خۆپارێزی لە ڕشانەوە و قووتدانی بەڵغەم]

ئەگەر کەسێ بە زۆر خۆی بڕشێنێتەوە، ڕۆژووەکەی دەشکێ؛[4] بەڵام ئەگەر بە بێ‌ویستی خۆی ڕشایەوە ئەوە ڕۆژووەکەی ناشکێ. ئەگەر بەڵغەمی ناو سینە و قورگی قووت دا ئەوە ڕۆژووەکەی ناشکێ لەبەر ئەوەی زۆربەی خەڵك ناتوانن خۆیانی لێ بپارێزن.[5]

---

١. ابوداود: ٢٠٢٨، بخاري: ١٨٠٤، احمد: ٢١١٧.

٢. ابوداود: ٢٠٣٠، طبراني في الكبير: ٩٣٢.

٣. مسلم: ١٩٥٢، احمد: ٩١٢٥، ترمذي: ٦٥٤، دارقطني: ٢٢٧٥.

٤. ترمذي: ٦٥٣، ابن‌ماجه: ١٦٦٦، احمد: ١٠٠٥٨.

٥. ئەمە بۆ وەختێ بوو کە ئەو بەڵغەمە نەیێتە نێو دەم و نەتوانێ تفی بکاتەوە، بەڵام ئەگەر بێتە نێو دەم و بتوانێ تفی بکاتەوە، لەو کاتەدا ئەگەر قووتی بدات ڕۆژووەکەی دەشکێ ـ وەرگێڕ.

### [پێنجەم: خۆپارێزی له جیماع و مشته]

[جیماع و ئاوهێنانەوه ڕۆژوو دەشکێنێ]. کەفارەت ئەکەوێته سەر ئەو کەسه کە [له ڕۆژی مانگی ڕەمەزان]دا جیماعی کردووه،[1] ئیتر لەسەر کەسێ کە بە خواردن یان خواردنەوه یان بە مشته ڕۆژووەکەی شکاندبێ، کەفارەت واجب نییه. ئەم کەفارەتەش بریتییه له ئازادکردنی کۆیلەیێك، ئەگەر کۆیله نەبوو، دوو مانگ ڕۆژووی [پشت سەریەك]، ئەگەریش توانای ڕۆژووی نەبوو، پێویسته نانی شەست فەقیر، بە هەرکامیان مشتێ [له قووتی ئەو شوێنه] بدات.[2]

## بەشی دووهەم: مەرجه مەعنەوییەکانی ڕۆژوو

بزانه بۆ ڕۆژوو سێ پله هەیه:

١. ڕۆژووی گشتی؛

٢. ڕۆژووی تایبەتی؛

٣. ڕۆژووی زۆر تایبەتی.

ڕۆژووی گشتی: بریتییه له بەرگری زگ و بەرگری له شەهوەت.

ڕۆژووی تایبەتی: بریتییه له بەرگری چاو، گوێ، زمان، دەست و پێ و ئەندامەکانیتر له تووشبوون بە گوناح .

ڕۆژووی زۆر تایبەتی: [سەرەڕای ئەوانەی کە باسمان کرد] بریتییه له پارازتنی دڵ له هەرچی خەم و خەفەت و بیرو فکری دنیایه و دابڕانه له غەیری خوا بە تەواوی.

ڕۆژوو بە هەرچی وا مەنعی لێ کراوە دەشکێ؛ پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «خَمْسٌ يُفَطِّرْنَ الصَّائِمَ: اَلْكِذْبُ وَالْغِيبَةُ وَالنَّمِيمَةُ وَالْيَمِينُ الْكَاذِبَةُ وَالنَّظَرُ بِشَهْوَةٍ».

واته: «پێنج شت ڕۆژووی ڕۆژووەوان دەشکێنن: درۆ، غەیبەت، فیتنەیی، سوێندی درۆ، سەیرکردنی نامەحرەم بە شەهوەتەوه».

---

١. مسلم: ١٨٧٠، ترمذی: ٦٥٦، ابن‌ماجه: ١٦٦١، احمد: ٦٩٨٩.

٢. مسلم: ١٨٧١، بخاری: ٦٣٢٢، ابن‌ماجه: ١٧٤٨، احمد: ١٠٢٦٩، ابوداود: ٢٠٤٣، ترمذی: ٦٥٦.

کەوا بوو پاراستنی ئەندامەکان لە گوناح، لە ڕۆژووی خەواس و خواناسە تایبەتییەکاندا، پێویستە.

**بۆ ڕۆژووی تایبەتی شەش مەرج پێویستە:**

**یەکەم:** چاوداخستن و بەرگریکردن لە ڕوانین بۆ هەرچی کە خراپە و حەرامە، هەرچی کە مرۆڤ لە یادی خوا غافڵ بکات.

پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «اَلنَّظَرُ سَهْمٌ مِنْ سِهَامِ إِبْلِيسَ».[١] واتە: «سەیری نامەحرەمکردن، تیرێکە لە تیرەکانی شەیتان».

**دووهەم:** پاراستنی زوانە لە درۆ و غەیبەت و دژوێن و ناڕەوا وتن، وە لەباتی ئەوانە خۆی بە یادی خواوە خەریك بکات.

پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «إِنَّمَا الصَّوْمُ جُنَّةٌ، فَإِذَا كَانَ أَحَدُكُمْ صَائِماً فَلا يَرْفُثْ وَلا يَجْهَلْ، وَ إِنْ امْرُؤٌ قَاتَلَهُ أَوْ شَاتَمَهُ فَلْيَقُلْ: إِنِّي صَائِمٌ»[٢].

واتە: «بەڕاستی ڕۆژوو قەڵغانە. ئەگەر یەکێکتان بەڕۆژوو بوو، ئەوە با دوژێن نەدات و گەوجانە هەڵسوکەوت نەکات، ئەگەریش کەسێ لەگەڵیدا شەڕی کرد، یان خراوەی پێ گوت، با لە وڵامیدا بڵێ: ئەمن بە ڕۆژووم».

**سێهەم:** پاراستنی گوێ لە بیستنی قسەی خراپ؛ خوای گەورە دەفەرمێ: ﴿سَمَّاعُونَ لِلْكَذِبِ أَكَّالُونَ لِلسُّحْتِ﴾[٣] واتە: «بۆ قسەی خراپ زۆر گوێ شل دەکەن وماڵی حرام بە زۆری ئەخۆن».

**چوارەم:** پاراستنی ئەندامەکانە چ دەست، چ پێ لە گوناح و بەرگری زگ لەوەی حەرام و حەڵاڵی تێ بکات. پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «كَمْ مِنْ صَائِمٍ لَيْسَ لَهُ مِنْ صَوْمِهِ إِلَّا الْجُوعُ وَ الْعَطَشُ»[٤] واتە: «زۆر ڕۆژووەوان هەیە کە جگە لە برسیەتی و تینوویەتی چی دی لە ڕۆژووەکەی بۆ نامێنێتەوە».

---

١. المستدرك للحاكم: ٧٩٨٨، طبرانی فی الکبیر: ١٠٢١١، مسند الشّهاب القضاعی: ٢٨٢.

٢. بخاری: ١٧٦١، مسلم: ١٩٤١، الموطأ لمالك: ٦٠٢، ابوداود: ٢٠١٦، نسائی: ٢١٨٦، احمد: ٧٧١٤، طبرانی فی الأوسط: ٢٨٨٢.

٣. المائدة: ٤٢.

٤. احمد: ٩٣٠٨، ابن‌ماجه: ١٦٨٠.

پێنجەم: لەکاتی بەربانگدا زۆر نەخوات؛ چونکە مەبەست لە ڕۆژوو نەفس‌شکێنییە؛ بۆ ئەوەی نەفسی لەسەر تەقوای خوا بار بهێنێ.

شەشەم: لە پاش بەربانگ و ڕۆژوو شکاندن دڵی لەنێوان ترس و ئومێدەواریدا بێت [ترس و ئومێد بۆ ئەوەی ئاخۆ ڕۆژووەکەی وەرگیرابێت یان نە؟].

## بەشی سێهەم: ترس و هومێد لە ڕۆژوودا

پێویستە ڕۆژووەوان دڵی بەردەوام لەنێوان ترس و هومێدەواریدا بێت کە ئاخۆ ئەم ڕۆژووەی لێ وەرگیراوە یان تەنیا برسیەتی و ماندوویەتی بۆ ماوەتەوە؟ چونکە مەبەست لە ڕۆژوو خۆگرتنەوەیە لە هەواو هەوەس و شەهوەت؛ دەی خۆ ئەم مەبەستەش تەنها بە نەخواردن و نەخواردنەوە پێك نایێت. شایەت [بەرخۆی بگرێ لە خواردن و خواردنەوە، بەڵام] بۆ نامەحرەم بڕوانێ و غەیبەت و فیتنەیی و درۆ بکات؛ ئەمانەش هەموویان ڕۆژوو دەشکێنن [واتە: خێری ڕۆژوو بە با دەدەن].

## بەشی چوارەم: ڕۆژووی سوننەت

پێویستە بزانی کە خێری ڕۆژووی سوننەت لە ڕۆژە گەورەکاندا زۆرترە و داکۆکی زۆری لە سەرە. ڕۆژانی گەورە هەندێکیان لە تەواو ساڵەکەدا هەیە، هەندێکیان لە هەموو مانگێکدا هەیە، هەندێکیش لە هەر حەفتەیێکدا هەیە. [بەم شێوەیە:]

### ڕۆژووی سوننەت لە ساڵدا:

ڕۆژووە سوننەتەکان لە ساڵدا بریتین لە:

ڕۆژووی ڕۆژی عەرەفە، ڕۆژی عاشوورا، دە ڕۆژی ئەووەڵی مانگی "زیلحەججە"، دە ڕۆژی ئەووەڵی مانگی "موحەڕڕەم". سەرجەمی مانگە حەرامەکان (ڕەجەب، زیلقەعدە، زیلحەججە، موحەڕڕەم) جێی گومانی ئەوەن کە ڕۆژوویان تێدا سوننەت بێت.

پێغەمبەرﷺ هێندە ڕۆژووی مانگی شەعبانی دەگرت،[1] گومانی ئەوە دەچوو کە مانگی ڕەمەزان بێت.

---

١. بخاری: ١٨٣٣ ـ ١٨٣٤، مسلم: ١٩٥٧، نسائی: ٢١٥٠، ابن‌ماجە: ١٦٣٩، احمد: ٢٣٨١٩.

له حەدیسدا هـاتووە کە: «أَفْضَلُ الصِّيَامِ بَعْدَ شَهْرِ رَمَضَانَ شَهْرُ اللهِ الْمُحَرَّمُ»[١] واتە: «پڕخێرترین ڕۆژوو پاش مانگی ڕەمەزان، ڕۆژووی مانگی موحەڕڕەمە؛ کە مانگی خوایە».

پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «صَوْمُ يَوْمٍ مِنْ شَهْرِ رَمَضَانَ أَفْضَلُ مِنْ ثَلاثِينَ مِنْ غَيْرِهِ وَ صَومُ يَوْمٍ مِنْ شَهْرِ حَرَامٍ أَفْضَلُ مِنْ ثَلاثِينَ يَوماً مِنْ صَوْمِ غَيْرِهِ[٢]، وَ مَنْ صَامَ الْخَمِيسَ وَالْجُمُعَةَ وَالسَّبْتَ مِنَ الْأَشْهُرِ الْحَرَامِ كَتَبَ اللهُ لَهُ عِبادَةَ سَبْعِ مِائَةِ عَامٍ»[٣].

واتە: «خێری ڕۆژووی ڕۆژێکی ڕەمەزان، زۆرترە لە سی ڕۆژ لە غەیری ڕەمەزاندا، هەروەها خێری ڕۆژووی یەك ڕۆژ لە مانگی حەرامدا زۆرترە لە سی ڕۆژ لە غەیری ئەودا. هەرکەسێك پێنجشەممە و جومعە و شەممەی مانگە حەرامەکان بەڕۆژوو بێت، خوای گەورە خێری عیبادەتی حەوت سەد ساڵی بۆ دەنووسێ».

[تێبینی:] مانگە گەورەکان بریتین لە: مانگی زیلحەججە، موحەڕڕەم، ڕەجەب، شەعبان.

مانگە حەرامەکان بریتین لە: مانگی زیلقەعدە، زیلحەججە، موحەڕڕەم، ڕەجەب.[٤] سیان لە پشت سەری یەکن (زیلقەعدە، زیلحەججە، موحەڕڕەم) و یەکێکیشیان (ڕەجەب) تەنیایە.

ڕۆژووی سوننەت لە مانگدا کە دووپات دەبێتەوە،[٥] بریتییە لە ڕۆژی ئەووەڵی مانگ، ڕۆژی ناوەڕاست ـ ئەم ڕۆژی ناوەڕاستەش لە "أيام‌البيض" (ڕۆژە سپیەکان) دەژمێردرێ ـ ڕۆژی ئاخری مانگ. هەروەها ڕۆژووی "أيام‌البيض" واتە: ڕۆژە سپیەکان کە بریتییە لە: سێزدەهەم و چواردەهەم و پانزدەهەمی هەر مانگێك.[٦]

---

١. مسلم: ١٩٨٢، نسائی: ١٥٩٦، احمد: ١٢٥٣ ـ ٨١٧٨، ابوداود: ٢٠٧٤، ترمذی: ٤٠٢.

٢. طبرانی فی الأوسط: ٩٦٠ بلفظ: «مَنْ صَامَ يَوْماً مِنَ الْمُحَرَّمِ فَلَهُ بِكُلِّ يَوْمٍ ثَلاثُونَ يَوماً»، و فی الکبیر بلفظ: «مَنْ صَامَ يَوْمَانِ مِنَ الْمُحَرَّمِ فَلَهُ بِكُلِّ يَوْمٍ ثَلاثِينَ حَسَنَةً».

٣. کنز العمال للهندی: ٢٤١٧٣ والسیوطی فی جامع الکبیر: ٥٣٥٨ بلفظ: «مَنْ صَامَ مِنْ كُلِّ شَهْرٍ حَرَامٍ ...»، طبرانی فی الأوسط: ١٨٥٦ بلفظ: «مَنْ صَامَ ثَلاثَةَ أَيَّامٍ مِنْ شَهْرٍ حَرَامٍ: الْخَمِيسُ وَالْجُمُعَةُ وَالسَّبْتُ كُتِبَ لَهُ عِبَادَةَ سَنَتَيْنِ»، و فی مجمع الزوائد للهیثمی: ١٩١/٣ بلفظ: «...كُتِبَ لَهُ عِبَادَةُ سِتِّينَ سَنَةٍ».

٤. التوبة: ٣٦. بخاری: ٢٩٥٨، مسلم: ٣١٧٩، ابوداود: ١٦٦٣، احمد: ١٩٤٩٢.

٥. بخاری: ١١٠٧، مسلم: ١١٨٢، ابوداود: ١٢٢١ ـ ٢٠٩٤، ترمذی: ٦٩٢ ـ ٦٧٣، نسائی: ٢٣٢٨، ابن‌ماجه: ١٦٩٨، احمد: ٢٠٣٣٩.

٦. بخاری: ١٨٤٥، نسائی: ٢٣٧٩، احمد: ١٩٤٣٣.

ڕۆژووی سوننەت لە حەفتەدا: بریتییە لە ڕۆژی دووشەممە، پێنجشەممە[1] و جومعە.[2]

ڕۆژووی تەواوی ساڵ: ئەم ڕۆژووە هەمووی ئەمانە کە گوتمان دەگرێتەوە، بەڵام لەسەر ئەوەی کە ئایا ڕۆژووی گشت ساڵە کە، ناپەسەندە یان نە؟ کێشە هەیە!

پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «أَفْضَلُ الصِّيامِ صَوْمُ أَخِي داوُدَ كانَ يَصُومُ يَوْماً وَ يُفْطِرُ يَوْماً»[3] واتە: «گەورەترین ڕۆژوو، ڕۆژووی داوودی برامە، کە ڕۆژێ نە ڕۆژێ بە ڕۆژوو ئەبوو».

لەوانەیە ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەرﷺ ئاماژە بێت بەم ڕۆژووەی حەزرەتی داوود عليه السلام: «عُرِضَتْ عَلَيَّ مَفاتيحُ خَزائِنِ الدُّنْيا وَ كُنُوزُ الْأَرْضِ فَرَدَدْتُها وَ قُلْتُ أَجُوعُ يَوْما وَ أَشْبَعُ يَوْما؛ أَحْمَدُكَ إِذا شَبِعْتُ وَ أَتَضَرَّعُ إِلَيْكَ إِذا جُعْتُ»[4].

واتە: «تەواوی کلیلی خەزێنەکانی دونیایان پێم پێشنیار کرد، ئەمن گلم نەداوەو وتم: من پێم خۆشە ڕۆژێ تێربم و ڕۆژێ برسی، هەروەختێ تێر بم شوکرانەبژێری تۆ دەکەم و هەروەختێ برسی بم لە تۆ دەپاڕێمەوە».

لە پێغەمبەرەوەﷺ دەگێڕنەوە کە: «ما صامَ النَّبِيُّﷺ شَهْراً كامِلاً قَطُّ غَيْرَ رَمَضانَ»[5] «پێغەمبەرﷺ جگە لە ڕەمەزان، قەت مانگێکی تەواو بەڕۆژوو نەبووە.

---

١. ابوداود: ٢٠٨١، نسائی: ٢٣٧١، احمد: ٥٣٨١.

٢. جاء فی الحدیث: «لا يَصُومَنَّ أَحَدُكُمْ يَوْمَ الْجُمُعَةِ إِلّا يَوْماً قَبْلَهُ أَوْ بَعْدَهُ» بخاری: ١٨٤٩، مسلم: ١٩٢٩ ـ ١٩٣٠، ترمذی: ٦٧٤.

٣. بخاری: ١٨٤٣ ـ ١٠٦٣، مسلم: ١٩٦٣ ـ ١٩٧٧ ـ ١٩٧٢، ابوداود: ٢٠٧٤١، ترمذی: ٧٠١، نسائی: ٢٣٤٦، ابن‌ماجه: ١٧٠٣، احمد: ٦٤٧٥ ـ ٦٢٤٨.

٤. ترمذی: ٢٢٧٠، احمد: ٢١١٦٦، طبرانی: ٧٧٤١، بیهقی: ١٣٩٤ جمیعهم بلفظ آخر و هو: «عَرَضَ عَلَيَّ رَبِّي لِيَجْعَلَ لي بَطْحاءَ مَكَّةَ ذَهَباً، قُلْتُ، لا، يا رَبِّ، وَ لٰكِنْ أَشْبَعُ يَوْماً وَ أَجُوعُ يَوْماً فَإِذا جُعْتُ تَضَرَّعْتُ إِلَيْكَ وَ ذَكَرْتُكَ، وَ إِذا شَبِعْتُ شَكَرْتُكَ وَ حَمِدْتُكَ».

٥. بخاری: ١٨٣٥، مسلم: ١٩٥٩، احمد: ٢٣٢٢، ابوداود: ٢٠٧١، نسائی: ٢٣٤٢.

# بابەتی حەوتەم: حەج و ڕەمز و ڕازی حەج

خوای گەورە لە مەڕ حەجدا ئەم ئایەتەی نازڵ فەرمووە:

﴿ٱلْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ﴾[1] واتە: «ئەوڕۆ دینم بۆتان تەواو کرد».

پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «مَنْ مٰاتَ وَ لَمْ يَحُجَّ فَلْيَمُتْ إِنْ شٰاءَ يَهُودِيّاً وَ إِنْ شٰاءَ نَصْرٰانِيّاً»[2].

واتە: «ئەگەر کەسێك بمرێت و حەجی نەکردبێت ئەوە با بە جـــوولەکەیی ـ ئەگەری ئەیەوێ ـ بمرێ، یان بە عیســـایی ـ ئەگەر ئەیەوێ ـ بمرێ».

## بەشی یەکەم: لەبارەی خێرو گەورەیی حەج و پیرۆزی مەککە، مەدینە، بەیتولمەقدیس و خێری سەردانیان:

خوای گەورە فەرموویـەتی: ﴿وَ أَذِّنْ فِي النّٰاسِ بِالْحَجِّ يَأْتُوكَ رِجٰالاً وَ عَلَىٰ كُلِّ ضٰامِرٍ يَأْتِينَ مِنْ كُلِّ فَجٍّ عَمِيقٍ ۝٢٧ لِيَشْهَدُوا مَنٰافِعَ لَهُمْ﴾[3].

واتە: «لەنێو خەڵکدا بانگەواز بکە بێن بۆ حەج، بە پیادە یان بە سواری وشتری لەڕو لاواز، دێن لە هەموو ڕێگاییێکی دوور و درێژەوە، تا خێر و بێرێ کە بۆیان تەرخان کراوە ببینن».

---

١. المائدة: ٣.

٢. ترمذی: ٧٤٠ بلفظ: «مَنْ مَلَكَ زٰاداً وَ رٰاحِلَةً تُبَلِّغُهُ إِلَىٰ بَيْتِ اللهِ وَ لَمْ يَحُجَّ فَلا عَلَيْهِ أَنْ يَمُوتَ يَهُودِيّاً أَوْ نَصْرٰانِيّاً».

٣. الحج: ٢٧.

پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «ما رُؤِيَ الشَّيْطانُ في يَوْمٍ أَصْغَرَ وَلا أَدْحَرَ وَلا أَحْقَرَ وَلا أَغْيَظَ مِنْهُ مِنْ يَوْمِ عَرَفَةِ»[1] واتە: «هیچ ڕۆژێ شەیتان بچووکتر، ڕاونراوتر، پەستتر، تووڕەتر، لە ڕۆژی عەرەفە نەبینراوە».

دیسان پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «مَنْ خَرَجَ مِنْ بَيْتِهِ حاجّاً أَوْ مُعْتَمِراً فَماتَ أُجْرِيَ لَهُ أَجْرُ الْحاجِّ وَالْمُعْتَمِرِ إِلَىٰ يَوْمِ الْقِيامَةِ»[2].

واتە: «هەرکەس بە نیەتی حەج یان عەمرە، لە ماڵ بێتەدەر و لە ڕێدا بمرێ، ئەوە خوا [هەرچی ساڵە] خێری حەج و عەمرەی تا قیامەت بۆ دەنووسێ».

هەندێ لە پیاوچاکە پێشووەکان فەرموویانە: ئەگەر ڕۆژی جومعە و عەرەفە یەکی گرت، ئەوە خوا لە تەواوی ئەوانەی لە عەرەفەدان خۆش ئەبێت. ڕۆژی عەرەفە مەزنترین ڕۆژە لە دونیادا؛ لەم ڕۆژەدا پێغەمبەرﷺ دوایین حەجی خۆی (حجەالوداع)ی فەرمووەو لەو کاتەدا کە لەوێ ڕاوەستا بوو، ئەم ئایەتە هاتەخوار: ﴿اَلْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ﴾[3] واتە: «ئەورۆ دینم بۆتان تەواو کرد». ئەهلی کتێب (یەهوود و مەسیحی). گوتوویانە: ئەگەر ئەم ئایەتە بەسەر ئێمەدا نازڵ ببوایە، ئەو ڕۆژەمان دەکردە جێژن.

حەزرەتی عومەرؓ فەرموویەتی: ئەمن شایەتی دەدەم کە ئەم ئایەتە لە ڕۆژێکدا کە دوو جێژنی تێدا بوو: لە ڕۆژی عەرەفە و ڕۆژی جومعە، نازڵ بووەتە سەر پێغەمبەر، لە کاتێکدا کە لە عەرەفەدا ڕاوەستا بوو.

پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «اَللّٰهُمَّ اغْفِرْ لِلْحاجِّ وَ لِمَنْ اسْتَغْفَرَ لَهُ الْحاجُّ»[4] واتە: «خوایا! خۆش بە لە حاجی و لە ئەوەی وا حاجی داوای لێبوردنی بۆ دەکات».

دەگێڕنەوە کە عەلی کوڕی موەففیق لەبری پێغەمبەرﷺ چەند حەجێکی کردبوو، گوتبووی: پێغەمبەرمﷺ لە خــەوا دیت، پێی فەرمووم: ئەی کوڕی موەففیق! ئەتۆ

١. الموطأ للامام المالك: ٨٤٠، بیهقی فی شعب الإیمان: ٣٧٧٥، جامع الکبیر للسوطی: ٧١٢، شرح السّنّة للبغوی: ٣٨١/٣، جامع الأصول لابن‌اثیر: ٦٨٦٦.

٢. طبرانی فی الکبیر: ٨٠، ابی‌یعلی الموصلی فی مسنده: ٦٢٢٧، بیهقی فی شعب الإیمان: ٣٨٠٦، الهیثمی فی مجمع الزّوائد: ٢٠٨/٣.

٣. المائدة: ٣.

٤. ابن‌ابی‌شیبه فی مصنفه: ١٩١/٤، طبرانی فی الکبیر: ٢٠٥ فی الأوسط: ٨٨٣٢. فی الصّغیر: ١٠٨٥، حاکم فی المستدرك: ١٥٦٤، بیهقی فی شعب الإیمان: ٣٨١٧.

حەجت لەبریتی من کردووە؟ منیش گوتم: بەڵێ، فەرمووی: لە جێی من لەبەیکت وتووە؟ وتم: بەڵێ، فەرمووی ئەدی منیش لە قیامەتدا ئاگادارت ئەبم و دەستت دەگرم و ئەتبەمە بەهەشت، لە حاڵێکدا تەواوی خەڵك وان لە نێو تەنگانەی حیسێب و کیتێبدا.

## ڕێز و گەورەی ماڵی کەعبە و مەککە:

پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «إِنَّ اللّٰهَ قَدْ وَعَدَ الْبَيْتَ أَنْ يَحُجَّهُ فِي كُلِّ سَنَةٍ سِتُّمِائَةِ أَلْفٍ فَإِنْ نَقَصُوا أَكْمَلَهُمُ اللّٰهُ تَعٰالَىٰ بِمَلائِكَتِهِ وَ إِنَّ الْكَعْبَةَ تُحْشَرُ يَوْمَ الْقِيٰامَةِ كَالْعَرُوسِ الْمَزْفُوفَةِ، وَ كُلُّ مَنْ حَجَّهٰا مُتَعَلِّقٌ بِأَسْتٰارِهٰا يَسْعَوْنَ حَوْلَهٰا حَتَّىٰ تَدْخُلَ الْجَنَّةَ فَيَدْخُلُونَ مَعَهٰا»[1].

واتە: «خوای گەورە بەڵێنی داوە بە کەعبە کە هەموو ساڵێ شەشسەد هەزارکەس حەجی بکەن، جا ئەگەر لەو ئەندازە کەمتر بوون ئەوە خوای مەزن بە فریشتەکانی تەواوی دەکات. ماڵی کەعبە لە ڕۆژی قیامەتدا دێتە پێشەوە وەکوو تازە بووکێ، هەر کەسێکیش حەجی کردبێ، خۆی داڵۆسکەی پەردەی کەعبە دەکات و بە دەوریا دێن تا کەعبە دەڕواتە بەهەشت و ئەمانیش لەگەڵیدا دەچنە نێوی».

لە حەدیسدا هاتووە کە: «حەجەرولئەسوەد» یاقووتێکە لە یاقووتەکانی بەهەشت،[2] لە ڕۆژی قیامەتدا دەیهێننە بەرەوە، دوو چاوی هەیە و زمانێ کە قسەی پێ دەکات؛ شایەتی دەدات لەسەر ئەو کەسەی کە بەڕاستی و بە دڵ ماچی کردووە، یان دەستی پیا هێناوە»[3].

پێغەمبەرﷺ زۆر «حەجەر»ی ماچ ئەکرد[4]. جارێك حەزرەتی عومەرؓ ماچی حەجەری کرد و فەرمووی: ئەمن دەزانم تۆ بەردێکی، نەدەتوانی زەرەرت بێت، نە خێر، ئەگەر

---

١. کشف الخفاء للعجلونی: ٧٣٠.

٢. ترمذی: ٨٠٤ ـ ٨٠٣، احمد: ٦٧٠٥ بلفظ: «إِنَّ الرُّكْنُ وَالْمَقٰامُ يٰاقُوتَتٰانِ مِنْ يٰاقُوتِ الْجَنَّةِ»، نسائی: ٢٨٨٦ بلفظ: «الْحَجَرُ الْأَسْوَدُ مِنَ الْجَنَّةِ»، حاکم فی المستدرك: ١٦٣١، بیهقی فی شعب الإیمان: ٣٧٤١، ابن‌حبان فی صحیحه: ٣٨٧٠، ابن‌خزیمه فی صحیحه: ٢٥٢٤ جمیعهم بلفظ: «الرُّكْنُ وَالْمَقٰامُ يٰاقُوتَتٰانِ مِنْ يَوٰاقِيتِ الْجَنَّةِ».

٣. احمد فی مسنده: ٢٥١١، بیهقی فی شعب الإیمان: ٣٧٤٦، طبرانی فی الکبیر: ١٢٣٠٩، دارمی فی سننه: ١٨٩٢ جمیعهم بلفظ: «لَيَبْعَثَنَّ اللّٰهُ الْحَجَرَ يَوْمَ الْقِيٰامَةِ وَ لَهُ عَيْنٰانِ يُبْصِرُ بِهِمٰا وَ لِسٰانٌ يَنْطِقُ بِهِ يَشْهَدُ بِهِ لِمَنِ اسْتَلَمَهُ بِحَقٍّ».

٤. ابن‌ماجه: ٢٩٣٦، حاکم فی المستدرك: ١٦٢٣، ابن‌خزیمه فی صحیحه: ٢٥٠٦، بیهقی فی شعب الإیمان: ٣٨٦٥.

پێغەمبەرم ﷺ نەدیبا کە ماچتی دەکرد قەت ماچت نەئەکردی[1]. پاشان گریا، لای کردەوە، لە پشتیەوە چاوی بە حەزرەتی عەلی رضي الله عنه کەوت، حەزرەتی عەلی پێی فەرموو: وا مەڵێ، ئەویش فەرمووی: ئەی بابی حەسەن ئا لێرە فرمێسك ئەرێژرێ و لێرە دۆعا و نزا وەردەگیرێ.[2]

عەلی رضي الله عنه فەرمووی: نەخێر، بەڵکوو خێر و زەرەری هەیە.

فەرمووی: چلۆن؟!

فەرمووی: «خـوای گەورە لەو کاتەدا کە بەڵێنی لە مرۆڤ وەرگرتووە، لە دەفتەرێکدا نووسیویە و خستوویەتیە نێو دەمی ئەم بەردەوە، ئەدی ئەویش لە ڕۆژی قیامەتدا شایەتی بەخێری بڕواداران دەدات کە وەفایان بەو بەڵێنیە کردووە، هەروەها شایەتی بەزەرەری کافران دەدات کە ئینکاریان کردووە». هەندێ گوتوویانە: ئەمەیە مانای وتەی خەڵك کاتێ دەست دەدەن لە حەجەرولئەسوەد و دەڵێن: «اَللّٰهُمَّ إِيمٰاناً بِكَ وَ تَصْدِيقاً بِكِتٰابِكَ وَ وَفٰاءً بِعَهْدِكَ»[3] واتە: «خـوایە! لەسەر بڕوا بە تۆ و شایەتیدان لەسەر کتێبەکەت و وەفا بە بەڵێنیەکەت هاتووینەتە ئێرە».

لە حەسەنی بەسرییەوە رحمه الله دەگێڕنەوە کە فەرموویـەتی: خێری ڕۆژێك ڕۆژوو لە مەککەدا بە ئەندازەی سەد ڕۆژە، خێری بەخشینی دیرهەمێك لەوێدا بە ئەندازەی سەد دیرهەمە، بە کورتی خێری هەر چاکەیێك لەوێدا سەد قاتی جێگەکانیترە.

پێغەمبەر ﷺ فەرموویـەتی: «أَنَا أَوَّلُ مَنْ تَنْشَقُّ عَنْهُ الْأَرْضُ ثُمَّ آتِي أَهْلَ الْبَقِيعِ فَيُحْشَرُونَ مَعِي، ثُمَّ آتِي أَهْلَ مَكَّةَ فَأُحْشَرُ بَيْنَ الْحَرَمَيْنِ»[4].

---

١. بخاری: ١٤٩٤، مسلم: ٢٢٢٨، نسائی: ٢٨٨٨ ـ ٢٨٨٧، الموطأ لمالك: ٧٢٠، ابوداود: ١٥٩٧، ابن‌ماجه: ٢٩٣٤، احمد: ٣٠٧.

٢. ابن‌ماجه: ٢٩٣٦، حاكم فی المستدرك: ١٦٢٣، ابن‌خزیمه فی صحیحه: ٢٥٠٦، بیهقی فی شعب الإیمان: ٣٨٦٥ جمیعهم بلفظ: «اسْتَقْبَلَ رَسُولُ اللهِ ﷺ الْحَجَرَ ثُمَّ وَضَعَ شَفَتَيْهِ عَلَيْهِ يَبْكِي طَوِيلاً ثُمَّ الْتَفَتَ فَإِذَا هُوَ بِعُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ يَبْكِي، فَقَالَ: يَا عُمَرُ هٰهُنَا تُسْكَبُ الْعَبَرَاتُ».

٣. بیهقی فی معرفة السنن والآثار: ٣٠٢٦، طبرانی فی الكبیر: ٦٥٣ ـ ٨٢٦ و فی الأوسط: ٤٩٩ ـ ٥٦٤٤ ـ ٦٠٠٥ دون لفظ: «وَفَاءً بِعَهْدِكَ» باضافة لفظ: «وَ سُنَّةِ نَبِيِّكَ».

٤. ترمذی: ٣٦٢٥ بإضافة: «أَنَا أَوَّلُ مَنْ تَنْشَقُّ عَنْهُ الْأَرْضُ ثُمَّ أَبُوبَكْرٍ ثُمَّ عُمَرُ»، ابن‌حبان صحیحه: ٧٠٢٥ و حسنه.

واتە: «ئەمن ئەووەڵین کەسێکم [لە ڕۆژی حەشردا] زەویم لەسەر دوو شەق دەبێ و دێمە دەرەوە، پاشان دێم بۆلای ئەهلی «بەقیع» و ئەوان لەگەڵ من حەشر دەکرێن و پاشان دێم بۆلای خەڵکی مەککە و لەنێوان هەردوو حەرەمەدا حەشر دەکرێم».

ئەڵێن: خۆرئاوا نابێ مەگەر لەو ڕۆژەدا یەکێك لە «ئەبدال» تەوافی ماڵی کەعبەی کردبێ، هەروەها خۆر هەڵنایێ مەگین لەو شەوەدا یەکێك لە «ئەوتاد» تەوافی کەعبەی کردبێ. تەواوبوونی ئەم تەوافانەش ئەبێتە هۆی بەرزبوونەوەی ماڵی خوا بۆ ئاسمان. ڕۆژێك بەرەبەیان خەڵك هەڵدەستن، دەبینن کە کەعبە بەرز بۆتەوەو هیچ ئاسەوارێکی لێ بەجێ نەماوە. ئەمەش کاتێ ڕوو دەدات کە حەوت ساڵی بەسەرا بێت و کەس تەوافی کەعبە نەکات. پاش ئەم کارەساتە قورئانیش لەنێو پەڕتووکەکاندا بەرز دەبنەوە. کوتوپڕ ڕۆژێ خەڵك هەڵدەستن و دەبینن هەموو پەڕەکانی قورئان سپی دیارە و هیچ پیتێکی تێدا نییە، پاش ئەمە قورئان لە سینەی تەواوی خەڵکدا پاك ئەبێتەوە؛ کەس هیچێکی لەبیردا نامێنێ، جا خەڵك وردە وردە ڕوو دەکەنەوە لە شیعر و هۆنراوە و چیرۆکی سەردەمی جاهیلی، پاشان دەججال دێتەدەر و حەزرەتی عیساعَلَيهِالسَّلَام دێتە خوار و دەججال ئەکوژێت. قیامەتیش لەو وەختەدا وەکوو ژنێکی دەمەو زایین وایە، کە هەرسات چاوەڕوانی منداڵبوونی لێ بکرێ [واتە: هەرسات لەوانەیە قیامەت بەرپا بێت].[1]

## ناپەسەندبوونی مانەوە لە مەککەدا

[هەندێ لە زانایان زۆر مانەوە لە مەککەدا لەبەر چەند هۆیەك، بە ناپەسەند دەزانن:].

یەکەم: هەندێکیان لەبەر ئەوەی کە مەترسی ئەوەی هەیە کە حاجییان ماندوو بن [و تاقەتی ڕێزگرتنی ماڵی خوایان نەمێنێ].

حەزرەتی عومەریشرَضِيَاللَّهُعَنهُ ئاوەها ئەفەرمێ: «خَشِيتُ أَنْ يَأْنِسَ النَّاسُ بِهٰذَا الْبَيْتِ» واتە: «لەوە دەترسم خەڵك بەم بە ماڵەوە خوو بگرن و بۆیان ئاسایی بێتەوە». حەزرەتی عومەر پاش ئەوەی خەڵك حەجیان دەکرد، جوابیانی دەکرد و دەیفەرموو: ئەی خەڵکی یەمەن! بگەڕێنەوە بۆ یەمەنەکەتان، ئەی خەڵکی شام! بچنەوە بۆ شامەکەتان، ئەی خەڵکی عیراق! بچنەوە بۆ عیراقەکەتان.

١. عمدة القاري شرح صحيح البخاري: ٤٥١/١٤، تاريخ مكّة الشّريف والمسجد الحرام لابن‌الضّياء: ٥٢.

دووهەم: گوتوویانە: بۆ ئەوەی ئەم شەوق و تاسە نەشکێت و دیسانەوە لە دڵیاندا شۆر و تامەزرۆی بەدی بهێنێ و ببێتە هۆی دووبارە گەڕانەوەیان. خوای گەورە ئەفەرمێ: ﴿وَ إِذْ جَعَلْنَا الْبَيْتَ مَثَابَةً لِلنَّاسِ وَ أَمْناً﴾[1].

واتە: «وە بیر بێنەوە ئەو کاتە کە ئەم ماڵەمان کردە پەسیو و پەناگا و جێگەیێ ئەمن بۆ خەڵك».

سێهەم: گوتوویانە: مەترسی ئەوە هەیە خەڵك لەوێدا تووشی گوناح و هەڵە ببن، ئەمەش شتێکی حەرامە و نابارە.

## خێری مانەوە لە مەککەدا

بۆ کەسێ کە بتوانێ حەققی ماڵی خوا بەجێ بهێنێ، مانەوە خێری تێدایە و ئەم فەرموودەی پێغەمبەرﷺ ئاماژە بەمە دەکات: «إِنَّكِ لَخَيْرُ أَرْضِ اللهِ وَ أَحَبُّ بِلادِ اللهِ إِلَيَّ وَ لَوْلا أَنِّي أُخرِجْتُ مِنْكِ مٰا خَرَجْتُ مِنْكِ»[2].

واتە: «[ئەی مەککە!] ئەتۆ باشترین ئەرزی خوایت و خۆشەویسترین شاری خوای بەلای منەوە، ئەگەر من لە تۆ دەر نەکرایەم، قەت لەتۆ نەئەچوومە دەرەوە».

## خێر و گەورەیی مەدینە

پاش مەککە شوێنێ گەورەتر لە مەدینە نییە. پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «صَلاةٌ فِي مَسْجِدِي هٰذٰا خَيْرٌ مِنْ أَلْفِ صَلاةٍ فِيمٰا سِوٰاهُ إِلَّا الْمَسْجِدَ الْحَرٰامِ»[3].

واتە: «جگە "مسجدالحرام" نەبێ، خێری نوێژێك لەم مزگەوتەمدا بە ئەندازەی هەزار نوێژە لە شوێنەکانیتردا».

پاش مەدینەش خێری نوێژی «مسجدالأقصی» پێنجسەد بەرانبەری شوێنەکانیترە[4].

---

١. البقرة: ١٢٥.

٢. ترمذی: ٣٨٦٠، ابن‌ماجه: ٣٠٩٩، احمد: ١٧٩٦٦، نسائی فی السنن: ٤٢٥٤ ـ ٤٢٥٣، دارمی فی السنن: ٢٥٦٥، ابن‌حبان: ٣٧٧٨.

٣. بخاری: ١١١٦، مسلم: ٢٤٧٠، الموطأ لمالك: ٤١٤، ترمذی: ٢٩٩، نسائی: ٢٨٤٩، ابن‌ماجه: ١٣٩٤، احمد: ٤٦٠٦.

٤. «وَ فِي مَسْجِدِ بَيْتِ الْمَقْدِسِ خَمْسُمِائَةِ صَلاةٍ» بیهقی فی شعب الإیمان: ٣٨٤٥، فیض القدیر للمناوی: ٥٨٦٨، کنز العمال للهندی: ٣٤٦٣٤.

لە ئیبنوو عەبباسەوە رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا ڕیوایەت کراوە کە پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فەرموویەتی: «صَلاةٌ فِي الْمَسْجِدِ الْمَدِينَةِ بِعَشْرَةِ آلافِ صَلاةٍ، وَ صَلاةٌ فِي الْمَسْجِدِ الْأَقْصَىٰ بِأَلْفِ صَلاةٍ، وَ صَلاةٌ في مَسْجِدِ الْحَرامِ بِمِائَةِ أَلْفِ صَلاةٍ».

واتە: «خێری نوێژێك لە مزگەوتی مەدینەدا بە ئەندازەی دە هەزار نوێژە، خێری نوێژێ لە «مسجدالأقصی» بە ئەندازەی هەزار نوێژە، خێری نوێژێ لە «مسجدالحرام» بە ئەندازەی سەد هەزار نوێژە».

## بەشی دووهەم: مەرجەکانی واجببوون و دامەزرانی حەج، ڕوکنەکانی، واجباتی و قەدەغەکراوەکانی

### مەرجەکانی دامەزرانی حەج:

بۆ ئەوەی حەج دابمەزرێ، موسڵمانبوون لە کاتی حەجەکە مەرجە. کە وابوو حەجی منداڵی تازە پێگەیشتوو کە چاك و خراپی خۆی لێك بکاتەوە (ممیز) دروستە و خۆی دەبێ ئیحرام ببەستێ؛ بەڵام ئەگەر هێشتا چاك و خراپی لێك نەدەکردەوە (غیرممیز) ئەوە با سەرپەرشتکارەکەی لەجێی ئەو ئیحرام ببەستێ و هەرچی خۆی ئەنجامی ئەدات بەویشی ئەنجام بدات.

کاتی ئیحرام بەستنیش بریتییە لە مانگی «شەشەڵان (شەوال)» و «زیلقەعدە» و نۆ ڕۆژ لە مانگی «زیلحەجە» تا هەڵاتنی خۆری ڕۆژی جێژن. هەرکەسێکیش لە غەیری ئەم وەختانەدا ئیحرام ببەستێ ئەوە بە عەمرە دائەمزرێ بۆی؛ چونکە تەواوی ساڵ وەختی عەمرەیە.

بۆ ئەوەی حەجی واجب بە تەواوی بێتەجێ پێنج مەرج پێویستە:

١. ئیسلام؛

٢. ئازادبوون (واتە: بەردە نەبوون)؛

٣. باڵغبوون؛

٤. عەقڵ؛

٥. کاتی حەج.[1]

١. روضة الطّالبين للنووی: ٢٨٨/١، المجموع للنووی: ٢٠/٧، الاحوی الکبير للماوردی: ٨/٤.

کەوابوو ئەگەر منداڵ یان کۆیلە ئیحرامیان بەست، بەڵام لە «عەرەفە» یان «موزدەلیفە» منداڵەکە باڵغ بوو و کۆیلەکە ئازاد کرا، ئەگەر پێش هەڵاتنی خۆری ڕۆژی جێژن بگەڕێنەوە بۆ «عەرەفە» ئەوە ئەو حەججەیان جێی حەجی واجب دەگرێتەوە؛ چونکە حەجی واجب بریتییە لە «عەرەفە»،[1] وە جگە لە مەرێك هیچ کەفارەتێکی تریان ناکەوە سەر. ئەم مەرجانەی کە باسمان کرد، جگە لە عەرەفە، بۆ عەمرەش پێویستە، تا حەجی واجب [کە بریتییە لە حەج و عەمرەیێك] لەسەر ئەو کەسە وا حەجی لەسەرە بکەوێ.

بەڵام بۆ ئەوەی حەج بە سوننەت دابمەزرێ بۆ موسڵمانێکی باڵغی ئازاد، پێویستە حەجی واجبی لە گەردنی خۆی خستبێ. کەوابوو حەجی واجب وا لە پێشەوە، پاشان حەجی قەزا، ـ بۆ کەسێ کە لەکاتی وەستان لە عەرفاتدا حەجەکەی بەتاڵ بووبێتەوە ـ پاشان حەجێ کە بە نەزرکردن لەسەر خۆی واجبی کردبێ، پاشان حەجێك کە لەجێی کەسێکیتر ئەنجام بدات پاش ئەمانە دەتوانێ حەجی سوننەت بەجێ بهێنێ. ڕەچاوکردنی ئەم ڕیزە واجبە و حەج بەم شێوەیە نەبێ دانامەزرێ. هەر نیەتێکیش غەیری ئەمە بهێنێ دروست نییە.

## مەرجی واجببوونی حەج:

[١. ئیسلام؛ ٢. باڵغبوون؛ ٣. عەقڵ]؛ ٤. کۆیلە نەبوون؛ ٥. توانایی.

هەرکەسێ حەجی لەسەر فەرز بێت عەمرەشی لەسەر فەرز دەبێ.

[تێبینی:] هەرکەسێ بۆ مامەڵەکردن یان بۆ سەردانی خزم بیەوێ بڕوات بۆ مەککە ئەوە بەگوێرەی فەرموودەیێ، پێویستە ئیحرام ببەستێ و پاشانیش بە کەیفی خۆی بە عەمرە، یان بە حەج بیشکێنێ؛ مەگەر ئەو کەسە دارفرۆش بێت [یان ئازووقەی پێویستی مەککە بیات].

## توانایی و دەسڕۆیشتن بۆ ئەنجامدانی حەج، دوو بەشە:

یەکەم: ڕاستەوخۆ حەج بکات؛ کە پێویستە جەستەی ساغ و سەلامەت بێ، ڕێگە ئەمن بێ، تۆشەو ئازووقەی سەفەریشی ببێ. نابێ لە ڕێگەی بەحرێکەوە کە مەترسی خنکانی هەیە بڕوات. هەروەها ئەبێ بژیوی هاتن و چوونەوەکەی تا وڵاتی خۆی هەبێ و

---

١. «اَلحَجُّ الْعَرَفَةُ». نسائی: ٢٩٦٦، ابن‌ماجه: ٣٠٠٦، احمد: ١٨٠٢٣، ترمذی: ٨١٤.

هەروەها بژێوی تەواوی ئەوانەی وا لەم ماوەدا نەفەقە و خەرجیان وا بە ئەستۆیەوە. ئەمەش ئەبێ پاش ئەوەی تەواوی قەرزەکانی دابێتەوە و پارەی کرێکردنی وڵاخیشی بۆ سەفەرەکەی ببێت.[1]

دووهەم: پەککەوتەیێ کە توانای ماڵیی هەبێ، ئەمەش بەم جۆرەیە کە کەسێ بە کرێ بگرێ کە لەجێ ئەو حەج بکات، بەو مەرجەی کە بەکرێگیراوەکە خۆی فەرزی حەجی بە سەرەوە نەمابێ. هەروەها باوکێك بە ساڵاچوو و پەککەوتە کە کوڕێکی هەبێ ئەم ئەرکەی لە خۆڕا بۆ جێبەجێ بکات ئەوە ئەو باوکە بە توانا حسێب دەکرێ.

ئەو کەسەی کە توانای حەجی هەیە، دروستە حەجەکەی دوا بخات، بەو مەرجەی کە بمێنێت و بتوانێ حەجەکەی بکات، وەگەرنا بە گوناحباری دەمرێ [و پێویستە لە میراتەکەی حەجێکی بۆ بسێنرێ].

## ئەرکانی حەج:

ئەو ڕوکنانەی کە بە بێ ئەوانە حەج دانامەرزێ پێنج دانەن:

١. ئیحرام؛

٢. تەواف؛

٣. هاتوچۆی نێوان سەفا و مەروە؛

٤. ڕاوەستان لە عەرەفە؛

٥. کورتکردنەوە یا تاشینی مووی سەر؛ بە گوێرەی فەرموودەیێك.[2] ئەرکانی عەمرەش هەر وەکوو حەجی تەمەتوع وایە جگە لە وەستانی عەرەفە نەبێ.

## واجباتی حەج:

ئەو کردەوانەی کە لە حەجدا واجبن و ئەبێ بۆ قەرەبووکردنەوەیان قوربانی بدرێ شەش دانەن:

---

١. ترمذی: ٧٤١، ابن‌ماجه: ٢٨٨٧، دارقطنی: ٢٤٣٨، بیهقی فی شعب الإیمان: ٣٦٨٨.

٢. روضة الطّالبین للنووی: ٣٢٦/١، شرح الوجیز للرافعی: ٣٩٢/٧، المجموع للنووی: ٢٦٥/٨، مغنی المحتاج: ٥١٣/١.

١. ئیحرام لە میقاتدا؛ هەرکەس تەرکی بکات [واتە لە میقاتدا ئیحرام نەبەستێ] ئەوە لەسەریەتی مەڕێك قوربانی بدات؛

٢. ڕەجمی شەیتان؛ هەرکەس شەیتان ڕەجم نەکات بەگوێرەی فەرموودەیێ واجبە قوربانی بدات؛

٣. مانەوە لە عەرەفەدا تا خۆرئاوا بوون؛

٤. شەو مانەوە لە «موزدەلیفە»دا؛

٥. شەو مانەوە لە «مینا»دا؛

٦. تەوافولویداع [واتە: تەوافی خوا حافیزی].

ئەم چوار دانەی ئاخرە بەگوێرەی فەرموودەیێك ئەگەر تەرك بكرێ واجبە بە قوربانی قەرەبوو بکرێنەوە؛ بەڵام لە فەرموودەیێکی‌تردا سوننەتە قوربانی بکرێ.

## سێ شێوازی حەج و عەمرەکردن:

یەکەم: «ئیفراد» واتە: بە تاك حەجکردن ـ ئەم شێوەیە باشترینیانە کە ـ، بریتییە لەوەی لەپێشدا تەنیا حەج بکات کاتێ حەجی تەواو کرد، ئیحرام بشکێنێ و بڕوات سەرلەنوێ بە نیەتی عەمرەوە ئیحرام ببەستێ و عەمرە ئەنجام بدات. باشترین شوێن بۆ ئیحرامی عەمرەبەستن: «جوعرانەیە» جا «تەنعیم» جا «حودەیبیە». کەسێ بە شێوەی «ئیفراد» حەج بکات، قوربانی لەسەر نییە، مەگەر خۆی حەز بکات سوننەت بەجێ بهێنێ.

دووهەم: «قیڕان» واتە: حەج و عەمرە پێکەوەکردن، ئەم شێوەیە بریتییە لەوەی کە ئیحرام هەم بە نیەتی حەج، هەم بە نیەتی عەمرە دابیەستێ، ئیتر تەنها مەناسیکی حەج ئەنجام دەدات و عەمرەکەی دەچێتە ژێری حەججەکەی؛ هەر وەکوو چۆن دەسنوێژ لە ژێری غوسڵدا جێی دەبێتەوە. پێویستە بڵێین ئەگەر پێش وەستان لە عەرەفەدا تەواف و هاتوچۆی بەین سەفاو مەروە بکات، ئەوە ئەو هاتوچۆیەی بۆ ئەژمێررێت، بەڵام تەوافەکەی بۆ حەسێب ناکرێ؛ چونکە مەرجە، تەوافی فەرز پاش وەستان لە عەرەفەدا بکرێ [کە وابوو پێویستە پاش عەرەفە تەواف بکاتەوە]. ئەو کەسەش کە بە شێوەی «قیڕان» حەج دەکات پێویستە لەسەری مەڕێك سەرِ ببڕێ، مەگەر ئەو کەسە خەڵکی مەککە بێت، ئەوە

قوربانیی لەسەر نییە؛ چونکە ئەو قوربانیدانە بۆ ئەوەیە کە ئیحرامی لە میقاتدا [کە یەکێ لە واجباتە] ئەنجام نەداوە؛ دەی خۆ خەڵکی مەککە میقاتیان مەککەیە و ئەویش مەککەی بەجێ نەهێشتووە.

سێهەم: «تەمەتتوع» بریتییە لەوەی کە لە میقاتی وڵاتی خۆیدا ئیحرام بە عەمرە ببەستێ و پاش عەمرەکەی لە مەککەدا ئیحرام بشکێنێ و دابنیشێ تا کاتی حەج، لەم ماوەیەدا ئەتوانێ ئەوانەی وا لە حەجدا قەدەغەبوون ئەنجامیان بدات، پاشان بە نیەتی حەجەوە ئیحرام ببەستێ و حەج بکات.

## مەرجەکانی حەجی تەمەتتوع:

یەکەم: خەڵکی مەککە نەبێت؛ خەڵکی مەککە بریتییە لەوەی کە لە مەودای کەمتر لە ئەندازەی نوێژ کورتکردنەوەدا بێت [واتە: کەمتر لە ۸۳ کیلۆمەتر].

دووهەم: پێش حەج، عەمرەی کردبێ.

سێهەم: عەمرەکەی لەو مانگانەدا کردبێ کە حەجی تێدا ئەکرێ.

چوارەم: پاش عەمرەکەی نابێ بگەڕێتەوە بۆ میقاتی حەج و نابێ بەو ئەندازەش دوور کەوێتەوە.

پێنجەم: حەج و عەمرەکەی بۆ یەك نەفەر بێت.

بەم پێنج مەرجە حەجی "تەمەتتوع" دائەمزرێ، لە سەریشی واجبە مەڕێك بکاتە قوربانی، ئەگەر مەڕی دەست نەکەوت یان نەیدەتوانی، ئەوە سێ ڕۆژ ڕۆژوو لەسەریەك یان جیا جیا، پێش جێژن بگرێ، حەوت ڕۆژیش کاتێ دەگەڕێتەوە بۆ ماڵ؛ کە دەبێتە دە ڕۆژ. ئەم حەوت ڕۆژەش بە کەیفی خۆی جیا جیا، یان لە سەریەك بگرێ.

[تێبینی:] لەنێو ئەم سێ شێوەدا، شێوەی "ئیفراد" لە هەموویان باشترە، پاشان شێوەی "تەمەتتوع" پاشان شێوەی "قیڕان".[1]

---

١. و هو قول الشافعی و مالك، ترمذی: ٧٥٠ و جاء فی تحفة الأحوذی شرح الترمذی: هذا الحدیث دلیل لمن قال إن الإفراد أفضل من القِران و التمتّع، مسلم: ٢١١٦، ابوداود: ١٥١٦، نسائی: ٢٦٦٧، ابن‌ماجه: ٢٩٥٥، احمد: ٢٣٥٨٦.

**شەش شت لە حەج و عەمرەدا قەدەغەیە:**

یەکەم: لەبەرکردنی کراس و پانتۆڵ، لە سەرنانی مێزەر، لەپێ‌کردنی خۆف.[١]

بەڵکوو پێویستە دامێن و پشتەماڵە [رداء] لەبەر کات و سۆڵە لە پێ کات.

جا ئەگەر سۆڵەی دەست نەکەوت، گۆرەوی خۆفەکەی تا ئاستی قاپی پێی بقرتێنێ.[٢]

ئەگەریش دامێنی نەبوو، دەتوانێ پانتۆڵ لەپێ بکات. بەستنی شاڵ و لەسەرگرتنی چەتر، یان چوونە سێبەری کەژاوە و... قەیدی نییە؛ بەڵام پیاو نابێ بەهیچ کلۆجێك سەری داپۆشێ. چونکە ئیحرامی پیاو لەسەریدایە. ژنیش دەتوانێ جلوبەرگی دووراو لەبەر بکات بەو مەرجەی ڕوومەتی بە نیقاب دانەپۆشێ؛ چونکە ئیحرامی ژن لە ڕۆخساریدایە.

دووهەم: خۆ بۆنخۆش‌کردن؛ پێویستە لە هەرچی کە ئینسانی عاقڵ بە بۆنخۆشی دائەنێ خۆی بپارێزێ.[٣] ئەگەریش خۆی بۆنخۆش کرد یان بەو شێوە قەدەغەیە جلوبەرگی لەبەر کرد، ئەوە دەبێ مەڕێك لە قوربانیدا بدات.

سێهەم: کورتکردنەوەی موو و ناخوون،[٤] فیدیەی ئەمانەش سەربڕینی مەڕێکە. بەڵام چاوڕەشتن[٥] و چوونە حەمام[٦] و خوێن‌گرتن و حەجامەت‌کردن[٧] و سەر شانەکردن قەدەغە نییە.[٨]

چوارەم: جیماع‌کردن و چوونەلای ژن.[٩] ئەگەر ئەم جیماع کردنە پێش شکاندنی ئیحرام بێت ئەوە حەجەکەی باتڵە و پێویستە وشترێك یان مانگایێك یان حەوت سەر مەڕ بکات بە قوربانی [سەرەڕای ئەمەش ئەبێ حەجەکەی قەزا بکاتەوە]. بەڵام ئەگەر پاش ئیحرام‌شکاندن

١. جووتێ گۆرەوی تایبەتە ئەگەر کەسێ لەپێیان کات ئیتر شۆردنی پێ بۆ دەسنوێژ پێویست ناکات.

٢. بخاري: ١٣١، مسلم: ٢٠١٣، ابوداود: ١٥٥٤، نسائي: ٢٦١٩، احمد: ٤٦٦٤.

٣. بخاري: ١٧٠٨، مسلم: ٢٠١٤، ابوداود: ٣٥٢٧.

٤. ﴿وَلا تَحْلِقُوا رُءُوسَكُمْ﴾... البقرة: ١٩٦.

٥. مسلم: ٢٠٨٩، ابوداود: ١٥٦٧، ترمذي: ٨٧٥.

٦. بخاري: ١٧٠٩، مسلم: ٢٠٩١، ابوداود: ١٥٦٨، نسائي: ٢٦١٧، ابن‌ماجه: ٢٩٢٥، احمد: ٢٢٤٧٥.

٧. بخاري: ١٧٠٤، مسلم: ٢٠٨٧، ابوداود: ١٥٦٤، ترمذي: ٧٦٨، نسائي: ٢٧٩٦، ابن‌ماجه: ٣٠٧٣.

٨. ﴿فَمَنْ كَانَ مِنْكُمْ مَرِيضاً أَوْ بِهِ أَذًى مِنْ رَأْسِهِ﴾... البقرة: ١٩٦.

٩. ﴿فَمَنْ فَرَضَ فِيهِنَّ الْحَجَّ فَلا رَفَثَ وَلا فُسُوقَ وَلا جِدَالَ فِي الْحَجِّ﴾ البقرة: ١٩٧. روضه‌الطالبين للنووي: ٣٣٢/١، شرح الوجيز للرافعي: ٤٧١/٧.

بوو و پێش تەوافی فەرز بوو ئەوە لەسەری فەرزە وشترێك بدا، بەڵام حەجەکەی باتڵ نابێتەوە و قەزای لەسەر نییە.

پێنجەم: پێشەکییەکانی جیماع کە بریتییە لە: ماچکردن، [لە باوەش گرتن] و خۆ پێداهێنان و... لەگەڵ ژناندا، بەجۆرێ کە دەستنوێژ بشکێنێ ئەمە حەرامە و لەسەریەتی مەڕێك بدات. هەروەها مشتە و بەدەستی خۆ ئاوهێنانەوە حەرامە و فیدیەی لەسەرە.[1]

[تێبینی:] ژن مارەکردن و ژن بە شوودان حەرامە؛[2] بەڵام چونکە نیکاحەکە دانامەزرێ لەسەری نییە حەیوان بدات.

شەشەم: ڕاوکردن لە دەشت و دەردا [بەڵام ڕاوی جانەوەری بەحر، دروستە و فیدیەی لەسەر نییە]. مەبەست لەو جانەوەرانەیە کە گۆشتیان ئەخورێ یان جانەوەرێ کە لە نێر و مێیێ بووە کە گۆشتی یەکێکیان ئەخورێ و هی ئەویتریان ناخورێ. جا ئەگەر نێچیرێکی ڕاو کرد ئەوە لەسەریەتی بەو ئەندازەیە لە گۆشتی ئاژەڵێك کە لەو نێچیرە بچێ، فیدیە بدات.[3]

## بەشی سێهەم: چۆنیەتی بەڕێوەبردنی حەج لە سەرەتاوە تا هاتنەوە ناو ماڵ، ئەمەش دە قۆناغە:

### قۆناغی یەکەم: لە ماڵەوە تا ئیحرام بەستن:

**ئەم قۆناغە خۆی هەشت بەشە:**

١. تۆبە و پاشگەزبوونەوە لە گوناح، دانەوەی قەرز، خەرج و بژیو ئامادەکردن بۆ ئەوانەی نەفەقەیان لەسەریەتی، دانەوەی ئەمانەت بەخاوەنەکانیان. پێویستە خەرجی حەجەکەی لە ماڵی حەڵاڵ دابین بکات.

٢. دۆزینەوەی هاوڕێیەکی چاك کە یارمەتی دینی و دونیایی لە ڕێگەدا بدات.

٣. بەرلەوەی لە ماڵ بچێتە دەر دوو ڕکعەت نوێژ بخوێنێ، لەو دوو ڕکعەتەدا سوورەتی «الکافرون» و سوورەتی «قُلْ هُوَ اللّٰهُ أَحَدٌ» بخوێنێ. هەرکاتێ نوێژەکەی تەواو کرد، دەست بەرز بکاتەوەو بڵێ:

١. حاشية قليوبى و عميره: ١٩٦/٦، شرح الوجيز للرافعى: ٤٨٠/٧.

٢. مسلم: ٢٥٢٢، ابوداود: ١٥٦٩، نسائى: ٢٧٩٣، احمد: ٤٣٢.

٣. ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لا تَقْتُلُوا الصَّيْدَ وَ أَنْتُمْ حُرُمٌ﴾... المائدة: ٩٥. شرح الوجيز: ٤٨٥/٧، مغنى المحتاج: ١٥٠.

«اَللّٰهُمَّ أَنْتَ الصّٰاحِبُ فِي السَّفَرِ وَ أَنْتَ الْخَلِيفَةُ فِي الْأَهْلِ وَ الْمٰالِ وَ الْوَلَدِ وَ الْأَصْحٰابِ، احْفَظْنٰا وَ إِيّٰاهُمْ مِنْ كُلِّ آفَةٍ وَ عٰاهَةٍ وَ بَلِيَّةٍ»[1].

واته: «خوايا! ئەتۆ هاورێمی لەم سەفەرەدا و تۆ سەرپەرشتی ماڵ و منداڵ و کەس و کارمی لەبری من. خوایە! ئێمە و ئەوان لە هەر ئافەت و بەڵاو ناخۆشییەك بپارێزە».

٤. هەرکاتێ گەیشتە دەمی دەرگاکە بڵێ: «بِسْمِ اللهِ تَوَكَّلْتُ عَلَى اللهِ وَلا حَوْلَ وَلا قُوَّةَ إِلّا بِاللهِ، رَبِّ أَعُوذُ بِكَ أَنْ أَضِلَّ أَوْ أُضَلَّ أَوْ أَزَلَّ أَوْ أُزِلَّ أَوْ أَظْلِمَ أَوْ أُظْلَمَ أَوْ أَجْهَلَ أَوْ يُجْهَلَ عَلَيَّ»[2].

واته: «بە نێوی خوا، بەس بەخوا پشت دەبەستم، هیچ قودرەت و دەسەڵات و گۆڕانێ نییە مەگەر لەسەر ویستی خوا. خوایە! پەنات پێ دەگرم لەوەی کە گومڕا بم یان گومڕا بکرێم، لەوەی کە بە لاڕێدا بچم یان بە لاڕێدا بمبەن، لەوەی دەستدرێژی بکەم یان دەستدرێژیم بەسەردا بکرێ، لەوەی نەزان بم یان نەزان بکرێم».

٥. کاتێ کە سواری وڵاخ [یان ماشین] دەبێ بڵێ: «بِسْمِ اللهِ وَ بِاللهِ وَاللهُ أَكْبَرُ، تَوَكَّلْتُ عَلَى اللهِ، حَسْبِيَ اللهُ، سُبْحٰانَ الَّذِي سَخَّرَلَنٰا هٰذٰا وَ مٰا كُنّٰا لَهُ مُقْرِنِينَ وَ إِنّٰا إِلَىٰ رَبِّنٰا لَمُنْقَلِبُونَ»[3].

واته: «بەنێوی خوا و لەسەر خوا، خوا لە هەموو شت گەورەترە، بە خوا پشتم بەستووە، خوام بەسە، پاك و بەرییە ئەو خوایەی کە ئەمەی بۆمان دەستەمۆ کردووە، وەگەرنە ئێمە شیاوی ئەوە نین و تواناییمان نییە، ئێمەش بە ڕاستی بۆلای خوا دەگەڕێینەوە».

٦. سوننەت وایە دانەبەزێ و وچان نەگرێ تا کاتی گەرمبوونی خۆر.

هەروەها لە شەودا درێژە بە ڕۆیشتنەکەی بدات. پێغەمبەرصَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فەرموویەتی: «عَلَيْكُمْ بِالدُّلْجَةِ فَإِنَّ الْأَرْضَ تُطْوَىٰ بِاللَّيْلِ مٰا لا تُطْوَىٰ بِالنَّهٰارِ»[4].

---

١. مسلم: ٢٣٩٢، ابوداود: ٢٢٣١، ترمذی: ٣٣٦٠، نسائی: ٥٤٠٦، احمد: ٢١٩٧ جميعهم بلفظ: «اَللّٰهُمَّ أَنْتَ الصّٰاحِبُ فِي السَّفَرِ وَالْخَلِيفَةُ فِي الْأَهْلِ اللّٰهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ وَعْثٰاءِ السَّفَرِ وَ كَآبَةِ الْمُنْقَلَبِ وَ سُوءِ الْمَنْظَرِ فِي الْأَهْلِ وَالْمٰالِ اَللّٰهُمَّ اطْوِ لَنَا الْأَرْضَ وَ هَوِّنْ عَلَيْنَا السَّفَرَ».

٢. ابوداود: ٤٤٣٠، طبرانی فی الکبیر: ١٩٥١٠، ابن‌ماجه: ٣٨٧٤، احمد: ٢٥٥٠٤، ترمذی: ٣٣٤٩، نسائی: ٥٤٤٤، مجمع الزّوائد للیهثمی: ٣٩٨/٤، کنز العمال للهندی: ١٨٤٢٠، ریاض الصّالحین للنووی: ١٨/١، جمیعهم بروایات مختلفة.

٣. ابوداود: ٢٣٣٥، ترمذی: ٣٣٦٨، احمد: ٧١٤، ابن‌حبان فی صحیحه: ٢٧٥٢ بروایات مختلفة.

٤. الموطأ لمالك: ١٥٥١، ابوداود: ٢٢٠٧، احمد: ١٤٥٠٩، نسائی فی السنن الکبری: ١٠٧٩١، حاکم فی المستدرك: ١٥٨٢، طبرانی فی الکبیر: ١٠٦٥٨ ـ ١٧٢٤١، معرفة الصحابة لأبی‌نعیم الاصبهانی: ٥٧٥٤.

واتە: «ئێوە شەوڕەوی بکەن؛ چونکە بەو جۆرە کە لە شەودا ڕێ تەی دەکرێ بە ڕۆژدا ڕێ تەی ناکرێ».

٧. هۆشی بێت بە تەنیایی ڕێ نەگرێتە بەر و لە کاروان جیا نەبێتەوە مەبادا ڕێی پێ بگرن.

٨. لەڕێدا هەرکاتێ لەسەر ملە بەرزەوە بوو، سێ جار «اللّٰه أَكْبَر» بکات و بڵێ: «اَللّٰهُمَّ لَكَ الشَّرَفُ عَلَىٰ كُلِّ شَرَفٍ وَ لَكَ الْحَمْدُ عَلَىٰ كُلِّ حٰالٍ»[1].

واتە: «خوایا! ئەتۆ بەسەر هەموو بەرزێکدا بەرزی و لە هەموو کاتدا سپاس و ستایش شیاوی تۆیە».

هەرکاتێ لە بەرزاییەوە هاتە خوارەوە بڵێ: «سُبحانَ اللّٰهِ»[2].

هەرکاتێکیش هەستی بە ترس کرد بڵێ: «سُبْحٰانَ الْمَلِكِ الْقُدُّوسِ رَبِّ كُلِّ الْمَلائِكَةِ وَالرُّوحِ جَلَّلْتَ السَّمٰوٰاتِ وَ الْأَرْضَ بِالْعِزَّةِ وَ الْجَبَرُوتِ»[3].

واتە: «پاك و بەرییە خوای مەزن، پەروەردگاری تەواوی ڕۆح و فریشتەیە، ئەتۆ خوایە! ئاسمان و زەوینت بە گەورەیی و دەسەڵاتی خۆت، ڕووناك کردۆتەوە».

## قۆناغی دووهەم: لە شێوازی ئیحرامبەستنەوە تا چوونە ناو مەککە:

**ئەمەش پێنج بەشە:**

١. خۆشۆردن بە نیەتی ئیحرامبەستنەوە،[4] وێڕای ئەم خۆشۆردنەی ناخوون بکات و بەرسمێڵی بگرێت و هەرچی بۆ خاوێنی پێویستە ئەنجامی بدات.

---

١. احمد: ١٣٠١٧، مسند ابی‌یعلی الموصلی: ٤١٨٤، جامع الکبیر للسیوطی: ٤٥٠، الاذکار للنووی: ٦٢٩، مجمع الزوائد للهیثمی: ٤٠١/٤.

٢. «كٰانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَ جُيُوشُهُ إِذٰا عَلَوُا الثَّنٰايٰا كَبَّرُوا وَ إِذٰا هَبَطُوا سَبَّحُوا» ابوداود: ٢٢٣٢، عبدالرّزّاق فی مصنفه: ٩٢٤٥، جامع الأصول من أحاديث الرّسول: ١٠٥٠، رياض الصّالحين للنووی: ١٢٠/١.

٣. طبرانی فی الکبیر: ١١٥٦، معرفة الصّحابة لأبی‌نعیم الأصبهانی: ١٠٨٩، جامع الکبیر للسیوطی: ٣٧١، کنزالعمال للهندی: ٥٠١٦.

٤. الموطأ لمالك: ٦١٩، ابن‌ابی‌شیبة فی مصنفه: ٥٢٥/٤، حاکم فی المستدرك: ١٥٩١، طبرانی فی الکبیر: ١٣٢٣٩، دارقطنی: ٢٤٦٠، مسند الشافعی: ٢٩٨، معرفة السّنن والآثار للبیهقی: ١٨٨٠.

٢. جلوبەرگی تەقەڵدار و دووراو لەبەر داکەنێ[1] ـ وەك چۆن گوتمان ـ و خۆی بۆنخۆش بکات؛ هیچ قەیدی نییە ئەگەر بۆن و جرمی عەترەکەشی دوایی پێوە بمێنێ، هەروەك چۆن باس کراوە.

٣. کاتێ کە دەکەوێتە ڕێ یان وڵاخەکەی لێ دەخورێ، نیەتی ئیحرام بەستنی هەبێ.

هەر ئەوەی کە نیەتی ئیحرامی هەبێ بەسە؛ بەڵام سوننەتە وێڕای نیەتەکە بڵێ: «لَبَّيْكَ اَللّٰهُمَّ لَبَّيْكَ، لَبَّيْكَ لا شَرِيكَ لَكَ لَبَّيْكَ، إِنَّ الْحَمْدَ وَالنِّعْمَةَ لَكَ وَالْمُلْكَ، لا شَرِيكَ لَكَ»[2]. ئەمە بەسە، ئەگەریش حەزی کرد ئەمەی پێ زیاد بکات:

«لَبَّيْكَ وَ سَعْدَيْكَ وَ الْخَيْرُ كُلُّهُ بِيَدِكَ وَ الرَّغِباء إِلَيْكَ،[3] لَبَّيْكَ بِحُجَّةٍ حَقّاً تَعَبُّدا وَرِقّا، اللّٰهُمَّ صَلِّ عَلَىٰ سَيِّدِنا مُحَمَّدٍ وَ عَلَىٰ آلِ مُحَمَّدٍ وَ سَلِّمْ».

٤. کاتێ ئیحرامی بەست، سوننەتە بڵێ: «اَللّٰهُمَّ إِنِّي أُرِيدُ الْحَجَّ فَيَسِّرْهُ لِي وَ أَعِنِّي عَلَىٰ أَدٰاءِ فَرْضِهِ وَ تَقَبَّلْهُ مِنِّي».

واتە: خوایە! ئەمن ئەمەوێ حەج بکەم، کە واتە داوات لێ دەکەم ئاسانی بکە بۆم و یارمەتیم بدە و لێمی وەربگرە.

٥. سوننەتە تا کاتێ وا لە ئیحرامدا بەردەوام «لَبَّيْكَ اللّٰهُمَّ لَبَّيْكَ...» بڵێ.[4]

## قۆناغی سێهەم: لە شێوازی چۆن چوونە نێو مەککە تا کاتی تەواف:

یەکەم: خۆشۆردن. ئەو خۆشۆردنانەی وا لە حەجدا سوننەتن نۆ دانەن:

١. غوسڵی ئیحرام؛

٢. کاتی چوونە نێو مەککە؛

٣. کاتی ئەووەڵین تەواف؛

٤. کاتی وەستان لە عەرەفەدا؛

٥. کاتی وەستان لە موزدەلیفەدا؛

---

١. بخاری: ١٧٠٧ ـ ٥٣٥٨، مسلم: ٢٠١٢، ترمذی: ٧٦٣، نسائی: ٢٦٢١، ابن‌ماجه: ٢٩٢٠، احمد: ٤٩١٩.

٢. بخاری: ١٤٤٨، مسلم: ٢٠٢٩، ابوداود: ١٥٤٧، ترمذی: ٧٥٥، نسائی: ٢٦٩٧، ابن‌ماجه: ٢٩٠٩، احمد: ٢٢٨٠.

٣. مسلم: ٢٠٢٩، ابوداود: ١٥٤٧، ترمذی: ٧٥٦، نسائی: ٢٧٠٠، ابن‌ماجه: ٢٩٠٩، احمد: ٤٢٢٥.

٤. حواشی شیروانی: ٦١/٤، حاشیة قلیوبی و عمیره: ٢٧/٦، مغنی المحتاج: ٤٧٢/٥، حاشیة البجیرمی علی الخطیب: ١١٦/٧.

٦، ٧، ٨. کاتی سێ شەیتان ڕەجمەکە؛

٩. کاتی ئاخرین تەواف (طواف‌الوداع).

دووهەم: سوننەتە کاتێ کە هێشتا لە دەرەوی مەککەدایە و دەیەوێ بچێتە نێو حەرەم بڵێ: «اَللّٰهُمَّ هٰذٰا حَرَمُكَ وَ أَمْنُكَ فَحَرِّم لَحْمِي وَ دَمِي وَ بَشَري عَلَى النّٰارِ وَ آمِنِّي مِنْ عَذٰابِكَ يَوْمَ تُبْعَثُ عِبٰادُكَ واجْعَلْني مِنْ أَوْلِيٰائِكَ وَ أَهْلِ طٰاعَتِكَ»[1].

واتە: خوایە! ئێرە هەرێمی تۆیە و تۆ بە ئەمنت داناوە، ئەدی خوایە گۆشت و پێست و خوێنم لە ئاگر حەرام کە، هەروەها لە ئەشکەنجە و عەزابی خۆت لەو ڕۆژەدا وا عەبدەکانت زیندوو دەکرێنەوە، پەنام بدەو بمخە ڕیزی دۆستان و گوێڕایەڵانی خۆتەوە، ئەی پەروەردگاری تەواوی عالەم!».

سێهەم: سوننەتە لەلای «أبطح»ەوە بڕواتە نێو مەککە کە جێگایێکی بەرزە ـ چونکە پێغەمبەرصَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لەو ڕێگەوە لای داوە بۆ مەککە ـ[2] هەروەها سوننەتە لەلای خوارەوە کە شوێنێکی نشێوە بڕواتە دەرەوە.

چوارەم: کاتێ دەڕواتە نێو مەککە و دەگاتە سەر «رِدْم»، لەو کاتەدا کە چاوی بەماڵی کەعبە دەکەوێ؛ سوننەتە بڵێ:

«لا إِلٰهَ إِلَّا اللهُ وَاللهُ أَكْبَرُ، اَللّٰهُمَّ أَنْتَ السَّلامُ وَ مِنْكَ السَّلامُ وَ دٰارُكَ دٰارُ السَّلامِ، تَبٰارَكْتَ يٰا ذَا الْجَلالِ وَ الْإِكْرٰامِ، اَللّٰهُمَّ إِنَّ هٰذٰا بَيْتُكَ عَظَّمْتَهُ وَ كَرَّمْتَهُ وَ شَرَّفْتَهُ اَللّٰهُمَّ فَزِدْهُ تَعْظِيماً وَ زِدْهُ تَشْرِيفاً وَ تَكْرِيماً»[3].

واتە: «هیچ خوایێ بە حەق نییە جگە لە تۆ نەبێ، تۆ لە هەموان گەورەتری، خوایە! تۆ خۆت سەرچاوەی ئارامش و ئاسایشی و ماڵەکەشت جێی ئۆقرە گرتنە. پاك و بەریت لە هەموو عەیبێ ئەی خاوەنی ڕێز و گەورەیی. خوایە! ئەمە ماڵی تۆیە، گەورە و ڕێزدار و پیرۆزت کردووە، ئەدی خوایە! پتر گەورە و پیرۆز و بەڕێزی بکە».

---

١. مغنی المحتاج: ٤٨١/٥، حاشية الجمل لزكريا الأنصاری: ١٢٥/٩، الفقه المنهجی: ٩٦/٢.

٢. مسلم: ٢٣٠٩، ترمذی: ٨٤٤، ابوداود: ١٥٩٢، احمد: ٢٣١٧٥.

٣. بیهقی فی السنن: ٧٣/٥، ابن‌ابی‌شیبة فی مصنفه: ٥٤١/٤ كلاهما بلفظ: «اللّٰهُمَّ أَنْتَ السَّلامُ وَ مِنْكَ السَّلامُ فَحَيِّنٰا رَبَّنٰا بِالسَّلامِ، اللّٰهُمَّ زِدْ هٰذٰا الْبَيْتَ تَشْرِيفاً وَ تَعْظِيماً وَ تَكْرِيماً وَ مَهٰابَةً وَ زِدْ مِنْ شَرَفِهِ وَ كَرَمِهِ وَ عِظَمِهِ مِمَّنْ حَجَّهُ أَوِ اعْتَمَرَهُ تَشْرِيفاً وَ تَكْرِيماً وَ تَعْظِيماً وَ بِرّاً».

پێنجەم: هەرکاتێ دەڕواتە نێو مزگەوتی حەرەم لە دەرگای «بَني شَيْبَه»وە بڕواتە ناوەوە و بڵێ: «بِسْمِ اللهِ و بِاللهِ وَ مِنَ اللهِ وَ إِلَى اللهِ وَ فِي سَبِيلِ الله وَ عَلَىٰ مِلَّةِ رَسُولِ اللهِ».

هەر کاتێکیش لە ماڵی خوا نزیك بووە و بڵێ: «اَلْحَمْدُ لِلّٰهِ وَ سَلامٌ عَلَىٰ عِبادِهِ الَّذِينَ اصْطَفَىٰ اَللّٰهُمَّ صَلِّ عَلَىٰ سَيِّدِنا مُحَمَّدٍ عَبْدِكَ وَ نَبِيِّكَ وَ عَلَىٰ إِبْراهِيمَ خَلِيلِكَ وَ عَلَىٰ جَمِيعِ أَنْبِيائِكَ وَ رُسُلِكَ».

پاشان دەستی بەرز بکاتەوە[1] بڵێ: «اَللّٰهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ فِي مَقامِي هٰذا فِي أَوَّلِ مَناسِكِي أَنْ تَقْبَلَ تَوْبَتِي وَ تَتَجاوَزَ عَنْ خَطِيئَتِي وَ تَضَعَ عَنِّي وِزْرِي، اَلحَمْدُ لِلّٰهِ بلَغَنِي بَيْتَهُ الْحَرامَ الَّذِي جَعَلَهُ مَثابَةً لِلنّاسِ وَ أَمْناً و جَعَلَهُ مُبارَكاً وَ هُدىً لِلْعالَمِينَ اَللّٰهُمَّ إِنِّي عَبْدُكَ والْبَلَدُ بَلَدُكَ وَالْحَرَمُ حَرَمُكَ وَالْبَيْتُ بَيْتُكَ، جِئْتُ أَطْلُبُ رَحْمَتَكَ، أَسْأَلُكَ مَسْأَلَةَ الْمُضْطَرِّ الْخائِفِ مِنْ عُقُوبَتِكَ الرّاجِي لِرَحْمَتِكَ الطّالِبِ لِمَرْضاتِكَ».

واتە: خوایە! هەر لەم ئەووەڵین جێگە عیبادەتەدا، داوات لێ دەکەم تۆبەم لێ وەرگری و لە هەڵەکانم ببووری و باری گوناحانم لە کۆڵ کەیتەوە. سپاس و ستایش بۆ ئەو خوایەی وا منی گەیاندە ئەم ماڵە پیرۆزەی خۆی کە پەناگ او پەسیوی خەڵکە و کردوویە بە شوێنێ پیرۆز و هۆی ڕێنوێنی تەواوی عالەم. خوایە! ئەمن بەندەی تۆم و ئەم شارە شاری تۆیە و ئەم هەرێمە هەرێمی تۆیە و ئەم ماڵە ماڵی تۆیە. ئەمن هاتووم داوای ڕەحمەت و بەرەکەتت لێ دەکەم، ئەپاڕێمەوە لێت وەکوو هەژارێك کە ترسی عەزابی لە دڵدایە و هیوای بە ڕەحم و بەزەیی تۆ هەیە و داوای ڕەزامەندیت دەکات».

شەشەم: پاش ئەمە بەرەو «حەجەرولئەسوەد» بڕوات و دەستی ڕاستی پێدا بهێنێ و ماچی بکات و بڵێ: «اَللّٰهُمَّ أَمانَتِي أَدَّيْتُها وَ مِيثاقِي تَعاهَدْتُهُ، اِشْهَدْ لي بِالْمُوافاةِ» واتە: «خوایا! ئەمانەتی خۆم بەجێ هێنا و بە بەڵێنی خۆم وەفام کرد، ئەتۆش شاهیدیم بۆ بدە کە هاتوومەتە ئێرە».

جا ئەگەر نەیتوانی ماچی بکا، ئەوە لە بەرانبەریەوە تێپەڕێ و ئەم دوعایەی سەرەوە بخوێنێ. پاشان بەهیچێکەوە خەریك نەبێ جگە «تەوافولقدووم»، مەگەر کاتی نوێژی فەرز بێت و خەڵك بە جەماعەت نوێژ بخوێنن، ئەوە لە گەڵیاندا نوێژ بخوێنێ و پاشان تەوافەکەی بکات.

---

١. ابوداود/١٥٩٦، احمد/١٠٥٢٦، ترمذی/٧٨٣.

## قۆناغی چوارەم: لەبارەی چۆنیەتی تەوافەوە:

کاتێ بیەوێ تەواف بکات ئەبێ شەش شت لەبەر چاو بگرێ:

یەکەم: پێویستە مەرجەکانی نوێژ (دەسنوێژ، داپۆشینی عەورەت...) لە تەوافدا بێتەجێ؛ چونکە تەواف هەر نوێژە بەس ئەوە نەبێ، دروستە قسەی تێدا بکرێ.[1] هەروەها پێویستە هەر لە سەرەتای تەوافەوە لەسەر شێوەی «اضطباع» تەواف بکات،[2] واتە: ناوەڕاستی پشتەماڵەکەی (کە تایبەتی ئیحرامە) بخاتە ژێر باڵی ڕاستی و ئەو دوو سەرەکەی‌تری بخاتە سەرشانی چەپی. ئیتر هەر لە سەرەتای تەوافەوە «لبیك اللّٰه...» نەڵێت و لەباتیی ئەو دوعایانەی کە کە باسیان ئەکەین بیانخوێنێ.

دووهەم: کاتێ پشتەماڵەکەی بەو شێوە لێ کرد کە وتمان، پاشان لای چەپی بکا لە کەعبە و لە ئاستی «حەجەرولئەسوەد»دا بەجۆرێ «حەجەرولئەسوەد» کەوێتە بەردەمیەوە، ڕابووەستێ.[3]

با بە ئەندازەی سێ هەنگاو لە بەینی ئەو و بەیتدا بمێنێ؛ چونکە هەتا نزیك بێ لە بەیتەوە باشترە. بەڵام ئاگادار بێت بەسەر «شازەروان»دا تەواف نەکات؛ چونکە «شازەروان» لەسەر ماڵی کەعبە حسێبە و لە حاندی «حەجەرولئەسوەد»دا لەگەڵ زەویدا یەکسانە، ئەبێ حاجی ئاگادار بێت بەسەریدا نەڕوات؛ چونکە وەکوو ئەوە وایە لەنێو بەیت تەواف بکات و تەوافەکەی دروست نییە. جا هەر لەم شوێنەوە کە باسمان کرد، دەست بکا بە تەواف کردن.[4]

سێهەم: سوننەتە پێش ئەوەی لە «حەجەرولئەسوەد» تێپەڕێ، بەڵکوو هەر لە سەرەتای تەوافەوە بڵێ: «بِسْمِ اللهِ وَ بِاللهِ وَاللهُ أَكْبَرُ،[5] اَللّٰهُمَّ! إِيْماناً بِكَ وَ تَصْدِيقاً بِكِتابِكَ وَ وَفاءً

---

١. بخاری: ١٥١٥، نسائی: ٢٨٧٤، احمد: ١٤٨٧٦، بلفظ: «أَقِلُّوا الْكَلامَ فِي الطَّوافِ فَإِنَّما أَنْتُمْ فِي الصَّلاةِ» و فی روایة: «إِنَّمَا الطَّوافُ صَلاةٌ فَإِذا طُفْتُمْ فَأَقِلُّوا الْكَلامَ» ترمذی: ٨٨٣، حاکم فی المستدرك: ١٦٤٠، صحیح ابن‌خزیمه: ٢٥٣٢، مسند ابی‌یعلی الموصلی: ٢٥٤٤ بلفظ: «الطَّوافُ حَوْلَ الْبَيْتِ مِثْلُ الصَّلاةِ إِلّا أَنَّكُمْ تَتَكَلَّمُونَ فِيهِ، فَمَنْ تَكَلَّمَ فِيهِ فَلا يَتَكَلَّمَ إِلّا بِخَيْرٍ».

٢. ابوداود: ١٦٠٧، ترمذی: ٧٨٧، ابن‌ماجه: ٢٩٤٥، احمد: ١٧٢٧٦.

٣. مسلم: ٢١٣٩ ـ ٢٢١٣، الموطأ لمالك: ٧١٤، ابوداود: ١٦١٣، روضة الطالبين: ٣١٣/١، شرح الوجيز للرافعی: ٢٩٢/٧.

٤. مختصر المزنی: ٦٧/١، الأم للشافعی: ١٩٣/٢، شرح الوجيز للرافعی: ٢٩٤/٧، المجموع للنووی: ٢٢/٨.

٥. احمد: ٤٤٠٠.

بِعَهْدِكَ وَ إِتِّبٰاعاً لِسُنَّةِ نَبِيِّكَ مُحَمَّدٍ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ».[1]

واتە: «بەناوی ئەڵڵاھ و لەسەر ناوی ئەڵڵاھ، ئەڵڵاھ لە هەموان مەزنترە. خوایە! بڕوامان بە تۆ هێناوەو شایەتی لەسەر ڕاستی ئەم قورئانە ئەدەین و وەفامان بەو بەڵێنەی تۆ کردووە و شوێنی ڕێبازی پێغەمبەری تۆ موحەممەد، کەوتووین».

جا لەدوای ئەوەی لە حەجەرلئەسوەد تێپەڕی و گەیشتە ئاستی دەرگای بەیت بڵێ: «اَللّٰهُمَّ هٰذَا الْبَيْتُ بَيْتُكَ...» هەر بەو شێوە کە گوتمان.

**چوارەم:** سوننەتە لە سێ دەوری ئەووەڵدا بە شێوەی گورگەلۆقە واتە: هەنگاوەکانی توند و نزیك لەیەك هەڵبێنێتەوە، بەڵام لە چوار دەوری ئاخردا بەکاوەخۆ و ئاسایی تەواف بکات. ماچکردن و ئیشارەتکردن بۆ حەجەرولئەسوەد و ڕوکنی یەمانی لە هەر حەوت دەورەکەدا سوننەتە.[2]

**پێنجەم:** هەرکاتێ حەوت دەورەکەی تەواو کرد، بڕواتە «مولتەزەم» واتە: نێوان حەجەر و دەرگای بەیت، ئەم شوێنە جێی گیرابوونی دوعایە. جا خۆی بلکێنێ بە بەیتەوە و دەست بگرێ بە پەردەی کەعبەوە و گۆنای ڕاستی بلکێنێ پێیەوە و لەپی دەست و هەر دوو باسکی بەسەر دیواری کەعبەدا بڵاو بکاتەوە و[3] بڵێ: «يٰا رَبَّ الْبَيْتِ الْعَتِيقِ أَعْتِقْ رَقَبَتِي مِنَ النّٰارِ، وَ أَعِذْنِي مِنَ الشَّيْطٰانِ الرَّجِيمِ، وَ أَعِذْنِي مِنْ كُلِّ سُوءٍ، وَقَنِّعْنِي بِمٰا رَزَقْتَنِي، وَ بٰارِكْ لِي فِيمٰا آتَيْتَنِي».

واتە: «ئەی پەروەردگاری ئەم خانووە ئازادە! گەردنی من لە ئاوری جەهەننەم ئازاد بکەو لە دەستی شەیتانی ڕەجمکراو و لە هەموو خراپەیێك پەنام بدە و بەو بژیو و ڕزقەی وا ئەیدەی پێم قانعم بکە و هەرچیم پێ ئەدەی پیرۆز و موبارەکی بکە.

پاشان بڵێ: «اللّٰهُمَّ إِنَّ الْبَيْتَ بَيْتُكَ وَالْعَبْدَ عَبْدُكَ وَ هٰذٰا مَقٰامُ الْعٰائِذِ بِكَ مِنَ النّٰارِ، اَللّٰهُمَّ اجْعَلْنِي مِنْ أَكْرَمِ وَفْدِكَ عَلَيْكَ».

---

١. مصنف عبدالرّزّاق: ٨٨٩٤ ـ ٨٨٩٧ ـ ٨٨٩٩، معرفة السنن والآثار للبیهقی: ٣٠٢٦، طبرانی: ٦٥٣، اخبار مکه للأزرقی: ٤٥٨.

٢. بخاری: ١٥٧٨، مسلم: ٢٢١٧، ابوداود: ١٦١٣، نسائی: ٢٨٩٦، ابن‌ماجه: ٢٩٤١، الموطأ لمالك: ٧١٤، احمد: ٢١١٠.

٣. ابوداود: ١٦٢٢ ـ ١٦٢٣، ابن‌ماجه: ٢٩٥٣، نسائی: ٢٨٦٥ ـ ٢٨٦٦.

واتە: «خوایا ئەم ماڵە ماڵی تۆیە و ئەم عەبدە عەبدی تۆیە و ئەمە شوێنی کەسێکە کە پەنا بە تۆ دێنێ لە ئاوری جەهەننەم، خوایە! بمخە ڕیزی باشترینی ئەوانەی وا هاتوون بۆ لات».

لەم شوێنەدا با حاجی زۆر سەناو ستایشی خوا بکات و سەڵەوات لە سەر حەزرەتی موحەممەدﷺ و باقی پێغەمبەرەکان بدات.

شەشەم: هەرکاتێ لەم دوعا و پاڕانەیەوە بووەوە سوننەتە لە پشت مەقامی ئیبراهیمەوە دوو ڕەکعەت نوێژ بخوێنێ،[1] جا لە ڕەکعەتی ئەووەڵدا سوورەتی «الکافرون» بخوێنێ و لە ڕەکعەتی دووهەمدا سوورەتی «الإخلاص» بخوێنێ.[2] ئەم دوو ڕەکعەتە پێی دەڵێن دوو ڕەکعەتی تەواف. «زەهری» فەرموویەتی: سوننەت وەهایە بۆ هەر حەوت دەورەی تەواف، دوو ڕەکعەت نوێژ بخوێنرێ.

## قۆناغی پێنجەم: «سَعْي»: هاتوچۆی نێوان سەفا و مەروە.[3]

هەرکاتێ دەستی لە تەواف کێشا، ئەوە با لە دەرگایێك کە بەرەو «سەفا» دەکرێتەوە بێتە دەر، هەرکاتێ گەیشتە پای کێوی «سەفا»، سوننەتە بە ئەندازەی باڵا پیاوێ لە پای کێوەکەوە بەرز بێتەوە، هەروەکوو چۆن پێغەمبەر بە سەفادا بەرز دەبووەوە تا کەعبەی لێ دەرئەکەوت.[4]

هاتوچووەکە (سعی) هەر لە کێوی سەفاوە دەست پێ دەکات؛[5] بەڵام ئەو پلەگەلە کە تازە دروستیان کردووە، نابێ حاجی بیانخاتە پشت سەری خۆیەوە، دەنا سەعیەکەی تەواو نابێ. هەر لەو شوێنەوە وا دەستی پێ کردووە، حەوت جار هاتوچۆی بەین «سەفا» و «مەروە» بکات. هەرکاتێ گەیشتە «مەروە» پیایدا بەرز بێتەوە و ڕوو لە «سەفا» بکات. بەم شێوە یەك جار لەو حەوت جارەی تەواو کردووە. جا هەرکاتێ بگەڕێتەوە بۆ «سەفا» دوو جار لەو حەوت جارە تەواو دەکات. بەم شێوە درێژەی پێ بدا تا حەوت جارەکە تەواو دەبێ.

۱. ﴿وَاتَّخِذُوا مِنْ مَقَامِ إِبْرَاهِيمَ مُصَلًّى﴾ البقرة: ۱۲۵، بخاری: ۱۵۷۸، مسلم: ۲۱۵۹، ابوداود: ۱۵٤۰، نسائی: ۲٦۸۲ ـ ۲۹۱۲، ابن‌ماجه: ۲۹۵۰، احمد: ٤۹۸۷.

۲. مسلم: ۲۱۳۷، ابوداود: ۱٦۲۸، نسائی: ۷۸٤، احمد: ۱۳۹۱۸.

۳. ﴿إِنَّ الصَّفَا وَالْمَرْوَةَ مِنْ شَعَائِرِ اللهِ فَمَنْ حَجَّ الْبَيْتَ أَوِ اعْتَمَرَ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِ أَنْ يَطَّوَّفَ بِهِمَا﴾ البقرة: ۱۵۸.

٤. شرح الوجيز للرافعي: ۳٤۲/۷ ـ ۳٤۳، روضة الطالبين للنووی: ۳۱٦/۱.

٥. مسلم: ۲۱۳۷، ترمذی: ۷۹۰، نسائی: ۲۹۱۲، ابوداود: ۱٦۲۸، ابن‌ماجه: ۳۰٦٥، الموطأ لمالك: ۷۳۰.

هەرکاتێ ئەم کردەوانەی بە ئەنجام گەیاندن، ئەوە «تەوافولقودووم» و «سەعیی» تەواو کردووە؛ کە هەردوکیان سوننەتن.

تەهارەت ـ واتە: خاوێن بوون لە بێدەسنوێژی و لەشپیسی ـ لە هاتوچۆی نێوان سەفاو مەروەدا سوننەتە،[1] بەڵام لە تەوافدا واجبە. [پێویستە ئەوە بڵێین:] هەرکاتێ پاش «طواف القدوم» سەعی بەین «سەفاو» و «مەروەی» ئەنجام دا، پێویست ناکا دیسانەوە پاش عەرەفە، سەعی بکاتەوە و هەر ئەمە جێی ڕوکنێکی بۆ دەگرێتەوە؛ چونکە مەرج نییە، سەعی پاش عەرەفە بکرێ، بەڵکوو «طواف الإفاضة» پێویستە پاش عەرەفە بکرێ. بەڵام بۆ سەعی مەرجە کە پاش تەواف بکرێ، ئیتر جیاوازی نییە پاش کام تەواف بێت، چ«طواف القدوم» چ «طواف الإفاضة».

## قۆناغی شەشەم: وەستان لە عەرەفە و ئەو ئیشانەی پێش عەرەفە ئەنجام دەدرێت

هەروەختێ حاجی لە ڕۆژی عەرەفەدا گەیشتە عەرەفات ئەوە نابێ لەو ڕۆژەدا بڕواتە نێو مەککە و تەوافولقدووم بکات. بەڵام ئەگەر چەند ڕۆژ پێش ڕۆژی عەرەفە گەیشتە مەککە، تەوافولقدووم بکات و هەر بە ئیحرامەوە ڕابوەستێ تا ڕۆژی حەوتەمی «زیلحەججە». لە دوانیوەڕۆی ئەو ڕۆژەدا، ئیمام خەڵك لە پەنای کەعبە کۆ دەکاتەوە و خوتبەیێك دەخوێنێ و بە خەڵك ڕادەگەینێ کە خۆیان ئامادە بکەن بۆ ئەوەی ڕۆژی «تەرویە» واتە: ڕۆژی هەشتەم بچن بۆ «مینا» و شەو تا بەیان لەوێ بمێننەوە و پاشان بچن بەرەو عەرەفات تا لەوێ بمێننەوە و فەرزی وەستان لە عەرەفاتدا، ئەنجام بدەن. کاتی وەستانەکەش لە نیوەڕۆی ڕۆژی نۆهەمەوەیە تا سپێدەی ڕۆژی جێژن،[2] کەوابوو پێویستە بەدەم وتنی «لَبیكَ اللّٰهُمَّ...»وە بەرەو «مینا» بکەوێتەڕێ.

سوننەتە ـ ئەگەر بتوانێ ـ هەر لە مەککەوە تا دوایی هاتنی حەج بە پێ بڕوات. خێری بە پیادەڕۆیشتن لە مزگەوتی حەزرەتی ئیبراهیمەوە تا عەرەفات زۆرترە لەوەی بە سواری بڕۆی. سوننەتە کاتێ گەیشتە مینا بڵێ: «اَللّٰهُمَّ إِنَّ هٰذِهِ مِنیٰ فَامْنُنْ عَلَيَّ بِمٰا مَنَنْتَ عَلَیٰ أَوْلِیٰائِكَ وَ أَهْلِ طٰاعَتِكَ».

١. شرح الوجیز للرافعی: ٣٤٥/٧، أسنی المطالب لأبی‌یحی زکریا الأنصاری: ١٩١/٦.

٢. المجموع للنووی: ١٠١/٨ ـ ١٢٠، أسنی المطالب لأبی‌یحی زکریا الأنصاری: ٢٠٨/٦، مغنی المحتاج: ٤٠/٦.

واتە: «خوایا ئەم شوێنە مینایە، ئەتۆش وەسەرمان مننەت بنێ و پێمان ببەخشە لەوەی وا بە دۆستانی خۆت و ئەهلی عیبادەتت بەخشیوە».

پێویستە ئەو شەوە لە «مینا» بمێنیتەوە، ئیدی لەو شەوەدا جگە لە مانەوەکە شتێکی‌تر نییە ئەنجامی بدات، کاتی بەیان پاش ئەوەی نوێژی بەیانی خوێند چاوەڕوان بێت تا خۆر لە سەر کەلی «ثبیر»ەوە هەڵدێت، جا بەرەو عەرەفات ڕێ کەوێ و ئەم دوعایە بخوێنێ: «اَللّٰهُمَّ اجْعَلْهٰا خَيْرَ غُدْوَةٍ غَدَوْتُهٰا وَ أَقْرَبَهٰا مِنْ رِضْوٰانِكَ وَ أَبْعَدَهٰا مِنْ سَخَطِكَ، اَللّٰهُمَّ إِلَيْكَ غَدَوْتُ وَ إِيّٰاكَ اعْتَمَدْتُ وَ وَجْهَكَ أَرَدْتُ واجْعَلْنِي مِمَّنْ تُبٰاهِي بِهِ الْيَوْمَ مِمَّنْ هُوَ خَيْرٌ مِنّي وَ أَفْضَلُ».

واتە: «خوایا! ئەم بەرەبەیانە بکە بە باشترین بەرەبەیانێ بۆم کە ڕۆژم تێدا کردبێتەوە، هەروەها بیکە بە نزیکترین ڕۆژ بە ڕەزایەت و لێبوردنت و بە دوورترین ڕۆژ لە تووڕەییت، خوایە! بۆ لای تۆ ڕۆژم کردۆتەوە و پشتم بە تۆ بەستووە و بەس دیداری تۆم ویستووە. خوایە! بمخە ڕیزی ئەوانەی وا لەو ڕۆژەدا پێیان ئەنازی، ئەوانەی وا لە من چاکتر و گەورەترن».

هەرکاتێ گەیشتە نزیکی عەرەفات با چادرەکەی لە «نمرة» لە نزیکی مزگەوتەوە، هەڵبدا؛ چونکە پێغەمبەرﷺ لەوێدا چادرەکەی هەڵداوە «نەمیرە» شوێنێکە وا لە دەشتی «عرفە»دا، پێش ئەوەی بگاتە شوێنی وەستان لە عەرەفات. سوننەتە بە بۆنەی وەستان لە عەرەفاتدا، غوسڵ بکات.

جا هەرکاتێ خۆر لە نیوەڕاستی ئاسمان لای دا، پێویستە ئیمام خوتبەیێکی کورت بخوێنێ و دابنیشێ، ئەنجا بانگوێژ دەست بکات بە بانگدان و هاوکات ئیمام خوتبەی دووهەم بخوێنێ. بانگوێژ دەست‌بەجێ پاش بانگەکەی، قامەتیش بخوێنێ و ئیمام وێڕای تەواوبوونی قامەتەکە خوتبەکەی دوایی بهێنێ. پاشان نوێژی نیوەڕۆ و عەسر پێکەوە کۆ بکاتەوە و بە کورت‌کراوی بیانخوێنێ، بۆ هەردوکیان بانگێ بدرێ، بەڵام دوو قامەت بوترێ، پاشان ڕێ‌کەون بۆ شوێنی وەستان لە عەرفاتدا، بەڵام ئەبێ ئاگادار بێت لە شیوی «عرنة»دا نەوەستێ. مزگەوتی حەزرەتی ئیبراهیمیش، بەشی هەووەڵی لە شیوی «عورنە»دایە، بەڵام لای خوارووی لەناو خاکی عەرەفەدایە؛ کە وابوو هەرکەس لەلای سەرووەوە ڕاببووەستێ، بە عەرەفە بۆی حەسێب ناکرێ. خاکی عەرەفەش لەناو مزگەوتەکەدا بە بەردی زەلام دیاری کراوە و باشتر وایە حاجی لە پەنای ئەو بەردانە، لە نزیک ئیمامەوە، ڕوو بە قیبلە دابنیشێ، تا بۆی دەکرێ تەسبیحات

و ویرد و تەهلیلە و سەنا و ستایشی خوا بکات و دوعا و پاڕانەوە و تۆبەش بکات. نابێ لەم ڕۆژەدا ڕۆژوو بگرێ تا بتوانێ دوعا و ویرد بخوێنێ.

پێویستە لە خاکی عەرەفە نەڕواتە دەر تا پاش خۆرئاوا بوون، تا هەم شەو هەم ڕۆژ لە عەرەفەدا بووبێ. ئەگەر لەوانە بوو کە لە دیتنی مانگدا. هەڵە ڕووی دابێت، کاری عاقڵانە ئەوەیە لانی کەم سەعاتێ لە ئێوارەی ڕۆژی هەشتەم لە خاکی عەرەفاتدا ڕابووەستێ. هەرکەسێ عەرەفەی لەدەست دەربچێ، ئەوە حەجی لەدەس دەرچووە و پێویستە ئیحرام بە عەمرە بشکێنێ و کردەوەکانی عەمرە ئەنجام بدات. پێویستە ئەو کەسەی عەرەفەی لەدەس دەرچووە، حەیوانێ سەرببڕێ، پاشان [لە ساڵێکی‌تردا] حەج قەزا بکاتەوە.

گرینگترین کار لەم ڕۆژەدا، دوعا و پاڕانەوە لە خوایە؛ چونکە هومێدی ئەوە زۆرە لەم ڕۆژەدا و لەم شوێنەدا، دوعا قەبووڵ بکرێ. گەورەترین دوعای کە لە پێغەمبەرەوە نەقڵ کراوە بۆ ڕۆژی عەرەفە، ئەوەیە بڵێ: «لا إِلَهَ إِلَّا اللّٰهُ وَحْدَهُ لا شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَ لَهُ الْحَمْدُ، يُحْيِي وَ يُمِيتُ وَ هُوَ حَيٌّ لا يَمُوتُ، بِيَدِهِ الْخَيْرُ وَ هُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ، اَللّٰهُمَّ اجْعَلْ فِي قَلْبِي نُوراً، وَ فِي سَمْعِي نُوراً وَ فِي بَصَرِي نُوراً، اَللّٰهُمَّ اشْرَحْ لِي صَدْرِي وَ يَسِّرْ لِي أَمْرِي»[1]

واتە: «هیچ خوایێ بە حەق نییە جگە ئەڵڵاه نەبێ، ئەو تەنیا و بێ‌هاوتایە، تەنها ئەو خاوەن موڵکە و هەموو سەنا و ستایشێ تایبەتی ئەوە، چونکە هەر ئەوە زیندوو دەکاتەوە و دەمرێنێ، خۆیشی هەمیشە زیندووە و قەت نامرێ، هەموو کاری چاك [و خراپ] لە دەستی ئەودایە و بەسەر هەموو شتێکدا زاڵە. خوایە! دڵ و چاو و گوێم لە نووری خۆت پڕکە. خوایە! دڵم ئاوەڵا کە و کارەکانم بۆ ئاسان بکە».

## قۆناغی حەوتەم: پاشماوەی ڕێ و ڕەسمی حەج دوای عەرەفە:

حاجی پاش وەستان لە عەرەفاتدا، بڕوات بۆ «موزدەلیفە» و نوێژی مەغریب و عیشا پێکەوە کۆ بکاتەوە و لە کاتی نوێژی عیشادا بە کورت‌کراوی بیانخوێنێ. بۆ هەردووکیشیان بانگێك و دوو قامەت بوترێ. نابێ لەنێوانیاندا نوێژی سوننەت بخوێنێ، بەڵکوو نوێژی سوننەتی مەغریب و عیشا و سوننەتی وەتر پێکەوە، لەپاش دوو نوێژە فەرزەکە بخوێنێ و لە پێشدا سوننەتەکانی مەغریب دەس پێ بکات.[2]

١. ترمذی: ٣٥٠٩، ابن‌ابی‌شیبة فی مصنفه: ٤٧٣/٤، بیهقی فی السنن الکبری و فی شعب الإیمان: ٣٧٧٨.

٢. مسلم: ٢٢٥٦، ابوداود: ١٦٤٩ ـ ١٦٢٨، نسائی: ٦٥٠، ابن‌ماجه: ٣٠٦٥، ترمذی: ٨١٣.

هەرکەسێ لە نیوەی ئەووەڵی شەودا لەوێ بڕواتە دەرەوە و شەو لەوێ دانەنیشێ، ئەوە واجبە حەیوانێ سەرببڕێ. شەوبێداری لەم شەوەدا یەکێکە لە کردەوە گەورەکان کە مرۆڤ بە خواوە نزیـك دەکاتەوە.

پاشان لە نیوەشەو بەولاوە وردە وردە حاجییەکان دەست بکەن بە ئامادەبوون بۆ ڕۆیشتن. جا لەبەر ئەوەی بەردی موزدەلیفە سووکن؛ باش وایە حەفتادانە وردە بەرد هەڵبگرێت، با بەشی بکات. هیچ قەیدی نییە بەردەکانی ورد بن. پاشان لە کاتی نوێژی بەیانیدا خۆی بشۆرێ و نوێژ بکات و ڕێ‌کەوێ تا دەگاتە «مشعرالحرام» کە دەبێتە ئاخری موزدەلیفە. لەوێدا ڕابووەستێ تا بوومەلێڵی بەیان. لەم کاتەدا ئەم دوعایە بخوێنێ: «اَللّٰهُمَّ بِحَقِّ الْمَشْعَرِ الْحَرٰامِ وَالشَّهْرِ الْحَرٰامِ وَالرُّكْنِ وَ الْمَقٰامِ بَلِّغْ رُوحَ سَيِّدِنٰا مُحَمَّدٍ مِنّٰا التَّحِيَّةَ وَ السَّلامَ وَ أَدْخِلْنٰا دارَ السَّلامِ يٰا ذَاالْجَلالِ وَ الْإِكْرٰامِ».

واتە: «خوایا! لەبەر خاتری «مەشعەرولحەرام» و مانگی حەرام و لەبەر خاتری ئەم جێگە و شوێنە پیرۆزە، سڵاو و دروودی ئێمە بگەیێنە بە گیانی گەورە و سەردارمان حەزرەتی موحەممەدﷺ، هەروەها بەهەشت بکە بە نەسیبمان، ئەی خاوەن شکۆ و ڕێز و گەورەیی».

پاشان، پێش خۆرکەوتن لەوێ بڕوات تا دەگاتە ئەو شوێنەی کە پێی دەڵێن: «وادي مُحَسِّر»، سوننە لەوێدا تا لەو شیوە دەر ئەچێ وڵاخەکەی [یان ماشێنەکەی] توند لێ بخوڕێ، ئەگەریش بە پێی دەچوو، سوننە پێ هەڵگرێ.[1]

جا لە بەیانی ڕۆژی جێژندا سوننەتە لەگەڵ وتنی «لبيكَ اللّٰهُمَّ...»، ئەڵڵاهو ئەکبەر بکات، تا دەگاتە مینا[2] و شوێنی ڕەجمی شەیتان. شوێنی ڕەجمی شەیتان سێ جێگەیە، کە نابێ ئیشی بە یەکەم و دووهەمیانەوە هەبێ و دەڕوات تا دەگاتە شەیتانی گەورە (جَمرة العقبة)، شوێنی ئەم شەیتانەش لە جادەکەدا دەکەوێتە لای ڕاستی قیبلەوە.

ئەو شوێنەی کە شەیتانی گەورەی لێوە ڕەجم دەکات ئەبێ تۆزێ لە کێوەکەوە بەرز بێتەوە، پاشان دوای ئەوەی خۆر بە ئەندازەی ڕمێك بەرز بێتەوە و پێش ئەوەی دەست بکا بە

١. ترمذی: ٨١١، ابن‌خزمیه فی صحیحه: ٢٦٤٤ ـ ٢٦٤٥، جامع الأصول لابن‌اثیر: ١٧٩٨.

٢. بخاری: ١٥٤٩، مسلم: ٢٢٥٤، نسائی: ٢٩٤٩، ابن‌ماجه: ٢٩٩٩.

سەربڕینی قوربانی. شەیتانی گەورە ڕەجم بکات ئەگەریش لە کاتی ڕەجمی شەیتاندا ڕووی لە قیبلە بوو هیچ قەیدی نییە.[1] جا حەوت بەرد بەرەو شەیتانی گەورە فڕێ بدات و لەگەڵیدا دەست بەرز بکاتەوە[2] و ئەڵڵاهو ئەکبەر بکات[3] و هەر جار بڵێ: «اَللّٰهُمَّ تَصْدِيقاً بِكِتَابِكَ وَ اِتِّباعاً لِسُنَّةِ نَبِيِّكَ» واتە: «خوایا! (ئەم شەیتانە بەردباران دەکەم) لەبەر بڕوا بە کتێبەکەت و شوێنکەوتنی ڕێبازی پێغەمبەرەکەتە».

پاش شەیتان ڕەجم ئیتر دروست نییە لەبەیك و ئەڵڵاهو ئەکبەر بکات[4] مەگەر پاش نوێژە فەرزەکان لە نیوەڕۆی ڕۆژی جێژنەوە تا عەسری ئاخرین ڕۆژی «أيامالتشريق».[5]

پاش ڕەجمی شەیتان قوربانییەکەی سەر ببڕێ، ئەگەر قوربانیەکەی لەگەڵدا بوو. باشتر وایە خۆی حەیوانەکەی سەر ببڕێ و بڵێ: «بِسْمِ اللّٰهِ وَاللّٰهُ أَكْبَرُ، اَللّٰهُمَّ مِنْكَ و بِكَ و لَكَ[6] تَقَبَّلْ مِنّي كَمٰا تَقَبَّلْتَ مِنْ خَلِيلِكَ إِبْرٰاهِيمَ».[7]

واتە: «بەنێوی خوا، خوا لە هەموان گەورەترە. خوایە! ئەمە لەلایەن تۆوەیە و بەهۆی تۆوەوە دەستی من کەوتووە و بۆ تۆیە بە تایبەتی. داوا ئەکەم لێموەرگری وەکوو: چۆن لە خۆشەویستی خۆت حەزرەتی ئیبراهیمتعَلَيْهِالسَّلَامُ قەبوول کرد».

قوربانی بەم شێوە باشترە: لە پێشدا بە وشتر، پاشان بە مانگا، پاشان بە مەڕ، قوربانی ئەگەر بە مەڕێك بکرێ بۆ یەك نەفەر باشترە لەوەی بە وشترێك بکرێ و بۆ حەوت نەفەر.

پێغەمبەرصَلَّىاللَّهُعَلَيْهِوَسَلَّمَ فەرموویەتی: «خَيْرُ الْأُضْحِيَةِ الْكَبْشُ الْأَقْرَنُ»[8] واتە: «باشترین ئاژەڵ بۆ قوربانی، مەڕی شاخدارە».

١. ترمذی: ٨٢٥، احمد: ٣٨٨٠، ابنماجه: ٣٠٢١.

٢. بخاری: ١٦٣٣، مصنف ابنابیشيبة: ٣٥٦/٤، الجمع بين الصحيحين البخاری و مسلم: ١٤١٦.

٣. بخاری: ١٦٣٢، مسلم: ٢١٣٧، ابوداود: ١٦٢٨، ترمذی: ٨٢٥، نسائی: ٣٠٣٣، ابنماجه: ٣٠٢١ ـ ٣٠٦٥، احمد: ٣٨٨٠.

٤. بخاری: ١٥٧٤، مسلم: ٢٢٤٨، ترمذی: ٨٤١، نسائی: ٣٠٣٠، ابنماجه: ٣٠٣١، ابوداود: ١٥٤٩، احمد: ١٧٢٨.

٥. حاكم فی المستدرك: ١٠٦٢ ـ ١٠٦١، طبرانی فی الكبير: ٩٤٢٢، ابنابیشيبة فی مصنفه: ٧٢/٢، معرفة السّنن والآثار للبيهقی: ١٩٩٦ ـ ١٩٩٩، الأم للشافعی: ١٩٧/٧، المجموع للنووی: ٤٠/٥، الحاوی الكبير للماوردی: ١١٣٢/٢.

٦. ابوداود: ٢٤١٣، معرفة السنن والآثار للبيهقی: ٥٨٧٥، جامع الأصول لإبنالأثير: ١٦٧١، المستدرك للحاكم: ١٦٦٩.

٧. روضة الطّالبين للنووی: ٣٥٤/١، الحاوی الكبير للماوردی: ٢٢٠/١٥، المجموع للنووی: ٤١٠/٨، أسنی المطالب لأبیيحی زكريا الأنصاری: ٤٩٨/٦.

٨. ابوداود: ٢٧٤٤، ترمذی: ١٤٣٧، بزار فی مسنده: ٢٧١١، طبرانی فی مسند الشّاميين: ٢٢٠٢، بيهقی فی سنن الكبری: ٤٠٣/٣.

حەیوانی قوربانی سپی بێ باشترە لەوەی زەرد یان ڕەش بێت. خاوەنی قوربانی ئەتوانێ لە گۆشتەکەی بخوات ئەگەر قوربانییەکە سوننەت بێت [بەڵام ئەگەر قوربانی فەرز بێت نابێ لێ بخوات مەگەر پارووێك یان دوان.] نابێ ئاژەڵی قوربانی لووت و گوێ بڕاو، یان شاخ و دەست و پێ شکاو و گوێ کەل یان گوێی لە لایێکەوە چ لە خوار، چ لە ژوور کون کرابێت.[1]

حاجی ئەبێ پاش ڕەجمی شەیتان و قوربانی، حەڵق بکات[2] واتە: مووی سەری کورت بکاتەوە یان بیتاشێ.[3] سووننەتە بەم شێوە حەڵق بکات: ڕوو بکا لە قیبلە و لەپێشی سەریەوە دەست پێ بکات، جا لای ڕاستی سەری تا دوو پێشەی پشت سەری، جا پاشماوەی سەری حەڵق بکات.[4] بە دەمیشیەوە ئەم دوعایە بڵێ: «اَللّٰهُمَّ اثْبِتْ لِي بِكُلِّ شَعْرَةٍ حَسَنَةً وَامْحِ عَنِّي بِهٰا سَيِّئَةً وَارْفَعْ لِي بِمٰا عِنْدَكَ دَرَجَةً»[5].

واتە: «خوایا! لە باتی هەر موویێك، چاکەیێکم بۆ دابنێ و گوناحێکم لێ بشۆرەوە و پلەیێك لەلای خۆت بەرزم بکەرەوە».

ژنان تەنها موو کورت بکەنەوە.[6] کەسێ سەری مووی پێوەنەبێت (تاس بێت)، سووننەتە تێخ بهێنێ بە سەریدا.

جا حاجی هەرکاتێ، پاش ڕەجمی شەیتان حەڵقی کرد، ئەوە دروستە ئیحرام شکێنی ئەووەڵ ئەنجام بدات، کە بریتییە لە ئازادبوون لە تەواوی ئەوانەی لێی حەرام کرا بوون، جگە لە ڕاو و نزیکی ژنەکەی نەبێ.

پاش حەڵق حاجی بەرەو مەککە ڕێ دەکەوێ و بەو شێوە کە باسمان کرد، تەواف بکات. ئەم تەوافە «تەوافی ڕوکن»ە و پێ دەڵێن: «طواف الزیارة». کاتی ئەم تەوافەش لە نیوەی شەوی جێژنەوە دەست پێ دەکات، وە باشترین کاتیشی ڕۆژی جێژنە، بۆ ئاخرەکەی وەختێك

---

١. ابوداود: ٢٤٢٢، ترمذی: ١٤١٨، نسائی: ٤٢٩٨ ـ ٤٢٩٦ ـ ٤٢٩٩ ـ ٤٣٠٠ ـ ٤٣٠١، احمد: ٨٠٩ ـ ١٢١٠.

٢. ﴿مُحَلِّقِينَ رُءُوسَكُمْ وَ مُقَصِّرِينَ﴾ الفتح: ٢٧.

٣. مسلم: ٢٢٩٢ ـ ٢٢٩٧.

٤. ابوداود: ١٦٩١.

٥. «قٰالُوا: مٰا هٰذِهِ الْأَضٰاحِي؟ قٰالَ: سُنَّةُ أَبِيكُمْ إِبْرٰاهِيمَ، قٰالُوا: مٰا لَنٰا مِنْهٰا؟ قٰال: بِكُلِّ شَعَرَةٍ حَسَنَةٌ، قٰالُوا: فَالصُّوفُ؟ قٰالَ: بِكُلِّ شَعْرَةٍ مِنَ الصُّوفِ حَسَنَةٌ» احمد فی مسنده/١٨٤٨٠، ترمذی/١٤١٣، ابن‌ماجه: ٣١١٨، طبرانی فی الکبیر: ٤٩٣٥.

٦. ابوداود: ١٦٩٤، ابن‌ابی‌شیبة فی مصنفه: ٢٢١/٤، طبرانی فی الکبیر: ١٢٨٤٣، دارمی سننه: ١٩٥٧، دارقطنی: ٢٦٩٧.

دیاری نەکراوە و ئەتوانێ دوای بخات، بەڵام تا تەواف نەکات دروست نییە نزیکی لەگەڵ ژنەکەیدا بکات. هەرکاتێ ئەم تەوافەی کرد، ئەوە هەموو شتێ لەسەر حەڵاڵ ئەبێ و هیچ کارێك لەرێ و ڕەسمی حەج نامێنێ ئەنجامی بدات جگە شەیتان ڕەجمەکانی ڕۆژەکانی پاش جێژن و مانەوە لە مینادا نەبێ؛ کە ئەمانە لە واجباتی حەجن کە پاش لە بەر داکەندنی ئیحرام ئەنجام ئەدرێن.

به سێ شت ئیحرام ئەشکێ:[1]

١. شەیتان‌ڕەجم؛

٢. حەلق؛

٣. تەوافی فەرز «طواف‌الركن».

لە حەجدا ئیمام چوار خوتبە دەخوێنێ:[2]

١. خوتبەی ڕۆژی حەوتەم؛

٢. خوتبەی ڕۆژی عەرەفە؛

٣. خوتبەی ڕۆژی جێژن؛

٤. خوتبەی ڕۆژی گەڕانەوە بۆ مینا.

ئەم خوتبانە هەموویان یەك‌دانەن جگە لە خوتبەی ڕۆژی عەرەفە نەبێ، کە دوو خوتبەیە و لە نێوانیاندا دانیشتنێکی کورت هەیە.

هەرکاتێ حاجی تەوافی ڕوکنی تەواو کرد، دەگەڕێتەوە بۆ ڕەجمی شەیتان و مانەوە لە مینادا، ئەو شەوە کە حاجی لە «مینادا» ئەمێنێتەوە پێی دەڵێن: «ليلة القرّ» واتە شەوی مانەوە؛ چونکە خەڵك بەیانی ئەو شەوە لە «مینا»دا ئەمێننەوە و ناچن.[3]

لە ڕۆژی پاش جێژندا، کاتێ کە خۆر لە ناوەڕاستی ئاسمان لادەدات، سوونەتە بە نیەتی ڕەجمی شەیتان، خۆی بشۆرێ و بەرەو شوێنی شەیتان ڕەجمی ئەووەڵ (الجمرة الأولى) کە لە دوای خاکی عەرەفات، لەلای ڕاستی جادەکەوەیە، ڕێ‌کەوێ و حەوت جار بەردی بۆ

١. روضة الطالبين للنووي: ٣٢١/١، شرح الوجيز للرافعي: ٣٨٣/٧، أسنى المطالب لأبي‌يحى زكريا الأنصاري: ٢٣٩/٦.

٢. روضة الطالبين للنووي: ٣١٧/١، شرح الوجيز للرافعي: ٣٥٦/٧.

٣. روضة الطالبين للنووي: ٣٢٢/١، شرح الوجيز للرافعي: ٣٩٦/٧، أسنى المطالب لأبي‌يحى زكريا الأنصاري: ٢٥٢/٦.

فڕێ بدات. هەرکاتێ ئەم کارەی کرد، تۆزێ لە جادەکە بترازێ و ڕوو بە قیبلە ڕاوەستێ و بە حاڵەتێ مل‌کەچانەوە، بە ئەندازەی سوورەی بەقەرە، حەمد و ستایشی خوا بکات و دوعا و تەلیلە و ئەڵڵاهو ئەکبەر بکات. پاشان دەڕواتە پێشترەوە بۆ شوێنی شەیتان ڕەجمی دووهەم «الجمرة الوسطى» لەوێشدا هەروەك جاری پێشوو، شەیتان ڕەجم دەکات و هەر بەو شێوە کە گوتمان ڕادەوەستێ و دوعاو نزا دەکات. پاشان بەرەو پێشتر دەڕوات تا دەگاتە شەیتانی گەورە (الجمرة العقبى) و حەوت جار ئەمیش ڕەجم دەکات. ئیتر پاش ئەم شەیتان ڕەجمی ئاخرە، هیچێ نەکات و بگەڕێتەوە بۆ مەنزڵەکەی و ئەو شەوە لە «مینا»دا بمێنێتەوە. بەم شەوەش ئەڵێن: «ليلة النَّفرِ الأولِ» واتە: هەووەڵ شەوی گەڕانەوە بۆ مینا.

حاجی لە ڕۆژی دووهەمی «ايام‌التشريق»دا، تا کاتی نیوەڕۆ ڕادەوەستێ و پاش ئەوەی نوێژی نیوەڕۆی خوێند، دیسان وەکوو ڕۆژی پێشوو، بیست و یەك دانە بەرد بۆ سێ شەیتانەکە فڕێ دەدات. پاشان کەیفی خۆیە دابنیشێ لە مینادا یان بگەڕێتەوە بۆ مەککە. بەڵام ئەگەر پێش خۆرئاوابوون لە مینا هاتەدەر، ئەوە هیچی بەسەرەوە نییە و قەیدی نییە، بەڵام ئەگەر دانیشت تا شەوی بەسەردا هات، دروست نییە بڕواتە دەرەوە، بەڵکوو ئەبێ ئەو شەوە لە مینادا بمێنێتەوە تا ڕۆژی دووهەمی جێژن، دیسانەوە وەکوو ڕۆژی پێشوو بیست و یەك جار بەرد فڕێ بدات و شەیتان ڕەجم بکات.

ئەو کەسەی کە شەو لە مینادا نەمێنێتەوە و بەیانییەکەی شەیتان ڕەجم نەکات لەسەری واجبە ئاژەڵێ سەر ببڕێ و گۆشتەکەی بڵاو بکاتەوە. ئەگەر بۆ حاجی بلوێ دروستە شەو بڕوات تەوافی ماڵی کەعبە بکات، بەو مەرجەی هەر ئەو شەوە بگەڕێتەوە و لە مینادا بمێنێتەوە؛ هەروەك چۆن پێغەمبەر وای دەکرد.[1]

## قۆناغی هەشتەم: لەبارەی تایبەتمەندی عەمرەوە

[حاجی بەم شێوە عەمرە دەکات]: لەپێشدا خۆی دەشۆرێ و پاشان جلوبەرگی ئیحرام لەبەر دەکات و بەنیەتی عەمرە ئیحرام ئەبەستێ و لەببەیك ئەڵێت و بەرەو مزگەوتی حەزرەتی عائیشە ڕێ‌دەکەوێ و دوو ڕەکعەت نوێژ لەوێدا ئەخوێنێ و پاشان دەگەڕێتەوە بۆ مەککە

١. الأم للشافعي: ٢٣٦٢.

و به دەم ڕۆیشتنەکەیەوە ئەڵڵاهو ئەکبەر دەکات، تا دەگاتە نێو مزگەوتی حەرەم. جا هەرکاتێ چووە نێو مزگەوتەکە ئیتر لەبەیك نەڵێت.

حەوت جار تەواف و سەعی نێوان سەفاو مەروە بکات. هەرکاتێ تەواف و سەعیی تەواو کرد، حەلق بکات و ئیدی بەم شێوە عەمرەکەی تەواو ئەبێ.

## قۆناغی نۆهەم: باسی دوایین تەواف «طواف‌الوداع»[1]

تەوافولویداع وەختێکە کە تەواوی مەناسیکی حەجی ئەنجام دابێ و باروبنەی سەفەری تێك نابێ و خەریکی مالاوایی بێت. حەوت جار تەواف بکات، بەبێ ئەوەی بە شێوەی گورگەلۆقە ڕا بکات یان پشتەماڵەکەی بخاتە بن باخەڵی و ئەو دوو لۆوەکەی‌تری بخاتە سەرشانی چەپی.

هەرکاتێ تەوافی تەواو کرد دوو ڕەکعەت نوێژ لەپشت مەقامەوە بخوێنێ و لە ئاوی زەمزەم بخواتەوە و پاشان بڕواتە «ملتزم» واتە نێوان حەجەر و دەرگای بەیت و داوای لێبوردن و خۆش‌بوون لە خوا بکات و لێی بپاڕێتەوە.[2]

## قۆناغی دەهەم: لەبارەی زیارەت و شێوازی سەردانی مەدینەوە

پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «مَنْ زارَنِي بَعْدَ وَفاتي فَكَأَنَّما زارَنِي فِي حَياتِي»[3] واتە: «هەرکەس پاش مەرگم سەردانم بکات، هەروەکوو ئەوە وایە لە ژیانمدا سەردانمی کردبێ».

هەروەها پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «مَن وَجَدَ سِعَةً وَ لَمْ يَزُرْنِي فَقَدْ جَفانِي» واتە: «هەرکەس دەرفەتێکی دەسکەوێ و سەرم لێ نەدا، ئەوە لە حەقمدا کۆتایی کردووە».

دیسان پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «مَنْ جاءَ زائِراً لا يَهُمُّهُ إِلَّا زِيارَتِي كانَ حَقّاً عَلَى اللهِ أَنْ أَكُونَ لَهُ شفِيعاً»[4] واتە: هەرکەسێ بە تایبەتی بۆلای من هاتبێ ئەوە لەسەر خوایە من بکا بە تکاکار بۆی».

---

١. «لا يَنْفِرَنَّ أَحَدٌ حَتَّى يَكُونَ آخِرُ عَهْدِهِ بِالْبَيْتِ»، مسلم: ٢٣٥٠، بخاري: ١٦٣٦ ـ ١٦٣٧، ابوداود: ١٧١٤، ابن‌ماجه: ٣٠٦٢.

٢. مغني المحتاج للشربيني: ٨٦/٦.

٣. بيهقي: ٣٨٥٥، دارقطني: ٢٧٢٦ بهذه الرّواية. طبراني في الكبير: ١٣٣١٤ ـ ١٣٣١٥، بيهقي: ٣٨٥٧، برواية: «مَنْ زارَ قَبْرِي بَعْدَ مَوْتِي كانَ كَمَنْ زارَنِي فِي حَياتِي».

٤. طبراني في الكبير: ١٢٩٧١ ـ ٧٩١ بلفظ: «لا يَعْلَمُهُ حاجَةٌ إِلَّا زِيارَتِي ...».

هەرکەسێ بیەوێ بچێ بۆ زیارەتی مەدینە، سوننەتە لە ڕێدا بە زۆری لەسەر پێغەمبەر سەڵەوات بدات. جا هەرکاتێ چاوی بە سنوور و دار و دیواری مەدینە کەوت، بڵێ: «اَللّٰهُمَّ هٰذٰا حَرَمُ رَسُولِكَ[1] فَاجْعَلْهُ لِي وِقٰايَةً مِنَ النّٰارِ وَ أَمٰاناً مِنَ الْعَذٰابِ وَ سُوءِ الْحِسٰابِ».

واتە: «خوایا ئێرە هەرێمی فرستادەی تۆیە، داوات لێ دەکەم بیکەیتە پارێزگاریێ لە ئاوری دۆزەخ و پەنایەك لە عەزابی جەهەننەم و لە بەد حیسابی ڕۆژی قیامەت».

سوونەتە پێش ئەوەی بڕواتە نێو شاری مەدینە، لە «بئر الحرّة»دا خۆی بشۆرێ و خۆی بۆنخۆش بکات و جوانترین و خاوینترین جلوبەرگی لەبەر بکات، جا هەرکاتێ ویستی بڕواتە نێو شاری مەدینە، با بە حاڵەتی ملکەچی و بە ڕێز و ئیحتیرامەوە بڕواتە نێو شار و لەو کاتەدا بڵێ: «بِسْمِ اللّٰهِ وَ عَلَىٰ مِلَّةِ رَسُولِ اللّٰهِ ﷺ ﴿رَبِّ أَدْخِلْنِي مُدْخَلَ صِدْقٍ وَ أَخْرِجْنِي مُخْرَجَ صِدْقٍ وَ اجْعَلْ لِي مِنْ لَدُنْكَ سُلْطَاناً نَصِيراً﴾»[2].

واتە: «بەنێوی خواو لەسەر دینی پێغەمبەری خوا. «پەروەردگارم! بەڕاستی بمبەرەرە ناو و بەڕاستی بمهێنە دەر، لەلای خۆتەوە پشتیوانیکی و یارمەتیدەرم بۆ دابنێ».

پاشان ڕوو بکاتە مزگەوتی پێغەمبەر ﷺ و بڕواتە ناو و لەپەنای مینبەردا دوو ڕەکعەت نوێژ بخوێنێ، جا بە جۆرێ ڕابوەستێ کە کۆڵەکەی مینبەرەکە بکەوێتە لای شانی ڕاستی و ڕوو بکاتە ئەو کۆڵەکەی کە لە پەنایدا سندۆقەکە هەیە، بە شێوەیێ کە ئەو بازنەیەی وا لە قیبلەی مزگەوتەکەدا بکەوێتە نێو چاوانی؛ چونکە ئەو شوێنە شوێنی وەستانی پێغەمبەر ﷺ بووە.[3]

پاشان بچێتە سەر گڵکۆی [پیرۆزی] پێغەمبەر ﷺ و لە ڕووبەڕوویەوە ڕابووەستێ بەم شێوە: پشت لە قیبلە و ڕوو لە گڵکۆکە بکات و بە ئەندازەی چوار گەز دوور لە کۆڵەکەکەوە

---

١. لَمّٰا أَشْرَفَ النَّبِيُّ عَلَى الْمَدِينَةِ قٰالَ: «اللّٰهُمَّ إِنِّي أُحَرِّمُ مٰا بَيْنَ جَبَلَيْهٰا مِثْلَ مٰا حَرَّمَ بِهِ إِبْرٰاهِيمُ مَكَّةَ اللّٰهُمَّ بٰارِكْ لَهُمْ فِي مُدِّهِمْ وَ صٰاعِهِمْ» وَ فی روایة: «مٰا بَيْنَ لاٰبَتَيْهٰا» مسلم: ٢٤٢٨، بخاری: ٢٦٧٥، احمد: ١٢١٥٥.

٢. الإسراء: ٨٠. ترمذی: ٣٠٦٤، احمد: ١٨٤٧.

٣. قال رسول‌اللّٰه ﷺ: «مٰا بَيْنَ بَيْتِي وَ مِنْبَرِي رَوْضَةٌ مِنْ رِيٰاضِ الْجَنَّةِ وَ مِنْبَرِي عَلَىٰ حَوْضِي» بخاری: ١١٢٠ ـ ١١٢١، مسلم: ٢٤٦٣ ـ ٢٤٦٥، ترمذی: ٣٨٥٠، نسائی: ٦٨٨، احمد: ٦٩٢٥، و فی روایة: «مٰا بَيْنَ مِنْبَرِي وَ قَبْرِي ...» احمد: ١١١٨٥.

ڕاوەستێ و قەندیلەکە بکەوێتە سەرسەری.[1] بەڵام دەست هێنان بە دیواری قەبرەکەدا و ماچ کردنی، نە سوننەتە و نە بە ڕێزلێنان دائەنرێ. پاشان بڵێ:[2]

«اَلسَّلامُ عَلَيْكَ يٰا رَسُولَ اللهِ! اَلسَّلامُ عَلَيْكَ يٰا نَبِيَّ اللهِ، اَلسَّلامُ عَلَيْكَ يٰا أَمِينَ اللهِ! اَلسَّلامُ عَلَيْكَ يٰا حَبِيبَ اللهِ! اَلسَّلامُ عَلَيْكَ يٰا صَفْوَةَ اللهِ! اَلسَّلامُ عَلَيْكَ يٰا خَيْرَةَ اللهِ! اَلسَّلامُ عَلَيْكَ يٰا أَحْمَدُ، اَلسَّلامُ عَلَيْكَ يٰا مُحَمَّدُ! اَلسَّلامُ عَلَيْكَ يٰا شَفِيعُ! اَلسَّلامُ عَلَيْكَ يٰا عٰاقِبُ! اَلسَّلامُ عَلَيْكَ يٰا بَشِيرُ! اَلسَّلامُ عَلَيْكَ يٰا نَذيرُ! اَلسَّلامُ عَلَيْكَ يٰا طٰهٰ! اَلسَّلامُ عَلَيْكَ يٰا أَكْرَمَ وُلْدِ آدَمَ! اَلسَّلامُ عَلَيْكَ يٰا رَسُولَ اللهِ! اَلسَّلامُ عَلَيْكَ يٰا رَسُولَ رَبِّ الْعٰالَمِينَ، اَلسَّلامُ عَلَيْكَ يٰا سَيِّدَ الْمُرْسَلِينَ! اَلسَّلامُ عَلَيْكَ يٰا خٰاتَمَ النَّبِيِّينَ! اَلسَّلامُ عَلَيْكَ يٰا قٰائِدَ الْخَيْرِ! السَّلامُ عَلَيْكَ يٰا فٰاتِحَ الْبِرِّ! اَلسَّلامُ عَلَيْكَ يٰا نَبِيَّ الرَّحْمَةِ! اَلسَّلامُ عَلَيْكَ يٰا سَيِّدَ الْأُمَّةِ، اَلسَّلامُ عَلَيْكَ يٰا قٰائِدَ الْغُرِّ الْمُحَجَّلِينَ! اَلسَّلامُ عَلَيْكَ وَ عَلَىٰ أَهْلِ بَيْتِكَ الَّذِينَ أَذْهَبَ الله عَنْهُمُ الرِّجْسَ وَ طَهَّرَهُمْ تَطْهِيراً، اَلسَّلامُ عَلَيْكَ وَ عَلَىٰ أَصْحٰابِكَ الطَّيِّبِينَ وَ أَزْوٰاجِكَ الطّٰاهِرٰاتِ أُمَّهٰاتِ الْمُؤْمِنِينَ. جَزٰاكَ اللهُ عَنّٰا أَفْضَلَ مٰا جَزَىٰ نَبِيّاً عَنْ قَوْمِهِ وَ رَسُولاً عَنْ أُمَّتِهِ، صَلَّى اللهُ عَلَيْكَ كُلَّمٰا ذَكَرَكَ الذّٰاكِرُونَ وَ غَفَلَ عَنْ ذِكْرِكَ الْغٰافِلُونَ. وَ صَلَّى اللهُ عَلَيْكَ فِي الْأَوَّلِينَ وَ الْآخِرِينَ أَفْضَلَ وَ أَكْمَلَ وَ أَعْلَىٰ وَ أَجَلَّ وَ أَطْيَبَ وَ أَطْهَرَ مٰا صَلَّى عَلَىٰ أَحَدِ خَلْقِهِ كَمٰا اسْتَنْقَذْنٰا بِكَ مِنَ الضَّلالَةِ وَ بَصَّرَنٰا بِكَ مِنَ الْعِمٰايَةِ وَ هَدٰانٰا بِكَ مِنَ الْجَهٰالَةِ. أَشْهَدُ أَنْ لا إِلٰهَ إِلَّا اللهُ وَحْدَهُ لا شَرِيكَ لَهُ وَ أَنَّكَ عَبْدُهُ وَ رَسُولُهُ وَ صَفِيُّهُ وَ أَمِينُهُ وَ خَيْرَتُهُ مِنْ خَلْقِهِ وَ أَشْهَدُ أَنَّكَ قَدْ بَلَّغْتَ الرِّسٰالَةِ وَ أَدَّيْتَ الْأَمٰانَةَ وَ نَصَحْتَ الْأُمَّةَ وَ جٰاهَدْتَ عَدُوَّكَ وَ هَدَيْتَ أُمَّتَكَ وَ عَبَدْتَ رَبَّكَ حَتَّىٰ أَتٰاكَ الْيَقِينُ. فَصَلَّى اللهُ عَلَيْكَ وَ عَلَىٰ أَهْلِ بَيْتِكَ الطَّيِّبِينَ الطّٰاهِرِينَ وَ كَرَّمَ وَ شَرَّفَ».

ئەگەریش کەسێ ڕایسپاردبوو سڵاوی بگەیەنێ بە پێغەمبەرﷺ ئەوە بڵێ: «اَلسَّلامَ عَلَيْكَ مِنْ فُلانٍ».

---

١. المجموع للنووي: ٢٧٣/٨، الفقه المنهجي: ١١٢/٢، أسنى المطالب لأبي‌يحيى زكريا الأنصاري: ٢٨٣/٦، تحفة المحتاج: ٣٨٤، مغني المحتاج للشربيني: ٩٦/٦.

٢. قال رسول اللهﷺ: «مٰا مِنْ أَحَدٍ يُسَلِّمُ عَلَيَّ إِلَّا رَدَّ اللهُ عَلَىٰ رُوحِي حَتَّىٰ أَرُدَّ عَلَيْهِ السَّلامُ» ابوداود: ١٧٤٥، احمد: ١٠٣٩٥، بيهقى فى شعب الإيمان: ١٤٧٩.

پاشان بە قەدەر گەزێ هەنگاو بنێتە دواوە و لەسەر حەزرەتی ئەبووبەکر رَضِيَ ٱللَّهُ عَنْهُ سەلام بکات؛ چونکە سەری حەزرەتی ئەبووبەکر رَضِيَ ٱللَّهُ عَنْهُ وا لە شانی پێغەمبەرەوە صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ هەروەها سەری حەزرەتی عومەر رَضِيَ ٱللَّهُ عَنْهُ وا لە شانی ئەبووبەکرەوە رَضِيَ ٱللَّهُ عَنْهُ.

پاشان بە ئەندازەی گەزێك بڕواتە دواترەوە و لەسەر حەزرەتی فارۆق رَضِيَ ٱللَّهُ عَنْهُ سەلام بکات و بڵێ:

«اَلسَّلامُ عَلَيْكُما يا وَزِيرَيْ رَسُولِ اللّٰهِ صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ اَلْمُعاوِنَيْنِ لَهُ عَلَى الْقِيامِ بِالدِّينِ مادامَ حَيّاً وَالْقائِمَيْنِ فِي أُمَّتِهِ بَعْدَهُ بِأُمُورِ الدِّينِ، تَتَّبِعانِ فِي ذٰلِكَ آثارَهُ وَ تَعْمَلانِ بِسُنَّتِهِ فَجَزاكُمَا اللّٰهُ خَيْرَ ما جَزىٰ وُزَراءَ نَبِيٍّ عَلىٰ دِينِهِ خَيْراً».

واتە: «سڵاوی خوا لەسەر ئێوە ئەی دوو وەزیر و دوو جێگری پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لە ئەنجامی دەستووراتی دیندا، تا کاتێ کە پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لە ژیاندا بووەوە ئەی دوو کەسێ کە لە دوای فەوتی پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لە شوێنی ئەودا دەستووراتی دینتان بەڕێوە دەبرد، ئێوە شوێنی بەرهەم و ئەسەواری پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ کەوتن و بە ڕچە و ڕێبازی ئەودا ڕۆیشتن. خوا پاداشی ئێوە بداتەوە بە باشترین پاداشێ کە خوا بۆ وەزیرانی پێغەمبەرێ لە سەر دینەکەی بوون، دایناوە».

پاشان بگەڕێتەوەو لە ئاستی سەری پێغەمبەردا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لە نێوان قەبر و کۆڵەکەیێکدا کە لەوێدایە ڕابوەستێ و ڕوو لە قیبلە بکات و حەمد و سەناو ستایشی خوا بکات و زۆرێ لەسەر پێغەمبەر سەڵوات بدات و جا بڵێ: خوایە تۆ فەرمووتە: ﴿وَ لَوْ أَنَّهُمْ إِذْ ظَلَمُوا أَنْفُسَهُمْ جاؤُوكَ فَاسْتَغْفَرُوا اللّٰهَ وَاسْتَغْفَرَ لَهُمُ الرَّسُولُ لَوَجَدُوا اللّٰهَ تَوّاباً رَحِيماً﴾.[1]

ئەدی خوایە! ئێمە ئەم فەرموودەتمانە بیست و بەگوێمان کردی و هاتووین بۆلای پێغەمبەرەکەت، بیکەینە تکاکار بۆلای تۆ تا لە گوناحەکانمان خۆش ببی و ئەو بارەی کە پشتمانی قورس کردووە [سووك بکەیتەوە]، لەهەڵەو خەتاکانمان تۆبە دەکەین و پێیان ئیعتیراف دەکەین. ئەتۆش خوایە تۆبەمان لێ وەرگرە و ئەم پێغەمبەرەت بکە بە تکاکار بۆمان و لەبەر پلە و پایەی ئەو و بە خاتری ئەو، بەزەییت پێماندا بێتەوە.

---

١. النساء: ٦٤. «ئەگەر ئەوان لەو کاتەدا کە لە حەقی خۆیاندا ستەم ئەکەن، هاتنە لای تۆ و لە خودا داوای لێبوردن بکەن و ڕەسوولی خوداش داوای لێبوردنیان بۆ بکات، ئەوە خوایان بە خاوەنی بەزەیی و تەوبە وەرگر دەست دەکەوێ».

خوایە! خۆش بە لە جیهادگەران و هەوالآنی کۆچەر و یاوەر و ئەو برایانەی کە پێش ئێمە ئیمانیان هێناوە. خوایە! بەڕەحمی خۆت ئەم دیدارەمان مەکە ئاخرین دیداری مەزاری پێغەمبەر و حەرەمی پیرۆزی خۆت، تۆ لە هەمووکەس بە ڕەحمتری.

پاشان بێتە لای «روضة» و دوو ڕەکعەت نوێژ لەوێدا بخوێنێ و دوعا و پاڕانەوەی زۆر بکات؛ چونکە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «مٰا بَیْنَ قَبْرِي وَ مِنْبَرِي رَوْضَةٌ مِنْ رِیٰاضِ الْجَنَّةِ وَ مِنْبَرِي عَلَیٰ حَوْضِي»[١].

واتە: «نێوان قەبرو مینبەرم باخێکە لە باخەکانی بەهەشت. مینبەرەکەشم وا لەسەر حەوزی [کەوسەر]مەوە».

لە پەنای منبەریشدا دوعا و نزا بکات و سوننەتە دەس بنێتە سەر دەسگیرەی خواری منبەرەکەوە، هەروەها سوننەتە ڕۆژی پێنجشەممە بڕوا بۆ سەردانی گۆڕی شەهیدان و لە مزگەوتی پێغەمبەردا نوێژی بەیانی بخوێنێ و پاشان بچێ بۆ زیارەت و دیسانەوە بۆ نوێژی نیوەڕۆ بگەڕێتەوە بۆ مزگەوت؛ مەبادا نوێژی جەماعەتی فەرزێکی، لە دەس دەربچێ.[٢]

سوننەتە هەموو ڕۆژ پاش ئەوەی سەلامی پێغەمبەریﷺ کرد، بڕوا بۆ «بەقیع»[٣] و لەوێ زیارەتی گۆڕی حەزرەتی عوسمان و گۆڕی حەزرەتی حەسەنی کوڕی عەلی و گۆڕی حەزرەتی عەلی کوڕی حوسەینی کوڕی عەلی و حەزرەتی حوسەین و موحەممەدی کوڕی عەلی و جەعفەری کوڕی موحەممەد و زیارەتی حەزرەتی عەبباس رضي الله عنه بکات. پاشان بڕواتە نێو مزگەوتی حەزرەتی فاتیمە رضي الله عنها و نوێژی تێدا بخوێنێ و زیارەتی گۆڕی ئیبراهیمی کوڕی پێغەمبەرﷺ و گۆڕی سەفیەی پووری پێغەمبەرﷺ بکات.[٤]

---

١. بخاری: ١١٢٠ ـ ١١٢١، مسلم: ٢٤٦٣ ـ ٢٤٦٥، ترمذی: ٣٨٥٠، نسائی: ٦٨٨، احمد: ٦٩٢٥، احمد: ١١١٨٥.

٢. قال رسول اللهﷺ: «مَنْ صَلَّیٰ فِي مَسْجِدِي أَرْبَعِینَ صَلاةً لا یَفُوتُهُ صَلاةٌ کُتِبَتْ لَهُ بَرٰاءَةٌ مِنَ النّٰارِ وَ نَجٰاةٌ مِنَ الْعَذٰابِ وَ بَرِيءَ مِنَ النِّفٰاقِ». احمد: ١٢١٢٢، طبرانی فی الأوسط: ٥٦٠٢.

٣. لأنّ النبيّﷺ کان یفعل ذلك، مسلم: ١٦١٨، نسائی: ٢٠١٢، احمد: ٢٤٢٩٧.

٤. المجموع للنووی: ٢٧٥٨، حاشیة الجمل لأبی‌یحیی زکریا الأنصاری: ٣٥٩/٩.

## بەشی چوارەم: لەبارەی وردەکاری حەج و کردەوە دەروونیەکان

پێویستە حاجی مامەڵە و تیجارەت نەکات با هەر مەبەستی لە حەجەکەی عیبادەتی خوا بێت و بەس. جا ئەگەر توانای ئەوەی هەبوو، با خەرج و بژیوی کەسانیتر بدات. با ڕووکردن و ڕۆشتنی بۆ حەج، ڕووکردن و ڕۆیشتن بێ بۆلای خوا و هیچکات خوای لەبیر نەچێتەوە و خۆی لە یارمەتی خەڵك بپارێزێ.

پێغەمبەرﷺ لەمبارەوە ئەفەرمێ: «اَلْحَجُّ الْمَبْرُورُ لَيْسَ لَهُ ثَوْابٌ إِلَّا الْجَنَّةُ»[1] واتە: «حەجی چاك و پیرۆز جگە لە بەهەشت پاداشێکی نییە». وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا! حەجی چاك کامەیە؟ فەرمووی: «طِيبُ الْكَلامِ وَ إِطْعامُ الطَّعامِ»[2] واتە: [ئەوەیە وێڕای حەجەکە] قسەو سەر و زمانت خۆش بێت و نانی فەقیر و هەژاریش بدەی». هەروەها پێویستە زمانپیس نەبێ و جنێو و قسەی خراپ و دەمەقرە وەلا نێ.

سوننەتە ئەگەر بۆی بکرێ بە پێ حەج بکات[3] و بە ڕواڵەت و سەرو سیمای تۆزاوی و شپرزاو حەج بکات و زۆر خۆی نەڕازێنێتەوە؛ چونکە پێغەمبەرﷺ دەستووری فەرمووە بەشێوەی ئاڵۆزاو و شڕ لەبەر حەج بکرێ و مەنعی فەرمووە لە شێوەی دەوڵەمەندانە[4] [چونکە خوای گەورە لە حەدیسی قودسیدا] دەفەرمێ: «اُنْظُرُوا إِلَىٰ زُوَّارِ بَيْتِي جاؤُونِي شَعْثاً غُبْراً مِنْ كُلِّ فَجٍّ عَمِيقٍ».[5]

واتە: «بڕوانن بۆ زیارەتکەرانی ماڵی من، هەموویان بە تۆزاوی و ئاڵۆزاوی، لە ڕێگا دوورەکانەوە هاتوون بۆ لام».

---

١. بلفظ: «لَيْسَ لَهُ جَزاءٌ»، بخاری: ١٦٥٠، مسلم: ٢٤٠٣، ترمذی: ٨٥٥، نسائی: ٢٥٨٢، ابن‌ماجه: ٢٨٧٩، احمد: ٧٠٥٠.

٢. بیهقی فی سنن الکبری: ٢٦٢٥ فی شعب الإيمان: ٣٨٢٤، المستدرك علی الصّحیحین للحاکم: ١٧٣٣، طبرانی فی الأوسط: ٦٨٠٧، و فی روایة: «قٰالُوا يٰا نَبِيَّ اللهِ مَا الْحَجُّ الْمَبْرُورُ؟ قٰالَ: إِطْعٰامُ الطَّعٰامِ وَ إِفْشٰاءُ السَّلامِ». احمد: ١٣٩٥٨.

٣. ابن‌ماجه: ٣١١٠، ابن‌خزیمه: ٢٣٣٢ ـ ٢٥٨٠، حاکم فی المستدرك: ١٦٤٥، طبرانی فی الکبیر: ١٢٤٤٠، بیهقی فی شعب الإيمان: ٣٦٩٥.

٤. «قٰالُوا: مَنِ الْحٰاجُّ يٰا رَسُولَ اللهِ؟ قٰالَ: الشَّعْثُ التَّفِلُ...» ترمذی: ٢٩٢٤، ابن‌ماجه: ٢٨٨٧، دارقطنی: ٢٤٤٦.

٥. «شَعْثاً غَبَراً ضٰاحِّينَ...» احمد: ٦٧٩٢، بیهقی فی شعب الإيمان: ٣٧٧٤، حاکم فی المستدرك: ١٦٦١، طبرانی فی الکبیر: ٦٧٨ ـ ١٤٠٥، ابن‌حبان: ٣٩٢٥ ـ ٣٩٢٦، ابن‌خزیمه: ٢٦٢٥ ـ ٢٦٢٦.

هەروەها پێویستە لەگەڵ وڵاخەکەیدا بە بەزەیی بێت و ئەوەندە باری لێ نەنێ تواناى هەڵگرتنی نەبێ، پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «لا تَتَّخِذُوا ظُهُورَ دَوابِّكُمْ كَراسِيَّ».[1]

واتە: «پشتی وڵاخەکانتان مەکەن بە کورسی و سەندەڵیی دانیشتن [و لێی دانەبەزن]»؛ بەڵکوو سوننەتە هەرچی بەیانی و ئێوارەیە لە وڵاخەکەی دابەزێ و پشووی پێ بدا.[2]

هەروەها سوننەتە ئاژەڵێ سەر ببڕێ و قوربانییێك بکات، هەرچەندەش لەسەری واجب نەبێ. هەرچێکیش ئەبەخشێ بە دڵ پێی خۆش و ڕازی بێت[3].

١. احمد: ١٥٠٩٦ بالفاظ مختلفة: «لا تَتَّخِذُوا الدَّوابَّ كَراسِيَّ»، «ارْكَبُوا هٰذِهِ الدَّوابَّ سالِمَةً وَابْتَدِعُوها سالِمَةً وَلا تَتَّخِذُوها كَراسِيَّ» احمد: ١٥٠٨٧، طبرانى فى الكبير: ١٦٨٣٠، دارمى: ٢٧٢٤.

٢. «كانَ النَّبِيُّ ﷺ إِذا صَلَّى الْفَجْرَ فِي السَّفَرِ مَشى» طبرانى فى الأوسط: ٧١٤٥، بيهقى فى سنن الكبرى: ٢٥٥/٥.

٣. ئەم بەشی پێنجەمە تەنیا لە نوسخەکەی «دارالسلام»دا هاتووە ـ وەرگێڕ.

# بابەتی هەشتەم: قورئان خوێندن

پێغەمبەرصَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فەرموویەتی: «مَنْ قَرَأَ الْقُرْآنَ ثُمَّ رَأَىٰ أَنَّ أَحَداً أُوتِيَ أَفْضَلَ مِمَّا أُوتِيَ فَقَدِ اسْتَصْغَرَ مَا عَظَّمَهُ اللّٰهُ تَعَالَىٰ».

واتە: «هەرکەسێ قورئان بخوێنێ، پاشان وابزانێ کەسێ تر شتێ باشتر لە ئەوی پێ دراوە، ئەوە بەڕاستی ئەو شتە وا خوا بە گەورەی داناوە ئەو بە بچووکی زانیوە».

دیسان پێغەمبەرصَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فەرموویەتی: «مَا مِنْ شَفِيعٍ أَفْضَلَ مَنْزِلَةً عِنْدَ اللّٰه يَوْمَ الْقِيَامَةِ مِنَ الْقُرْآنِ لا نَبِيٌّ وَلا مَلَكٌ وَلا غَيْرُهُ».[1]

واتە: «هیچ تکاکارێ بەلای خواوە پلەو پایەی لە ڕۆژی قیامەتدا، لە قورئان، گەورەتر نییە؛ نە پێغەمبەر و نە فریشتە و نە غەیری ئەمانەش».

دیسان پێغەمبەرصَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فەرموویەتی: «إِنَّ اللّٰهَ عَزَّوَجَلَّ قَرَأَ "طه" و "يس" قَبْلَ أَنْ يَخْلُقَ بِأَلْفَيْ عَامٍ فَلَمَّا سَمِعَتِ الْمَلائِكَةُ الْقُرْآنَ قَالَتْ طُوبَىٰ لِأُمَّةٍ يَنْزِلُ عَلَيْهِمْ هٰذَا وَ طُوبَىٰ لِأَجْوَافٍ تَحْمِلُ هٰذَا وَ طُوبَىٰ لِأَلْسِنَةٍ تَنْطِقُ بِهٰذَا».[2]

واتە: «خوای گەورە دوو سوورەتی «طه» و «یس»ی دوو هەزار ساڵ پێش ئەوەی بوونەوەر بەدی بهێنێ، خوێندەوە، کاتێ کە فریشتەکان ئەم قورئانەیان بیست، گوتیان: خۆزگەمان بە ئەو ئوممەتەی وا ئەمە دەنێرێتە سەریان و خۆزگەمان بە ئەو دەروونانەی وا ئەمە هەڵدەگرن و خۆزگەمان بە ئەو زمانانەی وا ئەمە دەخوێنن».

---

١. لايوجد بهذا اللفظ. لكن اخرجه مسلم: ١٣٣٧ بلفظ: «اقْرَءُوا الْقُرْآنَ فَإِنَّهُ يَأْتِي يَوْمَ الْقِيَامَةِ شَفِيعاً لِأَصْحَابِهِ». و طبراني في الكبير: ٨٥٧٣ و ابن‌ابی‌شيبة فی مصنفه: ١٧٢/٧ و البيهقی فی شعب الإيمان: ١٨٥٥ بلفظ: «الْقُرْآنُ شَافِعٌ مُشَفَّعٌ...» و كذا ابن‌ابی‌شيبة: ١٧١/٧ و الدّارمی فی سننه: ٣٣٧٤ و الشّهاب القضاعی فی مسنده: ١٢١١ - ١٢١٢ بلفظ: «اقْرَءُوا الْقُرْآنَ فَإِنَّهُ نِعْمَ الشَّفِيعُ لِصَاحِبِهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ».

٢. طبرانی فی الكبير: ١٠٢٠ و فی الأوسط: ٥٠٣٣، بيهقی فی شعب الإيمان: ٢٢٢٥، دارمی فی سننه: ٣٤٧٧.

## بەشی یەکەم: سەرکۆنەی قورئانخوێنانی نائاگا

ئەنەسی کوڕی مالیكرَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ فەرموویەتی: «رُبَّ تَالٍ لِلْقُرْآنِ وَالْقُرْآنُ يَلْعَنُهُ» واتە: «زۆر قورئانخوێن هەیە، قورئانەکە تووك و نفرینی لێ ئەکا».

ئەبووسولەیمانی دارانیرَحِمَهُ اللَّهُ فەرموویەتی: فریشتە چاوەدێرەکانی دۆزەخ، تەنانەت پێش لە کافرە بتپەرستەکانیش، دێن بە شوێن ئەو قورئانخوێنانەی کە بێئەمری خوایان کردووە؛ چونکە ئەوان پاش ئەوەی قورئانیان زانیوە، بێئەمری خوایان کردووە.[1]

**لە تەوراتیشدا هاتووە:**

ئەی بەندەکەم! ئەوە لێم شەرم ناکەی؟ تۆ لە کاتێکدا کە خەریکی ڕێ دەپێوی، ئەگەر نامەیێکت لە دۆستێکەتەوە بە دەستت بگات، گورج لا دەدەیت و دادەنیشی و بە وردی، پیت بە پیت دەیخوێنیتەوە، مەبادا شتێکی لێ دابخەیت. ئەدی ئەمە کتێبی منە و بۆ تۆم ناردووە، بڕوانە: بزا چیم بۆت تێدا شیکردۆتەوە و چەندە باسی [دینی و دونیاییم] بۆت دووپات کردۆتەوە؛ بەشکوو تۆ لە پانی و درێژی و [ورد و دروشتیدا] ڕابمێنی! بەڵام [بەداخەوە] تۆ ڕووی لێ هەڵدەچەرخێنی، بۆچی من سووکترم بەلای تۆوە لەو دۆستانەت؟!

ئەی بەندەی من! ئەگەر هەندێ لە دۆستانت، قسەیەکت بۆ بکەن، تۆ دەسبەجێ، بە تەواوی ڕووی تێ دەکەی و بە دڵ گوێی بۆ ڕادەدێری، ئەگەریش لەو کاتەدا کەسێ قسەت لەگەڵدا بکات یان بدا بە نێو قسەکانتاندا، زوو بە دەست ئاماژەی بۆ دەکەی کە بێدەنگ بێت. ئەدی من ڕووم لە تۆ کردووە و لەگەڵتا قسە دەکەم، کەچی تۆ دڵت لە من وەرچەرخاندووە!

بۆچی من بەلای تۆوە لە ئەو هەواڵانەت سووکترم؟! (خوا لە هەمووی ئەمانە بەرزتر و گەورەترە).

---

١. بیهقی فی شعب الإیمان: ٢٣٨٢ بلفظ: «الزَّبَانِيَةُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ أَسْرَعُ إِلَى حَمَلَةِ الْقُرْآنِ الَّذِينَ عَصَوُا اللَّهَ بَعْدَ قِرَاءَةِ مِنْهُمْ إِلَى عَبَدَةِ الْأَوْثَانِ غَضَباً عَلَيْهِمْ حِينَ عَصَوُا اللَّهَ بَعْدَ قِرَاءَةِ الْقُرْآنِ».

## بەشی دووهەم: یاسای ڕواڵەتیی قورئانخوێندن

پێویستە قورئانخوێن دەسنوێژی ببێت[1] و بە ئەدەب و ڕێزەوە و بە پێوە، یان بە دانیشتنەوە قورئان بخوێنێ. پڕخێرترین قورئان خوێندن، ئەوەیە وا لە نوێژدا بە پێوە دەخوێنرێ. [ئەبێ قورئانخوێن بە لەسەرخۆی و هێمنی قورئان بخوێنێ؛ چونکە] پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «مَن قَرَأَ الْقُرْآنَ فِي أَقَلَّ مِنْ ثَلاثٍ لَم يَفْقَهْهُ»[2].

واتە: «هەرکەس کەمتر لە سێ [شەو و ڕۆژدا] قورئان خەتم بکات، ئەوە دیارە لێی تێنەگەیشتووە».

بەمبۆنەوە زانایان بە ناپەسەندیان داناوە، هەر شەو قورئان خەتم بکرێ. پێم وایە خەتمی قورئان لە هەر حەوتوویەکدا یەکجار باشتر بێت.

تەرتیل؛ واتە: جوان و لە سەرخۆ خوێندنەوەی قورئان، سوننەتە.

هەروەها پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «إِنَّ هٰذَا الْقُرْآنَ نَزَلَ بِحُزْنٍ، فَإِذَا قَرَأْتُمُوهُ فَتَحَازَنُوا».[3]

واتە: «ئەم قورئانە بە خەمباری و دڵپڕییەوە هاتۆتە خوار، ئەدی ئێوەش کاتێ قورئان ئەخوێنن، خۆتان دڵپڕ و خەمبار کەن».

قورئانخوێن لە سەریەتی مافی ئەو ئایەتانە کە سوژدەیان هاتێدا، بەجێ بهێنێ؛ واتە: هەرکاتێ خۆی ئایەی سوژدەی خوێند، یان لە کەسێکی بیست، پێویستە ئەگەر دەسنوێژی ببێت، سوجدە ببات. لە قورئاندا چواردە شوێنی سوژدەمان هەیە، لە سوورەتی «حەجدا» دوو سوژدە هەیە، بەڵام لە سوورەتی «ص»دا سوژدە نییە [بەڵکوو ئەوە سەجدەی شوکرە و سەجدەی تەلاوەت نییە].

---

١. ﴿لا يَمَسُّهُ إِلَّا الْمُطَهَّرُونَ﴾ الواقعة: ٧٩.

٢. ابوداود: ١١٨٦، ترمذی: ٢٨٧٣، ابن‌ماجه: ١٣٣٧ بلفظ: «لَمْ يَفْقَهْ مَن قَرَأَ الْقُرْآنَ فِي أَقَلَّ مِنْ ثَلاثٍ».

٣. ابن‌ماجه: ١٣٢٧، بیهقی فی شعب الإیمان: ١٩٦٠ بلفظ: «... فَإِذَا قَرَأْتُمُوهُ فَابْكُوا...».

## بەشی سێهەم: یاسای مەعنەوی قورئانخوێندن

پێویستە قورئانخوێن بە ڕێز و بە ڕامانەوە قورئان بخوێنێ. بە ڕاستی خوای مەزن، ڕێزی لە مرۆڤەکان ناوە لەوەیدا کە قورئانی لە عەرشی گەورە و بەشکۆوە ئەوەندە ناردۆتە خوارەوە کە لێی تێبگەن، تەنانەت ئەو مانایانەی کە تێکەڵە لەگەڵ زاتی خۆیدا، خەڵکی لێ تێ گەیاندوون. [بنوارە] چلۆن سیفەتی قسەبێژی خوا لە دوو تۆی پیت و دەنگدا خۆی پیشان داوە.

ئەگەر خوای مەزن، حەقیقەت و ناوەرۆکی تەواوی وتەکانی خۆی، بە جلوبەرگی پیت و وشە نەشاردبایەوە، نە عەرش و نە زەوی هیچکامیان یارای بیستنی قورئانیان نەبوو و نێوان ئاسمان و زەویش لەبەر گەورەیی و شکۆی پرشنگی خوا، خۆیان بۆ ڕانەدەگیرا و ورد و خاش دەبوون.

هەروەها ئەگەر خوای مەزن خۆی حەزرەتی مووسای ڕانەگرتبا، یارای بیستنی وتەی خوای نەبوو، هەر وەکوو چۆن کێوەکە بەرگەی بریسکەی خۆدەرخستنە هەووەڵەکانی خوای نەگرت و هەپروون هەپروون بوو.

ئەدی با قورئانخوێن، گەورەیی بێژەری قورئانی لەبەرچاو بێت و لە دڵدا بە حازری دابنێ و ئەوەش هەڵی بنێ لەسەر خوێندنی قورئان. با وا بزانێ کە خوای گەورە ڕووی دەمی لە ئەو کردووە.

## بەشی چوارەم:
## تێگەیشتن لە قورئان و لێکدانەوەی بە عەقڵ؛ نەك بە نەقڵ

پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «إِنَّ لِلْقُرآنِ ظَهْراً وَ بَطْناً وَ حَدّاً و مَطْلَعاً»[1].

واتە: «قورئان بە ڕاستی ڕواڵەت و ناوەڕۆکی بۆ هەیە و خاوەنی سنوور و جێی هەڵهاتنی مانایە».

---

١. لم نجده بهذا اللفظ، لكن أورده البيهقي في شعب الإيمان: ٢٢٥٧ بلفظ: «... إِنَّ لِكُلِّ آيَةٍ مِنْهُ نُوراً يَوْمَ الْقِيامَةِ ظَهْراً وَ بَطْناً ...».

حەزرەتی عەلی رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ فەرموویەتی: ئەگەر بمهەوێ، حەفتا وشتر لە تەفسیری سوورەتی «فاتیحەدا» بار دەنێم. کەوابوو، دیارە ڕاز و ڕەمزی قورئان قەت تەواوبوونی بۆ نییە و عەجائیباتی قەت لە ئەژماردن نایە. ئەمەش بەسراوەتەوە، بە ئەندازەی دڵپاکی و خاوێنی ئەو کەسەوە.

ئەو فەرموودەی پێغەمبەرە صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ کە بە حەزرەتی عەبباسی فەرموو: «اَللّٰهُمَّ فَقِّهْهُ فِي الدِّينِ وَ عَلِّمْهُ التَّأْوِيلَ»[1] واتە: «خوایا! شارەزای دینی بکە و فێری مانا لێکدانەوەی قورئانی کە». ئەوە دەگەیەنێ کە تەفسیر و شرۆڤەی قورئان پێویست ناکا بەس لە پێغەمبەرەوە صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بیسترابێ و لەوەوە گێڕرابێتیانەوە.

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ ... لَعَلِمَهُ الَّذِينَ يَسْتَنبِطُونَهُ مِنْهُمْ ﴾[2] واتە: « ... (ئەو هەواڵە) کەسانێك لەوان وا لێکی دەدەنەوە، دەیزانن». خوای گەورە لەم ئایەتە پیرۆزەدا، ڕێی داوە بە زانایان لێکی بدەنەوە؛ کە وابوو، دیارە تەفسیر و شرۆڤەی قورئان پێویست ناکات بەس لە ڕێی بیستنی لە زاری پێغەمبەرەوە صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بێت.

---

١. احمد: ٢٢٧٤، بخاري: ١٤٠.

٢. النساء: ٨٣.

# بابەتی نۆهەم: لەبارەی زیکر و دوعاوە

خـوای گەورە فەرموویـەتی: ﴿ادْعُونِي أَسْتَجِبْ لَكُمْ﴾.[1] واتە: «بانگم بکەن وڵامتان ئەدەمەوە».

خوای گەورە فەرموویـەتی: ﴿فَإِذَا قَضَيْتُمُ الصَّلوٰةَ فَاذْكُرُوا اللهَ قِيَاماً وَ قُعُوداً وَ عَلَىٰ جُنُوبِكُمْ﴾[2] واتە: «هەرکاتێ نوێژتان تەواو کرد، یادی خوا بکەن بە پێوە، یان بە دانیشتنەوە، یان بە پاڵکەوتنەوە».

پێغەمبەرﷺ فەرموویـەتی: «ذَاكِرُ اللهِ فِي الْغَافِلِينَ كَالْحَيِّ بَيْنَ الْأَمْوَاتِ» واتە: «ئەوەی وا یادی خوا دەکات لەنێو غافڵ و بێئاگایاندا؛ وەکوو زیندوێکە لە نێوان مردواندا».

هەروەها پێغەمبەرﷺ فەرموویـەتی: «ذَاكِرُ اللهِ فِي الْغَافِلِينَ كَشَجَرَةٍ خَضْرَاءَ فِي وَسَطِ الْهَشِيمِ» واتە: «ئەوەی وا یادی خوا بکات لەنێو غافڵ و بێئاگایاندا، وەکوو: دارێکی سەوز وایە لەنێو گژوگیای وشك هەڵاتوودا».

دیسانەوە پێغەمبەرﷺ فەرموویـەتی: «مَا جَلَسَ قَوْمٌ مَجْلِساً يَذْكُرُونَ اللهَ ـ عزَّوجَلَّ ـ فِيهِ إِلَّا حَفَّتْ بِهِمُ الْمَلَائِكَةُ وَ غَشِيَتْهُمُ الرَّحْمَةُ وَ ذَكَرَهُمُ اللهُ فِيمَنْ عِنْدَهُ»[3].

واتە: «هیچ کۆمەڵێك پێکەوە لە کۆڕێکدا دانانیشین، یادی خوای گەورە بکەن، مەگەر فریشتە دەوریان دەگرن و لە ڕەحمەت و بەرەکەتدا دایانئەپۆشن، خوای گەورەش لەلای نزیکانی بارەگای خۆیەوە باسیان دەکات».

---

١. غافر: ٦٠.

٢. النساء: ١٠٣.

٣. مسلم: ٤٨٦٨، ابنماجە: ٣٧٨١، احمد: ١١٤٥٧، طبرانی فی الکبیر: ٨٠٩٩.

دیسان پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «مٰا قَعَدَ قَوْمٌ مَقْعَداً لَمْ يَذْكُرُوا اللهَ وَ لَمْ يُصَلُّوا عَلَىٰ رَسُولِ اللهِ إِلّا كٰانَ حَسْرَةً عَلَيْهِمْ يَوْمَ الْقِيٰامَةِ»[1].

واتە: «هەر کۆمەڵێك پێکەوە لە کۆڕێکدا دابنیشن و یادی خوا نەکەن و سەڵوات لەسەر پێغەمبەرﷺ نەنێرن، ئەوە لە ڕۆژی قیامەتدا ئەبێ بە داخ بە سەر دڵیانەوە و ئاخی بۆ هەڵدەکێشن».

هەروەها پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «أَفْضَلُ مٰا قُلْتُ أَنَا والنَّبِيُّونَ مِنْ قَبْلِي: «لا إِلٰهَ إِلَّا اللهُ وَحْدَهُ لا شَرِيكَ لَهُ»[2].

واتە: «گەورەترین وتەیێ کە من و پێغەمبەرانی پێش من گوتوویانە: "لا إِلٰهَ إِلَّا اللهُ وَحْدَهُ لا شَرِيكَ لَهُ"یە».

دیسان پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «مَنْ سَبَّحَ دُبَرَ كُلِّ صَلاةٍ ثَلاثاً و ثَلاثِينَ وَ حَمَّدَ ثَلاثاً و ثَلاثِينَ وَ كَبَّرَ ثَلاثاً و ثَلاثِينَ و خَتَمَ الْمِائَةَ بِـ (لا إِلٰهَ إِلَّا اللهُ وَحْدَهُ لا شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَ لَهُ الْحَمْدُ يُحْيِي و يُمِيتُ وَ هُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ)، غُفِرَتْ ذُنُوبُهُ وَ لَوْ كٰانَتْ مِثْلَ زَبَدِ الْبَحْرِ»[3].

واتە: «هەرکەس پاش هەر نوێژێ سی و سێ (٣٣) جار "سبحان الله" بڵێ و سی و سێ (٣٣) جار "الحمد لله" بڵێ و سی و سێ (٣٣) جار "اللهُ أكبر" بڵێ و بە وتنی "لا إِلٰهَ إِلَّا اللهُ وَحْدَهُ لا شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَ لَهُ الْحَمْدُ يُحْيِي و يُمِيتُ وَ هُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ" زیکرەکانی بکات بە سەد، ئەوە هەرچەندە بە قەدەر کەفی سەر بەحریش، گوناحیشی هەبێت، خوا لێی خۆش ئەبێت».

دەگێڕنەوە پیاوێ هاتە لای پێغەمبەرﷺ وتی: ئەی ڕاسپاردەی خوا! دونیا پشتی تێکردووم و دەستم خاڵی بووە؛

---

١. احمد: ٩٥٨٦، ابن‌حبان: ٥٩٣، و بلفظ: «مٰا جَلَسَ قَوْمٌ مَجْلِساً ـ إِلّا كٰانَ عَلَيْهِمْ تِرَةً فَإِنْ شٰاءَ عَذَّبَهُمْ وَ إِنْ شٰاءَ غَفَرَ لَهُمْ» ترمذی: ٣٣٠٢، احمد: ٩٤٦٦ ـ ٩٨٥٤.

٢. الموطأ لمالك: ٨٤١، ترمذی: ٣٥٠٩.

٣. مسلم: ٩٣٩، مالك فی الموطأ: ٤٣٩، احمد: ٨٤٧٨.

پێغەمبەرﷺ فەرمووی: «أَيْنَ أَنْتَ مِنْ صَلاةِ الْمَلائِكَةِ وَ تَسْبِيحِ الْخَلائِقِ وَ بِهٰا يُرزَقُونَ؟» واتە: «ئایا ئەتۆ لە نوێژی فریشتە و ویردی ئینسانەکان کە خوا بەوە ڕزقیان ئەدا، شتێ دەزانی؟»».

پیاوەکە گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! ئەوە چییە؟

پێغەمبەرﷺ فەرمووی: لەنێوان کازیوە تا وەختێ نوێژی بەیانی، سەد جار بڵێ: «سُبْحٰانَ اللّٰهِ وَ بِحَمْدِهِ، سُبْحٰانَ اللّٰهِ الْعَظِيمِ وَ بِحَمْدِهِ، أَستَغْفِرُ اللّٰهَ» دونیا بە کزی و دەسەمۆی دێتە بەردەستت و خواش لە بری هەر وشەیەك فریشتەیەکت بۆ دروست دەکات، تا ڕۆژی قیامەت تەسبیحاتی خوا بکات و خێرەکەشی بۆ تۆ دەنووسرێ.

پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «إِذٰا قٰالَ الْعَبْدُ: "اَلْحَمْدُ لِلّٰهِ" مَلَأَتْ مٰا بَيْنَ السَّماءِ وَالْأَرْضِ، فَإِذَا قٰالَ: "اَلْحَمْدُ لِلّٰهِ" الثّٰانِيَةَ، مَلَأَتْ مٰا بَيْنَ السَّماءِ السّٰابِعَةِ إِلَى الْأَرْضِ، فَإِذٰا قٰالَ: "اَلْحَمدُ لِلّٰهِ" الثّٰالِثَةَ، قٰالَ اللّٰهُ تَعٰالَىٰ: سَلْ تُعْطَ».

واتە: «هەرکاتێ بەندەی خوا بڵێ: "اَلْحَمْدُ لِلّٰهِ" نێوان ئاسمان و زەوین پڕ دەکات، هەر کات بۆ جاری دووهەم بڵێ: "اَلْحَمْدُ لِلّٰهِ" نێوان ئاسمانی حەوتەم تا زەمین پڕ دەکات، ئەگەر بۆ جاری سێهەم بڵێ: "اَلْحَمْدُ لِلّٰهِ" خوای گەورە پێی دەفەرمێ: داوا بکە تا پێت بدرێ.

پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «اَلْبٰاقِيٰاتُ الصّٰالِحٰاتُ هُنَّ: لا إِلٰهَ إِلَّا اللّٰهُ وَ سُبْحٰانَ اللّٰهِ وَاللّٰهُ أَكْبَرُ وَالْحَمْدُ لِلّٰهِ وَلا حَوْلَ وَلا قُوَّةَ إِلَّا بِاللّٰهِ الْعَلِيِّ الْعَظِيمِ»[1].

واتە: «ئەو خێرە چاکانەی کە هەر دەمێننەوە بریتین لە وتنی: "لا إِلٰهَ إِلَّا اللّٰهُ وَ سُبْحٰانَ اللّٰهِ وَاللّٰهُ أَكْبَرُ وَالْحَمْدُ لِلّٰهِ وَلا حَوْلَ وَلا قُوَّةَ إِلَّا بِاللّٰهِ الْعَلِيِّ الْعَظِيمِ".

پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ئەم وشانە هەرکەس بیانڵێتەوە خودا لە گوناحی ـ هەرچەند بە ئەندازەی کەفی سەر بەحریش ببێت ـ خۆش ئەبێت. (حەزرەتی عومەرڕ ئەم حەدیسەی ڕیوایەت کردووە).

---

١. مالك في الموطأ: ٤٤٠، احمد: ١١٢٨٨. لم نعثر عليه بهذه العبارة لكن أورده الترمذي بلفظ: «مٰا عَلَى الْأَرْضِ يَقُولُ لا إِلٰهَ إِلَّا اللّٰهُ واللّٰهُ أَكْبَرُ وَلا حَوْلَ و لا قُوَّةَ إِلَّا بِاللّٰهِ، إِلَّا كُفِّرَتْ عَنْهُ خَطٰايٰاهُ وَ لَوْ كٰانَتْ مِثْلَ زَبَدِ الْبَحْرِ» ترمذي: ٣٣٨٢، و في لفظ أحمد: ٦١٩١ و نسائي في سنن الكبرى: ٩٩٥١ زاد: «... لا إِلٰهَ إِلَّا اللّٰهُ وَاللّٰهُ أَكْبَرُ وَ سُبْحٰانَ اللّٰهِ وَالْحَمْدُ لِلّٰهِ وَلا حَوْلَ وَلا قُوَّةَ إِلَّا بِاللّٰهِ ...».

**[تێبینییەکی گرینگ]:**

بزانە ئەو زیکر و ویردانە وەختێ کەڵکیان هەیە کە لەگەڵ وتنیان، دڵیش وشیار بێت، ئیدی غەیری ئەمانە، کەڵکێ وەهایان نییە؛ چونکە ئامانج لەم زیکرانە ئەوەیە بە خواوە خوو بگیرێ، ئەمەش بەس بەوە ئەکرێ کە لەسەر وتنی زیکرەکان وێڕای وشیاری دڵ بەردەوام بێت بەم شێوە زیکرە خۆی لە عاقیبەتشەڕی دەپارێزێ.

## بەشی یەکەم: شێواز و یاسای دوعاکردن

[پێویستە بۆ ئەوەی دوعا گیرابێت ئەم مەرجانەی خوارەوە لەبەر چاو بگیرێ].

١. دەسنوێژی هەبێت؛

٢. ڕوو لە قیبلە بکات؛

٣. دەنگی نەوی بێت؛

٤. خۆی بە کەم بگرێ و مل کەچ بێت؛

٥. باوەڕی بەوە هەبێ کە خوا دوعای لێ وەردەگرێ و زۆر لەسەری بڕوات؛

٦. بەنێوی خوا و سەڵوات لەسەر پێغەمبەرەوەﷺ دەستی پێ بکات؛

٧. پێش ئەوەی بیەوێ دوعا بکات و تۆبە بکات پەشیمان ببێتەوە لە گوناحانی؛

٨. ئاگادار بێت ئەو کاتانەی کە پیرۆزن [وەکوو ڕۆژی عەرەفە، مانگی ڕەمەزان و شەو و ڕۆژی جومعە] لەدەستیان نەدات.

**خێری سەڵوات لەسەر پێغەمبەرﷺ:**

لە پێغەمبەرﷺ دەگێڕنەوە کە ڕۆژێ تەشریفی هێناو شادی و مزگێنی بەناو چاوانیەوە دیار بوو، فەرمووی: «أَنَّهُ جاءَنِي أَخِي جِبْرِيلُعَلَيْهِ السَّلَامُ فَقالَ: أَما تَرْضىٰ يا مُحَمَّدُ أَنْ لا يُصَلِّيَ عَلَيْكَ أَحَدٌ مِنْ أُمَّتِكَ مَرَّةً إِلَّا صَلَّيْتُ عَلَيْهِ عَشْراً»[1]

واتە: «جوبرەئیلی برام عَلَيْهِ السَّلَامُ هات بۆ لام و فەرمووی: ئەی موحەممەد! ئەتۆ ڕازی نیت بەوەی کە هەرکەس لە ئوممەتت جارێك سەڵواتت لەسەر بدا، ئەمن دەجار سەڵواتی لەسەر بدەم».

١. نسائی: ١٢٦٦ ـ ١٢٧٨، احمد: ١٥٧٦٧ و زاد: «وَلا يُسَلِّمُ عَلَيْكَ إِلّا سَلَّمْتُ عَلَيْهِ عَشْراً».

دیسان پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «مَنْ صَلَّىٰ عَلَيَّ صَلَّتْ عَلَيْهِ الْمَلائِكَةُ مٰا صَلَّىٰ عَلَيَّ فَلْيُقَلِّلِ الْعَبْدُ مِنْ ذٰلِكَ أَوْ لِيُكَثِّرْ»[1].

واتە: «هەرکەس سەڵواتم لەسەر بدات، پەرییانی ئاسمان سەڵواتی لەسەر ئەدەن، تا هەر وەخت ئەو سەڵواتم لەسەر بدات، ئیتر فەرق ناکات کەم سەڵوات بدات یان زۆر».

هەروەها پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «مَنْ صَلَّىٰ عَلَيَّ فِي كِتٰابٍ لَمْ تَزَلِ الْملائِكَةُ يَسْتَغْفِرُونَ لَهُ مٰادٰامَ اسْمِي فِي ذٰلِكَ الْكِتٰابِ»[2].

واتە: «هەرکەس لە کتێبێکدا سەڵواتم لەسەر بدات، فریشتەکانی ئاسمان، تا کاتێ نێوی من لە ئەو کتێبەدا بێت، لای خوداوە داوای لێبوردنی بۆ دەکەن».

## خێری تۆبە و داوای بەخشش‌کردن:

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَالَّذِينَ إِذٰا فَعَلُوا فٰاحِشَةً أَو ظَلَمُوا أَنْفُسَهُمْ ذَكَرُوا اللّٰهَ فَاسْتَغْفَرُوا لِذُنُوبِهِمْ»[3].

واتە: «ئەوانەی وا کاتێ تووشی گوناحی گەورە ئەبن یان [بە بۆنەی بێ‌ئەمری خواوە] لە خۆیان ستەم ئەکەن، بیری خوا دەکەنەوە و داوای لێبوردنی لێ دەکەن».

دیسان خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَ الْمُسْتَغْفِرِينَ بِالْأَسْحٰارِ﴾[4] واتە: «ئەوانەی وا بەرەبەیانان لەخوا داوای لێبوردن دەکەن».

پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «إِنّي لَأَستَغْفِرُ اللّٰهَ وَ أَتُوبُ إِلَيْهِ فِي الْيَوْمِ وَاللَّيْلَةِ سَبْعِينَ مَرَّةً»[5] واتە: «ئەمن لە شەو و ڕۆژێکدا، حەفتا جار تۆبە دەکەم و لەخوا داوای لێبوردن دەکەم».

---

١. ابن‌ماجە: ٨٩٧، احمد: ١٥١٣٤، بیهقی فی شعب الإیمان: ١٤٥٧.

٢. طبرانی فی الکبیر: ٤٤٧، جامع الکبیر للسیوطی: ٥٥٠٦.

٣. آل عمران: ١٣٥.

٤. آل عمران: ١٧.

٥. بخاری: ٥٨٣٢، ترمذی: ٣١٨٢، ابن‌ماجە: ٣٨٠٦، احمد: ٨١٣٧. و فی روایة: «مِائة مرّة» ابوداود: ١٢٩٤، ابن‌ماجە: ٣٨٠٥، احمد: ٩٤٣١.

دیسان پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «مٰا أَصَرَّ مَنِ اسْتَغفَرَ وَ إِنْ عٰادَ فِي الْيَوْمِ سَبْعِينَ مَرَّةً»[1] واتە: «هەرکەس [لە دوای گوناحکردنیدا بە دڵ] لە خوا داوای لێبوردن بکات بە شلگێر (مصرّ) لەسەر گوناح‌کردن ناژمێررێ؛ هەرچەند ڕۆژی حەفتا جاریش ئەنجامی بدات».

پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «مَنْ أَذْنَبَ ذَنْباً فَعَلِمَ أَنَّ اللهَ قَدِ اطَّلَعَ عَلَيْهِ، غَفَرَ اللهُ لَهُ، وَ إِنْ لَمْ يَسْتَغْفِرْ».[2]

واتە: «هەرکەس تووشیاری گوناحێ بێ و بزانێ کە خوا ئاگای لێیە، ئەوە خوا لێی خۆش ئەبێ؛ هەرچەندەش داوای لێبوردن نەکات».

پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «يَقُولُ اللهُ ـ عزَّوَجلَّ ـ يٰا عِبٰادِي كُلُّكُمْ مُذْنِبٌ إِلّٰا مَنْ عٰافَيْتُهُ فَاسْتَغْفِرُونِي أَغْفِرْ لَكُمْ وَ مَنْ عَلِمَ أَنِّي ذُو قُدْرَةٍ عَلَىٰ أَنْ أَغْفِرَ لَهُ غَفَرْتُ لَهُ وَلا أُبالِي».[3]

واتە: «خوای گەورە دەفەرمێ: هۆ بەندەکانم! هەمووتان گونەهکارن جگە ئەوانەتان وا ڕزگارم کردوون، ئەدی ئێوە داوای لێبوردن لە من بکەن، تا لێتان خۆش بم. هەرکەس باوەڕی وەها بێت کە من دەسەڵاتی ئەوەم هەیە لێی خۆش بم، ئەوە دەیبەخشم و گوێ نادەم».

پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «مَن قالَ: سُبْحانَكَ ظَلَمْتُ نَفْسِي وَ عَمِلْتُ سُوءا فَاغْفِرْ لِي إِنَّهُ لا يَغْفِرُ الذُّنُوبَ إِلاَّ أَنْتَ، غُفِرَتْ ذُنُوبُهُ وَ لَوْ كانَتْ كَمَدَبِ النَمْلِ»[4].

واتە: «هەرکەس بڵێ ـ پاك و بەریت خوایە ـ ئەمن لە حەقی خۆمدا ستەمم کردووە و کاری نارەوام ئەنجام داوە، ئەتۆش بمبوورە؛ چونکە جگە تۆ نەبێ کەس لە گوناحان خۆش نابێ، ئەوە لێی خۆش ئەبم هەرچەندەش گوناحانی وەك شارە مێلوورە پوورەی بەستبێ».

---

١. ترمذی: ٣٤٨٢ بلفظ: «... و لَوْ فَعَلَهُ فِي الْيَوْمِ ...» ابوداود: ١٢٩٣ بلفظ: «... وَ إِنْ عٰادَ فِي الْيَوْمِ ...».

٢. طبرانی فی معجم الأوسط: ٤٦٢٧، کنز العمال للهندی: ١٠٢٤٥، مجمع الزّوائد للهیثمی: ٤٤٩/٤.

٣. ابن‌ماجه: ٤٢٤٧، احمد: ٢٠٤٠٥، ابن‌ابی‌شیبة فی مصنفه: ٩٠/٧، مسلم: ٤٦٧٤ و ترمذی: ٢٤١٩ بلفظ آخر.

٤. هذا دعاء النّبيّﷺ أخرجه: بخاری: ٧٩٠، مسلم: ٤٨٧٦، ترمذی: ٣٣٦٨، ابوداود: ٢٢٣٥، نسائی: ١٢٨٥، ابن‌ماجه: ٣٨٢٥، احمد: ٨ لکن لم نعثر علی جزء الثّانی منه: «غُفِرَتْ ذُنُوبُهُ وَلَوْ ...».

## بەشی دووهەم: دوعا سوننەتەکان

سوننەتە بەم زیکرەوە دوعا دەست پێ بکات: «سُبْحانَ رَبِّيَ الْأَعْلَى الْوَهّابِ[1] لا إِلٰهَ إِلَّا اللّٰهُ وَحْدَهُ لا شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَ لَهُ الْحَمْدُ يُحْيِي وَ يُمِيتُ وَ هُوَ حَيٌّ لا يَمُوتُ وَ هُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ،[2] رَضِيتُ بِاللّٰهِ رَبّاً وَ بِالْإِسْلامِ دِيناً وَ بِمُحَمَّدٍ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَبِيّاً»[3].

پاشان بڵێ: «اَللّٰهُمَّ فاطِرَ السَّمٰواتِ وَ الْأَرْضِ عالِمَ الْغَيْبِ وَالشَّهادَةِ رَبَّ كُلِّ شَيْءٍ وَ مَلِيكِهِ، أَشْهَدُ أَنْ لا إِلٰهَ إِلَّا أَنْتَ، وَ أَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ نَفْسِي وَ مِنْ شَرِّ الشَّيْطانِ الرَّجِيمِ وَ شِرْكِهِ»[4].

پاشان ئەمەش بڵێ: «اَللّٰهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ الْعَفْوَ وَ الْعافِيَةَ في دِينِي وَ أَهْلِي وَ مالِي، اَللّٰهُمَّ اسْتُرْ عَوْراتِي و آمِنْ رَوْعاتِي»[5].

ئەوەش بزانە کە دوعاکان زۆرن، ئەتۆش بە هەرکامیان دڵت زیاتر حەزی دەکرد و دەکرایەوە، ئەوە زیاتر خۆتی پێوە خەریک بکە.

والسلام علىٰ من اتبع الهدىٰ

---

١. احمد: ١٥٩٥١، طبرانی: ٦١٣٠.

٢. مالك فی الموطأ: ٤٣٧، بخاری: ٣٠٥٠، مسلم: ٤٨٥٧، ابوداود: ٤٤١٥، ترمذی: ٣٣٣٦، نسائی: ١٣٢٢، ابن‌ماجه: ٣٧٨٨، احمد: ٤٧٢٠.

٣. مسلم: ٥٧٩، ابوداود: ١٣٠٦، ترمذی: ٣٣١١، نسائی: ٦٧٢، ابن‌ماجه: ٣٨٦٠، احمد: ١٨٢٠١.

٤. ابوداود: ٤٤٠٥، ترمذی: ٣٤٥٢، احمد: ٤٩.

٥. ابوداود: ٤٤١٢، ابن‌ماجه: ٣٨٦١، احمد: ٤٥٥٤.

# بابەتی دەهەم: لەبارەی ویردەکانەوە

پێویستە بزانی کە خوای گەورە زەوینی لە بەردەست بەندەکانیدا دەستەمۆ کردووە؛ تا خانووبەرەی لێ ساز کەن و بژیو و ڕزقی خۆیانی لێ دەربهێنن و خۆیان لە بەڵا و کارەساتەکان بپارێزن، هەروەها دڵنیا بن کە ڕۆیشتنی تەمەن و ژیان هەر وەکوو ڕۆیشتنی کەشتی وایە کە چۆن ئەوانەی سواری بوونە [لە شوێنێکەوە هەڵدەگرێ و لە شوێنیتر دایانئەبەزێنێ].

مرۆڤ لەم دنیایەدا ڕێبوارە و ئەووەڵ جێی دابەزینی ناو بێشکەیە و ئاخرین شوێنی ناو گۆڕە، نیشتمانی هەرمانی، بە هەشتە، یان دۆزەخ. تەمەنی مرۆڤ مەودای ئەم سەفەرەیە و ساڵەکانی ژیانی قۆناغەکانی ئەم سەفەرەیە و مانگەکانی ژیانی فەرسەنگەکانیە و ڕۆژەکانی کیلۆمیترەکانیە و هەناسەکانی هەنگاوەکانیە. تاعەت و عیبادەتی تۆشەی سەفەرەکەیە و کاتیش سەرمایەیە. هەواو هەوەس و شاوەت چەتەو ڕێگری ئەو ڕێگایەن. خێری ئەم سەفەرەش گەیشتن بە خوایە لە بەهەشتدا لەگەڵ ئەوەی ئەبێ بە خاوەن موڵك وماڵێکی گەورە و نیعمەتێکی نەبڕاوە. زەرەری ئەم سەفەرەش دووربوونەوەیە لە خوای گەورە ـ پەنا بە خوا ـ ، لەگەڵ ئەوەی لە چاڵەکانی دۆزەخدا کۆت و زنجیر بکرێن و ئەشکەنجەی سەخت بدرێن. کەوابوو ئەگەر مرۆڤ غافڵ بێ لەخوا ـ هەرچەندەش بە ماوەی ساتێك بێ ـ خۆی تووشی حەسرەت و پەشیمانییێك کردووە کە بڕانەوەی بۆ نییە و زەرەرێکی لە ئەندازە بەدەری تووشی خۆی کردووە.

## بەشی یەکەم: خێری ئەم ویردانە و شێوازو جێ وتنیان

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿إِنَّ لَكَ فِي النَّهَارِ سَبْحاً طَوِيلاً ۝ وَ اذْكُرِ اسْمَ رَبِّكَ وَ تَبَتَّلْ إِلَيْهِ تَبْتِيلاً ۝﴾.[1]

واتە : «ئەتۆ لە ڕۆژدا هاتوچۆی دوور و درێژ دەکەی، ئەدی یادی پەروەردگارت بکەو بەس بۆ ئەو عیبادەت بکە».

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَ اذْكُرِ اسْمَ رَبِّكَ بُكْرَةً وَ أَصِيلاً ۝ وَ مِنَ اللَّيْلِ فَاسْجُدْ لَهُ وَ سَبِّحْهُ لَيْلاً طَوِيلاً ۝﴾.[2]

واتە: «ئێوارە و بەیانی یادی خوا بکەو شەوانە سوژدەی بۆ ببە و بە درێژای شەو تەسبیحاتی بۆ بکە».

ئەگەر ئەتەوێ بۆ هەتاهەتایە بەختەوەر بیت، تەواوی شەو و ڕۆژت بۆ عیبادەتی خوا تەرخان بکە؛ چونکە سەروەری پێغەمبەران حەزرەتی موحەممەدﷺ وێڕای ئەوەی کە خوای گەورە لە هەرچی گوناحی ڕابردوو و داهاتووی خۆش بووە، بەڵام دەستووری پێ درابوو عیبادەت بکات. ئەدی تۆ پێویستترە کە بەردەوام عیبادەتی خوا بکەی و زۆرتر لە مەترسیدا بیت، کەوابوو خۆت زۆر مەخجڵێنە بە کاروباری دونیایەوە، مەگەر بە ئەندازەی پێویست. ئیتر پاشماوەی وەختەکەت لە ڕێی کاروباری پاشەڕۆژدا پڕ بکەرەوە و هۆشت بێ شەونوێژ تەرك نەکەیت؛ چونکە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «لابُدَّ مِنْ قِيَامِ اللَّيلِ وَ لَوْ قَدَرَ حَلْبِ شَاةٍ».[3]

واتە: «بۆ مرۆڤ شەوبێداری پێویستە، هەرچەندەش بە ئەندازەی دۆشینی مەڕێکیش بێت».

پیاوی خوا نابێ بەوەی کە نوێنی خەو ڕابخات، خەو بەسەر خۆیدا بێنێ؛ بەڵکوو پێویستە، خەریکی نوێژخوێندن و زیکرو ویرد بێت تا خەو زۆری بۆ ئەهێنێ.

---

١. المزّمّل: ٧ ـ ٨.

٢. الإنسان: ٢٥ ـ ٢٦.

٣. ابن‌ابی‌شیبة فی مصنفه: ١٧٣/٢، طبرانی فی الکبیر: ٧٨٥ والأوسط: ٤٢٦٤، بیهقی فی شعب الإیمان: ٢٩٤٦.

پێغەمبەرﷺ ئەفەرمێ: «یَعْقُدُ الشَّیْطَانُ عَلَیٰ قَافِیَةِ أَحَدِکُمْ إِذَا هُوَ نَامَ ثَلَاثَ عُقَدٍ یَضْرِبُ مَکَانَ کُلِّ عُقْدَةٍ عَلَیْكَ لَیْلٌ طَوِیلٌ فَارْقُدْ، فَإِنِ اسْتَیقَظَ وَ ذَکَرَ اللهَ تَعَالَیٰ إِنْحَلَّتْ عُقْدَةٌ، فَإِنْ تَوَضَّأَ إِنْحَلَّتْ عُقْدَةٌ، فَإِنْ صَلَّیٰ إِنْحَلَّتْ عُقْدَةٌ، فَأَصْبَحَ نَشِیطاً طَیِّبَ النَّفْسِ وَ إِلَّا أَصْبَحَ خَبِیثَ النَّفْسِ کَسْلَانَ».[1]

واتە: «کاتێ کە مرۆڤی موسڵمان بخەوێ، شەیتان دێتە پشت سەری و سێ گرێ دەدات و هەرکامی لە شوێنی خۆی دادەنێ و [ئەڵێ]: خەوێکی درێژت هەیە، بنوو. جا ئەگەر ئەو کەسە ڕاچڵەکا و یادی خوای کرد، گرێیێك لەو سێ گرێیە دەکرێتەوە، ئەگەر دەسنوێژی گرت ئەوە گرێییێتر دەکرێتەوە، ئەگەریش نوێژ بخوێنێ، ئاخر گرێیەکە دەکرێتەوە، [ئەگەر شەو ئەم کارە بکات] ئەوە بەیانی بە گەشی و خۆشحاڵییەوە هەڵدەستێ بەڵام ئەگەر ئاوەها نەکات ئەوە بە دڵناخۆشی و تەنبەڵییەوە ڕۆژ دەکاتەوە».

لە حەدیسدا هاتووە کە لەلای پێغەمبەرەوەﷺ باسی پیاوێك کرا کە شەو تا بەیان نوستووە، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: «ذٰاكَ بٰالَ الشَّیْطٰانُ فِي أُذُنِهِ»[2] واتە: «ئەوە شەیتان مێزی کردۆتە گوێیی».

پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «رَکْعَتٰانِ یَرْکَعُهُمَا الْعَبْدُ فِي جَوْفِ اللَّیْلِ خَیْرٌ لَهُ مِنَ الدُّنْیٰا وَ مٰا فِیهٰا، وَ لَوْلَا أَنِّي أَشُقُّ عَلَیٰ أُمَّتِي لَفَرَضْتُهُمٰا عَلَیْهِمْ»[3].

واتە: «دوو ڕەکعەت کە عەبدێ لە نیوەی شەودا بیخوێنێ، چاکترە لە دنیا و هەرچی کە لە دنیادایە، ئەگەر لەبەر ئەوە نەبوایە کە لەسەر ئوممەتم سەختم ئەکردەوە، لەسەریانم فەرز ئەکرد».

## باسی شەو و ڕۆژە پیرۆزەکان:

باسی ڕۆژە پیرۆزەکان ڕابورد؛ بەڵام ئەو شەوانە کە پیرۆزن [و خێری عیبادەتیان زۆرە] پازدە شەون کە بریتین لە: پێنج شەوەی تاقی ئاخری ڕەمەزان و شەوی حەقدەی ڕەمەزان،

١. بخاری: ١٠٧٤ ـ ٣٠٢٩، مسلم: ١٢٩٥، مالك فی الموطأ: ٣٨٣، ابوداود: ١١١١، ابن‌ماجه: ١٣١٩، احمد: ٧٠٠٧، نسائی: ١٥٨٩.

٢. بخاری: ١٠٧٦ ـ ٣٣٠، مسلم: ١٢٩٣، احمد: ٣٨٥٣، نسائی: ١٥٩٠.

٣. جامع الکبیر للسیوطی: ١٢٩٣٠، کنزالعمال للهندی: ٢١٤٣٥.

کە لە بەیانی ئەو شەوەدا جەنگی بەدر ڕووی داوە و [خوای گەورە لەبارەیەوە فەرموویە]: ﴿يَوْمَ الْفُرْقَانِ يَوْمَ الْتَقَى الْجَمْعَانِ﴾[1] واتە: «ڕۆژی جیابوونەوەی دوو گرووپی موسڵمان و کافر لە یەکتر، ڕۆژێ کە ئەو دوو گرووپە تووشیاری یەکبوون و پێکەوە جەنگیان کرد».

شەوەکانیتر بریتین لە: ئەووەڵ شەوی مانگی «موحەڕڕەم»، شەوی عاشوورا، ئەووەڵ شەوی مانگی «ڕەجەب»، شەوی پازدەی مانگی ڕەجەب، شەوی بیست و حەوتی ڕەجەب کە شەوی میعراجە و نوێژی سوننەتی تایبەتی خۆی هەیە؛ پێغەمبەرﷺ لەبارەیەوە فەرموویەتی:

«لِلْعٰامِلِ فِي هٰذِهِ اللَّيْلَةِ حَسَنٰاتُ مِائَةِ سَنَةٍ فَمَنْ صَلَّىٰ فِيهَا اثْنَتَيْ عَشْرَةَ رَكْعَةً يَقْرَأُ فِي كُلِّ رَكْعَةٍ فٰاتِحَةَ الْكِتٰابِ وَ سُورَةً مِنَ الْقُرْآنِ و يَتَشَهَّدُ في كُلِّ رَكْعَتَيْنِ وَيُسَلِّمُ فِي آخِرِهِنَّ ثُمَّ يَقُولُ: سُبْحٰانَ اللهِ وَ الْحَمْدُ لِلّٰهِ وَلا إِلٰهَ إِلَّا اللهُ وَ اللهُ أَكْبَرُ مِائَةَ مَرَّةٍ، ثُمَّ يَسْتَغْفِرُ اللّٰهَ مِائَةَ مَرَّةٍ، يُصَلِّي عَلَى النَّبِيِّ مِائَةَ مَرَّةٍ وَ يَدْعُو لِنَفْسِهِ مٰاشٰاءَ مِنْ أَمْرِ دُنْيٰاهُ وَ آخِرَتِهِ وَ يُصْبِحُ صٰائِماً، فَإِنَّ اللّٰهَ يَسْتَجِيبُ دُعٰاءَهُ كُلَّهُ إِلَّا أَنْ يَدْعُوَ في مَعْصِيَةٍ»[2]

واتە: «هەرکەس لەم شەوەدا خۆی بە عیبادەتەوە خەریك بکات، خێری سەد ساڵی بۆ ئەنووسرێ، هەرکەس لەم شەوەدا دوازدە ڕەکعەت نوێژ بخوێنێ و لە هەر ڕەکعەتێکدا، ئەلحەمد و سوورەتێتر لە قورئان بخوێنێ و لە هەر دوو ڕەکعەتدا، تەحیاتێ بخوێنێ و لە ڕەکعەتی ئاخردا سڵاو بداتەوە و پاشان سەد جار بڵێ: «سُبْحٰانَ اللهِ وَ الْحَمْدُ لِلّٰهِ وَلا إِلٰهَ إِلَّا اللّٰهُ وَ اللهُ أَكْبَرُ» و سەدجار «أَسْتَغْفِرُ اللهُ» بکات و سەدجار سەڵوات لەسەر پێغەمبەرﷺ بدات و بۆ خۆی و بۆ هەرکەس کە حەز بکات دوعای بەخێری دونیا و ئاخرەت بکات و بەیانی ئەو شەوە بەڕۆژوو بێت. جا ئەگەر ئاوەهای کرد ئەوە خوا هەموو دوعاکەی لێ قەبووڵ ئەکا، مەگەر ئەو دوعایەی کە بۆ کارێکی ناشەرعی بێت».

یەکێتر لەو شەوانە، شەوی نیوەی شەعبانە، لەو شەوەدا سەد ڕەکعەت نوێژ سوننەتە، لە هەر ڕەکعەتێکدا، کەڕەتێ ئەلحەمد و دە کەڕەت سوورەتی «ئیخلاس» بخوێنێ.

١. الأنفال: ٤١.

٢. بيهقي في شعب الإيمان: ٣٥٣١، كنز العمال للهندي: ٣٥١٧٠، جامع الكبير للسيوطي: ١٧١. و لم يذكروا فيه لفظ: «ق والقرآن المجيد».

شەوانی دوو جێژنی قوربان و ڕەمەزان، یەکێکی تر لەو شەوانەن کە بە تایبەتی شەوبێدارییان تێدا سوننەتە، پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «مَنْ أَحْيَا لَيْلَتَيِ الْعِيدَيْنِ لَمْ يَمُتْ قَلْبُهُ يَوْمَ تَمُوتُ الْقُلُوبُ»[1].

واتە: «هەرکەس شەوانی هەردوو جێژن خەوەربێت و خەریکی عیبادەت بێ، لەو ڕۆژەدا وا دڵەکان ئەمرن، دڵی ئەو نامرێ».

یەکێ تر لەو شەوانە شەوی ئاخیری «زیلحەججەیە»، کە خێری زۆری تێدا هەیە.

**بەم شێوە چارەکی باسی عیبادەت تەواو بوو،**

**بە شوێنیدا باسی چارەکی عادەت دێت.**

---

١. ابن‌ماجە: ١٧٧٢، طبرانی فی الأوسط: ١٦٣ بلفظ: «مَنْ صَلَّىٰ لَيْلَةَ الْفِطْرِ وَالْأَضْحَىٰ ...»، بیهقی فی شعب الإیمان: ٣٤٣٨.

# بابەتی یازدەهەم:
# لەبارەی ئاداب و شێوازی خواردن و خواردنەوەدا

[پێویستە پێش ئەوەی دەست بکرێ بە خواردن چەند خاڵێك لەبەرچاو بگیرێ:]

[خاڵی یەکەم:] وێڕای ئەوەی ئەبێ خۆراکەکەی حەڵاڵ بێت، پێویستە بەو نیەتەوە نان بخوات کە هێزو گوڕی تێ بێت بۆ عیبادەتکردن. خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿يَا أَيُّهَا الرُّسُلُ كُلُوا مِنَ الطَّيِّبَاتِ وَاعْمَلُوا صَالِحاً﴾.[1]

واتە: «ئەی پێغەمبەران! لە خۆراك و نانی حەڵاڵ بخۆن و کاری شیاو و چاکە ئەنجام بدەن».

[خاڵی دووهەم:] ئەگەر لەبەر عیبادەتی خودا نان ئەخۆی، وا شیاوە دەست بشۆری؛ چونکە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «الْوُضُوءُ قَبْلَ الطَّعَامِ يَنْفِي الْفَقْرَ وَ بَعْدَهُ يَنْفِي اللَّمَمَ»[2] واتە: «دەسنوێژگرتن پێش نانخواردن، بەری هەژاری ئەگرێت و دوای نانخواردن گوناحانی بچووك لەناو ئەبات».

[خاڵی سێهەم:] باشتر وایە [بە دانیشتنەوە] لەسەر سفرە نان بخورێ؛ چونکە ئەمە بە سوننەتی پێغەمبەرەوەﷺ نزیکترە. پێغەمبەرﷺ کاتێ نانیان بۆی ئەهێنا، لەسەر زەوینی دائەنا؛ چونکە ئەو شێوە نەفسشکێنی تێدا هەیە.

---

١. المؤمنون: ٥١.

٢. مسند الشهاب القضاعي: ٣٠٠، طبراني فی الأوسط: ٧٣٧٠، باللفظ. و فی روايات أخرى بلفظ: «بَرَكَةُ الطَّعَامِ الْوُضُوءُ قَبْلَهُ وَ بَعْدَهُ» ابوداود: ٣٢٦٩، ترمذی: ١٧٦٩، حاكم فی المستدرك: ٧١٨٢، بيهقی فی شعب الإيمان: ٥٤٢١.

پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «لا آكُلُ مُتَّكِئاً[1] إِنَّما أَنَا عَبْدٌ، آكُلُ كَما يَأْكُلُ الْعَبْدُ[2] وَ أَشرَبُ كَما يَشْرَبُ الْعَبدُ».[3]

واتە: «ئەمن شان نادەم بەسەر شتێکدا و نان بخۆم، بەڵکوو من بەندەم و بەشێوەیەك کە بەندە نان ئەخوات و ئاو ئەخواتەوە، منیش ئەخۆم و ئەخۆمەوە».

ئەڵێن؛ چوار شت دوای پێغەمبەرﷺ داهێنران و لە زەمانی ئەودا نەبوون:

١. سفرە؛

٢. بێژنگ؛

٣. "أُشنان" ئەو گیایەی کە بۆ شوشتن کەڵکیان لێوەرگرتووە؛

٤. زۆر خواردن.

[تێبینی:] پێویستە ئەوە بڵێین: کە نانخواردن بە سەر سفرەوە لە لایەن شەرعەوە هیچ مەنعی لەسەر نییە؛ چونکە وا نییە کە هەر شتێ کە تازە داهاتبێت، ئەنجامدانی مەنعی هەبێت.

[خاڵی چوارەم:] پێویستە بەڕێکوپێکی، هەر لە ئەووەڵەوە لەسەر سفرەوە دابنیشێ و تا تەواو ئەبێت لە خواردن بەو شێوە بەردەوام بێت، چونکە پێغەمبەر ئاوەهای ئەکرد.

هەندێ جار بە سەر دوو چۆکەوە دادەنیشت و پشتی پێی لە زەویدا بوو و هەندێ جاریش پێی ڕاستی دائەناو لەسەر پێی چەپی دائەنیشت.

[خاڵی پێنجەم:] خواردن و خواردنەوە لە سەر لا شان و بەپاڵکەوتنانەوە ناپەسەندە، مەگەر بۆ کەسێ سەخت بێ بۆی، لەبەر نەخۆشی وا دابنیشێ.

[خاڵی شەشەم:] هەر لە سەرەتاوە نیەتی ئەوەی هەبێت کە کەم بخوات و کەم بخواتەوە؛ چونکە ئەگەر وەها نەکات لەوەدا کە ئەڵێ بە نیەتی عیبادەتەوە نان ئەخۆم، درۆ ئەکا.

پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «ما مَلَأَ آدَمِ وِعاءً شَرّاً مِنْ بَطْنِهِ، حَسْبُ ابْنِ آدَمَ لُقَيْماتٌ يُقِمْنَ صُلْبَهُ، فَإِنْ لَمْ يَفْعَلْ فَثُلُثٌ لِطَعامٍ وَ ثُلُثٌ لِشَرابٍ وَ ثُلُثٌ لِلنَّفَسِ»[4].

١. بخاری: ٤٩٧٩، ابوداود: ٣٢٧٧، ابن‌ماجه: ٣٢٥٣، احمد: ١٨٠٠٥، دارمی فی سننه: ٢١٢٣.

٢. بيهقی فی شعب الإيمان: ٥٥٧٢، عبدالرّزّاق فی مصنفه: ١٩٥٤٣، ابی‌يعلی الموصلی فی مسنده: ٤٧٩٥.

٣. ابن‌ابی‌شيبة فی مسنده: ٩٦٣، جامع الكبير لسيوطی: ٢٣، كنز العمال للهندی: ٤٠٧٠٨.

٤. نسائی فی سنن الكبری: ٦٧٦٩، ترمذی: ٢٣٠٢، ابن‌ماجه: ٣٣٤٠، احمد: ١٦٥٥٦، بيهقی فی شعب الإيمان: ٥٢٦١.

واتە: «مرۆڤ هیچ کاسەیێ خراپتر لە سکی خۆی پڕ نەکردووە، بۆ بنیادەم بەسە چەند پارووییێك کە لەسەر پێی ڕاوەستێنن ئەگەریش وەها ناکات [با ورگی دابەش بکات، بەم شێوە:] سێیەکی بۆ نانخواردن سێیەکی بۆ ئاوخواردن، سێیەکی بۆ هەوا و هەناسەکێشان.

[خاڵی حەوتەم:] ئەبێ تا برسی نەبێت، نەیێتە سەرنان؛ چونکە تێری لەسەرتێری دڵ ڕەقی ئەهێنێ [وێڕای ئەوەی تووشی نەخۆشینی ئەکات]. پێش ئەوەی تێر بێت، دەس ڕاگرێ و چاوەڕوانی ئەوە نەبێت نان و پێخۆری بە تام و خۆش بخوات؛ چونکە پیت و بەرەکەتی نان بەوەوەیە کە چاوەڕوانی پێخۆر نەبێت.

[خاڵی هەشتەم:] پێویستە تێ‌بکۆشێ دەستی زۆر کەس بەسەر سفرەکەیەوە بێت، هەرچەندەش لە خێزان و خزم و کەسی خۆی بێت؛ چونکە باشترین نان، ئەو نانەیە دەستی زۆری بەسەرەوە بێت.[1]

ئەنەس رَضِيَ اللهُ عَنْهُ ئەفەرمێ: پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، بە تەنیا نانی نەئەخوارد.

## بەشی یەکەم: شێوازی خواردن و خواردنەوە [لە ڕوانگەی شەرعەوە]

### یەکەم: شێوازی نانخواردن:

١. سوننەتە لە سەرەتاوە بەنێوی خوا دەست بکا بە نانخواردن[2] و لە ئاخرەوە بە «اَلحمدلله» دوایی پێ‌بهێنێ. جوان وایە کە بڵێ: «بسم الله» لەگەڵ هەموو پاروەوە نانێکدا، تا نەوسی لە یادی خوا غافڵی نەکات. لە پارووی ئەووەڵدا بڵێ: «بسم الله»، لە پارووی دووهەمدا بڵێ: «بسم الله الرحمن» لە پارووی سێهەمدا بڵێ: «بِسْمِ اللهِ الرَّحْمٰنِ الرَّحِيمِ» با بە دەنگی بەرز بیڵێت، تا ئەوانەش کە بە دەور و بەریدان بێتەوە بیریان.[3]

---

١. «كُلُوا جَمِيعاً وَلا تَفَرَّقُوا فَإِنَّ الْبَرَكَةَ مَعَ الْجَمٰاعَةِ» ابن‌ماجه: ٣٢٧٨، طبرانی فی الكبير: ٥٨٢، و فی رواية: «أَحَبُّ الطَّعامِ إِلَى اللهِ مٰا كَثُرَتْ عَلَيْهِ الْأَيْدىٰ»، طبرانی فی الأوسط: ٧٥٢٨، ابی‌یعلی الموصلی فی مسنده: ١٩٩٤، السيوطی فی جامع الكبير: ٦٩٤، بيهقی فی شعب الإيمان: ٩١٧٣ و فی رواية: «طَعٰامُ الْوٰاحِدِ يَكْفِي الْإِثْنَيْنِ وَ طَعٰامُ الْإِثْنَيْنِ يَكْفِي الْأَرْبَعَةِ وَ طَعٰامُ الْأَرْبَعَةِ يَكْفِي الثَّمٰانِيَةَ» مسلم: ٣٨٣٦، بخاری: ٤٩٧٣، ترمذی: ١٧٤٣، ابن‌ماجه: ٣٢٤٥، احمد: ١٣٧٠٦.

٢. بخاری/٤٩٥٩ ـ ٤٩٥٧، احمد/١٥٧٤٥، نسائی/٤٣٦٠، ابوداود/٢٤٤٦.

٣. قال صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: «مٰازٰالَ الشَّيْطٰانُ يَأْكُلُ مَعَهُ، فَلَمّٰا ذَكَرَ اسْمَ اللهِ عَزَّوَجَلَ اسْتَقٰاءَ مٰا فِي بَطْنِهِ» ابوداود: ٣٢٧٦، احمد: ١٨١٩٥، نسائی فی سنن الكبرى: ١٠١١٣، طبرانی فی الكبير: ٨٥١.

٢. به دەستی ڕاست نان بخوات[١]، لەپێش و پاشی نانخواردنەوە، تۆزێ خوێ بخوات. پارووی بچووك بنێ و جوان بیجاوێ. تا پارووێکی تەواو نەکردووە دەست درێژ نەکاتەوە بۆ پارووێکی‌تر. نابێ خراپی نان و پێخۆر بڵێ. پێغەمبەرﷺ قەت خراپەی بە نان و پێخۆر نەدەگوت؛ ئەگەر بەدڵی بوایت ئەیخوارد، ئەگەریش نا، بەجێی ئەهێشت.[٢]

٣. ئەبێ لەو پێخۆرەی کە لە بەردەمیدایە بخوات[٣]؛ بەڵام بۆ میوە پێویست ناکات بەس لەوەی لەبەردەمیدایە بخوات؛ چونکە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «كُلْ مِمَّا يَلِيكَ» واتە: «لەوەی بەردەمتە بخۆ» بەڵام کاتێ میوەی ئەخوارد دەستی بەسەر هەموو میوەکەدا ئەگێڕا. گوتیان بە پێغەمبەرﷺ لەو بارەوە [کە چلۆن وەها دەکات؟]، فەرمووی: «لَيْسَ هُوَ نَوْعاً وٰاحِداً»[٤] واتە: «چونکە میوە یەك جۆر نییە».

٤. نابێ لەسەر کڵاوەی پێخۆرەکە بخوات[٥] و نانەکە لە ناوەڕاستەوە هەڵبێنێ؛ بەڵکوو لە لاوە پێخۆر بکێشێ و کولێرە و نانیش لەلاوە لەت بکات. نابێ نە نان نە گۆشت [لە کاتی خواردندا] بە چەقۆ لەت بکات؛ چونکە پێغەمبەرﷺ مەنعی کردووە و فەرموویەتی: «اِنْهِشُوا نَهْشاً»[٦] واتە: «[نان و گۆشت و...] بە قەپ لەت بکەن» نابێ کاسەو کەلوپەل لەسەر نان دابنرێ، مەگەر شتێ دابنێ کە بە نانەکەوە بیخوات.

پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «أَكْرِمُوا الْخُبْزَ[٧] فَإِنَّ اللّٰهَ تَعٰالَىٰ أَنْزَلَهُ مِنْ بَرَكٰاتِ السَّمٰاءِ»[٨].

---

١. بخاری: ٤٩٥٧، مسلم: ٣٧٦٦، ابوداود: ٣٢٨٤، ترمذی: ١٧٨٠، ابن‌ماجه: ٣٢٥٨، احمد: ١٥٧٣٨.

٢. «مٰا عٰابَ النَّبِيُّﷺ طَعٰاماً قَطُّ إِنِ اشْتَهٰاهُ أَكَلَهُ وَ إِلّٰا تَرَكَهُ»، بخاری: ٣٢٩٩ ـ ٤٩٨٩، مسلم: ٣٨٤٤، ابوداود: ٣٢٧١، ترمذی: ١٩٥٤، ابن‌ماجه: ٣٢٥٠، احمد: ٩٧٥٧.

٣. بخاری: ٤٩٥٧، مسلم: ٣٧٦٧، ابوداود: ٣٢٨٤، ترمذی: ١٧٨٠، ابن‌ماجه: ٣٢٦٤، احمد: ١٥٧٣٩.

٤. ترمذی: ١٧٧١، ابن‌ماجه: ٣٢٦٥، بلفظ: «فَإِنَّهُ غَيْرُ لَوْنٍ وٰاحِدٍ».

٥. ترمذی: ١٧٢٧، ابن‌ماجه: ٣٢٦٨، احمد: ٣٠٤٥. جمیعهم بروایات مختلفة، قالﷺ: «الْبَرَكَةُ تَنْزِلُ وَسَطَ الطَّعٰامِ فَكُلُوا مِنْ حٰافَتَيْهِ وَلا تَأْكُلُوا مِنْ وَسَطِهِ».

٦. ابوداود: ٣٢٨٥، بلفظ: «لا تَقْطَعُوا اللَّحْمَ بِالسِّكِّينَ فَإِنَّهُ مِنْ صَنِيعِ الْأَعٰاجِمِ وَانْهَسُوهُ فَإِنَّهُ أَهْنَأُ وَ أَمْرَأُ»، بیهقی فی شعب الإیمان: ٥٥٠٦، طبرانی فی الکبیر: ٧١٨٠ ـ ١٩١١٨ بلفظ: «لا تَقْطَعُوا الْخُبْزَ بِالسِّكِّينَ كَمٰا تَقْطَعُهُ الْأَعٰاجِمُ ... وَ لٰكِنْ لِيَأْخُذْهُ بِيَدِهِ فَلْيَنْهَشْهُ بِفِيهِ»، نسائی: ٢٢١١ بلفظ: «وَ لٰكِنْ انْهَسُوا نَهْساً».

٧. طبرانی فی الکبیر: ١٨٢٨٤ بلفظ: «أَكْرِمُوا الْخُبْزَ فَإِنَّ اللّٰهَ أَكْرَمَهُ، فَمَنْ أَكْرَمَ الْخُبْزَ أَكْرَمَهُ اللّٰهُ»، بیهقی فی شعب الإیمان: ٥٤٨١، حاکم فی المستدرك: ٧٢٤٥ بلفظ أخری.

٨. جامع الکبیر للسیوطی: ٨٨، مجمع الزوائد للیهثمی: ٢٥١/٢، کنز العمال للهندی: ٤٠٧٧٦ ـ ٤٠٧٧٧.

واتە: «ڕێزی نان بگرن؛ چونکە خوای گەورە نانی لە خێر و بەرەکاتی ئاسمانەوە، هێناوەتە خوار». مرۆڤ نابێ دەست و پلی بە نان پاك بکاتەوە.

پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «إِذا وَقَعَتْ لُقْمَةُ أَحَدِكُمْ فَلْيَأْخُذْها وَلْيُمِطْ ما كانَ بِها مِنْ أذىً وَلا يَدَعْها لِلشَّيْطانِ وَلْيَلْعَقْ أَصابِعَهُ»[1]

واتە: هەرکاتێ کەسێکتان پارووە نانی لە دەم داکەوت، با هەڵی بگرێ و ئەوەی وا پیس بووە، لێ بکاتەوە و بەجێی نەهێڵێ بۆ شەیتان، پاشان پەنجەکانی بلێسێتەوە».

نابێ فوو بکا لە خۆراکی گەرم؛ چونکە پێغەمبەرﷺ قەدەغەی فەرمووە.[2]

٥ـ ئەگەر خۆراکەکەی خورما بوو با بە تاق، تاق لێ بخوات[3] [واتە: یان پازدە یان هەڤدە...] نابێ ناوکی خورماکە بخاتەوە نێو ئەو کاسەیەکە خورماکەی تێدایە.

## دووهەم: شێوازی خواردنەوە:

لەکاتی خواردنەوەی ئاودا با گۆزەکە [یان لیوانەکە] بە دەستی ڕاست هەڵبگرێت و بڵێ: «بسم الله» پاشان وردە وردە هەڵی لووشێت و بە یەکجار هەڵی نەقۆڕێنێ؛ چونکە جگەرئێشە لە بە یەك بین ئاو هەڵقوڕانەوە دێ.[4]

جا سوننەتە پاش ئاو خواردنەکە بڵێ: «اَلْحَمْدُ لِلّٰهِ الَّذِي جَعَلَهُ عَذْباً فُراتاً بِرَحْمَتِهِ وَ لَمْ يَجْعَلْهُ مِلْحاً أُجاجاً بِذُنُوبِنا».[5]

---

١. مسلم: ٣٧٩٣ ـ ٣٧٩٤، ترمذی: ١٧٢٥، احمد: ١٢٣٥٠ ـ ١٣٥٧٥، و فی روایة: «كانَﷺ يَلْعَقُ أَصابِعَهُ الثَّلاثَ مِنَ الطَّعامِ» مسلم: ٣٧٨٩، احمد: ١٥٢٠٧، و فی روایة: «إِنَّكُمْ لا تَدْرُونَ فِي أَيِّ طَعامِكُمُ الْبَرَكَةُ» احمد: ١٢٣٥٠، مسلم: ٣٧٩٥، ترمذی: ١٧٢٥.

٢. «نَهىٰ رَسُولُ اللّٰهِﷺ أَنْ يَتَنَفَّسَ فِي الْإِناءِ أَوْ يُنْفَخَ فِيهِ» ابوداود: ٣٢٤٠، ترمذی: ١٨٠٩، ابن‌ماجه: ٣٤٢٠، احمد: ١٠٨٤٩، مالك فی الموطأ: ١٤٤٥ بلفظ: «نَهىٰ عَنِ النَّفْخِ فِي الشَّرابِ».

٣. بخاری: ٩٠٠، احمد: ١٢٩٤٥، ابن‌حبان فی صحیحه: ٢٨٧١، بیهقی فی شعب الإیمان: ٣٤٤٨، حاکم فی المستدرك: ١٠٤٠، طبرانی فی الأوسط: ٥١٧١، بلفظ: «... أَكَلَ ثَلاثاً ... أَوْ خَمْساً ... فَإِذا أَرادَ أَنْ يَزْدادَ أَكَلَ وِتْراً»

٤. «إِذا شَرِبَ أَحَدُكُمْ فَلْيَمُصَّ مَصّاً وَلا يَعُبُّ عَبّاً فَإِنَّ الْكُبادَ مِنَ الْعَبِّ»، سنن الکبری للبهقی: ٢٨٤/٧ و فی شعب الإیمان: ٥٦١٠، مصنف عبدالرّزاق: ١٩٥٩٤، جامع الکبیر للسیوطی: ٢١٨٧ ـ ٢١٩٣. و فی روایة: «أَنَّ رَسُولَ اللّٰهِﷺ نَهىٰ عَنِ الشُّرْبِ قائِماً» مسلم: ٣٧٧١ ـ ٣٧٧٤، ابوداود: ٣٢٢٩، ترمذی: ١٨٠١، ابن‌ماجه: ٣٤١٥، احمد: ١٢٤٠٦.

٥. طبرانی فی الدّعاء: ٨٢٥، الفتح الکبیر للسیوطی: ٩١٢٩، کنز العمال للهندی: ١٨٢٢٦، حلیة الاولیاء لأبی‌نعیم الأصبهانی: ٤١٦/٣، فیض القدیر للمناوی شرح جامع الصغیر للسیوطی: ٦٧٢٨.

واته: «سەناو ستایش بۆ ئەو خوایەی کە ئەم ئاوەی بە ڕەحمەت و بەرەکەتی خۆی، خۆش و شیرین کردووە و بە هۆی گوناحانی ئێمەوە تاڵ و سوێری نەکردووە».

سوننەتە هەروەختێ ئاو بۆ خەڵك دەگێڕێ، لە دەستی ڕاستەوە دەست پێ بکات.

هەروەها سوننەتە بەسێ پشوو ئاو بخورێتەوە[1] لە ئەووەڵین پشوودا: «بِسْمِ اللّٰهِ الرَّحْمٰنِ الرَّحِيمِ» و لە ئاخرەوە: «الحمد لله» بڵێ.

## [سوننەتەکانی پاش نانخواردن]:

١. سوننەتە هەر کاتێ دەستی لە نانخواردن کێشایەوە، وردە نان و هەرچی لە خۆراکەکە، کە وەریوە کۆی بکاتەوە، پاشان بن ددانەکانی پاك بکاتەوە. ئەڵێن: هەرکەس کاسە بلێسیتەوە و ئاوەکەشی بخواتەوە [واتە: نەهێڵێ هیچی لەکیس بچێ] ئەوە، خێری ئازادکردنی بەردەییێکی دەس ئەکەوێ.[2]

٢. سوننەتە پاش نانخواردن بڵێ: «اَلْحَمْدُ لِلّٰهِ الَّذِي بِنِعْمَتِهِ تَتِمُّ الصّٰالِحٰاتُ[3] وَ تَنْزِلُ الْبَرَكٰاتُ، اَللّٰهُمَّ لا تَجْعَلْهُ قُوَّةً عَلَىٰ مَعْصِيَتِكَ».

واته: «سەناو ستایش بۆ ئەو خوایەی کە بە هۆی نیعمەتەکانیەوە کاری چاك بە ئەنجام ئەگات و بەرەکەت دێتە خوار. خوایە! ئەم نانە نەکەیتە هێزێك لە جەستەماندا بۆ ئەنجامدانی گوناح و بێئەمری خۆت». پاشان سوورەتی «الإخلاص» و «قریش» بخوێنێ.

٣. سوننەتە لەسەر نانەکەوە هەڵنەستێ تا سفرەکە کۆ دەکرێتەوە.[4] هەروەها سوونەتە ـ ئەگەر نانەکە هی کەسێتر بوو ـ دوعای بە خێری بۆ بکات و بڵێ: «أَكَلَ طَعٰامَكُمُ الْأَبْرٰارُ وَ أَفْطَرَ عِنْدَكُمُ الصّٰائِمُونَ وَ صَلَّتْ عَلَيْكُمُ الْمَلائِكَةُ»[5].

---

١. «كٰانَ يَتَنَفَّسُ فِي الْإِنٰاءِ ثَلاثاً» و في رواية: «كٰانَ يَتَنَفَّسُ في الشَّرٰابِ ثَلاثاً وَ يَقُولُ: إِنَّهُ أَرْوىٰ وَ أَبْرَأُ وَ أَمْرَأُ»، مسلم: ٣٧٨١ ـ ٣٧٨٢، بخاری: ٥٢٠٠، ترمذی: ١٨٠٥، ابن‌ماجه: ٣٤٠٧، احمد: ١١٧٤١.

٢. احمد: ٢٥٤٠، بیهقی فی السنن: ٦٧٦٧، ابن‌حبان فی صحیحه: ٥٣٤٣، بیهقی فی شعب الإیمان: ٥٤٦٨، و فی روایة: «مَنْ لَعَقَ الصَّفْحَةَ وَ لَعَقَ أَصٰابِعَهُ أَشْبَعَهُ اللّٰهُ فِي الدُّنْيٰا وَالْآخِرَةِ» طبرانی فی الکبیر: ١٥٠٥٦، کنز العمال للهندی: ٤٠٧٩٠، مجمع الزّوائد للهیثمی: ٢٤٧/٢.

٣. ابن‌ماجه: ٣٧٩٣، حاکم فی المستدرك: ١٧٩٤، طبرانی فی الأوسط: ٦٨٥٢، بزّارفی مسنده: ٥٣٣، بیهقی فی شعب الإیمان: ٤٠٦٥.

٤. «... فَلا يَقُومُ رَجُلٌ حَتّٰى تُرْفَعَ الْمٰائِدَةُ ...»، ابن‌ماجه: ٣٢٨٥ ـ ٣٢٨٦، بیهقی فی شعب الإیمان: ٥٦٥٠، طبرانی فی مسند الشّامیّین: ٣٤٣٢.

٥. احمد: ١١٩٥٧، نسائی فی سنن الکبری: ٦٩٠١.

واتە: «[لەخوا داوا ئەکەم] پیاوچاکان نانتان بخۆن و ڕۆژووەوانان بەلاتانەوە ڕۆژوو بشکێنن و فریشتەکان داوای ڕەحمەتتان بۆ بکەن».

٤. سوننەتە پاش نانخواردن ئەم دوعایە بخوێنێ: «اَلْحَمْدُ لِلّٰهِ الَّذِي أَطْعَمَنٰا وَ سَقٰانٰا وَ كَفٰانٰا وَ آوٰانٰا سَيِّدَنٰا وَ مَوْلاٰنٰا»[1]

واتە: «سەناو ستایش بۆ خوایێ نان و ئاو و شوێنی حەسانەوەی داوە پێمان و خوامان بەسە. ئەی سەروەر و گەورەمان!».

سوننەتە لە ئاخرەوە دەست و پلی بشوات.

## بەشی دووهەم: ڕێ و ڕەسم و شێوازی بە کۆمەڵ نانخواردن

سوننەتە ئەگەر کەسێ لەناو کۆمەڵدا نانی خوارد [ئەم خاڵانەی خوارەوە لە بەرچاو بگرێ]:

١ـ نابێ دەس بۆ خواردنەکە ببات تا ئەوانەی کە لە ئەو گەورەترن دەستی بۆ ئەبەن، مەگەر لە شوێنێکدا بێت خۆی لە هەموو گەورەتر بێت و ئەوان بەتەمای دەسپێکردنی ئەم بن.

٢ـ سوونەتە پێکەوە قسەیەك بکەن کە خێری هاتێدا.

٣ـ لەگەڵ هاو بەشەکەیدا بە هێمنی بجووڵێتەوە و سوێند لەسەر خواردنەکە نەخۆن. حەزرەتی حەسەنی کوڕی عەلی رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا فەرموویەتی: «اَلطَّعٰامُ أَهْوَنُ مِنْ أَنْ يُحْلَفَ عَلَيْهِ» واتە: «خواردەمەن کەم بایەختر لەوەیە سوێندی لەسەر بخورێ». بەڵام ئەوە قەیدی نییە کە سێ جار بە هاوبەشەکەی بڵێ: بخۆ.

٤. ئەگەر کەسێ تەشتێ ئاوی هێنایە بەردەست، سوننەتە نەیداتەوە بە ملیدا و دەستی تێدا بشۆرێ.

ئەگێڕنەوە: «ئەنەسی کوڕی مالیك» و «سابیتی بەنانی» پێکەوە دانیشتبوون، ئەنەس رَضِيَ اللهُ عَنْهُ تەشتێ ئاوی هێنایە بەردەستی تا دەستی تێدا بشوات، ئەو گلی نەدایەوە، ئەنەس رَضِيَ اللهُ عَنْهُ فەرمووی:

«إِذٰا أَكْرَمَكَ أَخُوكَ فَاقْبِلْ كَرٰامَتَهُ وَلا تَرُدَّهٰا؛ فَإِنَّمٰا يُكْرِمُ اللهَ تَعٰالَىٰ»[2].

---

١. بخاری: ٥٠٣٨ بلفظ: «غَيْرَ مَكْفِيٍّ وَلا مَكْفُورٍ»، مسلم: ٤٨٩٠، ابوداود: ٤٣٩٤، ترمذی: ٣٣١٨، احمد: ١٢٠٩٤ جمیعهم بلفظ: «اَلْحَمْدُ لِلّٰهِ الَّذِي أَطْعَمَنٰا وَ سَقٰانٰا وَ كَفٰانٰا وَ آوٰانٰا فَكَمْ مِمَّنْ لا كٰافِيَ لَهُ وَلا مُؤْوِيَ».

٢. قال صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: «مَنْ أَكْرَمَ امْرَأً مُسْلِماً أَوْ أَخٰاهُ الْمُسْلِمِ فَإِنَّمٰا يُكْرِمُ اللهَ» طبرانی فی الأوسط: ٨٨٨٥، سیوطی فی جامع الکبیر/٤١٨٤.

واتە: «ئەگەر براکەت ڕێزی لێ گرتی ئەوە لێی قەبووڵ بکەو مەیدەرەوە بە سەریدا؛ چونکە بەمە ڕێزی لە خوا گرتووە».

هیچ خراپییەك لەوەدا نییە ئەگەر چەند نەفەر پێکەوە لەناو تەشتێکدا دەس بشۆن و سوننەتە ئەو ئاوەی کە ئەیکەن بە دەستیانا، ئەگەر جێی هەبێ، لەنێو تەشتێکدا کۆی بکەنەوە؛ پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فەرموویەتی: «اِجْمَعُوا وَضُوءَكُمْ، جَمَعَ اللهُ شَمْلَكُمْ»[1].

واتە: «ئاوی دەستشۆردنەکانتان کۆ بکەنەوە، خوا [دووبەرەکی لەناوتان هەڵدەگرێ و] کۆتان ئەکاتەوە».

٥. هەروەها وا جوانە خاوەن ماڵ، خۆی ئاو بهێنێ و بیکا بە دەست میوانانداو لەلای ڕاستەوە تەشت و ئاوەکە بگەڕێنێ.

٦. پێویستە بە سەر سفرەوە کارێکی ناپەسەند ئەنجام نەدات کە دانیشتوان پێیان ناخۆش بێت و قیزیان بشێوێتەوە، هەروەها ئاگادار بێت پرشەی دەستی نەخاتە نێو کاسە و دەفری خواردنەکەیانەوە.

٧. نابێ دەس لە نانخواردن کێشانەوەی لەبەر ئەوە بێت کە وا بزانن کەمخۆرە و ئەهلی قنیاتە.

جەعفەری کوڕی موحەممەد رَحِمَهُ اللهُ، فەرموویەتی: هەرکاتێ لەگەڵ برا و دۆستانتان لەسەر سفرەوە بوون، درێژە بدەن بە دانیشتنەکەتان؛ چونکە ئەوە سات و سەعاتێکە لەسەر تەمەنتان حەسێب ناکرێ و [حسێب و کتێبی نییە].

## بەشی سێهەم: خێری نان‌دان بە دۆستان و سەردان لە یەکتر

پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فەرموویەتی: «لا تَزَالُ الْمَلائِكَةُ تُصَلِّي عَلَىٰ أَحَدِكُمْ مَادَامَتْ مَائِدَتُهُ مُوضُوعَةً بَيْنَ يَدَيْهِ حَتَّىٰ تُرْفَعَ»[2].

واتە: «فریشتەکان بەردەوام سەلام و درووود ئەنێرن بۆ ئەو کەسانەتان کە وا سفرەی ڕاخستووە [و مێوانی لێ ئەکەوێ]، تا ئەو کاتەی سفرەکە کۆ ئەکرێتەوە».

---

١. بیهقی فی شعب الإیمان: ٥٤٣٣، الشهاب القضاعی فی مسنده: ٦٥٣، السیوطی فی جامع الکبیر: ٤٠١.
٢. طبرانی فی الأوسط: ١٠٤٧ ـ ٤٨٨٥، بیهقی فی شعب الإیمان: ٩١٧٩.

حەسەنی بەسری رَحِمَهُ اللَّهُ فەرموویەتی: هەر جۆرە نان و خوانێ کە مرۆڤ بە خێزان و باوك و دایکی خۆی ئەیدا، ئەوە حسێب و کتێبی تایبەتی خۆی هەیە؛ بەڵام ئەو نان و خوانەی کە پیاوێك بە دۆستان و برایانی دینی ئەدات لە ڕۆژی قیامەتدا ئەبێتە پەردە لە نێوان ئەو و ئاگردا و دەیپارێزێ.

حەزرەتی عەلی رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ فەرموویەتی: «لَإِن أَجْمَعَ إِخْوانِي عَلَىٰ صاعٍ مِنْ طَعامٍ أَحَبُّ إِلَيَّ مِنْ أَنْ أَعْتِقَ رَقَبَةً»[1].

واتە: «ئەگەر دۆستان و براکانم لەسەر خوانێ کۆ بکەمەوە پێم خۆشترە لەوەی بەردەیەك ئازاد بکەم».

سەحابەکان و هاوڕێیانی پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ کاتێ کە پێکەوە کۆ ئەبوونەوە بۆ قورئان خوێندن لێك جیا نەدەبووەنەوە تا نانیان پێکەوە ئەخوارد.

لە حەدیسی [قودسیدا] هاتووە کە خوای گەورە لەڕۆژی قیامەتدا ئەفەرمێ: «يَا ابْنَ آدَمَ، جُعْتُ فَلَمْ تُطْعِمْنِي، فَيَقُولُ: كَيْفَ أُطْعِمُكَ، وَ أَنْتَ رَبُّ الْعالَمِينَ؟، فَيَقُولُ: جاعَ أَخُوكَ الْمُسْلِمُ فَلَمْ تُطْعِمْهُ، فَلَوْ أَطْعَمْتَهُ كُنْتَ قَدْ أَطْعَمْتَنِي»[2].

واتە: «ئەی بنیادەم! ئەمن برسیم بوو و تۆ نانت نەدامێ، بنیادەمیش لەو ڕۆژەدا ئەڵێ: ئەدی خودایا! ئەمن چلۆن نانت بدەمێ، لە کاتێکدا تۆ پەروەردگاری هەموو بوونەوەری؟!. خوای گەورە ئەفەرمێ: برا موسڵمانەکەت برسی بوو و تۆ نانت نەدایە، ئەگەر تۆ نانت بە ئەو بدایە، نانت بەمن دابوو».

پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فەرموویەتی: «إِنَّ فِي الْجَنَّةِ غُرَفاً يُرَىٰ ظاهِرُها مِنْ باطِنِها وَ باطِنُها مِنْ ظاهِرِها، أُعِدَّها لِمَنْ أَلانَ الْكَلامَ وَ أَطْعَمَ الطَّعامَ وَ صَلَّىٰ بِاللَّيْلِ وَالنّاسُ نِيامٌ»[3].

واتە: «لە بەهەشتدا چەن هۆدەیەك هەن کە نێویان لە دەرەوە و دەرەوە لە نێوەوەیاندا دیارە، ئەوانە بۆ ئەو کەسانە تەیار کراوە کە بە نەرم و نیانی قسە دەکەن و نان دەدەن و شەوانە ـ لەو کاتەدا کە خەڵك نوستوون ـ نوێژ دەخوێنن».

---

١. کنز العمال للهندی: ٢٥٩٧٢.

٢. مسلم: ٤٦٦١ بلفظ آخر.

٣. احمد: ٦٣٢٦ ـ ٢١٨٣١، حاکم فی المستدرك: ٢٤٨، طبرانی في الكبير: ٣٣٨٨ بزيادة: «وَ تابَعَ الصَّلاةَ» ـ ٣٣٨٩ بزيادة: «وَ أَدامَ الصِّيامَ»، ابن‌حبان فی صحیحه: ٥١٠ بزيادة: «وَ أَفْشَى السَّلامَ»، ابن‌خزيمه فی صحیحه: ١٩٦٠، بیهقی فی شعب الإيمان: ٣٦٠٩.

مرۆڤ ئەبێ تا دەعوەت نەکرێ، نەڕوا بۆ نانی داوەتی؛ چونکە لە حەدیسدا هاتووە: هەرکەس بە بێدەنگ‌کردن بڕوا بۆ نانی داوەتی، ئەوە بە فاسیقی ئەڕوات و ئەو نانە بۆی حەرامە؛[1] مەگەر ئەوەی دڵنیا بێت کە ئەگەر خاوەن نانەکە بزانێ، پێی خۆشحاڵ ئەبێ. پێغەمبەرﷺ و حەزرەتی ئەبووبەکر و عومەررَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا برسییان بوو، چوون بۆ ماڵی ئەبی‌هەیسەمی کوڕی تەیهان و ئەبی‌ئەیووبی ئەنساری بۆ نان‌خواردن.[2]

ئەگەر کەسێ چووە ماڵێك و خاوەن ماڵ لە ماڵ نەبوو و ئەیزانی: ئەگەر بزانێ ئەو هاتووە خۆش‌کەیف ئەبێ، ئەوە ئەتوانێ نان بهێنێ بیخوات.

لە ئادابی ئیسلامەتییە، کە میوان پێشنیاری هیچێ نەدات، مەبادا خاوەن ماڵ دەستی تەنگ بێت؛ مەگەر وەختێ کە دڵنیا بێت، توانای ئەو شتەی هەیە. ئەگەر خاوەن ماڵەکە پێشنیاری دوو شتی پێدا کە بیهێنێ بۆی، ئەوە بزانێ کامەیان لەسەر شانی سووکترە، ئەوە هەڵبژێرێ. هیچ قەیدی نییە خاوەن ماڵ بە میوانەکانی بڵێ: هەرچی کە حەز ئەکەن پێشنیاری بدەن. ئەم‌جۆرە پێشنیارە خێر و سەوابی زۆری هەیە.

جابیررَضِيَ اللهُ عَنْهُ ڕەوایەتی کردووە کە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «مَنْ لَذَّذَ أَخاهُ بِما يَشْتَهِي، كَتَبَ اللهُ لَهُ أَلْفَ أَلْفَ حَسَنَةٍ وَ مَحا عَنْهُ أَلْفَ أَلْفَ سَيِّئَةٍ وَ رَفَعَ لَهُ أَلْفَ أَلْفَ دَرَجَةٍ وَ أَطْعَمَهُ اللهُ تَعالَىٰ ـ مِنْ ثَلاثَةِ جَنّاتٍ: جَنَّةُ الْفِرْدَوْسِ وَ جَنَّةُ عَدْنٍ و جَنَّةُ الْخُلْدِ».

واتە: «هەرکەسێ لەو خواردەمەنییە وا دۆستەکەی پێی خۆشە بیداتێ، ئەوە خوا هەزاران هەزار چاکەی بۆ دەنووسێ و هەزاران هەزار گوناحیشی لەسەر لائەبات و هەزاران هەزار پلە بەرزی ئەکاتەوە و لە سێ بەهەشت خواردەمەنی ئەداتێ: بەهەشتی "فیردەوس" و بەهەشتی "عەدن" و بەهەشتی "خولد".

نابێ خوڵکی میوان وەها بکات بڵێ: ئەخۆی شتێکت بۆ بێنم؟ ـ بەڵکوو ئەبێ خواردەمەنیەکە بهێنێتە بەردەستی، ئەگەر دڵی بردی ئەیخوات و دڵی نەیبرد نایخوات. ئەمە ڕاوێژی «سەفیانی سەوریە» ـ ڕەزای خوای لێ بێ ـ.

---

١. «مَنْ دَخَلَ عَلَىٰ غَيْرِ دَعْوَةٍ دَخَلَ سارِقاً وَ خَرَجَ وَ خَرَجَ مُغِيراً»، ابوداود: ٣٢٥٠، مسند الطیالیسی: ٢٤٤٢، بیهقی فی شعب الإیمان: ٩٢٠٠.

٢. ترمذی: ٢٣٩٢.

## بەشی چوارەم: لەبارەی میوانداریەوە

١. پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «لا تَتَكَلَّفُوا لِلضَّيْفِ فَتَبْغَضُوهُ، فَإِنَّ مَنْ أَبْغَضَ الضَّيْفَ فَقَدْ أَبْغَضَ اللهَ وَ مَنْ أَبْغَضَ اللهَ فَقَدْ أَبْغَضَهُ اللهُ».

واتە: «ئەوەندە بۆ میوان خۆتان مەخەنە سەختییەوە کە بە دەستیەوە یاس بن و ڕقتان لێی هەڵسێ، چونکە هەرکەس ڕقی لە میوان کەوێ، ڕقی لە خوا کەوتووە و هەرکەسیش ڕقی لە خوا بکەوێ، خوداش ڕقی لێ ئەکەوێ».

٢. پێویستە لە داوەتی ڕۆیشتندا، جیاوازی دەوڵەمەند و گەدا نەخات. لە هەندێ لە کتێبە ئاسمانییەکاندا هاتووە: یەك مایل ڕێ ببڕە و سەردانی نەخۆشێ بکە، دوو مایل ڕێ ببڕە بۆ ئەوەی تەرمێ بۆ سەرقەبران هاوڕێیی بکەی، سێ مایل ببڕە بۆ ئەوەی داوەتێکت وڵام دابێتەوە.

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «لَوْ دُعِيتُ إِلَى كُرَاعٍ لَأَجَبْتُ»[1] واتە: «ئەگەر خوڵك بکرێم بۆ "کراع"[2] ئەچم».

٣. ئەگەر کەسێ چوو بۆ میوانی و ڕۆژووی سوننەتی گرتبوو، باش وایە ڕۆژووەکەی بشکێنێ؛ چونکە بەم ڕۆژووشکاندنە خاوەن ماڵەکە شاد و دڵخۆش بکا باشترە لەوەی بەڕۆژوو بێ.[3]

٤. نەڕوات بۆ داوەتییەك کە بزانێ نانەکەی حەرامە، یان خاوەن داوەتییەکە مرۆڤێکی خراپکار، یان ستەمگەر و زاڵمە، یان ئەهلی بیدعەتە، یان بۆ ئەوە میوان دەعوەت دەکا کە خۆیی پێ هەڵبکێشێ.

٥. مەبەستی لە چوون بۆ داوەتییەکە، ئەنجامی دەستووراتی شەرع بێت، نەك بۆ زكلەوەڕاندن بڕوات.[4]

---

١. بخاری: ٢٣٨٠ ـ ٤٧٨٠، ترمذی: ١٢٥٨، احمد: ٩١٢١.

٢. کُراع: ناوی شوێنێکە چەند مایلێ لە مەدینەوە دوورە، پێغەمبەر ﷺ کاتێ ئەگەیشتە ئەوێ ڕۆژووی ئەشکاند و نوێژی بە کورتکراوی ئەخوێند ـ وەرگێڕ.

٣. و کذا رجل أفطر لضیفه. ابن‌ابی‌شیبة فی مصنفه: ٥٠٧/٢.

٤. «أَجِيبُوا الدَّعْوَةَ إِذَا دُعِيتُمْ» احمد: ٥١١٢، بخاری: ٤٧٨١، مسلم: ٢٥٧٧، ترمذی: ١٠١٧.

٤. نابێ بەبێ ئیزنی خاوەن داوەتییەکە بڕواتە دەرەوە. لە حەزرەتی عەبباسەوەرَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ دەگێڕنەوە کە فەرموویەتی: لە سەردەمی پێغەمبەرداصَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ئێمە بە دەم ڕێگەڕۆشتنەوە نانمان ئەخوارد و بە پێوە ئاومان ئەخواردەوە [و لەسەر ئیزنی دەڕۆیشتین].[1]

سوننەتە هاوسێ و بەراوسێ، خواردەمنی و نان بیەن بۆ خزم و کەسی مردوو.[2]

١. «كُنَّا نَأْكُلُ عَلَىٰ عَهْدِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَنَحْنُ نَمْشِي وَنَشْرَبُ وَنَحْنُ قِيَامٌ» ترمذی: ١٨٠٢، ابن‌ماجه: ٣٢٩٢.

٢. «... إِنَّ آلَ جَعْفَرٍ قَدْ شُغِلُوا بِشَأْنِ مَيِّتِهِمْ فَاصْنَعُوا لَهُمْ طَعَامًا» ابن‌ماجه: ١٥٩٩ ـ ١٦٠٠، ابوداود: ٢٧٢٥، ترمذی: ٩١٩.

# بابەتی دوازدەهەم: ئاداب و شێوازی ژنخواستن

## [بۆچوونی زانایان لەبارەی ژنهێنان]

پێویستە بزانی کە زانایانی دین لەبارەی ژنهێنانەوە چەند بۆچوونی جیاوازیان هەیە، هەندێکیان لەسەر ئەو باوەڕەن کە ژنهێنان باشترە لەوەی کە ژیانت تەرخان بکەی بۆ عیبادەت و خواپەرستی. هەندێکی‌تریان وتوویانە کە ژنهێنان، خێری زۆرە، بەڵام لایان وایە خۆ تەرخانکردن بۆ خواپەرستی، لە پێشترە و خێری زۆرترە، مادامێ کە زۆر حەزی لە ژنهێنان نەبێ [واتە: کەسێ بێت کە شاوەتی کەم بێت]، هەندێ‌تر لەسەر ئەو باوەڕەن کە لەم سەردەمەدا باش وایە ژنخوازی نەکرێت؛ یەکەم: لەبەر ئەوەی زۆربەی کار و پیشەکان حەرامن، دووهەم: لەبەر ئەوەی ئاکار و ڕەوشتی ژنان ناپەسەند بووە.

خوای گەورە لەم فەرموودەیەدا مرۆڤ هەڵئەنێ بۆ ژنهێنان کە ئەفەرمێ: ﴿وَ أَنكِحُوا الْأَيَامَىٰ مِنكُمْ﴾[1] واتە: «ژنە بێ‌شووەکان بدەن بەشوو».

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَ الَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا هَبْ لَنَا مِنْ أَزْوَاجِنَا وَ ذُرِّيَّاتِنَا قُرَّةَ أَعْيُنٍ﴾.[2]

واتە: «ئەوانەی کە ئەڵێن: خوایە! ژن و منداڵێکمان پێ بدە کە [لەبەر چاکی و عیبادەتی تۆوە] ببنە ڕووناکی دڵ و چاومان».

پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «النِّكَاحُ سُنَّتِي[3]، فَمَنْ أَحَبَّ فِطْرَتِي فَلْيَسْتَنَّ بِسُنَّتِي»[4].

---

١. النور: ٣٢. ٢. الفرقان: ٧٤.

٣. ابن‌ماجە: ١٨٣٦.

٤. بیهقی فی شعب الإیمان: ٥٠٩٣ و فی معرفة السّنن و الآثار للبیهقی: ٤٢٧٧ ـ ٤٢٨٠، ابی‌یعلی الموصلی فی مسندە: ٢٦٨٥.

واتە: «ژنهێنان سوننەت و دابی منە، کەوایە هەرکەس ڕێباز و ڕچەی منی پێ خۆشە، با شوێنی سوننەتەکەم بکەوێ».

### [بەڵگەی ئەوانە وا ژنهێنانیان پێ باش نییە:]

پێغەمبەرصَلَّىٱللَّهُعَلَيْهِوَسَلَّمَ لەبارەی خراپی ژنهێنانەوە ئەفەرمێ: «خَيْرُ النّاسِ بَعْدَ الْمِائَتَيْنِ، الخَفِيفُ الَّذِي لا أَهْلَ لَهُ وَلا وَلَدَ»[1].

واتە: «پاش دووسەد ساڵیتر، باشترین خەڵك ئەوانەن وا کەم عەلاقەن و سەریان سووکە، نە ژنیان هەیە و نە منداڵ».

دیسان پێغەمبەرصَلَّىٱللَّهُعَلَيْهِوَسَلَّمَ ئەفەرمێ: «يَأْتِي عَلَى النّاسِ زَمانٌ يَكُونُ هِلاكُ الرَّجُلِ عَلَىٰ يَدِ زَوْجَتِهِ وَ أَبَوَيْهِ وَ وَلَدِهِ، يُعِيرُونَهُ بِالْفَقْرِ وَ يُكَلِّفُونَهُ ما لا يُطِيقُ فَيَدْخُلُ الْمَداخِلَ الَّتِي يَذْهَبُ فِيها دِينُهُ فَيَهْلِكُ»[2].

واتە: «زەمانێ دێ بەسەر خەڵکدا، کە پیاو بە دەستی ژن و منداڵ و دایك و بابی خۆی تیا ئەچێ؛ تانە و تەشەری فەقیری و هەژاری لێ ئەدەن و داوای شتێکی لێ دەکەن کە لە توانایدا نییە، بەمبۆنەوە دەست بە کارگەلێکەوە ئەدا کە دینی بە با دەدا و لە ئەنجامدا بەدبەخت ئەبێ».

## بەشی یەکەم: چاکی و خراپی ژنهێنان

### [١. چاکی ژنهێنان:]

ژنهێنان خێر و کەڵکی زۆری تێدایە کە بریتین لە:

منداڵی چاك، نەفس‌شکێنی، بەڕێوەبردن و تەگبیر بۆ ماڵ و مەنزڵ، زۆربوونەوەی خزم و خوێش، خێری تێکۆشان بۆ دابین‌کردنی بژێوی ژن و منداڵ. ئەگەر منداڵ باش بێت، ئەوە خێری دوعای منداڵەکەی [هەتا زیندوو بێت] پێ دەگات، ئەگەریش بمرێ لە قیامەتدا ئەبێتە تکاکار بۆی.

---

١. كشف الخفاء للعجلوني: ١٢٣٥، كنز العمال للهندي: ٣١٣٠٢.

٢. كنز العمال للهندي: ٣١٠٠٨ برواية أخرى.

### [٢. زەرەر و خراپی ژنهێنان:]

بە دەستهێنانی ماڵی حەڵاڵ، کە کارێکی سەخت و دژوارە و پێویستە لەسەریشی بە دوویدا بچێت. هەروەها لەوانەیە پیاو نەتوانێ بە تەواوی مافی ژن و منداڵ بەجێ بهێنێ؛ چونکە مافی زۆریان هەیە بە سەریەوە و پێویستە لەگەڵیاندا جوان بجووڵێتەوە و بە سۆز و میهرەبان بێت لەگەڵیاندا، ئەمەش تەنیا پیاوە گەورەکان دەرەووەستی دێن.

### [٣. ئافەتی گەورەی ژنهێنان:]

ئەوەیە کە ژن و منداڵ، پشت هەڵبکەن لە یادی خوا و ڕێی پاشەڕۆژ نەگرنە بەر. هەروەها زۆر کات ژن و منداڵ ئەبنە هۆی ئەوەی پیاو ڕژد و دەسوشك بێت، ئەمەش ئافەتێکی کوشندەیە.

لێرەدا باسی چاکی و خراپی ژنهێنانمان کرد. ئەم چاکە و خراپەیەش دەگۆڕدرێ بە گۆڕانی بارودۆخ و کەسەکان. ئەدی تۆش سەیری خۆت بکە و کاروباری خۆت لێك بدەرەوە، بزانە کام ڕێگە نزیکترە بە قیامەتەوە ئەوەیان بگرەرە بەر.

## بەشی دووهەم: ئەو مەرجانەی کە بۆ ژن مارەکردن پێویستن

ئەو مەرجانەی کە بۆ دامەزرانی عەقد پێویستن، چوارن:

١. ئیزنی سەرپەرشتی ژن،[١] ئەگەر سەرپەرشتی نەبوو، حاکم ئەبێ ئیزن بدات.[٢]

٢. ڕازیبوونی ژن ئەگەر بێوەژن بوو[٣] [بەڵام بۆ کچ ئەگەر سەرپەرشتەکەی باوك، یان باوا بوو، ئیزن لێوەرگرتنی سوننەتە و واجب نییە، بەڵام ئەگەر برا و مام و... بوو، ئیزنی کچ واجبە].

---

١. قال صلى الله عليه وسلم: «لا نِكَاحَ إِلَّا بِوَلِيٍّ» ابوداود: ١٧٨٥، ترمذی: ١٠٢٠، ابن‌ماجه: ١٨٧٠، احمد: ١٨٦٩٧، المجموع للنووی: ٣٨١/١٣ ـ ٣٨٠.

٢. قال صلى الله عليه وسلم: «وَالسُّلْطَانُ وَلِيُّ مَنْ لا وَلِيَّ لَهُ» احمد: ٢١٤٨، ابن‌ماجه: ١٨٧٠.

٣. قال صلى الله عليه وسلم: «لا تُنْكَحُ الْأَيِّمُ حَتَّىٰ تُسْتَأْمَرَ، وَلا تُنْكَحُ الْبِكْرُ حَتَّىٰ تُسْتَأْذَنَ، قالُوا: يا رَسُولَ اللهِ! وَ كَيْفَ إِذْنُها؟ قالَ: أَنْ تَسْكُتَ» بخاری: ٤٧٤١ ـ ٦٤٥٥، مسلم: ٢٥٤٣، نسائی: ٣٢١٥، احمد: ٩٢٣٢،.

٣. ئامادەبوونی دوو شاهید کە عەدالەتیان ڕوون و ئاشکرا بێت[1].

٤. سیغەی نیکاح کە بریتییە لە وتەی مارەکردنی سەرپەرشتەکە و قەبووڵکردنی زاوا. پێویستە ئەم دوو وتە بێ ناواخن بوێژرێ و بە دوو وشەی «إنکاح وتزویج» واتە: "مارە لێ کردن و کردنە هاوسەر"، یان هەرچی مانای ئەم دوانە بدات، بوێژرێ، بە هەر زمانێك بێت فەرق ناکات. ئەم دوو وتەیە ئەبێ لە لایەن دوو پیاوی موکەللەفەوە بوێژرێ؛ جیاوازی نییە ڕاستەخۆ زاوا و سەرپەرستی ژنەکە بن یان نوێنەری ئەوان بن. نابێ هیچکام لەوانەی ئەم دوو وتەیە ئەڵێن چ خۆیان چ نوێنەرەکانیان ژن بن.[2]

## [ڕێورەسمی ژن خواستنی شەرعی:]

سوننەتە پێش ئەوەی مارە بکرێ، لە سەرپەرشتکارەکەی خوازبێنی بکرێ. ئەبێ ئەوە لە بەرچاو بگیرێ کە کچەکە، یان بێوەژنەکە لە عادەتدا نەبن و کەسێ تریش پێش ئەمان داوای نەکردبێ؛ چونکە پێغەمبەرصَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ خوازبێنی لەسەر خوازبێنیی قەدەغە کردووە.[3]

سوننەتە پێش ئەوەی وتەکانی مارەبڕین دەست پێ بکرێ، خوتبەیێ بخوێنرێ [پاشان سەرپەرشتی کچەکە بڵێ: «بسم الله والحمد لله والصلاة علی رسول اللهصَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، زَوَّجْتُكَ» واتە: «بە نێوی خوا، حەمد و سەنا هەر بۆ خودایە سەلام و سەلات لەسەر پێغەمبەرصَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: ئەوە فڵانە کچم کردە هاوسەرت].

پاشان پیاوە ژنخوازەکەش هەروەك ئەو بڵێ و لە ئاخردا بڵێ: «قَبِلْتُ نِكَاحَهَا عَلَىٰ هٰذَا الصِّدَاقِ» واتە: «ئەوە نیکاحی ئەو کچەم لەسەر ئەم مارەییە قەبووڵ کرد». هەروەها سوننەتە

---

١. قالصَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: «لا نِكَاحَ إِلَّا بِوَلِيٍّ وَ شَاهِدَيْ عَدْلٍ» ابن‌ابی‌شیبة فی مصنفه: ٢٧٣/٣، طبرانی فی الکبیر: ١٤٧١٥، الشافعی فی مسنده: ١٠٠٠، ابن‌حبان فی صحیحه: ٤١٥١، دارقطنی فی سننه: ٣٥٨٠، بیهقی فی معرفة السّنن والآثار: ٤٣٠٨.

لە ئەمڕۆدا لەبەر ئەوەی شاهید و سەرپەرشتی عادڵ کەمە، یان هەر نییە، زۆربەی زانایانی موتەئەخیری شافیعی مەزهەب لەسەر ئەوەن کە نیکاح بە شاهید و سەرپەرشتی غەیرە عادڵیش دائەمەزرێ ـ وەرگێڕ.

٢. روضة الطالبین للنووی: ٤٦٠/٢، الأم للشافعی: ٤٠/٥، تحفة المحتاج فی کتاب النّكاح.

٣. قالصَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: «لا يَخْطُبُ أَحَدُكُمْ عَلَىٰ خِطْبَةِ أَخِيهِ» بخاری: ١٩٩٦، مسلم: ٢٥١٩، مالك فی الموطأ: ٩٦٤، ابوداود: ١٧٨١، ترمذی: ١٠٥٣، نسائی: ٣١٨٧، ابن‌ماجه: ١٨٥٧، احمد: ٤٤٩٢.

ئەم وتانە کە بە سەرپەرشتی کچەکە ئەوێژرێ ڕوو بە کچەکەش بوێژرێ؛ چونکە ئەمە ئەبێتە هۆی پەیوەندی و زیادە خۆشەویستی لە نێوانیاندا.

هەروەها سوننەتە لەپێشدا سەیری کچەکە بکرێ.

هەروەها لە ڕێ و ڕەسمی شەرعییە کە کۆمەڵێك پیاوی بڕوا پێکرا و ڕیش سپی جگە لە دوو شاهیدەکە، لەو کۆڕەدا کۆ بکرێنەوە.

[چەند تێبینییەك:]

١ـ پێویستە مەبەستی لە ژنهێنان ئەوە بێت کە ئیدی چاوی خۆی دابخات و لە ڕوانین بۆ نامەحرەم خۆی بپارێزێ و بە هیوای منداڵی چاکەوە بێت و لەبەر زیادبوونی ئوممەتی پێغەمبەر منداڵی ببێت.

٢ـ ئەبێ خۆی لە ژنی کۆیلە دوور بخاتەوە و مادامێ توانای هەبێ مارەیی ژنی ئازاد بدات.

٣ـ ئاگادار بێت کە مەحرەمی شیریی نەبێت؛ چونکە بە نەسەب کێهە مەحرەمە، بە شیریش ئەوانە ئەبنە مەحرەم. بە پێنج جار شیرخواردن مەحرەمییەتی شیری پێك دێ؛ بەڵام لەوە کەمتر نابێتە هۆی مەحرەمییەت.

## ئەو سیفەتانەی کە بۆ بەردەوامبوونی ژیان پێویستن، هەشتن:

١. دینداری؛

٢. ئاکار و ڕەفتاری جوان و لەبار؛

٣. مارەیی کەم؛

٤. منداڵبوون؛

٥. نەسەبی چاك؛ نابێ ژن و شوو خزمایەتیان پێکەوە زۆر نزیك بێت. ئەم باسانە هەموویان لە حەدیسدا هاتوون. [بۆ ڕوونکردنەوەی زیاتر سەیری ئیحیا لەم باسەدا بکەن].

## بەشی سێهەم: ئادابی کۆمەڵایەتی و ئەرکی ژن و شوو لەسەر یەکتر

پیاو لەسـەریـەتی زەماوەند بنێ؛ پێغەمبەرﷺ فەرموویـەتی: «أَوْلِمْ وَ لَوْ بِشَاةٍ»[١] واتە: «شایی بگرە هەرچەندە بە سەربڕینی مەڕێکیش بێ». هەروەها پیاو لە سەریە، هەڵسوکەوتی جوان بێت و لەباسی غیرەت و ناموسەوە بە ڕێکوپێکی بجووڵێتەوە، ئەوەی وا پێویستە فێری ژن و منداڵەکەی بکات و بە لێزانی و ژیرییەوە لەکاتی نافەرمانیدا ئەدەبی بکات و ئاگادار بێت ـ ئەگەر چەند ژنی بوو ـ بە عەداڵەتەوە لەگەڵیاندا ڕەفتار بکات. لەباسی تێکەڵبوون و نزیکی‌کردندا، جوان بجووڵێتەوە و ناپەسەندە بە تەواوی دووری لێ بگرێ و نزیکی نەکات.

ژن لە سەریـەتی، لە هەموو کاتێکدا گوێڕایەڵی شووەکەی بێت و لە هەموو کاتدا دڵسۆز و میهرەبان بێت، چ لەگەڵ خۆیـدا و چ لەگەڵ خزم و خوێشیدا و هۆشی بە ماڵ و مەنزڵیەوە بێت. لە پێغەمبەرەوەﷺ دەگێڕنەوە کە فەرموویـەتی: «حَرَّمَ اللهُ عَلَىٰ كُلِّ آدَمِيٍّ دُخُولَ الْجَنَّةِ قَبْلِي غَيْرَ أَنِّي أَنْظُرُ عَنْ يَمِينِي فَإِذَا امْرَأَةٌ تُبَادِرُنِي، فَأَقُولُ: مَا لِهٰذِهِ تُبَادِرُنِي الْبَابَ!؟ فَيُقَالُ لِي: يَا مُحَمَّدُ! هٰذِهِ امْرَأَةٌ حَسْنَاءُ وَ كَانَ عِنْدَهَا يَتَامَىٰ لَهَا فَصَبَرَتْ حَتَّىٰ بَلَغَ أَمْرَهُمُ الَّذِي بَلَغَ، فَشَكَرَ اللهَ ـ تَعَالَىٰ ـ لَهَا ذٰلِكَ»[٢].

واتە: «خوای گەورە لەسەر تەواوی بنیادەم قەدەغەی کردووە، کە پێش من بچنە نێو بەهەشتەوە. بەڵام ئەڕوانم لە ناکاو لەلای ڕاستمەوە ژنێك خەریکە نزیکم ئەکەوێتەوە؛ ئەپرسم: ئەمە کێیە ئاوەها پێش‌بڕکێم لە گەڵدا ئەکات بۆ چوونە بەهەشت!؟ وڵام ئەدرێمەوە: ئەی موحەممەد! ئەوە ژنێکە خاوەنی جوانی چەند هەتیوی بەسەرەوە جێ مابوو، ئەویش خۆی ڕاگرت [و شووی نەکرد] تا ئەوان گەورە بوون. ئەوە خواش بەوە پاداشی ئەو کارەی داوەتەوە».

لە پێغەمبەرەوەﷺ دەگێڕنەوە: «لا يَحِلُّ لِامْرَأَةٍ تُؤْمِنُ بِاللهِ وَ الْيَوْمِ الْآخِرِ أَنْ تَحِدَّ عَلَىٰ مَيِّتٍ أَكْثَرَ مِنْ ثَلاثَةِ أَيَّامٍ إِلَّا الْمَرْأَةُ عَلَى الزَّوْجِ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَ عَشْراً»[٣].

---

١. بخاری: ١٩٠٧ ـ ٥٦١٨، مسلم: ٢٥٥٦ ـ ٢٥٥٨، ابوداود: ١٨٠٤، ترمذی: ١٠١٤، نسائی: ٣٢٩٩، ابن‌ماجه: ١٨٩٧، احمد: ١٢٢٢٤ ـ ١٣٣٦٠، مالك فی الموطأ: ٩٩٩..

٢. جامع الکبیر للسیوطی: ١٢٠١٤، کنز العمال للهندی: ٤٥٤٢٩.

٣. مسلم: ٢٧٣٧، ترمذی: ١١١٦، نسائی: ٣٤٤٣، احمد: ٢٥٢٥٠.

واتە: «بۆ هیچ ژنێ کە ئیمانی بە خوا و پێغەمبەر ببێت، دروست نییە زیاتر لە سێ ڕۆژ، تازیەبار بێت، مەگەر ژن بۆ شووەکەی کە چوار مانگ و دە شەو بۆی تازیەبارە. [واتە: پاش ئەوە دروستە تازیەکەی بشکێنێ و شوو بکات]. پێویستیشە ژن تا ئەو کاتەی بەسەر ئەچێ لە ماڵی شووەکەیدا بمێنێتەوە.

## [ڕەسم و یاسای منداڵبوون]:

هەرکاتێ پیاوێ بوو بە خاوەنی منداڵ؛ سوننەتە بانگ بدا بە گوێیدا و هەروەها ـ وەکوو چۆن لە پێغەمبەرەوەﷺ ئەگێڕنەوە ـ ناوێکی خۆشی لێبنێ؛ پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «إِنَّكُمْ تُدْعَوْنَ يَوْمَ الْقِيامَةِ بِأَسْمائِكُمْ فَأَحْسِنُوا أَسْماءَكُمْ»[1].

واتە: «ئێوە لە ڕۆژی قیامەتدا بەم نێوانەی دونیا بانگتان ئەکەن، کە وابوو با نێوی جوان بنێن».

هەرکەس ئەگەر نێوی ناخۆش و ناپەسەندی بوو، سوننەتە بیگۆڕێ؛ چونکە پێغەمبەر ﷺ ئەو کارەی کردووە. هەروەها پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «لا تَجْمَعُوا بَيْنَ اسْمِي وَ كُنْيَتِي»[2] واتە: «نێوی من و کونیەم (ابوالقاسم) پێکەوە مەنێن بە کەسێکدا».

لەکاتی ناوناندا، سوننەتە دەمی منداڵەکە بە خورما، یان بە هەر شیرینییەکی‌تر، شیرین بکرێ[3].

---

۱. ابوداود: ۴۲۹۷، احمد: ۲۰۷۰٤.

۲. احمد: ۹۲۲٦، ابن‌ابی‌شیبة فی مصنفه: ۱٦۲/٦، طبرانی فی الکبیر: ۱۸۲۷۲، ابن‌حبان فی صحیحه: ۵۹۱۰، بیهقی فی شعب الإیمان: ۱۳٤۳.

۳. لەبەر ڕێککەوتنی باری مانا، ئەم بەندەی ئاخرمان لەگەڵ بەندەکەی پێشەوەی جێبەجێ کرد ـ وەرگێڕ.

# بابەتی سێزدەهەم:
# لەبارەی شێوازی ماڵ بەدەستهێنان و کارو کاسبییەوە

ئەم بابەتە بریتییە لە چەند بەش:

## بەشی یەکەم: خێر و گەورەیی کار و کاسبی

پێغەمبەرﷺ لەبارەی مەزنیی کار و کاسبییەوە فەرموویەتی: «مِنَ الذُّنُوبِ ذُنُوبٌ لا يُكَفِّرهٰا إِلَّا الْهَمُّ فِي طَلَبِ الْمَعِيشَةِ»[1].

واتە: «لەنێو گوناحاندا هەندێکیان کەفارەیان تەنها تێکۆشانە لە ڕێی ناندەرهێنان و بژێوی ژیاندا».

دیسان پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «اَلتّاجِرُ الصَّدُوقُ يُحْشَرُ يَوْمَ الْقِيٰامَةِ مَعَ الصِّدِّيقِينَ وَالشُّهَدٰاءِ»[2].

واتە: «بازراگانی ڕاستگۆ لە ڕۆژی قیامەتدا لەگەڵ شەهیدان و «صدیقین»دا حەشر دەکرێت».

لە حەدیسدا هاتووە کە خوای گەورە، ئیماندارانی پیشەوەری خۆش ئەوێ.[3]

---

١. طبرانی فی الکبیر: ٢٣٣ و فی الأوسط: ١٠٢، السیوطی فی جامع الکبیر: ١٨٢٨.

٢. ترمذی: ١١٣٠، ابن‌ماجە: ٢١٣٠، طبرانی فی الکبیر: ٥٧٧، دارمی فی سننە: ٢٥٩٤، دارقطنی فی سننە: ٢٨٥٠.

٣. «إِنَّ اللّٰهَ يُحِبُّ الْمُؤْمِنَ الْمُحْتَرِفَ» و فی روایة: «الشّابَّ الْمُحْتَرِفَ» بیهقی فی شعب الإیمان: ١١٨١، طبرانی فی الکبیر: ١٣٠٢٢ بغیر لفظ «المؤمن» و فی الأوسط: ٩١٨٢، الشهاب القضاعیفی مسندە: ٩٩٧.

دیسان ئەم فەرموودەی پێغەمبەرەﷺ هاتووە: «مٰا أُوحِيَ إِلَيَّ أَنْ أَجْمَعَ الْمٰالَ وَ أَكُنْ مِنَ التّٰاجِرِينَ، وَلٰكِنْ أُوحِيَ إِلَىٰ أَنْ سَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ وَكُنْ مِنَ السّٰاجِدِينَ وَاعْبُدْ رَبَّكَ حَتَّىٰ يَأْتِيَكَ الْيَقِينُ»[1].

واتە: «لەلای خوداوە وەحیم بۆ نەکراوە کە: ماڵ بنێ بەیەکەوە و بازرگان بە؛ بەڵکوو پێم ڕاسپێرراوە کە: وێڕای سەناو ستایشی خوا، تەسبیحاتیشی بکە و لە ناوچینی سوژدە بەرەکاندا ببە و عیبادەت بۆ خوا بکە، تا کاتێ مەرگ تووشت ئەبێ».

جا بزانە گەدایی هەمیشە جۆرێ ناپەسەندیی تێدایە. کار و کاسبی بۆ هەمووکەس باشترە مەگەر بۆ کەسێ بەڕێوەبردنی کاروباری موسڵمانانی لە سەرشان بێت، ئەوە لەو کاتەدا باشتر وایە کار و کاسبی وەلانێ و خۆی بە بەڕێوەبردنی کاروباری موسڵمانانەوە خەریک بکات. بۆ بژیوی خۆیشی بە ئەندازەی پێویست لە داهاتی ئەو کارانە هەڵبگرێ یان لە غەیری ئەو ڕێگەوە بژیوی خۆی دابین بکات. لەبەر ئەمە هاوەڵەکانی پێغەمبەر کاتێ کە حەزرەتی ئەبووبەکر ـ ڕەزای خوای لێ بێ ـ سەرپەرستی موسڵمانانی وەئەستۆ گرت، داوایان لێ کرد کە دەس لە مامەڵە هەڵگرێ، ئەویش دەستی لێ کێشا و بە ئەندازەی پێویست بژیوی خۆی لەو کار و بارە گشتییە هەڵدەگرت و خەریکی بەڕێوەبردنی ئیشی خەڵك بوو.[2]

## بەشی دووهەم: مەرجەکانی دامەزرانی مامەڵە

مامەڵە لەسەر سێ ڕوکن دادەمەزرێ: یەکەم: دوو لایەنی مامەڵە (فرۆشیار، کڕیار)، دووهەم: مامەڵە لەسەر کراوەکە، سێهەم: وتووێژی مامەڵە.[3]

چوارکەس مامەڵە لەگەڵیاندا دروست نییە:[4]

١. منداڵ؛

٢. شێت؛

---

١. جامع الكبير للسيوطی: ٥٣٠، شرح السّنّة للبغوی: ٢٠٤/٧ بلفظ: «وَ أَكُونُ مِنَ الْمُهٰاجِرِينَ ...»، كنز العمال: ٦٣٧٤ بروايات مختلفة.

٢. حياة الصحابة للكاندهلوی: ٢٦٤/٢.

٣. مغنی المحتاج للشربينی: ١١/٢، المجموع للنووی: ١٤٩/٩، إعانة الطالبين للبكری الدمياطی: ٤/٣.

٤. المجموع للنووی: ١٥٥/٩.

۳. کۆیلە؛

٤. کوێر.

بەڵام مامەڵە لەگەڵ کافردا دروستە مەگەر لە چەند شتێکدا نەبێ:[١]

یەکەم: قورئان؛

دووهەم: کۆیلەی موسڵمان؛

سێیەم: چەك بە کافرێ کە لەگەڵ موسڵماندا شەڕ بکات.

## [مەرجەکانی مامەڵە لە سەرکراوەکە:]

کڕین و فرۆشتنی شەراب و پی و چەوریيەك کە لە حەیوانی گۆشت نەخوراو گیرا بێت و عاجی فیل حەرامە.[٢] بەڵام مامەڵەی ڕۆنێك کە پیس بووبێ بەهۆی ئەوەی شتێکی پیسی تێ کەوتبێ، دروستە.

مامەڵەی سەگ[٣] و جڕوجانەوەری وردیلە [کە بێسوود بن[٤]] و ئامێری مۆسیقا دروست نییە.[٥] بەڵام کڕین و فرۆشتنی فەرش و ڕاخەرێ کە نیگاری [زیندەوەری] بە سەرەوە کێشرا بێت دروستە، بەو مەرجەی کە ڕاخرابێ نەك هەڵواسرابێ، یان هەڵسپێرراو بێ؛[٦] چونکە پێغەمبەر فەرموویە بە حەزرەتی عائیشە رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا: «اِتَّخِذِي مِنْهَا نَمَارِقَ» واتە: «ئەوانە ئەو جۆرە فەرش و سەرینانە کە نیگاری پێوە بێ بکە بە پشتی و سەرین».

هەروەها پێویستە فرۆشەندە مالیك و خاوەنی شتە فرۆشراوەکە بێت و توانای ئەوەی هەبێت بەدەستی کڕیارەکەی بگەیێنێ و شتەکە دیاری و لە بەرچاو بێت.

---

١. المجموع للنووي: ٣٥٤/٩، حاشية قليوبي و عميره: ٢٩٠/٦.

٢. قال صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: «إِنَّ اللّٰهَ وَ رَسُولَهُ حَرَّمَ بَيْعَ الْخَمْرِ وَالْمَيْتَةِ وَالْخِنْزِيرِ وَالْأَصْنَامِ ...» بخاري: ٢٠٨٢، مسلم: ٢٩٦٠، ابوداود: ٣٠٢٥، ترمذي: ١٢١٨، نسائي: ٤١٨٣، احمد: ١٣٩٤٨، ابن‌ماجه: ٢١٥٨، شرح الوجيز للرافعي: ١١٢/٨.

٣. طبراني في الكبير: ١٢٨٤٢، نسائي: ٤٥٨٧، بخاري: ٢٠٨٣، مسلم: ٢٩٣٢، ابوداود: ٢٩٧٤، ترمذي: ١٠٥٢، ابن‌ماجه: ٢١٥٠، احمد: ٣١٧٤.

٤. شرح الوجيز للرافعي: ١١٨/٨، حاشية قليوبي و عميرة: ٢٩٩/٦، نهاية المحتاج: ٢٥٣/٣.

٥. روضة الطالبين للنووي: ٤٠٥/١، الأم للشافعي: ٢٢٤/٦، شرح الوجيز للرافعي: ١١٨/٨، أسنى المطالب ابويحيى زكريا الأنصاري الشافعي: ٤١١/٧.

٦. بخاري: ٥٤٩٨، مسلم: ٣٩٣٣، ابوداود: ٣٦٢٣، ترمذي: ٢٧٣٠، نسائي: ٥٢٦٠، احمد: ٢٤٦٠٦.

## [مەرجەكانی وتووێژی مامەڵە]:

پێویستە هەردوو لایەن سیغەی (إيجاب و قبول) بڵێن، واتە: ئەوەندە لە هەردوو لایەنەوە درببڕێت کە ڕەزایەتی هەردوولا بگەیەنێ. بەڵام لە وتەیێك و بۆچوونێكدا هەیە کە «ئیبنوسورەیەج» ڕیوایەتی کردووە: مامەڵە بەبێ وتووێژ لەسەرکردن، هەر بە شێوەی بە یەك بەخشین بۆ شتانێ کە خواردەمەنین یان زۆر بە نرخ نین، دروستە؛ لەبەر ئەوەی پێویستی کۆمەڵگای لەسەرە.[1]

سووخۆری و ڕیبا، لە قورئان و حەدیسدا هەڕەشەی زۆری لێ کراوە، ئەبێ مرۆڤی موسڵمان خۆی لێ بپارێزێ،[2] بەڵام سەلەم [واتە: کڕینی کاڵاییك پێش بەرهەم هاتنی] دروستە.[3] باسی کڕێدان و مەرجەکانی و [پاشماوەی باسی کڕین و فرۆشتن] لە کتێبە فیقهیەکاندا هاتووە، با خوێنەران لەوێ سەیری بکەن.

## بەشی سێهەم:

## دادپەروەری و بەویژدان بوون لە مامەڵەدا و خۆپارێزی لە زوڵم و زۆر

پێویستە بزانی کە هەندێجار بە گوێرەی فتوای زانایان مامەڵە دادەمەزرێ، بەڵام جۆرێ زوڵم و دەستدرێژی تێدایە کە ئەبێتە هۆی تووڕەبوونی خوا لە ئەو کەسەی کە ئەنجامی داوە. [ئەمان بریتین لە:]

١. پاوان و لە بازار هەڵگرتنی کاڵای پێویست، لە خواردەمەنی و [هەرچی کە پێداویستی زەرووری ژیان بێت]. ئەو کەسەی کە ئەم کارە بکات لە لایەن خواوە نفرینی لێ کراوە و زۆر هەڕەشەی توندی لە سەرە.[4]

---

١. شرح الوجيز للرافعي: ٩٩/٨، المجموع للنووی: ١٦٢/٩.

٢. قال اللّه تبارك وتعالى: ﴿وَأَحَلَّ اللَّهُ الْبَيْعَ وَحَرَّمَ الرِّبَا﴾ البقرة: ٢٧٥. «لَعَنَ رَسُولُ اللّٰهِ صلى الله عليه وسلم آكِلَ الرِّبَا وَمُؤْكِلَهُ وَكَاتِبَهُ وَشَاهِدَيْهِ» مسلم: ٢٩٩٥، ابوداود: ٢٨٩٥، ترمذی: ١١٢٧، ابن‌ماجه: ٢٢٦٨، بخاری: ١٩٤٤، نسائی: ٥٠١٤، احمد: ٩٣٣.

٣. قال صلى الله عليه وسلم: «مَنْ أَسْلَفَ فِي شَيْءٍ فَفِي كَيْلٍ مَعْلُومٍ وَ وَزْنٍ مَعْلُومٍ إِلَىٰ أَجَلٍ مَعْلُومٍ» بخاری: ٢٠٨٦، مسلم: ٣٠١٠ ـ ٣٠١١، ابوداود: ٣٠٠٤، ترمذی: ١٢٣٢، نسائی: ٤٥٣٧، ابن‌ماجه: ٢٢٧١، احمد: ٢٤١٧.

٤. قال صلى الله عليه وسلم: «الْمُحْتَكِرُ مَلْعُونٌ» مسلم: ٣٠١٣، ابوداود: ٢٩٩٠، ترمذی: ١١٨٨، ابن‌ماجه: ٢١٤٥، احمد: ٢٥٩٨٧، و قال صلى الله عليه وسلم: «لا يَحْتَكِرُ إِلَّا خَاطِئٌ» ابن‌ماجه: ٢١٤٤، حاكم فی المستدرك: ٢١٢٣، دارمی فی سننه: ٢٥٩٩، بيهقی فی شعب الإيمان: ١٠٧٠٠، عبدالرّزّاق فی مصنفه: ١٤٨٩٣.

٢. شاردنەوەی عەیبی كاڵا و پیتاك، كە ئەمە خەیانەتە بە كڕیار.[1]

٣. نارێكی لە تەرازوودا واتە زۆركێشان و كەمكێشان كە ئەویش هەڕەشەی زۆری لەسەرە؛ ئایەتی خوای گەورە لەمبارەوە، هاتوتە خوار ﴿وَيْلٌ لِلْمُطَفِّفِينَ﴾[2] واتە: هاوار و ڕۆ بۆ كەمفرۆشان [بۆ ئەوانەی وا كاتێ شتومەك لە خەڵك دەكڕن بە قەدەر خۆی دەیكێشن، بەڵام كاتێ كە بە خەڵكی دەفرۆشن كەم دەیكێشن]. بە كورتی هەرچی خەڵك خڵەتانی تێدا بێت حەرام و ناپەسەندە.

٤. نابێ بۆ بازاڕگەرمی و هەڵنانی كڕیار، بڕواتە سەر مامەڵەیێك و زۆرتر لە نرخەكەی بداتێ و نەیهەوێ بیكڕێ.

٥. پێغەمبەری مەزن ﷺ نەهی فەرمووە لە مامەڵەی شاری لەگەڵ لادێییكدا كە هێشتا نرخی بازاڕ نازانێ.[3]

پێویستە ئەگەر فرۆشیار جنسێكی بە هەرزان لە دۆست و خزم و كەسی خۆی كڕی، كاتێ كە ئەیفرۆشێ، بڵێ بە كڕیارەكە كە ئەو جنسەی بە هەرزان كڕیوە لە خزم؛ [بۆیە وا هەرزان ئەیفرۆشێ]، مەبادا وا بزانێ نرخی بازاڕیش هەروایە.

هەروەها پێویستە خۆش مامەڵە بێت و خەڵك نەخەڵەتێنێ بەشتێ كەوا هێشتا نرخی بازاڕی بۆ دەرنەهاتووە.[4] سوننەتە زۆر گیر نەدات لە كڕین و فرۆشتندا و چەقەچەقی زۆر نەكات. پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «رَحِمَ اللّٰهُ امْرَءاً سَهْلَ الْبَيْعِ، سَهْلَ الشِّرَاءِ، سَهْلَ الْقَضَاءِ، سَهْلَ الْاِقْتِضَاءِ».[5]

واتە: «خوای گەورە ڕەحم بكا بە ئەو كەسەی لە كڕین و فرۆشتن و لە دان و وەرگرتندا، ئاسان و سووك بیگرێت و زۆر لەسەری نەچێت».

١. «مَرَّ رَسُولُ اللّٰهِ ﷺ بِطَعَامٍ وَ قَدْ حَسَّنَهُ صَاحِبُهُ فَأَدْخَلَ يَدَهُ فِيهِ فَإِذَا طَعَامٌ رَدِیءٌ، فَقَالَ: بِعْ هٰذَا عَلَىٰ حِدَةٍ وَ هٰذَا عَلَىٰ حِدَةٍ، فَمَنْ غَشَّنَا فَلَيْسَ مِنَّا» مسلم: ١٤٧، ترمذی: ١٢٣٦، ابن‌ماجە: ٢٢١٥، احمد: ٤٢٦٨.

٢. المطففین: ١.

٣. «نَهَىٰ رَسُولُ اللّٰهِ ﷺ أَنْ يَبِيعَ حَاضِرٌ لِبَادٍ»، بخاری: ١٩٩٦، مسلم: ٢٥٣٢، ابوداود: ٢٩٨٢، ترمذی: ١١٤٤، نسائی: ٤٤١٦ و زاد: «وَ إِنْ كَانَ أَبَاهُ أَوْ أَخَاهُ»، ابن‌ماجە: ٢١٦٨، احمد: ٦١٢٩.

٤. قال ﷺ: «غَبْنُ الْمُسْتَرْسِلِ حَرَامٌ» طبرانی فی الكبیر: ٧٤٥٥، بیهقی فی سنن الكبری: ٣٤٩/٥.

٥. بخاری: ١٩٣٤، ابن‌ماجە: ٢١٩٤، بلفظ: «رَحِمَ اللّٰهُ رَجُلاً سَمْحاً إِذَا بَاعَ وَ إِذَا اشْتَرَىٰ وَ إِذَا اقْتَضَىٰ»، ترمذی: ١٢٤١، احمد: ١٤١٣١ بلفظ: «غَفَرَ اللّٰهُ لِرَجُلٍ كَانَ قَبْلَكُمْ سَهْلاً إِذَا بَاعَ سَهْلاً إِذَا اشْتَرَىٰ سَهْلاً إِذَا قَضَىٰ سَهْلاً إِذَا اقْتَضَىٰ».

جا هەرکەس دوعای پێغەمبەرﷺ کەوێتە کەلەبەر بۆی، هەم لە.مامەڵەی دونیا و هەم لە مامەڵەی دوارۆژدا، قازانجی زۆر دەکات.

پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «مَنْ أَنْظَرَ مُعْسِراً أَوْ تَرَكَهُ لَهُ حَاسَبَهُ اللهُ حِسَاباً يَسِيراً»[1].

واتە: «هەرکەس مۆڵەت بدات بە دەستەنگێ [و داوای قەرزی لێ نەکات،] یان بیبەخشێ و بەجێی بهێڵێ، ئەوە خوا بە ئاسانی لە ڕۆژی قیامەتدا حیسێب و کتێبی لەگەڵ دەکات.

هەروەها چاك وایە ئەگەر کڕیار، یان فرۆشیار داوای هەڵوەشانی مامەڵەکەیان لێ کرد، مامەڵەکە هەڵوەشێنێتەوە. پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «مَنْ أَقَالَ نَادِماً صَفْقَتَهُ، أَقَالَ اللهُ ـ تَعَالَى ـ عَثْرَتَهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ»[2].

واتە: «هەرکەس مامەڵەکەی لەگەڵ کەسێکدا کە لە مامەڵەکە پاشگەز بۆتەوە، هەڵوەشێنێتەوە، ئەوە خوای گەورە لە ڕۆژی قیامەتدا، تەنگی و چەڵەمەی لەبەر هەڵئەوەشێنێتەوە و ڕزگاری دەکات».

## بەشی چوارەم: دڵپەرۆشی بازرگان سەبارەت بە دین و پاشەڕۆژ

پێویستە کاروباری کاسبی ئەوەندە سەرقاڵی خۆیت نەکات کە بۆ خێری دونیا سەرمایەی پاشەڕۆژت لەکیس بچێ و تووشی تێکشکانێکی ئاشکرا ببیت. با ویست و نیەتت لە بازرگانی، بە دەسهێنانی بژێوی حەلاڵ بێت و خۆپارێزی لە دەستدرێژ کردنەوە بۆ خەڵك و بە دەسهێنانی ئەوەندە ڕزق و ڕۆزی بێ کە سەرت خەڵوەت بکات بۆ عیبادەت و کار و باری پاشەڕۆژ.

جا بزانە پیاوە چاکە پێشووەکان ـ خوایان لێ ڕازی بێت ـ بەلایانەوە ناپەسەند بووە، پارە وەر بگرن بۆ بەڕێوەبردنی عیبادەتەکان و بەجێهێنانی فەرزە کیفایەتەکان وەکوو: شۆردنی مردوو و کفن و دفنکردنی، یان وەکوو: بانگدان و نوێژی تەراوێح [بە ئیمامەت]کردن...

جا ئەگەر پیاوی بازرگانی دیندار مەبەستی لە مامەڵەکردن ئەوانە بێت کە باسمان کرد؛

---

١. مسلم: ٥٣٢٨، ترمذی: ١٢٢٧، احمد: ٨٣٥٤ بلفظ: «مَنْ أَنْظَرَ مُعْسِراً أَوْ وَضَعَ لَهُ أَظَلَّهُ اللهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ تَحْتَ ظِلِّ عَرْشِهِ يَوْمَ لا ظِلَّ إِلَّا ظِلُّهُ»، ابنماجه: ٢٤٠٩ بلفظ: «مَنْ أَنْظَرَ مُعْسِراً كَانَ لَهُ بِكُلِّ يَوْمٍ صَدَقَةٌ ...».

٢. بیهقی فی سنن الکبری: ٢٧/٦، ابنحبان فی صحیحه: ٥١١٩ بهذا اللفظ، ابوداود: ٣٠٠١، ابنماجه: ٢١٩٠، احمد: ٧١٢٢ بلفظ: «مَنْ أَقَالَ مُسْلِماً أَقَالَهُ اللهُ عَثْرَتَهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ».

ئەبێ ئاگادار بێت بازاڕی دونیا لە بازاڕی قیامەتی دوور نەخاتەوە چونکە بازاڕی کڕینی قیامەت مزگەوتە؛ خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿رِجَالٌ لا تُلْهِيهِمْ تِجَارَةٌ وَلا بَيْعٌ عَنْ ذِكْرِ اللَّهِ﴾[1] واتە: «ئەوان پیاوانێکن نە بازرگانی و نە سەودا یادی خوایان لەبیر ناباتەوە». ئەوەش بەم شێوەیە کە: لە بەیانەوە تا چێشتنگا لە مزگەوتدا دادەنیشێ [و پاشان ئەڕواتە سەر کارو کاسبی و] لە وەختی نوێژە فەرزەکاندا بێتەوە بۆ مزگەوت.

ئەو پیاو چاکانە، هەرکاتێ دەنگی بانگ ببیسن، بە تەواوی دەست لە هەرچی مامەڵەی دونیاییە هەڵدەگرن. تەنانەت هەندێکیان ئەگەر لەو کاتەدا کە چەکوشەکەیان بەرز دەکردەوە، دەنگی بانگ بهاتایە، نەیان‌دەکوتاوە؛ بەڵکوو بەجێیان ئەهێشت.

پیاوی بازاڕی، با لەو کاتەدا کە لە بازاڕدایە بە دڵ یادی خوای گەورە، بکات؛ چونکە لە بارەی خێری ئەم جۆرە زیکرانەوە حەدیسی زۆر هاتووە. پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی:

«مَنْ دَخَلَ السُّوقَ فَقَالَ: "لا إِلٰهَ إِلَّا اللهُ وَحْدَهُ لا شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَ لَهُ الْحَمْدُ يُحْيِي و يُمِيتُ، وَ هُوَ حَيٌّ لا يَمُوتُ، بِيَدِهِ الْخَيْرُ وَ هُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ" كَتَبَ اللهُ لَهُ أَلْفَيْ أَلْفَ حَسَنَةٍ»[2].

واتە: «هەرکەس بڕواتە نێو بازاڕ و بڵێ: "لا إِلٰهَ إِلَّا اللهُ وَحْدَهُ لا شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَ لَهُ الْحَمْدُ يُحْيِي و يُمِيتُ، وَ هُوَ حَيٌّ لا يَمُوتُ، بِيَدِهِ الْخَيْرُ وَ هُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ" خوای گەورە هەزاران هەزار چاکەی بۆ دەنووسێ».

پێویستە هۆشیاری دان و ستانی خۆی بێت؛ مەبادا تووشی شتێ ببێت کە لە ڕۆژی قیامەتدا نەتوانێ خۆی لە دەستی ڕزگار بکات. چونکە مرۆڤی بازرگان لە قیامەتدا حەسێب و کتێبی سەبارەت بە تەواوی مامەڵەکانی، لەسەر ئەکرێ و بەرانبەر بە نیەتی لەو مامەڵانەدا پرسیاری لێ ئەکرێ. هەروەها سەرنجی ئەوە ئەدرێ کە ئاخۆ مافی خەڵکی پاراستووە یان پێی شێلی کردووە.

---

١. النور: ٣٧.

٢. ترمذی: ٣٣٥٠، ابن‌ماجه: ٢٢٢٦، احمد: ٣٠٩، حاکم فی المستدرك: ١٩٣٠، دارمی فی سننه: ٢٧٤٨، بلفظ: «... كَتَبَ اللهُ لَهُ أَلْفَ أَلْفَ حَسَنَةٍ وَ مَحَىٰ عَنْهُ أَلْفَ أَلْفَ سَيِّئَةٍ وَ رَفَعَ لَهُ أَلْفَ أَلْفَ دَرَجَةٍ وَ بَنَىٰ لَهُ بَيْتاً فِي الْجَنَّةِ».

# بابەتی چواردەهەم: حەڵاڵ و حەرام

[ئەم بابەتە لە چەند بەش پێك هاتووە:]

## بەشی یەکەم: خێری کاسبی حەڵاڵ و خراپی کاسبی حەرام

لە ئیبنو مەسعوودەوە رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ دەگێڕنەوە کە پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فەرموویەتی: «طَلَبُ الْحَلالِ فَرِيضَةٌ عَلَىٰ كُلِّ مُسْلِمٍ»[1] واتە: «شوێنی حەڵاڵکەوتن فەرزە لەسەر هەرچی موسڵمانە».

هەندێ لەوانەی کە تەمەڵی و تەوەزەلی دایگرتوون، وای بۆ چوون کە چونکە حەڵاڵ نەماوە، بەری خۆیان بۆ هەرچی شتە شل کردووە؛ ئەمەش نەزانینێکی گەورەیە؛ پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فەرموویەتی: «اَلْحَلالُ بَيِّنٌ وَالْحَرَامُ بَيِّنٌ وَ بَيْنَهُمَا أُمُورٌ مُتَشَابِهَاتٌ»[2].

واتە: «حەڵاڵ دیارە و حەرامیش دیارە و لە نێوانیاندا شتانێ هەیە لێك دەچن، نە حەرامن، نە حەڵاڵن».

### سەبارەت بە خێر و گەورەیی ڕزقی حەڵاڵ:

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿يَا أَيُّهَا الرُّسُلُ كُلُوا مِنَ الطَّيِّبَاتِ وَ اعْمَلُوا صَالِحاً﴾[3].

«ئەی پێغەمبەران! بژیوی پاك و حەڵاڵ بخۆن و ئاکاری چاکتان ببێ».

---

١. طبرانی فی الأوسط: ٨٨٤٨ بلفظ «واجِبٌ»، بیهقی فی سنن الکبری: ١٢٨/٦ بلفظ: «كَسْبُ الْحَلالِ ...»، و فی شعب الإیمان بلفظ: «طَلَبُ كَسْبِ الْحَلالِ فَرِيضَةٌ بَعْدَ الْفَرِيضَةِ».

٢. بخاری: ٥٠ ـ ١٩١٠، مسلم: ٢٩٩٦، ابوداود: ٢٨٩٢، ترمذی: ١١٢٦، نسائی: ٤٣٧٧، ابن‌ماجە: ٣٩٧٤، احمد: ١٧٦٤٥.

٣. المؤمنون: ٥١.

پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «مَنْ أَكَلَ الْحَلالَ أَرْبَعِينَ يَوْماً نَوَّرَ اللهُ قَلْبَهُ وَ أَجْرَىٰ يَنابِيعَ الْحِكْمَةِ مِنْ قَلْبِهِ عَلَىٰ لِسانِهِ»[1] و في رواية «زهَّدَهُ اللهُ فِي الدُّنْيا».

واتە: «هەرکەس چل ڕۆژ نانی حەڵاڵ بخوات، خوای گەورە دڵی ڕووناك ئەکاتەوە و سەرچاوەی حیکمەت و زانین لە دڵیەوە هەڵدەقوڵێنێ و بەسەر زبانیدا جاریی دەکات». لە ڕیوایەتی‌تردا هاتووە: «خوا لە دنیادا زاهد و دونیانەویستی دەکات».

دەگێڕنەوە کە حەزرەتی «سەعدرضي الله عنه» داوای کرد لە پێغەمبەرﷺ لەخوا داوا بکات: خوا دوعای لێ وەرگرێ. پێغەمبەریشﷺ فەرمووی: «أَطِبْ طَعْمَتَكَ تُسْتَجَبْ دَعْوَتُكَ»[2]. واتە: «خۆراکت پاك و حەڵاڵ بکە، دوعات لێ وەردەگیرێ».

لە حەدیسدا هاتووە، ئیبنو عەبباسرضي الله عنهما لە پێغەمبەرەوەﷺ دەگێڕێتەوە «إِنَّ لِلّٰهِ مَلَكاً عَلَىٰ بَيْتِ الْمَقْدِسِ يُنادِي كُلَّ لَيْلَةٍ مَنْ أَكَلَ حَراماً لَمْ يُقْبَلْ مِنْهُ صَرْفٌ وَلا عَدْلٌ».

واتە: «خوای گەورە بەسەر «بەیتولمەقدیسەوە» فریشتەیێکی داناوە، هەرچی شەوە بانگ دەکات: هەرکەس حەرام بخوات نە عیبادەتی سوننەت نە عیبادەتی فەرزی لێ وەرناگیرێ» وتوویانە: مەبەست لە «صَرْف» نوێژی سوننەتە و مەبەست لە «عَدل» نوێژی فەرزە.

پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «مَنِ اشْتَرَىٰ ثَوْباً بِعَشَرَةِ دَراهِمَ وَ فِي ثَمَنِهِ دِرْهَمٌ حَرامٌ لَمْ يَقْبَلِ اللهُ صَلاتَهُ مادامَ عَلَيْهِ»[3].

واتە: «هەرکەس کراسێ بە دە (١٠) دیرهەم بکڕێ و لەنێو ئەو پارەیەدا تاقە دیرهەمێك حەرام هەبێت، تا ئەو لیباسەی لەبەردا بێت خوا نوێژی لێ قەبووڵ ناکات».

دیسان پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «كُلُّ لَحْمٍ نَبَتَ مِنَ الْحَرامِ فَالنّارُ أَوْلَىٰ بِهِ»[4] واتە: «هەر گۆشتێ بە حەرام ڕوشدی کردبێ، ئەوە ئاوری دۆزەخ بۆی باشترە».

---

١. شهاب القضاعی فی مسنده: ٤٤٦، ابن‌الأثیر فی جامع الأصول: ٩١٦٥ بلفظ: «مَنْ أَخْلَصَ لِلّٰهِ أَرْبَعِينَ صَباحاً ظَهَرَتْ يَنابِيعَ الْحِكْمَةِ مِنْ قَلْبِهِ عَلَىٰ لِسانِهِ».

٢. طبرانی فی الأوسط: ٦٦٨٣، جامع الکبیر للسیوطی: ٢ بلفظ: «يا سَعْدُ أَطِبْ مَطْعَمَكَ تَكُنْ مُسْتَجابُ الدَّعْوَةِ».

٣. احمد: ٥٤٧٣، بیهقی فی شعب الإیمان: ٥٧٠٧.

٤. ترمذی: ٥٥٨، احمد: ١٣٩١٩، طبرانی فی الکبیر: ١٥٦٢٩ بلفظ: «لا يَدْخُلُ الْجَنَّةَ لَحْمٌ نَبَتَ مِنْ سُحْتٍ، وَ كُلُّ لَحْمٍ نَبَتَ مِنْ سُحْتٍ فَالنّارُ أَوْلَىٰ بِهِ»، ابن‌حبان فی صحیحه: ١٧٥١، بیهقی فی شعب الإیمان: ٥٣٧٥ بلفظ: «كُلُّ جَسَدٍ نَبَتَ مِنْ سُحْتٍ فَالنّارُ أَوْلَىٰ بِهِ» و فی روایة: «أَيُّما لَحْمٍ نَبَتَ مِنْ سُحْتٍ...».

دیسان پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «مَنْ لَمْ يُبالِ مِنْ أَيْنَ اكْتَسَبَ الْمالَ لَمْ يُبالِ اللهُ ـ تَعالَىٰ ـ مِنْ أَيْنَ أَدْخَلَهُ النّارَ»[1].

واتە: «هەرکەس گوێ نەدات لە کوێوە ماڵ وەدەست ئەهێنێ، ئەوە خوای گەورەش گوێ نادات لە کوێوە ئەیخاتە نێو ئاور».

دووبارە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «اَلْعِبادَةُ عَشَرَةُ أَجْزاءٍ فَتِسْعَةٌ مِنْها فِي طَلَبِ الْحَلالِ»[2] واتە: «عیبادەت دە بەشە، نۆیان لەوەیدایە کە شوێنی ڕزقی حەڵاڵ بکەوی».

ئەم حەدیسە هەم بە مەرفووعی [واتە: نیسبەت لە پێغەمبەرﷺ دراو] هەم بە مەوقووفی [واتە: لەسەر سەحابە ڕاوەستراو] ڕیوایەت کراوە.

پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «مَنْ أَصابَ مالاً مِنْ مَأْثِمٍ فَوَصَلَ بِهِ رَحِماً، أَوْ تَصَدَّقَ بِهِ أَوْ أَنْفَقَهُ فِي سَبِيلِ اللهِ، جَمَعَ اللهُ لَهُ ذٰلِكَ جَمِيعاً ثُمَّ قَذَفَهُ فِي النّارِ»[3].

واتە: «هەرکەس ماڵێکی لە ڕێی حەرامەوە، دەس کەوێ، پاشان بە دیاری بیبا بۆ خزمێکی، یان بیبەخشێ، یان لەڕێی خوا خەرجی بکات، ئەوە خوا سەرجەمی ئەوانەی لە سەریەك بۆ کۆ دەکاتەوە و لە ئاوری دۆزەخی دەهاوێژێ».

دەگێڕنەوە حەزرەتی ئەبووبەکرؓ لە شیرێك کە کۆیلەکەی بۆی هێنابوو، خواردی، پاشان پرسی لە کۆیلەکەی کە لە کوێ هێناویە؟ ئەویش وتی: فاڵ و حسێبم بۆ دەستەیێك گرتەوە، ئەوانیش ئەو شیرەیان پێدام. حەزرەتی ئەبووبەکرؓ دەسبەجێ دەستی کرد بە دەمیدا و خۆی ڕشانەوە تا جێیەك گومانی ئەوە دەچوو کە خەریکە گیانی دەربچێ، پاشان فەرمووی: خوایە! داوای لێبوردنت لێ دەکەم و عوزر دەخوازم لەوەی کە دەمارەکانم هەڵیان گرتووە و تێکەڵی ڕیخۆڵەم بووە.[4]

لە حەدیسدا هاتووە کە ئەم هەواڵەیان بە پێغەمبەرﷺ گەیاند و ئەویش فەرمووی: «أَوَ ما عَلِمْتُمْ أَنَّ الصِّدِيقَ لا يَدْخُلُ جَوْفَهُ إِلَّا طَيِّباً».

---

١. کنز العمال للهندی: ٩٢٧١، جامع الکبیر للسیوطی: ٦٥٨٤، و فی صحیح البخاری: ١٩١٨: «يَأْتِي عَلَى النّاسِ زَمانٌ لا يُبالِي الْمَرْءُ ما أَخَذَ مِنْهُ أَمِنَ الْحَلالِ أَمْ مِنَ الْحَرامِ».

٢. کنز العمال للهندی: ٦٨٩١، جامع الکبیر للسیوطی: ٢٠ بلفظ: «...تِسْعَةٌ مِنْها فِي الصُّمْتِ وَالْعاشِرُ كَسْبُ الْيَدِ مِنَ الْحَلالِ».

٣. کنز العامل للهندی: ٩٢٦٥، جامع الکبیر للسیوطی: ٣٩٧٨.

٤. بخاری: ٣٥٥٤، معرفة الصحابة لأبی‌نعیم الأصبهانی: ١٠٤.

واتە: «بۆچی ئێوە نازانن کە ئەبووبەکرڕەزی جگە شتی پاك نەبێ هیچیتر ناڕواتە ناو سکیەوە»).

ئیبنوو عەبباس ڕەزی فەرموویەتی: خوا نوێژی کەسێك کە حەرام بڕواتە زکی قەبووڵ ناکات. سەهلی [توستەری] ڕەحمەتی فەرموویەتی: هەرکەس بیەوێ لە حاڵ و باڵی «صدیقین» واتە: چاکانی دەرگای خوا، سەری دەربچێ، ئەبێ جگە لە نانی حەڵاڵ چیدی نەخوات و جگە لە کار و باری باش و سوننەتی پێغەمبەر ﷺ یان کارێ کە بۆ ژیان پێویستی بێت، هەوڵ نەدات.

## بەشی دووهەم: جۆرەکانی حەڵاڵ و حەرام

بزانە هەر ماڵێك کە بەهۆی جیهاد لەگەڵ کافراندا بە هەر شێوەیێ وەدەس هاتبێت، حەڵاڵە؛ بەڵام بەو مەرجەی پێنجیەکێکی لێ بدرێ بە بەیتولماڵ، ئەگەر جیهادەکە بە دەستووری حاکمی موسڵمان بووبێت. هەروەها هەرچی کە لە ڕێی ڕاوکردن، یان لە ڕێی کۆکردنەوەی دار و پووشەوە، یان لە ڕێی کانەوە (کانی بەرد، ئاسن...) وەدەس بێت، حەڵاڵە.

### پلەی کەم و زیادیی حەڵاڵ و حەرام:

پێویستە بزانی کە حەرام بەتێکڕا پیسە؛ بەڵام ئەوەندەی هەیە کە هەندێکی لە هەندێتری پیسترە. حەڵاڵیش هەروەها هەر هەمووی پاکە؛ بەڵام هەندێکی لەچاو هەندێتری پاکترە.

پلەی یەکەم: خوارترین پلەی حەرام ئەوەیە خۆپارێزی بکرێ لە هەرچی کە زانایان فتوای حەرامیان داوە.

پلەی دووهەم: وەرع و خۆپارێزی پیاوچاکان، ئەویش ئەوەیە دووری بگیرێ لە هەرشتێ کە ڕێی تێ ئەچێ حەرام بێت؛ هەرچەندەش فتوادەران فتوای حەڵاڵیان بەگوێرەی زاهیری شەرع دابێ؛ بەڵام لەبەر ئەوەی جێی شوبهەیە، خۆپارێزیی لێ ئەکرێ بەتێکڕا. [ئەمەش پێ ئەڵێن: خۆپارێزی «صالحین» واتە: پیاوچاکان].

پلەی سێهەم: شتێ نە بە فتوای شەرع حەرام بێت، نە شوبهە لە حەڵاڵییەکەیدا ببێت؛ بەڵام لەبەر ئەوەی مەبادا بکێشێ بەلای حەرامدا، ئەنجام نادرێ.

ئەمەش بریتییە لە نەکردنی شتێ کە مەنعی نییە لەبەر ئەوەی مەبادا، مەنعی لەسەر بێ. [ئەمە پێی ئەڵێن: خۆپارێزی «متقین» واتە: لەخوا ترسان].

**پلەی چوارەم:** ئەوی وا هیچ باسێکی بەسەرەوە نەبێت [نە فتوای حەرام، نە شوبهە] تەنانەت ترسی ئەوەش نەبێ کە بەلای حەرامیشدا بکێشێ؛ بەڵام ئەو کارە بۆ غەیری خوا ئەنجام ئەدرێ و مەبەست لەو کارە تەقوا و عیبادەت بۆ خوا نییە، یان ئەو حەڵاڵە ڕێ بۆ «کراهة تحریم» یان بۆ گوناح خۆش دەکات.

خوپارێزی لەم جۆرە حەڵاڵە، تایبەتی «صدیقین» و نزیکانی خوایە.

## بەشی سێهەم: پلەی کەم و زیادی شوبهەکان

پێغەمبەری خوا ﷺ ئەفەرمێ: «اَلْحَلالُ بَیِّنٌ وَالْحَرامُ بَیِّنٌ وَ بَیْنَهُما أُمورٌ مُتَشابِهاتٌ لا یَعْلَمُها کَثِیرٌ مِنَ النّاسِ فَمَنِ اتَّقَی الشُّبُهاتِ فَقَدِ اسْتَبْرَأَ لِعِرْضِهِ وَ دِینِهِ وَ مَنْ وَقَعَ فِي الشُّبُهاتِ وٰاقَعَ الْحَرامَ کَالرّاعِي یَرْعَیٰ حَوْلَ الْحِمیٰ یُوشِكُ أَنْ یَقَعَ فِیهِ»[١].

واتە: «حەڵاڵ دیارە و حەرامیش دیارە و لە نێوانیاندا شتانێ هەیە کە لێك دەچن و زۆرێ لە خەڵك نایان زانن. جا هەرکەس خۆی لەم جۆرە شوبهانە بپارێزێ ئەوە ئابروو و دینی خۆی پاراستووە. هەرکەسیش خۆی تووشی ئەم جۆرە شوبهانە بکات ئەوە تووشی حەرام ئەبێت؛ هەر وەکوو چۆن شوانێ لە قەراخی زەوینێکی قۆرخکراودا ئاژەڵ بلەوەڕێنی، هەرسات لەوانەیە بچنە ناوی».

ڕوونکردنەوەی بەشی ناوەڕاست [واتە: ئەو بەشەی کە لەنێوان حەرام و حەڵاڵدایە] کە بریتییە لە شوبهە، بەم شێوەیە:

**حەڵاڵی ڕەها (مطلق)** وەکوو: ئاوی بارانێ کە هێشتا نەچۆتە نێو زەوی و زاری خەڵك.

**حەرامی ڕووت (محض)** وەکوو: شەراب.

---

١. بخاری: ٥٠ ـ ١٩١٠، مسلم: ٢٩٩٦، ابوداود: ٢٨٩٢، ترمذی: ١١٢٦، نسائی: ٤٣٧٧، ابن‌ماجە: ٣٩٧٤، احمد: ١٧٦٤٩ جمیعهم بلفظ: «یَرْتَعَ فِیهِ».

## ئەو شوێنانەی کەجێی شوبهەن پێنجن:

**نموونەی یەکەم:** ئەوەی کە شك لەهۆی حەرامی و حەڵالییەکەیدا ببێت؛ ئەمەش بەم شێوەیە کە هۆی حەڵاڵ و حەرامییەکەی هاوشانی یەك ئەوەستن، یان لایەنێکی لە لایەنی‌تری زۆرترە. جا ئەگەر دوو لایەنی شکەکە هاوشانی یەك وەستان، ئەوە سەیری پێشەوەی ئەکرێ و بەگوێرەی بنەڕەتەکەی ڕەفتار ئەکرێ [واتە: ئەگەر پێش ئەم شوبهە حەڵاڵ بووبێ ئەوە حەڵاڵە، ئەگەر حەرام بووبێ، ئەوە حەرامە]. بەڵام ئەگەر یەکێ لەو دوو لایەنە بەهێزتر بوو، ئەوە بەپێی ئەو لایەنە بەهێزە حوکم ئەدرێ.

**ئەمەش بە چوار بەش ڕوون ئەکرێتەوە:**

**بەشی یەکەم:** حەرامبوونەکەی ڕوون و ئاشکرا بێت، بەڵام لە حەڵاڵییەکەیدا شك ببێت؛ نموونەکەی وەکوو: ئەوەی پیاوێ تیرێ بەرەو نێچیرێ بتەقێنێ و ئەو نێچیرە بکەوێتە نێو ئاو، پاشان وەختێ پیاوەکە بڕواتە سەری، نێچیرەکە مردبێ، نایشزانێ: خنکاوە، یان بە تیرەکەی کوژراوە، ئەمە حەرامە؛ چونکە ئەسڵ حەرامبوونەکەیە، بەڵام ئەگەر بە شێوازێك کوژرابێت کە ڕوون و دیار بێت و دڵنیا بێت لە حەڵاڵبوونەکەی، بەڵام پاشان بکەوێتە ناو شکەوە، ئەوە ئەم یەقین و دڵنیاییە بۆ ئەو شکە، وەلانانرێ و بە حەڵاڵ دائەنرێ.

**بەشی دووهەم:** حەڵاڵییەکەی ئاشکرا بێت و بزانرێت، بەڵام شك لە حەرامییەکەیدا پەیدا بووبێ. ئەوە حوکم بە حەڵاڵییەکەی دەکرێ؛ وەکوو ئەوەی دووپیاوکە هەریەکی ژنێکیان هەیە، لە ناکاوێکدا پەلەوەرێ لەبەر چاویانەوە بفڕێ، یەکیان بڵێ: ئەگەر ئەم پەلەوەرەی کە هەڵفڕی قەلەڕەش بووبێ، ئەوە تەڵاقی ژنەکەم کەوتبێ. ئەوتریشیان بڵێ: ئەگەر قەلەڕەش نەبووبێ تەڵاقم کەوتبێ. پاش ئەمەش ڕوون نەبێتەوە کە ئەو پەلەوەرە قەلەڕەش بووە، یان نا. ئەوە حوکم بە حەرامی هیچ لایێکیان ناکرێ و تەڵاقی هیچ کامیان ناکەوێ، مادامێ ڕوون نەبێتەوە ـ واللە أعلم.

**بەشی سێهەم:** شتێك لە بنەڕەتدا حەرام بووبێ، بەڵام شتێکی بەسەردا هاتووە کە بە گومانی زۆر، حەڵاڵی کردووە و لایەنی حەرامییەتەکەی کز کردووە؛ ئەوە چونکە گومانی زۆر بەلای حەڵاڵییەکەیدایە و حەرامییەکەی شکی تێدایە بە حەڵاڵ دائەنرێ؛ وەکوو ئەوەی کە

پیاوێ بەرەو نێچیرێ تیر بتەقێنێ، نێچیرەکەی ون بێت پاشان بە مردارەوەبوویی بیدۆزێتەوە. سەیری بکات هیچ ئاسەوارێ جگە لە تیرەکەی ئەم بەسەر لەشیەوە نەبێ؛ بەڵام گومانی ئەوە هەبێ کە بە داکەوتن، یان بە هۆیێکیتر مردارەوە بووە. جا ئەگەر ڕوون نەبووەوە کە بە هۆی داکەوتن، یان بە هۆی تەکان و زەربەیێك مردارەوە بووە، ئەوە بە حەرام دائەنرێ. [بەڵام] ئیمامی شافیعیرَحِمَهُاللَّه لەم مەسئەلەیەدا دوو قەوڵی هەیە کە فتوا هەڵبژێراوەکەی ئەوەیە کە حەڵاڵە.

**بەشی چوارەم:** شتێك کە لە بنەڕەتدا حەڵاڵ بووبێت، بەڵام شتێکی بەسەردا هاتبێت کە گومانی زۆر (ظن غالب) بەلای ئەوەدا بێت بە بۆنەی هۆکارێك کە لە لایەن شەرعەوە ئیعتیبار کراوە، حەرام بووبێ. ئەوە لەبەر سستبوونی حوکمی ئەسڵە کە، ئیتر عەمەڵ بەو ئەسڵە ناکرێ و بە گوێرەی گومانە زۆرەکە، حوکم ئەدرێ [واتە: بە حەرام دائەنرێ]؛ وەکوو ئەوەی کە گومانی زۆری وەها بێت کە یەکێ لەم دوو دەفرە ئاوە، پیسە؛ بەبۆنەی ئەوەی کە نیشانەی پیسی پێوە دیارە و ئەبێتە هۆی پتر بوونی گومان لەسەر پیسبوونی. ئەوە حەرامە بخورێتەوە، هەر وەکوو چۆن قەدەغەیە دەسنوێژی لێ بگیررێ.

**نموونەی دووهەم بۆ شوبهە:** جۆرێکیتری شوبهە ئەوەیە کە سەرچاوەکەی لەتێکەڵبوونی حەڵاڵ و حەرامەوەیە؛ بەم شێوە کە حەرام لەگەڵ حەڵاڵدا تێکەڵ بێت و سەرلێشێوانێ لەو نێوانەدا ڕوو بدات و حەڵاڵ و حەرام لێك جیا نەکرێنەوە.

جا تێکەڵبوون بە چەند شێوەیە: یان هەر دوو لایەنی حەڵاڵ و حەرامەکە هێندە زۆرە لە ژماردن بەدەرە، یان لایەنێکیان زۆرە و لە ئەژماردن بە دەرە و ئەو لایەنەکەیتر کەمە و دەژمێررێ، یان هەردوولا، کەمن و دەژمێررێن. جا ئەگەر ئەو دوو لایەنە حەڵاڵ و حەرامە کە پێکەوە تێکەڵ بوون، کەم بن و لە ئەژماردن بێن، ئەوە ئەویش دوو شێوەیە: یان بە شێوەیێ کە لە جیاکردنەوەدا لە مرۆڤ تێك بچێ وەکوو: چەندانە کۆیلە، یان شتانێتر [وەکوو چەند سەر مەڕ یا ڕەشەوڵاخ].

**جا ئەم بەشە شوبهەیەش بە سێ جۆر ڕوون دەبێتەوە:**

**جۆری یەکەم:** شتێك لەگەڵ چەند شتیتردا کە ژمارەیان دیارە تێك بچێ وەکوو: ئەوەی کە ئاژەڵێکی مردارەوە بووی لەگەڵ دە ئاژەڵ کە سەربڕاون لێ تێك بچێ، یان ژنێك کە

مەحرەمی شیریی کەسێکە لەگەڵ دە ژنیتردا لێتێك بچێ. ئەمە بە ئیجماعی تێکڕای زانایان، پێویستە مرۆڤی موسڵمان خۆی لێ بپارێزێ، چونکە ڕێی ئیجتیهاد نەماوەتەوە [بۆ دیاریکردنی حەڵاڵ و حەرام].

**جۆری دووهەم:** شتێکی حەرامە کە لە ژمارە دێت لەگەڵ شتێکی حەڵاڵ کە لە ژماردن نایێت تێکەڵ بێت؛ وەکوو: تێکەڵبوونی دە مەحرەمی شیری لەگەڵ تەواوی ژنانی شارێکی گەورەدا. ئەوە لەسەر ئەو کەسە حەرام نییە لە ژنانی ئەو شارە بخوازێ؛ لەبەر ئەوەی حەڵاڵەکان زۆرن و پێویستیشی هەیە بە ژنهێنان. چونکە هەرکەس مەحرەمێکی لەناو ژنانی شارێکدا لێ تێك بچێ، نابێ قەدەغە بکرێ لە ژنهێنان.

هەرکەسێکیش کە بە دڵنیاییەوە بزانێ کە ماڵ و دارایی تەواوی دونیا، حەرامی تێکەڵ بووە، خۆ نابێ خواردن و مامەڵەکردنی لەسەر حەرام بکەین؛ چونکە خوای گەورە شتێکی لە دیندا دانەناوە کە مرۆڤ تووشی سەختی و ناچاری بکات.

وە لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ قەڵغانێك و عابایێك دزرا بەڵام خۆ کەس لە دنیادا قەدەغە نەکرا کە عابا و قەڵغان نەکڕێ.

**جۆری سێهەم:** شتێکی حەرام کە لە ژماردن نەیێت لەگەڵ شتێکی حەڵاڵدا کە ئەویش لە ژماردن نەیێت تێکەڵ بن؛ وەکوو: ماڵ و دارایی لەم سەردەمی ئێمەدا. ئەوەی کە بەلای منەوە ڕاست بێت و هەڵیبژێرم ئەوەیە کە هیچ شتێ ڕاستەوخۆ حەرام نییە، مەگەر نیشانەی حەرامی پێوە دیار بێت. [بەڵام ئەگەر نیشانەی حەرامی پێوە دیار نەبوو] ئەوە بۆ ئەهلی وەرەع و خۆپارێز وا باشە کە تەرکی بکەن. نیشانە و ئاسەواری حەرام وەکوو ئەو ماڵانە دەستی پاشایەکی زاڵمی بە سەرەوە بێت یان بەو مامەڵە حەرامانەی کە لەمەولا باسیان دەکەین مامەڵە کرابێت. بەڵگەی ئەم وتەیەش ئەوەیە کە لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ و لە سەردەمی خەلیفە ڕاشیدەکاندا رضي الله عنهم قەت مامەڵە و دانوستان و ماڵ وەدەسهێنان قەدەغە نەکراوە، لەگەڵ ئەوەشدا کە لە بازاڕدا پارەی شەراب و ماڵی سوو و ڕیبا لە دەستی کافرانی ئەهلی زیممەوە، زۆر بوو.

**شێوەیێکیتر لە شوبهە:** ئەگەر کڕیار کاڵایێك بە قەرز بکڕێ؛ بەڵام پاشان پارەکەی لە ماڵی حەرام بدا بە فرۆشیارەکە، ئەوە ئەگەر ئەو فرۆشیارە پێش ئەوەی پارەکە وەربگرێ

بە ڕەزایەتی دڵی خۆی و بە دڵنیاییەوە، کاڵاکەی دابێ بە کڕیارەکە، ئەویش پێش ئەوەی پارەکەی ئەم بدات، کاڵاکەی خواردبێ [یان کەڵکی لێ وەرگرتبێ]، ئەوە بۆ ئەو کڕیارە لەو کاتەدا حەڵاڵە، ئیدی بەوەی کە پاشان پارەی حەڵاڵ لە قیمەتەکەیدا بدات، حەرام نابێ؛ بەپێ فتوای تێکڕای زانایان. بەڵام پێویستە لەلایەن فرۆشیارەکەوە گەردنی ئازاد بکرێ؛ چونکە وەکوو ئەوە وایە هەر پارەی نەدابێ و ئەوەی وا خواردوویە حەرام نەبێت. ئەگەر فرۆشیارەکە گەردنی ئازاد کرد، لەگەڵ ئەوەیدا کە ئەیزانی کە پارەکەی حەرامە، ئەوە هەم ئەبێتە هۆی گەردن ئازادبوونی و هەم ئەبێتە هۆی حەڵاڵبوونی شتەکە[!].

## بەشی چوارەم: پرسیار و بە شوێندا چوون [بۆ حەڵاڵ و حەرام]

جا بزانە لە هەرچی کاتدا باش نییە بۆ حەڵاڵ و حەرام بپرسی و هەروەها نابێ ئەم کارە لە هەرچی کاتدا تەرك بکرێ و پەرکێشی نەکرێ. ئەگەر ئەو کەسەی کە ماڵەکە لە دەستی وەرئەگرێ لە لیباسی کەسانێکی شیاو و شایستەدا بوو، ئەوە هەر ئەو حاڵەتە بەسە و پێویست ناکات بپرسێ. ئەگەریش لە لیباسی ئەهلی زوڵم و زۆر و فیسقدا بوو ئەوە هەر ئەو حاڵەتە بۆ حەرامییەکەی بەسە. بەڵام ئەگەر حاڵەتی نادیار بوو؛ نە لە تاجری دەسپاکی ڕاست دەچوو، نە لە ئەهلی زوڵم و زۆر دەچوو، قەوڵی زاهیر و فتوا پێدراو وایە کە هەر بە عەداڵەتی موسڵمانیەتی کیفایەت ئەکرێ و پێویست ناکات بە شوێن حەڵاڵ و حەرامیدا بگەڕێ.

هەندێ لە زانایان پرسیارکردنیان بە دروست داناوە و [مرۆڤ ئەتوانێ بە گوێرەی ئەم فتوا لە کڕیار، یان لە فرۆشیار بۆ حەڵاڵی و حەرامی ماڵەکەی بپرسێ].

ئەگەر پیاوێ داهات و دەرامەدێکی حەرامی بوو، یان لەلایەن پاشا[ی زاڵم و] کاربەدەستانیەوە ماڵێکی دەس کەوت، باش وایە تەرکی بکات.

هەندێکیتر بۆ ڕای زۆربەی زانایان، یان بۆ زۆربەی خەڵکیان ڕوانیوە و بەپێ ئەوەی کە زۆر کات ئاوەهایە فتوایان داوە.

«حاریسی موحاسبی رَحِمَهُ اللَّهُ» فەرموویەتی: «هەرکەس دۆستێك یان برایێکی ببێت، پێویست ناکات پرسیاری لێ بکات؛ چونکە هەندێ جار بەهۆی ئەم پرسیارانەوە بڕێ شتی بۆ دەردەکەوێ کە پێشتر لێ بێ خەبەر بووە، ئەمەش ئەبێتە هۆی دڵڕەنجان و تووڕەبوونی دۆست و برادەرەکەی، وە ئەمەش خۆی گوناحە».

هەروەها پێویستە بزانی کە هیچ کەڵکێك لەوەدا نییە کە لە کەسێك کە هەندێ لە ماڵەکەی حەرامە و هەندێکی حەڵاڵە؛ پرسیار بکرێ؛ چونکە زۆر جار لەبەر هەندێ هۆکار درۆ دەکات کە وابوو باشتر وایە لە غەیر خۆی پرسیار بکرێ.

## بەشی پێنجەم: چۆن ڕزگار بوون لە دەس گوناحی ماڵی حەرام

پێویستە بزانی، هەرکەس کە تۆبە بکات و ماڵی حەرامی لەلا بێت ئەوە چەند ئەرکێکی بەسەرەوە کە ئەبێ ڕەچاویان بکات لە جیاکردنەوەی ماڵە حەرامەکە لە ماڵی خۆی و چۆن خەرجکردنی ئەو ماڵە:

**ئەرکی یەکەم:** شێوەی ماڵی حەڵاڵ لە حەرام هەڵاواردن و دەرکردنی لە ماڵی خۆی. ئەگەر ماڵەحەرامەکە دیار بوو وەکوو ئەوەی غەسب بێت یان بە ئەمانەت لەلای دانرا بوو یان بەهەر شێوەیە کە ڕوون بێت، ئەوە جیاکردنەوەی ئاسانە. بەڵام ئەگەر تێکەڵاو و ئاوێتە بێت، بەم شێوە کە بزانێ نیوەی لە ماڵەکەی حەرامە یان لە ڕێی کاسبییێکەوە وەدەست هاتووە کە درۆ و غەدەر و دەسپیسی تێدا کردووە، ئەوە پێویستە ـ ئەگەر ئەندازەکەی بزانێ ـ جیای بکاتەوە؛ بەڵام ئەگەر ئەندازەکەی نەدەزانی، با بە پارێزەوە و بە ڕەچاوکردنی گومانی زۆر و بەدڵنیاییەوە لێکیان هەڵاوێرێ.

ئەرکی دووهەم: چۆن خەرجکردنی ماڵە حەرامەکە کە جیای کردۆتەوە. هەرکاتێ کە ماڵە حەرامەکەی جیاکردەوە، ئەگەر ئەو ماڵە خاوەنی هەبوو، بیداتەوە بە خاوەنەکەی، ئەگەریش خاوەنەکەی مردبوو، ئەوە بیداتەوە بە میراتبەرەکانی. ئەگەر خاوەنەکەی ڕۆیشتبوو، ئەوە یان چاوەڕوان بێت، بگەڕێتەوە، یان بە هەر جۆرێك بێت، ماڵەکەی بگەیێنێتەوە دەستی. ئەگەریش خاوەنێکی دیاری نەبوو، ئەوە بە هەژار و فەقیری بدات، یان بۆ بەرژەوەندی گشتی موسڵمانان خەرجی بکات بەم شێوە: مزگەوتێ یان پردێ یان کاروانسەرایێ تایبەتی هەژارانی پێ دروست بکات.

ئەگەریش حاکم و قازی ئەمیندار لەو شوێنەدا، دەس کەوت، باش وایە بیسپێرێت بە دەستی ئەو؛ بەڵام ئەگەر بیسپێرێت بە دەستی قازیێکی غەدرکەر، ئەوە گوناحەکەی لە کۆڵ ناکەوێ. حەدیس و هەواڵی زۆر لە پێغەمبەرەوەﷺ هاتووە کە ئەوە دەگەیەنێ کە

دروستە ئەم جۆرە ماڵە حەرامانە، ببەخشرێ بە هەژار و فەقیر یان بۆ بەرژەوەندی موسڵمانان خەرج بکرێ. پێغەمبەرﷺ دەستووری فەرموو: ئەو مەڕە برژاوەی کە هێنابوویانە خزمەتی و پێیان گوتبوو حەرامە: «أَطْعِمُوهَا الْأُسَارَىٰ»[1] واتە: «ئەو مەڕە بدەنە دەرخواردی ئەسیرەکان».

## بەشی شەشەم: دیاری و خەڵاتی پاشایان

پێویستە ئەو کەسەی کە لەلایەن پاشاوە خەڵات و دیاری بۆ دێ، تێفکرێ و بڕوانێ: ئەگەر لەو ماڵانەیە کە لە سەرانەدا لە خەڵکی موسڵمانی سەندووە، یان لێیانی داگیرکردووە، نابێ لێی وەرگرێ. بەڵام ئەگەر بە میرات پێی گەیشتبوو یان لەو ماڵانە بوو کە خاوەنێکی دیاریکراوی نییە، یان غەنیمەت و سەرانە و ماڵیاتی کافران بوو، ئەوە قەیدی نییە، بەو مەرجەی کە ئەو کەسەی ئەم ماڵەی پێ دەدرێ پێویستی بێت یان بەرژەوەندی موسڵمانانی تێدا بێت. حەزرەتی عومەرؓ وای بۆ چووە کە: هەموو کەس لە بەیتولماڵدا، بەشی هەیە.

[تێبینی:] «جزیە»: [ئەو ماڵەی کە لە سەرانەی کافرانێکدا کە لە وڵاتی ئیسلامیدان و بەشەڕ نایێن، دەستێنرێ] چوارپێنجەمی ($\frac{4}{5}$) لە بەرژەوەندی موسڵماناندا و پێنج‌یەکیشی ($\frac{1}{5}$) لەو ئیشانەی کە دیاریکراون خەرج دەکرێ.

زانایان لەبارەی کەسێکەوە کە پارە لە پاشا وەربگرێ بۆ ئەوەی بۆ هەژار و گەدای خەرج بکات، لەسەر دوو ڕان: هەندێکیان کە خۆپارێز و ئەهلی وەرعن قەدەغەیان کردووە و دەستیان لێ ڕاگرتووە. هەندێکیشیان بە دروستیان داناوە و ئەنجامیان داوە. وا دیارە وا باشترە کە لە پاشای بستێنێ بەڵام بەو مەرجەی خۆی حەزی لێ نەکات کە بۆ خۆی خەرج بکات، هەروەها خەڵکیش لەمەدا چاوی لێ نەگرن و وا گومان بەرن کە چونکە فڵانە کەس لە پاشا ماڵی وەرگرتووە ئەوە ئیتر ماڵی پاشا حەڵاڵە و ترسیان بشکێ و ئەوانیش بچن لە پاشا ماڵ وەرگرن.

والله أعلم

---

١. احمد: ٢١٤٧١، طبرانی فی الکبیر: ١٥٩٠، دارقطنی فی سننه: ٤٨٢٦.

# بابەتی پازدەهەم: داب و شێوازی دۆستایەتی

بزانە یەکتر خۆشویستن لەبەر خوا و برایەتی لە دینی خوای گەورەدا لە گەورەترین عیباداتە.
ئەمەش بەری داری خۆشڕەفتاری و ئاکار چاکەیە کە هەردووکیان [واتە: برایەتی و خۆشڕەفتاری] پەسند کراون. خوای گەورە لەبارەی خۆشڕەفتارییەوە فەرموویەتی: ﴿وَ إِنَّكَ لَعَلَىٰ خُلُقٍ عَظِيمٍ﴾[1] واتە: «[ئەی موحەممەد!] بێگومان تۆ چاکترین ئاکار و ڕەفتارت هەیە». خوای گەورە لەبارەی برایەتی و پێکەوە بوونەوە فەرموویەتی: ﴿فَأَصْبَحْتُمْ بِنِعْمَتِهِ إِخْوٰاناً﴾[2] واتە: «لە سایەی نیعمەتی خواوە (دینی ئیسلام) ئێوە بوونە برا». دیسان خوا ئەفەرموێ: ﴿لَوْ أَنْفَقْتَ مٰا فِي الْأَرْضِ جَمِيعاً مٰا أَلَّفْتَ بَيْنَ قُلُوبِهِمْ وَلٰكِنَّ اللّٰهَ أَلَّفَ بَيْنَهُمْ»[3]

واتە: «ئەگەر تۆ [ئەی موحەممەد!] تەواوی ئەو شتانەی کە لە زەویدان، بەخشت بکردایە، هێشتا نەتدەتوانی دڵیان بخەیتە یەك، بەڵام خوا دڵیانی خستەیەك».

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «إِنَّ أَقْرَبَكُمْ مِنِّي مَجْلِساً أَحٰاسِنُكُمْ أَخْلاقاً، الْمُوَطَّئُونَ أَكْنٰافاً الَّذِينَ يَأْلِفُونَ وَ يُؤْلَفُونَ».[4]

واتە: «نزیکترین کەستان بە منەوە لە دانیشتنی [پاشەڕۆژدا] ئەوانەتانن کە ئاکار و ڕەفتاریان جوانە و هەمیشە دەوروبەریان پڕە و پێوەندی بە خەڵکەوە دەگرن و خەڵکیش هۆگریانن».

---

١. القلم: ٤.

٢. آل‌عمران: ١٠٣.

٣. الأنفال: ٦٣.

٤. طبرانی فی الکبیر: ٧٦٣٩ ـ ١٨٣ ـ ٩٦٤، بیهقی فی شعب الإیمان: ٨٦٠٥ ـ ٧٦١٦ ـ ٧٧٦٥ بروایات مختلفة: «إِنَّ أَحَبَّكُمْ إِلَيَّ أَحٰاسِنُكُمْ أَخْلاقاً الْمُوَطَّئُونَ أَكْنٰافاً الَّذِينَ يَأْلَفُونَ وَ يُؤْلَفُونَ».

پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «مَنْ أَرٰادَ اللّٰهُ بِهِ خَيْراً رَزَقَهُ خَلِيلاً صٰالِحاً إِنْ نَسِيَ ذَكَّرَهُ وَ إِنْ ذَكَرَ أَعٰانَهُ».[1]

واتە: «خوای گەورە ئەگەر ویستی باشی لەگەڵ کەسێکدا بێ، هاوەڵێکی چاك دەکاتە نەسیبی، ئەگەر [خوا، یان هەر شتێکی‌تر] لەبیر کات، دەیخاتەوە بیری، ئەگەریش لە بیریدا بێت یارمەتی ئەدات [بۆ چاك ئەنجامدانی کارەکەی].

دیسان پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «مَنْ آخِي أَخٰا فِي اللّٰهِ تَعٰالَىٰ، رَفَعَهُ اللّٰهُ تَعٰالَىٰ دَرَجَةً فِي الْجَنَّةِ[2] لا يَنٰالُهٰا بِشَيْءٍ مِنْ عَمَلِهِ».

واتە: «کەسێك لەبەر خوا برایەتی لەگەڵ کسێکدا بکات ئەوە خوای گەورە پلەیێکی پێ ئەدات کە بە هیچ کردەوەیێکی بەو پلەیە ناگات».

## بەشی یەکەم:
## ڕوونکردنەوەیەك لەسەر برایەتی لەبەر خواو برایەتی لەبەر دونیا

پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «اَلْأَرْوٰاحُ جُنُودٌ مُجَنَّدَةٌ فَمٰا تَعٰارَفَ مِنْهَا ائْتَلَفَ وَ مٰا تَنٰاكَرَ مِنْهَا اخْتَلَفَ»[3].

واتە: «ڕۆحەکان لەشکرانێکی ئامادە و تەیارن، هەرکامیان، یەکتری بناسن پێك دەگەن، هەرکامیشیان یەکتری نەناسن، لێك جیا دەبنەوە».

دیسان پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «إِنَّ رُوحَيِ الْمُؤْمِنَيْنِ لَيَلْتَقِيٰانِ عَلَىٰ مَسِيرَةِ يَوْمٍ وَ مٰا رَأَىٰ أَحَدُهُمٰا صٰاحِبَهُ قَطُّ»[4].

واتە: «ڕۆحی دوو ئیماندار، لەگەڵ ئەوەی ڕۆژە ڕێگەیێك بەینیانە و قەتیش یەکتریان نەدیوە، دەگەنەیەك [و یەکتری ئەناسن]».

هەر مرۆڤێك لەبەر یەکێ لەم هۆیانەی خوارەوە غەیری خۆی خۆش ئەوێ:

---

١. ابوداود: ٢٥٤٣، نسائی: ٤١٣٣، احمد: ٢٣٢٧٨، بلفظ: «... جَعَلَ لَهُ وَزِيراً صٰالِحاً...».

٢. طبرانی فی مسند الشّامیین: ١٥٢.

٣. بخاری: ٣٣٣٦، مسلم: ٤٧٧٣، ابوداود: ٤١٩٤، احمد: ٧٥٩٤.

٤. احمد: ٦٣٤٧ بلفظ: «إِنَّ أَرْوٰاحَ الْمُؤْمِنِينَ تَلْتَقِىٰ عَلَىٰ مَسِيرَةِ يَوْمٍ مٰا رَأَىٰ أَحَدُهُمْ صٰاحِبَهُ قَطُّ»، جامع الکبیر للسیوطی: ٨٢٥.

[یەکەم:] لەبەر ئەوەی ئەو کەسە جوانە و خوێنشیرینە.

[دووهەم:] لەبەر ئەوەی ئەو کەسە ئەتوانێ ئەم بە ئامانجی دونیایی بگەیەنێ و بەرژەوەندی ببێ بۆی.

[سێهەم:] لەبەر ئەوەی یارمەتی دەدات بۆ گەیشتن بە خێراتی دوارۆژ.

[چوارەم:] لەبەر ڕەزای خوا و بۆ خوا خۆشی ئەوێ نەك لەبەر ئەوەی بە ئامانجی دونیایی یا دوارۆژی بگات؛ بەڵکوو لەبەر ئەوەی عەبدی خوایە، خۆشی ئەوێ.

جا هەرکەسێ، کەسێتری خۆش بوێ، ئەویش خۆشی ئەوێ، ئەمەیە پێ ئەڵێن: برایەتی لەبەر خوا. وەکوو چۆن «مەجنوونی عامیری» ئەڵێ:

«أَمُـرُّ عَلَىٰ جِـدٰارِ دِیٰارِ "لَیْلَیٰ" أُقَبِّلُ ذَا الدِّیٰارَ وَ ذَا الْجِـــدٰارٰا
وَ مٰا حُبُّ الدِّیٰـــارِ شَغَفْنَ قَلْبِي وَلٰكِنْ حُبُّ مَنْ سَكَنَ الدِّیٰارٰا»

واتە: «بە پاڵی دیواری ماڵی لەیلا ڕادەبرم، ماچی ئەو شار و دار و دیوارە دەکەم. بەڵام خۆ، خۆشەویستی ئەو ماڵانە، دڵی منی گراوی خۆی نەکردووە. بەڵکوو ئەوەی وا لەنێو ئەو شارەدایە، دڵی منی بردووە».

پێویستە ئەوەش بزانین هەر وەکوو چۆن، خۆشویستن ئەبێ، لەبەر خوا بێ، ئەبێ قین و غەرەزیش هەر لەبەر خوا بێ. هەرکەسێ، کەسێکیتری خۆش بوێ لەبەر ئەوەی دۆستی، دۆستەکەیە و گوێڕایەڵیە، ئەبێ قینیشی لەو کەسە بێ کە دوژمنی دۆستەکەیە و ئازاری دەدات.

## بەشی دووهەم:
## تایبەتمەندی ئەو کەسانە کە بۆ دۆستایەتی هەڵیان دەبژێری

پێویستە بزانی هەموو کەسێ بۆ دۆستایەتی ناشێ. پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «اَلْمَرءُ عَلَىٰ دِینِ خَلِیلِهِ فَلْیَنظُرْ أَحَدُكُمْ مَنْ یُخٰالِلْ».[1]

واتە: «هەر مرۆڤێك وا لەسەر دینی ڕەفێقەکەیەوە، کە وابوو هەرکام لە ئێوە با بزانێ لەگەڵ کێدا ڕەفێقی دەکات».

پێویستە ئەو کەسەی کە بۆ دۆستایەتی هەڵی ئەبژێری، چەند مەرجی تێدا بێ:

١. ابوداود: ٤١٩٣، ترمذی: ٢٣٠٠، احمد: ٧٦٨٥.

١. عاقڵ بێ؛

٢. ئاکار جوان و ڕێکوپێك بێت؛

٣. فاسق و بێئەخلاق نەبێ؛

٤. ئەهلی بیدعەت و خراپەکاری نەبێت؛

٥. بۆ ماڵی دونیا تەماحکار نەبێت.

چونکە عەقل سەرمایەیە، حەزرەتی عەلی رضي الله عنه فەرموویەتی:

فَلا تُصحِبُ أَخا الْجَهْلِ ... وَإِيّـــاكَ وَإِيّـــاهُ

فَكَمْ مِنْ جٰـاهِلٍ أَرْدَىٰ ... حَلِيمـــاً حِينَ آخٰـــاهُ

يُقاسُ الْمَـــرْءُ بِالْمَـــرْءِ ... إِذٰا مَا الْمَـــرْءُ مٰاشٰـــاهُ

وَلِلشَّيْءِ مِـــنَ الشَّيْءِ ... مَقٰـــايِيسُ وَأَشْـــبٰاهُ

وَلِلْقَلْبِ عَلَـــى الْقَلْبِ ... دَلِيلٌ حِيـــنَ يَلْقٰـــاهُ

واتە: «لەگەڵ نەزاندا هاوڕێ مەبە، ئاگات لە خۆت بێ قەرەی نەکەوی.

چونکە زۆر نەزان لەگەڵ زاناو ژیردا بوون بە هاوڕێ و لەناویان بردن.

هەرکەس لەگەڵ هەرکەسێ هاوڕێ بێت وەکوو ئەو دەسەنگێنرێ.

بۆ هەر شتێ، لەناو شتاندا، پێوەر و کێشانە و وێنەیێك هەیە.

دڵیش خووی دڵێتر دەگرێ کاتێ کە پێکەوە بن».

ئاخر چلۆن دەبیتە دۆس لەگەڵ گێل و گەوجێکدا کە کاتێ بیەوێ خێرت پێ بگەیێنێ، زەرەرت لێ دەدات؟!

هەندێ شاعیر گوتوویانە:

«إِنِّي لَآمَنُ مِنْ عَـــدُوٍّ عٰـــاقِلٍ ... وَأَخٰـــافُ خِـــلّاً تَعْتَرِيهِ جُنُونٌ

فَالْعَقْلُ فَنٌّ وٰاحِـــدٌ وَطَرِيقُهُ ... أَدْرِي فَأَرْصُدُ، وَالْجُنُونُ فُنُونٌ»

واتە: «بێشك من لە دوژمنی ژیر ئەمینم؛ بەڵکوو لە دۆستێك ئەترسم کە شێتیی بەسەردا هاتبێ. چونکە عەقڵ یەك جۆرە و ڕێگەکەی ئەزانم و خۆمی لێ دائەگرم. بەڵام شێتی جۆراوجۆرە».

لەبەر ئەمەیە کە هەندێ گوتوویانە ئاموشۆنەکردنی گێل و نەزان، خۆی عیبادەتە و هۆی نزیکییە بە خواوە.

دۆستی فاسیق و بێئەخلاقیش هیچ خێرێ لە هاوڕێیدا نییە؛ چونکە کەسێ لە خوا بترسێ، بەردەوام گوناحی گەورە ناکات. ئەدی هەر کەسیش لەخوا نەترسێ کەس لە شەڕی، ئەمین نییە. خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَلا تُطِعْ مَنْ أَغْفَلْنَا قَلْبَهُ عَنْ ذِكْرِنَا وَاتَّبَعَ هَوَاهُ﴾[1].

واتە: «شوێن کەسێ مەکەوە کە دڵیمان لە یادی خۆمان غافڵ کردووە و شوێن هەواو ئارەزوو خۆی کەوتووە». تەبیعەت و مێشکی مرۆڤ لە تەبیعەت و مێشکی کەسانیتر ئەدزێ بەجۆرێ خۆی پێی نازانێ.

سەبارەت بە دۆستی ئاکارجوان، "عەلقەمە"رَحِمَهُ‌اللَّهُ لە ئامۆژگاریەکانیدا کە لەکاتی سەرەمەرگدا بۆ کوڕەکەی کردووە، ئاوەها ئەفەرموێ:

«کوڕیلەم! ئاگاداربە! هەرکاتێ پێویستت بوو لەگەڵ کەسانێکدا هاوڕێ بیت، ببە بە هاوڕێی کەسانێ کە ئەگەر خزمەتت کردن، تۆ لە شەڕ بپارێزن. ئەگەر لەگەڵیان بووی ببنە زینەت بۆت و بتڕازێننەوە، ئەگەر دەستەنگ بووی، یارمەتیت بدەن. لەگەڵ کەسانێك بە ئەگەر دەستت بۆ کارێ خێر برد، دەستت بگرن. ئەگەر شتێ چاکەیان لە تۆ دی، لە بەرچاوی بگرن. ئەگەریش شتی خراپەیان لە تۆ چاو پێ‌کەوت، بەری بگرن. لەگەڵ کەسێکدا بە کە هەر کات داوای لێ بکەی دریغت لێ نەکات، هەرکاتێك بێ‌دەنگ بیت. ئەو دەس بکات بە پەیڤین لەگەڵتا، هەرکات بەڵاو کارەساتت تووش بێ، بێت بە هاناتەوە و دڵداریت بداتەوە. لەگەڵ کەسێکدا بە هەرکاتێ قسەیێکت کرد، دان بە قسەکەتدا بنێ، هەروەها هەرکاتێ بۆ کارێك تێکۆشای، یارمەتیت بدات. هەرکاتیکیش بوو بە کێشەتان ئەو ڕێزی تۆ لە خۆی زیاتر بگرێ».

حەزرەتی عەلی کوڕی ئەبیتالیبرَضِيَ‌اللَّهُ‌عَنْهُ فەرموویەتی:

| | |
|---|---|
| «إِنَّ أَخاكَ الْحَقَّ مَنْ كانَ مَعَكَ | وَ مَنْ يَضُرُّ نَفْسَهُ لِيَنْفَعَكَ |
| وَ مَنْ إِذا رَيْبُ زَمانٍ صَدَعَكَ | شَتَّتَ فِيهِ شَمْلَهُ لِيَجْمَعَكَ» |

واتە: «برای ڕاستەقینە ئەوەیە کە بەردەوام لەگەڵتا بێت. ئەوەیە کە زەرەر بدا لەخۆی بۆ ئەوە، خێر بگەیێنێ بە تۆ.

ئەوەیە کە ئەگەر، چەرخەی ڕۆژگار تۆی دا بەزەویدا، ئەو خۆی بڕەتێنێ و پەلامار بدات بۆ ئەوەی تۆ کۆ بکاتەوە».

---

١. الكهف: ٢٨.

لەنێو ڕابردواندا (سەلەف) کەسانێك بووە کە کاتێ براکەی مردووە، بە ماوەی چل ساڵ خێزان و ماڵ و منداڵی، بەخێو کردووە و نیازەکانیانی بەراورد کردووە و هەموو ڕۆژێ سەردانی ماڵیانی کردووە و خەرجییان داوە؛ بەشێوەیێ ئەوان هەستیان بە باوكمردن نەکردووە، مەگەر ئەوەی هەر زاتەکەیان لە بەرچاو ون بووە. تەنانەت شتانێك یان ئاکارێکیان لێوە دیوە کە قەت لە ژیانی باوکیشیاندا شتی وایان نەدیوە.

باش وایە هاوڕێ و دۆستت جگە لەوەی خۆپارێز و ئەهلی وەرع بێت زاناش بێ تا تۆ هەمدیسان لە زانیارییەکەشی کەڵك وەربگری.

لوقمان ئەفەرمێ: ئەی کوڕیلەم! لە خزمەت زانایاندا بە، چۆك بە چۆك لەگەڵیاندا دابنیشە؛ چونکە دڵ بە حیکمەت و زانیاری دەبووژێتەوە، هەر وەك چۆن زەویی وشك و قاقڕ بە باران دەبووژێتەوە.

## بەشی سێهەم: سەبارەت بە ئەرك و مافی برایەتی و دۆستایەتی

پێویستە بزانی پێوەندی برایەتی لەنێوان دوو کەسدا، هەر وەکوو پێوەندی نێوان ژن و شوو وەهایە. هەرکاتێ پێوەندی برایەتی پێك هات، ئەوە چەند ئەرك و مافێك لەسەر یەك واجب دەکات کە بریتین لە:

١. ماڵ؛
٢. گیان؛
٣. زمان؛
٤. دڵ؛
٥. لێبوردن؛
٦. دوعا؛
٧. وەفا و ئەمەگ؛
٨. زۆر لێنەکردن و نەخستنە ناوە ڕەنج و ئازارەوە.

یەکەم: ئەرك و مافی ماڵی و ماددی [ئەمەش سێ پلەیە] لانی کەم: ئەوەیە هەر وەکوو چۆن کۆیلەکەت لە نیاز و پێداویستییە زەرووریەکان دابین دەکەی لەگەڵ ئەویشدا وەها

بیت. پلەی ناوەڕاست: ئەوەیە وەکوو خۆت وا بێت. سەرترین پلە: ئەوەیە لە خۆت باشتر بە دەمیەوە بیت؛ واتە: لە خۆت بگریتەوە بۆ ئەوە ئەو پۆشتە و تەیار بێت، ئەمە بانترین پلەی دۆستایەتییە.

لەم بارەوە حەدیسی زۆر هاتووە. پێغەمبەرصَلَّىٰاللَّهُعَلَيْهِوَسَلَّمَ فەرموویەتی: «إِنَّهُ مَا اصْطَحَبَ اثْنٰانِ قَطُّ إِلّٰا كٰانَ أَحَبُّهُمْ إِلَى اللّٰهِ ـ تَعٰالَىٰ ـ أَرْفَقُهٰا بِصٰاحِبِهِ»[1].

واتە: «دووکەس، هەرکاتێ ببنە هاوڕێ و دۆستی یەك، ئەوەیانە وا دۆستەکەی زیاتر خۆش ئەوێ، لەلای خواوە خۆشەویستترە».

دووهەم: یارمەتی گیانی و بەدەنی لە ئەنجامدانی پێداویستییەکانیدا و پێش ئەوەی داوای لێ بکات ئەم قۆڵی بۆ هەڵماڵێ. ئەم جۆرە یارمەتیەش هەر وەکوو یارمەتی ماددی، ئەو سێ پلەیەی کە ڕامانبورد، هەیەتی.

سێهەم: نابێ بە جۆرێ لەگەڵیدا بجووڵێتەوە، یان باسی شتانێکی لەگەڵدا بکات کە پێی ناخۆش بێت. ئەنەسرَضِيَٱللَّهُعَنْهُ فەرموویەتی: «كٰانَ رَسُولُ اللّٰهِصَلَّىٰاللَّهُعَلَيْهِوَسَلَّمَ لا يُوٰاجِهُ أَحَداً بِشَيْءٍ يَكْرَهُهُ»[2] واتە: پێغەمبەری خواصَلَّىٰاللَّهُعَلَيْهِوَسَلَّمَ بەجۆرێ لەگەڵ کەسێکدا نەدەجووڵایەوە کە پێی ناخۆش بێت».

جا بزانە ئەگەر بە شوێن دۆستێکدا بگەڕێی کە دوور بێ لە عەیب، ئەوە هەر دەستت ناکەوێ، ئیمامی شافیعیرَحِمَهُٱللَّهُ فەرموویەتی: «هیچ موسڵمانێك نییە کە بەتەواوی گوێڕایەڵی خوا بێت و قەت بێ‌ئەمری نەکات، هەروەها هیچ کەسێك نییە کە بێ‌ئەمری خوا بکات و [جار ـ جارێ] بەگوێ نەکات؛ کەوابوو: هەرکەس تاعەت و عیبادەتی لە گوناحی زۆرتر بوو ئەوە بە عادڵ دائەنرێ، ئەدی ئەگەر ئاوەها کەسێ لەچاو خواوە بە عادڵ دابنرێ، ئەبێ لەچاو تۆوە باشتر بە عادڵ دابنرێ» تۆ لەوانە بە وا چاکەی دۆستان دەخەنە بەرچاو و خراپەیان دائەپۆشن؛ چونکە خوای گەورە کاتێ هاواری لێ ئەکرێ بەم تایبەتمەندییەی هانای پێ ئەبرێ؛ ئەوێژرێ: «يا مَنْ يُظْهِرُ الْجَمِيلَ وَ يَسْتُرُ عَلَى الْقَبِيحِ»[3] واتە: «ئەی کەسێکە وا چاکە وەدەر دەخەیت و خراپە دادەپۆشی».

---

١. طبرانی فی الکبیر: ١٧٩٨ و فی الأوسط: ٣٠٠٩، حاکم فی المستدرك: ٧٤٣١، ابن‌حبان فی صحیحه: ٥٦٧، بیهقی فی شعب الإیمان: ٨٦٣٠ بلفظ: «مٰا تَحٰابَّ اثْنٰانِ فِي اللّٰهِ إِلّٰا كٰانَ أَعْظَمَهُمٰا أَجْراً أَشَدُّهُمٰا حُبّاً لِصٰاحِبِهِ».

٢. کنز العمال للهندی: ١٨٣٨٩.

٣. کنز العمال للهندی: ٣٨٢٩ ـ ٥٠٩٩.

هەروەها بزانە ئەوەی وا خوا خۆشی ئەوێ، کەسێکە وا خۆی بە ئەخلاق و ئاکاری خواوە دەڕازێنێتەوە کە بریتییە لە "ستارالعیوب" واتە: داپۆشێنەری عەیب و خوار و خێچی، "غفار الذنوب" واتە: بەخشێنەری گوناح .

هەروەها بشزانە کە ئیمانی مرۆڤی موسڵمان دانامەزرێ، مەگەر ئەوەی کە وا بۆ خۆی خۆشی ئەوێ بۆ برا دینییەکەی خۆشی بوێ. بێشك برای دینیش چاوەڕوانە براکەی عەیبەکانی داپۆشێ و لە هەڵەکانی خۆش ببێ و ڕازەکانی نەدرکێنێ. هەندێ گوتوویانە: «قُلُوبُ الْأَحْرارِ، قُبُورُ الْأَسْرارِ» واتە: «دڵی پیاوچاکان و ئازادمەردان، گۆڕستانی ڕاز و قسە نەدرکاوەکانە». هەمدیس گوتوویانە: «إِنَّ قَلْبَ الْأَحْمَقِ فِي فِيهِ، وَ لِسٰانُ الْعاقِلِ فِي قَلْبِهِ» واتە: «دڵی مرۆڤی گێل و گەوج لە دەمیدایە و زمانی مرۆڤی ژیر لە دڵیدایە» واتە: مرۆڤی گێل و گەمژە ناتوانێ ئەوەی لە ناخ و دەروونیدایە بیشارێتەوە، بەڵکوو بە زمان دەری ئەبڕێ و خۆی بۆ ڕاگیر ناکرێ و خۆیشی نازانێ چی گوتووە.

ئیبنو موعتەز فەرموویەتی:

«وَ مُسْتَوْدِعِي سِرّاً تَبَوَّأْتُ كَتْمَهُ      فَأَوْدَعْتُهُ صَدْرِي فَصٰارَ لَهُ قَبْراً»

واتە: «ئەی کەسێ کە ڕازی خۆتت بە ئەمانەت دانا لامەوە، ئەوا منیش دامشارد و لە دڵی خۆمدا بە ئەمانەت دامنا، پاشان دڵم بوو بە گۆڕێك بۆ ئەو ڕازەت».

چوارەم: ئەو قسانەی کە خۆشی لێ دێ لەگەڵیدا بیکەی، بەو مەرجەی نەبێتە هۆی لە حەق لادانت.

پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «إِذٰا أَحَبَّ أَحَدُكُمْ أَخٰاهُ فَلْيُخْبِرْهُ».[1] واتە: «ئەگەر کەسێکتان براکەی خۆش ئەوێ، با ئاگاداری بکاتەوە»؛ چونکە هەر ئەمە خۆی ئەبێتە هۆی زیادبوونی خۆشەویستی لەنێوانیاندا.

لەمبارەوە شاعیر چەند جوان ئەڵێ:

«خُذْ مِنْ خَلِيلِكَ مٰا صَفٰا      وَدَعِ الَّذِي فِيـــهِ الْكَدَرِ

فَالْعُمْــرُ أَقْصَــرُ مِنْ مُعٰا      تَبَةِ الْخَلِيلِ عَلَـى الْغِيَرِ»

واتە: «لە دۆستەکەت هەرچی کە پاك و چاکە وەرگرە و فێر بە، هەرچێکیش لێڵ و خراپە لێی گەڕێ. چونکە تەمەن لەوە کورتترە کە سەرکۆنە و لۆمەی دۆستەکەت بکەی».

۱. ابوداود: ٤٤٥٩، احمد: ۲۰۳۳۲.

لە تاکە بەیتێکدا هاتووە:

«وَ لَسْتَ بِمُسْتَبِقٍ أَخــــا لا تَلُمُّهُ        عَلَىٰ شَعْثٍ، أَيُّ الرِّجَالِ الْمُهَذَّبِ؟»

واتە: «ئەگەر تۆ هۆشی براکەتت نەبێت و لەسەر کاری ئاڵۆز و شپرز لۆمەی نەکەی، برای ئەو نیت، ئەدی کام پیاو هەیە بەری بێت لە عەیب؟

پێنجەم: وەفاو ئەمەگداری و دڵپاکی لەگەڵ دۆستاندا، ئەمەش بە بەردەوامبوون و خۆڕاگرتن لەسەر خۆشەویستیی ئەو تا مردنی و لەپاش مەرگیشی بە خۆشویستنی ماڵ و منداڵی و یارمەتی دانیان پێك دێت. دەگێڕنەوە کە پیرەژنێ هات بۆلای پێغەمبەرﷺ و ئەویش زۆر ڕێزی لێ گرت، پێیان گوت: لەبەرچی هێندە ڕێزی لێ دەگری، ئەویش فەرمووی: «إِنَّمَا كَانَتْ تَأْتِينَا أَيَّامَ خَدِيجَةَ»[1] واتە: «ئاخر ئەو لە سەردەمی خەدیجەدا سەردانی ئەکردین».

جا بزانە ئەمەگداری بەشێکە لە ئیمان و بەجێهێنانی عەهد و پەیمانیش بەشێکە لە دین. ئەبێ ئەتۆ بەردەوام ڕێز و حورمەت بۆ دۆستانت دابنێی نەك خۆت لەوان بە گەورەتر بزانی. سەبارەت بەم باسە گوتوویانە:

«تَـــذَلَّلْ لِمَنْ إِنْ تَـــذَلَّلْتَ لَهُ        يَـــرَىٰ ذَاكَ لِلْفَضْـــلِ لا لِلْبَلَهِ
وَ جَـــانِبْ صَـــدَاقَةَ مَنْ لا يَزَا        لُ عَلَى الْأَصْدِقَاءِ يَرَى الْفَضْلَ لَهُ»

واتە: «ملکەچی ئەو کەسانە بە کە ئەگەر ملکەچ و گوێڕایەڵیان بیت بە گەورەی و ڕێزی دابنێن، نەك بە گێلی و گەوجی».

«هەروەها خۆت لەو کەسانە لادە کە بەردەوام خۆیان لە دۆستانیان بە گەورەتر دادەنێن».

## بەشی چوارەم:
## سەبارەت بە مافی موسڵمانەتی، خزمایەتی و هاوسێیەتی

### یەکەم: ماف و ئەرکی موسڵمانان:

بریتییە لەوەی کاتێ پێی دەگات سڵاوی لێ بکات، کاتێ بانگهێشتی دەکات قەبووڵی بکات، کاتێ دەپژمێ دوعای خێری بۆ بکات، لەکاتی نەخۆشیدا ســەردانی بکات، بۆ بەڕێکردنی تەرمی موسڵمانان ئامادە بێت، کاتێ سوێند دەخوات، باوەڕی بە سوێندەکەی

1. طبرانی فی الکبیر: ١٨٥٥٧.

هەبێت، ئامۆژگاریی بکات هەرکاتێ داوای ئامۆژگاری لێ کرد،[1] کاتێ نییە لە پاشەملەوە هۆشی پێوە بێت، هەرچی بۆ خۆی خۆشی ئەوێ بۆ ئەویشی خۆش بوێ، هەرچی بۆ خۆی پێی ناخۆشە بۆ ئەویش پێی ناخۆش بێ.[2]

پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «أَرْبَعٌ مِنْ حَقِّ الْمُسْلِمِينَ عَلَيْكَ: أَنْ تُعِينَ مُحْسِنَهُمْ وَ أَنْ تَسْتَغْفِرَ لِمُذْنِبِهِمْ وَ أَنْ تَدْعُوَ لِمُدْبِرِهِمْ وَ أَنْ تُحِبَّ تَائِبَهُمْ».

واتە: «هەر موسڵمانێك چوار مافی بە سەرتەوە هەیە: یارمەتی ئەوەیان کە ئەهلی چاکەیە بدەی، لەوەشیان کە خەتابارە خۆش بیت، بۆ مردوان و ڕابردوانیان دوعای خێر بکەی، تۆبەکارەکانیانت خۆش بوێ».

یەکێ‌تر لە مافەکانی برای موسڵمان، ئەوەیە هیچیەك لە موسڵمانان ئازار نەدات و نەڕەنجێنێ نە بە قسە، نە بە کردەوە. پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: «اَلْمُسْلِمُ مَنْ سَلِمَ الْمُسْلِمُونَ مِنْ لِسَانِهِ وَ يَدِهِ»[3] واتە: «موسڵمانی ڕاستەقینە ئەوەیە کە موسڵمانان لە دەست و زمانی ئەمین بن».

هەروەها پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «اَلْمُهَاجِرُ مَنْ هَجَرَ السُّوءَ وَاجْتَنَبَهُ»[4] واتە: «کۆچەری ڕاستەقینە ئەوەیە لە گوناح و خراپە کۆچی کردبێت و دەستی لێ کێشابێتەوە [نە ئەو کەسەی لە مەدینەوە بۆ مەککە کۆچی کردبێ و گوناحیش بکات]».

دیسان پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «اَلْمُؤْمِنُ مَنْ أَمِنَهُ الْمُؤْمِنُونَ عَلَىٰ أَنْفُسِهِمْ وَ أَمْوَالِهِمْ»[5]. واتە: «مرۆڤی ئیماندار ئەو کەسەیە کە ئیمانداران لێی ئەمین بن لەسەر ماڵ و گیانیان».

یەکێ‌تر لە مافەکان ئەوەیە: ئەبێ مرۆڤی موسڵمان لە ئاستی هەموو موسڵمانێکدا خۆی بە کەم بگرێ و دەمارگرژی بەسەریاندا نەکات؛ چونکە بە ڕاستی خوای گەورە ﴿لا يُحِبُّ كُلَّ

١. «حَقُّ الْمُسْلِمِ عَلَى الْمُسْلِمِ سِتٌّ: ... إِذَا لَقِيتَهُ فَسَلِّمْ عَلَيْهِ، وَ إِذَا دَعَاكَ فَأَجِبْهُ، وَ إِذَا اسْتَنْصَحَكَ فَانْصَحْ لَهُ، وَ إِذَا عَطَسَ فَحَمِدَ اللهَ فَشَمِّتْهُ، وَ إِذَا مَرِضَ فَعُدْهُ، وَ إِذَا مَاتَ فَاتَّبِعْهُ» و فی روایة: «وَ يُحِبُّ لَهُ مَا يُحِبُّ لِنَفْسِهِ» وَ فی روایة: «وَ يَنْصَحُ لَهُ بِالْغَيْبِ»، مسلم: ٤٠٢٣، احمد: ٨٩٧٣، ترمذی: ٢٦٦٠.

٢. بخاری: ١٢، مسلم: ٦٤، ترمذی: ٢٦٦٠، نسائی: ٤٩٥٣، ابن‌ماجه: ١٤٢٣، احمد: ٦٣٦.

٣. بخاری: ٩ ـ ١٠، مسلم: ٥٨ ـ ٥٧، ترمذی: ٢٤٢٨، نسائی: ٤٩١٠، احمد: ٦٥٠٢.

٤. احمد: ٦٦٣١، طبرانی فی الکبیر: ١٤١٤.

٥. و فی روایة: «... عَلَىٰ دِمَائِهِمْ وَ أَمْوَالِهِمْ» ترمذی: 2551، نسائی: ٤٩٠٩، ابن‌ماجه: ٣٩٢٤، احمد: ٦٦٣١.

مُخْتالٍ فَخُورٍ﴾[1] «خۆشی لە هیچ ئینسانێ کە خۆبەزل‌زان بێت و بەخۆیدا بنازێ، نایێت». ئەگەریش هات و کەسێك خۆی بەسەر تۆدا گرت، ئەوە خۆڕاگر بە؛ لەبەر ئەو فەرموودەیەی خوای گەورە: ﴿خُذِ الْعَفْوَ وَ أْمُرْ بِالْعُرْفِ وَ أَعْرِضْ عَنِ الْجاهِلِينَ﴾[11]. واتە: «چاو بپۆشە و فەرمان بەکاری چاکە بدە و لەو نەزانانە پشت هەڵکە».

یەکێ‌تر ئەوەیە: گوێ بۆ ژاوەژاو و قسەی بێ‌سەر و بنی خەڵك چ سەبارەت بە خۆی، چ سەبارەت بە کەسانی‌تر، ڕانەگرێ، هەروەها خۆیشی وەکوو ئەوان لێ نەکات.

پێغەمبەرصَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ئەفەرمێ: «لا يَدْخُلُ الْجَنَّةَ قَتّاتٌ»[2] واتە: «کەسێك کە فیتنەیی دەکات و قسە ئەهێنێت و ئەبات، ناڕواتە بەهەشت».

یەکێ‌تر ئەوەیە: نابێ لە سێ ڕۆژ زیاتر لەگەڵ خزم و ئاشنایانی، قسە نەکات.[3] بەبێ ئیزن‌وەرگرتن خۆی نەکا بە ماڵی هیچ‌کەسێکدا.[4] لەگەڵ هەمووکەس بە ئاکار و ئەخلاقی جوان بجووڵێتەوە.[5] ڕێزی پیرەکان بگرێت و لەگەڵ منداڵاندا، میهرەبان بێت،[6] بە تێکڕا لەگەڵ هەمووکەسدا، ڕووکراوە و دەم بە بزە بێت.[7] قەت بەڵێن نەدات، مەگەر وەفای پێ بکات.[8]

---

١. لقمان: ١٨. ١١. الأعراف: ١٩٩.

٢. بخاری: ٥٥٩٦، مسلم: ١٥٢، ابوداود: ٤٢٢٨، ترمذی: ١٩٤٩، احمد: ٢٢١٦٣.

٣. «لا يَحِلُّ لِمُسْلِمٍ أَنْ يَهْجُرَ أَخاهُ فَوْقَ ثَلاثَةِ أَيّامٍ» و فی روایة: «لا يَحِلُّ لِمُؤْمِنٍ» بخاری: ٥٦٠٥، مسلم: ٤٦٤٤، ابوداود: ٤٢٦٥، ترمذی: ١٩٤٦، احمد: ١٤٣٧، ابن‌ماجه: ٤٥.

٤. ﴿يا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لا تَدْخُلُوا بُيُوتاً غَيْرَ بُيُوتِكُمْ حَتَّىٰ تَسْتَأْنِسُوا وَ تُسَلِّمُوا عَلَىٰ أَهْلِها﴾ النور: ٢٧. قالصَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ «اَلْإِسْتِئْذانُ ثَلاثٌ، فَإِنْ أُذِنَ لَكَ، وَ إِلّا فَارْجِعْ» مسلم: ٤٠٠٧ ـ ٤٠١٠، مالك فی الموطأ: ١٥٢٠، ابوداود: ٤٥١٠ بلفظ: «يَسْتَأْذِنُ أَحَدُكُمْ ثَلاثاً...»، ترمذی: ٢٦١٤، ابن‌ماجه: ٣٦٩٦، احمد: ١٨٧٣٥.

٥. قالصَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: «إِنَّ خِيارَكُمْ أَحاسِنُكُمْ أَخْلاقاً» بخاری: ٥٥٧٥، مسلم: ٤٢٨٥، ترمذی: ١٨٩٨، احمد: ٦٢١٥، و فی روایة: «أَلا أُحَدِّثُكُمْ بِأَحَبِّكُمْ إِلَيَّ وَ أَقْرَبِكُمْ مِنِّي مَجْلِساً يَوْمَ الْقِيامَةِ؟!» ثلاث مرات فقال: «أَحْسَنُكُمْ أَخْلاقاً» احمد: ٦٧٣٨، ترمذی: ١٩٤١ و فی روایة: «وَ خالِقِ النّاسَ بِخُلُقٍ حَسَنٍ» ترمذی: ١٩١٠، احمد: ٢٠٣٩٢.

٦. «مَنْ لَمْ يَرْحَمْ صَغِيرَنا وَ يَعْرِفْ حَقَّ كَبِيرِنا فَلَيْسَ مِنّا» ابوداود: ٤٢٩٢، ترمذی: ١٨٤٢ ـ ١٨٤٣ بلفظ: «وَ يُوَقِّرْ كَبِيرَنا» و بلفظ: «وَ يَعْرِفْ شَرَفَ كَبِيرِنا»، احمد: ٦٧٧٦، بخاری فی ادب المفرد: ٣٦٥.

٧. «...أَنْ تَلْقَىٰ أَخاكَ بِوَجْهٍ طَلِقٍ» مسلم: ٤٧٦٠، ترمذی: ١٨٩٣، احمد: ١٤٣٤٨ و روایة: «مِنَ الصَّدَقَةِ أَنْ تُسَلِّمَ عَلَى النّاسِ وَ أَنْتَ طَلْقُ الْوَجْهِ» بیهقی فی شعب الإیمان: ٧٦٩٤.

٨. قالصَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: «آيَةُ الْمُنافِقِ ثَلاثٌ: إِذا حَدَّثَ كَذَبَ وَ إِذا وَعَدَ أَخْلَفَ وَ إِذا اؤْتُمِنَ خانَ» بخاری: ٣٢، مسلم: ٨٩، ترمذی: ٢٥٥٥، نسائی: ٤٩٣٧، احمد: ٨٣٣١. و فی روایة: «أَرْبَعٌ مَنْ كُنَّ فِيهِ فَهُوَ مُنافِقٌ خالِصاً... إِذا عاهَدَ غَدَرَ...» ابوداود: ٤٠٦٨، بخاری: ٢٢٧٩، مسلم: ٨٨، ترمذی: ٢٥٥٦، احمد: ٦٤٧٩.

یەکێ‌تر ئەوەیە: بەینی موسڵمانان خۆش بکات. پێغەمبەرصَلَّى‌اللهُ‌عَلَيْهِ‌وَسَلَّمَ فەرموویەتی: «أَلا أُخْبِرُكُمْ بِأَفْضَلَ مِنْ دَرَجَةِ الصِّيامِ وَالصَّلاةِ وَالصَّدَقَةِ؟» واتە: «ئەرێ پێتان بڵێم چی لە نوێژ و ڕۆژوو و زەکات، پلەی بەرزترە و خێری زۆرترە». گوتیان: بەڵێ، پێغەمبەریشصَلَّى‌اللهُ‌عَلَيْهِ‌وَسَلَّمَ فەرمووی: «إِصْلاحُ ذاتِ الْبَيْنِ»[1] واتە: «نێوان خەڵك خۆش‌کردن» هەروەها ئەبێ عەیب و کەم و کووڕی خەڵك دابپۆشێ.[2]

هەندێ‌تر لەو مافانە ئەوەیە: خۆی لەو شوێنانە بپارێزێ وا قسەی پێوە ئەلکێ،[3] هەروەها لەلای هەرکەسەوە، دەسی ئەچێ، تکا بکا بۆ ئەو کەسەی کە کارەکەی لە ژێر دەستی ئەو دایە.[4] پێش ئەوەی سڵاوی لێ کەن، سڵاو بکات.[5] تا بۆی ئەلوێ و لە دەسەڵاتیدایە ماڵ و نامووس و ئابڕووی برا موسڵمانەکەی لە زوڵم و دەس‌درێژیی بێگانە بپارێزێ.[6]

یەکێ‌تر ئەوەیە: هەرکاتێ تووشی مرۆڤی قەڵس و شەڕفرۆش، بوو بە زمان‌لووسی و سازش خۆی ڕزگار بکات.[7]

هەروەها لەسەریەتی بڕوا بۆ سەر گۆڕی برای دینی و دوعای بەخێریان بۆ بکات.[8]

## دووهەم: مافی هاوسێیەتی:

پێویستە بزانی بۆ هاوسێش گشت ئەو مافانەی کە بۆ برای موسڵمان بوو، بۆ ئەویش هەیە، بە زیادەی مافی هاوسێیەتیش. پێغەمبەرصَلَّى‌اللهُ‌عَلَيْهِ‌وَسَلَّمَ فەرموویەتی:

«اَلْجِيرانُ ثَلاثَةٌ: جارٌ لَهُ حَقٌّ واحِدٌ وَ جارٌ لَهُ حَقّانِ وَ جارٌ لَهُ ثَلاثَةُ حُقُوقٍ، فَالْجارُ الَّذِي لَهُ ثَلاثَةُ حُقُوقٍ، اَلْجارُ الْمُسْلِمُ ذُو الرَّحِمِ، فَلَهُ حَقُّ الْجِوارِ وَ حَقُّ الْإِسْلامِ وَ لَهُ حَقُّ الرَّحِمِ وَ أَمّا

---

١. ابوداود: ٤٢٧٣، احمد: ٢٦٢٣٦، الموطأ للإمام مالك: ١٤٠٥، ترمذی: ٢٤٣٣.

٢. قالصَلَّى‌اللهُ‌عَلَيْهِ‌وَسَلَّمَ: «مَنْ سَتَرَ مُسْلِماً سَتَرَهُ اللهُ يَوْمَ الْقِيامَةِ» بخاری: ٢٢٦٢، مسلم: ٤٦٧٧ ـ ٤٦٩٢ بلفظ: «لا يَسْتُرُ عَبْدٌ عَبْداً إِلّا...» ابوداود: ٤٢٤٨، ترمذی: ١٣٤٥، ابن‌ماجه: ٢٢١، احمد: ٥٣٨٨.

٣. مسلم: ٤٠٤٠ ـ ٤٠٤١، احمد: ١٢١٣٢، بیهقی فی شعب الإیمان: ٦٣٨١ ـ ٦٣٨٣.

٤. بخاری: ١٣٤٢، مسلم: ٤٧٦١.

٥. ترمذی: ٢٦٢٣ بلفظ: «السَّلامُ قَبْلَ الْكَلامِ»، ابوداود: ٤٥٢٢، ترمذی: ٢٦١٨، بلفظ: «أَوْلَى النّاسِ بِاللهِ مَنْ بَدَأَهُمْ بِالسَّلامِ» احمد: ٢١١٦٨.

٦. ترمذی: ١٨٥٤، احمد: ٢٦٢٦٠.

٧. بخاری: ٥٥٩٤ ـ ٥٦٦٦، مسلم: ٤٦٩٣، ابوداود: ٤١٥٩، ترمذی: ١٩١٩، احمد: ٢٢٩٧٧.

٨. «...نَهَيْتُكُمْ عَنْ زِيارَةِ الْقُبُورِ فَزُورُوها...» مسلم: ١٦٢٣، بخاری: ١٢٠٣، ابوداود: ٢٨١٥ ـ ٢٨١٦، ترمذی: ٩٧٤، نسائی: ٤٣٥٣ ـ ٢٠٠٦، ابن‌ماجه: ١٥٦٠، احمد: ١٣٠٠٠ و فی روایة: «فَإِنَّها تُزَهِّدُ فِي الدُّنْيا وَ تُذَكِّرُ الْآخِرَةَ».

الْجارُ الَّذي لَهُ حَقّانِ، فَالْجارُ الْمُسْلِمُ الَّذِي لَهُ حَقُّ الْجِوارِ وَ حَقُّ الْإِسْلامِ وَ أَمَّا الَّذِي لَهُ حَقٌّ واحِدٌ فَالْجارُ الْمُشْرِكُ»[1].

واتە: «هاوسێ، سێ جۆرە: جۆرێکی تەنها حەقێکی بە سەر هاوسێکەوە هەیە، جۆرێ‌تری، دوو حەقی هەیە، جۆرێ‌تری، سێ حەقی هەیە. ئەو هاوسێیەی کە سێ حەقی هەیە، هاوسێی خزمی موسڵمانە: حەقی هاوسێیەتی، حەقی موسڵمانەتی، حەقی خزمایەتی هەیە. ئەو جۆرە هاوسێیەی کە دوو حەقی هەیە، ئەوەیە کە هاوسێکە موسڵمانە: حەقی هاوسێیەتی و موسڵمانەتی هەیە. ئەو جۆرەش کە تەنها حەقێکی هەیە، ئەو هاوسێیەیە کە کافرە و هاوەڵ بۆ خوا دادەنێ».

ئەوەی کە پێغەمبەرﷺ مافی هاوسێیەتی داوە بە کافر، ئەوە دەگەیەنێ کە مافی هاوسێ زۆر گرینگە.

هەروەها پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «ما زالَ جِبْرِيلُ يُوصِينِي بِالْجارِ حَتَّىٰ ظَنَنْتُ أَنَّهُ سَيُوَرِّثُهُ».[2] واتە: «هێندە جوبرەئیل هاوسێی پێ ڕاسپێرام (وتی: ئاگات لێیان بێ)، تا وام‌دەزانی هاوسێ لە هاوسێی میرات وەرئەگرێ».

هەروەها پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «مَنْ كانَ يُؤْمِنُ بِاللهِ وَ الْيَوْمِ الْآخِرِ فَلْيُكْرِمْ جارَهُ»[3]. واتە: «هەرکەس ئیمانی بە خواو پاشەڕۆژ هەیە با ڕێزی هاوسێکەی بگرێ».

## سێهەم: مافی خزم و کەس و کار:

پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «يَقُولُ اللهُ ـ تَعالَىٰ ـ أَنَا الرَّحْمٰنُ الرَّحِيمُ وَ هٰذِهِ الرَّحِمُ وَ شَقَقْتُ لَها اِسْماً مِنِ اسْمِي فَمَنْ وَصَلَها، وَصَلْتُهُ وَ مَنْ قَطَعَها قَطَعْتُهُ»[4].

---

١. بیهقی فی شعب الإیمان: ٩١١٣، جامع الکبیر للسیوطی: ٤٨٢، کنز العمال للهندی: ٢٤٨٩١، طبرانی فی مسند الشامیین: ٢٤٠١.

٢. بخاری: ٥٥٥٦، مسلم: ٤٧٥٧، ابوداود: ٤٤٨٥، ترمذی: ١٨٦٥، ابن‌ماجە: ٣٦٦٣، احمد: ٦٢٠٨. و فی روایة: «أَنَّ عَبْدَاللهِ بْنَ عَمْرٍو ذُبِحَتْ لَهُ شاةٌ فِي أَهْلِهِ فَلَمّا جاءَ قالَ: أَهْدَيْتُمْ لِجارِنَا الْيَهُودِيِّ، سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِﷺ يَقُولُ: ما زالَ جِبْرِيلُ ... » ترمذی: ١٨٦٦، ابوداود: ٤٤٨٥، بیهقی فی شعب الإیمان: ٩١١٧.

٣. مالك فی الموطأ: ١٤٥٤، بخاری: ٥٥٦٠، مسلم: ٦٧، احمد: ١٥٧٧٩.

٤. ابوداود: ١٤٤٤، احمد: ١٥٨٩، بخاری: ٥٥٢٩ـ ٥٥٣٠، ترمذی: ١٨٣٠.

واتە: «خوای گەورە ئەفەرمێ: من ڕەحمان و ڕەحیمم و ئەمەش «رَحِم»ە؛ لە پیتی ناوی خۆمەوە ناوێکم بۆ ڕەحم و خزمایەتی داناوە، کەوابوو هەرکەس [سەردانی خزم و کەسی بکات و] ڕەحم بلکێنێ بە یەکەوە، منیش پێوەی دەلکێم و هەرکەسیش خزمایەتی بپچڕێنێ، منیش ئەو لە ئەو دەپچڕێم [واتە: لێی دوور ئەکەومەوە].

پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «مَن سَرَّهُ أَنْ يُنْسَأَ لَهُ فِي أَثَرِهِ، وَ يُوسَعَ عَلَيْهِ فِي رِزْقِهِ فَلْيَصِلْ رَحِمَهُ».[1]

واتە: «هەرکەس پێی خۆشە ئەجەلی دواکەوێ و ڕزق و بژێوی زۆر بێت، با سەردانی خزمانی بکات».

دیسان پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «إِنَّ الرَّحِمَ مُعَلَّقَةٌ بِالْعَرْشِ، وَ لَيْسَ الْوَاصِلُ بِالْمُكَافِيءِ، وَ لٰكِنَّ الْوَاصِلَ الَّذِي إِذَا انْقَطَعَتْ رَحِمُهُ، وَصَلَهَا».[2]

واتە: «پێوەندی خزمایەتی (رَحِم) بە عەرشەوە هەڵواسراوە، ئەو کەسەش کە تەنها سەری خزمان دەدات پێی ناگات، بەڵکوو ئەو کەسە دەستی پێ دەگات کە هەرکاتێ پێوەندی خزمایەتی پچڕا پێکەوەی بلکێنێتەوە».

"ئەبوو تەلحە" کاتێ کە ویستی باغێکی پڕخێری کە خۆشی ئەویست، ببەخشێ لەبەر ئەوەی بە فەرموودەی خوا عەمەلی کردبێ ﴿لَنْ تَنَالُوا الْبِرَّ حَتَّىٰ تُنْفِقُوا مِمَّا تُحِبُّونَ﴾[3]. واتە: «قەت ناگەن بە خێر و چاکە، تا لەوەی وا خۆشتان ئەوێ، نەبەخشن». وتی: ئەی نێردراوی خوا، ئەو باغەم لە ڕێی خوا بە هەژاران و نەداران بەخشی، پاشان پێغەمبەریشﷺ فەرمووی: «وَجَبَ أَجْرُكَ عَلَى اللهِ قِسْمَةً فِي أَقَارِبِكَ»[4]. واتە: «خێر و پاداشی خوا، بە حەتمی پێت دەگات، بەشی خزمەکانتیشی لێ بدە».

---

١. بخاري: ١٩٢٥، مسلم: ٤٦٣٨، ابوداود: ١٤٤٣، نسائی فی سنن الکبری: ١١٤٢٩، احمد: ١٣٠٩٦ و فی رواية: «... وَ أَنْ يَمُدَّ فِي أَجَلِهِ ...» احمد: ١٢١٢٨، و فی رواية: «مَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللهِ وَ الْيَوْمِ الْآخِرِ فَلْيَصِلْ رَحِمَهُ» بخاري: ٥٦٧٣.

٢. احمد: ٦٢٣٨، بخاري: ٥٥٣٢، ابوداود: ١٤٤٦، ترمذی: ١٨٣١ بروايات مختلفة.

٣. آل عمران: ٩٢.

٤. «... اِجْعَلْهَا فِي قَرَابَتِكَ»، «... اِجْعَلْهُ فِي فُقَرَاءِ أَهْلِكَ»، بخاري: ٢١٥٠، مالك فی الموطأ: ١٥٨٢، مسلم: ١٦٦٤، ابوداود: ١٤٣٩، ترمذی: ٢٩٢٣، نسائی: ٣٥٤٥، احمد: ١١٩٨٥.

## مافی باوك و دایك و منداڵ:

پێویستە بڵێین: ئەگەر مافی خزمایەتی و ڕەحم، داکۆکی لەسەر کراوە، ئەوە نزیکترین خزم و کەسی هەرکەسێ، باوك و دایك و منداڵەکانیەتی.

پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «بِرَّ أُمَّكَ وَ أَبَاكَ وَ أُخْتَكَ وَ أَخَاكَ وَ ثُمَّ أَدْنَاكَ فَأَدْنَاكَ»[1]. واتە: «لەگەڵ دایك و باوك و خۆشك و برا و پاشان ئەوانەی وا لەوان خوارترن چاك بە».

هەروەها فەرموویەتی: «رَحِمَ اللهُ وَالِداً أَعَانَ وَلَدَهُ عَلَىٰ بِرِّهِ»[2]. واتە: «خوا ڕەحم بکا بە ئەو باوکەی وا یارمەتی منداڵەکەی لەسەر چاکە دەدات».

هەروەها سوننەتە، باوك و دایك لەگەڵ منداڵەکانیاندا، میهرەبان و دڵسۆز بن. دەگێڕنەوە "حەسەنی کوڕی عەلی" رضي الله عنه پێی هەڵخلیسکا، پێغەمبەریشﷺ لەسەر مینبەرەوە بوو: گورج هاتە خوارەوە و بەرزی کردەوە و ئەم ئایەتی خوێندەوە: ﴿إِنَّمَا أَمْوَالُكُمْ وَأَوْلَادُكُمْ فِتْنَةٌ﴾[3]. واتە: «ماڵ و منداڵ، مایەی ئەزموون و تاقیکردنەوەن، بۆ ئێوە».

## مافی خزمەتکار و کۆیلەی بەردەست:

ئەبێ لە خورد و خۆراك و پۆشاکدا، خۆی چی ئەخوات، بەشی ئەویش بدات. زیاتر لە زۆر و توانای، کاری بەسەردا نەدات، بە چاوی سووکەوە سەیری نەکات و خۆی لە حەنایدا بە گەورە نەگرێ، ئەگەریش هەڵە و پەڵەیێکی کرد، لێی خۆش ببێ.

---

١. نسائی: ٢٤٨٥، ابوداود: ٤٤٧٤، احمد: ٦٨٠٨.

٢. ابن‌ابی‌شیبة فی مصنفه: ١٠١/٦، جامع الکبیر للسیوطی: ١٢٨٧٨.

٣. التغابن: ١٥.

# بابەتی شازدەهەم: گۆشەگیری

## [بەشی یەکەم: ڕوانگەی زانایان سەبارەت بە گۆشەنشینی]

پێویستە بزانی لەسەر ئەم بابەتە کێشەی زۆر هەیە، هەندێك وای بۆ چوون کە سوننەتە و خێری لە تێکەڵی خەڵك زۆرترە؛ وەکوو: سەفیانی سەوری، ئیبراهیمی ئەدهەم، داوودی تایی، فوزەیلی کوڕی عەییاز (فضیل بن عیاض)، سولەیمانی خەوواس و بیشری حافی.

زۆربەی تابیعین لەسەر ئەو باوەڕەن: تێکەڵی خێری زۆرترە و زۆرکردنەوەی برا و دۆستان لەسەر ئەوەی یارمەتی یەکتر بدەن بۆ کاری چاکە و خواپەرستی، باشترە. هەموویان بەڵگە بەو حەدیس و ئایەتانە، ئەهێننەوە کە لەبارەی برایەتی و بەیەکەوە بوونەوە هاتوون؛ [وەکوو] ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەرﷺ کاتێ پیاوێکیان هێنا بۆلای کە ئەڕۆیشت بۆ کێو تا عیبادەتی خوا لەوێ بکات:

«لا تَفعَلْ أَنْتَ وَلا أَحَدٌ مِنكُمْ، لَصَبْرُ أَحَدِكُمْ في بَعْضِ مَواطِنِ الْإِسْلامِ خَيْرٌ مِنْ عِبادَةِ أَحَدِكُمْ أَرْبَعِينَ عاماً»[1].

واتە: «نە تۆ وا بکە نە هیچکەس لە ئێوەش؛ چونکە بەڕاستی ئەگەر یەکێ لە ئێوە، لە هەندێ وڵاتی ئیسلامیدا خۆڕاگرن [و خەڵك بۆ ئیسلام هەڵبنێن] چاترە لەوەی چل ساڵی ڕەبەق عیبادەت بۆ خوا بکەن».

ئەو وتانەی کە لە زانایانەوە لەمبارەوە نەقڵیان کردووە چەند بەشە، بەشێکیان: بە شێوەی گشتی بۆلای یەکێ لەم دوو بۆچوونە، ئەچێ، لە حەزرەتی عومەرەوەرضي الله عنه دەگێڕنەوە کە فەرموویەتی: «خُذُوا بِحَظِّكُمْ مِنَ الْعُزْلَةِ»[2] واتە: «بەشی خۆتان لە گۆشەگیریدا وەربگرن».

---

١. بیهقی فی شعب الإیمان: ٩٢٧٥، معرفة الصّحابة لأبی‌یعلی الموصلی: ٥٠٤٤، بغیة الحارث: ٦١٩.

کنز العمال للهندی: ٨٧١٠، التمهید لما فی الموطأ من المعانی: ٤٤٦/١٧. ٢.

"ئیبراهیمی نەخەعی"ش فەرموویە بە پیاوێ: «تَفَقَّهْ ثُمَّ اعْتَزِلْ»[1] واتە: «شەرع فێر بە، پاشان گۆشەگیر ببە».

ئەوانەی کە گۆشەگیرییان بەلاوە باشە، بەڵگەیان بەم ئایەتە هێناوەتەوە: ﴿وَأَعْتَزِلُكُمْ وَمَا تَدْعُونَ مِنْ دُونِ اللَّهِ﴾.[2] واتە: «ئەوا من (ئیبراهیم) لە ئێوە و لەوانەی جگە لە خوا دەیپەرستن، دوور دەکەومەوە».

هەروەها بەڵگەش بە فەرمایشتی پێغەمبەرﷺ کە بە "عەبدوڵڵای کوڕی عامری جەهەنی" فەرموو، لە کاتێکدا پرسیاری کرد: ئەی پێغەمبەری خوا! ڕزگاری لە چیدایە؟

پێغەمبەریشﷺ فەرمووی: «لِيَسَعْكَ بَيْتُكَ، وَ أَمْسِكْ عَلَيْكَ لِسانَكَ، وَ أَبْكِ عَلَىٰ خَطِيئَتِكَ»[3] واتە: «با خانووەکەت بەشت بکات و پێی قەناعەت بکە، زمانت ڕابگرە، بۆ گوناحانت بگری».

هەروەها پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْعَبْدَ التَّقِيَّ النَّقِيَّ الْخَفِيَّ»[4] واتە: «خوای گەورە بەندەی پاك و خۆپارێز و خۆدەرنەخەر و بێدەنگی خۆش دەوێ».

بەڵام بەڵگە هێنانەوە بەم حەدیسە جێی قسەیە؛ چونکە پێغەمبەرﷺ لەڕاستیدا، بەوە فەرمانی نەداوە بە تەواوی سەحابەکان، هەندێ جار بەختەوەری کەسێك لە گۆشەگیریدایە؛ هەروەکوو چۆن بڕێ جار بەختەوەری کەسانێك لە دانیشتن لە ماڵ و نەڕۆیشتن بۆ جیهاددایە. دەیخۆ ئەمەش ئەوە ناگەیەنێ کە تەرکی جیهاد باشترە، ئەدی هەروەهاش لە تیکەڵیکردنی خەڵکدا، جیهاد و تاڵیی و سەختی خۆی هەیە. بەم بۆنەوە کە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی:

«اَلَّذِي يُخالِطُ النّاسَ وَ يَصْبِرُ عَلَىٰ أَذاهُمْ، خَيْرٌ مِنَ الَّذِي لا يُخالِطُ النّاسَ وَلا يَصْبِرُ عَلَىٰ أَذاهُمْ»[5].

واتە: «ئەو کەسەی کە تیکەڵی خەڵك دەکات و لەسەر سەختی و ئازاری ئەوان، خۆگرە، باشترە لەوەی کە تیکەڵی خەڵکی ناکات و لەسەر ڕەنج و ئازاریان خۆی ڕاناگرێت».

---

١. كشف الخفاء للعجلوني: ١٠٠٣.

٢. مريم: ٤٨.

٣. ترمذي: ٢٣٣٠، احمد: ١٦٨١٠ ـ ٢١٢٠٦.

٤. مسلم: ٥٢٦٦، احمد: ١٣٦٤، لكن بلفظ: «... اَلْعَبْدَ التَّقِيَّ الْغَنِيَّ الْخَفِيَّ».

٥. ترمذي: ٢٤٣١، احمد: ٤٧٨٠، ابن‌ماجه: ٤٠٢٢.

## بەشی دووهەم: خێر و زەرەری گۆشەگیری

بزانە کە گۆشەگیری شەش بەهرەی تێدایە:

**بەهرەی یەکەم:** دەستبەتاڵبوون بۆ خواپەرستی و عیبادەتکردن و بیرکردنەوە و خوو بە خواوە گرتن و موناجات و دوعا و نزاکردن و تێڕامان سەبارەت بە عالەمی مەلەکووت. ئەمانەش مسۆگر نابێ مەگەر بە گۆشەگیری و دەس لە خەڵك کێشانەوە. بەم بۆنەوە هەندێ لە زانایان وتوویانە: کەس ناتوانێ گۆشەگیری ڕاستەقینە بەجێ بهێنێ مەگەر بە خووگرتن بە قورئانەوە. ئەوانەش دەستیان بە قورئانەوە گرتووە، کەسانێکن کە بە زیکر و یادی خوای گەورە دەستیان لە دونیا بەرداوە، هەروەها بەناوی خواوە ژیاون و بە ناوی خواوە ئەمرن و بە خزمەتی خواش دەگەن.

شك لەوەدا نییە ئەم جۆرە کەسانە، تێکەڵی خەڵك بەریان ئەگرێ لە زیکرو یادی خوا، بەم بۆنەوە بوو کە پێغەمبەرﷺ لەسەرەتاوە، لەکێوی "حیرا" عیبادەتی ئەکرد.[1] جا ئەگەر هەر پیاوێ بەردەوام خەڵوەتی کێشا، ئەگا بە ئەو پلەیە کە "جونەید"رَحِمَهُ اللَّهُ فەرموویەتی: نزیکەی سی ساڵە لەگەڵ خوا وتووێژ دەکەم، خەڵك وا دەزانن لەگەڵ ئەوان قسەم کردووە.

بە خەڵوەتکێشێکیان گوتووە: ئەوە چی تۆی لەسەر ئەم تەنیاییە هەڵناوە؟ ئەویش گوتوویە: ئەمن تەنیا نیم؛ بەڵکوو هاونشینی خوام، هەرکات بمەوێ لەگەڵم بدوێ، قورئانەکەی ئەخوێنمەوە، هەرکاتیش بمەوێ لەگەڵی بدوێم نوێژ دەخوێنم.

ئەڵێن: حەزرەتی وەیسی قەرەنیرَحِمَهُ اللَّهُ دانیشتبوو، لەناکاو "هەرێمی کوڕی حەییان"ی لێ پەیدا بوو، وەیس فەرمووی: چۆن هاتووی؟ گوتی هاتووم بە تۆوە خوو بگرم. ئەویش فەرمووی: شك نابەم کەسێ بەخواوە، خووی گرتبێ و بە شوێن ئەوەوە بێ بە غەیری ئەوەوە خوو بگرێ. پاشان فەرمووی: ئەمن کاتێ مانگ ئەبینم ئەڵێم: ئۆخەی سەرم خەڵوەت بوو، بۆ خوا، بەڵام کاتێ خۆری بەیانی ئەبینم لە ترسی خەڵکدا لەرز دامئەگرێ و ئەترسم کەسێ بێ بۆلام لە یادی خوا غافڵم بکات.

---

[1] بخاری: ٣ ـ ٤٥٧٢، مسلم: ٢٣١، احمد: ٢٤٧٦٨.

مالیکی کوڕی دینار رَحِمَهُ ٱللَّهُ فەرموویەتی: هەرکەس بە وتوویژ لەگەڵ خوادا خوو نەگرێ و خۆی لە وتوویژ لەگەڵ خەڵکدا نەکێشێتەوە، ئەوە کردەوەی چاکی کەم دەکات و دڵی کوێر دەبێ و عومری بە با ئەچێ.

**بەهرەی دووهەم:** گۆشەنشینی ئەبێتە هۆی خۆدەربازکردن لە گوناحانێ کە مرۆڤ زۆرتر بەهۆی تێکەڵییەوە تووشی ئەبێ، ئەم جۆرە گوناحانە بریتین لە غەیبەت، ڕیا، بێدەنگ‌بوون لە بەرانبەر فەرمان بە چاکە و نەهی لە خراپە. ـ لەشوێنی خۆیدا ئەم باسە دێ ـ.

بە کورتی، بڕیار بەوەی کە یەکێك لەم دوودانە (تێکەڵی، گۆشەگیری) بەڕەهایی و بەبێ هیچ قەید و بەندێ، لەویان باشترە، مەحاڵە و ناکرێ. چونکە ئەم دوو حاڵەتە بە پێی گۆڕانی کەسەکان، دەگۆڕدرێ و هەرکامیان بۆ کەسێك باشە.

کەواتە، میانەڕەوی لە هەمووشت باشترە، واتە: ئەوەندە خۆی لە کۆمەڵ دوور نەخاتەوە و وەها گۆشەگیر بێت کە بەهرەو کەڵکی تێکەڵی و ناوکۆمەڵی لە دەس دەربچێ. هێندەش تێکەڵی نەکات و خۆی بەرنەداتەوە ناو خەڵك کە سوود و بەهرەی گۆشەگیری لە دەس دەربچێ.

پێویستە ئەوەش بزانێ کە ئەبێ مەبەستی لە گۆشەنشینی ئەوە بێ کە خۆی لە شەڕ و ئافەتی خەڵك دوور بخاتەوە. بە گشتیش بیەوێ ڕوو لە یاد و زیکری خوا بکات.

با هێندەش درێژە بە هیوا و ئارەزوو نەدات و بەری نەفسی خۆی لە ئارەزووی دونیای بگرێتەوە، چونکە درێژکردنەوەی زەمان و کات، مەحاڵە. مەبەستیشی لە گۆشەگیری جیهاد و شەڕی گەورە (جهاد الأکبر) بێ، کە بریتییە لە شەڕ لە بەرانبەر نەفسەوە، هەروەك چۆن سەحابەکان فەرموویان: ئێمە لە شەڕی بچووك گەڕاینەوە بۆ شەڕی گەورە.[1]

والله أعلم

---

جامع الکبیر للسیوطی: ٢٨٠، کشف الخفاء للعجلونی: ١٣٦٢. ١.

# بابەتی هەڤدەهەم: سەفەر

**سەفەر دوو جۆرە:**

**یەکیان:** سەفەری زاهیری، کە بریتییە لە گەڕان بە سەر تەواوی سووچ و قوژبنی زەویدا.

**دووەم:** سەفەر بە دڵ و دەروونە بۆلای خوا، ئەمەش هەر ئەوەیە وا خوا لە قورئاندا لەبارەی خۆشەویستی خۆی و ئیبراهیمەوە، دەیگێڕێتەوە: ﴿إِنِّي ذَاهِبٌ إِلَىٰ رَبِّي سَيَهْدِينِ﴾[1] واتە: «ئەمن ئەچم بۆلای پەروەردگارم، ئەو بەم زوانە ڕێنوێنیم دەکا».

بەتێکڕا فەرموودەی خوای گەورە ئاماژە بۆ ئەم دوو جۆرە سەفەرە دەکات: ﴿سَنُرِيهِمْ آيَاتِنَا فِي الْآفَاقِ وَفِي أَنفُسِهِمْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ الْحَقُّ﴾[2].

واتە: «بەم زوانە هەم لە سەرتاسەری ئاسمان و زەویندا، هەم لە دەروونی خۆیاندا، نیشانەکانی خۆمان دەخەینە بەرچاویان، تا بۆیان ڕوون بێتەوە کە تەنها ئەو (قورئان و ئیسلام) ڕاستە».

سەفەری گەورە سەفەری نهێنیی دەروونە بۆلای خوای مەزن. ڕێبواری ئەم سەفەرەش بۆ هەمیشەیی بەرەو بەهەشتێ دەچێ کە پانایی بە قەدەر ئاسمانەکان و زەمینە، لە شوێنێکدان کە جێگاکانی و سەرچاوەی ئاوەکانی، بە زیادبوونی ئەوانەی کە ئەچنە ئەوێ، تەنگ نابێتەوە، بەڵکوو هەرچەندە ڕێبوارەکانی زۆرتر بن ئەو زیادتر دەبێ.

جا هەرکەس لەم سەفەرە بێبەش بێ، ئەوە لە هەرچی خێر و چاکەیە بێ بەشە و لە کەنداوێکدا دەمێنێتەوە کە بۆ هەتاهەتایە لێی دەرباز نابێ. تەواوی ئەو شێواز و ئادابانەی

---

١. الصافات: ٩٩.

٢. فصّلت: ٥٣.

کە قورئان و ئایەتەکانی باسیان کردووە، پێوەندی هەیە بە ئاداب و شێوازی ئەم سەفەرە کە بریتییە لە سەفەری دوارۆژ؛ بەڵام سەفەری زاهیری کە تایبەتە بە هەنگاوهەڵگرتن و بڕینی مەسافەتەکان، ئەوە ئێمە باسی لەسەر دەکەین و بەهرەو سوود و ئاداب و شێوازەکەی لە چەند بەشێکدا ڕوون دەکەینەوە.

## بەشی یەکەم: ئاداب و شێوازی سەفەرو بەهرەکانی

سەرەتا پێویستە نیەت و ویستی خۆی بۆ سەفەر دیاری بکا، کە بۆ حەججە، یان بۆ دیدار عالمێکە یان بۆ دیداری دۆست و خۆشەویستێکی خوایە، چ مردوو چ زیندوو، یان بۆ ئەوەیە کە بڕواتە سەر سنوور و لەوێ پارێزگاری بکات، یا نەخێر، بۆ ڕاکردنە لە دەس ئەو کەم و کووڕییانەی کە لە دین یا لە دونیا ڕووی داوە و ئەم دەرەوەستیان نایە، یان بۆ بازرگانی و بە دوای ڕزقی حەڵاڵدا چوونە، [بەکورتی] ئەم سەفەرانە کە تایبەت بۆ کاری دونیایی نییە، بە جۆرێ کە تەنها ماندوویەتی و ڕەنجەکەی بۆ بمێنێتەوە.

جا بزانە ڕەزیلی و پەستی و خواریی نەفسی ئینسان لە کاتی گۆڕانی بارودۆخ و کارو باریدا دەردەکەوێ. ئەم گۆڕانکارییانەش لە سەفەردا زۆرە.

## بەشی دووهەم:
## هەندێ لە ڕوخسەت و ئاسانکارییەکانی سەفەر، لەدیندا

بە کورتی هەندێ لە ئادابی سەفەرمان لە پەڕتووکی حەجدا ڕوون کردەوە. ئێستا ئەو ڕوخسەتانەی کە لە سەفەردا هەیە، بریتییە لە: مەسح لەسەر خوف (گۆرەوییەکی تایبەتە) بە ماوەی سێ ڕۆژ، لە دوای ئەوەی کە خوفەکەت لە پێ کرد و دەسنوێژەکەت شکا. تەیەمموم بۆ نوێژە فەرزەکان،[1] کورت و کۆکردنەوەی نوێژەکان[2]. خوێندنی نوێژی سوننەت بەسەر

١. ﴿ ...فَتَيَمَّمُوا صَعِيداً طَيِّباً ...﴾ المائدة: ٦. بخاري: ٣٢٤، مسلم: ٥٥١.

٢. ﴿...أَنْ تَقْصُرُوا مِنَ الصَّلاةِ ...﴾ النساء: ١٠١. مسلم: ١١٠٨، نسائی: ٤٥٣ ـ ١٤١٦، ابن‌ماجه: ١٠٥٥، احمد: ١٦٩. «كَانَ ﷺ يَجْمَعُ بَيْنَ صَلاةِ الظُّهْرِ وَالْعَصْرِ وَ يَجْمَعُ بَيْنَ الْمَغْرِبِ وَالْعِشَاءِ» بخاری: ١٠٤١، الموطأ لمالك: ٢٩٨، مسلم: ١١٥١، ابوداود: ١٠٢٢، ترمذی: ٥٠٨، نسائی: ٥٨٣، احمد: ٢١٠٥٦.

وڵاخەوە [یان لە نێو ماشیندا]، یان خوێندنی نوێژی سوننەت بەدەم ڕێبڕینەوە[1]. ڕۆژوو نەگرتن.[2]

جا پێویستە ڕێبوار شێوەکانی دۆزینەوەی قیبلە بزانێ و هەروەها جێگاکانی دابەزین و مانەوەی نێوان ڕێگە کە تیایاندا تا بحەوێتەوە و خۆی بۆ درێژەدان بە سەفەرەکەی ئامادە بکات.

والله أعلم

١. «... يُصَلّي عَلَىٰ دٰابَّتِهِ... وَ هُوَ مُسٰافِرٌ»، «... يُصَلِّي التَّطَوُّعَ وَ هُوَ رٰاكِبٌ فِي غَيْرِ الْقِبْلَةِ»، «... لا يُصَلّي عَلَيْهَا الْمَكْتُوبَةَ». بخاری: ١٠٣٠ ـ ١٠٣١ ـ ١٠٣٢ ـ ١٠٣٤، مسلم: ١١٣٦ ـ ١١٣٥ ـ ١١٣٤، ترمذی: ٤٨٦ ـ ٤٨٨ ـ ٧٣٦.
٢. ﴿... فَمَنْ كٰانَ مِنكُمْ مَرِيضاً أَوْ عَلَىٰ سَفَرٍ فَعِدَّةٌ مِنْ أَيّٰامٍ أُخَرُ... ﴾ البقرة: ١٨٤ ـ ١٨٥.

# بابەتی هەژدەهەم: ئاواز و سەما (سماع و وجد)

## بەشی یەکەم: [حەقیقەتی سەماع]

پێویستە بزانی کە سەبارەت بە ئاواز و سەما، کێشە هەیە، هەندێك بە حەرامیان داناوە و هەندێکیان بە دروستیان زانیوە. ئێمەش حەقیقەتی "سەماع" ڕوون دەکەینەوە و ئەڵێین: «سەماع، بریتییە لە بیستنی دەنگێکی خۆشی کێشداری پڕمانا و واتا کە دڵ بهەژێنێ»، لەنێو ئەم سەماعەدا تەنها گوێ و دڵ چێژ و لەززەت وەردەگرێ ئەمەش وەکوو چۆن چاو لە دیتنی سەوزەڵانی چێژ وەردەگرێ و قەلبیش بەهۆی ئەم ئاوازەوە شاد دەبێ.

خوای مەزن فەرموویەتی: ﴿يَزِيدُ فِي الْخَلْقِ مَا يَشَاءُ﴾[1]. واتە: «خوا هەرچی کە بیهەوێت دەتوانێ لەنێو مەخلووقاتدا، زیادی بکات» ڕاڤەکەران و لێکۆڵەرانی قورئان بە «دەنگی خۆش» مانای ئەو زیادکردنەیان لێك داوەتەوە.

پێغەمبەرصَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ سەبارەت بە [دەنگ خۆشی] ئەبوو مووسای ئەشعەری رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ فەرموویەتی: «لَقَدْ أُوتِيَ مِزْمَاراً مِنْ مَزَامِيرِ آلِ دَاوُدَ»[2] واتە: «بەڕاستی ئەبوو مووسا ئاواز و دەنگێکی خۆشی لە ئاوازەکانی خێڵی داوودی پێ دراوە».

لە حەدیسدا هاتووە: «مَا بَعَثَ اللّٰهُ نَبِيّاً إِلَّا وَ هُوَ حَسَنُ الصَّوْتِ»[3] واتە: «خوا هیچ پێغەمبەرێکی نەناردووە مەگەر دەنگخۆش بووبێ».

---

١. فاطر: ١.

٢. بخاری: ٤٦٦٠، مسلم: ١٣٢٢، ترمذی: ٣٧٩٠، نسائی: ١٠٠٩، ابن‌ماجه: ١٣٣١، احمد: ٢١٨٩١.

٣. ترمذی فی الشّمائل المحمّديّة: ٣١١.

ئەمەش کە بوێژرێ: ئەمە تایبەت بە کتێبی خواو خوێندنەوەی ئەوە، شتێکی مەحاڵە و نەگونجاوە، چونکە گوێ گرتن بۆ دەنگی خۆشی بولبول، مەباحە، ئەدی کاتێ کە گوێ گرتن بۆ دەنگی خۆش دروست بێ، بۆ وەختێکیش کە ئەو دەنگە کێش و وەزنی هەبێت، حەرام نییە. جا چۆن ئەکرێ حەرام بێ کاتێ دەنگەکانی ئاواز کێش و وەزنی تایبەتی هەیە، بڕگە و سەروای تایبەت بەخۆی هەیە؟ ئەمەش هیچ جیاوازێکی نییە کە ئەم دەنگە خۆشە لە بنیادەمەوە، دەربچێ، یان لە پەلەوەرەوە، یان لە غەیری ئەمانەوە. کەوایە دەبێ ئەو دەنگانەی کە لەشتە جامدەکانەوە دەردەچێ وەکوو: دەهۆڵ، دووزەلە، دەف، بلوێر و... قیاس بکرێ لەسەر دەنگی پەلەوەر، لە نێو ئەمانەدا تەنها ئەوانەی کە دەقی شەرع لەسەر حەرامبوونەکەیەتی، حەرامە. ئەمانەش وەکوو ئەو جۆرە کەرەستە مۆسیقایانەی کە لەکاتی خواردنی شەرابدا باون». چونکە هەرکاتێ خواردنی شەراب نەهی لێکراو بێت، پێویستە هەرچی کە لەگەڵیدایە و تەواوکەریەتی، مەنع بکرێ، تا بەتەواوی بەرکوتی ئەو کارە بکرێ، تەنانەت لە سەرەتاوە (لە سەردەمی پێغەمبەردا) وەها داخوازی دەکرد کە خومەکان بشکێنرێن.[1]

هەروەها ئەو فەرموودانەی کە لە سەحابەکانەوە ڕیوایەت کراوە کە ئاوازیان بە شیعرەکانیان داوە داکۆکی لەسەر ئەوە دەکا کە باسمان کرد، تەنانەت لە هەردوو سەحیحەکەی (بوخاری و موسلم)دا هاتووە کە: ئەبووبەکر و بیلال رضي الله عنهما کاتێ هاتنە مەدینە بیلال نەخۆش بوو، جا کاتێ کە تا و لەرزی لە کۆڵ کەوت، بەدەنگی بەرز فەرمووی:

«أَلا لَيْتَ شِعْرِي هَلْ أَبِيتَنَّ لَيْلَةً ... بِوادٍ وَ حَوْلِي "إِذخِرٌ" وَ "جَلِيلُ"

وَ هَلْ أَرِدَنْ يَوْماً مِياهَ مَجَنَّةٍ ... وَ هَلْ يَبْدُونَ لي "شامَةٌ" و "طَفيلُ"»[2]

واتە: ئای خۆزگە دەمزانی: ئاخۆ ئەبێ شەوێك من لە شیوێ ڕابوێرم و لە دەوروبەرمدا داری "إذخر" و "جلیل" ببێت.

ئاخۆ ببێ ڕۆژێ ئەمن بچمە سەر ئاوی "مجنه"، یان ئاخۆ پێمەوە دیار ئەبن دوو کێوی "شامه" و "طفیل".

حەزرەتی ئەبووبەکر رضي الله عنه فەرموویەتی:

---

١. بخاري: ٢٢٩٧ ـ ٥٦٨٣، ترمذي: ١٢١٤.

٢. بخاري: ١٧٥٦، الموطأ لمالك: ١٣٨٥، احمد: ٢٣٣٢٤.

«كُلُّ امْــرِىءٍ مُصَبَّحٌ فِي أَهْلِهِ          وَالْمَوْتُ أَدْنَىٰ مِنْ شِرَاكِ نَعْلِهِ»[1]

واتە: هەرکەسێك لەنێو خاوخێزانی خۆیدا ڕۆژی کردۆتەوە، لەکاتێکدا مەرگ لەپەتی پێلاوەکەی پێیەوە نزیکتر بووە.

پێغەمبەریش ﷺ فەرموویەتی:

«اَللّٰهُمَّ إِنَّ الْعَيْشَ عَيْشُ الْآخِرَةِ          فَارْحَمِ الْأَنْصَارَ وَالْمُهَاجِــرَةَ»[2]

واتە: ژیان ژیانی دواڕۆژە، [ئەدی خوایە!] بەزەییت بە هەوالانی کۆچەر و یاوەر بێتەوە.

هەمووی ئەمانە لە سەحیحی موسلیم و بوخاریدا هاتووە.

## بەشی دووهەم:
## کاریگەریی سەماع لەو لایەنەوە کە دڵ دەجووڵێنێ و هەرچی بە سەریەوە بێ دەیهەژێنێ

ئەڵێم: نهێنی و سیرڕی خوای مەزن لەوەدایە کە موناسەبە و ڕێکەوتن لە نێوان دەنگی خۆش و کێشدار و ڕۆحدا هەیە، هەربۆیە ئەو دەنگانە ئاوەها کاریگەرییەکی سەیر و سەمەرە دەکەنە سەر دڵ، جارێك خەمباری دەکات و جارێ خۆشحاڵ، جارێ گریان و جارێ خەندان. هەروەها هەندێ جموجووڵی سەیر و نامۆ لە ئەندامەکاندا بەدی دەهێنێ. وەهاش گومان مەبە کە ئەمە تەنها لەبەر تێگەیشتن لە مانای ئەو ئاوازانەیە، بەڵکوو ئەمەش لەنێو ئاژەڵ و جروجانەوەراندا بەرچاو دەکەوێ، بە تایبەت لە وشتردا، یان لە منداڵە ساواییکدا کە هێشتا نەهاتۆتە گروگاڵ و هیچ نازانێ، یان لە دەنگی ئەو سازانەی کە مانای نازاندرێ، بە تایبەت وشتر، چونکە هەرچەندەش بیابانی درێژی لە بەردا بێ و پشتی لەژێر باری گراندا

---

١. بخاری: ١٧٥٦ ـ ٥٢٢٢، الموطأ لمالك: ١٣٨٥، احمد: ٢٣٢٢٤.

٢. و فی روایة: «اللّٰهُمَّ لا خَيْرَ إِلَّا خَيْرُ الْآخِرَةِ فَاغْفِرْ لِلْأَنْصَارِ وَالْمُهَاجِرَةِ» و فی روایة: «فَانْصُرِ الْأَنْصَارَ وَالْمُهَاجِرَةَ»، و فی روایة: «فَبَارِكْ فِي الْأَنْصَارِ وَالْمُهَاجِرَةِ» و فی روایة: «فَأَكْرِمِ الْأَنْصَارَ وَالْمُهَاجِرَةِ» و فی روایة: «فَارْحَمِ الْأَنْصَارَ وَالْمُهَاجِرَةِ» و فی روایة: «فَأَصْلِحِ الْأَنْصَارَ وَالْمُهَاجِرَةِ» بخاری: ٣٦١٦ ـ ٤١٠ ـ ٢٦٢٣ ـ ٢٧٤١ ـ ٣٦٣٩ ـ ٣٧٩١ ـ ٥٩٣٤، مسلم: ٣٣٦٧ ـ ٣٣٦٨ ـ ٣٣٦٩، ابوداود: ٣٨٣، ترمذی: ٣٧٩١ ـ ٣٧٩٢، نسائی: ٦٩٥، احمد: ١٢٢٦١ ـ ١٢٢٩٦ ـ ١٢٣٠٦ ـ ١٢٦٥٣ ـ ٢٥٢٧٧.

ماندووبێ، هەرکە دەنگی ئاوازی تایبەتی خۆی بیست (حــداء) ملی کێش دەهێنێت و چەندین قۆناغ ڕێگە دەبڕێ.

ئەبووبەکر موحەممەدی کوڕی داوودی دینەوەری کە بە "رقی" بەناوبانگ بوو گوتوویە: «ئەمن لە بیاباندا بووم، تووشی هۆزێکی عەرەب هاتم و پیاوێکیان منی میوانی کرد و بردمیە نێو چادرێکەوە، چاوم بە کۆیلەیێکی ڕەش کەوت، کە بە زنجیر بەسترابووەوە، دیتم کە چەند وشتری مێ لە بەردەمی ماڵەکەدا مردارەوە بوون و هەروەها دیتم وشترە مێیێك لەرِو لاواز بووە، ئەڵێی گیانی تیا نەماوە.

ئەو کۆیلە پێی گوتم: ئەتۆ میوانی و تکایێکم لای ئاغەکەم بۆ بکە، بەڵکوو ئەم زنجیرە لەپێم بکاتەوە؛ چونکە بەڕاستی ئەو ڕێزی میوان دەگرێ و دەس نانێت بە ڕوویەوە. منیش کاتێ کە نانیان بۆ هێنایین دەسم گرتەوە و گوتم: ناخۆم مادامێ تکام بۆ ئەم کۆیلەیە لێ وەرنەگیرێ.

خاوەن ماڵیش گوتی: ئەم کۆیلەیە چی ماڵم بووە لەناوی بردووە.

گوتم: چی کردووە؟

گوتی: دەنگێکی ئێجگار خۆشی هەیە، ئەمنیش لەسەر پشتی ئەم وشترانە ژیان دەبەمە سەر، ئەویش باری قورسی لەسەر ناون و گۆرانی بۆ چڕیون، بەجۆرێ کە هەر بەیەك شەو، ڕێی سێ شەویان، لەخۆشی ئاوازەکەیدا، بڕیوە. جا کاتێ بارەکەی داگرتوون، هەموویان مردوون جگە ئەم دانە مێیەیان نەبێ. ئینجا چونکە ئەتۆ میوانی منی و ڕێزم هەیە بۆت، بەتۆی ئەبەخشم، بەڵام پێم‌خۆشە دەنگی ببیسی.

لە بەیانیدا فەرمانی پێ کرد کە ئاواز بچڕێ بەسەر ئەو وشترانەی کە لە بیر ئاو دەهێنن، جا کاتێ کە دەنگی بەرز کردەوە، وشترەکان سەریان لێ شێواو گوریسیان بڕی و من بە دەمەوە کەوتم. گومان ناکەم ئەمن قەت دەنگی خۆشتر لەوەم بیستبێ».

کەوابوو سەماع کاریگەری سەیری هەیە. کەسێك کە سەماع و ئاوازی خۆش نەیهەژێنێ ئەوە عەقڵی ناتەواوە، لای داوە لە میانەڕەوی و لە ڕۆحانیەت و مەعنەوییەت دوور کەوتۆتەوە.

پەلەوەر بەسەر حەزرەتی داوودعَلَيْهِالسَّلَامُ ڕادەوەستا بۆ بیستنی دەنگی.[1]

---

١. تفسیر ابن کثیر فی سورة الأنبیاء، الآیة: ٨٢ و فی سورة ص، الآیة: ١٧، صفوة التّفاسیر للصّابونی فی سورة الأنبیاء.

ئەبووسولەیمانی دارائیرَحِمَهُاللهُ فەرموویەتی: سەماع و ئاوازی خۆش لە دڵێکدا کە هیچی تێدا نەبێ، کاریگەر نییە، بەڵکوو هەرچی تێدا بێت ئەوە دەهەژێنێ. بەم بۆنەوە خۆشی لە دەنگی شین و ڕۆڕۆ نایێ، چونکە ئەو شتانە دەهەژێنێ کە بەلایەوە ناخۆشە، ئەوەش بریتییە لە خەفەت خواردن بۆ ئەو شتانەی کە لە دەستی دەرچوون.

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿لِكَيْلَا تَأْسَوْا عَلَىٰ مَا فَاتَكُمْ﴾[1] واتە: «لەبەر ئەوە خەفەت نەخۆن بۆ ئەو شتانەی کە لەکیستان چووە».

لەم بارەوە حەدیس و ڕیوایەتی زۆر هاتووە.

ئاواز و گۆرانی چڕین لە زەماوەند و گۆڤەند و ناونانی منداڵ و غەیری ئەمانەش، دروستە و کەراهەتی نییە، چونکە ئەو سترانانە ئەبنە هۆی بزواندنی دڵ بۆ شادی و خۆشییەکی موباح و سوننەت. ئەو ڕیوایەتانە کە باس لە هاتنی پێغەمبەرصَلَّىٰاللهُعَلَيْهِوَسَلَّمَ لە مەککەوە دەکەن، کە ژنان وێڕای دەفلێدان گۆرانیان چڕیوە و ئاهەنگی تایبەتیان ساز کردووە، داکۆکی لەسەر دروستی ئەم باسە دەکەن:

«طَلَعَ البَــدْرُ عَلَيْنَا     مِـــنْ ثَنِيَّاتِ الْوَدَاعِ
وَجَبَ الشُّكْرُ عَلَيْنَا     مَــا دَعَــا لِلّٰهِ دَاعٍ»[2]

واتە: مانگی شەوی چواردەمان لە ملەی "الوداع"وە لێ هەڵات.

کە وابوو تا کەسێ مابێ بانگەواز بۆ خوا بکات، شوکرانەبژێری خوا لەسەرمان پێویستە.

ئەو حەدیسەش کە لە سەحیحەیندا لە حەزرەتی عائیشەوەرَضِيَاللهُعَنْهَا ڕیوایەت کراوە، بەم باسە ئاماژە دەکات، حەزرەتی عائیشە فەرموویەتی:

«رَأَيْتُ رَسُولَ اللّٰهِصَلَّىٰاللهُعَلَيْهِوَسَلَّمَ يَسْتُرُنِي بِرِدَائِهِ وَ أَنَا أَنْظُرُ إِلَى الْحَبَشَةِ يَلْعَبُونَ فِي الْمَسْجِدِ حَتَّىٰ أَكُونَ أَنَا الَّذِي أَسْأَمُ»[3].

واتە: «سەیرم کرد پێغەمبەرصَلَّىٰاللهُعَلَيْهِوَسَلَّمَ خەریکە من بە عاباکەی خۆی دادەپۆشێ و ئەمنیش سەیری حەبەشەییەکانم دەکرد کە لەنێو مزگەوتدا خەریك بوون گەمەیان دەکرد، تا کاتێ من لە سەیرکردنیان ماندوو بووم».

١. الحدید: ٢٣.
٢. بیهقی فی دلائل النّبوّة: ٧٥٢ ـ ٢٠١٩، ابن‌الأثیر فی جامع الأصول: ٦٤٤٥.
٣. بخاری: ٤٨٣٥ ـ ٤٣٥، مسلم: ١٤٨١، نسائی: ١٥٧٧، احمد: ٢٤٩٠٦.

هەروەها ئەوەی وا بوخاری و موسلیم لە سەحیحەیندا دیسانەوە لە زەهری، لە عەروە، لە حەزرەتی عائیشەوەرَضِيَٱللَّهُعَنهَا ڕیوایەتیان کردووە کە: «حەزرەتی ئەبووبەکررَضِيَٱللَّهُعَنهُ لە ڕۆژانی مینادا چوو بۆ لای حەزرەتی عائیشە، دوو جارییەی لە پەنا بوو دەفیان لێ دەدا و دەیانکوتا، پێغەمبەریشصَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَسَلَّمَ لیباسەکەی دابوو بە مل سەریدا. ئەبووبەکررَضِيَٱللَّهُعَنهُ پێی ڕاگرتن، پێغەمبەرصَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَسَلَّمَ لیباسەکەی بەسەر ڕوومەتیەوە لابرد و فەرمووی: «دَعْهُمَا يَا أَبَابَكْرٍ فَإِنَّهَا أَيَّامُ عِيدٍ»[1] واتە: «ئەی ئەبووبەکر وازیان لێبێنە چونکە ڕۆژانی جێژنە» هەر وێنەی ئەم حەدیسە، لە حەدیسێ‌تردا (ڕیوایەتی عەمری کوڕی حاریس، لە کوڕی شەهابەوە) هاتووە کە «تُغنّيان و تَضربان» واتە: «گۆرانیان دەوت و دەفیان لێ‌دەدا»[2].

ئەم بەڵگانەی کە هێنامانەوە بە بێ‌شك مەباحبوون و دروستبوونی سەما و گۆرانی دەگەیەنن، هەروەها دروستبوونی دەنگ و ئاوازی ژنان، دەگەیەنێ، بەو مەرجەی ترسی تووشبوونی فیتنە نەبێت.

بەکورتی، ئاواز و گۆرانی هەرچی لە دڵدا بێت ئەوە دەبزوێنن، ئەگەر لە دڵدا عەشقی موباح و دروست بێ، ئەوە وروژاندنی ئەو عەشقە، دروستە، هەروەها ئەگەر لەدڵدا عەشقێکی حەرام بێت (واتە: هەواو هەوەس و شەهوەت) ئەوە وروژاندنی دروست نییە. ئەمەش بریتییە لە گۆرانی و ئاوازی بێ‌خەبەران.

بەڵام ئاواز و شۆر و جەزبەی ئەهلی دڵ، ئەوانە کە بە عیشقی خواو تاسە و تامەزرۆیی ئەوەوە، ناویان دەرکردووە ـ واتە ئەوانەی کە بۆ هەرچی کە ئەڕوانن خوای تێدا ئەبینن، هیچ دەنگێ نایێتە بەر گوێیان، مەگەر دەنگی خوایە، یان لەبارەی خواوەیە ـ ئەوە ئاواز و سەما، عیشق و خۆشەویستییان زیاتر دەکات و شەوق و تاسەیان دەهورووژێنێ و دەبێتە بەردی چەخماخی دڵی ئەوان و گڕی تێ بەردەدا، دەبێتە هۆی بەدیهێنانی حاڵاتی موکاشەفە و موڵاتەفەی عیرفانی کە لە باسکردن نایە. ئەو کەسانەی کە چێشتوویانە، دەزانن چلۆنە، هەروەها کەسانێ ئینکاری دەکەن کە هەستیان ناتەواوە و ناتوانێ پەی پێ ببات. ئەمەش لە زاراوەی ئەهلی تەسەووفدا پێ ئەڵێن: وەجد.

---

١. بخاري: ٢٦٩١ ـ ٣٢٦٦ ـ ٣٦٣٨، مسلم: ١٤٨٠ ـ ١٤٧٩ ـ ١٤٨٢، نسائي: ١٥٧٩، ابن‌ماجه: ١٨٨٨.

٢. بخاري: ٣٢٦٦، مسلم: ١٤٨٠، نسائي: ١٥٧٩.

جا هەر شتێ عیشقی خوا لەدڵدا زیاد و فەراوان بکات ـ ئەگەر بەفەرز نەیێتە ئەژمار ـ ئەوە لە موباحات و کردارە ڕەواکان، کەمتر نییە، جا چلۆن وەها نابێ کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ داخوازی ئەو حاڵەتە لە دوعاکانیدا دەکات، کاتێ کە فەرموویەتی: «اَللّٰهُمَّ ارْزُقْنِي حُبَّكَ وَ حُبَّ مَنْ أَحَبَّكَ وَحُبَّ مٰا يُقَرِّبُنِي إِلَىٰ حُبِّكَ»[1].

واتە: «خوایا! خۆشەویستی خۆت و خۆشەویستی هەرکەسێ تۆی خۆش ئەوێ و خۆشەویستی هەرچی کە لە خۆشەویستی تۆم نزیکەوە بکات، بکە بە نەسیبم».

جا ئێستا بزانە، ئاواز و هۆرە دڵ دەبزوێنێ، هەندێ کەس هەن کە هێندە لوتف و ڕەحمی خودا تێیدا بەهێز بووە بە پلەی کەماڵ گەیشتوون، ئیتر پێویستیان بە دڵبزوێنی دەرەکی نییە کە لە دەرەوە دڵ بهەژێنێ.

## بەشی سێهەم: ئاداب و شێوازی ئاواز و سەما

بزانە یەکێك لە ئادابی سەماع و هۆرە ئەوەیە کە بە جوانی گوێی بۆ بگیررێ و تا ئەو جێگەیەی بۆیان ئەلوێ هەراو هاوار و تەکان و جووڵەیان نەبێ، بە تایبەت بۆ ئەو گەنجانەی کە لە بەردەستی پیرەکانیاندان، یان بۆ ئەو تازەکارانەی کە لە بەردەستی ئەوانەدان کە تەواویان کردووە. پێویست و واجبە کە هۆشیاری دڵ و نەفسی خۆی بێ، بە جۆرێ کە وریا بێ نەفسی بەو جموجووڵانە تووشی ڕیای نەکات و بە درۆ سەما بکات. بەڵام هەندێ لە ئەهلی تەسەووف بۆچوونیان وایە کە دروستە بە زۆر خۆی بهێنێتە سەما بۆ ئەوەی لە داهاتوودا بە شێوەی ڕاستەقینە بێتە سەما و ببێتە هۆی ورووژاندنی هەرچی شتە کە لە دەروونیدایە.

---

١. ترمذی: ٣٤١٣، ابن‌ابی‌شیبة: ٩٦/٧، جامع الأصول لإبن الأثیر: ٢٣٦٣ جمیعهم بلفظ: «وَ حُبَّ مَنْ يَنْفَعُنِي حُبُّهُ عِنْدَكَ»، و فی روایة: «قٰالَ النَّبِيُّ ﷺ: "قٰالَ دٰاوُدَ عَلَيْهِ السَّلَامُ: رَبِّ أَسْأَلُكَ حُبَّكَ وَ حُبَّ مَنْ يُحِبُّكَ ...» حاكم فی المستدرك مع تعلیقات: ٣٦٢١.

# بابەتی نۆزدەهەم: فەرمان بە چاکە و نەهی لە خراپە

## بەشی یەکەم: واجببوونی فەرمان بە چاکە و نەهی لە خراپە

پێویستە بزانی فەرمان بە چاکە و نەهی لە خراپە، لە ئەسڵی دینن، بەم دوانەیە کە ئامانج و هەدەفی ناردنی پێغەمبەران دەردەکەوێ، فەرموودەی خوای مەزنیش ئەمە دەگەیێنێ:

﴿وَلْتَكُنْ مِنكُمْ أُمَّةٌ يَدْعُونَ إِلَى الْخَيرِ وَ يَأْمُرونَ بِالْمَعْرُوفِ وَ يَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنْكَرِ﴾[1] واتە: «با گرووپێ لە ئێوە بانگەوازی چاکە بکەن و فەرمان بە چاکە و نەهی لە خراپە بکەن».

لە حەدیسیشدا هاتووە کە حەزرەتی ئەبووبەکر رَضِيَ اللهُ عَنْهُ لە خوتبەیێکدا فەرمووی:

ئەی خەڵکینە! ئێوە ئەم ئایەتە دەخوێنن و بەجۆرێ پاساوی بۆ دەهێننەوە کە مانای ئەو ئایەتە نییە:

﴿يٰا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا عَلَيْكُمْ أَنْفُسَكُمْ لا يَضُرُّكُمْ مَنْ ضَلَّ إِذَا اهْتَدَيْتُمْ﴾[2]واتە: «ئەی کەسانێك کە ئیمانتان هانیوە، هۆشتان بێ کاتێ کە کەوتنە سەر ڕێگەی ڕاسە، ئەوانە وا بە لاڕێدا چوون، زەرەرتان پێ نەگێینن».

ئەمنیش لە دەمی پێغەمبەرم صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بیستووە، دەیفەرموو: «مٰا مِنْ قَوْمٍ عَمِلُوا بِالْمَعٰاصِي وَ فِيهِمْ مَنْ يَقْدِرُ عَلَىٰ أَنْ يُنْكِرَ عَلَيْهِم فَلَمْ يَفْعَلْ إِلّا يُوشَكُ أَنْ يَعُمَّهُمُ اللهُ بِعَذٰابٍ مِنْ عِنْدِهِ».[3]

---

١. آل‌عمران: ١٠٤.

٢. المائدة: ١٠٥.

٣. ابوداود: ٣٧٧٥ بهذا اللفظ. و ترمذی: ٢٠٩٤ ـ ٢٩٨٣، ابن‌ماجه: ٣٩٩٥، احمد: ١ ـ ١٦ ـ ٣٠ ـ ٥٠ بلفظ: «وَ إِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: إِنَّ النّٰاسَ إِذٰا رَأَوْا ظٰالِماً فَلَمْ يَأْخُذُوا عَلَىٰ يَدَيْهِ أَوْشَكَ أَنْ يَعُمَّهُمُ اللهُ بِعِقٰابٍ مِنْهُ» و فی روایة: «إِنَّ النّٰاسَ إِذٰا رَأَوُا الْمُنْكَرَ لا يُغَيِّرُونَهُ أَوْشَكَ ...» و فی روایة: «...الْمُنْكَرَ بَيْنَهُمْ فَلَمْ يُنْكِرُوهُ يُوشِكُ ...».

واتە: هەر هۆز و تایفەیێ کە گوناح بکەن و وێڕا ، ئەوەی کەسانێکیان تێدا بیێت کە دەسەڵاتی ئەوەیان هەبێ بەریان بگرن، کەچی نەیکەن، ئەوە لەوانەیە کە خوا سەرجەمیان بخاتە بەر عەزابی خۆی».

لە ئەبی‌سەعلەبەی خەشەنییەوە دەگێڕنەوە، کە سەبارەت بە تەفسیری فەرموودەی خوا: «لا یَضُرُّكُمْ مَنْ ضَلَّ إِذَا اهْتَدَيْتُمْ» پرسیاری لە پێغەمبەر ﷺ کرد، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: «يا أَبا ثَعْلَبَةَ مُرْ بِالْمَعْرُوفِ وَانْهَ عَنِ الْمُنْكَرِ، فَإِذا رَأَيْتَ شُحّاً مُطاعاً وَ هَوىً مُتَّبَعاً وَ دُنْيا مُؤْثَرَةً وَ إِعْجابَ كُلِّ ذِي رَأْيٍ بِرَأْيِهِ فَعَلَيْكَ بِنَفْسِكَ، وَدَعْ عَنْكَ الْعَوامَّ، إِنَّ مِنْ وَرائِكُمْ فِتَناً كَقَطْعِ اللَّيْلِ الْمُظْلِمِ لِلْمُتَمَسِّكِ فِيها بِمِثْلِ ما أَنْتُمْ عَلَيْهِ أَجْرُ خَمْسِينَ مِنْكُمْ»[1]

واتە: «ئەی ئەبوو سەعلەبە! فەرمان بە چاکە بکە و نەهی لە خراپە بکە، هەرکاتێ دیت کە خەڵك لە حەسادەت و ئێرەیی، پەیڕەوی دەکەن و شوێنی هەواو هەوەس دەکەون و دونیایان [بەسەر دواڕۆژدا] هەڵبژاردووە، هەروەها هەرکاتێ دیت هەر خاوەن ڕایێ بە بۆچوون و ڕای خۆی بایی بووە، ئەبێ هۆشی خۆتت بێ و تەرکی خەڵکی ڕەشۆکی و عەوام بکە. ئەوە بەڕاستی لە دوای ئێوە (لە داهاتوودا) فیتنە و ئاژاوەهایێك هەیە کە وەکوو پەڵەی شەوی تاریکە، هەرکەس لەناو ئەو فیتنەیانەدا دەس بەوەی بگرێ وا ئێوە دەستان پێوە گرتووە (واتە دینی ئیسلام) ئەوە ئەجر و پاداشی پەنجا کەس لە ئێوەی هەیە».

## بەشی دووهەم: بناغەی ئەمر بە چاکە و نەهی لە خراپە

ئەوە بزانە کە ئەمر بە چاکە لەسەر چوار بناغە دامەزراوە:

١. «المُحْتَسِبُ»، واتە: نەهی‌کەر؛

٢. «المُحْتَسَبُ فیه»، واتە: نەهی لێ‌کراو؛

٣. «المُحتَسَبُ عَلیهِ» واتە: ئەو شتەی کە نەهی لێکراوە؛

٤. «الإحتساب»، واتە: خودی نەهیەکە.

---

١. ترمذی: ٢٩٨٤، ابن‌ماجه: ٤٠٠٤، طبرانی فی الکبیر: ١٨٠٣٣، بیهقی فی شعب الإیمان: ٧١٤٧، ابن‌حبان فی صحیحه: ٣٨٦ بألفاظ مختلفة.

**بناغەی یەکەم: چەند مەرجی هەیە؛**

**مەرجی یەکەم:** نەهی‌کەر ئەبێ تەکلیفی لەسەر بێ، کەوا بوو هەموو کەس ئەم مەرجە دەیگرێتەوە. وە بۆ بەڕێوەبردنی ئەم ئەرکە، پێویستی بە دیاریکردن و ئیزندانی لەلایەن کەسێکەوە نییە.

**مەرجی دووهەم:** موسڵمانبوونە، چونکە ئەمر بە چاکە، دین برەو پێ‌دەدا.

**مەرجی سێهەم:** عەداڵەتە، کە کێشەی لەسەرە، هەندێکیان بە مەرجیان داناوە لەبەر فەرموودەی خوای مەزن: ﴿لِمَ تَقُولُونَ مَا لا تَفْعَلُونَ﴾[1] واتە: «بۆچی شتێك ئەڵێن کە خۆتان نایکەن»، هەروەها لەبەر فەرموودەی خوای مەزن: ﴿أَتَأْمُرُونَ النَّاسَ بِالْبِرِّ وَتَنْسَوْنَ أَنْفُسَكُمْ﴾[2] واتە: «ئایا فەرمان بە خەڵك دەدەن بۆ کاری چاکە و خۆتان لە بیر دەکەن؟»».

لەم بارەشەوە حەدیس و ڕیوایەتی زۆر هاتووە. هەندێ‌تر عەداڵەتیان بە مەرج نەزانیوە. ئەمەش بۆچوونی ڕاست و دروستە، چونکە بە ئیجماع و هاوڕایی تەواوی زانایان، عیسمەت و لە گوناح پارێزراوی، مەرج نییە، تەنانەت لە پارێزراوبوونی پێغەمبەرانیش لە گوناحی بچووکدا کێشە هەیە، ئەدی چلۆن ئەبێ لە غەیری ئەواندا چاوەڕوانی عیسمەت بکرێ. لە پاشانکەش هەر ئەمەش، ئەبێتە هۆی ئەوەی ئەم مەرجە لە بەرچاو نەگیرێ چونکە ئەم مەرجە دەس ناکەوێت.

ئێمە ئەڵێین دوو ئەرکمان لەسەرە، یەکەم: دەس‌کێشان، دووهەم: بەرگرتن، ئەمنیش یەکیان دەکەم هومێدم ئەوەیە بە بەرەکەتی بتوانم ئەوتریشیان بەجێ بهێنم.

بەڵام کافر و دژەدین نابێ ئەمر بە چاکە و نەهی لەخراپە بکات، چونکە بەم ئیشە سوڵتەی خۆی بەسەر موسڵماناندا دەسەپێنێ و خواش ڕێی نەداوە کە کافران بەسەر موسڵماناندا ئەمر و نەهی بکەن.

مرۆڤی موسڵمان بە پێی ئەوەی کە شیاوی ئەو شوێنە بێ، بە هەڕەشە و ترساندن، یان لێدان و... ئەمر بە چاکە و نەهی لە خراپە دەکات، ئەمەش بە پاشابوون و ئیمام و پێشەوابوون و غەیری ئەمانەش ناگۆڕێ و هەمووکەس یەکسانە.

---

١. الصف: ٢.

٢. البقرە: ٤٤.

هەرکەس هەر کارێك بکات کە نابێ بیکات، ئەو نەهی لێ ئەکرێ، ئەو فەرموودە کە گێڕاویانەتەوە کە مەروانی کوڕی حەکەمەوە پێش لە نوێژی جێژن وتاری دەدا، پیاوێ پێی گوت: بەسە، وتار ئەبێ پاش نوێژ بدرێ، مەروانیش گوتی: فڵانەکەس! ئەم فەرمانە گۆڕاوە.

ئەبوو سەعیدی خدری رَضِيَ اللهُ عَنْهُ لەوێ بوو فەرمووی: ئەو پیاوە ئەوەی کە لە سەری بوو ئەنجامی دا. پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فەرموویە پێمان: «مَنْ رَأَىٰ مِنْكُمْ مُنْكَراً فَلْيُغَيِّرْهُ بِيَدِهِ فَإِنْ لَمْ يَسْتَطِعْ فَبِلِسٰانِهِ فَإِنْ لَمْ يَسْتَطِعْ فَبِقَلْبِهِ وَ ذٰلِكَ أَضْعَفُ الْإِيمٰانِ»[1]

واتە: «هەرکەس لە ئێوە خراپەیێکی چاو پێ‌کەوت، ئەوە با بە دەست ئەو ئیشە بگۆڕێ، ئەگەر نەیتوانی ئەوە با بە زمان بیگۆڕێ، ئەگەر نەیتوانی ئەوە با بەدڵ (واتە ڕقی لێ بێ)، ئەمەش لاوازترین ئیمانە».

لەمەوە دەرکەوت کە نەهی‌کردنیش خۆی چەند پلەی هەیە.

### بناغەی دووهەم:

نەهی لێکراوەکە، کە بناغەیێکی‌ترە، ئەبێ ناشەرعی‌بوونەکەی بە ئیجتیهادەوە نەبەسترابێتەوە. نابێ لەوانە بێ کە پێشەوا باوەڕ پێ‌کراوەکانی دین‌کێشەیان لەسەر بێ. کەوا بوو نابێ شوێن‌کەوتوانی ئیمامی شافیعی بەر حەنەفی مەزهەب بگرێ لە خواردنەوەی ئاوجۆ و شەرابێ کە مەست ناکات، هەروەها نابێ حەنەفی مەزهەب بەر شافیعی مەزهەب بگرێ لە خواردنی گۆشتی بزنەمژە و کەمتیاردا.

### بناغەی سێهەم

نەهی لەسەرکراو، مەرجی ئەوەیە کە ئینسان بێ [ئیدی مەرج نییە تەکلیفی لەسەر بێ یان نە] چونکە منداڵ لە خواردنی شەراب مەنع ئەکرێ.

بەڵێ هەندێ کردەوە هەیە کە منداڵ و شێتی لێ مەنع ناکرێ [وەکوو نوێژ نەخوێندن، ڕۆژوو شکاندن].

---

[1]. مسلم: ٧٠، ابوداود: ٣٧٧٧، ترمذی: ٢٠٩٨، نسائی: ٤٩٢٣، ابن‌ماجە: ١٢٦٥، احمد: ١٠٧٢٣.

## هەندێ لە ئاداب و ئەرکی ئەو کەسەی کە نەهی لە خراپە دەکات

ئەبێ ئەو کەسە زانا بێ، خۆ پارێز بێ، ئاکار و ڕەفتاری چاك بێ، میهرەبان بێ نەك تووڕە، بۆیە ئەبێ زانا بێ تا سەبارەت بە ئەمر بە چاکە و نەهی لە خراپە سنووری شەرع بزانێ، بۆیە ئەبێ خۆپارێز بێ تا لە چوارچێوەی سنووری شەرعدا ئەنجامی بدات، ئەبێ خۆش‌ڕەفتار بێ، نابێ بە تووڕەییەوە بیکات، مەبادا لە سنووری شەرع دەربچێ و خراپتری بکات لە وەیکە ئەیەویست چاکی بکات. تەنانەت ئەگەر کەسێ بەری‌گرت یان بە شتێ ناخۆش بەرنگاری کرد، ئەبێ هۆشیار بێ لە سنووری شەرع لا نەدات و ئەمر بە چاکە و نەهی لە خراپە لەبیر نەکات و خۆی لە عەینی ئەو وەختە کە خەریکە نەهی لە خراپە دەکات خەریکی ئەنجامدانی ئەو گوناحە نەبێ.

## بەشی سێهەم:
## ئەو ئیشە خراپانەی کە خەڵك خوویان پێوە گرتووە

وەکوو لادان لە جیهەتی قیبلە، پەلەکردن لە سوژدە و ڕوکووعدا، بە هەڵە قورئان خوێندن، بەڕاستی پێویستە لەسەر ئەم کردەوە (بە هەڵە قورئان‌خوێندن) ئاگادار بکرێ، چونکە ئەمە لە گەورەترینی خێراتەکانە، تەنانەت لە نوێژە سوننەتەکان خێری زۆرترە.

یەکێ‌تر لە ئیشە خراپەکان: زیادەوێژی و درێژەدانە بە بانگ وکێشانی لە ئەندازە بەدەری وشەکانی بانگە، دووپات و سێ‌پاتکردنەوەی بانگ لەیەك مزگەوتدا، جار لە دوای جار لە نوێژی بەیانیدا، چونکە هیچ خێرێکی تێدا نییە.

یەکێ‌تریش، پۆشینی جلوبەرگێکە کە هەورێشمی زۆری تیدایە، یا گەمە و گاڵتەی تیکەڵ بە بیدعەت و خراپەوتنی ئینسانە فاسقەکان، یان کۆبوونەوەو حەڵقەبەستنی خەڵك لە ڕۆژی جومعەدا بۆ کڕین و فرۆشتنی دەرمان و نوشتە و دوعا. بەپێ ئەمانەی کە باسمان کرد نموونەکانی دیکەی بێنە بەرچاو، ئیدی پێویست نییە هەمووی ناو ببەین.

## بەشی چوارەم:
## سەبارەت بە فەرمان بە چاکەو نەهی لە خراپەی فەرمانڕەواکان

پێویسته بزانی ئەمر بە چاکە و نەهی لە خراپە چوار پلەی هەیە:

١. پێناسەکردن و پیشاندان؛

٢. ئامۆژگاریکردن؛

٣. بە توندوتیژی و تووڕە بوون؛

٤. بە زۆر بەرگرتنی.

لە بەرانبەر فەرمانڕەوایان و پاشایان و دەسەڵاتداران تەنها پێناسەکردن و ئامۆژگاریکردن دروستە، بەڵام بە توندوتیژی باس‌کردنی و بەرگرتنیان بەزۆر، دروست نییە، چونکە ئەبێتە هۆی بەرپابوونی فیتنە و ئاژاوە کە خراپترە لەوەی کە ئەوان تووشی بوون.

بەڵێ ئەگەر بزانێ کە توندوتیژی نابێتە هۆی ئیشێکی خراپ و شتێ خراپی لێ ناوەشێتەوە ئەوە قەیناکا. بەڵام هەندێ لە پیاوچاکانی ڕابردوو گوێیان بەمە نەداوە و [لە هەرکوێدا بۆیان لواوە بە توندی لە بەرانبەر فەرمانڕەوا و دەسەڵاتدارانەوە وەستاون]. فەرموودەی پێغەمبەریش صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ئاماژە بەمە دەکات: «خَيْرُ الشُّهَدَاءِ حَمْزَةُ بْنُ عَبْدِالْمُطَّلِبِ،[1] ثُمَّ رُجُلٌ قَامَ إِلَىٰ إِمَامٍ فَأَمَرَهُ وَنَهَاهُ فِي ذَاتِ اللهِ ـ عَزَّوَجَلَّ ـ فَقَتَلَهُ عَلَىٰ ذٰلِكَ»[2].

واتە: «بەڕێزترین شەهید حەمزەی کوڕی عەبدولموتەلیبە، پاشان ئەو پیاوەی کە لە بەرانبەر ئیمام و پێشەوایەکەوە هەڵدەسێتەوە و ئامۆژگاریی دەکات بۆ کاری چاکە و لە کاری خراپە نەهیی دەکات، ئەویش لەسەر ئەوە دەیکوژێ».

دیسان پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فەرموویەتی: «أَفْضَلُ الْجِهَادِ كَلِمَةُ الْحَقِّ عِنْدَ سُلْطَانٍ جَائِرٍ»[3]. واتە: «مەزنترین جیهاد، قسەیێکی حەققە لەلای ئەمیرێکی ستەمگەردا». بەڕاستی ئەگەر خاوەنی ئەم وتەیە بکوژرێ ئەوە شەهیدە، هەروەك چۆن لە چەندها حەدیسدا هاتووە.

١. طبرانی فی الکبیر: ٢٦٠٩، جامع الکبیر للسیوطی: ١٢٣٧٠.

٢. جامع الکبیر للسیوطی: ١٢٣٧٠ بلفظ: «وَ رَجُلٌ قَامَ وَ أَمَرَ وَ نَهَىٰ فَقُتِلَ عَلَىٰ ذٰلِكَ». و الحاکم فی المستدرك: ٤٨٧٢ بلفظ: «سَيِّدُ الشُّهَدَاءِ حَمْزَةُ بْنُ عَبْدِالْمُطَّلِبِ وَ رَجُلٌ قَامَ إِلَىٰ إِمَامٍ جَائِرٍ فَأَمَرَهُ وَ نَهَاهُ فَقَتَلَهُ».

٣. ابوداود: ٣٧٨١، ترمذی: ٢١٠٠، نسائی: ٤١٣٨، ابن‌ماجه: ٤٠٠١، احمد: ١٨٠٧٦.

لە "ضبة بن محصن العنزي"یەوە ڕیوایەت کراوە فەرموویەتی: ئەبوومووسای ئەشعەری لە بەسرەدا ئەمیرمان بوو، هەرکاتێ کە وتاری دەدا، حەمد و سەنای خودای مەزنی دەکرد و سەڵواتی لەسەر پێغەمبەرﷺ دەدا و پاشان دوعای بەخێری بۆ حەزرەتی عومەررضي الله عنه دەکرد، ئەمەش زۆر تووڕەی کردم و خۆم پێ ڕانەگیرا و هەستام و گوتم: ئەدی هاوەڵەکەی تری کوا؟ ئەتۆ ئەمت (حەزرەتی عومەر) خستۆتەبەر ئەوەوە (حەزرەتی ئەبووبەکررضي الله عنه)!.

ئەبوو مووساش نامەیێکی بۆ حەزرەتی عومەر نارد و گلەیی منی لا کردبوو و لەو گلەییەدا نووسیبووی: "ضبة بن محصن العنزي" لە میانەی وتاردانەکەمدا هەستاوەتەوە پێی بڕیوم.

حەزرەتی عومەریش بۆی نووسیبوو کە بینێرە بۆلام، ئەبوومووساش منی نارد بۆلای حەزرەتی عومەر، منیش چووم بۆلای و دەرگام کوتا و حەزرەتی عومەر هاتە دەرەوە و فەرمووی: ئەوە کێیە لە بەردەرگادا؟ گوتم: منم "ضبة بن محصن الغزي"، فەرمووی: «لا مَرْحَباً و لا أَهْلاً» واتە: بەخێر نەهاتی، بێ‌ماڵ و منداڵ. ئەمنیش گوتم: خێر و پیرۆزی لە خواوەیە، ماڵ و منداڵیشم هەر نییە. بەڵام ئێستا ئەی عومەر! تۆ منت بۆچی بێ ئەوەی تاوانێکم کردبێت یان کارێکم ئەنجام دابێت، لە بەسرەوە، بانگهێشت کردووە؟

فەرمووی: ئەی ئەو دەمەقرە چی بوو، کە لە نێوان تۆ و نوێنەری مندا لەوێ، ڕووی داوە؟

گوتم: ئێستا ئاگادارت دەکەمەوە، ئەو هەرکاتێ وتاری دەدا، حەمد و سەنای خوای مەزنی دەکرد و پاشان لەسەر پێغەمبەرﷺ سەڵواتی دەدا و پاشان دەستی دەکرد بە دوعای خێر بۆ تۆ، ئەمەش منی تووڕە کرد و هەستام و گوتم: ئەی کوا هاوەڵەکەی؟ ئەتۆ فەزڵی ئەمت (عومەر) بەسەر ئەودا (ئەبووبەکر) داوە. ئەویش پاشان کۆمەڵێ خەڵکی کۆ کردەوە و نامەی بۆ تۆ نووسی و شکایەتی منی کرد.

حەزرەتی عومەر لەپڕدا دەستی کرد بە گریان و فەرمووی: ئەتۆ وەڵڵاهی لە من سەرکەوتووتر و ژیرتری. ئاخۆ تۆ گوناحی من ببەخشی ـ لەخوا داواکارم گوناحانت ببەخشێ ـ ، ئەمنیش گوتم: خوای مەزن لە تۆ خۆش بێت، ئەی سەرۆکی موسڵمانان!

وتی: پاشان حەزرەتی عومەر گریا و پێی فەرمووم: سوێند بە خوا، تاقە شەو و ڕۆژێك لە [ژیانی] ئەبووبەکر هەیە کە چاکترە لە عومەر و ئەولادەی عومەر. ئەرێ تۆ حەز دەکەی باسی ئەو تاقە شەو و ڕۆژەت بۆ بکەم؟ گوتم بەڵێ. فەرمووی:

شەوەکەی: پێغەمبەرﷺ کاتێ ویستی لە مەککە بڕواتە دەر و لەدەستی موشریکەکان دەربچێ، بە شەو لە ماڵ هاتەدەر و ئەبووبەکر شوێنی کەوت، جارێ لە پێش پێغەمبەرەوە ﷺ دەڕۆیشت جارێ لە دوایەوە، جارێ لەلای ڕاستەوە، جارێ لەلای چەپیەوە.

پێغەمبەرﷺ، فەرمووی ئەوە چییە ئەبووبەکر!؟ شتی وا لە کرداری تۆدا بۆم ئاشنا نییە! فەرمووی ئەی ڕەسوولی خوا! ئەوە هەرکاتێ بیری کەمینی دوژمنان دەکەمەوە، وە پێشت دەکەوم، هەرکاتێ بیری بە شوێنەوە بوونت دەکەم، دەکەومە پشت سەرتەوە، جارێك لای چەپ و جارێ لای ڕاست، ئەمن بۆ پارێزگاریت ئەمین نیم و بە پەرۆشم.

ئەو شەوە پێغەمبەرﷺ بەسەر پەنجەکانی پێیدا دەچوو بە ڕێوە، تا پێی سوویا و ماسی، کاتێ کە ئەبووبەکرؓ زانی کە پێ‌خاوس بووە و پێی ماسیوە نایەسەر شانی و بە پەلە ڕۆیشتن تا گەیشتنە دەمی ئەشکەوتەکە، لەوێدا داینا و فەرمووی: سوێند بە ئەو کەسەی کە تۆی بە حەق ناردووە، نابێ تۆ بڕۆیتە ناو، تا من نەچمە ناوی، با ئەگەر شتێکی تێدا بێت، پێش تۆ تووشی من بێت.

فەرمووی: ئەبووبەکرؓ چووە ناو و هیچی چاو پێ نەکەوت، پێغەمبەریﷺ هەڵگرت و بردیە ناو ئەشکەوتەکەوە. لەناو ئەشکەوتەکەدا کونێکی دەمتاکی تێدا بوو، کە ماری لێ بوو، ئەبووبەکریش پێی نابەو کونەوە مەبادا یەکێ لەو مارانە بێنە دەرەوە بچنە لای پێغەمبەرﷺ و ئازاری بدەن. لە پڕ یەکێ لەو مارانە لە کون دەرپەڕی و پێی ئەبووبەکری گەست، پاشان ئەبووبەکرؓ لەبەر ئێش فرمێسك لە چاوانیەوە بەسەر کوڵمیدا هاتەخوار.

پێغەمبەریشﷺ فەرمووی: ﴿لا تَحْزَنْ إِنَّ اللَّهَ مَعَنا﴾ واتە: «خەم مەخۆ بەڕاستی خودامان لەگەڵە»، پاشان خوای مەزن ئارامش و ئۆقرەی ڕژاند بە سەر ئەبووبەکردا. ئەمە شەوەکەی بوو.

ڕۆژەکەش: کاتێ پێغەمبەرﷺ فەوتی فەرموو، عەرەب هەڵگەڕانەوە، هەندێکیان گوتیان: نوێژ ناکەین، هەندێ‌تریان گوتیان: ئێمە زەکات دەرناکەین. ئەمنیش هیچ ئامۆژگارییێکم لێ دریغ نەدەکرد، گوتم: ئەی جێگری پێغەمبەری خوا، لەگەڵ خەڵکدا میهرەبان ببە و دڵسۆزییان لەگەڵدا بکە.

ئەبووبەکرڕەزیاللەعەنە فەرمووی: [ئەی عومەر!] ئەتۆ لە سەردەمی جاهیلییەتدا توندوتیژ و لێبڕاو بوویت، بەڵام ئێستا سست و بێویستی! ئەدی بەچی لەگەڵیاندا بسازم، پێغەمبەری خوا ﷺ فەوتی فەرمووە و وەحی لەناودا هەڵگیراوە، سوێند بەخوا ئەگەر ئەوان پەت و پاوەنێ کە لەو وەختەدا بە پێغەمبەریان ئەدا، بە منی نەدەن، لەگەڵیان بەشەڕ دێم و لەسەر ئەوە دەیانکوژم.

فەرمووی: ئێمە لەگەڵیاندا شەڕمان کرد، ئەدی سوێند بەخوا کارەکە زۆر بەجێ و ژیرانە بوو. ئەمەش ڕۆژەکەی بوو.[1]

پاشان نامەی بۆ ئەبوو مووسا نووسی و لۆمە و سەرزەنشتی کرد.

والله أعلم

١. الخبر كاملاً فى المجالسة و جواهر العلم للدينورى المالكى: ٢٢٣٨ و الرياض النّضرة لمحب الطبرى: ٦٨/١، لكن قصة الهجرة فى البخارى: ٣٣٤٦ ـ ٣٧٩، مسلم: ٥٣٢٩، احمد: ٣ و قصة قتال اهل الرّدّة فى البخارى: ١٣١٢ ـ ٦٤١٣ ـ ٦٧٤١، مسلم: ٢٩، ابوداود: ١٣٣١، ترمذى: ٢٥٣٢، نسائى: ٢٤٠٠، احمد: ١١٢.

# بابەتی بیستەم:
# ئاداب و ڕەوشتی ژیان و ئاکاری پێغەمبەرایەتی

## بەشی یەکەم: ئاداب و ئاکاری پێغەمبەر ﷺ:

بزانە کە پێغەمبەر ﷺ هەمیشە خۆبەکەمزان و ملکەچ و دڵپڕ بوو. داوای لە خوا دەکرد کە بە ئاکاری چاك بیرازێنێتەوە و ئاداب و ڕەوشتی جوانی خەڵات بکا. پێغەمبەر ﷺ لە دوعاکانیدا دەیفەرموو: «اَللّٰهُمَّ حَسِّنْ خَلْقِي و خُلُقِي»[1] واتە: «خوایا! سرشت و ڕەفتارم جوان و چاك بکە».

سەعیدی کوڕی هیشام فەرموویەتی: چووم بۆ لای حەزرەتی عائیشە رضي الله عنها پرسیارم لێ کرد لەبارەی ئاکاری پێغەمبەرەوە ﷺ.

فەرمووی: ئەرێ قورئانت خوێندووە؟

گوتم: بەڵێ.

فەرمووی: «كَانَ خُلُقُ رَسُولِ اللهِ الْقُرْآنَ»[2] واتە: «ئاکار و ڕەفتاری پێغەمبەری خوا بە پێی قورئان بوو».

---

١. لم نعثر علیه لکن فی روایة احمد: ٢٣٢٥٦ ـ ٣٦٣٢، بیهقی فی شعب الإیمان: ٨١٨٤، ابن‌ابی‌شیبة فی مسنده: ٣٦٧: «اللّٰهُمَّ كَمَا أَحْسَنْتَ خَلْقِي فَأَحْسِنْ خُلُقِي». و فی روایة: «كَانَ ﷺ إِذَا نَظَرَ فِي الْمِرْآةِ قَالَ ﷺ: الْحَمْدُ لِلّٰهِ حَسَّنَ خَلْقِي وَ خُلُقِي» طبرانی فی الکبیر: ١٠٦١٤، بیهقی فیشعب الإیمان: ٤١٤٥.

٢. نسائی فی سنن الکبری: ١١٣٥٠، حاکم فی المستدرك: ٣٤٤٠، بیهقی فی دلائل النبوة: ٢٤٣، طبرانی فی مسند الشّامیین:١٩٣٦. و فی روایة: «... كَانَ خُلُقُهُ الْقُرْآنَ» احمد: ٢٣٤٦٠، طبرانی فی الکبیر: ١٧٥٥، بیهقی فی شعب الإیمان: ١٣٦٠.

ئاکار و ئەدەبی پێغەمبەرﷺ بە پێی قورئان وەکوو فەرموودەی خوای گەورە: ﴿خُذِ الْعَفْوَ وَ أْمُرْ بِالْعُرْفِ وَ أَعْرِضْ عَنِ الْجاهِلِينَ﴾.[1] واتە: «لێبوردوو بەو ئامۆژگاری بە کاری چاکە بکەو ڕوو لە نەزانان وەرگێڕە».

هەروەها وەکوو فەرموودەی خوای مەزن ﴿إِنَّ اللَّهَ يَأْمُرُ بِالْعَدْلِ وَ الْإِحْسانِ وَ إِيتاءِ ذِي الْقُرْبىٰ وَ يَنْهىٰ عَنِ الْفَحْشاءِ وَالْمُنْكَرِ وَالْبَغْيِ﴾.[2]

واتە: «خودا دەستووری بە عەدالەت و بە چاکبوون و بە سەردان لە خزمان داوە و نەهیی کردووە لە کاری خراپ و ناپەسەند و زوڵم و دەستدرێژی».

هەروەها فەرموویەتی: ﴿وَاصْبِرْ عَلىٰ ما أَصابَكَ إِنَّ ذٰلِكَ مِنْ عَزْمِ الْأُمُورِ﴾.[3]

واتە: «لەسەر ئەو بەڵایانەی کە تووشت ئەبێ خۆڕاگر بە، بەڕاستی ئەوە لەو کارانەیە کە ئەبێ لەسەری سوور بێ». لەمبارەوە ئایاتی زۆر هەیە.

ڕۆژی ئوحود کاتێ کە ددانی پێغەمبەرﷺ شکا بوو و خوێن لە ڕوخساری دەچۆڕا، ئەویش ئەو خوێنەی پاك دەکردەوە و دەیفەرموو: ئەدی ئەو گەلەی کە ڕوومەتی پێغەمبەرەکەیان شەلاڵی خوێن دەکەن، لەکاتێدا ئەو بۆلای پەروەردگار بانگیان دەکات، چلۆن سەردەکەون؟!

لەم کاتەدا خوای گەورە ئەم ئایەتەی ناردە سەری ﴿لَيْسَ لَكَ مِنَ الْأَمْرِ شَيْءٌ﴾.[4]

واتە: «ئەتۆ هیچ شتێکت لە کاروباری بەندەکان بەدەست نییە (بەڵکوو هەموو شت بە دەستی خوایە)».

جا بزانە نموونەی ئەم ئایەتانە لە قورئاندا زۆرە، ڕووی دەمی ئەم ئایەتانەش ئەدەبکردن و پاڵاوتنی ڕەفتار و ئاکاری پێغەمبەرە، لەپاش ئەوەوە تیشکی بە تەواوی مەخلووقات دەگات.

پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «بُعِثْتُ لِأُتَمِّمَ مَكارِمَ الْأَخْلاقِ»[5] واتە: «ئەمن نێردراوم تا ئاکاری جوان، تەواو بکەم».

---

١. اعراف: ١٩٩.
٢. نحل: ٩٠.
٣. لقمان: ١٧.
٤. آل عمران: ١٢٨.
٥. بیهقی فی سنن الکبری: ١٠/١٩٢، شهاب القضاعی فی مسنده: ١٠٨٠، حاکم المستدرك: ٤٢٢١، مالك فی الموطأ: ١٤٠٥ بلفظ: «بُعِثْتُ لِأُتَمِّمَ حُسْنَ الْأَخْلاقِ»، احمد: ٨٥٩٥ بلفظ: «بُعِثْتُ لِأُتَمِّمَ صالِحَ الْأَخْلاقِ»، ابن‌ابی‌شیبة فی مصنفه: ٧/٤٤٠، بیهقی فی شعب الإیمان: ٧٦٠٩، حاکم فی المستدرك: ٤١٨٧.

حەزرەتی عەلی رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ فەرموویەتی: ئەمن سەرم سوڕ دەمێنێ لەو پیاوەی کە برا دینییەکەی دێ بۆلای و کەلی لێ دەخات، ئەویش کەلی ناگرێت، جا ئەگەر هیوای بەخێری دوارۆژ نییە، یان ترسی لە سزای خوا نییە، خۆ ئەبوا زۆر بە عەزرەتی ئەنجامدانی ئاکاری چاکەوە بێ، چونکە ئاکاری چاك ئینسان بۆ ڕێی ڕزگاری ڕێنوێنی دەکات.

پیاوێ لێی پرسی: ئەرێ ئەمەت لە پێغەمبەرەوە صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بیستووە؟

فەرمووی: بەڵێ. لەوەش چاترم بیستووە: کاتێ کە ئەسیرانی هۆزی "تەی"یان هانی کۆیلەیێکی ژنیان تێدا بوو، گوتی: ئەی موحەممەد! خۆزگە ئازادت ئەکردم، تا لەناو هۆزەکانی عەرەبدا سووکایەتیم پێ نەکرێ، چونکە من کچی سەرۆکی هۆزێکم و بابیشم لە هۆگرانی شەرافەت و پیاوەتییە؛ دایمە دیلی ئازاد کردووە و برسیی تێر کردووە و نانی داوە و سڵاوی لە هەموو کەس کردووە، دەستی نەناوە بە ڕووی هیچ نیازمەندێکەوە، ئەمن کچی "حاتەمی تەیم".

پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فەرمووی: «يٰا جٰارِيَةُ هٰذِهِ صِفَةُ الْمُؤْمِنِينَ حَقّاً، لَوْ كٰانَ أَبُوكِ مُسْلِماً لَتَرَحَّمْنٰا علَيْهِ، خَلُّوا عَنْهٰا فَإِنَّ أَبٰاهٰا كٰانَ يُحِبُّ مَكٰارِمَ الْأَخْلاقِ وَ إِنَّ اللهَ ـ تَبَارَكَ وَتَعَالَىٰ ـ يُحِبُّ مَكٰارِمَ الْأَخْلاقِ».[1]

واتە: «ئەی کچە کۆیلەکە! بەڕاستی ئەمانە ئاکار و ڕەوشتی موسڵمانانە، ئەگەر بابت موسڵمان بووبا، بێشك لێی خۆش دەبووین. ئەدی بەری بدەن، چونکە بەڕاستی بابی ئاکاری جوانی خۆش ویستووە، خوای گەورە و مەزنیش ئاکاری جوان و لەباری خۆش دەوێ».

هەروەها فەرموویەتی: «وَ الَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لا يَدْخُلُ الْجَنَّةَ إلّا حَسَنُ الْأَخْلاقِ».[2]

واتە: «سوێند بەو کەسەی کە گیانی من لە دەستیدایە، جگە لە ئاکار و ڕەفتارچاکان نەبێ کەس نارواتە بەهەشت».

لە مەعازی کوڕی جەبەلەوە دەگێڕنەوە کە پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فەرموویەتی: «إِنَّ اللّٰهَ ـ تَعٰالَىٰ ـ حَفَّ الْإِسْلامَ بِمَكٰارِمِ الْأَخْلاقِ وَ مَحٰاسِنِ الْأَعْمٰالِ» واتە: «خوای گەورە ئیسلامی بە ئاکار و ڕەفتاری چاك و لەبار داپۆشیوە».

---

١. بيهقي في شعب الإيمان: ٧٦٤٩ بلفظ أخرى.

٢. لم نعثر على هذا اللفظ، لكن ورد بلفظ: «...لا يَدْخُلُ الْجَنَّةَ أَحَدٌ إِلّا بِحُسْنِ الْخُلُقِ» بيهقي في شعب الإيمان: ٧٦٤٩.

## برێك لە ڕەوشت و ئاکاری جوان و لەبار:

تێکەڵی و ئاموشۆی باش، کرداری جوان، زمانی نەرم، بەخشینی شتی چاك، دەس کراوەیی و نان‌دان، سڵاوکردن، سەردان لە موسڵمانی نەخۆش چ چاك بێ چ خراپ، بەڕێکردنی تەرمی موسڵمانان، هاوسێیەتی چاك لەگەڵ هەرکەس کە هاوسێی بی چ کافر، چ موسڵمان، ڕێزگرتن لە پیاوی پیری موسڵمان، بۆ داوەتی چوون، دوعای خێرکردن، لێبوردوویی، نێوان خەڵك خۆش‌کردن، دەس‌ودڵ بازی، پیاوەتی، لە پێشدا سڵاوکردن، ڕق‌خواردنەوە و خۆڕاگرتن و بەخشینی خەڵك.

## ئابڕووی ئیسلام بەمانە دەچێ:

بە گەمە و گاڵتەی بێ‌جێ و گۆرانی و ئاهەنگ[1]، دەغەڵی و گەندەڵکاری، درۆ، غەیبەت، ئێرەیی، چەکلی و دەس‌وشکی، ستەم، فڕوفێڵ، فیتنەیی، بەین تێکدان، ڕەحم و خزم لێك‌کردن، بەد ئەخلاقی، دەمار زلی، بە خۆدا نازین، خۆ بە زل زانین، دەست درێژی، دەم شڕی، زمان پیسی، هەرزەکاری، خراپە، ڕق و قین، حەسادەت، شوومی و چاوپیسی، زوڵم و دژمنایەتی و دەست‌درێژی.

ئەنەسی کوڕی مالك رَضِيَ اللهُ عَنْهُ فەرموویەتی: هیچ ئامۆژگارییەکی چاك نەماوە پێغەمبەر نەیکا بۆمان و فەرمانمان پێ نەدا بە کردنی، هەروەها هیچ فڕو فێڵ و عەیب و شتی خراپ نەماوە، کە نەیترساندبین لێی و بەری نەگرتبین. هەر ئەم ئایەتە بەسە بۆ ئەم کارە ﴿إِنَّ اللَّهَ يَأْمُرُ بِالْعَدْلِ وَ الْإِحْسَانِ... ﴾.[2]

## ڕوونکردنەوەی هەندێك لە ڕەوشت و ئاکاری پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:

کە هەندێ لە زانایان کۆیان کردۆتەوە و لە حەدیس و ڕیوایەتەکاندا دەسچنیان کردووە: فەرموویانە: پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بەتاقەتترین و عادڵترین و پاکترین ئینسان بوو، قەت دەستی لە دەستی ژنێك نەکەوتووە مەگەر ئەو ژنە جارییەی، یان خێزانی، یان مەحرەمی بووە.[3]

---

١. بە پێی بابەتی هەژدەهەم، لێرەدا مەبەست گۆرانی و ئاهەنگی ناشەرعییە ـ وەرگێڕ.

٢. النحل: ٩٠.

٣. «وَاللهِ مَا مَسَّتْ يَدُهُ يَدَ امْرَأَةٍ...» بخاری: ٢٥١٢ ـ ٤٥١٢، احمد: ٢٤٠٤٢ و زاد: «...إِلَّا امْرَأَةً يَمْلِكُهَا».

پێغەمبەرﷺ سەخیترین ئینسان بووە، تاقە دیرهەم و دینارێك بەلایەوە شەوی نەکردۆتەوە، ئەگەر زیاد لە خەرجی خۆی هەبوایە و کەسی دەست نەکەوتایە پێی بدا، ئەوە نەئەڕۆیشتە ماڵەوە تا تەگبیری بۆ بکردایە کە بیگەیاندایەتە دەستی کەسێك کە نیازی پێی هەیە، لەو شتانەی کە دەستی ئەکەوت تەنها بەشی بژیوی ئەو ساڵەی لێ دائەنا ئەویش لە سادەترین شتانێ کە لەوێ دەستی ئەکەوت، وەکوو خورما و جۆ. پاشماوەکەشی لە ڕێی خوا ئەبەخشی. هەرشتێکی لێ داوا بکرایە دەیبەخشی، پاشان دەچووەوە سەربژیوی ماڵەکەی و هێندەش لەوە دەیبەخشی کە پێش ئەوەی ساڵ بە سەر بچێ، خۆی نیازمەند ئەبوو، ئەگەریش لەو ماوەدا شتێکیان بۆ نەهێنایە تاقەتی دەگرت.[1]

پێغەمبەرﷺ پێڵاوی دەدوورا، کەوشی پینە دەکرد، لەکاری ناوماڵدا یارمەتی خێزانەکانی دەدا؛ گۆشتی لەگەڵیان لەت دەکرد و...[2]

پێغەمبەرﷺ زۆر بە حەیا بوو، چاوی نەئەخستە ناوچاوی کەس، وڵامی کۆیلە و ئازادی وەك یەك دەداوە.[3]

پێغەمبەرﷺ دیاری وەردەگرت، هەرچەندەش کاسەیێ شیر یا لاقە کەروێشکێ

---

١. «كَانَ النَّبِيُّ ﷺ أَحْسَنَ النَّاسِ وَ أَشْجَعَ النَّاسِ وَ أَجْوَدَ النَّاسِ ...». بخاری: ٢٦٠٨ ـ ٥٥٧٣، مسلم: ٤٢٦٦، ترمذی: ١٦١٠، ابن‌ماجه: ٢٧٦٢، احمد: ١٢٠٣٧.

«... وَ رَسُولُ اللّٰهِ ﷺ أَبَرُّ النَّاسِ وَ أَوْصَلُ وَ أَحْلَمُ النَّاسِ ...» حاكم فی المستدرك: ٦١٣٠.

«كَانَ رَسُولُ اللّٰهِ ﷺ أَجْوَدَ النَّاسِ ...» بخاری: ٥ ـ ٤٦١٣، مسلم: ٤٢٦٨ ـ ٤٢٦٦، ترمذی: ٣٥٧١، نسائی: ٢٠٦٨، ابن‌ماجه: ٢٧٦٢، احمد: ٢٤٨٥ ـ ٣٢٥٠.

«... ذَكَرْتُ شَيْئاً مِنْ تِبْرٍ عِنْدَنَا فَكَرِهْتُ أَنْ يُمْسِيَ أَوْ يَبِيتَ عِنْدَنَا فَأَمَرْتُ بِقِسْمَتِهِ» بخاری: ١١٤٥، ابوداود: ٢٦٥٦، نسائی: ١٣٤٨، احمد: ١٥٥٦٥.

«مَا سُئِلَ النَّبِيُّ ﷺ عَنْ شَيْءٍ قَطُّ فَقَالَ لَا» بخاری: ٥٥٧٤، مسلم: ٤٢٧٤، احمد: ١٣٧٧٥.

٢. «كَانَ رَسُولُ اللّٰهِ ﷺ يَخْصِفُ نَعْلَهُ وَ يَخِيطُ ثَوْبَهُ وَ يَعْمَلُ فِي بَيْتِهِ ...» احمد: ٢٤١٧٦، بخاری: ٦٣٥ـ ٥٥٧٩، ترمذی: ٢٤١٣، احمد: ٢٣٠٩٣ بلفظ: «كَانَ فِي مِهْنَةِ أَهْلِهِ ...».

«قَالَ عَائِشَةُ رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهَا أَرْسَلَ إِلَيْنَا آلُ أَبِي بَكْرٍ بِقَائِمَةِ شَاةٍ فَأَمْسَكْتُ وَ قَطَعَ رَسُولُ اللّٰهِ ﷺ ...» احمد: ٢٣٤٩٠، و فی روایة: «... فَأَمَرَ النَّبِيُّ ﷺ بِسَوَادِ الْبَطْنِ يُشْوِي ...» بخاری: ٢٤٢٥ ـ ٤٩٦٣، مسلم: ٣٨٣٢، احمد: ١٦١٠.

٣. «كَانَ النَّبِيُّ ﷺ أَشَدَّ حَيَاءً مِنَ الْعَذْرَاءِ فِي خِدْرِهَا» بخاری: ٣٢٩٨ ـ ٥٦٣٧، مسلم: ٤٢٨٤، ابن‌ماجه: ٤١٧٠، احمد: ١١٢٥٨.

بوایە، بەو ئەندازەش قنیاتی دەکرد و دەیخوارد.[1] بەڵام زەکات و ئیحسانی نەدەخوارد.[2] هەموو کات دەچووە داوەتی کەنیز و هەژار و نەداران و بەلاشیەوە عار نەبوو[3].

مەعازرَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ فەرموویەتی: پێغەمبەرصَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ئامۆژگاریی دەکردم و دەیفەرموو:

«يا مَعاذُ أُوصِيكَ بِاتِّقاءِ اللهِ وَ حُسْنِ الْحَدِيثِ، وَالْوَفاءِ بِالْعَهْدِ،[4] وَ أَداءِ الْأَمانَةِ، وَ تَرْكِ الْخِيانَةِ، وَ حِفْظِ الْجارِ، و رَحْمَةِ الْيَتِيمِ، وَلِينِ الْكَلامِ، وَ بَذْءِ السَّلامِ وَ حُسْنِ الْعَمَلِ و قَصْرِ الْأَمَلِ وَ لُزُومِ الْإِيمانِ، والتَّفَقُّهِ فِي الْقُرْآنِ، و حُبِّ الْآخِرَةِ، وَ الْجَزَعِ مِنَ الْحِسابِ، وَ خَفْضِ الْجَناحِ وَ أَنْهاكَ أَنْ تَسُبَّ حَكِيماً، أَوْ تكَذِّبَ صادِقاً، أَوْ تُطِيعَ آثِماً، أَوْ تُعْصِي إِماماً عادِلاً، أَوْ تفْسِدَ أَرْضاً، وَ أُوصِيكَ بِتَقْوَى اللهِ عِنْدَ كُلِّ حَجَرٍ و شَجَرٍ و مَدَرٍ وَ أَنْ تُحَدِّثَ لِكُلِّ ذَنْبٍ تَوْبَةً، السِّرَّ بِالسِّرِّ وَالْعَلانِيَّةَ بِالْعَلانِيَّةِ»[5].

واتە: «ئەی مەعاز! ئامۆژگاریت دەکەم: بە تەقوا و ترسی خوا، قسەی خۆش و لەبار، وەفا بە پەیمان و بەڵێن، دانەوەی ئەمانەت، تەرکی خیانەت، پاراستنی هاوسێ، بەزەیی لەگەڵ هەتیو، قسەی نەرم، دەس پێش‌خەری لە سڵامدا، کار و ئیشی چاك، کەم‌کردنەوەی ئاوات و ئارەزوو، پابەندبوون بە ئیمانەوە، داچوون و وردبوونەوە لە قورئان، خۆش‌ویستنی دواڕۆژ، ترس و دڵەڕاوکێ لە حیساب و لێپرسینەوە، مل‌کەچی و بێ‌دەماری. نەهیت ئەکەم لەوەی دژوێن و خراپە بە حەکیم و زانا بڵێی، یان ڕاست‌وێژێ وەدرۆ بخەیتەوە، یان بەگوێی

---

١. «كانَ رَسُولُ اللهِصَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقْبَلُ الْهَدِيَّةَ وَ يُثِيبُ عَلَيْها» بخاری: ٢٣٩٦، ابوداود: ٣٠٦٩، ترمذی: ١٨٧٦، احمد: ٢٣٤٥٠. عَنْ أُمِّ الْفَضْلِرَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا «...أَنَّها أَرْسَلَتْ إِلَى النَّبِيِّصَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِقَدَحِ لَبَنٍ ... فَأَخَذَ بِيَدِهِ فَشَرِبَهُ» بخاری: ١٨٥٢ ـ ٥١٨٧، مسلم: ١٨٩٤، احمد: ١٧٧٣. و فی روایة: عَنْ أَنَسٍرَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ «أَنْفَجْنا أَرْنَبا بِمَرِّ الظَّهْرانِ ... وَ بَعَثَ بِها إِلَى رَسُولِ اللهِصَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِوَرِكِها أَوْ فَخِذَيْها فَقَبِلَهُ و أَكَلَ مِنْهُ» بخاری: ٢٣٨٤ ـ ٥٠٦٦، مسلم: ٣٦١١، نسائی: ٤٢٣٨، احمد: ١٢٢٨٦.

٢. «وَلا يَقْبَلُ الصَّدَقَةَ» احمد: ٨٣٥٧ و فی روایة: «وَلا يَأْكُلُ الصَّدَقَةَ» ابوداود: ٣٩١٢.

٣. «كانَ رَسُولُ اللهِصَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَعُودُ الْمَرِيضَ وَيَشْهَدُ الْجَنازَةَ وَيَرْكَبُ الْحِمارَ وَيُجِيبُ دَعْوَةَ الْعَبْدِ ...» ترمذی: ٩٣٨، و فی روایة: «...يُجِيبُ دَعْوَةَ الْمَمْلُوكِ» ابن‌ماجه: ٢٢٨٧ ـ ٤١٦٨. و قالصَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: «لَوْ دُعِيتُ إِلَى كُراعٍ لَأَجَبْتُ» بخاری:٤٧٨٠، احمد:٩١٢١.

نسائی: ١٣٩٧، طبرانی فی الکبیر: ١٣٧٧، بیهقی فی شعب الإیمان: ٧٧٦١ بلفظ: «...وَلا يَأْنَفُ أَنْ يَمْشِيَ مَعَ الْأَرْمِلَةِ وَالْمِسْكِينِ فَيَقْضِيَ حاجَتَهُ».

٤. ابن‌حبان فی صحیحه: ٣٩٥.

٥. بیهقی فی الزّهد الکبیر: ٩٦٦ بعبارة أخرى.

گوناحکاریێ بکەی، یان نافەرمانی ئیمام و پێشەوای دادوەر بکەی، یان شوێنێ بە فەساددا بکێشی. بەوە ئامۆژگاریت دەکەم کە لەلای هەر دار و بەرد و کلۆییێکەوە ترسی خوات بێ و بۆ هەر گوناحێکت تەوبەیێ بکە، نهێنی بە نهێنی و ئاشکرا بە ئاشکرا».

ئاوەهایە ئاداب و ڕەوشتی بەندەکانی خواو بانگهێشتکردنیان بۆ ئاکاری جوان و ڕەفتاری لەبار.

پێغەمبەرﷺ لەبەر خوا توورە دەبوو و قەت لەبەر خۆی توورە نەدەبوو.[1]

پێغەمبەری خواﷺ لەبر برسیەتی بەردی دەبەست بە سکیەوە[2]، هەرچی ئامادە بوایە لەوەیە دەخوارد[3]، هەرچی دەست کەوتبا ڕەتی نەئەکردەوە، قەت لە خواردنی نانی حەلاڵ خۆی لانەدەدا. هەرچی بۆی دەس بدایە لەبەری دەکرد، جارێ عەبا[4]، جارێ بوردی یەمانی[5]، جارێ جبەی لە خوری چنراو[6]، هەرچی موباحی دەست بکەوتایە دەیپۆشی[7]. ئەنگوستیلەی زیوی لە ئەنگوستی ناوەڕاستی دەستی ڕاستی دەکرد[8] و هەندێ جاریش لە دەستی چەپی دەکرد[9].

---

١. ترمذی فی الشمائل المحمّدیّة: ٢٢٣، طبرانی فی الکبیر: ١٧٨٦٧، بیهقی فی شعب الإیمان: ١٣٦٢.

٢. «... عَصَّبَ بَطْنَهُ بِعِصابَةٍ.... مِنَ الْجُوعِ» مسلم: ٣٨٠٢، احمد: ١٠٩٧٤، «... قَدْ شَدَّ عَلَىٰ بَطْنِهِ حَجَراً» و فی روایة: «... حَتّىٰ رَبَطَ النَّبِيُّ ﷺ عَلَىٰ بَطْنِهِ حَجَراً مِنَ الْجُوعِ» احمد: ١٣٧٠٤ ـ ١٣٦٩٥.

٣. نسائی: ٢٢٨٩، طبرانی فی الأوسط: ٧٥٧٥، بیهقی فی معرفة السنن والآثار: ٢٥٧٣. و فی روایة: «ما عابَ النَّبِيُّ ﷺ قَطُّ إِنِ اشْتَهاهُ أَكَلَهُ وَ إِلّا تَرَكَهُ» بخاری: ٣٢٩٩ ـ ٤٩٨٩، مسلم: ٣٨٤٤، ابوداود: ٣٢٧١، ترمذی: ١٩٥٤، ابن‌ماجه: ٣٢٥٠، احمد: ٩٧٥٧.

٤. بخاری: ٥٣٦٣ بلفظ: «جاءَتْ إِمْرَأَةٌ بِبُرْدَةٍ... هِيَ الشَّمْلَةُ مَنْسُوجٌ...»، و فی روایة: «وَ عَلَيْهِ قَباءٌ...» بخاری: ٢٤٠٩، مسلم: ١٧٥٠، ابوداود: ٣٥١٠، ترمذی: ٢٧٤٣، نسائی: ٥٢٢٩، احمد: ١٨١٦٥. و فی روایة: «... وَ عَلَيْهِ رِداءٌ نَجْرانِيٌّ...» مسلم: ١٧٤٩، ابن‌ماجه: ٣٥٤٣، احمد: ١٢٨٦٠.

٥. بخاری: ٥٣٦٥ بلفظ: «كانَ أَحَبَّ الثِّيابِ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ أَنْ يَلْبَسَها الْحِبَرَةُ».

٦. بخاری: ٥٣٥٣، مسلم: ٤٠٨، ابوداود: ١٣٠، ابن‌ماجه: ٤٦١، احمد: ١٧٤٨٦ جمیعهم بلفظ: «... وَ عَلَيْهِ جُبَّةٌ مِنْ صُوفٍ...».

٧. ابن‌ماجه: ٣٥٦٧ بلفظ: «يَلْبَسُ قَمِيصاً قَصِيرَ الْيَدَيْنِ وَالطُّولِ».

٨. «كانَ يَلْبَسُ خاتَماً مِنْ فِضَّةٍ...» بخاری: ٥٤١٨، مالك فی الموطأ: ١٤٦٨، احمد: ٥١٥٠. و فی روایة: «كانَ يَتَخَتَّمُ فِي يَمِينِهِ» ابوداود: ٣٦٩٠، ترمذی: ١٦٦٤، نسائی: ٥١٠٢، ابن‌ماجه: ٣٦٣٧، احمد: ١٦٥٥. و فی روایة: «... لَأَرَىٰ بَرِيقَهُ فِي خِنْصَرِهِ» بخاری: ٥٤٢٥.

٩. ابوداود: ٣٦٩١، بیهقی فی شعب الإیمان: ٥٩٤٦ بلفظ: «كانَ يَتَخَتَّمُ فِي يَسارِهِ».

عەبد یان هەرکەسێ‌تریشی، لە پشتی خۆیەوە سـوار دەکرد[١]، جار وابوو بە ئەسپ ئەڕۆیشت[٢]، جار وا بوو بە چارەوێی بۆر[٣]، جارێ بە وڵاخ،[٤] جارێ بە پێ،[٥] جارێ بە پێ‌پەتی بە بێ عابا و مێزەر و کڵاو[٦].

پێغەمبەرﷺ لە دوورترین شوێنی شار، سەردانی نەخۆشی دەکرد[٧]، خۆشی لە بۆنی خۆش دەهات و بۆنی پیسی بەلاوە ناحەز بوو[٨]، لەگەڵ هەژار و فەقیران دادەنیشت و لەگەڵیاندا نانی دەخوارد[٩]، ڕێزی پیاوماقووڵانی دەگرت و لەگەڵ پیاوە گەورەکاندا بەچاکی پێوەندی پێیانەوە دەگرت[١٠]. سەری خزم و کەسی دەدا، بە بێ ئەوەی فەزڵیان بدا بە سەر

١. بخاری: ١٤٤٣ ـ ١٥٧٤ بلفظ: «أَنَّ أُسامَةَ بْنَ زَيْدٍ رضي الله عنهما كانَ رِدْفَ النَّبِيِّ ﷺ ثُمَّ أَرْدَفَ الْفَضْلَ مِنَ الْمُزْدَلِفَةِ ...» ابوداود: ١٦٤٠، احمد: ١٧٢٣ ـ ١٧٣٤. و فی روایة: قالَ مُعاذ رضي الله عنه: «كُنْتُ رِدْفَ النَّبِيِّ ﷺ عَلَىٰ حِمارٍ» بخاری: ٢٦٤٤، احمد: ٢١٠٤٦.

٢. «... فَرَكِبَ النَّبِيُّ ﷺ فَرَساً لِأَبِي طَلْحَةَ» بخاری: ٢٧٤٦ ـ ٢٧٤٧، مسلم: ٤٢٦٦ ـ ٤٢٦٧، ابوداود: ٥١٠، ترمذی: ١٦٠٨، نسائی: ٨٢٣، احمد: ١٢٢٠٢. و فی روایة: «كانَ لِلنَّبِيِّ ﷺ فَرَساً يُقالُ لَهُ اللُّحَيْفُ» بخاری: ٢٦٤٣.

٣. «... رَأَيْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ عَلَىٰ بَغْلَتِهِ الْبَيْضاءِ» بخاری: ٣٩٧٥ ـ ٢٧١٣، مسلم: ٣٣٢٥ ـ ٣٣٢٧، احمد: ١٧٧٤٥.

٤. و فی روایة: «... رَكِبَ عَلَىٰ حِمارٍ عَلَىٰ إِكافٍ ...» بخاری: ٢٧٦٥ ـ ٤٢٠٠، مسلم: ٤٤، ابوداود: ٢١٩٦ ـ ١٠٣٧ بلفظ: «رَأَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ يُصَلِّي عَلَىٰ حِمارٍ»، ترمذی: ٩٣٨، نسائی: ٧٣٢ ـ ٧٣٣، ابن‌ماجه: ٤١٦٨، احمد: ٤٢٩١. و فی روایة: «طافَ النَّبِيُّ ﷺ فِي حَجَّةِ الْوَداعِ عَلَىٰ بَعِيرٍ ...» بخاری: ١٥٠٤، مسلم: ٢٢٢٣، ابوداود: ١٦٠١، نسائی: ٧٠٦.

٥. «... كانَ يَأْتِي راكِباً وَ ماشِياً» مالك فی الموطأ: ٣٦٢، مسلم: ٢٤٨٠، نسائی: ٦٩١، احمد: ٤٦١٤.

٦. مسلم: ١٥٣٣ بلفظ: «... نَحْنُ بِضْعَةَ عَشَرَ ما عَلَيْنا نِعالٌ وَلا خِفافٌ وَلا قَلانِسُ وَلا قُمُصٌ نَمْشِي ...».

٧. مسلم: ١٥٣٣ بلفظ: «... يا أَخا الْأَنْصارِ كَيْفَ أَخِي سَعْدُ بْنُ عُبادَةَ؟ فَقالَ: صالِحٌ، فَقالَ ﷺ: مَنْ يَعُودُهُ مِنْكُمْ؟ فَقامَ وَ قُمْنا مَعَهُ وَ نَحْنُ بِضْعَةَ عَشَرَ ما عَلَيْنا نِعالٌ ...».

٨. «عَنْ عائِشَةَ رضي الله عنها صَنَعْتُ لِرَسُولِ اللهِ ﷺ بُرْدَةً سَوْداءَ فَلَبِسَها فَلَمّا عَرِقَ فِيها وَجَدَ رِيحَ الصُّوفِ فَقَذَفَها ... وَ كانَ يُعْجِبُهُ الرِّيحُ الطَّيِّبَةُ ...» ابوداود: ٣٥٥٢، احمد: ٢٣٩٦٤، و فی روایة: «... يُحِبُّ الرِّيحَ الطَّيِّبَةَ ...» احمد: ٢٣٨٥٤.

٩. «... فَجَلَسَ رَسُولُ اللهِ ﷺ وَسْطَنا لِيَعْدِلَ بِنَفْسِهِ ...» ابوداود: ٣١٨١. «وَ قالَ أَبُوهُرَيْرَةَ رضي الله عنه: كانَ النَّبِيُّ ﷺ يَجْلِسُ مَعَنا فِي الْمَجْلِسِ ...» ابوداود: ٤١٤٥. «... وَ أَهْلُ الصُّفَّةِ أَضْيافُ الْإِسْلامِ ... وَ أَشْرَكَهُمْ فِيها ... فَشَرِبَ مِنَ الْفَضْلَةِ» بخاری: ٥٩٧١، احمد: ١٠٢٦٣، ترمذی: ٢٤٠١.

١٠. «... وَ يُكْرِمُ كَرِيمَ كُلِّ قَوْمٍ ...» ترمذی فی الشمائل المحمدیة: ٣٢٩ ـ ٣٣٠ و فی روایة: «... إِذا جاءَكُمْ كَرِيمُ قَوْمٍ فَأَكْرِمُوهُ ...» بیهقی فی سنن الکبری: ١٦٨/٨، طبرانی فی الکبیر: ٢٢١٧، أبی‌نعیم الأصبهانی فی معرفة الصحابة: ١٥٧١.

ئەوانەی وا گەورەتر بوون[1]. زوڵم و ستەمی لەکەس نەدەکرد[2]، عوزری لە هەرکەسێ کە عوزری بۆی بهێنایێتەوە قەبووڵ دەکرد[3]، سوحبەت و شۆخی دەکرد، بەڵام جگە ڕاستی چی‌تری نەدەگوت[4]، بە بێ‌ئەوەی دەنگ بەرز بکاتەوە پێ دەکەنی[5]، گەمەی موباحی بدیبا سەیری دەکرد و پێی ناخۆش نەبوو[6] لەگەڵ خێزانی خۆی یاری و گاڵتەی دەکرد[7]. هەم کۆیلەی پیاوی بوو هەم ژن، لەگەڵیاندا نانی دەخوارد و خۆی لەسەر سفرە و شوێنی دانیشتن جیا نەئەکردەوە.[8]

ئەو پێغەمبەرێکی نەخوێندەوار بوو، نەدەیزانی نە بنووسێ، وە نە بخوێنێتەوە، لەناو جەرگەی نەزانیدا بوو، لە نێو بیابان و لە هەژاری و لە شوانیدا گەورە بووبوو.

هەتیوی بێ‌داك و بێ‌باب بوو، پاشان خوای گەورە هەرچی ڕەفتار و ئاکاری جوان بوو، وە هەرچی ڕەوشتی باش و هەرچی چیرۆك و داستانی سەرەتا و دوایی دنیا و هەرچی کە سەربەرزی و ڕزگاری و سەرکەوتوویی دوارۆژی تێدا بوو، پێی فێر کردبوو.

لە خوا دەپاڕێینەوە کە یارمەتیمان بدا بۆ تاعەت و عیبادەتی خۆی و ڕەوشت و ئاکاری پێغەمبەرﷺ ببێتە ڕەوشت و ڕێبازمان، ئامین.

---

١. «كَانَ كُلَّ يَجُلُ الْعَبَّاسَ إِجْلالَ الْوَلَدِ ...» حاكم فى المستدرك: ٥٤١٩. «أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ أَمَرَ بِسَدِّ الْأَبْوابِ إِلَّا بابَ أَبِي بَكْرٍ» بخارى: ٤٤٦ ـ ٣٣٨١، ترمذى: ٣٦١١، احمد: ١٠٧١٠.

٢. بخارى: ٥٥٧٢ ـ ٥٥٩٤ ـ ٥٦٦٦، ابوداود: ٤١٦٠، احمد: ٢٢٩٧٧ و فيه: «بِئْسَ أَخُوا الْعَشِيرَةِ ... إِنَّ شَرَّ النَّاسِ عِنْدَ اللهِ يَوْمَ الْقِيامَةِ مَنْ تَرَكَهُ النَّاسُ اتِّقاءَ شَرِّهِ» و فى رواية: «إِنَّ اللهَ لا يُحِبُّ الْفاحِشَ الْمُتَفَحِّشَ».

٣. بخارى: ٤٠٦٦، مسلم: ٤٩٧٣، نسائى: ٧٢٣، احمد: ١٥٢١١ فى قصّة الثّلاثة الّذين خلفوا.

٤. ترمذى: ١٩١٣، احمد: ٨٣٦٦ و فيه: «إِنَّكَ تُداعِبُنا قالَ: إِنِّي لا أَقُولُ إِلَّا حَقًّا».

٥. «... إِنَّما كانَ يَتَبَسَّمُ ...» بخارى: ٤٤٥٤، مسلم: ١٤٩٧، ابوداود: ٤٤٣٤ و فى رواية: «... جُلُّ ضَحِكِهِ التَّبَسُّمُ ...» طبرانى فى الكبير: ١٧٨٦٧، ترمذى فى الشّمائل المحمّديّة: ٢٢٣، بيهقى فى شعب الإيمان: ١٣٦٢.

٦. يدل على هذا حديث لعب الحبشة بين يديه فى المسجد و قال لهم: «... دُونَكُمْ يا بَنِي أَرْفِدَةَ ...» بخارى: ٨٩٧، مسلم: ١٤٨٢.

٧. من حديث عائشة: «... سابَقَنِي النَّبِيُّ ﷺ فَسَبَقْتُهُ» ابن‌ماجه: ١٩٦٣، ابوداود: ٢٢١٤، احمد: ٢٢٩٨٩.

٨. بخارى: ٢٣٥٩، مسلم: ٣١٣٩ ـ ٥٣٢٨، ابن‌ماجه: ٣٦٨٠، احمد: ٧١ ـ ١٥٨١٣ بروايات مختلفة منها: «... أَطْعِمُوهُمْ مِمَّا تَأْكُلُونَ وَ اكْسُوهُمْ مِمَّا تَلْبَسُونَ ...» و منها: «... أَكْرِمُوهُمْ كَرامَةَ أَوْلادِكُمْ ...»، و منها: «إِنَّ إِخْوانَكُمْ خَوَلُكُمْ جَعَلَهُمُ اللهُ تَحْتَ أَيْدِكُمْ ...».

**بەشێتر لە ڕەوشتەکانی پێغەمبەرﷺ:**

زانایان گوتوویانە: پێغەمبەرﷺ قەت دژوێنی بە کەس نەداوە، ئەگەریش دابێتی کەفارەتی داوە و ڕەحمەتی بۆ ناردووە[1]، هەروەها قەت نفرینی ژنی نەکردووە، نە خێزانی خۆی، نە ئەوانەی خزمەتکاری بوون،[2] جارێك لە غەزادا پێیان گوت: ئەی پێغەمبەری خوا! خۆزگە نفرینی دوژمنانت بکردای ئەویش فەرمووی: «إِنَّما بُعِثْتُ رَحْمَةً وَ لَمْ أُبْعَثْ لَعّاناً»[3]. واتە: «ئەمن بۆ ڕەحمەت و بەزەیی نێردراوم، نەك بۆ لەعنەت و نفرینکردن».

ئەنەسی کوڕی مالك رضي الله عنه فەرموویەتی: سوێند بەو خوایەی کە پێغەمبەری بە حەق و ڕاستی ڕەوانە کردووە، قەت لەو شتانەی کە پێی ناخۆش بووە، پێی نەگوتووم: بۆچی واتە کردووە؟ خێزانەکانیشی هەرکاتێ سەرزەنشی منیان دەکرد، دەیفەرموو: لێیگەڕێن قەزاو قەدەری خوا وابووە.[4]

زانایان گوتوویانە: لەنێوان دوو شتی چاکدا هەمیشە ئاسانەکەیانی هەڵدەبژارد، مەگەر ئەوەی کە گوناح، یان پچڕانی ڕەحمی تێدا بووایە، ئیدی لە هەمووکەس زیاتر لەو وەختەدا خۆی دەپاراست[5].

هەرکەسێ چ کۆیلە، چ ئازاد چ ژن، چ پیاو ڕووی لێ بخستای یارمەتی دەدا[6].

---

١. «...فَأَيُّ الْمُؤْمِنِينَ أَذَيْتُهُ شَتَمْتُهُ لَعَنْتُهُ جَلَدْتُهُ فَاجْعَلْها لَهُ صَلاةً وَ زَكاةً وَ قُرْبَةً» مسلم: ٤٧٠٧ ـ ٤٧٠٦، احمد: ٧٨٥٢ ـ ١٠٨٦٠ ـ ٨٧٠٩ و فی روایة: «اللّهُمَّ فَأَيُّما مُؤْمِنٍ سَبَبْتُهُ ...» بخاری: ٥٨٨٤.

٢. «لَمْ يَكُنِ النَّبِيُّ سَبّاباً وَلا فَحّاشاً وَلا لَعّاناً...» بخاری: ٥٥٧١، احمد: ١١٨٢٦ ـ ١٢١٤٨. و فی روایة: «ما ضَرَبَ رَسُولُ اللّهِ ﷺ خادِماً لَهُ قَطُّ وَلاَ امْرَأَةً لَهُ قَطُّ وَلا ضَرَبَ بِيَدِهِ...» احمد: ٢٢٩٠٦، مسلم: ٤٢٩٦، ابوداود: ٤١٥٤.

٣. مسلم: ٤٧٠٤.

٤. ترمذی: ١٩٣٨، احمد: ١٣٢٩٦ بلفظ: «خَدَمْتُ النَّبِيَّ ﷺ عَشْرَ سِنِينَ فَما قالَ لِي أُفٍّ قَطُّ، وَ ما قالَ لِشَيْءٍ لِمَ صَنَعْتَهُ؟ وَلا لِشَيْءٍ تَرَكْتُهُ لِمَ تَرَكْتَهُ؟» و فی روایة: «فَلَوْ لامَنِي أَحَدٌ مِنْ أَهْلِ بَيْتِهِ إِلّا قالَ: دَعُوهُ...» احمد: ١٢٩٣٨.

٥. «...ما خُيِّرَ رَسُولُ اللّهِ ﷺ بَيْنَ أَمْرَيْنِ قَطُّ إِلّا أَخَذَ أَيْسَرَهُما...» مالك فی الموطأ: ١٤٠١، بخاری: ٣٢٩٦ ـ ٥٦٦١، مسلم: ٤٢٩٤ ـ ٤٢٩٥، ابوداود: ٤١٥٣، احمد: ٢٢٩٠٦ ـ ٢٣٦٨٦.

٦. «...وَلا يَأْنَفُ أَنْ يَمْشِيَ مَعَ الْأَرْمِلَةِ وَالْمِسْكِينِ فَيَقْضِيَ لَهُ الْحاجَةَ» نسائی: ١٣٩٧. وفی روایة: «...إِنْ كانَتِ الْأَمَةُ مِنْ أَهْلِ الْمَدِينَةِ لَتَأْخُذُ بِيَدِ رَسُولِ اللّهِ ﷺ فَتَنْطَلِقُ بِهِ فِي حاجَتِها» احمد: ١١٥٠٣، ابن‌ماجه: ٤١٦٧، بخاری: ٥٦١٠.

خوای گەورە پێش ئەوەی ڕەوانەی بکات لە سەتری ئەووەڵی تەوراتدا لەبارەیەوە فەرموویەتی: موحەممەد ڕاسپاردەی خوایە، بەندەی منە، هەڵمبژاردووە، دڵڕەق و غەرەزن نییە، لەنێو گەڕەك و بازاڕدا دەمەقرە ناکات، خراپە بە خراپە وڵام ناداتەوە، بەڵکوو لە خەڵك خۆش دەبێ و خاوەن بەزەییە، لە مەککەدا لە دایك ئەبێ، بۆ تەیبە (مەدینە) کۆچ دەکا، شام دەبێتە مڵکی، ئیزار دەپۆشێ، خۆی و ئەوانەی هەن بە دەورو بەریدا بە پێی قورئان و زانست دەجووڵێنەوە، جەستە و ئەندامەکانی دەشوات. لە ئینجیلشدا هەر بەم شێوە باس و تاریفی کراوە.[1]

عادەتی پێغەمبەرﷺ وابوو کە بە هەرکەس بگەشتبا لە پێشدا سەلامی دەکرد[2]، هەرکەس بۆ کارێك ڕای بگرتایە، تاقەتی دەگرت تا ئەو کەسە خۆی ئەمی بەجێ ئەهێشت، هەرکەس دەستی بگرتایە دەستی بەرنەئەدا مەگەر ئەو کەسە خۆی دەستی ئەمی بەربدایە[3].

پێغەمبەرﷺ بە هەرکەسێ لە دۆستانی بگەیشتبا، لە پێش ئەودا تەوقە و دەست و مشتاقی دەست پێ‌دەکرد[4]، پاشان دەستی دەگرت و لە باوەشی دەگرت و دەیگوشی و بە خۆیەوە دەیلکاند[5].

لەکاتی هەستان و دانیشتندا زیکر و یادی خوای دەکرد[6]، لەکاتی نوێژ خوێندندا هەرکەس بهاتبا بۆلای، نوێژەکەی کورت دەکردەوە و ڕووی لێ دەکرد و دەیفەرموو: ئیشت هەیە؟ جا هەرکاتێ نیازی ئەو کەسەی بەجێ بهێنایە، دەگەڕاوە سەر نوێژەکەی[7]. زۆربەی کاتیش ڕوو لە قیبلە دادەنیشت.[8]

---

١. دارمی فی سننه: ٧ ـ ٥، حاکم فی المستدرك: ٤٢١١، طبرانی فی الکبیر: ٩٩٠٣، بیهقی فی دلائل النّبوّة: ٢٥٣٩.

٢. «...وَ يُبْدَ مَنْ لَقِيَهُ بِالسَّلامِ» و فی روایة: «...يَبْدُرُ مَنْ لَقِيَهُ...» بیهقی فی شعب الإیمان: ١٣٦٢، الآحاد والمثانی لأبی‌عاصم: ١١١٣، طبرانی فی أحادیث الطّوال: ٣٠.

٣. «...إِذٰا لَقِيَ الرَّجُلُ فَكَلَّمَهُ لَمْ يَصْرِفْ وَجْهَهُ... وَ إِذٰا صٰافَحَهُ لَمْ يَنْزِعْ يَدَهُ...» ابن‌ماجه: ٣٧٠٦، ترمذی: ٢٤١٤.

٤. «...مٰا لَقِيتُهُ قَطُّ إِلّا صٰافَحَنِي...» ابوداود: ٤٥٣٨، احمد: ٢٠٤٧١ ـ ٢٠٥٠٢.

٥. ابوداود: ٤٥٣٨، احمد: ٢٠٤٧٠ ـ ٢٠٥٠٢ بلفظ: «...فَالْتَزَمَنِي...».

٦. «كٰانَ رَسُولُ اللّٰهِﷺ لا يَقُومُ وَلا يَجْلِسُ إِلّا عَلَىٰ ذِكْرِ اللّٰهِ...» ترمذی فی الشّمائل المحمّدیّة: ٣٣١، طبرانی فی الکبیر: ١٧٨٦٨، بیهقی فی شعب الإیمان: ١٣٦٢.

٧. کشف الخفاء للعجلونی: ٢٠١٣.

٨. «كٰانَ رَسُولُ اللّٰهِﷺ إِذٰا جَلَسَ فِي الْمَجْلِسِ احْتَبَىٰ بِيَدَيْهِ» ترمذی فی الشّمائل المحمّدیة: ١٣٠، بیهقی فی السنن الکبری: ٢٣٦/٣، شرح السّنّة للبغوی: ٢١٩/٦. و فی روایة: «رَأَيْتُ رَسُولَ اللّٰهِﷺ بِفِنٰاءِ الْكَعْبَةِ مُحْتَبِياً بِيَدِهِ» بخاری: ٥٨٠١.

⇦

پێغەمبەرﷺ هەرکەسێ بهاتبا بۆلای ڕێزی دەگرت، تەنانەت هەندێ جار لیباسەکەی بەری خۆی ڕادەخست بۆ ئەو کەسەی کە هیچ پەیوەندییێك چ نەسەبی، چ شیری لە نێوانیاندا نەبوو، و لەسەری دایدەنیشاند[1].

پێغەمبەرﷺ هەرکەس بهاتبا بۆلای، سەرینی ژێر باڵی خۆی پێ دەدا، جا ئەگەر ئەو کەسە وەری نەگرتبا، بەزۆر دەینا ژێر باڵی.

پێغەمبەرﷺ هەرکاتێ لە شوێنی دانیشتنەکەی هەستابا، دەیفەرموو: «سُبْحٰانَكَ اللّٰهُمَّ، و بِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلّا أَنْتَ وَحْدَكَ، لا شَرِيكَ لَكَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَ أَتُوبُ إِلَيْكَ»[2] پاشان دەیگوت: «عَلَّمَنِيهُنَّ جِبْرِيلُ»[3] واتە: جوبرەئیل ئەمانەی فێر کردووم.

## شێوازی شۆخی و پێکەنینی پێغەمبەرﷺ:

پێغەمبەرﷺ قسەزانترین و قسەخۆشترین مرۆڤ بوو و دەیگوت: «ئەمن قسەزانترینی عەرەبم»[4] ئەهلی بەهەشت بە زمانی پێغەمبەرﷺ ئاخاوتن دەکەن[5].

پێغەمبەرﷺ بە وتەیێکی تەواو و پڕمانا قسەی دەکرد[6] بە بێ زیادی و کەم‌وکووڕی، قسەکانی یەك بە دوای یەك دەکرد[7]، لە ناو قسەکانیدا نێو بڕێکی دەکرد تا گوێگران لە

⇨

«كٰانَ رَسُولُ اللّٰهِﷺ يَجْلِسُ بَيْنَ ظَهْرانَيْ أَصْحٰابِهِ فَيَجِيءُ الْغَرِيبُ فَلا يَدْرِي أَيُّهُمْ هُوَ حَتَّىٰ يَسْأَلَ فَطَلَبْنٰا إِلَىٰ رَسُولِ اللّٰهِﷺ مَجْلِساً يَعْرِفُهُ الْغَرِيبُ ... فَبَنَيْنا لَهُ دُكّاناً ...» نسائى: ٤٩٠٥، ابوداود: ٤٠٧٦. ترمذى فى الشمائل المحمّديّة: ٣٣١، طبرانى فى الكبير: ١٧٨٦٨، بيهقى فى شعب الإيمان: ١٣٦٢.

١. «إِذٰا أَتٰاكُمْ كَرِيمُ قَوْمٍ فَأَكْرِمُوهُ» ابن‌ماجه: ٣٧٠٢، و فى رواية: «دَخَلَ جَرِيرُ بْنُ عَبْدِاللّٰهِ ... فَرَمٰاهُ رَسُولُ اللّٰهِﷺ بِبُرْدَتِهِ وَ قٰالَ: اِجْلِسْ عَلَيْهٰا ...» شعب الإيمان للبيهقى: ١٠٤٨٨، المستدرك للحاكم: ٧٩٠٠. و فى رواية: «... فَأَلْقَىٰ إِلَىٰ كِسٰائِهِ ...» طبرانى فى الكبير: ٢٢١٧، أبى‌نعيم الأصبهانى فى معرفة الصحابة: ١٥١٧.

٢. ابوداود: ٤٢١٧، ترمذى: ٣٣٥٥، نسائى: ١٣٢٧، احمد: ١٨٩٣٣.

٣. نسائى فى سنن الكبرى: ١٠٢٦١، ابن‌ابى‌شيبة فى مصنفه: ٤٩/٧.

٤. طبرانى فى الكبير: ٥٢٩٩، معرفة الصحابة لأبى‌نعيم الاصبهانى: ٢٨٠١ كلاهما بلفظ: «أَنٰا أَعْرَبُ الْعَرَبِ». و فى رواية: «قٰالَ أَبُوبَكْرٍ رضي الله عنه: مٰا رَأَيْتُ أَفْصَحَ مِنْكَ ...» كشف الخفاء للعجلونى: ٧٠/١، كنز العمال للهندى: ٣٢٠٢٤.

٥. طبرانى فى الكبير: ١١٢٧٨، حاكم فى المستدرك: ٧٠٩٩، بيهقى فى شعب الإيمان: ١٣٦٤ جميعهم بلفظ: «أَحِبُّوا الْعَرَبَ لِثَلاثٍ: لِأَنِّي عَرَبِيٌّ وَالْقُرْآنِ عَرَبِيٌّ وَ كَلامُ أَهْلِ الْجَنَّةِ عَرَبِيٌّ».

٦. «بُعِثْتُ بِجَوٰامِعِ الْكَلِمِ» بخارى: ٢٧٥٥، مسلم: ٨١٣، نسائى: ٣٠٣٧، احمد: ٧٢٦٩.

٧. ابوداود: ٤١٩٨ بلفظ: «كٰانَ فِي كَلامِ رَسُولِ اللّٰهِﷺ تَرْتِيلٌ أَوْ تَرْسِيلٌ».

قسەکەی حاڵی بن و لەبەری بکەن[١].

پێغەمبەرﷺ چ لە کاتی شادی، چ لە کاتی تووڕەییدا جگە لە حەق و ڕاستی نەبێ چیتری نەدەگوت[٢]. لە هەموو کەس دەم بە بزەتر و ئێسك سووکتر و بە کەیفتر بوو[٣]، مەگەر ئەو کاتانەی کە قورئان نازڵ بوایەتە سەری[٤]، یان بیری قیامەتی بکردایە[٥]، یان ئامۆژگاری و وتاری بدایە[٦].

ڕۆژێك عەرەبێکی دەشتەکی هات بۆ خزمەتی پێغەمبەرﷺ ئەویش حاڵی گۆڕابوو و سەحابەکان بەلایانەوە سەیر بوو، ئەو پیاوە ویستی پرسیاری لێ بکات، هەوالان گوتیان: ئەی فلانی! لێی گەڕێ، ئێمە دەزانین کە ڕەنگی گۆڕاوە، کابرا گوتی: سوێند بەو کەسەی کە ئەوی بە ڕاستی بە پێغەمبەرایەتی ناردووە، دەست هەڵگری نابم مەگەر پێبکەنێ.

گوتی: ئەی ڕاسپاردەی خوا! بیستوومانە کە لە کاتێکدا کە هەموو خەڵك لە برسیەتیدا خەریکە بمرن، دەججاڵی عالەمگیر تریت بۆ خەڵك ئەهێنێ، ئەرێ ئەی پێغەمبەری خوا! تۆ پێت وایە ئەمن دەست لەو تریتە بکێشم و خۆمی لێ بپارێزم تا بە لەڕ و لاوازی تێدا بچم؟ یان باشتر ئەوەیە لێی بخۆم تا تێر و تەسەل دەبم و هێز دەگرم، پاشان بە خوا ئیمان بهێنم و کفری دەججاڵ بکەم؟ ئەڵێن: پێغەمبەرﷺ هێندە پێکەنی تا ددانەکانی پێشی وەدەرکەوت.

---

١. ابوداود: ٤١٩٩ بلفظ: «مٰا کٰانَ رَسُولُ اللّٰهِﷺ يَسْرُدُ سَرْدَكُمْ... كٰانَ كَلامُ رَسُولِ اللّٰهِﷺ كَلاماً فَصْلاً يَفْهَمُهُ كُلُّ مَنْ سَمِعَهُ» و فی روایة: «كٰانَ يَتَكَلَّمُ بِكَلامٍ بَيْنَهُ فَصْلٌ يَحْفَظُهُ مَنْ جَلَسَ إِلَيْهِ» ترمذی: ٣٥٧٢، و احمد: ٢٥٠١٢ بلفظ: «يَحْفَظُهُ مَنْ سَمِعَهُ».

٢. ابوداود: ٣١٦١، بلفظ: «...فَوَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ مٰا يَخْرُجُ مِنْهُ إِلّا حَقٌّ»، و احمد: ٦٢٢١ بلفظ: «...مٰا خَرَجَ مِنِّي إِلّا حَقٌّ».

٣. «مٰا رَأَيْتُ أَحَداً أَكْثَرَ تَبَسُّماً مِنْ رَسُولِ اللّٰهِﷺ» ترمذی: ٣٥٧٤، احمد: ١٧٠٥٣. و روایة: «...مٰا رَآنِي إِلّا تَبَسَّمَ فِي وَجْهِي...» بخاری: ٢٨٠٩، مسلم: ٤٥٢٣، ترمذی: ٣٧٥٧، ابن‌ماجە: ١٥٥، احمد: ١٨٣٨٠، و فی روایة: «مٰا ضَحِكَ رَسُولُ اللّٰهِﷺ إِلّا تَبَسُّماً» ترمذی: ٣٥٧٥، احمد: ٢٠٠١٢. و فی روایة: «...وَ كٰانُوا يَتَحَدَّثُونَ فَيَأْخُذُونَ فِي أَمْرِ الْجٰاهِلِيَّةِ فَيَضْحَكُونَ وَ يَتَبَسَّمُﷺ» مسلم: ٤٢٨ ـ ١٠٧٤، احمد: ١٩٩٢٨.

٤. «...وَ كٰانَ النَّبِيُّﷺ إِذٰا نَزَلَ عَلَيْهِ الْوَحْيُ اشْتَدَّ ذٰلِكَ عَلَيْهِ...» احمد: ٤١٨٩، نسائی فی سنن الکبری: ٨٨٥٣.

٥. «...وَ كٰانَ إِذٰا ذَكَرَ السّٰاعَةَ احْمَرَّتْ وَجْنَتٰاهُ وَ عَلا صَوْتُهُ وَاشْتَدَّ غَضَبُهُ...» نسائی: ١٥٦٠، احمد: ١٤١٠٢.

٦. «كٰانَ رَسُولُ اللّٰهِﷺ يَخْطُبُنٰا... حَتّٰى نَعْرِفَ ذٰلِكَ مِنْ وَجْهِهِ وَ كَأَنَّهُ نَذِيرُ قَوْمٍ... لَمْ يَتَبَسَّمْ ضٰاحِكاً حَتّٰى يَرْتَفِعَ عَنْهُ» احمد: ١٣٦٠. و فی روایة: «كٰانَ رَسُولُ اللّٰهِﷺ إِذٰا خَطَبَ احْمَرَّتْ عَيْنٰاهُ...» مسلم: ١٤٣٥، ابن‌ماجە: ٤٤.

پاشان پێغەمبەرﷺ فەرمووی: نە بەڵکوو خوای گەورە هەر بەوەی موسڵمانەکان بێ‌نیاز دەکات تۆش بێ‌نیاز دەکات.

پێغەمبەرﷺ هەرکاتێ، کارێکی بۆ دەهاتە پێش، بەخوای دەسپارد و داوای ڕێنوێنی لە خوای گەورە دەکرد و دەیفەرموو:

«اَللّٰهُمَّ أَرِنِي الْحَقَّ حَقّاً فَأَتْبَعَهُ، وَأَرِنِي الْمُنْكَرَ مُنْكَراً وَارْزُقْنِي اجْتِنٰابَهُ، وَأَعِذْنِي مِنْ أَنْ يَشْتَبَهَ عَلَيَّ فَأَتَّبِعَ هَوٰايَ بَغَيْرِ هُدًى مِنْكَ وَاجْعَلْ هَوٰايَ تَبَعاً لِطٰاعَتِكَ، وَخُذْ رِضٰا نَفسِكَ مِنْ نَفْسِي فِي عٰافِيَةٍ وَاهْدِنِي لِمٰا اخْتُلِفَ فِيهِ مِنَ الْحَقِّ بِإِذْنِكَ، إِنَّكَ تَهْدِي مَنْ تَشٰاءُ إِلَىٰ صِرٰاطٍ مُسْتَقِيمٍ».[1]

واتە: «خوایا! ڕاستی و حەق، بە ڕاستی و حەق بخە بەرچاوم تا شوێنی بکەوم، هەروەها خراپەم بە خراپە پیشان بدە و دووری لێ‌کردنیشی بکە بە نەسیبم. پەنام بدە لەوەی کە لێم تێك بچن و شوێنی هەواو ئارەزووی خۆم بکەوم و بە بێ‌ئەوەی تۆ ڕێم پیشان بدەی. ئاوات و ئارەزووم بخە شوێن تاعەت و عیبادەتی خۆت، ڕەزایەت و دڵشادی خۆت بکە بە ڕەزایەت و شادی من. لەوەشدا وا کێشەی لەسەرە، بۆ حەققەکە ڕێنوێنیم بکە، بە ئیزن و ویستی خۆت. ئەتۆ خوایە هەرکەس کە بتەوێ بۆ ڕێی ڕاست هیدایەتی دەدەی».

## باسی ڕەوشت و ئادابی نان‌خواردنی پێغەمبەرﷺ:

هەندێك لەم باسە لە بابەتی خواردن و خواردنەوەدا ڕابورد[2].

پێغەمبەرﷺ خەیاری بە خوێوە و وێڕای خورمای تەڕ دەخوارد[3].

پێغەمبەرﷺ، خۆشترین میوە بەلایەوە، خورمای تەڕ و کاڵەك و ترێ بووە[4]. جاری وا بووە ترێ بە هێشووەیی خواردووە و ئاوەچۆڕەکەی بەسەر ڕیشیدا، وەکوو مرواری بینراوە،

١. لَمْ نَعثر علیه، لکن ورد فی کتب الحدیث قسمة منه: «...اهْدِنِي لِمٰا اخْتُلِفَ فِيهِ...» مسلم: ١٢٨٩، ابوداود: ٦٥٣، ترمذی: ٣٣٤٢، نسائی: ١٦٠٧، ابن‌ماجه: ١٣٤٧.

٢. بابەتی یازدەهەم.

٣. «كٰانَ يَأْكُلُ الْقِثّٰاءَ بِالرُّطَبِ» مسلم: ٣٨٠٦، ابوداود: ٣٣٢٨، ترمذی: ١٧٦٧، ابن‌ماجه: ٣٣١٦، احمد: ١٦٥٠.

٤. «كٰانَ رَسُولُ اللّٰهِﷺ يَأْكُلُ الْبِطِّيخَ بِالرُّطَبِ» ابوداود: ٣٣٣٩، ترمذی: ١٧٦٦، و فی روایة: «...وَ كٰانَ أَحَبُّ الْفٰاكِهَةِ إِلَيْهِ» حاکم فی المستدرک: ٧٢٣٧، طبرانی فی الأوسط: ٨١٣٦، بیهقی فی شعب الإیمان: ٥٥٩٣. و فی روایة: «...يَأْكُلُ الْعِنَبَ خَرْطاً» طبرانی فی الکبیر: ١٢٥٥٩، بیهقی فی شعب الإیمان: ٥٥٦٦. و فی روایة: «خَيْرُ طَعٰامِكُمُ الْعِنَبُ» کشف الخفاء للعجلونی: ١٢٧٥.

ئەوەش بریتی بوو لەو ئاوەی کە لە ترێیەکەوە دەتکا. پێغەمبەرﷺ زۆربەی خۆراکی ئاو و خورمای وشك بووە[١].

پێغەمبەرﷺ شیر و خورمای پێکەوە خواردووە و ناویانی بە «الأطيبين»[٢]، واتە: دوو خۆش تام، بردووە. خۆشترین خۆراك بەلایەوە گۆشت بووە و دەفەرمێ:

**«هُوَ يَزِيدُ فِي السَّمْعِ وَ هُوَ سَيِّدُ الطَّعَامِ فِي الدُّنْيَا وَ الْآخِرَةِ، وَ لَوْ سَأَلْتُ رَبِّي أَنْ يُطْعِمَنِهِ كُلَّ يَوْمٍ لَفَعَلَ»**[٣].

واتە: «گۆشت هێزی بیستن زیاد دەکاو باشترین خۆراکە، هەم لەدنیا و هەم لە دوارۆژدا، جا ئەگەر داوام لە خوا بکردایە کە هەموو ڕۆژ بیکاتە خۆراکم، وەهای دەکرد».

پێغەمبەرﷺ تریتی ئاو گۆشتی[٤] لەگەڵ کوولەکەدا دەخوارد و حەزی لە کوولەکە دەکرد[٥]، دەیگوت ئەمە (کوولەکە) داری یوونسی برامە.

حەزرەتی عائیشەرضي الله عنها لە پێغەمبەرەوەﷺ ڕیوایەتی فەرمووە: **«إِذَا طَبَخْتُمْ قِدْراً فَأَكْثِرُوا فِيهِ مِنَ الدُّبَّاءِ فَإِنَّهُ يَشُدُّ الْقَلْبَ الْمَحْزُونَ»**[٦].

واتە: «هەرکاتێ چێشتان لێنا، کوولەکەی زۆری تێ بکەن، چونکە کوولەکە دڵی خەمبار پتەو دەکاتەوە».

---

١. «...الْأَسْوَدَانِ التَّمْرُ وَالْمَاءِ...» بخاری: ٢٣٧٩ ـ ٥٩٧٨، مسلم: ٥٢٨٢ ـ ابن‌ماجه: ٤١٣٥، احمد: ٧٦٢١. و فی روایة: «عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها قَالَتْ: كَانَ يَأْتِي عَلَيْنَا الشَّهْرُ مَا نُوقِدُ فِيهِ نَاراً إِنَّمَا هُوَ التَّمْرُ وَالْمَاءُ...» بخاری: ٥٩٧٧، مسلم: ٥٢٨٠، ابن‌ماجه: ٤١٣٤. و فی روایة: «تُوُفِّيَ النَّبِيُّ ﷺ حِينَ شَبِعْنَا مِنَ الْأَسْوَدَيْنِ التَّمْرِ وَالْمَاءِ» بخاری: ٤٩٦٤، مسلم: ٥٢٨٤، احمد: ٢٣٨١٥.

٢. «...يَتَمَجَّعُ لَبَنًا بِتَمْرٍ...» احمد: ١٥٣٢٨.

٣. کشف الخفاء: ١٥١٢.

٤. «أَحَبَّ الطَّعَامِ إِلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ الثَّرِيدُ مِنَ الْخُبْزِ وَ الثَّرِيدُ مِنَ الْحَيْسِ» ابوداود: ٣٢٨٩. و فی روایة: «فَضْلُ عَائِشَةَ عَلَى النِّسَاءِ كَفَضْلِ الثَّرِيدِ عَلَى سَائِرِ الطَّعَامِ» بخاری: ٣١٥٩ ـ ٣١٧٩ ـ ٣٤٨٥ ـ ٥٠٠٨، مسلم: ٤٤٥٩ ـ ٤٤٧٨، ترمذی: ١٧٥٧، نسائی: ٣٨٨٥، ابن‌ماجه: ٣٢٧١، احمد: ١٢١٣٧.

٥. «كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يُحِبُّ الْقَرْعَ» ابن‌ماجه: ٣٢٩٣، احمد: ١٣٥٧٨ ـ ١٢٣٢٥. و فی روایة: «يُحِبُّ الدُّبَّاءَ» احمد: ١٣٣٨٨.

٦. فیض القدیر شرح جامع الصّغیر للمناوی: ٦٩٩٤، الفوائد لأبی‌بکر الشافعی: ٩١٢.

پێغەمبەرصَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَسَلَّمَ گۆشتی ئەو باڵندانەی کە ڕاویان دەکردن دەخوارد[1]، بەڵام خۆی ڕاوی نەدەکرد و بە شوێنیدا نەدەڕۆیشت، حەزی دەکرد کە بۆی ڕاو بکرێت و بۆی بهێنرێ، ئەوجار دەیخوارد[2]. پێغەمبەر، نان و ڕۆنی دەخوارد[3]، لەناو گۆشتی شەکدا حەزی لە دەست و شانی دەکرد[4]، لەناو چێشتە کوڵێندا حەزی لە کوولەکە دەکرد[5] و لەناو ترشیدا حەزی لە سرکە دەکرد[6]، لەناو خورمادا حەزی لە «عجوة»[7] دەکرد و دایمە دوعای خێر و پیتی بۆ دەکرد[8]، دەیفەرموو ئەوە (عجوة) لە بەهەشتەوەیە، شیفای سەم و سیحرە[9]. هەروەها لەناو تەڕەکاڵەکاندا خۆشی لە کاسنی و چەقەنە[10] و پەڵپینە دەهات[11].

١. یدل علی ذلك لفظ: «كَانَ عِنْدَ النَّبِيِّ صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَسَلَّمَ طَيْرٌ فَقَالَ: اللَّهُمَّ ائْتِنِي بِأَحَبِّ خَلْقِكَ إِلَيْكَ يَأْكُلُ مَعِي هٰذَا الطَّيْرَ، فَجَاءَ عَلِيٌّ فَأَكَلَ مَعَهُ» ترمذی: ٣٦٥٥ و کذا لفظ سفینة قال: «أَكَلْتُ مَعَ رَسُولِ اللّٰهِ صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَسَلَّمَ لَحْمَ حُبَارىٰ» ابوداود: ٣٣٠٣، ترمذی: ١٧٥١.

٢. یدل علی ذلك ظاهر أحواله و کذا لفظ: «مَنْ سَكَنَ الْبَادِيَةَ جَفَا وَ مَنِ اتَّبَعَ الصَّيْدَ غَفَلَ وَ مَنْ أَتَى السُّلْطَانَ افْتُتِنَ» ابوداود: ٢٤٧٦، ترمذی: ٢١٨٢، نسائی: ٤٢٣٥، احمد: ٣١٩٠. و کذا لفظ: «... قَدْ كَانَتْ لِلّٰهِ قَبْلِي رُسُلٌ كُلُّهُمْ يَصْطَادُ أَوْ يَطْلُبُ الصَّيْدَ ...»: طبرانی فی الکبیر: ٧١٩١.

٣. یدل علی ذلك حدیث طویل فیه: «... وَ عَصَرَتْ أُمُّ سُلَيْمٍ عُكَّةً فَأَدَمَتْهُ ... فَأَكَلُوا حَتَّىٰ شَبِعُوا ...» بخاری: ٣٣١٣. و کذا لفظ: «وَدِدْتُ أَنَّ عِنْدِي خُبْزَةً بَيْضَاءَ مِنْ بُرَّةٍ سَمْرَاءَ مُلَبَّقَةً بِسَمْنٍ وَ لَبَنٍ ...» ابوداود: ٣٣٢٢، ابن‌ماجه: ٣٣٣٢.

٤. مسلم: ٢٨٧ فی حدیث طویل فیه: «... وُضِعَتْ بَيْنَ يَدَيْ رَسُولِ اللّٰهِ صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَسَلَّمَ قَصْعَةٌ مِنْ ثَرِيدٍ وَ لَحْمٍ فَتَنَاوَلَ الذِّرَاعَ وَ كَانَتْ أَحَبَّ الشَّاةِ إِلَيْهِ ...». و فی روایة: «... يُعْجِبُهُ الذِّرَاعُ ...» ابوداود: ٣٢٨٧. و فی روایة: «رَأَيْتُ رَسُولَ اللّٰهِ صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَسَلَّمَ يَحْتَزُّ مِنْ كَتِفِ شَاةٍ فَأَكَلَ مِنْهَا ...» بخاری: ٥٠٠٢. و فی روایة ذبح شاة و قال: «الشَّاةُ كُلُّهَا لَكُمْ إِلَّا الْكَتِفَ» بیهقی فی شعب الإیمان: ٣٠٨٦.

٥. «كَانَ رَسُولُ اللّٰهِ صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَسَلَّمَ يُحِبُّ الدُّبَّاءَ ...» احمد: ١٢٣٤٦ ـ ١٢٣٨٨.

٦. «نِعْمَ الْأُدُمُ أَوْ نِعْمَ الْإِدَامُ الْخَلُّ» مسلم: ٣٨٢٣ ـ ٣٨٢٤، ابوداود: ٣٣٢٥، ترمذی: ١٧٦٢، نسائی: ٣٧٣٦، ابن‌ماجه: ٣٣٠٨، احمد: ١٣٧٤٢.

٧. باشترین جۆری خورمایێکە لە مەدینەدا زۆر بووە ـ وەرگێر.

٨. «بَارَكَ اللّٰهُ فِي الْجُذَامِىٰ وَ فِي حَدِيقَةٍ خَرَجَ هٰذَا مِنْهَا» الآحاد والمثانی لأبی‌عاصم: ١٤٧٤، معرفة الصّحابة لأبی‌نعیم الاصبهانی: ٣٥٤٧.

٩. «الْعَجْوَةُ مِنَ الْجَنَّةِ و فِيهَا شِفَاءٌ مِنَ السُّمِّ ...» ترمذی: ١٩٩٢، ابن‌ماجه: ٣٤٤٤، احمد: ٧٧٠٦. و فی روایة: «مَنْ تَصَبَّحَ بِسَبْعِ تَمَرَاتٍ عَجْوَةً لَمْ يَضُرُّ ذٰلِكَ الْيَوْمَ سُمٌّ وَلا سِحْرٌ» مسلم: ٣٨١٤، احمد: ١٤٨٨.

١٠. کاسنی و چەقەنە: هندووبا، گیاشیلاو، گیایەکی گەڵا بڵاوە گوڵەکانی شین و سپی و سووری کاڵە، بۆ دەرمان کەڵکی لێ وەرئەگیررێت ـ وەرگێر.

١١. «عَلَيْكُمْ بِالْهِنْدُبَاءِ ...» جامع الکبیر للسیوطی: ٣٠٧. «مَرَّ النَّبِيُّ صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَسَلَّمَ بِالرِّجْلَةِ ... وَ قَالَ: بَارَكَ اللّٰه فِيكِ أَنْبِتِي ... فَأَنْتِ شِفَاءٌ مِنْ سَبْعِينَ دَاءِ أَدْنَاهَا الصِّدَاعُ» المطالب العالیة لإبن‌حجر العسقلانی: ٢٥١٩، بغیة الحارث: ٥١٠.

### شێوازی جلوبەرگ پۆشینی پێغەمبەرﷺ:

پێغەمبەرﷺ هەر جۆرە پۆشاکێکی دەست کەوتبا لەبەری دەکرد، زۆرتر لیباسی سپی دەپۆشی، دەیگوت: «أَلْبِسُوهٰا أَحْيٰاءَكُمْ وَ كَفِّنُوا فِيهٰا مَوْتٰاكُمْ»[1] واتە: «لیباسی سپی بکەنە بەر زیندووەکانتان و مردووەکانتانی تێدا کفن بکەن». زۆر جار لە ماڵ ئەهاتە دەرەوە و بە ئەنگوستیلەکەیەوە تاڵێ بەنی دەبەست، بۆ ئەوەی شتی بیر بخاتەوە[2].

پێغەمبەرﷺ، کڵاوی لە ژێر مێزەرەوە دەکردە سەری[3] و جارجار مێزەرەکەی دەگۆڕا، جاریواش هەبوو کڵاوەکەی لەسەر دەرئەهانی و لەبەر دەمیدا دایئەناو و ڕوو بە کڵاوەکەی نوێژی دەکرد[4].

پێغەمبەرﷺ هەرکاتێ کراسی لەبەر دەکرد، لەلای ڕاستیەوە قۆڵی پێدا دەکرد[5] و دەیفەرموو: «اَلْحَمْدُ لِلّٰهِ الَّذِي كَسٰانِي مٰا أُوٰارِي بِهِ عَوْرَتِي وَ أَتَجَمَّلُ بِهِ فِي النّٰاسِ»[6].

واتە: «سەناو ستایش بۆ ئەو خودایەی کە پۆشەنێکی بە من داوە کە من عەورەت و شەرمگامی پێ داپۆشم و لەناو خەڵکدا خۆمی پێ بڕازێنمەوە. هەر کاتێکیش لیباسی لەبەر دابکەندایە، لە لای چەپەوە دایدەیکەند[7]

---

١. «خَيْرُ ثِيٰابِكُمُ الْبَيٰاضُ فَكَفِّنُوا فِيهٰا مَوْتٰاكُمْ وَ أَلْبِسُوهٰا» ابن‌ماجه: ١٤٦١، احمد: ٣١٧١ و زاد: «وَ خَيْرُ أَكْحٰالِكُمُ الْإِثْمِدُ».

٢. الدّرر المنتثرة للسيوطى: ٢٢/١، علل الترمذى الكبير: ٤٧٧.

٣. «كٰانَ يَلْبَسُ قَلَنْسُوَةً بَيْضٰاءَ» شعب الإيمان للبيهقى: ٥٨٤٨. و فى رواية: «فَرْقُ مٰا بَيْنَنٰا وَ بَيْنَ الْمُشْرِكِينَ الْعَمٰائِمُ عَلَى الْقَلانِسِ» ابوداود: ٣٥٥٦، ترمذى: ١٧٠٦.

٤. «كٰانَ لِرَسُولِ اللّٰهِﷺ ثَلاثُ قَلانِسَ ... وَ رُبَّمٰا وَضَعَهٰا بَيْنَ يَدَيْهِ إِذٰا صَلّٰى» ابوالشيخ الأصبهانى فى أخلاق النبىّ: ٣٠٠، ابوداود: ٥٩٢ بلفظ آخر.

٥. ترمذى: ١٦٨٨ بلفظ: «...إِذٰا لَبِسَ قَمِيصاً بَدَأَ بِمَيٰامِنِهِ». و فى رواية: «كٰانَ النَّبِيُّﷺ يُحِبُّ التَّيَمُّنَ مٰا اسْتَطٰاعَ فِي شَأْنِهِ كُلِّهِ...» بخارى: ٤٠٨ ـ ٤٩٦١، ترمذى: ٥٥٣، مسلم: ٣٩٦، ابوداود: ٣٦١١، ابن‌ماجه: ٣٩٥، نسائى: ٤١٨ و فى رواية: «يُحِبُّ التَّيٰامُنَ يَأْخُذُ بِيَمِينِهِ وَ يُعْطِي بِيَمِينِهِ ... فِي جَمِيعِ أُمُورِهِ» نسائى: ٤٩٧٣.

٦. ترمذى: ٣٤٨٣، ابن‌ماجه: ٣٥٤٧، احمد: ٢٨٨. بلفظ: «... وَ أَتَجَمَّلُ بِهِ فِي حَيٰاتِي ...».

٧. «كٰانَ لَبِسَ شَيْئاً مِنَ الثِّيٰابِ بَدَأَ بِالْيَمِينَ وَ إِذٰا نَزَعَ بَدَأَ بِالْأَيْسَرِ» أخلاق النبىّ لأبى الشيخ الاصبهانى: ٧٧٣ ـ ٧٧٢ و فى رواية له: «...إِذٰا خَلَعَ بَدَأَ بِيَسٰارِهِ».

پێغەمبەرﷺ قاتێکی هەبوو تایبەت بە ڕۆژی هەینی[١]. هەرکاتێ لیباسی تازەی دەکڕی، کۆنەکەی دەدا بە هەژار و فەقیران و دەیفەرموو:

«مٰا مِنْ مُسْلِمٍ يَكْسُو مُسْلِماً مِنْ سَمَلِ ثِيٰابِهِ، لا يَكْسُوهُ إِلّٰا لِلّٰهِ، إِلّٰا كٰانَ فِي ضَمٰانِ اللهِ وَ حِرْزِهِ مٰا وٰارٰاهُ حَيّاً وَ مَيِّتاً»[٢].

واتە: «هەر موسڵمانێ لەبەر خوا، موسڵمانێ‌تر بە لیباسە کۆنەکانی خۆی چ بە زیندوویی و چ بە مردوویی پۆشتە بکات، ئەوە وا لە ئەمان و پەنای خوادا».

پێغەمبەرﷺ فەرشێکی چەرمی هەبوو کە ناوەکەی پڕ بوو لە پووش و ڕیشۆی دار خورما[٣]، بە ئەندازەی دوو گەز، یان زیاتر درێژ و گەزو بستێك پان بوو. عەبایەکیشی هەبوو دەیکردە بەری و لە هەرکوێ دابنیشتایە دوو لوانە دەیخستە ژێری[٤]. هەروەها پێغەمبەرﷺ پشتوێنێ چەرمی بوو، سێ بازنەی زێوی تێدا بوو[٥].

## باسی بوێری و ئازایی پێغەمبەرﷺ:

حەزرەتی عەلیرضي الله عنه فەرموویەتی: «لە ڕۆژی بەدردا سەرنجم‌دا، خەریکین پەنا بە پێغەمبەرﷺ دەبەین، لە حاڵێکدا ئەو لە ئێمە نزیکتر بوو بە دوژمنەوە، پێغەمبەرﷺ لەو ڕۆژەدا لە هەموو کەس بوێرتر بوو»[٦].

---

١. طبرانی فی الأوسط: ٣٦٥٠ والصغیر: ٤٢٥، کشف الخفاء للعجلونی: ١٦٧٩.

٢. عبدالله بن‌المبارك فی مسنده: ٢٢، بیهقی فی شعب الإیمان: ٥٨٧٣ بلفظ آخر: «مٰا مِنْ مُسْلِمٍ يَلْبَسُ ثَوْباً جَدِيداً ... فَيَكْسُوهُ أَخٰا لَهُ مُسْلِماً لا يَكْسُوهُ ... وَ فِي ضَمٰانِ اللهِ وَ فِي جَوٰارِ اللهِ». وفی روایة: «كَسٰا ثَوْبَهُ الْخَلِقَ مِسْكِيناً».

٣. «كٰانَ فِرٰاشُ رَسُولِ اللهِﷺ مِنْ أَدَمٍ وَ حَشْوُهُ مِنْ لِيفٍ» بخاری: ٥٩٧٥، مسلم: ٣٨٨٣، ترمذی: ١٦٨٣، احمد: ٢٣٣١٢. و فی روایة: «... نَحْوا مِمّٰا يُوضَعُ الْإِنْسٰانُ فِي قَبْرِهِ» ابوداود: ٤٣٨٧.

٤. بیهقی فی دلائل النبوّة: ٣٠٥ بلفظ: «... فِرٰاشُ رَسُولِ اللهِﷺ عَبٰاءَةٌ مُثَنّٰيَةٌ ...». و فی روایة: «سُئِلَتْ حَفْصَةُ: مٰا كٰانَ فِرٰاشُ رَسُولِ اللهِﷺ فِي بَيْتِكَ؟ قٰالَتْ: مَسْحاً نَثْنِيهِ ثِنِيَّتَيْنِ فَيَنٰامَ عَلَيْهِ ...» ترمذی فی الشّمائل المحمّدیّة: ٣٢١

٥. لم نعثر علیه لکن أورده بیهقی فی دلائل النبوّة: ٣٢٦٣ بلفظ: «كٰانَ فِي دِرْعِ رَسُولِ اللهِﷺ حَلْقَتٰانِ مِنْ فِضَّةٍ ...».

٦. «لَقَدْ رَأَيْتُنٰا يَوْمَ بَدْرٍ ... وَ هُوَ أَقْرَبُنٰا إِلَى الْعَدُوِّ ...» احمد: ٦١٩.

**باسی موعجیزەکانی پێغەمبەر ﷺ:**

پێویستە بزانی هەمووی ئەوانەی کە حاڵ و ڕەوشت و ڕەفتاری پێغەمبەریان دیوە و گوێیان بۆ فەرموودەکانی شل کردووە، دەزانن کە لە سەرەتای دنیاوە تا ئاخری دونیا کەس نییە ئاکار و کرداری وەکوو ئەوانەی پێغەمبەری لێ بوەشێتەوە، ئەمەش بۆ مرۆڤ ڕێکی نایێت و تەسەوور ناکرێ مەگەر لە ڕێی وەحی و سرووشەوە.

ئاخر کابرای عەرەبی دەشتەکی، ڕوومەتی جوانی پێغەمبەری ئەبینی، ئەیگوت: وەڵلاهی ئەمە قەت ڕوومەتی ئینسانی درۆزن نییە، هەرکەس دڵی وریا بوایە هەر ئەوەی بە نیشانەی پێغەمبەرایەتی و ڕاستی ئەو دەزانی.

ئەمەش هەندێ لەو موعجیزاتە کە لەسەر دەستی پێغەمبەر ﷺ ڕوویان داوە:

١. مانگی شەق کرد وەختێ کە خەڵکی قورەیش داوایان لێ کرد[١].

٢. لە ماڵی جابردا خەڵکیکی زۆری بە تۆزێ نان تێر کرد.[٢]

٢. لە ڕۆژی شەڕی خەندەقدا، لە ماڵی ئەبووتەلحەدا، نانی دا بە خەڵکێکی زۆر[٣].

٣. ئاو لە بەین پەنجەکانیەوە هەڵقوڵاوە و لەشکرەکە هەر هەموو لەگەڵ ئەوەشدا کە زۆر تینوویان بووە، تێریان خواردۆتەوە[٤].

٤. سەحابەکان، لە کاسەیەکی بچووکدا کە پێغەمبەر ﷺ نەیدەتوان چاك دەستی تێ بخات، دەستنوێژیان گرتووە[٥].

نموونەی ئەمانە ئێجگار زۆرن، بەڵام مرۆڤی وریا و ژیر نابێ ئیمانی لەسەر ئەمانە ڕابووەستێنێ.

والله أعلم

---

١. بخاري: ٣٣٦٥ ـ ٤٤٨٩، مسلم: ٥٠١٣ بلفظ: «سَأَلَ أَهْلُ مَكَّةَ أَنْ يُرِيَهُمْ آيَةً فَأَرَاهُمْ انْشِقَاقَ الْقَمَرِ»، احمد: ١٢٨٢٥ و زاد: «مَرَّتَيْنِ». ترمذی: ٢١٠٨ بلفظ: «انفلق».

٢. بخاري:٣٣١٤، مسلم:٣٨٠٠.

٣. بخاري:٣٣١٣ ـ ٤٩٦٢ ـ ٦١٩٤، مسلم:٣٨٠١، ترمذی: ٣٥٦٣.

٤. بخاري: ١٩٣ ـ ٣٣٠٧ ـ ٣٣١١ ـ ٣٨٣٧ ـ ٥٢٠٨، مسلم: ٤٢٢٤، ترمذی: ٣٥٦٦، نسائی: ٧٦ ـ ٧٧، احمد: ٣٦١٦ ـ ١٢٢٢٣ ـ ١٤٢٧٨.

٥. بخاري: ١٩٣، مسلم: ٤٢٢٤ ـ ٤٢٢٦، احمد: ١٢٠٤٠.

# بابەتی بیست و یەکەم:
# عەجایەبات و شتە سەیرەکانی دڵ

پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: «إِنَّ فِي جَسَدِ ابْنِ آدَمَ مُضْغَةً إِذَا صَلُحَتْ صَلُحَ الْجَسَدُ كُلُّهُ وَ صَلَحَ لَهَا سَائِرُ الْبدَنِ، أَلا وَ هِيَ الْقَلْبُ».[1]

واتە: «لەناو جەستەی مرۆڤدا پارچە گۆشتێ هەیە، ئەگەر ئەو پارچە گۆشتە دابمەزرێ تەواوی جەستە دادەمەزرێ و هەموو ئەندامەکانیتر بۆ ئەو دەسوڵحێن، ئاگادار بن ئەو لەتە گۆشتە دڵە». بەم حەدیسە ڕوون بووەوە، کە بناغە و بنچینە لە مرۆڤدا دڵە و هەر دڵە کە لەناو عالەمی جەستەدا پاشای فەرمان لێبراوە و باقی ئەندامەکانیتر فەرمانبەری ئەون.

## [بەشی یەکەم:] لێکدانەوەی مانای دڵ و ڕۆح و نەفس و عەقڵ

### وشەی یەکەم: دڵ، بە دوو مانا بەکار ئەهێنرێ:

**یەکەمیان:** ئەو پارچە گۆشتە سنەوبەرییەیە کە لەلای چەپی سینەوەیە، لەناو ئەم پارچە گۆشتەشدا بۆشاییەك هەیە کە خوێنی ڕەشی تێدایە، ئەو بۆ شاییە کە سەرچاوە و کانی ڕۆحە، لەناو حەیواناتدا و لەناو مردواندا هەیە.

**دووهەمیان:** دڵ، لەتیفەیێك و هێزێکی خوداییە و ڕۆحانییە کە جۆرە پەیوەندیێکی بەم پارچە گۆشتەوە هەیە. ئەم هێزو لەتیفەیە عیلمی بە خودای گەورە هەیە و دەتوانێ ئەو شتانەی

---

1. بخاری: ٥٠، مسلم: ٢٩٩٦، ابن‌ماجه: ٣٩٧٤، احمد: ١٧٦٤٩ جمیعهم بلفظ: «...أَلا إِنَّ فِي الْجَسَدِ مُضْغَةً إِذَا صَلُحَتْ... وَ إِذَا فَسَدَتْ فَسَدَ الْجَسَدُ كُلُّهُ...» و فی روایة احمد: «أَلا إِنَّ فِي الْإِنْسَانِ مُضْغَةً...».

کە هێزی خەیاڵ و هێزی وەهم لێیان تێ ناگات، هەستیان بکات، ئەم لەتیفەیە حەقیقەتی مرۆڤە و ئەوە کە بەرپرسە [لە بەرانبەری هەموو شتێکەوە].

خوای گەورە لە فەرموودەی خۆیدا بەم مانا ئاماژە دەکات: ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَذِكْرَىٰ لِمَن كَانَ لَهُ قَلْبٌ﴾[1]. واتە: «بەڕاستی لەم (سەرگوزشت)ەدا بیرهێنانەوەی تێدایە بۆ هەرکەسێ دڵی هەبێ». جا خۆ ئەگەر مەبەستی خوا ئەو پارچە گۆشتە سنەوبەرییە بێ دەیخۆ هەموو کەس دڵی هەیە.

جا کە ئەمەت زانی، بزانە کە پێوەندی نێوان ئەم هێز و لەتیفە لەگەڵ ئەم پارچە گۆشتە سنەوبەرییە، پێوەندییەکی نهێنی و شاراوەیە کە بە زمان ناوێژرێ، بەڵکوو تەنها بە دیتن دەردەکەوێ. ئەوەی کە دەکرێ بوێژری ئەوەیە کە بڵێین: ئەو لەتیفە وەکوو پاشایە و ئەم پارچە گۆشتە وەکوو ماڵ یان مەملەکەت وایە. جا دروست نییە بڵێین پێوەندی نێوانیان وەکوو پێوەندی نێوان عەرەز و جیسمە] چونکە ئەگەر ئەو پێوەندیە پێوەندی عەرەزییە و [وەکوو هی جیسم وایە]، ئەوە فەرموودەی خوا بە پێی ئەو حیسابە دروست نییە کە دەفەرمێ ﴿وَأَنَّ اللَّهَ يَحُولُ بَيْنَ الْمَرْءِ وَقَلْبِهِ﴾[2] واتە: «خوای گەورە جیایی دەخاتە نێوان مرۆڤ و دڵیەوە».

## وشەی دووهەم: ڕۆح، ئەمیش دوو مانای هەیە:

**یەکەمیان:** ڕۆحی سروشتی و تەبێعی، کە دووکەڵێکە سەرچاوەکەی خوێنێکی ڕەشە کە لە بۆشایی دڵدایە ـ دڵیش بریتی بوو لەو گۆشتە سنەوبەرییە ـ ، ئەم دووکەڵە لە کاناڵی ڕەگەکانەوە بەهۆی گوشار و کوتانی دڵ لە تەواوی جەستەدا بڵاو دەبێتەوە، وەکوو چرایەك وایە کە لە نێو ماڵدا، تەواوی سووچەکانی ماڵەکە ڕوون دەکاتەوە، ئەمەش هەر ئەوەیە وا پزیشکەکان بە وشەی «گیان» ناوی لێ دەهێنن.

**دووهەمیان:** ڕۆح بریتییە لە هێزو لەتیفەیێکی خوایی کە هەر ئەو مانا ڕاستەقینەی دڵی هەیە، ڕۆح و دڵ هەردووکیان لەم مانایەدا هاوچەشنن، بۆ ئەم مانایە خوای گەورە ئاماژە دەکات بە فەرموودەی خۆی ﴿وَيَسْأَلُونَكَ عَنِ الرُّوحِ، قُلِ الرُّوحُ مِنْ أَمْرِ رَبِّي﴾[3] «واتە: [ئەی موحەممەد] لەبارەی ڕۆحەوە پرسیارت لێ دەکەن، تۆ بڵێ ڕۆح لە نێو بازنەی عالەمی غەیبی خوادایە».

---

١. ق: ٣٧. ٢. الأنفال: ٢٤. ٣. الإسراء: ٨٥.

**وشەی سێهەم: نەفس، دوو مانای هەیە:**

**یەکەمیان:** بە مانای هێزێکە کە تووڕەیی و شەهوەت و ڕەوشتە خراپەکان لە خۆیدا کۆ دەکاتەوە. ئەمەیە مەبەستی پێغەمبەرﷺ «أَعْدَىٰ عَدُوِّكَ نَفْسُكَ الَّتِي بَيْنَ جَنْبَيْكَ»[1] واتە: «پیسترین دوژمنی تۆ نەفستە کە لە نێوان دوو پاڵووتدایە». ئەمەش هەر ئەو نەفسەیە کە فەرمانی بەرهەڵستکاری و دەستوور بە شکاندنی دراوە.

**دووهەمیان:** ئەمیش لەتیفەیێکی خواییە کە بە مانای یەکێ لە دوو مانای ڕۆح و دڵە. نەفسیش لەگەڵ وشەی دڵ و ڕۆحدا بەو مانای لەتیفە دەگوترێ کە حەقیقەتی مرۆڤە، ئەو هێزەی کە مرۆڤ لە باقی حەیوانات جیا دەکاتەوە، جا هەر کاتێ خاوێن و ڕووناك بوو بەهۆی یاد و ناوی خواوە، ئەوە ئاسەوار و کاریگەری شەهوەت و ئاکاری خراپ و نالەباری لێ دەسرێتەوە، ئەوکاتە پێ دەڵێن: «اَلنَّفْسُ الْمُطْمَئِنَّةُ» واتە: «نەفسی دڵنیا». ئەمەش مەبەستی خوایە بەو فەرمایشتەی کە دەفەرموێ: ﴿يٰا أَيَّتُهَا النَّفْسُ الْمُطْمَئِنَّةُ ارْجِعِي إِلَىٰ رَبِّكِ رٰاضِيَةً مَرْضِيَّةً﴾[2] واتە: «ئەی نەفسی دڵنیا، بگەڕێوە بۆلای پەروەردگارت بەو حاڵەتەوە کە تۆ لە خوا ڕازیت و خواش لە تۆ ڕازییە» نەفس پێش ئەوەی بەم پلەیە بگات، دوو پلەی‌تری هەیە:

**یەکیان:** نەفسی سەرکۆنەکەر و لۆمەکەر، ئەمەش هەر ئەوەیە وا خوا سوێندی پێ خواردووە: ﴿لا أُقْسِمُ بِالنَّفْسِ اللَّوّٰامَةِ﴾[3] واتە: «سوێند بە نەفسی سەرکۆنەکەر» ئەم نەفسەش لۆمەی ئینسان لەسەر گوناح دەکات و پێی ڕازی نییە و پێش ئەوە نەفس بەم پلەیە بگات پلەی‌تری لەبەرە [کە بریتییە لەوەی خوارەوە].

**دووهەمیان:** نەفسی ئەممارە، کە فەرمان بە ئەنجامدانی کاری خراپە دەکات، هەر وەك چۆن خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿إِنَّ النَّفْسَ لَأَمّٰارَةٌ بِالسُّوءِ﴾[4] واتە: «ئەم نەفسە زۆر هاندەری مرۆڤە بۆکاری خراپە». ئەمەش حاڵەتێکە جگە بە چاکە فەرمان نادات و لەسەر کاری خراپە لۆمە ناکات [بۆ ئیشی خراپەش هانی دەدات]. ئەم حاڵەتە پەسترین و خوارترین حاڵەت و مەقامە، نەفسی دڵنیا وەکوو سەرمیچ و سەقف وایە و نەفسی لۆمەکەر لە نێوانیاندایە، نە حەز

١. بیهقی فی الزّهد الکبیر: ٣٥٥، عبدالرّحمن السّلمی فی آداب الصّحبة: ٥١ بلفظه، جامع الکبیر للسیوطی: ١١٩٢ بلفظ آخر.

٢. الفجر: ٢٧. ٣. القیامة: ٢. ٤. یوسف: ٥٣.

بە ئیشی خراپە دەکات تا ئەنجامی بدات و نەهێزی دڵنیابوونی هەیە تا بە ئەنجامی کاری چاکە خۆی دڵنیا بکات، کاری چاکەش کە دڵ دڵنیا بکات یادی خوایە.

### وشەی چوارەم: عەقڵ

عەقڵ بە چەند مانا هاتووە کە لێرەدا دوانیان مەبەستە:

**یەکەمیان:** عەقڵ، بریتییە لە زانینی حەقیقەتی شتەکان.

**دووهەمیان:** کەسایەتییەکی عالمە کە عیلم لە ئەودا وەکوو سیفەتێکی لێ هاتووە کە بەردەوام لەگەڵیدایە، ئەمەش هەر ئەو مانا لەتیفەی خوداییەیە کە باسەکەی ڕابورد، چونکە ناکرێ مەبەست لە عەقڵ هەر ئەو مانایەکەمە بێ، لەبەر ئەو فەرمایشتەی پێغەمبەرە ﷺ: «أَوَّلُ مٰا خَلَقَ اللّٰهُ ـ تَعٰالَىٰ ـ اَلْعَقْلَ، ثُمَّ قٰالَ لَهُ أَقْبِلْ فَأَقْبَلَ، ثُمَّ قٰالَ لَهُ: أَدْبِر فَأَدْبَرَ».[1]

واتە: «هەووەڵین شتێك کە خوای گەورە خەلقی کرد، عەقڵ بوو، پاشان پێی فەرموو: وەرە پێشەوە، ئەویش هاتە پێشەوە، پاشان پێی گوت: وەرگەڕە دواوە، ئەویش وەرگەڕایەوە دواوە».

جا کە بۆت ڕوون بووەوە کە لە ئایەتەکان و حەدیسەکاندا، مەبەست لە (دڵ، ڕۆح، نەفس، عەقڵ) ئەو لەتیفە و هێزە خوداییەیە، ئێمەش هەرکاتێ هەرکام لەمانەمان باس کرد ئەوە مەبەستمان پێی ئەو هێز و لەتیفەیە.

سەهلی توسەتری رَحِمَهُ اللَّهُ، گوتوویە: «دڵ عەرشە، سینگ کورسییە» ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە مەبەستی لە دڵ شتێکە کە لە ئەو دیوی ئەو پارچە گۆشتە سنەوبەرییەوەیە.

## بەشی دووهەم: لەشکری دڵ

جا کە دڵت ناسی، باسی لەشکری دڵت بۆ دەکەین، دڵ، دوو لەشکری هەیە، یەکیان بەچاو دەبینرێ؛ کە بریتییە لە دەست و پێ و چاو و ئەندامەکانیتر. لەشکرێتر کە تەنها بە چاوی دڵ دەبینرێ بریتییە لە «صفات» کە لەمەودوا باسی دەکەین. ئەو فەرموودەیەی

---

[1] طبراني في الكبير: ٨٠١٢، بيهقي في شعب الإيمان: ٤٣١٢، ابن‌الأثير في جامع الأصول: ١٩٩٢ جميعهم بلفظ: «لَمّا خَلَقَ اللّٰهُ الْعَقْلَ ...».

پێغەمبەریش ﷺ هەر ئەمە دەگەیەنێ کە فەرموویەتی: «إِنَّ فِي جَسَدِ ابْنِ آدَمَ مُضْغَةً إِذٰا صَلُحَتْ صَلُحَ سٰائِرُ الْجَسَدِ أَلا وَ هِيَ الْقَلْبُ»[1].

وێڕای ئەمە، دڵ پاشاییێکی فەرمان لێبراوە و نەفس و ئەندامەکانی تری جەستە، گوێڕایەڵی فەرمان و نەهیەکانی ئەون، جا ئەگەر ئاوەها نەبوو و گوێڕایەڵی نەبوون و شەهوەت و هەواو هەوەس زاڵ بوون بەسەریدا، ئەمیر و پاشا خۆی ئەبێتە، فەرمانبەر و ژێردەستەی نەفس و کارەکە پێچەوانەوە دەبێتەوە، پاشا لە چنگی دوژمندا دیل ئەبێت و ئەکەوێتە ژێردەستی سەگ یان دوژمن.

بەمبۆنەوە، هەرکاتێ پیاو شوێنی سکی یان شوێنی شەهوەتی کەوت، چ لە حاڵەتی خەودا و چ لە حاڵەتی بێداریدا ـ ئەم حاڵەتە تایبەتی سۆفی و ئەهلی عیرفانە ـ خۆی لە حاڵەتی سوجدە لە بەردەم خووگ یان کەردا ئەبینێ. هەرکاتێکیش بە گوێی غەزەب و تووڕەیی بکات خۆی لە حاڵەتی سوجدە لە بەردەم سەگدا ئەبینێ، کەواتە لە واقعیدا ئەو بە گوێێ گوێدرێژی کردووە، کە بریتییە لە شەهوەت و بە گوێی بەرازی کردووە کە بریتییە کە نەوسنی. ئەو لەم حاڵەتەدا واتە: لە وەختی تاعەتی شەهوەت و سکیدا بە گوێی ئەو شەیتانەی کردووە کە زاڵە بەسەر مرۆڤدا.

جا ئەگەر هەواو هەوەس بەم سیفەت و ڕەوشتانەوە ـ کە لەشکری شەیتانن ـ بەسەر دڵدا زاڵ ببن و دڵیش پشتیوانێکی نەبێ تا ئەم لەشکرە شکست بدات و دەسەڵاتی نەمێنێ و شکست بهێنێ، ئەبێتە هۆی زایەبوون و خراپبوونی تایبەتمەندی ئەو هێز و لەتیفەیە. ئەمەش مەبەستە لەوەی کە لە حەدیسدا، باسی ڕەشبوونەوەی دڵ دەکات، هەروەها مەبەست لە پەردە بەسەردا کێشان و زاڵبوون بەسەریدا لە فەرمودەی خوای گەورەدا هەر ئەوەیە: ﴿أُولٰئِكَ الَّذِينَ طَبَعَ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ﴾[2] واتە: «ئەوانە کەسانێکن کە خوا مۆری ناوە بە سەر دڵیانەوە». یان لە فەرموودەیتردا: ﴿كَلّا بَلْ رٰانَ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ مٰا كٰانُوا يَكْسِبُونَ﴾[3] واتە: «نەخێر، بەڵکوو کردەوەی خۆیان بووەتە ژەنگ بەسەر دڵیانەوە.

---

١. ماناکەی ڕابورد. بخاری: ٥٠، مسلم: ٢٩٩٦، ابن‌ماجه: ٣٩٧٤، احمد: ١٧٦٤٩ جميعهم بلفظ: «...أَلا إِنَّ فِي الْجَسَدِ مُضْغَةً إِذٰا صَلُحَتْ... وَإِذٰا فَسَدَتْ فَسَدَ الْجَسَدُ كُلُّهُ...» و فی روایة احمد: «أَلا إِنَّ فِي الْإِنْسٰانِ مُضْغَةً...».

٢. محمد: ١٦.

٣. المطففين: ١٤.

دڵ وێنەی ئاوێنەیە، ئاوێنەش تاکاتێ خاوێن بێ لە ژەنگ و چڵك، هەموو شتێکی تێدا ئەبینرێ، بەڵام هەرکاتێ چڵك گرتی و ژەنگی هێنا و شتێ نەبوو کە پاکی بکاتەوە و چڵکەکەی لابات و ڕووناکی بکاتەوە، لە ئاکامدا چڵکی تێ ئەخزێ و خراپ ئەبێ و جۆرێکی لێ دێت کە زاخاودەریش ناتوانێ خاوێن و ڕۆشنی بکاتەوە، مەبەست لە مۆرخواردنی دڵ و ژەنگ‌هێنانی هەر ئەمەیە، پەیغەمبەرﷺ ئاماژە بەمە دەکات: «إِنَّ الْقَلْبَ لَيَصْدَأُ كَمٰا يَصْدَأُ الْحَدِيدُ، قِيلَ وَ مٰا جَلاٰئُهُ؟، قٰالَ: «ذِكْرُ الْمَوْتِ وَ تِلاٰوَةُ الْقُرآنِ»[1].

واتە: «هەر وەکوو چۆن ئاسن ژەنگ دەهێنێ دڵیش ژەنگ دەهێنێ. گوتیان: ئەدی بە چی ژەنگی لادەچێت؟ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: بە یادی مەرگ و قورئان‌خوێندن».

جا هەرکاتێ، سەرپەرشتی قەلب بە تەواوی نەماو دار لە دەستی داکەوت، شەیتان بەسەریدا زاڵ دەبێ و ئەو سیفات و ئاکارە چاکانە بە خراپە، دەگۆڕێ.

پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «اَلْقُلُوبُ أَرْبَعَةٌ، قَلْبٌ أَجْرَدُ و فِيهِ سِرٰاجٌ يَزْهُو، فَذٰلِكَ قَلْبُ الْمُؤْمِنِ وَ قَلْبٌ أَسْوَدُ مَنْكُوسٌ، فَذٰلِكَ قَلْبُ الْكٰافِرِ، قَلْبٌ أَغْلَفُ مَرْبُوطٌ عَلَىٰ غِلاٰفِهِ، فَذٰلِكَ قَلْبُ الْمُنٰافِقِ، و قَلْبٌ مُصْفِحٌ فِيهِ إِيمٰانٌ، وَ نِفٰاقٌ فَمَثَلُ الْإِيمانِ فِيهِ كَمَثَلِ الْبَقْلَةِ يَمُدُّهَا الْمٰاءُ الطَّيِّبُ، وَ مَثَلُ النِّفٰاقِ كَمَثَلِ الْقُرْحَةِ يَمُدُّهٰا الْقَيْحُ وَالصَّدِيدُ، فَأَيُّ الْمٰادَّتَيْنِ غَلَبَتْ عَلَيْهِ حُكِمَ لَهُ بِهٰا»[2] و فی روایة «ذَهَبَتْ فِيهِ».

واتە: دڵ چـوار جۆرە، دڵێکیان ڕووت و خاڵییە و چرایەکی تێدایە داگیرساوە، ئەمە دڵی موسڵمانی [ڕاستەقینەیە]. دڵێکیش ڕەش و ئاوەژووکراوە، ئەمەش بریتییە لە دڵی کافر. دڵێکی‌تر هەیە کە پەردەی بەسەردا کێشراوە و لەناو ئەو پەردەدا ئەسیر کراوە، ئەمەش بریتییە لە دڵی مونافیق، دڵێکی‌تریش هەیە بەربڵاوە، ئیمان و نیفاق تێیدا هاوبەشن، ئیمان لەم دڵەدا وەکوو ئەو گیایە وایە کە ئاوی خاوێن و پاك باڵای پێ دەکات، نیفاقیش وەکوو زەخمێ وایە کە چڵك و کیمی لێ شۆڕ ئەبێتەوە، کە وابوو هەر ماددەیێکیان بەسەر ئەویتریاندا زاڵ ببێ ئەوە بەلای خۆیدا ئەیکێشێ و حوکمی ئەو بەڕێوە دەبرێ».

---

١. بیهقی فی شعب الإیمان: ١٨٥٩، بلفظ: «إِنَّ هٰذِهِ الْقُلُوبَ تَصْدَأُ كَمٰا يَصْدَأُ الْحَدِيدُ إِذٰا أَصٰابَهُ الْمٰاءُ... وَ مٰا جِلاٰؤُها ...» ابن‌ابی‌شیبة فی مصنفه: ٣٠٠/٨.

٢. احمد: ١٠٧٠٥، ابن‌ابی‌شیبة فی مصنفه: ٢٢٣/٧، طبرانی فی الصّغیر: ١٠٧١.

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿إِنَّ الَّذِينَ اتَّقَوْا إِذَا مَسَّهُمْ طَائِفٌ مِنَ الشَّيْطَانِ تَذَكَّرُوا، فَإِذَا هُمْ مُبْصِرُونَ﴾[1].

واتە: «بێشك ئەوانەی کە پارێزکار و تەقوادارن، هەرکاتێ خەتەرەیێك لەلای شەیتانەوە بەدڵیاندا بێ یادی خوا دەکەن، ئیتر دەست بەجێ ئەوان بینا و وشیار دەبوونەوە».

ئەم ئایەتە ئەوە دەگەیەنێ کە بینا بوون و بەرچاو کرانەوە و ڕوون بوونەوە، تەنها بە یادی خوا دەبێ، کەسێکیش دەتوانێ یادی خوا بکات کە خۆپارێز و لەخوا ترس بێ، کە وابوو، تەقوا و ترسی خوا دەروازەی یادی خوایە، یادی خواش دەروازەی کەشف و کرانەوەی دڵە، کەشفیش کلیلی ڕزگاری گەورەیە.

## بەشی سێهەم: [ڕوونکردنەوەی ئەحواڵ]

بزانە دڵ وەکوو ئاوێنە وایە، تێگەیشتن و پەیبردن بە حەقیقەت وەکوو ئەو وێنانەیە کە لە نێو ئاوێنەدا دەبینرێ، ئەدی دەرکەوتنی ئەم وێنانە دیاردەیێکی سێهەمە. جا کە ئەمەت زانی، بزانە کە پێنج هۆکار بەری دەرکەوتنی وێنە لەناو ئاوێنە دەگرێ:

**یەکەم:** خراپبوونی ئاوێنەکە، واتە پێش ئەوەی جەلا بدرێ و وەکوو ئاوێنەی لێبێت.

**دووهەم:** پیس و چڵکنبوونی ئاوێنەکە.

**سێهەم:** شتەکە لەسەر جێی خۆی نەبێ، واتە، بەم شێوە کە لە پشتی ئاوێنەکەوە بێ.

**چوارەم:** پەردەی بکەوێتە نێوان ئاوێنەکە و شتەکەوە.

**پێنجەم:** نەزاندرێ شتەکە لە کام لاوەیە.

دڵیش هەروایە، ئەویش ئەکرێ بە خشڵی خوای گەورە خۆی لە هەمووی شتێکدا برازێنێتەوە و خۆی لەم پێنج خەسڵەتەی [خوارەوە] دوور بخاتەوە:

**یەکەم:** نوقسان و عەیبداری لە خودی قەلبدا، وەکوو منداڵ و شێت.

**دووهەم:** لەبەر لێڵی گوناح و پیسیێ کە بەسەر دڵدا کەڵەکە بووە، ئەوەش لەبەر هەواو و هەوەسی زۆرە خوای گەورەش بەمە ئاماژە دەکات ﴿كَلَّا بَلْ رَانَ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ مَا كَانُوا يَكْسِبُونَ﴾[2] واتە: «نەخێر، بەڵکو کردەوەی خۆیان بووەتە ژەنگ بە سەر دڵیانەوە».

١. الأعراف: ٢٠١.    ٢. المطفّفين: ١٤.

هەروەها پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «مَنْ قَارَفَ ذَنْباً فَارَقَهُ عَقْلٌ لَمْ يَعُودُ إِلَيْهِ أَبَداً» واتە: «هەرکەس تووشی گوناحێ ببێ، جۆرە عەقڵ و وریاییێکی لە دەست دەردەچێ کە قەت ناگەڕێتەوە بۆ لای» تەنیا ئەوە هەیە کە مەگەر کارێکی چاکە پاش ئەوە ئەنجام بدات [تا بیباتەوە سەرجێیەکەی خۆی] جا ئەگەر ئەو کارە چاکەیە بەبێ ئەو گوناحە بوایە، ڕووناکیی دڵی زیاتر دەبوو.

سێهەم: ئەبێ دڵی ڕوو بەو حەقیقەتە بێ کە بە شوێنیەوەیەتی، کە واتە ئەبێ ڕووی لە تاعەت و عیبادات بێ، پێویستە هەر وەکوو چۆن، حەزرەتی ئیبراهیمی خەلیلعليه السلام فەرموویەتی: «إِنِّي وَجَّهْتُ وَجْهِيَ لِلَّذِي فَطَرَ السَّمٰوٰاتِ وَالْأَرْضَ حَنِيفاً»[1].

واتە: «ئەمن بە دڵێکی پاکەوە ڕووم بەرەو ئەو کەسەی وا ئاسمانەکان و زەوینی دروست کردووە، وەرچەرخاند».

چوارەم: پەردە، واتە: ئەو پەردەیەی کە سەر دڵی گرتووە بەهۆی گوناح و شەهوەتەوە، یان بەهۆی عەقیدە و بڕوای هەڵەوە، کە لە منداڵییەوە فێری بووە و ئاسەوارەکەی هێشتا بەسەر دڵیەوە ماوە.

پێنجەم: ئەو لایەن و سووچە کە ئەبێ ڕووی لێ بکا، نەزانێ؛ کە وایە دەبێ ئیمانێکی گشتی و هەمەلایەنەگیری هەبێ بەوەی کە قەت دەرکی ناکات، کە بریتییە لە ئیمان بە غەیب. ئەدی مادامێ ئەم ئیمانەی نەبێ ئەدی چلۆن ئەکرێ کەوێتە شوێن شتێ کە بوون و نەبوونەکەی نازانێ. کە وابوو غەفڵەت و ناهوشیاری، بەری ئەم کارە دەگرێ.

پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: «لَوْلا أَنَّ الشَّيٰاطِينَ يَحُومُونَ عَلَىٰ قُلُوبِ بَنِي آدَمَ لَنَظَرُوا إِلَىٰ مَلَكُوتِ السَّمٰاءِ»[2].

واتە: «ئەگەر شەیتان دەوری دڵی بنیادەمی نەدایێت، ئەوە سەیری عالەمی نادیاری ئاسمانیان دەکرد».

---

١. الأنعام: ٧٩.

٢. احمد: ٨٢٨٦، بنحوه: «... هٰذِهِ الشَّيٰاطِينُ يَحُومُونَ عَلَىٰ أَعْيُنِ بَنِي آدَمَ أَنْ لا يَتَفَكَّرُوا فِي مَلَكُوتِ السَّمٰوٰاتِ وَالْأَرْضِ وَ لَوْلا ذٰلِكَ لَرَأَوْا الْعَجَائِبَ»، ابن‌ابی‌شیبة فی مصنفه: ٤٤٦/٨، جامع الکبیر للسیوطی: ١٢٧٨٤.

هەروەها پێغەمبەرصَلَّاللَّهُعَلَيۡهِوَسَلَّمَ فەرموویەتی: «كُلُّ مَوْلُودٍ يُولَدُ عَلَى الْفِطْرَةِ فَأَبَوَاهُ يُهَوِّدَانِهِ، أَوْ يُنَصِّرَانِهِ، أَوْ يُمَجِّسَانِهِ»[1].

واتە: «هەموو منداڵێ بە پاکی لە دایك ئەبێ، دوایی ئەوە باوك و دایکین دەیکەنە یەهوودی، یان مەسێحی یان زەردەشتی».

لە ئیبنی عومەرەوەرَضِيَٱللَّهُعَنۡهُمَا ریوایەت کراوە کە فەرموویەتی: وتیان بە پێغەمبەرصَلَّاللَّهُعَلَيۡهِوَسَلَّمَ، خوا لە ئاسمان و زەمیندا لەکوێیە؟ فەرمووی: «فِي قُلُوبِ عِبَادِهِ الْمُؤْمِنِينَ»[2]. واتە: «لە نێو دڵی بەندە ئیماندارەکانیدایە».

لە حەدیسی [قودسیدا] هاتووە کە خوای گەورە فەرموویەتی: «لَمْ يَسَعْنِي أَرْضِي، وَ سَمَائِي، وَ وَسِعَنِي قَلْبُ عَبْدِي الْمُؤْمِنِ»[3].

واتە: «لە زەمین و ئاسمانی خۆمدا، جێم نابێتەوە، کە چی لە دڵی بەندەی موسڵمانی خۆمدا جێم دەبێتەوە».

هەر بەم پێیە حەزرەتی عومەررَضِيَٱللَّهُعَنۡهُ فەرمووی: «رَأَىٰ قَلْبِي رَبِّي» واتە: «دڵم خوای بینیوە»، چونکە بێ‌گومان ئەو دڵی خۆی تەزکیە و خاوێن کردووەتەوە، خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿قَدْ أَفْلَحَ مَنْ زَكَّاهَا﴾[4] واتە: «هەرکەس کە دڵی خاوێن بکات، ڕزگار دەبێ».

## [پلەی ئیمان] بزانە وەرگرتن و قەبووڵ‌کردنی حەق و ڕاستی سێ پلەی هەیە:

یەکەم: ئەوەیە بەگوێ ببیسێ، ئەمەش ڕێی تێ ئەچێ کە هەڵە تێدا ڕوو بدا، وەك تەقلیدێك کە خەڵکی عەوام دەیکەن.

دووهەم: ئەوەیە کە دەنگی ئەو کەسەی کە بە دوویدا دەگەڕێ بۆ وێنە لەنێو ماڵدا ببیسێ، هەر بە پێی ئەو دەنگە بەڵگە بهێنێتەوە کە ئەو کەسە کە بە شوێنیدا دەگەڕام، ئەوەیە.

---

١. بخاری: ١٢٩٦، مسلم: ٤٨٠٣، ابوداود: ٤٠٩١، ترمذی: ٢٠٦٤ بلفظ: «أَوْ يُشَرِّكَانِهِ»، مالك في الموطأ: ٥٠٧، احمد: ٦٨٨٤ .

٢. لم نجده بهذا اللفظ لكن اخرجه الطبراني بنحوه: «إِنَّ لِلّٰهِ آنِيَةً مِنْ أَهْلِ الْأَرْضِ و آنِيَةُ رَبِّكُمْ قُلُوبُ عِبَادِهِ الصَّالِحِينَ» طبرانی فی مسند الشامیین: ٨١٧، جامع الكبير للسيوطي: ١٥٨٢.

٣. كشف الخفاء للعجلوني: ٢٢٥٦ بلفظه. لكن ورد بلفظ آخر: «إِنَّ لِلّٰهِ آنِيَةً مِنْ أَهْلِ الْأَرْضِ وَ آنِيَةُ رَبِّكُمْ قُلُوبُ عِبَادِهِ الصَّالِحِينَ أَحَبُّهَا إِلَيْهِ أَلْيَنُهَا وَ أَرَقُّهَا» طبرانی فی مسند الشامیین: ٨١٧، جامع الكبير للسيوطي: ١٥٨٢.

٤. الشمس: ٩.

سێهەم: بڕواتە ماڵەوە و بە چاوی سەر سەیری بکات و ببینێ، جا ئەمەیە مەبەستی عەلی رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ کە فەرموویەتی: «لَوْ كُشِفَ الْغِطَاءُ مَا ازْدَدْتُ يَقِيناً»[1] واتە: «ئەگەر پەردە لەنێواندا لابرێ (واتە غەیب ببینم) هیچ بە ئیمان و بڕوام زیاد نابێ». ئەم پلەش لە ئیمان، ئیمانی پێغەمبەران و سیددیقین و دۆستانی خوایە. ئەمە ئەو ئیمانەیە کە هەڵەو بێئاگایی نایێت بە دەوریدا.

بەڵام نموونەی ئەو کافر و منداڵ و شێتانەی کە ئیمان ناهێنن و مل بە حەقیقەت نادەن ئاوەهایە، کافر وەك پیاوێ چاوساغ وایە کە لە نێو تاریکیدا بێت. چونکە بەڕاستی چاو هەندێ جار تەواو و سالمە، بەڵام بەر ڕوانینی لێ گیراوە، چونکە تا تیشکی خۆر لێی نەدات و ڕۆشنی نەکاتەوە، دیتنی شت بۆ چاو مەحاڵە.

ئەدی زانیاریش هێشتا نەکەوتۆتە دڵی منداڵ و شێتەوە، ئەویش ناتوانێ شت لێك بکاتەوە، چونکە لاپەڕەی دڵی هێشتا ئامادە نەبووە کە نەقش و نیگاری قەڵەم وەرگرێ. قەڵەمیش بریتییە لەوەی کە یەکێك لە مەخلووقاتی خوا ببێتە هۆی هەڵکڕانی نیگار و نەقش لە دڵی ئەو عەبدەدا.

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ٱلَّذِي عَلَّمَ بِٱلْقَلَمِ ۝ عَلَّمَ ٱلْإِنسَٰنَ مَا لَمْ يَعْلَمْ ۝﴾.[2] واتە: «ئەو خودایەی کە بە هۆی پێنووسەوە فێری کرد، مرۆڤی فێر کرد ئەوەی کە نەیدەزانی».

پێنووسی خواش وەکوو پێنووسی خەڵك وا نییە، هەر وەکوو چۆن سیفاتی خوا وەکوو سیفاتی ئینسان وا نییە، خۆ پێنووسی ئەو لە زەل و چێو نییە، هەر وەکوو چۆن خوا خۆی لە جەوهەر و عەرەز نییە.

## بەشی چوارەم: حاڵ و چۆنیەتی دڵ بە گوێرەی بەشەکانی زانست (عەقڵی، دینی، دنیایی)

بۆت ڕوون بووەوە کە دڵ ـ واتە: هێزو لەتیفەی خودایی ـ وەکوو پاشایە، جەستەش وەکوو ڕایەت و ژێردەستەی وایە، هێزی عەقڵ و ئەندێشەش وەکوو وەزیر و ڕاسپاردەی وایە، ئاکار

١. حاشية السّندي على النّسائي: ٤٩٨٧، شرح صحيح البخاري لشمس الدّين السفيري: ٧/١٦.

٢. العلق: ٥ ـ ٤.

و سیفاتی خراپ وەکوو سەربازی ئاسایش وایە. مادامێ دڵ لەسەر جێی خۆی بێ و بتوانێ دەستوور بە وەزیر بدات و لە موڵکی خۆیدا بەپێی عەقڵ دەستتێوەردان بکات، ئەوە مانای وایە کە دڵ خاوەنی مەملەکەتە و قایم ڕاوەستاوە.

بەڵام ئەگەر شەهوەت و سیفاتی خراپ و نالەبار بێگوێیی عەقڵ بکەن، ئەمە لە حاڵەتی ئاسایی لایان داوە و لە ئەسڵی عەدالەت ترازاون.

ئێستا نموونەیێکی‌ترتان بۆ ئەهێنمەوە: ئەڵێین: دڵ ـ لەتیفە و هێزی خوایی ـ وەکوو ڕاوچییێکی سوارکار وایە، جەستەش: ئەسپەکەیە، تووڕەیی و شەهوەت: سەگەکانن، جا ئەگەر ئەسپەکەی گوێڕایەڵی بێت و سەگەڕاوکەرەکەی گوێڕایەڵی بێت، ئامانجەکەی کە ڕاوەکەیە، دێتە جێ، ئامانجی دڵیش ڕاوکردنی عیلم و زانست و بەختەوەری دواڕۆژە. بەڵام ئەگەر ئەسپەکەی سەرکەش و یاخی بێت و گوێڕایەڵی نەبێ، یان سەگەکەی دەستەمۆ و فێر نەکرابێ، نە بە کس دانی ئەچێت، نە بە قاو لێ‌کردنی دێتەوە، کە وابوو نێچیرەکەی لەدەس دەرئەچێت و ئیشەکەی زایە ئەبێ. تەنانەت ئەشترسێ لەوەی کە سەگەکەی هار بێ بە سەریدا و بیخوات جگە لەوەی هیچ ڕاوێکی بۆ نەکردووە.

## بەشی پێنجەم:
## بزانە، دڵ بە چەند شێوازی جیاواز زانیاری وەدەست ئەهێنێ

١. زانایان، بۆ بە دەستهانینی زانیاری، پێشەکی دەچنن تا بە نەتیجە و مەبەست دەگەن؛ بەڵگە دەهێننەوە تا بە مەبەست و ئامانج بگەن.

٢. پێغەمبەران، لەڕێ کەشف و ویست و ڕوونکاری خوای گەورەوە زانستیان بۆیان پەیدا دەبێ، خوای گەورە بە ئیبراهیمی خەلیلعَلَيْهِالسَّلَامُ فەرمووی: ﴿وَ كَذٰلِكَ نُرِي إِبْرَاهِيمَ مَلَكُوتَ السَّمٰوَاتِ وَالْأَرْضِ﴾[1] واتە: «هەر بەو چەشنە شتە شاراوەکانی ئاسمان و زەوینمان، پیشانی ئیبراهیم دا».

پێغەمبەرمانصَلَّى‌اللَّهُ‌عَلَيْهِ‌وَسَلَّمَ فەرموویەتی: «اَللّٰهُمَّ أَرِنَا الْأَشْيَاءَ كَمَا هِيَ» واتە: «خوایە! شتەکان هەر بەو شێوە کە هەن پێمان پیشان بدە». بۆ پێغەمبەران، حەقیقەتەکان هەر بەو شێوە کە

١. الأنعام: ٧.

وایە بەبێ بەڵگە و بورهان و پێشەکی ڕوون دەبێتەوە، ئەمەش مەبەستی خوایە کە فەرموویە ﴿مَا يَفْتَحِ اللَّهُ لِلنَّاسِ مِنْ رَحْمَةٍ فَلَا مُمْسِكَ﴾[1] واتە: «خوا ئەگەر دەرگای ڕەحمەتی خۆی ئاوەڵا بکات بۆ خەڵك، کەس نییە پێشی بگرێ» ئەم ڕەحمەت و بەرەکەتەش لە سەخاوەت و خێر و بەخششی هەتاهەتایی خواوە دەڕژێتە نێو دڵانێ کە خۆیان بدەنە بەری.

پێغەمبەر ﷺ بەمە ئاماژە دەکا کە فەرموویەتی: «إِنَّ لِرَبِّكُمْ فِي أَيَّامِ دَهْرِكُمْ نَفَحَاتٌ، أَلَا فَتَعَرَّضُوا لَهُ»[2] واتە: «بێ شك، لەسەردەمی هەرکام لە ئێوەدا، خوای گەورە، چەندین خێر و بەخششی هەیە، وریا بن ڕووی تێبکەن» جا ڕووتێکردن و خۆدانە بەر ئەم ڕەحمەتە، بریتییە لە ڕزگاری و بەختەوەری بەهۆی پاڵاوتنی نەفسەوە، خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿قَدْ أَفْلَحَ مَنْ زَكَّاهَا﴾[3] واتە: «هەرکەس نەفسی بپاڵێوێ و پوختە بکات ئەوە ڕزگار دەبێ»، پشت هەڵکردن و ڕوو وەرچەرخاندن لەو ڕەحمەتە، بەهۆی گوناح و نافەرمانییەوەیە، خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَ قَدْ خَابَ مَنْ دَسَّاهَا﴾[4] واتە: «هەرکەسێ نەفسی خۆی ناپوخت و ئالوودە کرد، ئەوە نائومێدە (لە ڕەحمەتی خوا)».

جا ئەگەر خوازیاری ڕووناکبوونەوەی دڵ و بارینی ڕەحمەت لە لایەنی بەندەوە بێ، ڕێگەی ئەوەیە کە دوعا بکات و داوای هیدایەتی و ڕێنوێنی بکات، بەڵام ئەگەر لە لایەنی خواوە بوو بە بێ ئەوەی لە لایەن بەندەوە داوا کرابێ و هۆکارێکی هەبێ، ئەو ڕەحمەتە لەلایەن خواوە لە ئاسمانەوە دەڕژێتە خوارەوە.

پێغەمبەریش ﷺ بەمە ئاماژە دەکات: «يَنْزِلُ اللَّهُ ـ تَعَالَىٰ ـ كُلَّ لَيْلَةٍ إِلَىٰ سَمَاءِ الدُّنْيَا»[5] واتە: «خوای گەورە هەموو شەوێ خێر دەبارێنێت بە سەر ئاسمانی دونیادا».

هەروەها پێغەمبەر ﷺ بەم فەرموودەیەش ئاماژە دەکات کە دەفەرمێ: «لَقَدْ طَالَ شَوْقُ الْأَبْرَارِ إِلَىٰ لِقَائِي، وَ أَنَا لَأَشَدُّ شَوْقاً» واتە: «پیاوچاکان بەردەوام تاسەباری منن، ئەمنش لەوان زیاتر تاسەبارم».

---

١. فاطر: ٢.

٢. طبرانی فی الكبير: ١٥٨٦١، سيوطی فی جامع الكبير: ١٤٧٣.

٣. الشمس: ٩.

٤. الشمس: ١٠.

٥. ابوداود: ١١٢٠ ـ ٤١٠٨، احمد: ٧٢٧٥ ـ ١٦١٤٧.

هەمدیس پێغەمبەرﷺ لە زوانی خـواوە، بە هەر دوو لایەنی كەشف و داوای كەشفكردن (التكشّف والاستكشاف)، ئاماژە دەكات، دەفەرمێ: «مَنْ تَقَرَّبَ إِلَيَّ شِبْراً تَقَرَّبْتُ إِلَيْهِ ذِرَاعاً»[1] واتە: «هەركەس بستێ لەمن نزیـك بێتەوە من گەزێ لە ئەو نزیـك ئەبمەوە».

بەكورتی، بزانە كە بەخشش و خێری خوایی، ئەیهەوێ بەبێ هیچ چەكلی و ڕژدیێ، خۆشبەختی ڕابخات بۆ خاوەن نەفسەكان، وە ئەو خێرە ئەزەلییەی خواش بۆ ئەو نەفسانەیە كە لەسەرەتاوە توانای وەرگرتنی ئەو جۆرە خێر و ڕزگاریانەیان هەبێ، پێغەمبەریشﷺ بەمە ئاماژە دەكات كە دەفەرمێ: «كُلُّ مَوْلُود يُولَدُ عَلَى الْفِطْرَةِ»[2] واتە: «هەر منداڵێ بە سرشتی پاكەوە لەدایك ئەبێ...»، هەروەها خوای گەورە دەفەرمێ ﴿فِطْرَةَ اللهِ الَّتِي فَطَرَ النَّاسَ عَلَيْهَا﴾[3] واتە: «[بمێننەوە] لەسەر ئەو سرشتەی كە خوا بنیادەمی لەسەری درووست كردووە».

هەروەها فەرمایشتی خوای گەورە: ﴿لَقَدْ خَلَقْنَا الْإِنْسَانَ فِي أَحْسَنِ تَقْوِيمٍ﴾[4] واتە: «بێ‌شك ئێمە مرۆڤمان لە جوانترین بەژندا دروست كردووە».

بەڵێ پاش ئەم حاڵەتە پاكە سروشتییە، لەنێوان ئەو دوانەدا (كەشف و داوای كەشفكردن) هەندێ شتی بەرگر و لادەر كە بریتین لە شەهوەت و هەوا و هەوەس و گوناح و سەرقاڵی دونیا. جا هەركاتێ ئەم پەردە و بەرگرانە لاچوون، كارەكە دەڕواتەوە سەر شوێنەكەی خۆی و گەورەیی و مەزنی خوا خۆی لە دڵدا دەنوێنێ و دڵ بە بەختەوەری هەتا هەتایی ئەگات. كاسە هەرچەندی لێی خاڵی بكرێ، جێی چۆڵ دەبێ بۆ شتی‌تر.

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَالرَّبَّانِيُّونَ وَالْأَحْبَارُ﴾[5] واتە: «خوداناسانی ڕاستەقینە و زانا بلیمەتەكان». واتە: «هەركەس بەم پلە بەختەوەر بێ، ئەبێتە فریشتەیێكی ڕێزدار و ئەبێتە ڕەبانی و [كەسێكی ئاسمانی لێ دەردەچێ].

حەزرەتی عەلیرضي الله عنه بەمە ئاماژە دەكات كە دەفەرمێ: «خوای گەورە لە زەمیندا كاسەیێكی هەیە، ئەویش دڵە، خۆشەویسترین بەلای خواوە نەرمترین و خاوێنترین و پتەوترینیانە،

١. بخاری: ٦٩٨٢ ـ ٦٩٨٣، مسلم: ٤٨٣٢ ـ ٤٨٥٠ ـ ٤٩٢٧، ترمذی: ٣٥٢٧، ابن‌ماجە: ٣٨١١، احمد: ٨٩٨٣ ـ ٩٢٤٤ ـ ١٠٢١٠ جمیعهم بروایات مختلفة.

٢. بخاری: ١٢٩٦، مالك فی الموطأ: ٥٠٧، مسلم: ٤٨٠٣، ابوداود: ٤٠٩١، ترمذی: ٢٠٦٤ بلفظ: «أَوْ يُشَرِّكَانِهِ»، احمد: ٦٨٨٤.

٣. الروم: ٣٠. ٤. التین: ٤. ٥. المائدة: ٤٤.

پاشان بەم شێوە ڕاڤەی کرد: پتەوترین لەدیندا خاوێنترین لە یەقیندا نەرم و نیانترین لە بەرابەر براکانیەوە»[1].

خوای گەورە بەمە ئاماژە دەکات: ﴿مَثَلُ نُورِهِ كَمِشْكَاةٍ فِيهَا مِصْبَاحٌ الْمِصْبَاحُ فِي زُجَاجَةٍ، الزُّجَاجَةُ كَأَنَّهَا كَوْكَبٌ دُرِّيٌّ﴾[2].

واتە: «ڕووناکی ئەو وەك تاقێکە چرای تێدا هەڵکرابێ، چراکە لە جامێکدا بێ، جامەکە وەك ئەستێرەیەك ترووسکەی بێ...».

ئوبەی کوڕی کەعب رَضِيَ اللهُ عَنْهُ فەرموویەتی: ئەم ڕووناکییە (کە خوا لەم ئایەتە باسی دەکات) وەکوو ڕووناکی موسڵمانەکان و دڵیان وایە، بەڵام فەرموودەی خوا: ﴿أَوْ كَظُلُمَاتٍ فِي بَحْرٍ لُجِّيٍّ﴾[3] واتە: «یان وەکوو تاریکاییەك لەنێو دەریاییێکی بێ بندا»، وەکوو دڵی مونافق و دووڕوو وایە.

زەیدی کوڕی ئەسلەم گوتوویە: فەرموودەی خوای گەورە: ﴿فِي لَوْحٍ مَحْفُوظٍ﴾[4] واتە: «تەختە و لاپەڕەیێکی پارێزاو» بریتییە لە دڵی موسڵمان.

## بەشی شەشەم: ئەو شوێنانەی کە سیفەتەکانی دڵی تێدایە

بزانە بنیادەم لە هەر بنەڕەتی سروشت و تێکەڵ بوونیدا، چوار سیفەت و تایبەتمەندی تێدایە، ئەم چوار شتە بریتییە لە: سیفەتی حەیوانی دڕندە، سیفەتی ئاژەڵ، سیفەتی شەیتان، سیفەتی خودایی:

جا لە کاتێکدا کە تووڕەیی زاڵ ئەبێ بە سەریدا، ئاکار و ڕەفتاری حەیوانی دڕندە لە خۆیەوە نیشان دەدات.

هەرکاتێ شەهوەت و هەواو هەوەس زاڵ بوو بە سەریدا، کارو ئیشی ئاژەڵ و حەیوانی نەفام ئەنجام دەدات.

---

١. لم نجد بهذ اللّفظ، لكن ورد بلفظ آخر سبق ذكره: «إِنَّ لِلّهِ آنِيَةً مِنْ أَهْلِ الْأَرْضِ وَ آنِيَةُ رَبِّكُمْ قُلُوبُ عِبَادِهِ الصَّالِحِينَ أَحَبُّهَا إِلَيْهِ أَلْيَنُهَا وَ أَرَقُّهَا» طبراني فى مسند الشّاميّين: ٨١٧، جامع الكبير للسيوطى: ١٥٨٢، و في رواية: «... فَأَحَبُّهَا إِلَى اللهِ أَرَقُّهَا وَ أَصْفَاهَا وَ أَصْلَبُهَا أَرَقُّهَا لِلْإِخْوَانِ وَ أَصْفَاهَا مِنَ الذُّنُوبِ وَ أَصْلَبُهَا» كنز العمال للهندى: ١٢٢١.

٢. النور: ٣٥. ٣. النور: ٤٠. ٤. البروج: ٢٢.

لەکاتی تێکەڵبوونی ئەم دوو سیفەتەی پێشوو و تەشەنەکردنی حەزی شەڕو تووڕەیی و زوڵم و زۆر و فڕوفێڵ، سیفەتی شەیتانی بەسەریدا زاڵ دەبێ.

بەبۆنەی ئەوەی کە لە سروشتی مرۆڤدا هێزێکی خودایی هەیە وەك خوا خۆی دەفەرمێ ﴿قُلِ الرُّوحُ مِنْ أَمْرِ رَبِّي﴾[1] ئینسان لووتی بەرز دەگرێت و داوای خوایی دەکات و مل بە هیچێ نادات، هەرچییەکیش لەگەڵ ئەم سیفەتەیدا لە زانیاری و بەزانا بوونی، جۆر بێ پێی کەیف خۆشە و هەرچێکیش لەگەڵیدا جۆر نەبێ وەکوو نەزانی و بە نەزانبوونی، پێ ناخۆشە.

جا کە ئەمەت زانی، دیسان بزانە کە خۆ خەریكکردن بە تاعەت و عیباداتەوە و بەردەوامی لە سەریان، بەو مەبەستەوە ئەنجام ئەدرێن کە نەهێڵن شتێ زاڵ بێ کە نابێ زاڵ ببێ و ئەو شتەی وا نرخی هەیە بهێڵنەوە. (بە ئومێدی خوا لەباسی ڕیازەتی نەفسدا باسی لەسەر دەکەین).

پێویستە بزانی کە ئەو زانیارییەی کە لەدڵدا پێك دێ، ئەگەر لە ڕێی ئاساییەوە بێت، ئەوە بریتییە لە ڕێبازی زانایان، بەڵام ئەگەر ئاوەها نەبێ ئەوە ڕێبازی سۆفییانە، کە بەهۆی کەشف و دیتنی شتەکان بە چاوی دڵ بەدەست دێ، ئەمەش خۆی دوو بەشە:

یەکەم: ئیلهام و وەحی کە بریتییە لە «النَّفْثُ فِي الرَّوْعِ»، کە پێغەمبەرﷺ ئاماژەی پێ دەکات: «إِنَّ رُوحَ الْقُدُسِ نَفَثَ فِي رَوْعِي[2]، أَحْبِبْ مَنْ شِئْتَ فَإِنَّكَ مُفارِقُهُ، وَ اعْمَلْ ما شِئْتَ، فَإِنَّكَ مَجْزِ بِهِ، وَعِشْ ما شِئْتَ، فَإِنَّكَ مَيِّتٌ»[3].

واتە: «ڕووحولقودووس (جوبرەئیل) خستیە دڵمەوە (واتە: وەحی بۆم هێنا) کە: هەرکەس کە مەیلت هەیە، خۆشت بوێ، چونکە بێشك لێی جیا ئەبیتەوە هەروەها هەرچی کە کەیفت هەیە بیکە، چونکە بێشك لەسەری جەزا دەدریتەوە، هەروەها بەو شێوە وا دەتەوێ بژی، چونکە بێگومان دەمریت».

دووهەم: ئەمەش هەر لە ئیلهام دێتە ئەژمار، بەم شێوەیە کە حەقیقەت و ڕاستەقینەی شتەکانی بۆ ڕوون دەکرێتەوە و ئەو فریشتە ئیلهامهێنەرەی کە وەحی لێ وەردەگرێ بە چاوی سەر دەبینێ.

---

١. الإسراء: ٨٥.

٢. طبرانی فی الکبیر: ٧٥٩٤، بیهقی فی شعب الإیمان: ١١٤١، بزّار فی مسنده: ٢٩١٤، الامام الشّافعی فی مسنده: ١٠٧٧، ابن‌ابی‌شیبة فی مصنّفه: ١٢٩/٨ جمیعهم بروایات مختلفة.

٣. بیهقی فی شعب الإیمان: ١٠٠٥٨، حاکم فی المستدرك: ٨٠٣٨، طبرانی فی الأوسط: ٧٠٥ بروایات مختلفة.

جا بزانە کاتێ دڵ وەکوو ئاوێنەی ڕۆشنی خاوێنکراو وابێ ـ پێشتریش زانیت کە حەقیقەتی شتەکان لە «لوح‌المحفوظ»دا نیکاریان کێشراوە ـ جا هەرکاتێ پەردە لەنێواندا لابچێت و ئاوێنەی دڵ لە بەرانبەری «لوح‌المحفوظ»وە بوەستێ، ئەوە حەقیقەتی شتەکان دەردەکەون وپەردە لە نێواندا نامێنێ. جارێك لە خەوندا و جارێك لە بێداریدا، ئەمە حاڵەتی ئاسایی سۆفییانە. بەڵام جاری واش هەیە بە هەڵکردنی بای لوتف و بەزەیی خوا، بەبێ هیچ هۆکارێك لە لایەن بەندەوە و بەبێ هیچ ئامادەبییەك، ترووسکەیێ لە زانیاریگەلێکی عەجیب و سەیر، لەپشتی پەردەی غەیبەوە دەدا بە ناو دڵی ئینساندا.

ڕوونبوونەوەی ئەم زانیارییە نهێنییانە بە مردن بە ئاخر دەگات و بە تەواوی پەردەی لەسەر لادەدرێ، پێغەمبەرصَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بەمە ئاماژە دەکات کە دەفەرمێ: «اَلنَّاسُ نِيَامٌ إِذَا مَاتُوا انْتَبَهُوا»[1] واتە: «مرۆڤ خەوتوون، هەرکاتێ بمرن، بێدار دەبنەوە».

پاڵاوتن و تەزکیەی سۆفیانە، لە مەرگەوە نزیکە، بەمبۆنەوە خۆیان بە خوێندنەوە خەریك ناکەن، بەڵکوو خەریکی تەزکیەی و خاوێنکاری دڵن و هەموو پەیوەندییێك دەبڕن، تا ببێتە هۆی ئەوەی بە تەواوی ڕوو بکەنە خوای گەورە و مەزن و پاشان کارەکانیان بسپێرنە دەستی ئەو، چونکە خودا ئاگادارترە و زاناترە کە چ شتێ بخاتە دڵیانەوە و دڵیان بە چی ڕووناك بکاتەوە، ئەمەش ڕێبازی پێغەمبەران و دۆستانی خودایە، چونکە ئەوان بە خوێندن و فێربوون عیلم بە دەست ناهێنن، بەڵکوو خەزێنە ئەدۆزنەوە و نیازێکیان بە هەوڵ و تەقالا نییە.

نموونەی زانیاری ئاسایی کە لەڕێی هەوڵ و کۆششەوە بەدەست دێ و لەگەڵ ئەو ڕێبازەی ئەواندا وەکوو، خەزێنە و کیمیاگەری وایە[2]. جا ئەبێ هۆشیار بی هەوڵ و تێکۆشان بەجێ نەهێڵی، مادامێ خەزێنەت نەدۆزیوەتەوە، چونکە لە بەین دەچی.

## جیاوازی نێوان ڕێبازی و خوێندنی ئاسایی لەگەڵ ڕێبازی سۆفیاندا:

بزانە دڵ دوو دەرگای هەیە، یەکیان بەرەو دنیای زاهیری دەکرێتەوە، ئەوی‌کەیان بەرەو دنیای غەیب و نهێنی. ڕاستی و دروستی ئەم بۆچوونە بە ڕامان لە دیاردەی خەودا دەردەکەوێ،

---

١. سیوطی فی الدّرر المنتثرة: ٢٠/١، العجلونی فی کشف الخفاء: ٢٧٩٥، جمیعهم قالوا: هو من کلام علیرَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ.

٢. واتە: هەوڵ و تێکۆشان وەکوو کیماگەری وایە بۆ بە دەستهێنانی زێڕ؛ بەڵام ڕێبازی پێغەمبەران و پیاوچاکان وەکوو دۆزینەوەی خەزێنەی زێڕ وایە ـ وەرگێڕ.

ئەتۆ شتانێ سەیر و سەمەرەت بۆ دەردەکەوێ و غەیبت بۆ ئاشکرا دەبێت و شتانێ دەبینی کە لە عالەمی بێداریدا پاش تێپەڕینی ماوەیێکی دوور و درێژ دەیانبینی. ئەم دەرگایەش تەنها بەڕووی پێغەمبەران و دۆستانی خوادا دەکرێتەوە. ئەمەش تایبەتی کەسانێکە وا دڵیان پاك و خاوێنە لە غەیری خوای مەزن، و سەرتاپا ڕووی لە خوا کردووە. پێغەمبەریش ﷺ بەم حاڵەتە ئاماژە دەکات و دەفەرمێ:

«سَبَقَ الْمُفَرِّدُونَ. قِيلَ: وَ مَنْ هُمْ يٰا رَسُولَ الله، قٰالَ: الْمُجْتَهِدُونَ بِذِكْرِ اللهِ، وَضَعَ الذِّكْرُ عَنْهُمْ أَوْزٰارَهُمْ، فَوَرَدُوا الْقِيٰامَةَ خِفٰافاً»[1]. ثُمَّ قٰالَ فِي وَصْفِهِمْ [إخبارا عن الله تعالى]: «أُقبِلُ عَلَيْهِمْ بِوَجْهِي، أَتَرَىٰ أَنَّ مَنْ وٰاجَهْتُهُ بِوَجْهِي يَعْلَمُ أَحَدٌ أَيُّ شَيْءٍ أُرِيدُ أَنْ أُعْطِيَهُ؟» ـ ثُمَّ قٰالَ: «أَوَّلُ مٰا أُعْطِيَهُمْ أَنْ أَقْذِفَ مِنْ نُورِي فِي قُلُوبِهِمْ فَيُخبِرُونَ عَنِّي كَمٰا أُخْبِرُ عَنْهُمْ».

واتە: «خەڵوەتنشینان پێشکەوتن. پرسیار کرا لە پێغەمبەر ﷺ: ئەوانە کێن ئەی پێغەمبەری خوا! فەرمووی: ئەوانەن وا بەردەوام بۆ یادی خوا تێ دەکۆشن، یاد و زیکری خواش باری لەسەر شانیان داگرتووە. ئیدی لە ڕۆژی قیامەتدا بە سووکی دێن بۆ ئەوێ».

پاشان پێغەمبەر ﷺ لەبارەیانەوە [لە زمانی خواوە] فەرمووی: «ئەمن خۆم ڕوویان تێ دەکەم، جا دەزانن ئەگەر کەسێك من ڕووی تێبکەم، کەس دەزانێ ئەمن ئەمەوێ چی پێ بدەم؟ پاشان خوا فەرمووی: هەوەڵ شتێ کە من بیادەمێ ئەوەیە کە لە ڕووناکی خۆم دەڕژێنمە ناو دڵیانەوە، ئیدی ئەوان لە منەوە خەبەر ئەدەن هەر وەك چۆن من لەوانەوە خەبەر دەدەم».

کەوابوو ڕێی چوونە ناوی ئەم عالەمە، تەنها دەروازەی دڵە کە بەرەو عالەمی غەیب و نهێنی ئاوەڵا دەبێت، کە عالەمی خودایە.

هەندێ لە خواناسان گوتوویانە: لە دڵەوە دەلاقەیەك هەیە بەرەو غەیب.

ئێستاش جیاوازی نێوان خوێندن و تەسەووف بە نموونەیێ لە چیرۆکێکدا ڕوون دەکەینەوە:

ئەگێڕنەوە کە خەڵکی چین و خەڵکی ڕۆم، لە بەردەم یەکێ لە پاشاکانیاندا، بە جوانیی نەقش و نیگاریانەوە دەنازین و خۆیان دەبردە پێشەوە. پاش ماوەیێ پاشا هاتە سەر ئەوەی کە گەڵاڵەیێکیان (طرح) پێ بدا کە هەرکامیان لایێکی بکێشن. خەڵکی چین لەلایەکەوە،

---

١. مسلم: ٤٨٣٤ بلفظ: «... قِيلَ: وَ مَا الْمُفَرِّدُونَ يٰا رَسُولَ اللهِ؟ قٰالَ: الذّٰاكِرُونَ اللهَ كَثِيراً وَالذّٰاكِرٰاتُ»، ترمذی: ٣٥٢٠ بلفظ: «... قٰالَ: الْمُسْتَهْتَرُونَ فِي ذِكْرِ اللهِ يَضَعُ عَنْهُمُ الذِّكْرُ أَثْقٰالَهُمْ فَيَأْتُونَ يَوْمَ الْقِيٰامَةِ خِفٰافاً»، احمد: ٧٩٤٠ ـ ٨٩٦٤.

خەڵکی ڕۆمیش لەلایەکەی‌ترەوە، پەردەیەکیش بخرێتە نێوانیان تا ئەم لاچاویان بەولاوە نەبێ. پاشان وایان کرد، خەڵکی ڕۆم ڕەنگ و ڕەوغەنێ عەجایبات و سەیریان هێنا. بەڵام خەڵکی چین هیچێ ڕەنگ و ڕۆغەنیان لەگەڵدا نەبوو، هاتن لایەنەکەی خۆیان دەکڕاند و دەیان‌سوی و بریقەیان تێدەخست. جا کاتێ کە خەڵکی ڕۆم دەستیان کێشاوە و تەواویان کرد هاوکات خەڵکی چینیش گوتیان تەواومان کرد. پاشا سەری سووڕما لێیان و گوتی: چلۆن تەواوتان کردووە، خۆ هیچێ ڕەنگتان لەگەڵ خۆتان نەبردووە. وڵامیان داوە ئێوە کارتان بەسەر ئەوەوە چییە، پەردە لا بدەن و سەیر بکەن. پەردەیان لادا، دیتیان کە لە لای چینیەکانەوە هەر ئەو نەقش و نیگارەی ڕۆمییەکان دەدرۆشێتەوە، وێڕای بریقە و ترووسکەی کە هی ئەوان نەیبوو، وەکوو ئاوێنەیێ کە زۆر خاوێن و پاك کرابێتەوە دەدرۆشایەوە چونکە ئەوان خەریکی کڕاندن و سوان و بریقەدارکردن بوون، بەڵام ڕۆمییەکان بەس نیگاریان کێشا بوو[1].

کە وابوو، سۆفی و ئەهلی عیرفان خەریکی سواقدان و بریقەدارکردنن و ئەهلی زانستیش، نیگارکێشی دەکەن، ئیتر بەم‌بۆنەوە زۆر بۆیان ڕوون نابێتەوە، بەڵام سۆفییەکان شتانێ زۆرتریان دەست دەکەوێ و بۆیان ڕوون دەبێتەوە، کە بە زۆری عیلم و زانیاری دەست ناکەون، پێغەمبەریش ﷺ بەمە ئاماژە دەکات «مٰالا عَيْنٌ رَأَتْ، وَلا أُذُنٌ سَمِعَتْ، وَلا خَطَرَ عَلَىٰ قَلْبِ بَشَرٍ»[2].

هەروەها خوای گەورە لە حەدیسی ڕابوردوودا بە فەرموودەی خۆی ئاماژەی پێ کرد: «أَيَعلَمُ أَحَدٌ إِذٰا وٰاجَهْتُهُ بوَجْهِي أَيَّ شَيْءٍ أُرِيدُ أَنْ أُعْطِيَهُ» ئەمەش مەبەست ئەو ژیانەیە کە خودا فەرموویەتی: ﴿إِذٰا دَعٰاكُمْ لِمٰا يُحيِيكُمْ﴾[3] واتە: «هەرکاتێ بانگهێشتان بکات بۆ شتێ کە زیندووتان بکاتەوە» ئەدی پاش ئەو ژیانە دڵ قەت نامرێ.

حەسەنی بەسری رَحِمَهُ اللَّهُ فەرموویەتی: «خاك، ئەو جێگەیەی کە ئیمانی تێدا بێ (دڵ) ناخوات» کە وابوو بۆ هەرکەسێ بە ئەندازەی پلە و پایەی خۆی، پاداش هەیە.

مرۆڤی موسڵمان بە ئەندازەی ڕووناکی دڵی خۆی بە شوێنی گەیشتن بە خوای مەزندا وێڵە.

---

١. ئەم چیرۆکە لەبەر ئەوەی هەندێ ناکۆکی تێدابوو، لە ڕووی ئیحیاوە تۆزێ دەسکاریمان کرد ـ وەرگێڕ.

٢. بخاری: ٣٠٠٥ ـ ٤٤٠٧، مسلم: ٥٠٥٠ ـ ٥٠٥٣، ترمذی: ٣١٢١ ـ ٣٢١٤، ابن‌ماجه: ٤٣١٩، احمد: ٧٧٩٦ ـ ٩٦٣٦.

٣. الأنفال: ٢٤.

پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «إِنَّ بَعْضَهُمْ يُعْطِي نُوراً مِثْلَ الْجَبَلِ وَ بَعْضُهُمْ يُعْطِي أَصْغَرَ حَتَّىٰ يَكُونَ آخِرُهُمْ رَجُلاً يُعْطِي نُورَهُ عَلَىٰ إِبْهَامِ قَدَمَيْهِ فَيُضِيءُ مَرَّةً، و يَطْفَأُ مَرَّةً، فَإِذٰا أَضٰاءَ قَدَّمَ قَدَمَيْهِ، فَمَشَىٰ، وَ إِذٰا طُفِيءَ أَقٰامَ. و مُرُورُهُمْ عَلَى الصِّرٰاطِ عَلَىٰ قَدَرِ نُورِهِمْ، فَمِنْهُمْ مَنْ يَمُرُّ كَطَرْفِ الْعَيْنِ، و مِنْهُمْ مَنْ يَمُرُّ كَالْبَرْقِ، و مِنْهُم كَالسَّحٰابِ، و مِنْهُمْ كَانْقِضٰاضِ الْكَوْكَبِ، و مِنْهُمْ مَنْ يَمُرُّ كَشَدِّ الْفَرَسِ، وَ الَّذِي أُعْطِيَ نُورٌ عَلَىٰ إِبْهٰامِهِ يَحْبُو عَلَىٰ وَجْهِهِ، و يَدَيْهِ، و رِجْلَيْهِ، يَجُرُّ يَدٰا، و يَتَعَلَّقُ بِأُخْرَىٰ و يجُرُّ رِجْلاً، وَ يَتَعَلَّقُ بِأُخْرَىٰ، و تُصِيبُ جَوٰانِبَهُ النَّارُ، فَلا يَزٰالُ كَذٰلِكَ حَتَّىٰ يَخْلِصَ»[1].

«بێشك هەندێکیان تیشکێکیان پێ ئەدرێ بە قەدەر کێوێ، هەندێکیان بچووکتر هەتا هێندە بچووك ئەبێتەوە دواینەکەیان بەشە تیشکەکەی بەسەر پەنجە گەورەی پێیەکانیەوەیەتی، ئەویش، جارێ دەگرێ و جارێ دەکوژێتە، جا هەر کاتێ کە داگیرسا هەنگاوێ دەنێ، هەر کاتێکیش کوژایەوە ڕادەوەستێ. کەواتە ڕۆیشتنیان بەسەر پردی سیراتەوە بە ئەندازەی تیشکەکانیانە، هەندێکیان بە قەدەر چاو ترووکانێ دەخایێنێ تێدەپەڕن، هەندێکیان وەکوو بەرق دەپەڕێنەوە، هەندێکیان وەکوو ئەسپی توندڕەو دەپەڕینەوە، ئەوەی وا تیشکەکەی بەسەر پەنجەی پێیەوەیەتی، بەسەر دەم و دەست و پێیەوە کەوتووە، دەستێکی دەکێشێ و بەوی‌تریان خۆی دەگرێتەوە، پێیەکی دەکێشێ، بەوتریان خۆی دەگرێتەوە، پاڵووەکانیشی ئاگرەکە دەیانگرێ، بەم شێوە درێژەی پێ دەدا تا دەپەڕێتەوە»).

هەر ئابەم شێوە پلەو دەرەجەکانی ئیمان جیاوازی هەیە.

پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «لَوْ وُزِنَ إِيمٰانُ أَبِيبَكْرٍ بِإِيمٰانِ الْعٰالَمِ سِوَى النَّبِيِّينَ لَرَجَحَ»[2] واتە: «ئەگەر ئیمانی ئەبووبەکر بە ئیمانی تەواوی دونیا ـ جگە لە پێغەمبەران ـ کێشانە بکرێ، سەر ئەکەوێ و قورسترە».

ئەمە هەر وەکوو قسەی کەسێکە کە بڵێ: ئەگەر تیشکی خۆر لەگەڵ تیشکی هەرچی چرایە، ئەندازە بگیررێ، تیشکی خۆر زیاترە».

---

١. طبرانی فی الکبیر: ٩٦٤٧ فی حدیث طویل: «... فَيُعْطِيهِمْ نُورَهُمْ عَلَىٰ قَدْرِ أَعْمٰالِهِمْ... فَيَمُرُّونَ عَلَىٰ قَدْرِ نُورِهِمْ... و مِنْهُمْ يَمُرُّ كَالْبَرْقِ...».

٢. بیهقی فی شعب الإیمان: ٣٥ بلفظ: «... بِإِيمٰانِ أَهْلِ الْأَرْضِ لَرَجَحَ بِهِمْ».

کە وابوو، ئیمانی خەڵك هەر هەموو وەکوو چرا و شەم وایە، ئیمانی دۆستانی خوا وەکوو تیشکی مانگ و ئەستێرە وایە، ئیمانی پێغەمبەران وەکوو تیشکی خۆر وایە.

## بەشی حەوتەم: بەڵگەی شەرعی لەسەر ڕاستی ڕێبازی سۆفیەتی

ئەبوودەرداڕَضِيَ اللهُ عَنْهُ فەرموویەتی: «موسڵمان لە پشتی پەردەیێکی ناسك و تەنکەوە دەڕوانێ، سوێند بە خوا، خوا خۆی فەرموودەکانی خۆی دەخاتە دڵیانەوە و زمانیان لەسەر قسە دەچەرخێنێ».

پێغەمبەرصَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فەرموویەتی: «اتَّقُوا فِرَاسَةَ الْمُؤْمِنِ فَإِنَّهُ يَنْظُرُ بِنُورِ اللهِ»[1]. واتە: «لە زیرەکی موسڵمانی ئیماندار بترسن، چونکە بە تیشکی خوا دەڕوانێ».

هەروەها پێغەمبەری خواصَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فەرموویەتی: «إِنَّ مِنْ أُمَّتِي مُحَدِّثِينَ و مُكَلَّمِينَ، وَ إِنَّ عُمَرَ مِنْهُمْ»[2]. «واتە: لەنێو ئوممەتی مندا کەسانێك هەن کە [لە لایەن خواوە] هەواڵ دەدەن و قسە دەکەن، عومەر یەکێکە لەوانە».

ئیبنوعەبباسرَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا ئەم ئایەتەی ئاوەها ڕیوایەت کردووە: «وَ مَا أَرْسَلْنَا مِنْ قَبْلِكَ مِنْ رَسُولٍ وَلا نَبِيٍّ وَلا مُحَدِّثٍ»[3]. مەبەستی لە «مُحدّث» سیدیقین بووە، [واتە: کەسێك وا لە لایەن خواوە ئیلهامی بۆ ئەکرێ].

حەدیس و ڕیوایەت لەمبارەوە زۆرە و لە ئەژماردن بەدەرە.

## بەشی هەشتەم:
## باسی ئەو درگایانە دەکات کە شەیتان لێیانەوە دەڕواتە ناو دڵ

بزانە دڵ دەروازەیێکی هەیە کە شەیتان لەوێوە دەڕواتە ناوی، لە بەرانبەر ئەو دەروازەوە کە بەرەو عالەمی غەیب ئاوەڵا ئەبێ. هەر وەك چۆن پاشا دەستەو دایەرەی هەیە، شەیتانیش

١. ترمذی: ٣٠٥٢، طبرانی فی الکبیر: ٧٣٦٩.

٢. بخاری: ٣٤١٣ بلفظ: «لَقَدْ كَانَ فِيمَا قَبْلَكُمْ مِنَ الْأُمَمِ مُحَدَّثُونَ فَإِنْ يَكُ فِي أُمَّتِي أَحَدٌ فَإِنَّهُ عُمَرُ»، ترمذی: ٣٦٢٦، مسلم: ٤٤١١ بلفظ آخر فیه: «...فَإِنَّ عُمَرَ بنَ الْخَطَّابِ مِنْهُمْ».

٣. تفسیر الآلوسی فی تفسیر سورة الحج: ٥٥، فتح القدیر للشوکانی فی تفسیر سورة الحج: ٥٢، و کذا تفسیر جامع الأحکام للقرطبی حج: ٥٢ و الدّرّ المنثور للسیوطی حج: ٥٢، الإعتقاد للبیهقی ٢٨٩ و قال: «قراءة أبیّ بن کعب».

دەستە و دایەرەی هەیە.[١]

ڕەوشت و ئاکاری خراپ، دەبنە ڕۆچنە و شەیتان لێیانەوە دەڕواتە ناو دڵ، هەر بە ئەندازەی سڕینەوەی ئەو ڕەوشت و ئاکارە خراپە، کون و ڕۆچنەی هاتنی شەیتان تەنگ دەبێتەوە یان، ئەبەسترێ، هەروەها بە ئەندازەی گوێنەدان بە گوناح، ئەو دەرگاو ڕێگایانە بۆ شەیتان گەورەتر ئەبێتەوە. ئەتۆش کەیفی خۆتە ئەم دەرگا و ڕۆچنانە دابخەی و دڵت بکەیتە جێی زانین و حیکمەت و جێی هاتنەخواری فریشتەکان، یان بەرهەڵدای بکەیت و دڵت ببێتە هێلانەی شەیتان.

تەواوی ئەو باسانەی کە لێرەو دوا دێت باسی چۆن لابردن و لەناوبردنی شەهوەت و چۆن چۆڵکردنی دڵ لە هەواو هەوەس دەکات.

والله أعلم بالصواب

١. «إِنَّ لِلشَّيْطَانِ لَمَّةً بِابْنِ آدَمَ وَ لِلْمَلَكِ لَمَّةً ...» ترمذی: ٢٩١٤، نسائی فی السّنن الکبری: ١١٠٥١، بیهقی فی شعب الإیمان: ٤١٨٧، ابن‌حبان فی صحیحه: ١٠٠٢، ابن‌الأثیر فی جامع الأصول: ٥٢٨.

# بابەتی بیست و دووهەم: ڕیازەت و ڕاهێنانی نەفس

پێغەمبەرصَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فەرموویەتی: «رَجَعْنا مِنَ الْجِهادِ الْأَصْغَرِ إِلَى الْجِهادِ الْأَكْبَرِ»[1]. واتە: «ئێمە لە جیهادی بچووك گەڕاینەوە بۆ جیهادی گەورە».

پێویستە بزانی کە نەفس هەندێ پیسی و پەستی و خراپەی هەیە کە پێویستە لەوانە پاك و خاوێن بکرێتەوە، بەمەش بەختەوەر و ڕزگار دەبێت و دەگاتە خزمەتی خوای مەزن.

## بەشی یەکەم: ڕوونکردنەوەیەك لەسەر خۆشخولقی و بەدخولقی

پێغەمبەرصَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فەرموویەتی: «إِنَّ حُسْنَ الخُلُقِ يُذِيبُ الْخَطِيئَةَ، كَما تُذيبُ الشَّمْسُ الْجَلِيدَ»[2]. واتە: «بێ‌گومان ئەخلاقی جوان و لەبار، گوناح دەتوێنێتەوە، هەر وەك چۆن خۆر سەهۆڵ دەتوێنێتەوە».

عەبدوڕڕەحمانی کوڕی سەمرە دەفەرمێ: ئێمە لە خزمەتی پێغەمبەری خواداصَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بووین فەرمووی: «إِنِّي رَأَيْتُ الْبارِحَةَ عَجَباً، رَأَيْتُ رَجُلاً مِنْ أُمَّتِي جاثِياً عَلَى رُكْبَتَيْهِ بَيْنَهُ وَ بَيْنَ اللهِ حِجابٌ، فَجاءَ حُسْنُ الْخُلُقِ فَأَدْخَلَهُ عَلَى اللهِ تَعالَى»[3].

واتە: «دوێنێ‌شەو شتێکی سەیرم دیت، پیاوێك لە ئوممەتی خۆم بینی کە لەسەر دوو چۆك دانیشتبوو، لە نێوان ئەو و خودادا پەردەیێك هەبوو، پاشان خۆش‌خولقی هات و ئەوی بردە لای خوا».

---

1. کشف الخفاء للعجلوني: ١٣٦٢، سیوطی فی جامع الکبیر: ٢٨٠، بیهقی فی الزّهد الکبیر: ٣٨٤ بلفظ: «قَدِمْتُمْ خَيْرَ مَقْدِمٍ مِنَ الْجِهادِ الْأَصْغَرِ...».
2. بیهقی فی شعب الإیمان: ٧٦٧٤.
3. مکارم الأخلاق للخراطی: ٤٩.

ئەڵێن: فڵانە کەس «خَلْق و خُلق»ی جوانە واتە: هەم ڕوومەت و ڕواڵەتی جوانە، هەم دڵ و دەروونی. جوانی و لەباریی ڕواڵەت بریتییە لە جەماڵ و جوانی ـ هەر وەك خۆت ئاگاداری ـ جوانی دڵ و دەروونیش بریتییە لە زاڵبوونی ئاکاری جوان بە سەر ئاکاری نالەبار و خراپدا جیاوازی لە بەشی دەروونیدا زۆرترە لە جیاوازی لە بەشی ڕواڵەتیدا، خوای مەزن بەمە ئاماژە دەکات و دەفەرمێ: ﴿إِنِّي خَالِقٌ بَشَراً مِنْ طِينٍ ۝٧١ فَإِذَا سَوَّيْتُهُ و نَفَخْتُ فِيهِ مِنْ رُوحِي﴾[1].

واتە: «ئەمن مرۆڤێ لە قوڕ خەلق دەکەم، جا ئەو کاتە کە شێوەکەیم ڕێك خست و لە ڕۆحی خۆم کردە بەری...»، خوای مەزن لەم ئایەتەدا بەوە ئاماژە دەکات کە نیگاری زاهیری مرۆڤ لە خاکە و نیگاری دەروونی لە عالەمی غەیب و ڕۆحی خۆیە.

جا ئێمە لێرەدا مەبەستمان بە ئەخلاقی جوان، بەشە دەروونییەکەیە، کە هەر بەو ئەندازەی کە ئاکار و ڕەوشتی خراپ دەتوێتەوە و لەناو دەچێ، ئاکاری جوان و لەبار جێ دەگرێتەوە. ئەمەش مەبەستە لە ئەخلاقی جوان.

سەرترین پلەی ئەخلاق و ڕەوشتی جوان هی پێغەمبەرەﷺ چونکە ئەو لەمبارەوە بە پلەی کەماڵ و تەواو گەیشتووە. خۆی فەرموویەتی: «حَسِّنُوا أَخْلاقَكُمْ»[2] واتە: «ئاکارتان جوان بکەن»، پێغەمبەرﷺ لەم حەدیسەدا داکۆکی دەدات کە ئەخلاق هەڵگری ئەوەیە گۆڕانکاری بەسەردا بێت و مرۆڤ کاریگەری و دەستتێوەردانی تێدا هەبێ. کە وایە پێویستە تێبکۆشی بۆ ئەوەی دەست بەسەر تووڕەیی و شەهوەت و سکدا بگری.

تەواوی ئەم کارانە ئەبێ بەپێی شەرع بێت، جا ئەگەر ئاوەهات کرد، ئەوە بە مەبەست گەیشتووی، ئەمەش تەنها بە هەوڵ و تێکۆشان و بە خۆڕاگری و تاقەتگرتن لەسەر ئەو شتانەی کە پێت ناخۆشە و لە سەرشانت سەختە، تا پاش ئەوە خووی پێوە بگری.

---

١. ص: ٧٢ ـ ٧١.

٢. لم نعثر على عين لفظ هذا الحديث، لكن ورد فی كتب الحديث أحاديث بهذا المعنى تقريبا منها ما ورد فی المعجم الكبير: «أَوْحَى اللهُ إِلَىٰ إِبْرٰاهِيمَ: يٰا خَلِيلِي، حَسِّنْ خُلُقَكَ وَ لَوْ مَعَ الْكٰافِرِ تَدْخُلُ مَدْخَلَ الْأَبْرٰارِ...» طبرانی فی الكبير: ١١١٥. و كذا ورد فی هذا المعنى أحاديث كثيرة منها: «مٰا شَيْءٌ أَثْقَلَ فِي مِيزٰانِ الْمُؤْمِنِ مِنْ خُلُقٍ حَسَنٍ...» ترمذی: ١٩٢٥، و قالﷺ: «إِنَّ مِنْ خِيٰارِكُمْ أَحٰاسِنُكُمْ أَخْلاقاً» بخاری: ٥٥٧٥، مسلم: ٤٢٨٥، ترمذی: ١٨٩٨، احمد: ٩٦٤٠، و قالﷺ: «...مِنْ أَحَبِّكُمْ إِلَيَّ وَ أَقْرَبِكُمْ مِنِّي مَجْلِساً يَوْمَ الْقِيٰامَةِ أَحٰاسِنُكُمْ أَخْلاقاً» ترمذی: ١٩٤١، و قالﷺ: «خَيْرُكُمْ فِي الْإِسْلامِ أَحٰاسِنُكُمْ أَخْلاقاً إِذٰا فَقِهُوا» احمد: ٩٨٤٢.

پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «اَلْخَيْرُ عٰادَةٌ»[1] واتە: «چاکەکردن بە خوو و عادەتە». واتە ئەگەر کەسێ بە سروشت و تەبیعەت دەس‌کراوە و سەخی نەبێ ئەتوانێ خووی پێوە بگرێ و بە زۆر خۆی سەخی بکات. هەروەها ئەگەر مرۆڤێ خۆ بەکەمزان و خاکی نەبوو، دەتوانێ خووی پێوە بگرێ و خۆی بەو سیفەتە عادەت بدات. ئەخلاقەکانی‌تریش ئاوەهان، دەتوانێ بە بەکارهێنانی دژەکەی چارەسەریان بکات، تا جێگەیێ کە بە مەبەستی خۆی دەگات. بەردەوامبوون لەسەر تاعات و عیبادات و بەرهەڵستی‌کردن لەگەڵ شەهوەت و هەوا و هەوەس ڕواڵەتی دەروونی ئینسان چاك دەکەن و ئەبنە هۆی خووگرتن بەخوای مەزنەوە.

پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «اُعْبُدِ اللّٰهَ فِي الرِّضٰا، فَإِنْ لَمْ تَسْتَطِعْ فَفِي الصَّبْرِ عَلَىٰ مٰا تَكْرَهُ خَيْرٌ كَثِيرٌ»[2]،

واتە: «بە ئەوپەڕی دڵخۆشییەوە، عیبادەت بۆ خودا بکە، جا ئەگەر نەتتوانی [تاقەت بگرە] چونکە لە تاقەتگرتن لەسەر ئەو شتەی کە پێت سەخت و ناخۆشە، خێری زۆر هەیە».

سەرەتا تاقەت بگرە تا خۆت بەو کارە دڵخۆش و ڕازی دەبیت، چونکە سروشتی ئینسان لەسەر جوانی و لەباری دەروون «واتە ئاکار چاکی» پێك هاتووە، پێغەمبەرﷺ بەمە ئاماژە دەکات و دەفەرمێ: «اَلْحَسَنَةُ بِعَشْرِ أَمْثٰالِهٰا»[3] واتە: «هەر چاکەیێك دە بەرانبەری خۆی پاداشتی هەیە»، چونکە چاکەکردن لەگەڵ سروشتی مرۆڤدا کۆکە.

## [بەشی دووهەم:] بەرەو پاڵاوتنی ئاکارو ڕەوشت:

پێشتر زانیمان کە چارەسەری نەخۆشی جەستە لەوەدایە کە بە دژەکەی بەرانبەری لەگەڵدا بکرێ، ئەدی نەخۆشی دەروونیش هەر ئاوەهایە. ئەمەش بەپێی کەسەکان دەگۆڕێ، چونکە تەبیعەتەکان جیاوازن.

پیر و شێخی [ڕاستەقینە] لەناو هۆزەکەیدا، وەکوو پێغەمبەر وایە لەناو ئوممەتەکەیدا، ئەو [پیرە دەست گیرە] سەیری حاڵ و بارودۆخی موریدەکەی دەکات و دەزانێ چ سیفەتێ زاڵە

1. ابن‌ماجە: ٢١٧، بیهقی فی السّنن الکبری: ٨٤/٣، طبرانی فی الکبیر: ١٦٢٦٩.
2. بیهقی فی شعب الإیمان: ٩٥٢٨، حاکم فی المستدرك: ٦٣٦٤، ابن‌الأثیر فی جامع الأصول: ٩٣١٥، بلفظ: «... فَإِنِ اسْتَطَعْتَ أَنْ تَعْمَلَ لِلّٰهِ بِالرِّضٰا وَالْيَقِينِ فَافْعَلْ، وَإِنْ لَمْ تَسْتَطِعْ فَإِنَّ في الصَّبْرِ عَلَىٰ مٰا تَكْرَهُ خَيْراً كَثِيراً».
3. بخاری: ١٨٤٠ـ٣١٦٥، مسلم: ١٩٦٢، ابوداود: ٢٩٠، نسائی: ٢٣٥١، ابن‌ماجە: ١٦٢٨ـ٣٨١٣، احمد: ٦٨٩٧ـ١٠٢٧٣.

بە سەریدا و بەچی پێویستە دەرمان بکرێ، لەپێشدا سەرگەرمی بکات بە نوێژ و تاعەت و بە خاوێن ڕاگرتنی پۆشاك و بە بەردەوامبوون لەسەر سەڵەوات و زیکری خوای مەزن، لە خەڵوەت و چۆڵاییدا، ئا بەم ڕەوشتە ئەو عەیب و ناتەواوییانەی کە وەکوو ئاگر لە دڵیدا خۆیان حەشارداوە، دەردەکەون.

جا ئەگەر ماڵ و داراییێکی زیاتر لەسەر خەرجی خۆی هەبوو، ئەوە لێی دەستێنێت و بۆ نیاز و ئیحتیاجاتی خاوەنداڵان خەرجی دەکات، تا دڵی ئارام بگرێ، چونکە ئارامشی دڵی ئەو موریدە لە هەمووشت گیرنگترە و ئەسڵە، هەروەها هەر ئەوەی کە توانیویە دڵی خەڵکی‌تر بەم ماڵەی خۆی تەسکینی پێ بدا ئەوە خۆی ورە و هیمەتی پێ دەدات و بە بەرەکەتی ئەم هیمەتەیە ئامانجەکەی لەسەر شانی سووك دەبێتەوە.

ڕێگاییێکی‌تر بۆ پاڵاوتن و تەزکیەی ئەخلاق ئەوەیە، هەندێ ئاکاری [خراپی] بەسەر هەندێ ئاکاری‌تریدا زاڵ بکات، [بۆ وێنە] بۆ ڕیا و خۆنواندن بەخشش و سەخاوەتی هەبێ تا بەخاڵەت و دەست‌وشکی و خۆشەویستی ماڵی دونیا و کۆکردنەوەی لە دەروونی خۆیدا لەبەین بەرێ. خۆی تووڕە نەکات و نەفس و چاو لەوەڕێنی نەکات تا لەسەر داوێن‌پاکی و خۆڕاگری تاریفی بدرێتەوە. جا پاشان ئاوڕ بداتەوە سەر ڕیا و خۆنواندن و بەو هێزە دیندارییە کە لەو ماوەی ڕیازەت و ڕووکردنە خوا بەدەستی هێناوە لە ڕیشە هەڵی بکەنێ و بە تەواوی بیسرێتەوە و بەهۆی تێکۆشانی بەردەوام و خەریك‌بوون لەگەڵ نەفسدا چارەسەری بکات.

دەگێڕنەوە کە پیرێك هەبووە کە پێی سەخت بووە شەوانە [بۆ تاعەت و عیبادەت] بەسەر پێیەوە ڕابووەستێ، هاتووە لەسەر خۆی فەرزکردووە کە بۆ ماوەیێك بەسەر سەریەوە بووەستێ، ئیدی پاش ئەو ماوە بە لە سەر پێ وەستان ڕازی بووە و بەخێرێکی باشی زانیوە کە دەستی کەوتووە.

## [بەشی سێهەم:] ناسینی عەیبە دەروونیەکان

پێغەمبەرصَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَسَلَّمَ فەرموویەتی: «إِذَا أَرَادَ اللّٰهُ بِعَبْدٍ خَيْراً بَصَّرَه بِعُيُوبِ نَفْسِهِ»[1].

---

۱. بیهقی فی شعب الإیمان: ۱۰۰۵۳، ابن‌ابی‌شیبة فی مصنفه: ۲٦۲/۸، کشف الخفاء للعجلونی: ۱۹۱، کنز العمال للهندی: ۲۸٦۸۹ بلفظ: «إِذَا أَرَادَ اللّٰهُ بِعَبْدٍ خَيْراً فَقَّهَهُ فِي الدِّينِ وَ زَهَّدَهُ فِي الدُّنْيَا وَ بَصَّرَه عُيُوبَهُ».

واتە: «هەرکاتێ خوا گەرەکی بێت خێر بە بەندەیێکی بگەیێ، عەیبەکانی پێ نیشان دەدات». جا بۆ ناسینی عەیب چەند ڕێگایەك هەیە:

[یەکەم:] لە بەردەستی پیرێك لە پیرانی تەریقەتدا تەمەسسوك دابدا و هەرچی کە ئەوپێی ئەڵێ بەگوێ بکا، ئیدی لەو وەختەدا هەندێجار خۆی شتی لێ حاڵی دەبێ، هەندێجاریش شێخەکەی شتی پێ پیشان دەدات. ئەم ڕێگەیە باشترین و چاکترین ڕێگە بۆ تێگەیشتنە؛ تەنها ئەوەندەی هەیە لەم سەردەمەدا ئەم کارە کەمە.

[دووهەم:] بە دوای دۆستێکی چاکدا بگەڕێ کە ئاگاداری ئەسرار و نهێنی ئەم بوارە بێ، ببێ بە هاوەڵی و بیکاتە چاوەدێری نەفسی خۆی، تا چاوەدێری بکات و هەرکاتێ کە پێویست بێ لەسەر عەیبەکانی ئاگاداری بکاتەوە. پێشەوا گەورەکانی دین ئاوەهایان دەکرد.

حەزرەتی عومەرڕَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ دەیفەرموو: «رَحِمَ اللّهُ امْرَأً أَهْدَىٰ إِلَيَّ عُيُوبِي»[1]. واتە: «خوا لەو کەسە خۆش بێ وا عەیبەکانم بە دیاری بۆ دێنێ».

حەزرەتی عومەرڕَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ کاتێ کە سەلمانڕَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ هات بۆلای سەبارەت بە عەیبەکانی پرسیاری لێ کرد و پێی فەرموو: سەبارەت بە من چیان بۆ تۆ گێڕاوەتەوە کە پێت ناخۆش بێ، سەلمان داوای کرد، کە لێی گەڕێ، بەڵام حەزرەتی عومەر وازی نەهێنا و زۆری لێ کرد، ئەویش فەرمووی: بیستوومە کە دوو پێخۆر لەسەر سفرە دادەنێن، هەروەها تۆ دوو قات لیباست هەیە، یەکیان بۆ شەوت، یەکیشیان بۆ ڕۆژت.

فەرمووی ئەدی جگە لەمانە چیترت پێ‌گەییوە؟

فەرمووی: هیچ.

فەرمووی: هەر ئەم دوانەم بەسە.[2]

حەزرەتی عومەرڕَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، لە حوزەیفەڕَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ کە هاوەڵی نهێنی پێغەمبەرصَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بوو لە نێو مونافقەکاندا، پرسی: ئەرێ بە منەوە نیشانەی نیفاق شك دەبەی؟[3]

---

١. دارمی فی سننه: ٦٧٤.
٢. سیر اعلام النّبلاء للذّهبی: ٤٩٨/١ بلفظ: «...قَالَ لَهُ عُمَرُ: يَا أَخِي، أَبَلَغَكَ عَنِّي شَيْءٌ تَكْرَهُهُ؟ قَالَ:بَلَغَنِي أَنَّكَ تَجْمَعُ عَلَىٰ مَائِدَتِكَ السَّمْنَ وَاللَّحْمَ وَ بَلَغَنِي أَنَّ لَكَ حُلَّتَيْنِ...».
٣. فتح الباری شرح صحیح البخاری لابن‌حجر: ٣٢.

[سەیر کەن] حەزرەتی عومەرﷺ بەو گەورەیی و پلە بەرزییەوە ئاوەها خۆی بە تاوانبار دەزانێ!

[سێهەم:] جا ئەگەر دۆستی چاکت دەست نەکەوت، ئەوە گوێ شل بکە بۆ قسەی ئێرەیی‌بەران (حەسوودان) و ئەوانەی وا چاویان بە شوێنتەوەیە، هۆشیاربە لەبەر چاوت ون نەبن ئەو ئێرەیی‌بەرانەی کە بە شوێن عەیبەکانتەوەن و زیادە دەنێنە سەریشی، ئەتۆ کەڵکی خۆتیان لێ وەرگرە و ئەوان هەرچی عەیب لە تۆ ئەگرن، تۆ خۆتی پێ تاوانبار بزانە، قەت تووڕە مەبە بەسەر ئەو کەسانەدا کە لەسەر عەیبەکانت ئاگادارت دەکەنەوە. چونکە عەیب مار و دووپشکە هەم لە دونیا و هەم لە قیامەتدا دەتگەزێ، کەواتە کەسێك ئاگادارت بکاتەوە کە لە تۆی کراسەکەتدا مارێك هەیە، بە مننەتەوە ئەو قسەیە لێ وەرگرە، چونکە ئەگەر لێی تووڕە بیت نیشانەی کزی ئیمانتە بە دوارۆژ، ئەگەریش پێی شاد بیت و بە دەرفەتی چاکی بزانی، ئەوە نیشانەی بە هێزی ئیمانتە.

جا بزانە تووڕەیی لەم کاتانەدا گوناحکار ئاشکرا دەکات، هێزی ئیمان لەم جۆرە کاتانەدا کەڵکی زۆرە بۆت، سوودەکەشی ئەوەیە کە لۆمە و سەرکۆنەی حەسوود و ئێرەیی‌بەر، بە شتێ چاك دەزانی کە دەستت کەوتبێ.

گوتیان بە عیساعَلَيْهِالسَّلَامُ کێ تۆی ئەدەب کردووە؟

فەرمووی: کەس منی ئەدەب نەکردووە، بەڵکوو هەڵەی نەزانانم دیوە و خۆم لێ پاراستووە[1].

## [بەشی چوارەم:] چەند نەقڵێك لە خاوەن دڵان و ڕوونکردنەوەی

### چەند بەڵگەی شەرعی لەسەر چارەسەری نەخۆشی دڵ و دەروون:

بزانە ئەو باسانەی کە تا ئێستا گوتوومانە، ئەگەر لەسەری ڕابمێنی و [بەکاریان بهێنی]، چاوت دەکرێتەوە و بەهرەی چاکت دەست دەکەوێ. ئەگەریش خودا ئەو بەهرەیەت بە نسیب نەکا، لانی‌کەم ئیمان و باوەڕێکت دەست دەکەوێ، چونکە سەرەتای هەرشتێ ئیمانە پاشان گەیشتن بە ئامانج.

---

١. فیض القدیر للمناوی: ٢٨ بلفظ: «قِيلَ لِروحِ اللهِ عِيسَى: مَنْ أَدَّبَكَ؟ ...»، المجالسة و جواهر العلم لأبی‌بکر الدّینوری المالکی: ٢٦٣٩ بلفظ: «لَقِيَ حَكِيمٌ حَكِيماً فَقَالَ لَهُ: مَنْ أَدَّبَكَ؟ ...».

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿يَرْفَعُ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا وَالَّذِينَ أُوتُوا الْعِلْمَ دَرَجَاتٍ﴾[1]. واتە: «خوای گەورە پلەی ئەو کەسانە بەرز دەکاتەوە کە ئیمانیان هێناوە و زانیارییان بە نسیب کراوە». کە وابوو لە خواترسی سەرمایەی ئەم کارانەیە.

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَمَنْ يَتَّقِ اللَّهَ يَجْعَلْ لَهُ مَخْرَجاً وَيَرْزُقْهُ مِنْ حَيْثُ لا يَحْتَسِبْ﴾[2]. واتە: «هەرکەس لە خوا بترسێ، خوا ڕێگە دەرچوونێکی بۆ دابین ئەکا و لە شوێنێکەوە ڕزقی ئەدات کە خۆی شکی ناڕواتە سەری».

دەڵێن: ژنەکەی عەزیزی میسر (زولەیخا) بە یووسفیعَلَيهِالسَّلَام گوت:

ئەی یووسف! بێگومان تەماح و شەهوەت پاشا دەکەنە بەردە، هەروەها خۆپارێزی و خۆڕاگری بەردە دەکەنە پاشا.

یووسفعَلَيهِالسَّلَام فەرمووی: خوا فەرموویەتی: ﴿إِنَّهُ مَنْ يَتَّقِ وَ يَصْبِرْ فَإِنَّ اللَّهَ لا يُضِيعُ أَجْرَ الْمُحْسِنِينَ﴾[3] واتە: «بێگومان هەرکەس خۆپارێز و خۆڕاگر بێ [خوای گەورە ڕووی لێ دەکات]، بە ڕاستی خوای گەورە پاداشتی چاکەکەران بەزایە نادات».

جونەیدرَحِمَهُاللَّهُ گوتوویە: شەوێکا خەوم زڕا و هەستام چووم خۆم خەریکی ویرد و عیبادەت کرد، کەچی ئەو تام و چێژەی کە شەوانیتر دەستم دەکەوت نەمبوو. ویستم بخەوم، نەمتوانی. ویستم دانیشم، نەمتوانی. چوومە دەرەوە کوتوپڕ دیم پیاوێ خۆی بە عابایەکەوە پێچاوە و لەسەر ڕێگەکە کەوتووە. هەرکە هەستی بە من کرد، گوتی: ئەی ئەبولقاسم لەم کاتەدا چۆن هاتووی؟، گوتم: بۆچی ناوەخت هاتووم؟

گوتی: نەخێر، بەڵکوو داوام لە بزوێنەری دڵەکان (خوا) کردووە کە دڵت بەرەو لای من بجووڵێنی. گوتم: ئەدی خوا وای کرد، ئێستا نیازت چییە؟ گوتی: کەنگێ دەرمان، دەردی دڵ چارە دەکات؟، گوتم: هەر وەختێ نافەرمانی نەفست کرد. ئەویش دەسبەجێ ڕووی کردە نەفسی خۆی و گوتی: گوێ بگرە، حەوت کەڕەت ئەمن ئابەم شێوە وڵامی تۆم داوەتە، بەڵام تۆ ملت نەدا، تا لە جونەیدت بیست. گوتی: کابرا چوو و ئەمن نەمناسی[4].

---

١. المجادلە: ١١. ٢. الطلاق: ٢. ٣. یوسف: ٩٠.

٤. بیهقی فی الزهد الکبیر: ٣٣٥.

## [بەشی پێنجەم:] ئاسەواری ئەخلاقی جوان

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿قَدْ أَفْلَحَ الْمُؤْمِنُونَ ۞ الَّذِينَ هُمْ فِي صَلاتِهِمْ خاشِعُونَ ۞﴾ تا ئایەتی: ﴿أُولٰئِكَ هُمُ الْوارِثُونَ ۞﴾[1].

واتە: «بێ‌گومان بڕواداران ڕزگارن، ئەوانە کە لە نوێژەکانیاندا ملکەچ و خۆبەکەمزانن».

خــوای گەورە فەرموویــەتی: ﴿التّائِبُونَ الْعابِدُونَ﴾[2]. واتە: «ئەوانەی کــە تەوبەکەرو خواپەرستن».

هەروەها خوای گەورە فەرموویـەتی: ﴿إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ الَّذِينَ إِذا ذُكِرَ اللهُ وَجِلَتْ قُلُوبُهُمْ وَ إِذا تُلِيَتْ عَلَيْهِمْ آياتُهُ زادَتْهُمْ إِيماناً﴾[3].

واتە: «بێ‌گومان ئیمانداارانی ڕاستەقینە تەنها ئەوانەن کە هەرکاتێ ناوی خوا برا، ئەوە دڵەکانیان دەترسێت و دەهەژێت، کاتێکیش ئایەتەکانی خــوا بەسەریاندا بخوێنرێتەوە، باوەڕیان پتر دەبێ».

خوای گەورە فەرموویـەتی: ﴿وَ عِبادُ الرَّحْمٰنِ الَّذِينَ يَمْشُونَ عَلَى الْأَرْضِ هَوْناً﴾[4]. واتە: «بەندەکانی خوای میهرەبان ئەوانەن کە زۆر بەهێمنی و کاوەخۆیی بەسەر زەویـدا ئەڕۆن».

هەندێ خەڵك هەن بچووکترین ئاماژەیان بەسە بۆ ئەوەی بکەونە سەر ئەم ڕێگەیە، لەبەر ئەوەی لە منداڵییەوە دڵسۆزێکیان هەبووە. هەروەك لە "سەهلی توستەری"یەوەرحمه‌الله دەگێڕنەوە کە فەرموویەتی: ئەمن سێ ساڵان بووم، شەوانە هەڵدەستام سەیری خەڵوەکێشانی خاڵۆم ـ موحەممەدی کوڕی موحەممەدی سوار ـ دەکرد.

ڕۆژێك خاڵۆم پێی گوتم: ئەوە یادی ئەو خوایەی کە تۆی دروست کردووە ناکەیت؟ منیش گوتم: چۆن یادی خوا بکەم، گوتی: هەرکاتێ لەناو نوێنەکەتدا خۆت تل لێ دەدەی، سێ جار بە دڵ بە بێ‌ئەوەی زمانت بجووڵێنی، بڵێ: «اللهُ مَعِي، اللهُ نَاظِرٌ إِلَيَّ، اَللهُ شَاهِدِي». ئەمەم چەند شەو گوت، پاشان خاڵۆمم ئاگادار کردەوە کە ئەمەم کردووە.

فەرمووی: هەر شەو حەوت جار بڵێ. منیش وەهام کرد وپێم ڕاگەیاندەوە، پاشان فەرمووی: هەر شەو یازدە کەڕەت بیڵێ.

---

١. المؤمنون: ١ ـ ٢، ١٠. ٢. التوبة: ١١٢. ٣. الأنفال: ٢. ٤. الفرقان: ٦٣.

پاشان وەهام کرد، ئیتر ئەمجار لەززەتی ئەو ویردە کەوتە دڵمەوە.

پاش ساڵێك خاڵۆم پێی گوتم: بەردەوام بە لەسەر ئەوەی کە فێرم کردی، تا دەچیتە نێو گۆڕەوە چونکە بەڕاستی هەم لەدونیا و هەم لە دوارۆژدا، بەهرەت پێ دەبەخشێ، چەندها ساڵ لەسەر ئەو حاڵەتە مامەوە، پاشان چێژێکم لە دڵی خۆمدا هەست پێ دەکرد. پاشان خاڵۆم ڕۆژێك پێی گوتم: ئەی سەهل! هەرکەس خوا لەگەڵیدا بێ و سەیر و تەماشای بکات ئەدی چلۆن گوناح و نافەرمانی دەکات. هۆشت بێ گوناح نەکەی.

ئەمن خۆمم دەپاراست و هوشیاری خۆم بووم، پاشان بنەماڵەم منیان نارد بۆ قوتابخانە گوتم: ئەمن ئەترسم هەوڵ و کۆششم لێ تێك بچێ و سەرم لێ بشێوێ. بەڵام ئەوان لەگەڵ مامۆستاکەمدا مەرجیان دانا، کە من سەعاتێکی دیاریکراو بچمە ئەوێ و پاشان گورج بگەڕێمەوە.

ئەمن چوومە قوتابخانە و لە شەش یان حەوت ساڵاندا قورئانم لەبەرکرد، هەمیشە بەڕۆژوو بووم، دوازدە ساڵ نانی جۆ بژیوم بوو.

لە سێزدە ساڵاندا پرسیارێکم بۆ پێش هات و داوام کرد، بمنێرن بۆ "بەسرە"، تا لە زانایانی ئەوێ پرسیار بکەم. [چووم و لە بەسرەدا] کەس قانعی نەکردم. ناچارکەوتم چووم بۆ "ئابادان"، بۆ لای پیاوێ بە "ئەبووحەبیبی حەمزەی کوڕی عەبدوڵڵای ئابادانی" دەناسرا، پرسیارم لێ کرد و وڵامی دامەوە، لە خزمەتیدا مامەوە، لە قسەو گفتوگۆی بەهرەم برد و ڕەوشت و ڕەفتاری فێر بووم.

پاشان گەڕامەوە بۆ شووشتەر، بژیوی خۆم کردبووە ئەوەی کە بە دیرهەمێ، جۆم بۆ بکڕن و بیهاڕن و بیکەنە نان بۆم، هەرچی شەوە کاتی پارشێو یەك دانە کولێرەی بێ خوێ و بێ پێخۆرم دەخوارد. ئەو دیرهەمە بەشی یەك ساڵی کردم.

پاشان ویستم سێ شەو خۆم ڕابگرم و هیچ نەخۆم ئەنجا ڕۆژوو بشکێنم، پاشان پێنج شەو، پاشان حەوت، پاشان بیست و پێنج شەو. تا بەم شێوازە بیست ساڵم ڕابرد. پاشان لەوێ نەمام و دەستم کرد بە دنیاگەڕان و سەیری دنیاکردن. پاشان گەڕامەوە بۆ شووشتەر و هەموو شەو تا بەیان بێدار بووم و خەریکی عیبادەت بووم ـ بەس خوای گەورە و مەزن، یاریدەرە ـ.

## [بەشی شەشەم:] مەرجەکانی خواست و ئیرادە و پێشەکییەکانی تێکۆشان

بزانە [ئەی ڕێبواری ڕێی دوارۆژ!] هەرکەس بە باوەڕی ڕاستەقینەوە، بە دڵ باوەڕی بە دوارۆژ ببێت، وای لێ دێت کە جووت و چاندنی بۆ دوارۆژە و زۆر تامەزرۆی قیامەتە و نیعمەتەکان و لەززەت و خۆشییەکانی دونیای بەلاوە سووکە.

جا لێرەدا من مەبەستم بە باوەڕ و ئیمان تەنیا قسەو هەوای دەم و زمان و جووڵاندنی زمان بۆ وشەی ئیمان و شادە نییە، بە بێئەوەی ڕاستی و پاکی دڵی لەسەر بێ. ئەم جۆرە ئیمانە وەکوو قسەی ئەو کەسەیە کە باوەڕی بەوە هەیە کە گەوهەر لەپارەی قەڵب باشترە؛ کەچی لە گەوهەر تەنها پیتەکانی دەناسێ و ئیدی حەقیقەتی گەوهەر نازانێ چییە.

ئەم جۆرە بەراوردە وەهایە هەرکاتێ خوو و عادەت بە پارەی قەڵبەوە بگرێ ئیدی دەستی لێ ناکێشێ و هیچ حەزی بە گەوهەر نامێنێ.

کە وابوو هۆی نەگەیشتن بە ئامانج، ڕێنەگرتنەبەرە. هۆی ڕێنەگرتنەبەریش بێخواست و ئیرادەییە، هۆی بێئیرادەبوونیش بێباوەڕیە، هۆی بێباوەڕیش لە زاهیرو ڕواڵەتدا، بێ مامۆستایی و نەبوونی زاناو شارەزای ڕێی خوایە[1].

جا هەرکەس چ خۆی ڕاچڵەکێ، چ ڕایچڵەکێنن، پێویستە چەند مەرجێ بەجێبهێنێت:

مەرجی یەکەم: لابردنی پەردە و لەمپەر لە نێواندا، کە ئەمەش خۆی چوار شتە:

١. ماڵ و سەرووەت.

٢. پلەو مەقام.

٣. شوێنکەوتووی و تەقلید.

٤. گوناح.

١. لەمپەری ماڵ و سەرووەت، پرژو بڵاو بکە و بیبەخشە، مەگەر بە ئەندازەی پێداویستی.

٢. پلەو مەقامی دنیایی، خۆلێبواردن بەوەی کە لەو شوێنە باربکەی، یان خۆ بەکەمنیشاندان و بە ئەرك زانین، یا ڕووکردنە ئەو شتانەی کە پلە و مەقامی دنیایی لە دەست ئەسێنن.

---

١. ئەم بەشەم لە ڕووی نوسخەی «دارالسلام»وە وەرگێرا ـ وەرگێر.

٣. شوێنکەوتووی و تەقلید، بەوە لەبەین دەچێ کە لا گری کوێر کوێرانەی مەزهەبەکان وەلانێ و ئیمان بە واتای: «لا إِلَهَ إِلَّا اللّٰهُ مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللّٰهِ» بە شێوەیێکی ڕاستەقینە بهێنێ و بە کردەوەش ئەو کارانە ئەنجام بدات کە پشتی ئەو باوەڕەی بگرێ و ئەو خودایانە کە خۆی دروستی کردوون لە هەواو هەوەس و دونیا و تەواوی ئەو شتانەی کە نەفس بۆلای دەچێت، لە بەین ببات. جا ئا لەو کاتەدا فەرمانەکانی خوا بەشێوەی حەقیقی و ڕاستەقینە قەبوول بکات و بەردەوام لە یادی خوادا بێ. ئا لەم کاتەدایە کە باوەڕی ڕاستەقینەی خوای بۆ دەردەکەوێ چونکە خوا فەرموودەی هەیە کە ﴿وَ الَّذِينَ جَاهَدُوا فِينَا لَنَهْدِيَنَّهُمْ سُبُلَنَا﴾[1] واتە: «ئەوانەی کە لەبەر ئێمە تێکۆشان و تەقەللایان داوە، بەرەو لای ڕێگەی خۆمان ڕێنوێنیان دەکەین».

٤. گوناح، ئەبێ تەرك بکرێ و لە شوێنیدا تاعەت و عیبادەت و پەشیمانی لە کردەوەی ڕابردوو و تەوبە و مافی خەڵكدانەوە دابنرێ.

جا هەرکاتێ وەهای کرد و دەستی لەم چوار کارە هەڵگرت، وەکوو ئەو پیاوەی لێ دێ کە خۆی خاوێن کردبێ و دەسنوێژی گرتبێ و لیباسی لەبەر کردبێ و ئامادەی نوێژ بووبێ.

جا ئا لەم کاتەدا پیرێکی پێویستە کە ـ ڕێی دوا ڕۆژی گرتبێتەبەر ـ تا ئەمیش دەستی پێوە بگرێ و بکەوێتە سەر ڕێی ڕاستە. جا لەم کاتەدا ئەبێ لەبەر دەستی شێخەکەیدا وەکوو مردووی بەردەست مردووشۆر وابێ، خۆی جووڵە ناکات، بەڵکوو مردووشۆر بە هەر بارێکدا کە مەیلی بێ دەیجووڵێنێ.

ئا لێرەدا ئەو قسەی حەزرەتی مووسا و خزرەیعَلَيْهِمَاالسَّلَامُ بێتەوە بیر و بە هیچ لەونێ ئیراد لە شێخەکەی نەگرێت و گلەیی لێ نەکات.

لەم کاتەدا ئامۆژگاری پێ دەکرێ بە چوار شت:

١. خەڵوەت؛

٢. بێدەنگی؛

٣. برسیەتی؛

٤. بێخەوی.

---

١. العنکبوت: ٦٩.

١. برسیەتی، بۆ ئەوەی خوێنی دڵ کەم بێتەوە تا تیشك و سپییەتییەکەی بمێنێتەوە، هەروەها بۆ ئەوەی چەوریی دڵ بسووتێ و خاوێنەکەی بمێنێتەوە. ئەمەش کلیلی کرانەوەی دڵە، هەروەك چۆن قەسوەت و گوناح ـ کە دژی خاوێنی و پاکین ـ ئەبنە پەردە بەسەر دڵەوە. پێغەمبەرﷺ بە حەزرەتی عائیشەرَضِيَ اللهُ عَنها فەرمووی: «ضَيِّقِي مَجَارِيَ الشَّيْطَانِ بِالْجُوعِ»[1] واتە: «[ئەی عائیشە!] شوێنی هاتوچۆی شەیتان بە برسیەتی تەنگ بکە».

حەزرەتی عیساعَلَيهِ السَّلَام بە حەواریون (هەواڵەکانی خۆی)، دەیفەرموو: «سکتان برسی ڕابگرن، بەشکەم دڵتان خوا ببینێ».

سەهلی [توستەری]رَحِمَهُ الله فەرموویەتی: ئەبدال، نابێ بە ئەبدال مەگەر چوار خەسڵەتی ببێ: ورگی بە خاڵی بهێڵێتەوە، بێخەوی، بێدەنگی، دوورەپەرێزی لە خەڵك.

٢. بێخەوی، ئەم خەسڵەتە دیسان دڵ خاوێن دەکاتەوە و ترووسکەی تێ دەخات، برسیەتیش زۆر کاریگەری هەیە لەسەر بێخەوی و هەردووکیشیان ئەبنە هۆی ڕووناکبوونەوەی دڵ. بەڵام خەوی زۆر، دڵ ڕەق دەکات و دەیمرێنێ، خەوێ کە بۆ جەستە پێویست نەبێ. سەبارەت بە ئەبدال ئەڵێن: «نَوْمُهُمْ غَلَبَةٌ، وَأَكْلُهُمْ فَاقَةٌ، وَكَلامُهُمْ ضَرُورَةٌ» واتە: «خەویان زۆرییە (تا خەو نەیانباتەوە ناخەوەن)، خواردنیان گەدایانەیە، قسەکردنیان بۆ نیازە».

ئیبراهیمی خەوواسرَحِمَهُ الله گوتوویە: «حەفتا کەس لە دۆستان، یەك دەنگ بوون لەسەر ئەوەی کە خەوی زۆر، لە ئاوی زۆر خواردنەوەیە».

٣. بێدەنگی، بێدەنگی بە گۆشەنشینی و خەڵوەت پێك دێ. قسەی زۆرکردن، بە تایبەت بۆ کەسێ کە چێژی لە زانست وەرگرتبێ، زۆر خراپە، دەست لێکێشانیشی ئەستەمە، بەڵام ئەو دەست لێکێشانە خێری زۆرە و بە کەڵکە، چونکە بەشێوەی دڵ و دەروون ڕوو لە غەیب و مەعنەوییەت دەکات و ڕوو لە ئەم ژیانی دونیایە وەردەچەرخێنێ.

٤. خەڵوەت و گۆشەنشینی، سوودەکەی ئەوەیە کە سەرقاڵی نامێنێت و وەختی خاڵی ئەبێت بۆ عیبادەت، چونکە پێویستە بەرگری لە حەواسسەکانی (چاو، گوێ...) بکات تا دڵی

---

١. بخاری: ١٨٩٧ ـ ٦٦٣٦، مسلم: ٤٠٤٠ ـ ٤٠٤١، ابوداود: ٢١١٣ ـ ٤٠٩٦ ـ ٤٣٤٢، ترمذی: ١٠٩٢، ابن‌ماجه: ١٧٦٩، احمد: ١٢١٣٢ ـ ١٣٨٠٤ جمیعهم بلفظ: «...إِنَّ الشَّيْطَانَ يَجْرِي مِنْ بَنِي آدَمَ مَجْرَى الدَّمِ»، و فی روایة: «...يَجْرِي مِنَ الْإِنْسَانِ...» دون قوله: «فضَيِّقُوا مَجَارِيهِ بِالْجُوعِ».

بجووڵێ، ئەمەش تەنها بە گۆشەنشینی ئەکرێ. پاشان باش وایە لە ماڵێکی تاریکدا بێت، تا چاوی بە شتێ نەکەوێ کە سەرنجی ڕابکێشێ، جا ئەگەر شوێنی تاریکی دەست نەکەوت، سەروچاوی بە شتێ دابپۆشێ، یان چاوی بنووقێنێ، چونکە لەکاتی بەتاڵبوونی حەواسدا، دڵ دەنگی خوا دەبیسێ و جەماڵی پەروەردگاری مەزن دەبینێ. مەگەر نازانی کە کاتێ بانگ لە پێغەمبەرﷺ کرا، پێیان گوت: ﴿يٰا أَيُّهَا الْمُزَّمِّلُ﴾[1]﴿يٰا أَيُّهَا الْمُدَّثِّرُ﴾[2].

جا هەرکاتێ ئەم برسیەتی و خەڵوەکێشان و بێخەوی و بێدەنگییەی ئەنجام دا ئەوە با ویردێ لە ویردەکان لەسەر زمان بگرێت و دووپاتی بکاتەوە. بەم شێوە:

دەستنوێژ بگرێ و لە سووچێکەوە دابنیشێ و ڕوو لە قیبلە بکات و بە زمان بڵێ: «اللّٰه اللّٰه» بەردەوام ئەمە بڵێ و دڵی هۆشیار ڕابگرێت و تەواوی حەواسی کۆ بکاتەوە لەسەر بیستنی ئەو وشەیە کە لەزمانی دەردەچێ و ئاگای لە خۆی بێ، تا کاتێ کە بە ویستی خۆی زمانی نەجووڵێنێ، بەڵکوو وەهای لێبێت بە بێ ویستی خۆی زمانی ئەو ویردە بڵێ (واتە زمانی خۆی زاکیر بێ).

پاشان لە زمانەوە ئەم حاڵەتە بڕواتە سەر دڵی، بەجۆرێ هەرکاتێ زمانی بێدەنگ ببێ، دڵی ئەو ویردە بڵێ. هەرکاتێ کە دڵ دەستی کرد بە زیکرو ویردخوێندن، لەو کاتەدا زمان بێدەنگ ئەبێ، جا هەر بەو شێوە درێژەی پێ بدا تا پێتی ئەو زیکرە لە دڵی دەسڕێتەوە و تەنها زیکرێکی بێ پیتی لێ بەجێ دەمێنێ. پاشان لە زیکریش بەرزتر دەبێتەوە و ئەبێتە حاڵەتێکی بەردەوام.

لەم کاتەدا بەسەر هەموو ڕووداوێکدا کە بۆی ڕوو بدات ئاگادار دەبێتەوە و بۆ پیرەکە باسی دەکات. ئەو موریـدە ڕووداوانێك چ سەبارەت بە دڵپاکی بێت، چ قەسوەت و دڵڕەشی، دەبینێ، یان هەندێك خەیاڵات و وەسوەسە و حاڵی تایبەتی بۆ پێش دێ، کە دەبێ بە شێخەکەی بڵێت، چونکە ئەو شێخە لە ئەم زاناترە.

ئەبێ هەمیشە و دایم ـ مادامێ ئاگای لە خۆی بێ ـ خەرکی زیکر و یادی خوا بێت. خوای مەزن فەرموویەتی: ﴿قُلِ اللّٰهُ ثُمَّ ذَرْهُمْ﴾[3]. واتە: «بڵێ خوایە و پاشان لێیان گەڕێ».

---

١. المزّمّل: ١. ٢. المدّثّر: ١. ٣. الأنعام: ٩١.

جا هەرکاتێ کە وەسوەسە و خەڵێڵەی خراپ زاڵ بوو بەسەریدا، ئەوە مادامێ هێندە باوەڕی زاڵ بێ بەسەر ئەو خەڵێڵانەدا کە هەست نەکات بەوانە، ئەوە هیچ گوناحی ناگات. دەگەڕێتەوە سەر زیکرو ویرد.

خوای مەزن فەرموویەتی: ﴿وَ إِمَّا يَنزَغَنَّكَ مِنَ الشَّيْطَانِ نَزْغٌ فَاسْتَعِذْ بِاللَّهِ إِنَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿٢٠٠﴾ إِنَّ الَّذِينَ اتَّقَوا إِذَا مَسَّهُمْ طَائِفٌ مِنَ الشَّيْطَانِ تَذَكَّرُوا فَإِذَا هُمْ مُبْصِرُونَ ﴿٢٠١﴾﴾[1].

واتە: «ئەگەر خەڵێڵەت لە شەیتانەوە بۆ هات، ئەوە هەر پەنا بە خودا بەرە؛ کە خۆی بیسەر و زانایە بێگومان ئەو کەسانە کە پارێزگارن، هەرکاتێ خەیاڵی خراپیان لە شەیتانەوە تووش دەبێ، گورج یادی خوا دەکەن و بەرچاویان ڕوون دەبێتەوە».

مرۆڤی موسڵمان، ئەبێ بە درێژایی تەمەنی لەسەر زیکری خودا بەردەوام بێ چونکە لەوانەیە ببێت بە یەکێك لە گەورەکانی دین ئەوانەی وا حەقیقەت لەبەر چاویان ئاشکرا ئەبێ و چاویان ڕووناك ئەبێتەوە. ئەو شتانە ئەبینێ کە چاو نایانبینێ و گوێ نایانبیسێ و بەدڵی هیچ بەشەرێکدا نەهاتووە. جا ئەگەر شتێکی بۆ دەرنەکەوت، ئەوە با بەردەوام بێ، چونکە بێشك لە کاتی هاتنی فریشتەی مەرگدا، ئەوە بەرچاوی ڕوون دەبێتەوە و کەشفی بۆ دەبێ و بە هومێدی خوا بە مەرام و مەبەستی خۆی دەگات.

والله أعلم

---

١. الأعراف: ٢٠١ ـ ٢٠٠. ئەم دوو ئایەتە لە هەردوو نوسخەکەدا پێش و پاش نووسرابوون، لێرەدا ڕاستمان کردەوە ـ وەرگێڕ.

# بابەتی بیست و سێهەم: دامرکاندنی دوو هەوەس؛ هەوەسی ورگ و هەوەسی جینسی

ئەم بابەتە لە چەند بەش پێك هاتووە:

## [بەشی یەکەم: دامرکاندنی هەوەسی ورگ]

بزانە کە سەرچاوەی هەرچی ئافەت و بەڵایە، شاوەتی ورگە، لە ورگیشەوە هەوەسی جینسی سەر هەڵدەدات، لە هەوەسی ورگەوە بوو ئادەم عَلَيْهِ السَّلَامُ تووشی ئەو بەڵایە بوو و لە بەهەشت دەرکرا، هەر ئەوەشە وەها بە مرۆڤ دەکا کە ئەکەوێتە شوێنی دونیا و پێی عەلاقەمەند ئەبێ.

### ١. ڕوونکارییێك لەسەر خێرو چاکەی برسیەتی و زەرەر و خراپەی تێری:

پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فەرموویەتی: «جَاهِدُوا أَنْفُسَكُمْ بِالْجُوعِ، وَالْعَطَشِ، فَإِنَّ الْأَجْرَ فِي ذَلِكَ كَأَجْرِ الْمُجَاهِدِ فِي سَبِيلِ اللهِ، وَإِنَّهُ لَيْسَ مِنْ عَمَلٍ أَحَبُّ إِلَى اللهِ - تَعَالَى - مِنْ جُوعٍ وَعَطَشٍ».

واتە: «بە برسیەتی و تینوویەتی لەگەڵ نەفسی خۆتاندا شەڕ بکەن، چونکە خێری ئەو نەفس‌کوژییە بە قەدەر خێری جیهادگەر لەڕێ خوایە، بێ‌گومان هیچ کردەوەیەك بەلای خوای مەزنەوە خۆشەویستر لە برسیەتی و تینوویەتی [لە ڕێی ئەودا] نییە».

ئیبنوعەبباس رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا ڕیوایەتی کردووە کە پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فەرموویەتی: «لا يَدْخُلُ مَلَكُوتَ السَّمَاءِ مَنْ مَلأَ بَطْنَهُ». واتە: «کەسێ کە ورگی پڕ بێ قەت دەستی بە جیهانی ئاسمانی ڕاناگات».

ئەبوو سـەعیدی خودری رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ ڕیوایەتی کردووە کە پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فەرموویەتی: «اِلْبِسُوا وَ اشْرَبُوا وَ کُلُوا فِي أَنْصافِ الْبُطُونِ، فإِنَّهُ جُزْءٌ مِنَ النُّبُوَّةِ».

واتە: «بپۆشن و بە قەدەر نیوەی ورگتان بخۆن و بخۆنەوە، چونکە بێشك ئەم ڕەوشتە بەشێك لە پێغەمبەرایەتی بووە».

حەسەنی [بەسری] رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ فەرموویەتی: پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فەرموویەتی: «أَفْضَلُكُمْ مَنْزِلَةً عِنْدَ اللهِ ـ تَعالَىٰ ـ أَطْوَلُكُمْ جُوعاً وَ تَفَكُّراً، وَ أَبْغَضُكُمْ إِلَى اللهِ ـ تَعالَىٰ ـ كُلُّ نَؤُومٍ، أَكُولٍ، شَرُوبٍ».[1]

واتە: «بەڕێزترینتان لەلای خودای مەزن، ئەو کەسەیە کە برسیەتی و بیرکردنەوەی لە هەموو کەس درێژخایەنتر بێ، دزێوترینتان بەلای خودای گەورەوە ئەوەیە وا خەواڵوو و زۆرخۆر و زۆر خۆرەوەیە».

پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فەرموویەتی: «إِنَّ اللهَ ـ تَعالَىٰ ـ يُباهِي الْمَلائِكَةَ بِمَنْ قَلَّ مَطْعَمُهُ وَ مَشْرَبُهُ فِي الدُّنْيا، يَقُولُ اللهُ: انْظُرُوا إِلَىٰ عَبْدِي، ابْتَلَيْتُهُ بِالطَّعامِ وَالشَّرابِ فِي الدُّنْيا، فَتَرَكَهُما لِأَجْلِي، اِشْهَدُوا يا مَلائِكَتِي! ما مِنْ أَكْلَةٍ يَدَعُها إِلَّا أَبْدَلْتُهُ بِها دَرَجاتٍ فِي الْجَنَّةِ».

واتە: «خودای مەزن، بەو کەسانەوە کە خواردن و خواردنەوەیان لە دونیا کەمە بە سەر فریشتەکاندا دەنازێ، ئەفەرمێ: ئەی فریشتەکان سەیری ئەو بەندەم بکەن، ئەمن تووشی [ئافەتی] خواردن و خواردنەوەم کردووە، کەچی ئەو لەبەر من خۆی لێیان دەبوێرێ، ئێوە ئەی پەریان! شایەتی بۆ بدەن، کە هەر خۆراکێ نەخوات، ئەمن چەندها قاتی ئەوە پاداشتی لە بەهەشتدا ئەدەمەوە».

ئەبوو سولەیمان رَحِمَهُ اللَّهُ فەرموویەتی: ئەوەی کە یەك پاروو نانی شێو نەخۆم، بەلامەوە لەوەی کە شەو تا بەیان عیبادەت بکەم، باشترە[2].

## [٢. بەهرەو سوودی کەمخۆری:]

پێشتر باسمان کرد کە کەمخۆری ئەبێتە هۆی دڵناسکی و شکستەیی مرۆڤ و بەری تەماح و دەمار ئەگرێ. هەندێ لە سوود و کەڵکەکانیشی بریتین لە:

١. لم اجده بهذا اللّفظ، لکن ذکره بنحوه: ابن‌ماجه: ٣٣٤١ ـ ٣٣٤٢، ترمذی: ٢٤٠٢، طبرانی فی الکبیر: ٨٨٧، ٥٢٥٦ بلفظ: «كُفَّ جُشاءَكَ عَنّا فَإِنَّ أَطْوَلَكُمْ جُوعاً يَوْمَ الْقِيامَةِ أَكْثَرُكُمْ شِبَعاً فِي دارِ الدُّنْيا».

٢. حلیة الأولیاء لأبی‌نعیم الأصبهانی: ١٨١/٤.

مرۆڤ بەڵاو ئافەت و ئەشکەنجەی خوای لەبیر ناچێتەوە.

شەهوەت و حەزە حەیوانییەکان دەشکێنێ.

بە هۆی برسیەتییەوە بەسەر نەفس و شەیتاندا زاڵ دەبێ و ڕەگ و ڕیشەیان دەردەهێنێ.

بە برسیەتی بەری خەو ئەگرێ و بەردەوام بێدارە.

لەم سۆنگەوە هەندێ لە پیرانی تەریقەت لەسەر سفرەوە دەستیان ڕادەگرن و دەڵێن: ئەی موریدان! زۆر مەخۆن، تا زۆر نەخۆنەوە و زۆر نەخەون و لە زۆر خەوتنیشدا زەرەری زۆر بکەن.

کە وابوو بە برسیەتی دەوام لەسەر عیبادەت زۆرتر ئەکرێ، چونکە هەرکەس تێر بێ لە بەجێ‌هێنانی تاعەت و عیبادەتدا تەنبەڵ ئەبێتەوە. فرەخۆریش خوازیاری زۆر بەشوێن نانداگەڕان و پاشان کات بە فێڕۆدان بەهۆی چێشت‌لێنان و دەست و دەم‌وچاو شوشتن و دەم و ددان خاوێن‌کردنەوە و هاتوچۆی زۆری سەرئاو بۆ خۆ خاڵی‌کردنەوە.

سیرڕی [سەقەتی] رَحِمَهُ‌اللَّهُ باسی یەکێ لە شێخەکان دەگێڕێتەوە کە: خۆراکی حەڵوا شتی نەرمەقووت بوو، پێیان گوت کە بۆچی وەها دەکەیت؟ فەرمووی: ئەمن ئەژماردوومە مەودای نێوان جاوین و قووتدان حەفتا تەسبێحە، بەم‌بۆنەوە ئەمن چل ساڵە نانم نەجاویوە.

جا سەیر کە هەرکەس یەقینی بێ کە هەر هەناسەیەك، گەوهەرێکە لە نرخاندن نایە، دەشزانێ بە فیڕۆدانی حیساب و کیتابی هەیە.

یەکێ‌تر لە بەهرەکانی برسیەتی ئەوەیە کە جەستە و بەدەنی مرۆڤ ساغ ڕادەگرێ، بێ‌شك هەرکەس کەم بخوات کەم نەخۆش دەکەوێ[1].

یەکێ‌تر لە سوودەکانی ئەوەیە هێزی لەخۆ بوردووی و خێردانەوە بۆ خەڵك لە مرۆڤدا بەدی ئەهێنێ.

## ٣. ڕەوشتی خۆڕاهێنان بۆ شکاندن و کەم‌کردنەوەی شاوەتی ورگ و هەوەس‌بازی

بزانە کە پاش ڕەچاوکردنی حەڵاڵی نان ـ بەو شێوە کە ڕابوورا ـ پێویستە سێ ئەرك بەجێ بهێنێ:

---

١. يدلّ على ذلك قوله صَلَّى‌اللَّهُ‌عَلَيْهِ‌وَسَلَّمَ: «صُومُوا تَصِحُّوا» طبراني فى الكبير: ١١٩٠، جامع الكبير للسيوطى، حرف الهمزة: ٢٥.

دیاریکردنی ئەندازەی کەم و زۆری خۆراك.

دیاریکردنی کات، لە خاو و بە پەلەخواردن.

دیاریکردنی جۆری خواردەمەنییەکە.

**ئەرکی یەکەم:** ڕەوشتی وردە وردە کەمکردنەوەی نانخواردن فێر بێ، چونکە هەر کەس لە فرەخۆری بە یەکجاری بگوێزێتەوە بۆ کەمخۆری، تەبێعەتی تێك دەچێ. ئەبێ وردە وردە، بە پێی حسێب بڕواتە پێشەوە: ئەگەر ڕۆژێ بۆ نموونە سێ کولێرە دەخوات، ئەوە هەر ڕۆژ سێ یەك لە دەیەکی کولێرەیێ کەم بکاتەوە کە دەبێتە یەك سیهەمی کولێرەیێ، کەوا بوو لە یەك مانگدا کولێرەیێ و لە دوو مانگدا دوو کولێرە، ئیدی لەسەر شانیشی گران نییە.

کەمکردنەوەی خۆراك بۆ ئەوەی کاریگەری هەبێ و بمێنێتەوە بەش بە حاڵی خۆی چەند پلەی هەیە:

**پلەی یەکەم:** پیاوچاکان و سیددیقین بەو ئەندازە قنیاتیان کردووە کە ژیان و عەقڵیان بۆ بمێنێتەوە، پێغەمبەریش بەم پلەیە ئاماژە دەکات: «حَسْبُ ابْنِ آدَمَ لُقَيْمَاتٌ يُقِمْنَ صُلْبَهُ»[1] واتە: «بۆ بنیادەم چەند پارووێك کە پشتی ڕابگرن، بەسە».

**پلەی دووهەم:** خۆی ڕابهێنێ بەوە کە شەو و ڕۆژێك بە نیوە مستێ کە دەبێتە کولێرەیێ ساغ و نەختێ، قەناعەت بکات، ئەم مست و نەختە خۆراکە دەبێتە چواریەکی مەنێ (مەنی مەککە)، ڕەوشت و ڕێبازی حەزرەتی عومەر رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ نزیکە لەمەوە، چونکە ئەو حەوت یان نۆ پارووی دەخوارد.

**پلەی سێهەم:** خۆی ڕابهێنێ بەوە کە شەو و ڕۆژێ مستێ بخوات کە دەبێتە دوو کولێرەی نیو، ئەم مستە لە سێیەکی ورگ زیادترە.

**پلەی چوارەم:** مستەکە زیاد بکات تا دەبێتە مەنێ، ئەم مەنەش ئاخریە و لەمەش زیاتر، ئیسراف و زیادەڕەوییە و لەوانەیە بەری فەرموودەی خوا بکەوێ ﴿وَ كُلُوا وَ اشْرَبُوا وَلا تُسْرِفُوا﴾[2] واتە: «بخۆن و بخۆنەوە، بەڵام زیادەڕەوی مەکەن».

[جگە لەمەی کە باسمان کرد] ڕێگەیتر هەیە بۆ کەمکردنەوەی خۆراك، ئەمەش بریتییە لەوەی تا برسی نەبێ نەخوات و پێش ئەوەی تێر بێ دەس بگرێتەوە، هۆشی بێ لەم شێوازە

١. ابن‌ماجه: ٣٣٤٠، ترمذی: ٢٣٠٢، احمد: ١٦٥٥٦.

٢. الأعراف: ٣١.

لا نەدات. بەڵام ئەمە مەترسی زۆرە، چونکە لەوانەیە نەزانێ بەڕاستی کەی برسیەتی، لێی تێك بچێ. یەکێ لە گەورەکان گوتوویە: برسیەتی ڕاستەقینە ئەوەیە کە بۆ پێخۆر نەپرسێ. یەکێتر فەرموویەتی: [ئەبێ هێندە برسی بێ] هیچ نانێ بۆی جیاوازیی نەبێ.

بزانە ئەم شێوازە ئاخەرینە بە گۆڕانی کەسەکان ئەگۆڕێ، ناکرێ دەس‌نیشان بکرێ، بەڵکوو هەرکەسێ بەش بەحاڵی خۆی ئەبێ تێڕوانینی خۆی هەبێ.

سەهلی [توستەری]رَحِمَهُاللَّهُ گوتوویە: ئەگەر دونیا (واتە بژیوی دونیا) خوێنی خەست بوایە، ئەوە مرۆڤی موسڵمان حەڵاڵ بوو لێی بخوات، چونکە خۆراکی هەر ئیمانداریێ بە ئەندازەی ئەوەیە کە نەمرێ و پێی بژی و لەسەر پێ ڕاوەستێ.

**ئەرکی دووهەم: کاتی نان‌خواردن:** هەندێ لە ڕێبوارانی ڕێی تەریقەت، لەجێی ئەوە کەم بخۆن، یەکسەر بۆ ماوەیێ بیساتی نانخواردن ئەپێچنەوە؛ هەندێکیان سێ ڕۆژان نان ناخوات، هەندێکیان بۆ ماوەی سی ڕۆژ یان چل ڕۆژ نان ناخوات. کۆمەڵێ زۆر لە زانایان لەسەر ئەم باوەڕەن وەکوو سولەیمانی خەواس، سەهلی کوڕی عەبدوڵڵاه، ئیبراهیمی خەواس کە ئەم شێوازە باشە.

دەگێڕنەوە کە زانایانی ئەهلی تەسەووف گوتوویانە: هەرکەس چل ڕۆژ دەست‌بکێشێ لە نان‌خواردن لەلایەن خواوە هێزێکی ئاسمانی بۆ دەردەکەوێ، واتە هەندێ ڕازی نهێنی خوای بۆ ڕوون ئەبێتەوە.

سۆفییەك گەیشتە ڕاهیبێ و زۆرێ پێکەوە دوان و سۆفییەکە حەزی ئەکرد کە ئەو ڕاهیبە موسڵمان بکات. ڕاهیبەکە پێی گوت: مەسیح چل ڕۆژی ڕەبەق نانی نەدەخوارد و ئەمەش موعجیزەیە و بەس بۆ پێغەمبەری ڕاستەقینە دەگونجێ. سۆفییەکەش پێی گوت: ئەگەر من پەنجا ڕۆژ نان نەخۆم، ئەتۆ ئەو دینەی کە وای لەسەری، بەجێ دێڵی و دەبیتە موسڵمان؟ گوتی: بەڵێ. سۆفییەکەش لە شوێنێ کە بە ڕاهیبەکەوە دیار بێ دانیشت، تا پەنجا شەو تەواو بوو. پاشان وتی: حەز دەکەی بیکەم بە شەست ڕۆژ بۆت؟ سۆفییەکە، شەست ڕۆژی تەواو کرد. ڕاهیبەکە زۆر سەری سوڕما و گوتی: قەت گومانم نەدەبرد کەسێ بتوانێ کە لە مەسیح زیاتر نان نەخوات. ئەو ڕاهیبە هەر بەم بۆنەوە موسڵمان بوو.

ئەم پلەیەش هەرکەسی پێ ناگات بەڵکوو تایبەتی ئەو کەسانەیە کە دەروونیان کراوەیە و گەیشتوونەتە پلەی موکاشەفە و بەو شتانەی کە دابڕکەری عادەت و خووخدەی مرۆڤە، خۆیانیان ماندوو کردووە و لەو ئیشە چێژ وەردەگرن و ئیدی برسیەتی و نیازمەندیەکانی تریان، لەبیر ئەباتەوە و بژیویەکی ڕۆحانیان لەلایەن خواوە بۆ دێ.

پێغەمبەرﷺ بەم پلەیە ئاماژە دەکات «أَنَا أَبِيتُ عِنْدَ رَبِّي يُطْعِمُنِي وَ يَسْقِينِي»[1] واتە: «ئەمن لە خزمەتی پەروەردگارا ئەمێنمەوە و ئەویش نان و ئاوم پێ دەدات».

**پلەی سێهەم:** لە شەو و ڕۆژێکدا یەك پێخۆری بێ، ئەمەش لانی کەمە و خوارترین پلەیە. ئەبوو سەعیدی خودریرضي الله عنه دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەرﷺ هەرکاتێ کە بە ڕۆژ نانی بخواردایە ئیدی شێوی نەدەخوارد، یان هەرکاتێ کە شێوی بخواردایە بە ڕۆژ نانی نەدەخوارد[2].

پێغەمبەرﷺ بە حەزرەتی عائیشەرضي الله عنها فەرمووی: «إِيَّاكِ وَ الْإِسْرَافَ، فَإِنَّ أَكْلَتَيْنِ فِي يَوْمٍ مِنَ الْإِسْرَافِ»[3] واتە: «وریا بە ئیسراف و زیادەڕەوی مەکە لە خواردندا، چونکە دوو ژەم نانخواردن لە ڕۆژێکدا ئیسرافە».

## ٤. ڕوونکردنەوەیێ لەسەر قازانج و خێری کەمخۆری

بزانە برسیەتیکێشانێ کە بە باش دابنرێ ئەوەیە کە مرۆڤ لەیادی خوا دوور نەخاتەوە، چونکە ئەگەر ئەو برسیەتییە لە ڕادە بەدەر بوو ئەوە ئەبێتە هۆی دوورکەوتنەوە لە خوا، مەگەر بۆ کەسێ کە ئەو برسیەتییە دەکێشێ تا شەهوەتی بەهێز کە زاڵ بووە بە سەریدا بشکێنێ. جا ئەگەر لەبەر ئەوە نەبێ باش وایە کە لە سنووریێکی ناوەڕاستدا [نە زۆر برسی، نە تێر] ڕاییگرێ.

پاشان وێڕای شکاندنی شەهوەت دوو ئافەت سەر هەڵئەدات، کە پێویستە خۆپارێزی لێ بکرێ.

---

١. بخاری: ١٨٢٧ ـ ٦٧٥٥ ـ ٦٧٠١، مسلم: ١٨٤٦ ـ ١٨٥٠، ابوداود: ٢٠١٤، ترمذی: ٧٠٩، احمد: ٤٥٢٢ ـ ٦٨٦٥ ـ ١٢٨٠٥ جمیعهم بألفاظ مختلفة منها: «إِنِّي أَبِيتُ يُطْعِمُنِي رَبِّي وَ يَسْقِينِي»، و فی روایة: «إِنِّي أَظَلُّ ...».

٢. بیهقی فی شعب الإیمان: ٥٢٥٦، طبرانی فی الأوسط: ٩١٧٧ لکن بلفظ: «فَمَا أَكَلَ أَبُوجُحَيْفَةَ مِلْءَ بَطْنِهِ حَتَّىٰ فَارَقَ الدُّنْيَا حَتَّىٰ إِذَا تَغَدَّىٰ لا يَتَعَشَّىٰ وَ إِذَا تَعَشَّىٰ لا يَتَغَدَّىٰ».

٣. ابنماجه: ٣٣٤٣، بیهقی فی شعب الإیمان: ٥٢٣٤ بنحوه: «إِنَّ مِنَ السَّرَفِ أَنْ تَأْكُلَ كُلَّ مَاشْتَهَيْتَ» و فی روایة: «مِنَ الْإِسْرَافِ أَنْ تَأْكُلَ ...».

**یەکەم:** هەندێ جار بەتەنێ نان دەخوات تا لەگەڵ خەڵکدا نان نەخوات، کەچی هەر ئەمە خۆی شیرکێ نادیارە و ڕیایە و زۆر جار ئەبێتە هۆی بەرەو نیفاق و دووڕوویی کێشانی خاوەنەکەی.

**دووهەم:** ئەیەوێ بە کەسێك کەم قنیات و کەمخۆر و خۆپارێز ناو دەر بکات، کەچی نازانێ ئافەتێکی سووکی لەکۆڵ کەوتووە و ئافەتێ لە ئەو قورستری تووش بووە کە بریتییە لە [حەز لە] پلە و پایەو ناوبانگ دەرکردن.

ئەبوو سولەیمان [دارانی] رَحِمَهُ اللَّهُ گوتوویە: ئەگەر شتێکی خۆشیان هێنایە بەردەستت کە تۆ لەو شتە پارێزت بوو، ئەوە هەر نەختێکی لێ بخۆ و لێ تێر مەخۆ، ئەتۆ بەم شێوە تاوی شەهوەتی نەفست شکاندووە، لە حاڵێکیشدا بە تەواوی بەگوێ نەفست نەکردووە، چونکە ئەوەندەت پێ نەداوە تێر بخوات، کە وابوو هەر ئەمە خۆی ئەبێتە هۆی شکاندنی شەهوەت و لەلایەکی تریشەوە بێ گوێیی نەفست کردووە.

جەعفەری سادیق رَحِمَهُ اللَّهُ فەرموویەتی: هەرکاتێ خواردەمەنییێکی بەتامیان هێناوە بۆم، سەیرم کردووە، ئەگەر نەوسم برۆشتبایە سەری ئەوە نەختێکم پێ ئەدا، چونکە ئەوەم بە باشتر ئەزانی لەوەی بەرگری بکەم. بەڵام ئەگەر نەوسم حەزی خۆی لێم پۆشی و وای نواند کە خۆشی لێ نایە، ئەوە هیچی پێ نادەم و بەو پێنەدانە سزای ئەدەم. ئەمەش خۆی ڕەوشتێکە لە سزادانی نەفس لەسەر حەزی خواردن.

بزانە! هەرکەس بە نەخواردنی شتێ کە حەزی لێیەتی، تووشی ڕیابازی بوو ئەوە وەکوو ئەو کەسە وایە کە لەدەس دووپشك ڕادەکا و تووشی مار دێ.

## بەشی دووهەم: شکاندنی هەوەسی جنسی

بزانە، چێژ و لەززەتی جیماع بۆ دوو بەهرە بەسەر ئینساندا زاڵ دەبێ:

**بەهرەی یەکەم:** چێژ و خۆشی جیماع ببێتە هۆی ئەوەی لەززەتی دوارۆژی پێ بسەنگێنرێ، چونکە لەززەتی جیماع خۆشترین لەززەتی جەستەی مرۆڤە ئەگەر درێژەی هەبوایە. هەروەك چۆن ئاگر و ئێشەکەی سەختترین ئێشی جەستەیە.

**بەهرەی دووهەم:** مانەوەی تۆرەمەی بەشەر و بەردەوام بوونی.

بەڵام هەوەسی جنسی پاش ئەم دوو بەهرە کە هەیەتی، ئافەت و بەڵای دینی و دونیایی زۆری تێدایە، ئەگەر بەرگری نەکرێ و هەوسار نەکرێت و نەگەڕێنرێتەوە بۆ ئەندازەی ئیعتیدال و سنووری ناوەڕاست.

گوتوویانە مانای فەرموودەی خوای مەزن ﴿رَبَّنَا وَلَا تُحَمِّلْنَا مَا لَا طَاقَةَ لَنَا بِهِ﴾[1] واتە: «ئەی پەروەردگاری ئێمە، بارێك مەخە سەر شانمان کە تاقەت و توانایی هەڵگرتنیمان نەبێ» هەر ئەو هێز و هەوەسە جنسیەیە.

ئیبنوعەبباس رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا لە ڕاڤەی فەرموودەی خوای مەزندا: ﴿وَ مِنْ شَرِّ غَاسِقٍ إِذَا وَقَبَ﴾[2] فەرموویە مەبەست: [پەناگرتنە بەخوا لە شەڕی] ڕەپبوونی زەکەر[3].

هەندێکیش ئەم ڕاڤەیان لە پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نیسبەت داوە.

پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دەیفەرموو: «اَللّٰهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ سَمْعِي، وَ بَصَرِي وَ قَلْبِي، وَ مَنِيِّ».[4] واتە: «خوایا! ئەمن پەنا بە تۆ دەبەم لە شەڕی گوێ و چاو و دڵم و هەوەسی جینسیم».

هەروەها دەیفەرموو: «اَلنِّسَاءُ حَبَائِلُ الشَّيْطَانِ»[5]، «لَوْلَا هٰذِهِ الشَّهْوَةُ لَمَا كَانَتْ كَذٰلِكَ». واتە: «ژنان داوی شەیتانن، ئەگەر شەهوەت نەبوایە، قەت ئاوەها نەدەبوو (واتە پیاو نەئەکەوتە داوی ژن)».

دەگێڕنەوە کە مووسا عَلَيْهِ السَّلَامُ لە کۆڕێکدا دانیشتبوو، کوتوپڕ شەیتان سەری هەڵدا و عابایەکی لەبەردابوو، لە هەزار ڕەنگ ئەدرەوشایەوە، کاتێ کە نزیك مووسا بووەوە، عاباکەی لەبەر دەرهانی و داینا، پاشان هاتە خزمەتی و گوتی: سڵاوت لەسەر بێ! مووساش فەرمووی: تۆ کیت؟ گوتی: ئەمن شەیتانم. مووساش فەرمووی: هەی بەخێر نەیێت، چلۆن هاتووی؟ گوتی: هاتووم سڵاوت لەسەر بدەم، بۆ ئەو پلە و پایە وا لەلای خواوە هەتە. مووسا فەرمووی: ئەدی ئەوە چ بوو لەبەرتا دیم؟ گوتی ئەوە شتێکە کە دڵی ئەولادەکانی ئادەمی پێ هەڵئەخەڵەتێنم.

---

١. البقرة: ٢٨٦.

٢. الفلق:٣.

٣. تفسیر المحرّر والوجیز لأبی‌محمّد عبدالحق بن‌غالب بن‌عطیة المحاربی، فی تفسیر سورة الفلق». ئەم ئایەتە بە پێی تەفسیرەکانی‌تر واتە: «پەنا بە خودا دەگرین لە شەڕی شەو کاتێ کە تاریك دادێ» ـ وەرگێڕ.

٤. ابوداود: ١٣٢٧، ترمذی: ٣٤١٤، نسائی: ٥٣٤٩ ـ ٥٣٦١، احمد: ١٤٩٩٢.

٥. ابن‌ابی‌شیبة فی مصنفه: ١٦٢/٨، بیهقی فی دلائل النّبوّة: ١٩٩٤، مسند الشّهاب القضاعی: ٥٥.

مووساش عَلَيْهِ السَّلَامُ فەرمووی: ئەدی تۆ چ کاتێ بەسەر مرۆڤدا زاڵ ئەبی؟ گوتی: هەرکاتێ دەماری هەبێ و کردەوەی چاکی زۆر هەبێ و گوناحەکانی لەبیر کات، [ئەی مووسا!] لە سێ شت دەتترسێنم، هۆشت بێ:

[یەکەم:] قەت لەگەڵ ژنێکدا کە مەحرەمت نییە لە چۆڵاییدا پێکەوە مەبن، چونکە بێشك پیاو بەتەنێ لەگەڵ ژنێکدا کە مەحرەمی نەبێ دانانیشێ مەگەر منی لەگەڵدایە، ئەمن تا لە خشتەی نەبەم و تووشی ئەو ژنەی نەکەم دەست هەڵناگرم.

[دووهەم:] لەگەڵ خوداشدا هەر پەیمانێکت بەست، بەجێ بهێنە.

[سێهەم:] هەر شتێکت دانا بیکەی بە خێرات، ئەوە بێگومان بیکە، چونکە هەرکەس شتێ دانێ بۆ خێرات و نەیکرد، ئەوە من ئەبمە هاوەڵی، تا لەو کارە پاشگەزی بکەمەوە.

پاشان پشتی هەڵکرد و بە دەم ڕۆیشتنەوە دەیگوت: هاوار بە ماڵم مووسا زانی ئەمن بەچی بنیادەم ئەخەڵەتێنم[1].

هەندێجار مرۆڤی بە هەوەس وای لێ دێت کە عاشقی شوێنێکی تایبەت ئەبێ و لەوێ نەبێ لە هیچ شوێنیتر نیازی خۆی بەجێ ناهێنێ، ئەم حاڵەتەش لەنێو ئاژەڵ و چوارپێیاندا زۆرە و شتێکی ناپەسەندە.

زیادەڕەوی هەمیشە خراپە، ئەمەش بریتییە لەوەی هێندە هەوەسی هەڵبسێ کە عەقڵی زایە بکات و هێزی لێ بستێنێ. بە پێچەوانەشەوە، لەناوبردنی شەهوەت بۆ کەسێ وا شلەپەتە بێ هەمدیس خراپە. بەڵکوو باشترین کار ئەوەیە لە ئەندازەی ناونجیدا ڕابگیرێ، بەم شێوە هەرکاتێ زۆری هێنا بە خۆ برسیکردن بشکێنرێ، یان بە ژنهێنان.

پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فەرموویەتی: «يا مَعشَرَ الشَّباب مَنِ اسْتَطاعَ مِنْكُمُ الْباءَةَ فَلْيَتَزَوَّجْ، فَإِنَّهُ أَغَضُّ لِلْبَصَرِ، وَ أَحْصَنُ لِلْفَرْجِ وَ مَنْ لَمْ يَسْتَطِعْ فَعَلَيْهِ بِالصَّوْمِ فَإِنَّهُ لَهُ وِجاءٌ»[2].

واتە: «ئەی چینی گەنجەکان! هەرکامتان دەسەڵاتان هەبوو (تواناى ماڵی و جەستەیی) ئەوە با ژن بهێنێ، چونکە ژنهێنان چاو بە ئینسان دادەخات و داوێنی لە کاری خراپە ئەپارێزێ، هەرکامیشتان دەسەڵاتی نەبوو، ئەوە با ڕۆژوو بگرێ، چونکە ڕۆژوو دایدەمرکێنێ».

---

١. مکائد الشّیطان لأبن‌ابی‌الدّنیا: ٤٧.

٢. بخاری: ٤٦٧٧ ـ ٤٦٧٨، مسلم: ٢٤٨٥ ـ ٢٤٨٦، ترمذی: ١٠٠١، نسائی: ٢٢٠٧ ـ ٣١٥٨، ابن‌ماجه: ١٨٣٨، احمد: ٣٤١١ ـ ٣٩٠٣ جمیعهم بلفظ: «يَا مَعْشَرَ الشَّبَابِ مَنِ اسْتَطَاعَ مِنْكُمُ الْبَاءَةَ فَلْيَتَزَوَّجْ فَإِنَّهُ أَغَضُّ لِلْبَصَرِ وَ أَحْصَنُ لِلْفَرْجِ ...».

## ڕوونکردنەوەیەك لەسەر ژنهێنان و ژننەهێنانی موریدان:

بزانە مورید نابێ هەر لە سەرتای موریدییەوە خۆی بە ژنهێنانەوە سەرجەنجاڵ بکات، چونکە ژنهێنان بەری دەگرێ لەوەی کە بە تەواوی هێزەوە ڕوو لە خوای مەزن بکات هەروەك پێشتر لە سەری چووین. هەروەها ئەبوو سولەیمانی دارانی رَحِمَهُ اللَّهُ فەرموویەتی: هەرکەس ژن بهێنێ، ئەوە بێ‌شك ڕوو لە ئیشی دونیایی دەکات، هەروەها فەرموویەتی: ئەمن موریدێکم نەدیوە ژنی هێنابێ و لە سەر بارودۆخی هەوڵی مابێتەوە.

جا بزانە ئەگەر تۆ لەمبارەوە خۆت لەگەڵ پێغەمبەردا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بسەنگێنی، ئەوە هەڵەت کردووە، چونکە پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نە دونیا و نە هەرچی لە دونیایە، نەیدەتوانی سەرقاڵی خۆی بکات، خوای گەورە بەمە ئاماژە دەکات: ﴿مَا زَاغَ الْبَصَرُ وَ مَا طَغَىٰ﴾[1] واتە: «چاوی لانەدا و سەرکەشی نەکرد». پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بێ‌شك هیچ شتێ لە یادی خوا غافڵی نەدەکرد.

کە وابوو هەرکاتێ شەهوەت بەسەرتا زاڵ بوو، ڕۆژوو بگرە و بە برسیەتی و تینوویەتی و بێ‌خەوی بەر خۆت بگرە. زۆربەی کات بە یەکێ لەمانە دادەمرکێ، بەڵام ئەگەر هەوەسی لە ئاستی ئاسایی بەدەر بێ و نەتوانێ بەری چاوی خۆی بگرێ، ئەوکات بە بۆنەی ئەم حاڵەتە تایبەتییەوە، دەتوانێ ژن بهێنێ، تا بحەسێتەوە. چونکە کەسێ نەتوانێ چاوی بپارێزێ، قەت ناتوانێ دڵی بپارێزێ، ئەدی کاتێکیش مێشکی سەرقاڵ بێ چ سوودێك لە ڕەبەن بوونیدا هەیە، بەڵکوو مەترسی ئەوەشی هەیە کە حەزرەتی عیسا عَلَيْهِ السَّلَامُ فەرموویەتی: خۆتان بپارێزن لە ڕوانین بۆ نامەحرەم، چونکە نەزەر لەدڵدا تۆمی هەوەس دەچێنێ و هەر ئەوەش بەسە بۆ تووش‌بوونی فیتنە و بەڵا[2].

سەعیدی کوڕی جەبیر رَحِمَهُ اللَّهُ فەرموویەتی: ئەو بەڵایەی تووشی حەزرەتی داوود عَلَيْهِ السَّلَامُ بوو لەبەر ڕوانین بۆ نامەحرەم بوو[3].

---

١. النجم: ١٧.

٢. بيهقى فى الزّهد الكبير: ٣٩٦.

٣. لم نجد على اصله لكن قال صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: «...إِنَّمَا جُعِلَ الْإِذْنُ مِنْ أَجْلِ النَّظَرِ» طبرانى فى الكبير: ٥٥٣٧ ـ ٥٥٣٨، دارمى فى سننه: ٥٥٣٩، و فى رواية: «إِنَّمَا جُعِلَ الْإِسْتِئْذَانُ مِنْ أَجْلِ الْبَصَرِ».

حەزرەتی داوودعَلَيْهِالسَّلَامُ بە کوڕەکەی فەرمووە: کوڕم! وە دووی شێر و مار بکەوە، بەڵام شوێنی ژن مەکەوە[1].

بە یەحیای کوڕی زەکەریایانعَلَيْهِمَاالسَّلَامُ گوت: زینا لە چییەوە دەست پێ دەکات؟ فەرمووی: لە ڕوانین و ئاوات‌خواستنەوە، چونکە ئەگەر دڵی داخوازییەکی نەکرد کە نەتوانێ بیشکێنێ، ئەوە ئەتوانێ ژن نەهێنێ.

دەگێڕنەوە کە موحەممەدی کوڕی سولەیمان هەر ڕۆژ هەشتاد هەزار دیرهەم داهاتی دەغڵودانی بووە. پاشان لە نامەیێکدا بۆ خەڵك و زانایانی بەسرەی نووسی کە ژنێکی پێ پێشنیار بکەن تا بیخوازێت، هەموویان لەسەر ئەوە کۆك هاتن کە ڕابیعەی عەدەوییە بخوازێ، موحەممەدی کوڕی سولەیمان نامەیێکی بۆ ڕابیعە نووسی:

«بسم الله الرحمن الرحیم». پاشان، بێ‌شك خودای مەزن لە دارایی دونیا هەر ڕۆژ لە داهاتی دەخڵ و دان هەشتا هەزار دیرهەمی پێ داوم و بێ‌شك لە داهاتووی نزیکدا دەبێتە هەر ڕۆژ سەد هەزار دیرهەم. ئەمنیش ئەوەندە و ئەوەند شتت پێشکەش دەکەم: ئەدی وڵامم بدەوە.

ڕابیعەش بۆی نووسی: «بسم الله الرحمن الرَّحیم». پاشان، بێ‌گومان پارێز لە ماڵی دونیا، هۆی ئاسوودەیی جەستەیە. حەز و خۆشەویستی دونیاش هۆی خەم و کەسەرە، جا هەرکاتێ ئەم نامەم بە دەستت گەیشت، ئەوە تۆشەت ئامادە بکە و دەس‌پێشخەری بکە بۆ دواڕۆژ. ئەتۆ سەرپەرشتی خۆت بکە و خەڵك مەکە سەرپەرشت‌کاری ماڵی خۆت تا [پاش مەرگت] میراتەکەت بەش بکەن. تا دوایین ڕۆژی تەمەنت بەڕۆژوو بە و بە مەرگ ڕۆژووەکەت بشکێنە. بەڵام ئەمن ئەگەر خوای بەرز و مەزن وێنەی ئەوە و چەند بەرانبەری ئەوەی وا خەڵاتی تۆی کردووە بکاتە خەڵاتم، قەت خۆشحاڵم ناکات، ئەگەر ببێتە هۆی ئەوەی چرکە ساتێك لە خوام غافڵ بکات».

بەم باسانەی کە ڕابورد بۆمان ڕوون بووەوە کە هەرچی مرۆڤ لەخودا غافڵ بکات نابێ بەرەو لای بڕوات.

---

١. تفسیر الدّرّ المنثور للسیوطی: سورة الانبیاء الآیة: ٧٨.

## بەشی سێهەم: نرخ و گەورەی کەسێ کە بەری هەوەسی دەگرێ:

بزانە «العصمة» ئەوەیە کە نەتوانی گوناح بکەی، بەڵام دژایەتیکردنی هەوەس لەگەڵ ئەوەشدا کە بتوانی بیکەی، ئەوە لە عیسمەت گەورەترە، کە بریتییە لە پلەی سیددیقین، هەروەها پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «مَنْ عَشِقَ فَعَفَّ فَكَتَمَ فَمٰاتَ فَهُوَ شَهيدٌ»[1] واتە: «هەرکەس عاشق ببێ و خۆی بپارێزی و عەشقەکەی ئاشکرا نەکات و بمرێ، ئەوە شەهیدە».

هەروەها پێغەمبەرﷺ فەرمووی: «سَبْعَةٌ يُظِلُّهُمُ اللّهُ فِي ظِلِّهِ يَوْمَ الْقِيٰامَةِ يَوْمَ لا ظِلَّ إِلّا ظِلُّه ...»[2] واتە: «حەوت چین هەن کە لەو ڕۆژەدا کە جگە لە سێبەری خودا هیچ سێبەرێ نییە، خوا دەیانخاتە ژێر سێبەرەی خۆیەوە ...» یەکێك لەوانە کەسێکە کە ژنێکی جوانکەڵە و لەبار، داوای لێ بکات و ئەم بڵێ: نە، من لە پەروەردگاری عالەم دەترسم!

دەگێڕنەوە کە سولەیمانی کوڕی یەسارڕەحمەاللە جوانترین ڕوومەتی وەختی خۆی هەبوو، ژنێك دەڕواتە لای و داوای ئیشی خراپی لێ دەکات، ئەویش بەگوێ ناکات و لەماڵ بەڕاکردن دێتە دەرەوە و ژنەکە بەجێ دەهێڵێ. ئەم سولەیمانە دەڵێ: لە خەونمدا یووسفمعلیه‌السلام دیت و وا دیاربوو کە پێم گوت: ئەتۆ یووسفی؟ گوتی: بەڵێ ئەمن ئەو یووسفەم وا ویستم ...[3]، بەڵام ئەتۆ ئەو سولەیمانەی کە نەتویست ...[4].

والله أعلم

---

١. كشف الخفاء للعجلونی: ٢٥٣٨، كنز العمال للهندی: ٧٠٠٠، اعتلال القلوب للخرائطی: ١٠٣.

٢. بخاری: ٦٢٠ ـ ١٣٣٤ ـ ٦٣٠٨، مسلم: ١٧١٢، ترمذی: ٢٣١٣، نسائی: ٥٢٨٥، احمد: ٩٢٨٨.

٣. ئاماژە بە ئایەتی: ﴿وَ لَقَدْ هَمَّتْ بِهِ وَ هَمَّ بِهٰا لَوْلا أَنْ رَأَىٰ بُرْهٰانَ رَبِّهِ﴾. یوسف: ٢٤.

٤. بیهقی فی شعب الإیمان: ٦٨٩٥ ـ ٦٧٠٩، تفسیر القرطبی فی سورة یوسف، سیر اعلام النّبلاء للذهبی: ٢/٨ فی ترجمة سلیمان بن‌یسار.

# بابەتی بیست و چوارەم: ئافەتی زمان

بزانە زمان گەلێك پڕ مەترسییە و تەنها بە بێدەنگی نەبێ بەهیچێ لە شەڕی ڕزگاری نییە. بەمبۆنەوەیە کە پێغەمبەرﷺ تاریفی بێدەنگی کردووە و خەڵکی بەرەو لای هەڵناوە، دەفەرمێ: «مَنْ صَمَتَ نَجَا»[1]، واتە: «هەرکەس بێدەنگ بێ ڕزگارە».

هەروەها فەرموویەتی: «اَلصَّمْتُ حِكْمَةٌ وَ قَلِيلٌ فَاعِلُهُ»[2] واتە: «بێدەنگی کارێکی بەجێیە و کەمن ئەوانەی ئەنجامی دەدەن».

هەروەها پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «مَنْ يَتَكَفَّلْ لِي مَابَيْنَ لَحْيَيْهِ و رِجْلَيْهِ أَتَكَفَّلْ لَهُ بِالْجَنَّةِ»[3].

واتە: «هەرکەس [پاراستنی] نێوان دووشەویلە و دووپێی [لە گوناح] بۆ من لە ئەستۆ بگرێ، ئەوا منیش بەهەشتی بۆ دەستەبەر دەکەم».

دەگێڕنەوە کە مەعازی کوڕی جەبەلؓ گوتی: ئەی نێردراوی خودا! ئامۆژگاریم بکە، پێغەمبەریشﷺ فەرمووی: «أُعْبُدِ اللهَ كَأَنَّكَ تَرَاهُ، وَاعْدُدْ نَفْسَكَ مِنَ الْمَوْتَى[4] وَ إِنْ شِئْتَ أَنْبَأْتُكَ بِمَا هُوَ أَمْلَكُ لَكَ مِنْ هٰذَا كُلِّهِ، (وَ أَشَارَ بِيَدِهِ إِلَى لِسَانِهِ)»[5].

---

١. ترمذی: ٢٤٢٥، احمد: ٦١٩٣ _ ٦٣٦٧.

٢. مسند الشّهاب القضاعی: ٢٣١، بیهقی فی شعب الإیمان: ٤٦٧٢.

٣. ترمذی: ٢٣٣٢ بلفظه، و فی روایة: «مَنْ يَضْمَنْ لِي ... أَضْمَنْ لَهُ الْجَنَّةَ» بخاری/٥٩٩٣، و فی روایة: «مَنْ تَوَكَّلَ لِي ... تَوَكَّلْتُ لَهُ بِالْجَنَّةِ» بخاری: ٦٣٠٩، احمد: ٢١٧٥٧، و فی روایة: «مَنْ وَقَاهُ اللهُ شَرَّ مَا بَيْنَ لَحْيَيْهِ وَ شَرَّ مَا بَيْنَ رِجْلَيْهِ دَخَلَ الْجَنَّةَ» ترمذی: ٢٣٣٣، احمد: ٢١٩٨٧.

٤. ابن‌ابی‌شیبة فی مصنّفه: ١٢٨/٨، بیهقی فی شعب الإیمان: ١٠١٨٣.

٥. احمد: ٢١٠٥٤، ابن‌ابی‌شیبة فی مصنّفه: ٢٣٧/٦، طبرانی فی الکبیر: ١٦٧٨٧ بلفظ آخر: «... أَلَا أُخْبِرُكَ بِأَمْلَكِ النَّاسِ مِنْ ذٰلِكَ؟ ...».

واتە: «وەها عیبادەتی خوا بکە کە گوایا دەیبینی، هەروەها خۆت لە کۆمەڵی مردوان بزانە، ئەگەریش ئەتەوێ تا هەواڵی شتێکت پێ بدەم کە لە هەمووی ئەمانە بەنرختر بێت (بە دەستیشی ئاماژەی بۆ زمانی دەکرد)».

لە ئەبووبەکری سیددیقیشەوەرَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ دەگێڕنەوە کە بەردێکی لە دەمی دەنا و بەو کارەی خۆی لە قسەکردن دەگرتەوە و بە دەستی ئاماژەی بە زمانی دەکرد و دەیگوت: ئەمەیە ئەمخاتە ناو کێشەوە.

ئیبنومەسعوودرَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ فەرموویەتی: سوێند بەو خودایەی جگە لەو هیچ خودایێ نییە، شتێ شك نابەم کە لە زمان زیاتر پێویستی بە زیندان بێ[1].

ئێستاش دێینە سەر باسی ئافەتی زمان، لە سووکترین ئافەتەوە بۆ گەورەترین ئافەت.

## ئافەتی یەکەم: قسەی بێهوودە

بزانە ئەگەر باسی شتێ بکەی کە هیچ سوودێکی نەبێ، بێگومان کاتی خۆتت بە فیڕۆ داوە و بێخود حیسابت هێناوەتە پێی خۆت، هەروەها شتێکی بێبایەخت بە شتێکی بایەخدار گۆڕیوەتەوە، کەچی ئەگەر تۆ لەباتی ئەوە یاد و زیکری خودات بکردایە، یان بێدەنگ بوویتایە، یان خۆتت بە ئەندێشە و تێڕامان خەریك بکردایە، ئەوە خێری چاکت دەست ئەکەوت.

پێغەمبەرصَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فەرموویەتی: «مِنْ حُسْنِ إِسْلامِ الْمَرْءِ تَرْكُهُ مٰا لا يَعْنِيهِ»[2] واتە: «لە پوختی مرۆڤی موسڵمان ئەوەیە کە ئیشی بێهوودە ئەنجام نەدات».

ئەنەسی [کوڕی مالیك]رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ فەرمووی: لە ڕۆژی جەنگی ئوحودا گەنجێك لە ئێمە شەهید بوو و کاتێ کە تەرمەکەیان دۆزییەوە، بەردێکی لە برسیەتیدا بەسەر ورگیەوە گرێ دابوو، دایکی خاکی سەر ڕوومەتی کوڕەکەی سڕی و گوتی: بەهەشتت پیرۆز بێت، ئەی کوڕم!

پێغەمبەریشصَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فەرمووی: «فَمٰا يُدْرِيكَ لَعَلَّهُ كٰانَ يَتَكَلَّمُ فِيمٰا لا يَعْنِيهِ وَ يَمْنَعُ مٰا لا يَضُرُّهُ»[3] واتە: «تۆ چلۆن دەزانی، لەوانەیە ئەم کوڕەت قسەی بێخود و بێهوودەی کردبێ و بەری شتانێکی گرتبێ کە زەرەری بۆی نەبووبێ».

---

١. ابن‌ابی‌شیبة فی مصنّفه: ٢٣٧/٦، طبرانی فی الکبیر: ٨٦٥٧ ـ ٨٦٥٨.

٢. الموطأ لمالك: ١٤٠٢، ترمذی: ٢٢٣٩ ـ ٢٢٤٠، احمد: ١٦٤٦، ابن‌ماجه: ٣٩٦٦.

٣. ابی‌یعلی الموصلی فی مسنده: ٣٩٠٨، بیهقی فی شعب الإیمان: ٤٦٥٦ دون آخره.

بزانە قسەی بێهوودە ئەوەیە کە لە کۆڕێکدا دابنیشی و بەسەرهات و چیرۆکی خۆت سەبارەت بەو سەفەرە کە بە کەژ و کێو و بیاباندا تێپەڕیوی، بگێڕیتەوە، بە بێ ئەوەی فشە و درۆی تێدا بکەی.

## ئافەتی دووهەم: قسەی زیادە

بریتییە لەو جۆرە قسانەی کە دووپاتیان دەکەیتەوە و هیچ سوودێکیش لەو دووپاتکردنەدا نییە، یان چەندین قسە دەکەی کە هیچ پێویست بە وتن ناکات.

عەتای کوڕی ئەبی ڕیباح رَحِمَهُ اللَّهُ گوتوویە: پێشینیان خۆشیان لە قسەی زیادە و زۆرتر وتن لەوەی کە پێویستە، نەئەهات[1]. بۆ وێنە بڵێ: خوایە! ئەم سەگە لەناو بەرە هەر لەسەر ئەم ئافەتە دووهەمە حەسێب ئەکرێ.

موتەڕڕەف، ئەڵێ: بۆ ئەوەی ناوی خوا، گەورەیی و ڕێزی لە دڵتانا بمێنێتەوە، لەگەڵ ناوبردنی سەگ و گوێدرێژ و هەرچی لەمانە بچێ، ناوی خوا مەهێنن، واتە مەڵێن: خوایە ئەم سەگە بگرە ...[2] باسی قسەی زیادە، بێ کۆتاییە و لە کۆکردن نایە.

پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فەرموویەتی: «طُوبَىٰ لِمَنْ أَمْسَكَ الْفَضْلَ مِنْ لِسانِهِ وَأَنْفَقَ الْفَضْلَ مِنْ مالِهِ»[3] واتە: «خۆزگە بەو کەسانە کە بەری زیادەگۆیی زمانیان دەگرن و زیادەی ماڵیان دەبەخشن».

بیلالی کوڕی حەرەس گوتوویە: پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فەرموویەتی: «إِنَّ الرَّجُلَ لَيَتَكَلَّمُ بِالْكَلِمَةِ مِنْ رِضْوانِ اللهِ ما يَظُنُّ أَنْ تَبْلُغَ بِهِ ما بَلَغَتْ فَيَكْتُبُ اللهُ بِها رِضْوانَهُ إِلَىٰ يَوْمِ الْقِيامَةِ، وَإِنَّ الرَّجُلَ لَيَتَكَلَّمُ بالْكَلِمَةِ مِنْ سَخَطِ اللهِ ما يَظُنُّ أَنْ تَبْلُغَ بِهِ ما بَلَغَتْ فَيَكْتُبُ اللهُ عَلَيْهِ بِها سَخَطَهُ إِلَىٰ يَوْمِ الْقِيامَةِ»[4].

---

١. «إِنَّ مَنْ قَبْلَكُمْ يَعُدُّونَ فُضُولَ الْكَلامِ ما عَدا كِتابَ اللهِ». بيهقی فی شعب الإيمان: ٤٧٢٨.

٢. أخرجه الطبراني و غيره بنحوه: «إِذا رَأَيْتُمْ أَخاكُمْ قارَفَ ذَنْباً فَلا تَكُونُوا أَعْواناً لِلشَّيْطانِ عَلَيْهِ تَقُولُوا: اللّٰهُمَّ اخْزِهِ، اَللّٰهُمَّ الْعَنْهُ وَ لٰكِنْ سَلُوا اللهَ الْعافِيَةَ فَإِنّا أَصْحابُ مُحَمَّدٍ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كُنّا لا نَقُولُ فِي أَحَدٍ شَيْئاً حَتَّىٰ نَعْلَمَ عَلَىٰ ما يَمُوتُ ...» طبرانی فی الكبير: ٨٤٩٥، بيهقی فی شعب الإيمان: ٦٢٦٥، عبدالرّزّاق فی مصنّفه: ٢٠٢٦٦، شرح السّنّة للبغوی: ٣٥٠/٦.

٣. طبرانی فی الكبير: ٤٤٨٠ بلفظ: «طُوبَىٰ لِمَنْ عَمِلَ بِعِلْمِهِ وَ أَنْفَقَ الْفَضْلَ مِنْ مالِهِ وَ أَمْسَكَ الْفَضْلَ مِنْ قَوْلِهِ»، معرفة الصّحابة لأبی‌نعيم الأصبهانی: ٢٤٨٧، بيهقی فی شعب الإيمان: ٣١١٦ـ١٠٠٧٩، مسند الشّهاب القضاعی: ٥٨٠.

٤. الموطأ لمالك: ١٥٦٢، ترمذی: ٢٢٤١، ابن‌ماجه: ٣٩٥٩، احمد: ١٥٢٩١، حاكم‌المستدرك: ١٣١، طبرانی فی الكبير: ١١٢٠ ـ ١١٢٥، بيهقی فی السّنن الكبری: ١٦٥/٨.

واتە: «بێ‌گومان جاری وا هەیە کە پیاو قسەیێ لەو قسانە کە خوا پێی ڕازییە دەکات و گومان ناکات کە ئەو قسە بە جێگەیێکی بگەیێنی، کەچی خوای [گەورە] تا ڕۆژی قیامەت لەبەر ئەو قسە ڕەزا و خێری خۆی بۆ دەنووسێ، هەروەها جاری واهەیە، کە پیاو قسەیێك لەو قسانە کە خودا لێی تووڕەیە دەکات و گومان ناکات ئەو قسە بە جێگەیێکی بگەیێنێ، کەچی خوای [گەورە] تا ڕۆژی قیامەت لەبەر ئەو قسە وەبەر تووڕەیی خۆی دەخات».[1]

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «إِنَّ الرَّجُلَ لَيَتَكَلَّمُ وَ بِالْكَلِمَةِ يُضْحِكُ بِهٰا جُلَسٰاءَهُ يَهْوِي بِهٰا أَبْعَدَ مِنَ الثُّرَيّٰا»[2].

واتە: «بێ‌گومان [جاری وا هەیە] پیاو قسە دەکات و بەو قسەیە هاوەڵەکانی دێنێتە پێکەنین [کەچی] هەر ئەو قسانە لە مەودای ئێرە تا سورەییا زیاتر دایدەبەزێنێ و سووکی دەکات».

## ئافەتی سێهەم: ڕۆچوون لە گوناح و باتڵدا

هەرزەبێژی و قسەی حەرام و گوناح، وەکوو باسی ژن و ئەندامی ژن، یان وەکوو باسی شەراب و کۆڕی شەرابخۆری و ئەو جێگایانەی کە کاری ناشەرعی تێدا ئەکرێ.

خودای مەزن بەم حاڵەتە ئاماژە دەکات ﴿وَ كُنّٰا نَخُوضُ مَعَ الْخٰائِضِينَ﴾[3]واتە: «ئێمەش هەرزەبێژیمان لەگەڵ هەرزەبێژان دەکرد»[4].

## ئافەتی چوارەم: ئەو شتانەی کە ڕابوردووە یا هێشتا نەهاتووە

مشتومڕ و چەقە و دەمەقڕە لەسەر شتانێ کە ڕابردوون، یان تەگبیرکردنیان بۆ داهاتوو. ئەمەش لە لایەن پێغەمبەرەوە ﷺ نەهی لێ کراوە چونکە دەفەرمێ: «لاتُمٰارِ أَخٰاكَ وَلا تُمٰازِحْهُ وَلا تَعِدْهُ مَوْعِداً فَتُخْلِفَهُ»[5] واتە: «لەگەڵ دۆست و برادەرتا دەمەقڕە مەکە و گاڵتەی پێ مەکە و جێ‌ژوانی لەگەڵدا دیاری مەکە و پاشانە کە نەچی».

---

١. «كَمْ مِنْ كَلامٍ قَدْ مَنَعَنِيهِ حَدِيثُ بِلالِ بْنِ الْحٰارِثِ». احمد: ١٥٢٩١.

٢. احمد: ٨٨٥٢ بلفظه، و بخاری: ٥٩٩٧ و احمد: ٥٩٩٧ بلفظ: «... لا يُلْقَىٰ لَهٰا بٰالاً يَهْوِي بِهٰا فِي جَهَنَّمَ» و فی مسلم: ٥٣٠٣ـ٥٣٠٤ و بخاری: ٥٩٩٦ و احمد: ٨٥٦٧ بلفظ: «... يَهْوِي بِهٰا فِي النّٰارِ أَبْعَدَ مٰابَيْنَ الْمَشْرِقِ وَالْمَغْرِبِ»، و فی ترمذی: ٢٢٣٦ و احمد: ٦٩١٧ ـ ٧٦١٧ و ابن‌ماجه: ٣٩٦٠ بلفظ: «... يَهْوِي بِهٰا سَبْعِينَ خَرِيفاً».

٣. المدّثر: ٤٥.

٤. واتە: کاتێ پرسیار ئەکرێ لە دۆزەخیان کە لەبەر چی لە دۆزەخیان خستوون، ئەمە وەڵامیانە ـ وەرگێڕ.

٥. ترمذی: ١٩١٨.

پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «مَنْ تَرَكَ الْمِرَاءَ وَ هُوَ مُحِقٌّ بُنِيَ لَهُ بَيْتٌ فِي أَعْلَى الْجَنَّةِ وَ مَنْ تَرَكَ الْمِرَاءَ وَ هُوَ مُبْطِلٌ بُنِيَ لَهُ بَيْتٌ فِي رَبَضِ الْجَنَّةِ»[1].

واتە: «هەرکەس دەس لە جەدەل و دەمەقرە هەڵبگرێ، لەگەڵ ئەوەشدا کە حەقی بەدەستە، ئەوە خانوویێکی لە لاژووری بەهەشتەوە بۆ ئەکرێتەوە، هەروەها ئەگەر دەس لە دەمەقرە و کێشە هەڵگرێ لەگەڵ ئەوەیشدا کە ناحەقوێژ بێت ئەوە لە دەور و بەری بەهەشتدا خانووێکی بۆ دەکرێتەوە».

## ئافەتی پێنجەم: دژەبەرایەتی

دژەبەرایەتی ـ ئەمەش دیسان خراپە ـ بریتییە لەوەی کە دوژمنی بکەی لەگەڵ کەسێکدا تا حەقێك یان ماڵێکی لێ بستێنی.

حەزرەتی عائیشەرضي الله عنها ڕیوایەتی کردووە کە: پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «أَبْغَضُ الرِّجَالِ إِلَى اللهِ الْأَلَدُّ الْخَصِمُ»[2] واتە: «خوا لەو پیاوەی کە لە دژایەتیدا چەق و سەختگیرە لە هەموو کەس زیاتر ڕقیە».

ئەبوو هورەیرەرضي الله عنه ڕیوایەتی کردووە کە: پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «مَنْ جَادَلَ فِي خُصُومَةٍ بِغَيْرِ عِلْمٍ لَمْ يَزَلْ فِي سَخَطِ اللهِ حَتَّىٰ يَنْزِعَ»[3] واتە: «هەرکەس چەقەی زۆر بکات لە دوژمنایەتیدا، بە بێ ئەوەی کە [ڕاست و ناڕاست] بزانێ، ئەوە تا گیانی دەردەچێ وەبەر تووڕەی خودا دەکەوێ».

## ئافەتی شەشەم: بە زۆر ئاو و تاودان بە قسەو بە زۆر وەزن و قافیە پێدان

پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «أَنَا و أَتْقِيَاءُ أُمَّتِي بُرَآءُ مِنَ التَّكَلُّفِ»[4] واتە: «ئەمن و خۆپارێزانی ئوممەتم دوورین لەوەی زۆر لەخۆیان بکەن بۆ قسە».

---

۱. ترمذی: ۱۹۱٦، ابن‌ماجە: ۵۰ بروايات مختلفة.

۲. بخاری: ۲۲۷۷ ـ ٤۱٦۱ ـ ٦٦۵۱، مسلم: ٤۸۲۱، ترمذی: ۲۹۰۲، نسائی: ۵۳۲۸، احمد: ۲۳۱٤۲ ـ ۲٤۵۲۲.

۳. جامع الکبیر للسیوطی: ٤٦٦۸، حرف المیم و کنز العمال للهندی: ۷۹۲۹ بلفظه، طبرانی فی مسند الشامیّین: ۲۳٦۱، بیهقی فی شعب الإیمان: ۷۲۷۱ بلفظ: «... مَنْ أَعَانَ عَلَىٰ خُصُومَةٍ ...».

٤. المقاصد الحسنة للسخاوی: ۵۵/۱، حرف الهمزة، کشف الخفاء للعجلونی: ٦۱۰ ـ ٦۲۱ بلفظ: «أَنَا وَالْأَتْقِيَاءُ مِنْ أُمَّتِي بَرِيئُونَ مِنَ التَّكَلُّفِ»، الدّرر المنتثره للسیوطی: ۳/۱، حرف الألف، جامع الکبیر للسیوطی: ۲۵۷ حرف الهمزة. و فی روایة بنحوه: «نُهِينَا عَنِ التَّكَلُّفِ» بخاری: ٦۷٤۹، جامع الأصول لابن‌الأثیر: ۳۰٦۸.

حەزرەتی فاتمە رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا ڕیوایەتی کردووە کە: پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فەرموویەتی: خراپترینی ئوممەتی من ئەو دەوڵەمەندانەن کە هەموو جۆرە خواردەمەنییەك دەخۆن و لیباسی ڕەنگاوڕەنگ دەکەنە بەریان و لە قسەکانیاندا لاف و گەزاف لێ دەدەن[1].

## ئافەتی حەوتەم: دژوێن و نارەوا وتن و دەمپیسی

پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فەرموویەتی: «إِيَّاكُمْ والْفَحْشَ، فَإِنَّ اللّٰهَ لا يُحِبُّ الفَحْشَ و لَا التَّفَحُّشَ».[2] واتە: «ئامان ئێوە و نارەوا وتن، چونکە بێ‌گومان خوا خۆشی لە دژوێن و دژوێن‌فرۆشی نایە».

تەنانەت پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نەیدەهێشت جنێو بدەن بە کوژراوە کافرەکانی جەنگی بەدر[3].

پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فەرموویەتی: «اَلْبِذٰاءُ، وَالْبَيٰانُ شُعْبَتٰانِ مِنَ النِّفٰاقِ»[4] واتە: «دەمپیسی و ناوی خەڵك زڕاندن دوو لقی دووڕوویین».

## ئافەتی هەشتەم: تووك و نفرین‌کردن، فەرق ناکات چ نفرینی مرۆڤ بێ یان گیانلەبەر یان بێ‌گیان:

پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فەرموویەتی: «اَلْمُؤْمِنُ لَيْسَ بِلَعّٰانٍ»[5] واتە: «ئیماندار، نفرین‌کەر نییە».

حوزەیفە رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ فەرموویەتی: «هەر هۆزێ نفرینی یەکتریان کردبێ، بێ‌شك ئەو نفرینە تووشی خۆیان بووەتەوە»[6].

---

۱. حاکم فی المستدرك: ٦٤٩٢، طبرانی فی الکبیر: ٧٣٨٨ ـ ٧٣٨٩، بیهقی فی شعب الإیمان: ٥٢٨١.

۲. احمد: ٦١٩٩ ـ ٦٥٤٢، طبرانی فی الکبیر: ١٤٧٩ بلفظه. و مسلم: ٤٠٢٨، ابوداود: ٣٥٦٦ دون ذکر: «وَإِيّٰاكُمْ الفُحْشَ». و فی روایة: قال صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لعائشة: «... عَلَيْكِ بِالرِّفْقِ وَ إِيّٰاكِ وَالْعُنْفَ وَالْفُحْشَ ...» بخاری: ٥٥٧٠ ـ ٥٩٢٢.

۳. ابن‌ابی‌الدّنیا فی الحلم: ١١٣ و فی الصّمت: ٣٢١، تحفة الأحوذی شرح التّرمذی: ١٩٠٥، عمدة القاری شرح صحیح البخاری للعینی: ١٧٤/١٣، الجامع فی الحدیث لابن‌وهب: ٤٦٣ بلفظ: «لا تَسُبُّوا هٰؤُلاءِ فَإِنَّهُ لا يَخْلُصُ إِلَيْهِمْ شَيْءٌ مِمّٰا تَقُولُونَ وَ تُؤْذُونَ الْأَحْيٰاءَ أَلا إِنَّ الْبَذٰاءَ لُؤْمٌ». ترمذی: ١٩٠٥، احمد: ١٧٤٩٩ بلفظ: «لا تَسُبُّوا الْأَمْوٰاتَ فَتُؤْذُوا الْأَحْيٰاءَ».

٤. ترمذی: ١٩٥٠، احمد: ٢١٢٨٠.

٥. ترمذی: ١٩٠٠، احمد: ٣٦٤٦ بروایات مختلفة. و فی روایة: «... لَعْنُ الْمُؤْمِنِ كَقَتْلِهِ ...» مسلم: ١٦٠، بخاری: ٥٦٤٠، احمد: ١٥٧٩٠، ترمذی: ٢٥٦٠ بلفظ: «... وَلاعِنُ الْمُؤْمِنِ ...».

٦. «مٰا تَلاعَنَ قَوْمٌ قَطُّ إِلّٰا حَقَّ عَلَيْهِمُ الْقَوْلُ» بخاری فی الادب المفرد: ٣٢٧، ابن‌ابی‌شیبة فی مصنفه: ٦٢٨/٨، عبد الرّزّاق فی مصنفه: ١٩٥٣٥، بیهقی فی شعب الإیمان: ٤٧٩٦.

حەزرەتی عائیشەرَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا فەرموویەتی: پێغەمبەرصَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ گوێی لە ئەبووبەکررَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ بوو کە نفرینی یەکێ لە بەردەکانی دەکرد، پێغەمبەرصَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ڕووی لێ کرد و گوتی: «يَا أَبَابَكْرٍ! صِدِّيقِينَ وَ لَعَّانِينَ، كَلَّا وَ رَبِّ الْكَعْبَةِ وَ أَعَادَ مَرَّتَيْنِ أَوْ ثَلاثاً»[1].

واتە: «ئەی ئەبووبەکر! سوێند بەخوای کەعبە سیددیق و نفرین پێکەوە نایانکرێ؟! دوو جار، یان سێ جار دووپاتی کردەوە». هەر ئەو ڕۆژە ئەبووبەکررَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ ئەو بەردەیە ئازاد کرد و هات بۆلای پێغەمبەرصَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فەرمووی: ئیتر دووبارەی ناکەمەوە.

جا بزانە هەرکەس بە پێی شەرع سابت بووبێ کە نفرین لێکراوە، وەکوو: ئەبووجەهل، فیرعەون، ئەوە قەیدی نییە نفرین و تووك بکرێن، هەروەك چۆن نفرین نەکردنیشیان قەیدی نییە. بەڵام لە تووك و نفرینی جوولەکەدا مەترسی هەیە، چونکە لەوانەیە کە خوای مەزن لە چارەنووسیدا ئیسلامی بەنسیبی کردبێ، ئەوە ئیدی ترسی هەیە نفرین بکرێن، مەگەر ئەوەی نفرینەکەی مەرجدار بکات و بڵێ: ئەگەر لەسەر دینی جوو بمرێ. بە کورتی، تەنانەت نفرین نەکردنی شەیتانیش هیچ قەیدی نییە، ئەدی چ بگات بە غەیری شەیتان، کە وابوو باشتر وایە موسڵمان بە تەواوی تووك و نفرین تەرك بکات و زمانی لێ بپارێزێ.

## ئافەتی نۆهەم: گۆرانی و هەڵبەست

باسی گۆرانی لەبابەتی سەماعدا ڕابورد. بەڵام شیعر: وتەیێکە چاکی چاکە و خراپی خراپە، تەنها ئەوەی هەیە خۆ بۆ تەرخانکردنی خراپە.

پێغەمبەرصَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فەرموویەتی: «لَأَنْ يَمْتَلِيءَ جَوْفُ أَحَدِكُمْ قَيْحاً حَتَّىٰ يَرِيَهُ، خَيْرٌ لَهُ مِنْ أَنْ يَمْتَلِيءَ شِعْراً»[2].

واتە: «سکتان پڕ بێ لە کیم و چڵك بەجۆرێ ناوزگی بخواتەوە و زایەی بکات، باشترە لەوەی پڕ بێ لە شیعر». جا خراپەی ئەو شیعر و هەڵبەستانە لە کاتێکدایە کە بەردەوام شیعر بوێژرێ و تەواو کاتی بۆ تەرخان بکرێ، دەنا حەدیسیتر هاتووە ڕەوابوونی شیعر دەسەلمێنێ.

---

١. بخاری فی الأدب المفرد: ٣٢٨ بلفظ: «...اللَّعَّانِينَ وَالصِّدِّيقِينَ؟ كَلَّا وَ رَبِّ الْكَعْبَةِ».

٢. بخاری: ٥٦٨٨ ـ ٥٦٨٩، مسلم: ٤١٩١ ـ ٤١٩٣، ابوداود: ٤٣٥٦، ترمذی: ٢٧٧٨ ـ ٢٧٧٩، ابن‌ماجە: ٣٧٤٩ ـ ٣٧٥٠، احمد: ١٤٢٤ ـ ٧٥٣٥ ـ ١٠٩٤١ بروايات مختلفة.

## ئافەتی دەهەم: گاڵته و گەپ

پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «لا تُمارِ أَخاكَ، وَلا تُمازِحْهُ»[1] واته: «دەمەقرە و دەمەتەقێ لەگەڵ برادەرەکەتا مەکە».

جا بزانە، زۆر گاڵته و گەپکردن نەهی لێ کراوە، چونکە ئەبێتە هۆی پێکەنینی زۆر و ئەدی زۆر پێکەنینیش دڵ دەمرێنێ.

پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «إِنّي لَأَمْزَحُ وَلا أَقُولُ إِلَّا حَقًّا»[2] واته: «بێگومان ئەمن گاڵته و گەپ دەکەم بەس جگە ڕاست نەبێ چیتر ناڵێم».

دەگێڕنەوە کە پێغەمبەرﷺ بە سوهەیبی فەرموو: «أَتَأْكُلُ التَّمْرَ وَ أَنْتَ رَمِدٌ؟ فَقالَ: آكِلُ بِالشِّقِ الْآخَرِ، فَتَبَسَّمَ رَسُولُ اللّٰهِﷺ»[3].

واته: «ئەرێ تۆ چاوت دەگلێ و خورماش دەخۆی؟! ئەویش گوتی: ئەمن بەو لا کەیترم دەیخۆم، پێغەمبەرﷺ بزەی کەنین گرتی».

## ئافەتی یازدەهەم: تیتاڵی و گاڵته بە خەڵك

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿لا يَسْخَرْ قَوْمٌ مِنْ قَوْمٍ﴾[4]. واته: «کەستان گاڵته و تیتاڵی بە کەسیترتان نەکات» تیتاڵیکردن بریتییە لە سووکایەتیکردن و ناودێرکردنی عەیبی خەڵکی و زۆر جاریش بە دەمەلاسکێکردنەوە چ بە قسە، چ بە کردەوە.

پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «إِنَّ الْمُسْتَهْزِئِينَ بِالنّاسِ يُفْتَحُ لِأَحَدِهِمْ بابٌ مِنَ الْجَنَّةِ فَيُقالُ: هَلُمَّ هَلُمَّ، فَيَجِيءُ بِكَرْبِهِ وَ غَمِّهِ، فَإِذا أَتاهُ أُغْلِقَ دُونَهُ فَما يَزالُ كَذٰلِكَ حَتّىٰ إِنَّ الرَّجُلَ لَيُفْتَحُ لَهُ الْبابُ فَيُقالُ لَهُ: هَلُمَّ هَلُمَّ فَلا يَأْتِيهِ»[5].

---

١. ترمذی: ١٩١٨، بیهقی فی شعب الإیمان: ٨٠٧٣.

٢. ترمذی: ١٩١٣، احمد: ٨٣٦٦ ـ ٨١٢٥ بلفظ: «...إِنَّكَ تُداعِبُنا، قالَ: إِنّي لا أَقُولُ إِلَّا حَقًّا».

٣. ابن‌ماجه: ٣٤٣٤، حاکم فی المستدرك: ٨٣٧٣، بلفظ: «...تَأْكُلُ تَمْراً وَ بِكَ رَمَدٌ؟ قالَ: فَقُلْتُ: إِنّي أَمْضَغُ مِنْ ناحِيَةٍ أُخْرىٰ...»، و فی روایة: «...أَمْضُهُ...» طبرانی فی الکبیر: ٧١٥٢.

٤. الحجرات: ١١.

٥. بیهقی فی شعب الإیمان: ٦٣٣٣، ابن‌ابی‌الدّنیا فی ذم الغیبة والنّمیمة: ١٤٥ و فی الصّمت: ٢٨٤، سیوطی فی جامع الکبیر: ٥٣٧، حرف الهمزة.

واتە: «بێگومان ئەوەی وا بە خەڵك تیتاڵی دەكات لە بەهەشتدا دەركەیێكی بەڕوودا ئەکرێتەوە پێ دەڵێن: وەرە وەرە، ئەویش بە باری خەم و خەفەتەوە هەرکە دێ بڕواتە ناوەوە خێرا دەرکەی بەڕوودا دادەخرێ، پاشان دەرکەی‌تری بۆ ئاوەڵا دەبێ و پێ دەڵێن: وەرە وەرە، ئەویش دیسان بەو بارە خەم و خەفەتەوە دێ لەوێوە بڕواتە ناوەوە، دیسان دەرکەی بەڕوودا دادەخرێ، ئیدی هەر بەم چەشنە درێژەی هەیە، تا وای لێ دێ دەرکەی بۆ ئاوەڵا دەبێ و پێ دەوترێ: وەرە وەرە، بەڵام ئەو ناڕوا».

مەعازی کوڕی جەبەلﷺ ڕیوایەتی کردووە کە: پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «مَنْ عَيَّرَ أَخَاهُ بِذَنْبٍ قَدْ تَابَ مِنْهُ، لَمْ يَمُتْ حَتَّىٰ يَعْمَلَهُ»[1]. واتە: «هەرکەس برادەرێکی لەسەر گوناحێ کە تەوبەی لێ کردووە، لۆمە بکات، ئەوە نامرێ مەگین خۆی تووشی ئەو گوناحە دەبێت».

## ئافەتی دوازدەهەم: ئاشکراکردنی نهێنی

ئەمەش [لە دیندا] نەهی لێ کراوە، چونکە سووکایەتی و ئازاری دۆستانی تێدایە.پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «اَلْحَدِيثُ بَيْنَكُمْ أَمَانَةٌ»[2]، واتە: «قسە لە نێوانتاندا ئەمانەتە».

## ئافەتی سێزدەهەم: بەڵێن و وادەی درۆ

ئەمەش کارێکی خراپە، چونکە نیشانەی دووڕووی تێدایە.

خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا أَوْفُوا بِالْعُقُودِ﴾[3]، واتە: «ئەی ئەوانەی وا ئیمانتان هێناوە، پەیمانەکانتان بەجێ بهێنن».

پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «اَلْعِدَّةُ عَطِيَّةٌ»[4] واتە: «بەڵێندان بەخششە».

---

١. ترمذی: ٢٤٢٩، طبرانی فی الأوسط: ٧٤٥٢، بیهقی فی شعب الإیمان: ٦٣٥٦.

٢. ابن‌ابی‌الدّنیا فی الصّمت: ٤٠٤ بلفظه. و فی روایة: «إِذَا حَدَّثَ الرَّجُلُ بِالْحَدِيثِ ثُمَّ الْتَفَتَ فَهِيَ أَمَانَةٌ» ابوداود: ٤٢٢٥، ترمذی: ١٨٨٢، احمد: ١٤٥٣١ ـ ١٣٩٥٠ بلفظ: «مَنْ حَدَّثَ فِي مَجْلِسٍ ...».

٣. المائدة: ١.

٤. طبرانی فی الأوسط: ١٨١٩، شهاب القضاعی فی مسنده: ٦.

## ئافەتی چواردەهەم: درۆ و سوێند بە درۆخواردن گوناحێکی ئێجگار پیسە

لە ئەبووبەکری سیددیقەوەرَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ دەگێڕنەوە کە پاش فەوتی پێغەمبەرصَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وتاری دەدا و دەیفەرموو: پێغەمبەرصَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لەم شوێنەی مندا ڕاوەستاو پاشان گریا و فەرمووی: «إِيّاكُمْ وَالْكِذْبَ، فَإِنَّهُ مَعَ الْفُجُورِ، وَ هُما فِي النّارِ»[1].

واتە: «خۆتان لە درۆ بپارێزن، چونکە بێ‌شك درۆ سەرچاوەی خراپەکارییە، ئەم دوانەش (درۆزن و خراپەکار) هەردووکیان وان لە نێو ئاگردا».

پێغەمبەرصَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فەرموویەتی: «إِنَّ الْكِذْبَ بابٌ مِنْ أَبْوابِ النِّفاقِ»[2]. واتە: «درۆ دەروازەیێکە لە دەروازەکانی دووڕوویی».

یەکێ لە پێشینیان فەرموویەتی: بەڕاستی قسە هێندە جێی پێچ و پەنای تێدایە کە پێویست بەوە ناکا درۆی بۆ بدرێ، [حەزرەتی عومەرَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ] فەرموویەتی: «أَمّا فِي الْمَعارِيضِ ما يَكْفِي الرَّجُلَ عَنِ الْكِذْبِ»[3]. واتە: «ئەرێ مەگەر قسە هێندە جێی پێچ و پەنای تێدا نییە کە پیاو بێ‌نیاز بکات لە درۆ».

## ئافەتی پازدەهەم: پاشەملە قسەکردن (غیبة)

ئەدی هەر لەپێشدا ئەوە دێنمەوە کە قورئان لەبارەی خراپیەوە دواوە: ﴿لا يَغْتَبْ بَعْضُكُمْ بَعْضاً أَيُحِبُّ أَحَدُكُمْ أَنْ يَأْكُلَ لَحْمَ أَخِيهِ مَيْتاً﴾[4].

واتە: «با کەستان لە پاشەملەی کەسێ‌ترتان قسەنەکات، ئایا کەسێك لە ئێوە هەیە حەز بکات گۆشتی براکەتان بە مردوویی بخوات؟»

---

١. ابن‌ماجە: ٣٨٣٩ و احمد: ٥ ـ ٣٤ بلفظه. و فی روایة أخری: «إِيّاكُمْ وَالْكِذْبَ، فَإِنَّ الْكِذْبَ يَهْدِي إِلَى الْفُجُورِ، وَ إِنَّ الْفُجُورَ يَهْدِي إِلَى النّارِ» ابوداود: ٤٣٣٧، احمد: ٣٨٩٩.

٢. الخرائطی فی مساوئ الأخلاق: ١٠٧ ـ ١١٦، سیوطی فی فتح الکبیر: ٣١٩٣، حرف الهمزة و جامع الکبیر: ٤٤٧.

٣. ابن‌ابی‌شیبة فی مصنفه: ١٨٥/٦، بیهقی فی السّنن الکبری: ١٩٩/١٠، طبرانی فی الکبیر: ١٤٦٢٣، شهاب القضاعی فی مسنده: ٩٤١.

٤. الحجرات: ١٢.

ئەبوو هورەیرە رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ ڕیوایەتی کردووە کە: پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فەرموویەتی: «لا تَحٰاسَدُوا، وَلا تَبٰاغَضُوا و لا تَنٰاجَشُوا، وَلا تَدٰابَرُوا، وَلا یَغْتَبْ بَعْضُكُمْ بَعْضاً، وكُونُوا عِبٰادَ اللّٰهِ إِخْوٰاناً»[1].

واتە: «ئێرەیی بە یەکتر مەبەن، بەرانبەر بە یەك ڕقتان نەبێ، یەکتری مەخەڵەتێنن، کەستان پاشەملەی ئەویترتان قسەنەکات، بەڵکوو ئێوە ئەی بەندەکانی خودا برای یەك بن».

پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فەرموویەتی: «إِیّٰاكُمْ وَالْغِیبَةَ، فَإِنَّ الْغِیبَةَ أَشَدُّ مِنَ الزِّنٰا، لِأَنَّ الرَّجُلَ إِذٰا زَنَىٰ وَ تٰابَ، فَیَتُوبُ اللّٰهُ عَلَیْهِ، وَ إِنَّ صٰاحِبَ الْغِیبَةِ لا یُغْفَرُ حَتَّىٰ یَغْفِرَ لَهُ صٰاحِبُهُ»[2].

واتە: «خۆتان لە غەیبەت بپارێزن، چونکە لە پاشەملەوە خراپەوتن سزای لە زینا سەختترە، چونکە پیاو هەرکاتێ زینا بکات و پاشان تەوبەی لێ بکات، ئەوە خودا لەو گوناحەی خۆش دەبێ، چونکە بەڕاستی غەیبەتکەر نابەخشرێ مەگەر غەیبەت کراوەکە لێی خۆش ببێ».

ئەنەس رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ ڕیوایەتی کردووە کە: پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فەرموویەتی: «مَرَرْتُ لَیْلَةَ أُسْرِيَ بِي عَلَىٰ قَوْمٍ یَخْمِشُونَ وُجُوهَهُمْ بِأَظٰافِیرِهِمْ فَقُلْتُ یٰا جِبْرِیلُ! مَنْ هٰؤُلاءِ؟ فَقٰالَ: هٰؤُلاءِ الَّذِینَ یغْتٰابُونَ النّٰاسَ وَ یَقَعُونَ فِي أَعْرٰاضِهِمْ»[3].

واتە: «ئەو شەوەی کە بۆ ئاسمانیان بردم، بەلای کۆمەڵێکدا تێپەڕیم کە بە ناخوونیان ڕوومەتیان دەڕووکان، گوتم: ئەی جوبرەئیل! ئەوانە کێن؟، گوتی: ئەوانە کەسانێکن کە غەیبەتی خەڵکیان کردووە و ئابڕوویانیان بردووە».

خودای مەزن وەحی کرد بۆ مووسا عَلَيْهِ السَّلَامُ و فەرمووی: «هەر کەس لە غەیبەت تەوبە بکات و بمرێ، ئەوە ئاخرین کەس دەڕواتە بەهەشت، هەرکەس [تەوبە نەکات و] پێداگری لەسەر بکات، ئەوە ئەووەڵین کەس دەڕواتە نێو ئاور»[4].

**پێناسەی غەیبەت:** غەیبەت بریتییە لەوەی لە پاشملەوە لەبارەی کەسێ قسەیێ بکەی کە ئەگەر پێی بگاتەوە پێی ناخۆش بێت، جا جیاوازی نییە، باسی کەم و کورتییێك لە جەستەیدا

١. بخاری: ٥٦٠٤ ـ ٥٦٠٥ ـ ٥٦٠٦، مسلم: ٤٦٤١ ـ ٤٦٤٢ ـ ٤٦٤٣ ـ ٤٦٤٦ ـ ٤٦٥٠، ابوداود: ٤٢٦٤، ترمذی: ١٨٥٨، ابن‌ماجه: ٣٨٣٩، احمد: ١٧ ـ ٧٥٣٦ ـ ٩٩٧٩ ـ ١٠٥٢٧ جمیعهم بروایات مختلفة و بعضهم زادوا: «وَلا تَحَسَّسُوا... ولا تَنافَسُوا... و لا تَجَسَّسُوا...».

٢. طبرانی فی الأوسط: ٦٧٧٨، ابوبکر الدّینوری المالکی فی المجالسة و جواهر العلم: ٣٥٤١، بیهقی فی شعب الإیمان: ٦٣١٥.

٣. ابوداود: ٤٢٣٥، احمد: ١٢٨٦١ بلفظ: «... هٰؤُلاءِ الَّذِینَ یَأْكُلُونَ لُحُومَ النّٰاسِ ...».

٤. شرح صحیح البخاری لشمس الدّین السفیری بلفظ: «مَنْ مٰاتَ تٰائِباً مِنَ الْغِیبَةِ ...».

یان لە کردەوەیدا، یان لە ئاخاوتنیدا، یان لە دینی، یان لە دونیایدا، تەنانەت باسی پۆشاك و ماڵ و ئاژەڵ و... بکرێ.

هەروەها بزانە [غەیبەت بەس بەزمان نییە] بەڵکوو بە ئاماژە و هێماش، هەر وەکوو بە ڕاشکاوی قسەکردن وایە، جیاوازی لەنێوان دەس و سەر تەکاندان لەگەڵ بە ئاشکرا و پاشەملە قسەکردندا نییە. هەروەها گوێگریش لەگەڵ بێژەرەکەیدا هاوبەشە، گوێڕاگرتن و سەرخولدان و سەرسوڕمان بۆ ئەو قسانەی کە غەیبەتکەرەکە دەیکا، خۆی هۆی پێشهێنانەوەی غەیبەتە و یارمەتی و هاوبەشی ئەوی تێدایە.

ئەبوو دەرداﷺ ڕیوایەتی کردووە کە: پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «مَنْ رَدَّ عَنْ عِرْضِ أَخِيهِ بِالْغِيبَةِ كَانَ حَقّاً عَلَى اللهِ ـ تَعَالَىٰ ـ أَنْ يَرُدَّ عَنْ عِرْضِهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ»[1].

واتە: «هەرکەس بەری غەیبەتکردنی برایەکی دینی خۆی بگرێ، ئەوە حەقە بەسەر خودای مەزنەوە کە لە ڕۆژی قیامەتدا ئابڕووی بپارێزێ».

**ڕوونکارییەك سەبارەت بەو شتانەی وا ئیزنی غەیبەتکردنیان دراوە:**

ئەمەش لە وەختێکدا دروستە کە ئامانجێکی دینی تێدا بێت، کە بریتییە لەم شەش دانەی خوارەوە:

**یەکەم:** گلەیی‌کردن سەبارەت بە ستەمێ، وەکوو ئەوەی کەسێ لەلایەن قازییەکەوە ستەمی لێ کرابێ، یان بەرتیلی لێ سەندرابێ، یان غەیری ئەمانە لەم کاتانەدا غەیبەتکردن ڕەوایە[2].

**دووهەم:** یارمەتی‌خوازی بۆ ئەوەی ناشەرعی لا ببرێ، یان گوناحکارێ چاك بکرێ و بخرێتە سەر ڕێ ڕاستە.

**سێهەم:** داوای فتواکردن [لە زانایان]، بۆ وێنە بڵێ: بابم، یان برام لە فلانە شتدا ستەمیان لێ کردووم، ئەدی تەگبیر چییە و چلۆن خۆم ڕزگار بکەم؟. لەمجۆرە شوێنانەدا ئەگەر بەجۆرێ شاراوە بێ کە نێوی کەس نەبات، باشترە.

---

١. احمد: ٢٦٢٦٠ ـ ٢٦٢٦٤، ترمذی: ١٨٥٤.

٢. ئەم جۆرە غەیبەتەش تەنها لەلای حاکم و کاربەدەستێ کە لە ئەو سەرتر بێ دروستە، بۆ ئەوەی مافی خۆی بستێنێ، نەك لە ناو خەڵکدا، هەروەك چۆن لە ئیحیادا هاتووە: ٢٠٤/٣ ـ وەرگێڕ.

**چوارەم:** ترساندنی موسڵمانان لە شەڕ و زەرەر دیتن، پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «اُذْكُرُوا الْفاجِرَ بِما فِيهِ مِنْ مَساوِيهِ يَحْذَرُهُ النّاسُ»[1] واتە: «باسی کارە خراپەکانی مرۆڤی خراپەکار بکەن، تا خەڵك خۆیانی لێ بپارێزن».

**پێنجەم:** کەسێ بە ناوێکەوە ناوبانگی دەرکردووە، وەکوو: "الأعرج"، "الأَعمَش" واتە: شەلە، ڕەش‌بین، [چەورە، کوێرە، ڕەشە ... بەجۆرێ کە کەس بەو ناوانە نەبێ نایان‌ناسێ]، ئەوە ناوبردنیان بەوانە هیچ گوناحی نییە.

**شەشەم:** هەرکەس کە بە بەرهەڵدایی خەریکی گوناح و فەساد بێت، وەکوو: پیاوی قۆندەر و خاوەنی فەحشاخانە و کەسێ بە ئاشکرا شەراب بخوات.

پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «مَنْ أَلْقَىٰ جِلْبابَ الْحَياءِ عَنْ وَجْهِهِ فَلا غِيبَةَ لَهُ»[2]. واتە: «هەرکەس پەردەی حەیای دڕان، ئەوە غەیبەتی [گوناحی] نییە».

**ڕوونکارییەك لەسەر کەفارەتی غەیبەت:**

بزانە کەسێ کە غەیبەتێکی تووش بووە پێویستە پاشگەزبێتەوە و تەوبە بکات و ئاخ و ئۆف لەسەر ئەوکارەی هەڵبکێشێ، تا مافی خودای مەزنی لە شان کەوێ، پاشان داوای گەردن‌ئازادی لە غەیبەت‌کراوەکە بکات تا لەو تاوانە ئازادی بکات، پێویستە ئەم ئازادی‌خواستنە وێڕای پەشیمانی دەربڕین و نارەحەتی بێت.

حەسەنی بەسریرحمه الله فەرموویەتی: داوای لێبوردن لە خوا بەسە و گەردن‌ئازادی پێویست نییە [هەندێ جا بەم حەدیسە بەڵگەیان هێناوەتەوە:]

ئەنەسی کوڕی مالیكرضي الله عنه لە پێغەمبەرەوەﷺ ڕیوایەت دەکات کە فەرموویەتی: «كَفّارَةُ مَنِ اغْتَبْتَهُ أَنْ تَسْتَغْفِرَ لَهُ»[3] واتە: «کەفارەتی ئەو کەسە کە لە پاشەملەیەوە قسەت کردووە، ئەوەیە، لە خودا داوای لێبوردنی بۆ بکەی».

---

١. طبرانی فی الصّغیر: ٥٥٩، بیهقی فی شعب الإیمان: ٩٢١٩، ابن‌ابی‌الدّنیت فی الصّمن: ٢١٩ و فی ذمّ الغیبه والنّمیمة: ٨١ بلفظ: «أَتَرْعَوْنَ عَنْ ذِكْرِ الْفاجِرِ...».

٢. شهاب القضاعی فی مسنده: ٤٠٧، بیهقی فی السّنن الكبری: ٢١٠/١٠، سیوطی فی الفتح الكبیر: ١١٥٢٥.

٣. بیهقی فی شعب الإیمان: ٦٣٦٧، الحارث فی البُغیة: ١٠٨٧، المطالب العالیة لابن‌حجر العسقلانی: ٢٧٧٥، ابن‌ابی‌الدّنیا فی الصّمت: ٢٩٠ و فی ذمّ الغیبة والنّمیمة: ١٥١.

موجاهیدیش فەرموویەتی: کەفارەتی گۆشتی برای خۆخواردن (واتە: پاشەملە قسەکردن) ئەوەیە کە چاکەی بڵێیت و دوعای خێری بۆ بکەی.

بەڵام باشتر لە هەموو ئەوەیە گەردنئازادی لێ بخوازی.

## ئافەتی شازدەهەم: دووزمانی و قسەهێنان و بردن

خودای مەزن فەرموویەتی: ﴿هَمَّازٍ مَشَّاءٍ بِنَمِيمٍ﴾[1] واتە: «ئەو کەسەی کە بە شوێن عەیب و عاری خەڵکەوەیە و قسەهێن و قسەبەرە».

عەبدوڵڵای کوڕی موبارەك رَحِمَهُ اللهُ فەرموویەتی: «زۆڵ ناتوانێ قسە بشارێتەوە» ئاماژە دەکا بە هەرکەسێ کە نەتوانێ قسە هەڵبگرێ و دووزمان و زمانشڕ بێ، ئەوە لەوانەیە زۆڵ بێ بە گوێرەی فەرموودەی خودای مەزن ﴿عُتُلٍّ بَعْدَ ذَٰلِكَ زَنِيمٍ﴾[2] واتە: «دەمار زلە، سەرەڕای ئەمانەش زۆڵە»[3].

خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَيْلٌ لِكُلِّ هُمَزَةٍ لُمَزَةٍ﴾[4] واتە: «هاوار بۆ هەموو ئەو کەسانە دووزمانن و بە دووی عەیب و عاردا دەگەڕێن».

خودای مەزن لە سوورەتی مەسەددا فەرموویەتی: ﴿حَمَّالَةَ الْحَطَبِ﴾[5] واتە: «دارکێش» دووزمانیش کەسێکە کە بارە قسە دەکێشێ و [گڕ بەردەداتە نێوان خەڵك].

خوای مەزن فەرموویەتی: ﴿فَخَانَتَاهُمَا فَلَمْ يُغْنِيَا عَنْهُمَا مِنَ اللهِ شَيْئًا﴾[6]. واتە: «(دوو هاوسەری نووح و لووت) خەیانەتیان کرد پێیان، ئەوانیش (نووح و لووت) نەیانتوانی لەلای خوداوە هیچ کارێکیان بۆ بکەن».

هەروەها لە حەدیسدا هاتووە «لا يَدْخُلُ الْجَنَّةَ قَتَّاتٌ»[7] واتە: «دووزمان ناڕواتە بەهەشت»، «قتات» واتە: «دوو زمان و قسەهێنەر و قسەبەر».

سەبارەت بە دوو زمانی حەدیس زۆر هاتووە.

---

١. القلم: ١١. ٢. القلم: ١٣.

٣. سوورەتی قەلەم سەبارەت بە «وەلیدی کوڕی موغەیرە» هاتە خوارەوە کە خودای گەورە یەك بە یەك عەیبەکانی ناو ئەبات، تا دەگاتە ئەو شوێنە کە ئەفەرمێ: سەرەڕای ئەمانە هەمووی، زۆڵیشە ـ وەرگێر.

٤. الهمزة: ١. ٥. المسد: ٤. ٦. التحريم: ١٠.

٧. بخاری: ٥٥٩٦، مسلم: ١٥٢ ـ ١٥٣، ابوداود: ٤٢٢٨، ترمذی: ١٩٤٩، احمد: ٢٢١٦٣ ـ ٢٢٢٤٢ ـ ٢٢٣٣٧.

**پێناسەی دوو زمانی:** دوو زمانی واتە: دەربڕینی شتێ کە نابێ دەربڕدرێ جاجیاوازی نییە، ئەو کەسە وا قسەکە لەبارەیەوە کراوە پێی ناخۆش بێ، یان ئەوە وا قسەکەیان بۆی بردۆتەوە، یان کەسی سێهەم. دیسان جیاوازی نییە ئاشکراکردنە کە بە دەم بێ، یان بە نووسین بێ، یان بە هێما و ئاماژە بێ، کەواتە بەکورتی دووزمانی بریتییە لە ئاشکراکردنی نهێنی و دڕاندنی پەردەی شتێکی شاراوە.

## ئافەتی حەڤدەهەم: دووزمانی

ئەمەش بریتییە لەوەی کەسێ لەنێوان دوو نەفەردا کە پێکەوە دژایەتیان هەیە، هاتۆچۆ بکات و لەگەڵ هەرکامیان بەجۆرێ قسە بکات کە بە دڵیەتی. ئەمەش خۆی بێ‌شك دووڕوویییە.

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «مَنْ كَانَ لَهُ وَجْهَانِ فِي الدُّنْيَا كَانَ لَهُ لِسَانَانِ مِنْ نارٍ يَوْمَ الْقِيَامَةِ»[1] واتە: «هەرکەس لە دونیا دووڕوو بێ ئەوە لە پاشە ڕۆژدا دوو زمان لە (بڵێسەی) ئاگری هەیە».

ئەبوو هورەیرە رضي الله عنه ڕیوایەتی کردووە کە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «تَجِدُونَ مِنْ شَرِّ عِبَادِ اللهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ ذَا الْوَجْهَيْنِ، الَّذِي يَأْتِي هٰؤُلاءِ بِحَدِيثِ هٰؤُلاءِ، وَ هٰؤُلاءِ بِحَدِيثِ هٰؤُلاءِ»[2]، لە ڕیوایەتێ‌تردا ئاوەهایە: «اَلَّذِي يَأْتِي هٰؤُلاءِ بِوَجْهٍ، وَ هٰؤُلاءِ بِوَجْهٍ»[3].

واتە: «لە ڕۆژی قیامەتدا تێدەگەن کە دووڕوان لە خراپترین بەندەکانی خودان، ئەوانەی کە قسەی ئەو دەستە دێنن بۆ ئەم دەستە، قسەی ئەم دەستەش ئەبەن بۆ ئەو دەستە».

## ئافەتی هەژدەهەم: تاریف و خراپە وتن (مدح و ذم):

پیاهەڵگوتن، لە هەندێ شوێندا حەرامە، بەڵام خراپەوتن غەیبەتە و تاوانە و لە پێشەوە باسەکەی ڕابورد.

مەدح و پەسن‌کردن خۆی لە خۆیدا شەش ئافەتی هەیە، چواریان لەو کەسەدایە کە پەسنەکە دەکات، دوانیشی لە پەسەن‌کراوەکەدایە.

---

١. ابوداود: ٤٢٣٠.

٢. احمد: ٨٨٠٦ ـ ١٠٠٢٣.

٣. مسلم: ٤٥٨٨ ـ ٤٧١٦، احمد: ٧٠٣٩ ـ ١٠٣٧٢.

**چوار ئافەتی پەسنکەر:**

**یەکەم:** هێندە پەسنەکەی زیاد بکات کە بەلای درۆدا بکێشی.

**دووهەم:** ڕیا و کلکەسووتەی تێکەڵ ببێت، بەم شێوە کە بەو تاریف و پەسنەی خۆشەویستییەك [کە لە دڵیا نییە] دەرببڕێ.

**سێهەم:** شتانێ بێ‌بنەما بڵێ کە خەبەری لێ نییە و بە دوویدا نەگەڕاوە.

**چوارەم:** بەو پەسنەی کەسێ دڵخۆش بکات کە زاڵم و خراپەکار بێت. ئەمە بەهیچ جۆرێ ڕەوا نییە، پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «إِنَّ اللّٰهَ ـ تَعٰالَىٰ ـ لَيَغْضِبُ إِذٰا مُدِحَ الْفٰاسِقُ»[1] واتە: «بێ‌گومان خودای مەزن تووڕە دەبێ، هەرکاتێ پەسنی کەسێکی خراپەکار بکرێ».

**بۆ پەسن‌کراوەکەش لە دوو لایەنەوە زەرەری هەیە:**

**یەکەم:** ئەبێتە هۆی خۆبەزل‌زانی و دەمارزلی.

**دووهەم:** هەرکاتێ کە تاریفی بکەن، ئەولە خۆی ڕازی ئەبێت و کەم و کورتی و ناتەواوییەکانی لەبیر دەچێتەوە، ئیدی هەوڵ و تێکۆشانی بۆ ئەنجامی کاری چاکە کەم دەبێتەوە، جا سەبارەت بەمە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «قَطَعْتَ عُنُقَ صٰاحِبِكَ وَيْحَكَ لَوْ سَمِعَهُ مٰا أَفْلَحَ»[2]. واتە: «هاوار بە ماڵت، گەردنی دۆستەکەت بڕی، چونکە ئەگەر ببیسێ ڕزگار نابێ».

## ئافەتی نۆزدەهەم: غەفڵەت و بە هەڵەدا چوون

غەفڵەت، بێ‌خەبەری لە وردەکاری و هەڵەهایێك کە دەکەونە نێو قسەی مرۆڤ، بە تایبەت لەبارەی خوداو سیفاتیەوە. بۆ وێنە حوزەیفەرضي الله عنه ڕیوایەتی کردووە کە: پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «لا يَقُلْ أَحَدُكُمْ: مٰا شٰاءَ اللّٰهُ وَ شِئْتَ، و لٰكِنْ لِيَقُلْ: مٰا شٰاءَ اللّٰهُ ثُمَّ شِئْتَ».[3]

---

۱. بیهقی فی شعب الإیمان: ٤٥٤٣، ابن‌حجر فی المطالب العالیة: ۲۸۱۲، ابی‌یعلی الموصلی فی معجمه: ۱٦۸ ـ ۱٦۹، سیوطی فی الفتح الکبیر: ۳٦۳٤، حرف الهمزة.

۲. احمد: ۱۹٥۲٦ ـ ۱۹٦۰۷ بلفظ: «... عُنُقَ أَخِيكَ لَوْ سَمِعَهٰا مٰا أَفْلَحَ أَبَداً»، و بخاری: ۲٤٦۸ ـ ٥٦۰۱، مسلم: ٥۳۱۹ ـ ٥۳۲۰، ابوداود: ٤۱۷۱، ابن‌ماجه: ۳۷۳٤ دون قوله: «... لَوْ سَمِعَهٰا ...».

۳. ابن‌ماجه: ۲۱۰۸ بلفظه، نسائی: ۳۷۱۳، احمد: ۲٥۸٤٥ بروایة أخری.

واتە: «کەستان نەڵێ: هەرچی خودا و ئێوە ویستتان، بەڵکوو بڵێ: هەرچی خوداو پاشان ئێوە ویستتان».

ئەمەش لەبەر ئەوەیە کە عەتف و بادانەوەی ڕەها، گومانی هاوبەشی دەخاتە مێشکەوە.

پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «لا تَقُولُوا لِلْمُنَافِقِ سَيِّدَنَا، فَإِنَّهُ إِنْ يَكُنْ سَيِّدَكُمْ فَقَدْ أَسْخَطْتُمْ رَبَّكُمْ»[1].

واتە: «قەت بە مرۆڤی دووڕوو و مونافق مەڵێن: گەورەم؛ چونکە ئەگەر بەڕاستی ئەو گەورەتان بێت، ئەوە خوداتان لە خۆتان ڕەنجاندووە».

پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «مَنْ قَالَ أَنَا بَرِيءٌ مِنَ الْإِسْلَامِ فَإِنْ كَانَ صَادِقاً فَهُوَ كَمَا قَالَ، وَ إِنْ كَانَ كَاذِباً فَلَيْسَ يَرْجِعُ إِلَى الْإِسْلَامِ»[2].

واتە: «هەرکەس بڵێ من بەریم لە ئیسلام ئەوە ئەگەر ڕاست بکات، هەر بەو شێوەیە کە گوتوویە (واتە بێبەرییە لە ئیسلام)، ئەگەریش درۆ بکات، ئەوە ناگەڕێتەوە نێو دینی ئیسلام».

### ئافەتی بیستەم: پرسیاری بێجێگە:

پرسیاری عەوامانە سەبارەت بە سیفاتی خودای مەزن و لەبارەی خوداوە، کە ئایا ئەم سیفات و وتانە قەدیمە یان حادیسە؟

ئەم چەشنە پرسیارە لەلایەن ئەوانەوە دەست تێوەردانی بێجێیە، چونکە ئیشی ئەوان کار و کاسبییە، نە زانست، چونکە نەخوێندەواران کاتێ لەم باسانەدا ڕۆ بچن زۆر جار دەکێشێ بەلای کافرییەوە و خۆشیان پێی نازانن. ئەم چەشنە پرسیارە لەلایەن ئەوانەوە وەك ئەوەیە کە کەسێ شوان و ئاژەڵدار سەبارەت بە نهێنیەکانی حکوومەتداری پرسیار بکات.

لە حەدیسدا هاتووە: «نَهَىٰ رَسُولُ اللّٰهِﷺ عَنِ الْقِيلِ وَ الْقَالِ وَ كَثْرَةِ السُّؤَالِ وَ إِضَاعَةِ الْمَالِ»[3].

واتە: «پێغەمبەرﷺ مەنعی فەرمووە لە وتی-وتی و پرسیاری زۆر و ماڵ لەکیسدان».

١. احمد: ٢١٨٦١. نسائی فی السّنن الکبری: ١٠٠٧٣، بیهقی فی شعب الإیمان: ٤٥٤٢.

٢. ابوداود: ٢٨٣٦، نسائی: ٣٧١٢، ابن‌ماجه: ٢٠٩١، احمد: ٢١٩٢٨ ـ ٢١٩٣٢.

٣. بخاری: ١٣٨٣ ـ ٢٢٣١ ـ ٦٧٤٨، مسلم: ٣٢٣٦ ـ ٣٢٣٨ ـ ٣٢٣٩، احمد: ٧٩٨٤ ـ ١٧٤٨٣ ـ ١٧٤٧٣.

بەکورتی سەرقاڵبوونی مرۆڤ بەوەی کە ئاخۆ پیتەکانی قورئان قەدیمە، یان حادیسە چەشنی ئەو کەسەیە کە پاشا نامەیێکی بۆ نووسیوە؛ چەند پلان و گەلاڵەی تێدا کێشاوە، ئەویش خۆی بەوە خەریك ناکات [کە بزانێ چییە]، بەڵکوو کاتی خۆی لەوەدا بە فیڕوو دەدات کە ئاخۆ پێنووسی ئەم نووسراوە تازەیە یان کۆنە، بێگومان ئەبێ لەسەر ئەم ئیشەی سزا بدرێ.

«و صلّی الله علیٰ سیدنا محمد و علیٰ آله و صحبه»

# بابەتی بیست و پێنجەم:
# ئافەتی تووڕەیی، غەرەز، ئێرەیی

## ١. زەرەری تووڕەیی

بزانە تووڕەیی ئاگرێکە بە چەشنی ژیلەمۆ (سکڵی ژێر خۆڵەمێش) لە دڵدا جێگیرە، دەمارزلیش ئەبێتە هۆی وەدەرخستنی و گڕدانی. وا دیارە تووڕەیی لەو ئاورە دروست بووە کە خودا شەیتانی لێ خولقاندووە.

ئەبووهورەیرەرَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ ڕیوایەتی کردووە، کە پیاوێ گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئیشێکم پێ پیشان بدە کە ســووك بێ [و بمباتە بەهەشت]، فەرمووی: «لا تَغْضَبْ ثُمَّ أَعادَ عَلَيْهِ، فَقالَ: لا تَغْضَبْ»[1]. واتە: «تووڕە مەبە، دیسان پیاوەکە ئەو وتەیە دووپات کردەوە، هەمدیس فەرمووی: تووڕە مەبە».

ئیبنومەسعوودرَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەرصَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فەرموویەتی: «مٰا تَعُدُّونَ الصُّرَعَةَ فِيكُمْ»، قٰالَ: قُلْنٰا الَّذِي لا يَصْرَعُهُ الرِّجٰالُ، قٰالَ: «لَيْسَ ذٰلِكَ، ولٰكِنْ الَّذِي يَمْلِكُ نَفْسَهُ عِنْدَ الغَضَبِ»[2].

واتە: «لە نێو ئێوەدا پاڵەوان بە کێ دەڵێن؟» گوتمان: هەرکەس کە نەیدەن بە عەرزدا، فەرمووی: «نە، ئەوە نییە، بەڵکوو ئەو کەسەیە کە لەکاتی تووڕەییدا بەری خۆی بگرێ».

---

١. بخاری/٥٦٥١، ترمذی/١٩٤٣، احمد/٨٣٨٩.

٢. مسلم: ٤٧٢٢، ابوداود: ٤١٤٨، احمد: ٣٤٤٤.

پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «مٰا غَضَبَ أَحَدٌ إِلَّا أَشْفَىٰ عَلَىٰ جَهَنَّمَ»[1] واتە: «هەرکەس تووڕە بێ دەڕواتە لێوارەی جەهەننەمەوە».

## ٢. بنەڕەتی تووڕەیی

بزانە! کاتێ کە بنیادەم بە پێی سروشت لەبەر هەڕەشەی نەماندایە کەچی مانەوەشی مەبەستە، خودای مەزن تووڕەیی پێ بەخشیوە [تا لە بەرانبەر ئەو مەترسیانەوە خۆی پێ بپارێزێ]. تووڕەیی خۆی هێزێکە گڕاوی لە دەروونەوە دەجۆشێ، کە خوا بەدیی هێناوە و لە ناخی مرۆڤدا چاندوویەتی، جا هەرکاتێ تەماحی تێ بکرێ و لە مەترسیدا بێ، ئەو ئاوری تووڕەییە کڵپە دەستێنێ و بڵێسەی دێ تا خوێنی دڵ گەرم دەکات و لەنێو دەمار و ڕەگەکاندا بڵاو دەبێتەوە و بەرەولای ژووررووی جەستە بەرز دەبێتەوە، هەروەك چۆن ئاور، یان ئاوی کوڵ هاتوو، وایە، جا کاریگەری لەسەر پێست دادەنێ و سووری دەکاتەوە.

جا هەرکاتێ ئەم تووڕەییە لە بەرانبەر کەسێکەوە کە دەسەڵاتی بەسەریدا نەبێ و لە بەرانبەریەوە هەست بە ترس و خۆف بکات، ئەوە کۆبوونەوەی خوێنی بە دواوەیە و لە کۆتاییدا ئەبێتە خەفەت و ڕەنگی زەرد و دامرکا و ئەبێ. بەڵام ئەگەر لە بەرانبەر کەسێکەوە بێ کە هاوشانی خۆی بێ، ئەوە خوێن دەکەوێتە نێوان دوو حاڵەتی کۆبوونەوە و بڵاوەکردندا، هەندێ جار ڕەنگی زەرد دەبێ و هەندێ جار سوور و لەگەڵ ئەوەشدا دەلەرزێ.

بەکورتی جێی تووڕەیی دڵە و بریتییە لە بە کوڵهاتنی خوێنی دڵ بۆ ئەستاندنی تۆڵە.

### هەر مرۆڤێ بەش بە حاڵی خۆی سێ پلەی هەیە:

**یەکەم:** «التفريط»، ئەمەش بریتییە لەوەی هێزی تووڕەی تێدا بنەبڕە، یان لاوازە، ئەمەش بێ‌غیرەتی لێ دەکەوێتەوە کە شتێکی خراپە، ئەمەش مەبەستی ئیمامی شافیعییەرحمه‌الله کە دەفەرمێ: «مَنِ اسْتُغْضِبَ، فَلَم يَغْضَبْ فَهُوَ حِمٰارٌ»[2] واتە: «هەرکەس کارێك بکرێ کە ئەبێ تووڕە بێ و ئەو تووڕە نەبێ، ئەوە کەرە».

---

١. جامع الكبير للسيوطي: ١٤٧٠ بلفظ: «لِلنّٰارِ بٰابٌ لا يَدْخُلُ مِنْهُ إِلّا مَنْ شَفَىٰ غَيْظَهُ بِمَعْصِيَةِ اللهِ عَزَّوَجَلَّ»، و بيهقي في شعب الإيمان: ٧٩٧٨ بلفظ: «...بِسَخَطِ اللهِ».

٢. سير اعلام النّبلاء للذهبي: ٣٠/١٩ ـ ٤٣/١٠ في مناقب الشافعيرحمه‌الله.

**دووهەم:** «الاعتدال» واتە شێوەی نە زۆر نە کەم، ئەم جۆرەیە کە خودای مەزن پەسنی هاوەڵانی پێغەمبەری - خوایان لێ ڕازی بێ - پێ کردووە «أَشِدّٰاءُ عَلَى الْكُفّٰارِ رُحَمٰاءُ بَيْنَهُمْ»[1]، واتە: «سەبارەت بە کافران دڵڕەقن، لە بەین خۆیاندا بە ڕەحم و بە سۆزن».

**سێهەم:** «الإفراط» واتە: زیادەڕەوی، ئەمەش بریتییە لەوەی لە سنووری دیاریکراو لا بدات و تووڕەیی بەجۆرێ بەسەر ئەو کەسەدا زاڵ بێت، کە لەژێر دەسەڵاتی عەقڵ و دیندا نەمێنێ و خۆڕاگری خۆی لە دەست بدات. بەو حاڵەتەوە وەکوو نەخۆشی لێ دێت.

ئەم جۆرە تووڕەییە خراپە، ڕواڵەتی دەگۆڕێ و دزێو دەبێت و دەروونی لە ڕواڵەتی دزێوتر و قیزەونتر دەبێت.

دەگێڕنەوە جارێ حەزرەتی عائیشە رضي الله عنها تووڕە بوو، پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرمووی: «مٰالَكِ يٰا عٰائِشَةُ جٰاءَ شَيْطٰانُكِ؟ فَقٰالَتْ و مٰالَكَ شَيْطٰانٌ؟ قٰالَ: بَلَىٰ، ولٰكِنْ دَعَوْتُ اللهَ فَأَعٰانَنِي عَلَيْهِ فَأَسْلَمَ، فَلا يَأْمُرُنِي إِلّٰا بِالْخَيْرِ»[2].

واتە: «ئەرێ عائیشە چیت لێ قەوماوە، شەیتانەکەت هاتووە بۆلات؟ گوتی: بۆچی تۆ شەیتانت نییە؟ فەرمووی: بۆچی نە، هەمە، بەڵام داوام کردووە لە خودا و خوداش یارمەتی داوم و موسڵمانم کردووە. ئیدی جگە بۆ ئیشی چاکە نەبێ فەرمانم پێ نادات».

حەزرەتی عەلی رضي الله عنه فەرموویەتی: پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم قەت بۆ ماڵی دونیا تووڕە نەئەبوو، بەڵام کاتێ کە لەسەر حەقێك تووڕە بووبا، کەس پەی پێ نەئەبرد و هیچێ بەری ئەو تووڕەییە نەدەگرت، تا ئەو حەقەی ڕاست دەکردەوە.

بزانە! هەرچەندەش تووڕەیی ناکرێ بنەبڕ بکرێ، بەڵام ئەکرێ کەم بکرێتەوە و بە تایبەتی بۆ لابردنی خەریکی تێکۆشان بێت بەو مەرجەی ئەگەر تووڕەییکە لەسەر پێداویستییە زەرووریەکانی ژین نەبێت.

---

١. الفتح: ٢٩.

٢. فی روایة لـ مسلم: ٥٠٣٥، نسائی: ٣٨٩٨، احمد: ٢٣٧٠١ بلفظ أخرى و فیه نصفه الاوّل فقط: «أَقَدْ جٰاءَكِ شَيْطٰانُكِ؟ قٰالَتْ: يٰا رَسُولَ اللهِ! أَوَ مَعِيَ شَيْطٰانٌ؟ قٰالَ: نَعَمْ وَ مَعَ كُلِّ إِنْسٰانٍ ...» و فی روایة: «أَمٰا لَكِ شَيْطٰانٌ؟ ...» و فی روایة: «أَفَأَخَذَكِ شَيْطٰانٌ؟ ...». و فی روایة لـ مسلم: ٥٠٣٤ و احمد: ٣٥٩١ ـ ٤١٦٠ بلفظ أخرى و فیه نصفه الثّانی فقط: «... إِنَّ اللهَ أَعٰانَنِي عَلَيْهِ فَأَسْلَمَ فَلا يَأْمُرُنِي إِلّٰا بِخَيْرٍ».

جا بزانە، تووڕەیی با نەکرێ بە تەواوی چارەسەر بکرێ، بەڵام دەکرێ کەم بکرێتەوە و هەوڵی چارەسەری بۆ بدرێ، بەم شێوەیە کە نەفسی بناسێ و بزانێ چەندە خوار و پەستە و هەروەها بزانێ کە پێویست ناکات نەفسی بەو پەستی و بێنرخییەوە بەرز ڕابگرێ.

## [٣.] ڕەوشتی چارەسەری تووڕەیی و دامرکاندنی لەکاتی تاوگرتنیدا

ئەمەش بە چەند جۆر ئەکرێ:

[١.] بزانێ خێری خۆڕاگرتن و خۆخواردنەوە چەندە زۆرە، هەروەك چۆن ڕوونمان کردەوە.

[٢.] خۆی بە سزاو ئەشکەنجەی خودا بترسێنێ و بزانێ کە خودا لە هەمووکەس بەسەر ئەودا بە دەسەڵاتترە.

[٣.] خۆی بەوە بترسێنێ کە ئەگەر تۆڵە بستێنێ، ئەوە هەمدیسان، ناحەزەکەی قۆڵی بۆ هەڵدەکات بۆ ئازاردانی و ئەمەش ئەبێتە هۆی دوژمنییەکی نەبڕاوە.

[٤.] بیر لە دزێویی ڕوخساری بکاتەوە کە لە بەرچاوی خەڵکەوە لەکاتی تووڕەییدا چەندە ناشیرین دەبێ و تێك‌دەچێ، بزانێ ئەگەر لەسەر ئەو تووڕەییە بێت، وەکوو دڕندەیەکی لێ دێت. بەڵام بزانێ ئەگەر خۆڕاگر بێ وەکوو پێغەمبەران و دۆستانی خودایە.

[٥.] بیر لەوە بکاتەوە کە هۆی ئەم تووڕەبوونەیە لەبەر ئەوەیە کە ئەو کارە وا ئەم لەسەری تووڕە بووە بە پێی ویستی خودا وابووە، نە بە پێی ویستی خۆی، لە حەدیسدا هاتووە کە ئەم جۆرە تووڕەبوونە ئەبێتە هۆی تووڕەبوونی خودا.

جا پاش زانینی ئەم چەند ڕەوشتە بەرگرییە بزانە کە لەکاتی تووڕەبووندا پێویستە بڵێ: «أَعُوذُ بِاللهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ»[1] واتە: «لە دەستی شەیتانی ڕفێندراو پەنا بە خودا دەگرم».

هەروەها پێغەمبەرﷺ فەرمانی داوە کە لەکاتی تووڕەییدا ئەوە بوێژرێ.

هەر کاتێ حەزرەتی عائیشە رضي الله عنها تووڕە بووایە پێغەمبەرﷺ لووتی دەگرت و دەیگوت: «يَا عُوَيْشُ قُولِي: اَللّٰهُمَّ رَبَّ مُحَمَّدٍ! اِغْفِرْ لِي ذَنْبِي، وَ اذْهَبْ غَيْظَ قَلْبِي، وَ أَجِرْنِي مِنْ مُضِلَّاتِ

١. بخاري: ٣٠٤٠ ـ ٥٦٥٠، مسلم: ٤٧٢٥ ـ ٤٧٣٦، ابوداود: ٤١٥٠، ترمذي: ٣٣٧٤، احمد: ٢١٠٩٥ ـ ٢٥٩٤٨ جميعهم بروايات مختلفة منها: «... رَجُلانِ يَسْتَبَّانِ فَأَحَدُهُمَا احْمَرَّ وَجْهُهُ وَانْتَفَخَتْ أَوْدَاجُهُ فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: إِنِّي لَأَعْلَمُ كَلِمَةً لَوْ قَالَهَا ذَهَبَ عَنْهُ مَا يَجِدُ، لَوْ قَالَ: أَعُوذُ بِاللهِ مِنَ الشَّيْطَانِ ذَهَبَ عَنْهُ ...» و منها: «... حَتَّىٰ عُرِفَ الْغَضَبُ فِي وَجْهِ أَحَدِهِمَا ... لَوْ قَالَهَا لَذَهَبَ غَضَبُهُ أَعُوذُ بِاللهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ».

الْفِتَنِ مٰا ظَهَرَ مِنْهٰا وَ مٰا بَطَنَ»[1].

واتە: «ئەی عایشۆکێ! بڵێ: خودایا، ئەی پەروەردگاری موحەممەد! لە گوناحانم خۆش بەو ڕقی دڵم دامرکێنە و لەو ئافەتە گومڕاکەرانە ڕزگارم بکە، چ ئەوانەی وا دیارن و چ ئەوانەی وا شاراوەن».

با کەسێ تووڕە ئەبێ ئەم دۆعایە بڵێ و ئەگەر بە پێوەیە دابنیشێ، ئەگەریش دانیشتووە، ڕاکشێ[2].

پێغەمبەرصَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فەرموویەتی: «إِنَّ الْغَضَبَ جَمْرَةٌ تُوقَدُ فِي الْقَلْبِ أَلَمْ تَرَوْا إِلَى انْتِفٰاخِ أَوْدٰاجِهِ وَ حُمْرَةِ عَيْنَيْهِ، فَإِذٰا وَجَدَ أَحَدُكُمْ مِنْ ذٰلِكَ شَيْئاً، فَإِنْ كٰانَ قٰائِماً فَلْيَجْلِسْ، و إِنْ كٰانَ جٰالِساً فَلْيَنَمْ، فَإِنْ لَمْ يَزَلْ ذٰلِكَ فَلْيَتَوَضَّأْ بِالْمٰاءِ الْبٰارِدِ، أَوْ لِيَغْتَسِلْ فَإِنَّ النّٰارَ لا يُطْفِئُهٰا إِلَّا الْمٰاءُ»[3].

واتە: «بێ‌گومان تووڕەیی پشکۆیەکە لە دڵدا گڕ دەدرێ، مەگەر نەتان‌ڕوانیوە بۆ باکردنی ڕەگەکانی و سووربوونەوەی چاوی، جا هەرکات هەرکامتان ئەم حاڵەتەی بەسەرا هات، ئەگەر بە پێوە بوو دابنیشێ، ئەگەریش دانیشتبوو، با پاڵکەوێ، جا ئەگەر ئەم حاڵەتەی لەکۆڵ نەکەوت، با بە ئاوی سارد دەست‌نوێژ بگرێ، یان خۆی بشوات، چونکە ئاگر تەنها ئاو دەیکوژێنێتەوە».

## [٤.] خێرو گەورەیی خۆڕاگری

بزانە بەتاقەت‌بوون لە ڕقخواردنەوە باشترە، چونکە ڕقخواردنەوە زۆرییە و لە خۆ زۆرکردنە، بەڵام تاقەت‌گرتن نیشانەی پوختی عەقڵە و شکاندنی هێزی تووڕەیی لە ژێر چاوەدێری عەقڵدایە، سەرەتاکەشی بە کوڵ‌دامرکانەوە دەست پێ دەکات، پاشان دەبێتە خوو و خدە.

---

١. احمد: ٢٥٣٦٤، طبرانی فی الکبیر: ١٩٢٣٧، بیهقی فی الدّعوات الکبیر: ٣٠٦ من حدیث امّ‌سلمة. و فی روایة ابن‌السّنّی فی عمل الیوم واللّیلة: ٤٥٤ ـ ٦٢١ و سیوطی فی الفتح الکبیر: ٩١٥٥، حرف الکاف من حدیث عائشة. جمیعهم دون ذکر: «مٰا ظَهَرَ وَ مٰا بَطَنَ».

٢. «إِذٰا غَضِبَ أَحَدُكُمْ وَهُوَ قٰائِمٌ فَلْيَجْلِسْ فَإِنْ ذَهَبَ عَنْهُ الْغَضَبُ، وَإِلّٰا فَلْيَضْطَجِعْ» ابوداود: ٤١٥١، احمد: ٢٠٣٨٦.

٣. فیه روایات مختلفة، منها: «إِنَّ الْغَضَبَ مِنَ الشَّيْطٰانِ وَ إِنَّ الشَّيْطٰانَ خُلِقَ مِنَ النّٰارِ، وَ إِنَّمٰا تُطْفَأُ النّٰارُ بِالْمٰاءِ، فَإِذٰا غَضِبَ أَحَدُكُمْ فَلْيَتَوَضَّأْ» ابوداود: ٤١٥٢، احمد: ١٧٣٠٢. و منها: «إِنَّ الْغَضَبَ جَمْرَةٌ فِي قَلْبِ ابْنِ‌آدَمَ...» ترمذی: ٢١١٧، احمد: ١٠٧١٦ ـ ١١١٥٨.

پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «إِنَّمَا الْعِلْمُ بِالتَّعَلُّمِ[1] وَالْحِلْمُ بِالتَّحَلُّمِ، وَ مَنْ يَتَحَرَّى الْخَيْرَ يُعْطَهُ، وَ مَنْ يَتَوَقَّ الشَّرَّ يُوقَهُ»[2].

واتە: «زانست بە فێربوون بەدەست دێ، تاقەتیش لە بە زۆرکردن لە خۆڕاگرتندا بەدی دێ، هەرکەس چاکەی گەرەك بێ پێی دەدرێ، هەرکەس خۆی لە شەڕ بپارێزێ دەپارێزرێ».

پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «أُطْلُبُوا الْعِلْمَ، وَاطْلُبُوا مَعَ الْعِلْمِ السَّكِينَةَ وَ الْحِلْمَ لَيِّنُوا لِمَن تَعَلِّمُونَ مِنْهُ، و لِمَنْ يَتَعَلَّمُونَ مِنْكُمْ، وَلا تَكُونُوا مِنْ جَبابِرَةِ الْعُلَمْاءِ فَيَغْلِبَ جَهْلُكُمْ عِلْمَكُمْ»[3].

واتە: «وەدووی زانین کەون، وێڕای زانینیش وەدووی ئارامش و تاقەت بکەون، لەگەڵ ئەو کەسانەدا کە شتیان لێ فێر دەبن یان شتیان فێر دەکەن، نەرم و نیان و لەسەرخۆ بن. قەت لەو زانا دڵڕەقانە مەبن، مەبادا وەهاتان پێ بێ کە نەزانی بەسەر زانینتاندا زاڵ بێ».

هەروەها پێغەمبەرﷺ لە پاڕانەوەکانیدا دەیگوت: «اَللّٰهُمَّ اغْنِنِي بِالْعِلْمِ وَ زَيِّنِّي بِالْحِلْمِ، وَ أَكْرِمْنِي بِالتَّقْوَىٰ، وَ جَمِّلْنِي بِالْعافِيَةِ»[4].

واتە: «خودایا! بە زانین بێنیازم بکە، بە تاقەت بمڕازێنەرەوە، بە خۆپارێزی بەڕێزم بکە، بە سەلامەتی شیاوم بکە».

پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «اِبْتَغُوا الرِّفْعَةَ عِنْدَ اللّٰهِ قْالُوا: وَ مْا هِيَ يْا رَسُولَ اللّٰهِ! قْالَ: تَصِلُ مَنْ قَطَعَكَ، وَ تُعْطِي مَنْ حَرَّمَكَ، وَ تَحْلُمُ عَمَّنْ جَهَلَ عَلَيْكَ»[5].

واتە: بەشوێن پلەی بەرزەوە بن بەلای خوداوە. گوتیان پلەی بەرز چییە ئەی ڕاسپاردەی خودا؟ فەرمووی: سەردانی کەسێ بکەی کە لێت تۆراوە، بەخشش بکەی لەگەڵ کەسێ تۆی بێوەری کردووە، بەرانبەر بە کەسێ کە لە ئاستی تۆدا نەزانیی کردووە، خۆڕاگر بی».

---

١. بخاری: ٦٧.

٢. طبرانی فی الکبیر: ١٧٦٣، بیهقی فی شعب الإیمان: ١٠٢٥٤، سیوطی فی جامع الکبیر: ٢٩٥٣، حرف الهمزة.

٣. جامع الکبیر للسیوطی: ٤١، حرف الهمزة، الفقه والمتفقّه للخطیب البغدادی: ٨٩٣، کنز العمال للهندی: ٢٩٢٦٧، المجالسة و جواهر العلم لأبی بکر الدینوری المالکی: ١١٩٧.

٤. جامع الکبیر للسیوطی: ٢١٤، حرف الهمزة، ابن‌ابی‌الدّنیا فی الحلم: ٣، کنز العمال للهندی: ٣٦٦٣ ـ ٣٧٥٧.

٥. جامع الکبیر للسیوطی: ١٠٢، حرف الهمزة دون ذکر: «تَصِلُ مَنْ قَطَعَكَ»، البزّار فی مسنده: ٢٧٢٧ دون: «ابْتَغُوا الرِّفْعَةَ عِنْدَ اللّٰهِ ...»، کشف الأستار للهیثمی: ١٩٤٧ بلفظ: «أَلا أَدُلُّكُمْ عَلَىٰ مْا يَرْفَعُ اللّٰهُ بِهِ الدَّرَجْاتِ؟ ...».

خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَ إِذٰا خٰاطَبَهُمُ الْجٰاهِلُونَ قٰالُوا سَـلاماً﴾[1] واتە، «هەرکاتێ نەزانان ڕوویان تێ بکەن و بیان‌دوێنن، ئەوان [بە نەرمی وڵام دەدەنەوە و] دەڵێن: سڵاو».
زانایان [لە مانای ئەم ئایەتەدا] گوتوویانە: ئەگەر نەزانان ڕووبەڕوویان بوونەوە، ئەوان بە نەزانی لەگەڵیانا ناجوڵێنەوە[2].

هەرکاتێ کەسێ جنێوی پێ دای و لە پشت‌سەرت قسەی کرد و عەیب و عاری پێتەوە لکاند، ئەوە لە سەرتە تاقەت بگری. چونکە ڕزگاری هەر دوو دونیا لە خۆڕاگریدایە. لەم دونیادا ڕێزت زیاد دەکات و لە دوا ڕۆژدا خێری زۆرت پێ دەبەخشێ.

پێغەمبەرصَلَّىٰ‌اللَّهُ‌عَلَيْهِ‌وَسَلَّمَ فەرموویەتی: «إِنِ امْرَأٌ عَيَّرَكَ بِمٰا فِيكَ فَلا تُعَيِّرْهُ بِمٰا فِيهِ»[3] واتە: «ئەگەر هات و کەسێ تانە و تەشەری ئەو عەیبانەی لێ‌دایت کە هەتە، ئەتۆ تانەی ئەو عەیبانەی کە خۆی هەیەتی لێی مەدە».

## [٥.] پاداش و خێری لێبوردن

ئەمەش بریتییە لەوەی کەسێ مافی ئەستاندنی شتێکی هەبێ و چاوپۆشی لێ بکا، وەکوو: بەخشینی تۆڵەی قیساس، یان ماڵ، یا زەرەر و زیانێ، خودای مەزن فەرموویەتی: ﴿خُذِ الْعَفْوَ وَأْمُرْ بِالْعُرفِ وَ أَعْرِضْ عَنِ الْجٰاهِلِينَ﴾[4] واتە: «لێبوردوو بە و بە کاری چاکە فەرمان بدە و پشت لە نەزانان وەرگێڕە».

هەروەها فەرموویەتی: ﴿و أَنْ تَعْفُوا أَقْرَبُ لِلتَّقْوىٰ﴾[5] واتە: «لێبوردووی زۆر نزیکە بە خواترسییەوە».

هەروەها پێغەمبەرصَلَّىٰ‌اللَّهُ‌عَلَيْهِ‌وَسَلَّمَ فەرموویەتی: «ثَلاثٌ وَالَّذِي نَفِسِي بِيَدِهِ إِنْ كُنْتُ حٰالِفاً لَحَلَفْتُ عَلَيْهِنَّ؛ مٰا نَقَصَتْ صَدَقَةٌ مِنْ مٰالٍ فَتَصَدَّقُوا، و لا عَفٰا أَحَدٌ عَنْ مَظْلَمَةٍ يَبْتَغِي بِهٰا

١. الفرقان: ٦٣.

٢. احمد فی الزّهد: ١٦٧٢ بلفظ: «حُلَمٰاءُ إِنْ جُهِلَ عَلَيْهِمْ لَمْ يَجْهَلُوا»، ابن‌ابی‌شیبة فی مصنفه: ٢٥٨/٨ بلفظ: «حُلَمٰاءُ إِنْ جُهِلَ عَلَيْهِمْ لَمْ يَسْفَهُوا...»، بیهقی فی شعب الإیمان: ٨٠٩٤ بلفظ: «حُلَمٰاءُ لا يَجْهَلُونَ عَلَىٰ أَحَدٍ وَ إِنْ جُهِلَ عَلَيْهِمْ حُلِمُوا».

٣. ابوداود: ٣٥٦٢، احمد: ١٩٧١٥ ـ ١٩٧١٧، جامع الأصول لابن‌الأثیر: ٩٤٤٣، بیهقی فی شعب الإیمان: ٧٧١٧ و زادوا: «... فَإِنَّمٰا وَبٰالُ ذٰلِكَ عَلَيْهِ».

٤. الأعراف: ١٩٩.

٥. البقرة: ٢٣٧.

وَجْهَ اللهِ إِلَّا زَادَهُ اللهُ عِزّاً يَوْمَ الْقِيامَةِ، وَلا فَتَحَ رَجُلٌ عَلَىٰ نَفْسِهِ بابَ مَسْأَلَةٍ إِلَّا فَتَحَ اللهُ عَلَيْهِ بابَ فَقْرٍ»[1].

واتە: «سىٰ‌شت هەیە، سوێند بەو کەسە کە گیانی من بە دەستیە، ئەگەر سوێندخۆر بووبام سوێندم لەسەریان دەخوارد:

[.١] خێرات قەت لە ماڵ کەم ناکاتەوە، کەوایە خێرات بکەن.

[.٢] کەسێك لەبەر ڕەزای خودا لە تاوانێ خۆش ببێت، خودا عیززەت و گەورەی لە پاشەڕۆژدا پتر دەکات.

[.٣] کەسێك کە دەرکەی سواڵکردن بەڕووی خۆی بکاتەوە خودا دەرگای نەداری بۆ دەکاتەوە و قەت دارا نابێ».

پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «اَلتَّواضُعُ لا يَزِيدُ الْعَبْدَ إِلَّا رَفْعَةً فَتَواضَعُوا يَرْفَعْكُمُ اللهُ وَالْعَفوُ لا يَزِيدُ الْعَبْدَ إِلَّا عِزّاً، فَاعْفُوا يعِزَّكُمُ اللهُ، وَالصَّدَقَةُ لا تَزِيدُ الْمالَ إِلَّا كَثْرَةً فتَصَدَّقُوا يَرحَمْكُمُ اللهُ»[2].

واتە: «خۆ بە کەمزانین جگە بەرزبوونەوەی بەندە نەبێ چیتری لێ ناوەشێتەوە، کەوابوو خۆ بە کەم بگرن تا خودا بەرزتان بکاتەوە، بەخشین و لێبوردن جگە ڕێزو گەورەیی نەبێ چیتری لێ ناکەوێتەوە، کەوابوو بەخشندە بن تا خودا ڕێزدارتان بکات، خێراتیش ئەبێتە هۆی بە پیت‌بوونی ماڵ، کەوابوو خێرات بکەن، تا خودا بەزەیی پێتانا بێتەوە».

هەروەها پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «مَنْ دَعا عَلَىٰ مَنْ ظَلَمَهُ فَقَدِ انْتَصَرَ»[3]. واتە: «هەرکەس دوعای شەڕ لەو کەسە بکات کە زوڵمی لێ‌کردووە ئەوە لە ڕاستیدا تۆڵەی لێ سەندووەتەوە».

## [.٦] خێرو چاکەی میهرەبانی و دلۆڤانی

بزانە میهرەبانی کارێکی پیرۆزە و بەری ئاکاری جوانە، توند و تیژیش دژیەتی.

---

١. ترمذی: ٢٢٤٧، احمد: ١٥٨٤ ـ ١٧٣٣٩ بروایات مختلفة منها لفظ: «ثَلاثٌ أُقْسِمُ عَلَيْهِنَّ...» و مسلم: ٤٦٨٩، مالك فی الموطأ: ١٥٩٠ ترمذی: ١٩٥٢ بلفظ أخری: «ما نَقَصَتْ صَدَقَةٌ مِنْ مالٍ... إِلّا رَفَعَهُ اللهُ».

٢. الفتح الكبير للسيوطی: ٥٥١٥، حرف التاء، كنز العمال للهندی: ٥٧١٩.

٣. ترمذی: ٣٤٧٥، ابن‌ابی‌شیبه: ٩٣/٧، الفتح الكبير للسيوطی: ١١٧٥٥، حرف الميم.

پێغەمبەرﷺ بە حەزرەتی عائیشەرضي الله عنها فەرمووی: «إِنَّهُ مَنْ أُعْطِيَ حَظَّهُ مِنَ الرِّفْقِ أُعْطِيَ حَظَّهُ مِنْ خَيْرِ الدُّنْيا، وَالْآخِرَةِ، وَمَنْ حُرِمَ حَظَّهُ مِنَ الرِّفْقِ حُرِمَ حَظَّهُ مِنْ خَيْرِ الدُّنْيا وَالْآخِرَةِ»[1].

واتە: «بێگومان هەرکەس لە میهرەبانی بەشی درابێ، ئەوە خێری دونیا و دوارۆژی بە نسیب ئەبێ، هەروەها هەرکەس لە میهرەبانی بێبەش بوو ئەوە لە خێر و چاکەی دونیاو دوارۆژ بێبەشە».

پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «إِذا أَحَبَّ اللهُ أَهْلَ بَيْتٍ أَدْخَلَ عَلَيْهِمُ الرِّفْقَ»[2] واتە: «هەرکات خودا خێزانێکی خۆش بوێ سۆز و میهرەبانی دەخاتە نێوانیان».

## [٧.] خراپەیی بەخیلی و ئێرەییبردن

بەخیلیبردن لە ڕق و قین ئەکەوێتەوە، ڕق و قینیش لە تووڕەیی، پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «اَلْحَسَدُ يَأْكُلُ الْحَسَناتِ، كَما تَأْكُلُ النّارُ الْحَطَبَ»[3]. واتە: «ئێرەییبردن چاکەکان دەخوات، هەر وەك چۆن ئاور پووش دەخوات».

بەخیلی لە حەقیقەتدا ناحەزییێکە بەرانبەر بە نیعمەتەکانی خودا بەسەر براکەیەوە و حەزە بە نەمانی، جا ئەگەر ئەو نیعمەتەی پێ ناخۆش نەبوو و حەزی بە نەمانی نەدەکرد، بەڵام حەزی دەکرد خۆی لەوەی بێ ئەوە پێ دەڵێن «غبطة» و ئاواتەخوازی.

پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «اَلْمُؤْمِنُ يَغْبِطُ وَالْمُنافِقُ يَحْسُدُ»[4] واتە: «ئیمـانـدار ئاواتەخوازی دەکات و دووڕوو بەخێلی دەبات».

خودای مەزن فەرموویەتی: ﴿وَدَّ كَثِيرٌ مِنْ أَهْلِ الْكِتابِ لَوْ يَرُدُّونَكُمْ مِنْ بَعْدِ إِيمانِكُمْ كُفّارا حَسَداً﴾[5] واتە: «زۆرێ لە ئەهلی کتێب (جوولەکە، گاور) لەڕووی بەخیلییەوە حەز دەکەن ئێوە پاش ئەوەی باوەڕتان هێناوە، هەڵتانگەڕێننەوە و کافرتان بکەن».

خودای مەزن لەم ئایەتەدا ئاماژەی بەوەکردووە کە ئەوان لەڕووی بەخیلییەوە حەزیان نەدەکرد نیعمەتی ئیمان بۆ ئەوان بێ.

---

١. ترمذی: ١٩٣٦ تماماً، و احمد: ٢٤٠٩٨ نصفه الاوّل فقط.

٢. احمد: ٢٣٢٩٠ بلفظ: «إِذا أَرادَ اللهُ عَزَّوَجَلَّ بِأَهْلِ بَيْتٍ خَيْراً...»، بیهقی فی شعب الإیمان: ٧٣٢٦.

٣. ابوداود: ٤٢٥٧، ابن‌ماجه: ٤٢٠٠، بیهقی فی شعب الإیمان: ٦١٨٤.

٤. کشف الخفاء للعجلونی: ٢٦٩٤. ٥. البقرة: ١٠٩.

خودای مەزن فەرموویەتی: ﴿وَلَا تَتَمَنَّوْا مَا فَضَّلَ اللَّهُ بِهِ بَعْضَكُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ﴾[1] واتە: «ئاواتی شتێ مەخوازن کە خودا بەهۆی ئەوەوە هەندێکتانی بەسەر هەندێ‌ترتاندا، گەورە کردووە». لێرەدا مەبەست نەهی‌کردنە لە ئاوات‌خواستنی نەمانی شتێك لەلای کەسێك و هاتنی ئەو شتە بۆلای ئەم.

بەڵام ئەوەی کە ئاواتەخواز بێ کە خودا وێنەی ئەو نیعمەتەی بداتێ ئەوە خراپ نییە و ئەگەریش داخوازییەکە دینی بێ ئەوە زۆر باشە.

## هۆکارەکانی بەخێڵی بردن:

بزانە بەخیلی‌بردن هۆکاری زۆرە، کە بریتین لە: دوژمنی، خۆبەزل‌زانی، قین و رق، دەمارزلی، ترس لە دەس‌دەرچوونی ئامانجە حەزپێکراوەکان، حەز بە گەورەیی، ناپاکی دەروون، ئەمانە هەموویان لە ڕوانگەی شەرعەوە خراپن و ڕێگەچارەیان ئەوەیە کە تێبگەی بەخێڵی‌بردن هەم زەرەری دونیایی پێوەیە، هەم زەرەری دوارۆژ؛ لە دونیادا خەفەتی پێ دەخۆی و شەو و ڕۆژ لە پەناتدایە و لێت ناتەکێتەوە، لە باری شەرعیشەوە ئافەتەکەی لەوەدایە کە دەبێتە هۆی تووڕەیی و ناحەزی بەرانبەر بە نیعمەتی خودای مەزن، بەخیلی‌بردن بۆ ئەو کەسەی کە بەخێڵی پێ براوە خێرە، بۆ بەخیلی بەرەکەش گوناح و تاوانی بۆی دەنووسرێ، جا ئێستە کە ئەمەت زانی ئەگەر دۆستی دوژمنەکەت نیت، دەبێ خۆت بەزۆر لە ئێرەیی‌بردن بسرێتەوە.

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «ثَلاثٌ لا يَنْفَكُّ الْمُؤْمِنُ عَنْهُنَّ: اَلْحَسَدُ، وَالظَّنُّ، وَالطِّيَرَةُ». ثُمَّ قالَ: «وَ لَهُ مِنْهُنَّ مَخْرَجٌ: إِذا حَسَدْتَ فَلا تَبْغِ»[2].

واتە: «سێ شت هەن کە لە مرۆڤی ئیماندار جیا نابنەوە: ئێرەیی، گومانی خراپ و بەخت و شانس تاقی‌کردنەوە»، پاشان فەرمووی: «وە بۆ ڕزگاری بوون لە دەست ئەم سیانە ڕێگایەك هەیە ئەویش ئەوەیەکە: هەرکاتێ بەخیلیت بەکارێ برد ئەنجامی مەدە».

---

١. النساء: ٣٢.

٢. بيهقى فى شعب الإيمان: ١١٢٩ و عبدالرزّاق فى مصنفه: ١٩٥٠٤ بلفظ: «ثَلاثٌ لا يُعْجِزُهُنَّ ابْنُ آدَمَ الطِّيَرَةُ وَ سُوءُ الظَّنِّ وَ الْحَسَدِ ...»، طبرانى فى الكبير: ٣١٥٣ بلفظ: «ثَلاثٌ لازِمٰاتٌ لِأُمَّتِي: اَلطِّيَرَةُ وَالْحَسَدُ وَ سُوءُ الظَّنِّ ...».

# بابەتی بیست و شەشەم: سەبارەت بە خراپیی دونیا

بزانە! دونیا دوژمنی خودای مەزن و دوژمنی خۆشەویستانی خودایە تەنانەت دوژمنی دوژمنانی خوداشە؛ دژایەتی دنیا لەگەڵ خودادا لەوێیەوەیە کە ڕێ لە دۆستانی دەگرێ، بەمبۆنەوە خوداش لەو ڕۆژەوە خولقاندوویەتی، سەیری نەکردووە. دژایەتیشی بۆ دوستانی خوداش، لەوەوەیە کە خۆی دەڕازێنێتەوە بۆیان و بە شۆخ و شەنگی و تەڕ و پاراوی فریویان دەدات تا ئەو جێگەیەی کە هەرکاتێ لێی دوور کەونەوە تاڵاوی بێتاقەتی بچێژن. دژایەتیشی لەگەڵ دوژمنانی خوداشدا لەوەوەیە کە وردە وردە فریویان دەدات و دەیان خەڵەتێنێ و دەیانخاتە داوی خۆی، بەجۆرێ کە پێی متمانە دەکەن و باوەڕی پێ ئەهێنن، تا لە پێویستیترین نیازیان [کە بریتییە لە بەختەوەری دوارۆژ] بێبەشیان دەکات.

## ڕوونکاری یەکەم: بەڵگەکانی خراپیی دونیا

بزانە، پێغەمبەران نێردراون بۆ بانگهێشتکردنی خەڵك لە دونیاوە بۆ دوارۆژ. بەمبۆنەوە کتێبە ئاسمانییەکان هاتوونەتە خوارەوە و زۆربەی ئایەتەکانیش سەبارەت بەمە باس دەکەن.

دەگێڕنەوە کە پێغەمبەرﷺ بەلای مەڕێکی مردارەوەبوودا تێپەڕی فەرمووی: «أَتَرَوْنَ هٰذِهِ الشّاةَ هَيِّنَةً عَلَىٰ صاحِبِها؟»، قالُوا: نَعَمْ، قالَ: «وَ الَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ إِنَّ الدُّنْيا أَهْوَنُ عَلَى اللهِ ـ عزَّوَجلَّ ـ مِنْ هٰذِهِ عَلَىٰ صاحِبِها، وَ لَوْ كانَتِ الدُّنْيا تَعْدِلُ عِنْدَ اللهِ جَناحَ بَعُوضَةٍ ما سَقَىٰ كافِرا مِنْها شَرْبَةَ ماءٍ»[1].

---

١. ابن‌ماجه: ٤١٠٠ بلفظ آخر، حاكم فی المستدرك: ٧٩٥٨، بیهقی فی شعب الإیمان: ٩٩٨١.

واتە: «ئەرێ دەبینن ئەم مەڕە چلۆن لەبەر چاوی خاوەنەکەی بێنرخ بووە؟» گوتیان: بەڵێ، فەرمووی: «سوێند بەو کەسەی گیانم بەدەستیەتی، دونیا بەلای خوداوە لەم مەڕە بەلای خاوەنەکەیەوە سووکترە، چونکە ئەگەر دونیا بەلای خوداوە بەقەدەر باڵە مێشوولەیەك نرخی هەبوایە، خودا چۆڕێ ئاوی بەکافر نەدەدا».

هەروەها پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «اَلدُّنْیٰا سِجْنُ الْمُؤْمِنِ وَ جَنَّةُ الْکٰافِرِ»[1] واتە: «دونیا بەندی موسڵمانە و بەهەشتی کافرە».

هەروەها پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «اَلدُّنْیٰا مَلْعُونَةٌ، وَ مَلْعُونٌ مٰا فِیهٰا إِلَّا مٰا کٰانَ لِلّٰهِ مِنْهٰا»[2] واتە: «دونیا و هەرچیشی تێدایە جگە لەوەی تایبەتە بەخوداوە، تووك و نفرینی لێ کراوە».

ئەبوو مووسای ئەشعەریرضي الله عنه ڕیوایەتی کردووە کە: پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «مَنْ أَحَبَّ دُنْیٰاهُ أَضَرَّ بِآخِرَتِهِ وَ مَنْ أَحَبَّ آخِرَتَهُ أَضَرَّ بِدُنْیٰاهُ، فَآثِرُوا مٰا یَبْقیٰ عَلیٰ مٰا یَفْنیٰ»[3].

واتە: «هەرکەس دونیای خۆش بوێ زەرەر لە دوارۆژی دەدا، هەرکەسیش دوارۆژی خۆش بوێ بە دونیای زەرەر دەگەیەنێ، ئەدی ئێوەش ئەوەی وا ئەمێنێ پێش ئەوەی بخەن کە نامێنێ».

هەروەها پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «حُبُّ الدُّنْیٰا رَأْسُ کُلِّ خَطِیئَةٍ»[4] واتە: «خۆشویستنی دونیا دایکی هەرچی گوناحە».

زەیدی کوڕی ئەرقەمرضي الله عنه دەڵێ: ئێمە لە خزمەت ئەبووبەکری سیددیقدارضي الله عنه بووین، داوای خواردەمەنی کرد، هەنگوێن و ئاویان بۆ هێنا، کاتێ کە لە دەمیەوە نزیکی کردەوە و ویستی بیخواتەوە، دەستی کرد بە گریان و هێندە گریا تا سەحابەکانیشی کردە گریان، ئەوان ژیر بوونەوە، بەڵام ئەو ژیر ئەنەبووەوە، دیسان [پیاڵەکەی] بردەوە بۆ دەمی و دەستی کردەوە بەگریان، تا ئاستێ کە هاوەڵانی گومانیان نەدەکرد کە بتوانن پرسیاری لێ بکەن.

١. مسلم: ٥٢٥٦، ترمذی: ٢٢٤٦، ابن‌ماجه: ٤١٠٣، احمد: ٧٩٣٩ ـ ٩٨٩٨.

٢. بیهقی فی شعب الإیمان: ١٠١٧٨ بلفظه، و ترمذی: ٢٢٤٤، ابن‌ماجه: ٤١٠٢، طبرانی فی الکبیر: ١٦٨٠، بیهقی فی شعب الإیمان: ١٥٨٠ بلفظ: «...إِلَّا ذِکْرَ اللّٰهِ وَ مٰا وٰالاهُ أَوْ عٰالِماً أَوْ مُتَعَلِّماً».

٣. احمد: ١٨٨٦٦ ـ ١٨٨٦٧، حاکم فی المستدرك: ٨٠١١، بیهقی فی شعب الإیمان: ٩٨٥٤.

٤. جامع الأصول لابن‌الأثیر: ٢٦٠٣ الفتح الکبیر للسیوطی: ٥٧٨٢، حرف الحاء بلفظه، بیهقی فی شعب الإیمان: ٩٩٧٤ بلفظ: «حُبُّ الدُّنْیٰا أَصْلُ کُلِّ خَطِیئَةٍ» و فی الزهد الکبیر: ٢٥٧ بلفظ: «رَأْسُ کُلِّ خَطِیئَةٍ حُبُّ الدُّنْیٰا».

زەید فەرمووی: پاشان ئەبووبەکر چاوانی سڕی. هاوەڵان گوتیان: ئەی جێگری پێغەمبەری خودا! لەبەرچی دەگریایت؟

فەرمووی: ئەمن لەگەڵ پێغەمبەری خوداﷺ بووم، دیتم شتێك لەخۆی دوور دەخاتەوە، سەیرم کرد هیچ کەسم لەگەڵیدا نەدیت، گوتم: ئەی نوێنەری خودا! ئەوە چی لەخۆت دوور دەخەیتەوە؟! فەرمووی:

«هٰذِهِ الدُّنْيا مُثِّلَتْ لِي فَقُلْتُ لَها أَبْعِدِي عَنِّي، ثُمَّ رَجَعَتْ، فَقالَتْ: إِنَّكَ إِنْ أَفْلَتَّ مِنِّي لَمْ يُفْلِتْ عَنِّي مَنْ بَعْدَكَ»[1].

واتە: «ئەمە دونیا بوو هاتبووە بەرچاوم، پێم گوت: لێم دوورکەوەرەوە، دیسان هاتەوەو گوتی: بێ‌گومان بە ئەگەر تۆ لەدەست من ڕزگاریت بێ، ئەوانەی کە لەپاش تۆ دێن لەدەستم ڕزگاریان نابێ».

هەروەها پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «يا عَجَبا كُلَّ الْعَجَبِ لِلْمُصَدِّقِ بِدارِ الْخُلُودِ وَ هُوَ يَسْعَىٰ لِدارِ الْغُرُورِ»[2].

واتە: «تەواو سەرسوڕماوم سەبارەت بەو کەسانەی کە دان بە ماڵی هەرماندا دەنێن و کەچی بۆ ماڵی فێڵ و تەڵەکە هەوڵ دەدەن».

هەروەها پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «إِنَّ الدُّنْيا حُلْوَةٌ خُضْرَةٌ، وَ إِنَّ اللهَ ـ تَعالَىٰ ـ مُسْتَخْلِفُكُمْ فِيها فَناظِرٌ كَيْفَ تَعْمَلُونَ[3]، إِنَّ بَنِي إِسْرائِيلَ لَمّا بُسِطَتْ لَهُمُ الدُّنْيا وَ مُهِّدَتْ تاهُوا فِي الْحُلْيَةِ، وَالنِّساءِ، وَالطِّيبِ، وَالثِّيابِ».

واتە: «بێ‌شك دونیا سەوزە و شیرینە، خودای مەزنیش ئێوەی لەوێ داناوە و سەیرتان دەکات کە ئێوە چی دەکەن؟ بەڕاستی بەنی ئیسرائیل کاتێ کە دونیا بۆیان فەرحان و فەراوان بوو، لەنێو خۆ ڕازاندنەوە و ژن و بۆن‌خۆشی و پۆشاکدا، سەریان لێ شێوا».

حەزرەتی عیساعليه السلام فەرموویەتی: دونیا مەکەن بە خودای خۆتان، با ئەو ئێوە نەکاتە بەردەی خۆی، خەزێنەکانتان بەلای کەسێکەوە دابنێن کە لەکیسی نەدا بۆتان، چونکە

١. حاکم فی المستدرك: ٧٩٦٧، بیهقی فی شعب الإیمان: ١٠٠٣٩.
٢. بیهقی فی شعب الإیمان: ١٠٠٥٦، ابن‌ابی‌شیبه فی مصنفه: ١٣٣/٨، الشهاب القضاعی فی مسنده: ٥٦٢.
٣. مسلم: ٤٩٢٥، ترمذی: ٢١١٧، ابن‌ماجه: ٣٩٩٠، احمد: ١٠٧١٦ ـ ١١١٥٨.

بێشك دنیادار ترسی ئافەتی هەیە بۆ سەر ماڵەکەی، بەڵام خاوەنی خەزێنەی خودا، ترسی خەزێنەکەی نییە[1].

پێغەمبەرصَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَسَلَّمَ لە یەکێ لە وتارەکانیدا فەرمووی: «اَلْمُؤْمِنُ بَيْنَ مَخافَتَيْنِ: بَيْنَ أَجَلٍ قَدْ مَضىٰ لا يَدْرِي مَا اللهُ صانِعٌ فِيهِ، وَ بَيْنَ أَجَلٍ قَدْ بَقِيَ لا يَدْرِي مَا اللهُ قاضٍ فِيهِ، فَلْيَتَزَوَّدِ الْعَبْدُ مِنْ نَفسِهِ لِنَفْسِهِ، وَ مِنْ دُنْياهُ لِآخِرَتِهِ، وَ مِنْ حَياتِهِ لِمَوْتِهِ، وَ مِنْ شَبابِهِ لِهَرمِهِ، فَإِنَّ الدُّنْيا خُلِقَتْ لَكُمْ، وَ أَنْتُمْ خُلِقْتُمْ لِلْآخِرَةِ، وَ الَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ ما بَعْدَ الْمَوْتِ مِنْ مُسْتَعْتَبٍ، وَلا بَعْدَ الدُّنْيا مِنْ دارٍ إِلَّا الْجَنَّةَ، أَوِ النّارَ»[2].

واتە: «مرۆڤی ئیماندار لە نێوان دوو مەترسیدایە: لەنێوان کاتی ڕابردوودا کە نازانێ خودا چ بڕیارێکی لەبارەیەوە داوە، و لەنێوان داهاتوودا کە نازانێ خودا چ بڕیارێکی تێدا بۆی دەر کردووە. کە وابوو با بەندەی موسڵمان تۆشەی خۆی هەڵبگرێ، لە دونیا بۆ دوارۆژ، لە ژیانی بۆ مەرگی، لە لاوی بۆ پیری، چونکە بێشك دونیا بۆ ئێوە خولقێندراوە و ئێوە بۆ دوارۆژ. سوێند بەو کەسەی کە ڕۆحم بە دەستیە، پاش مەرگ جێی داوای بەخشین نییە، پاش دونیاش ماڵێك جگە بەهەشت یان جەهەننەم نییە».

هەروەها پێغەمبەرصَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَسَلَّمَ فەرموویەتی: «إِنَّهُ حَقٌّ عَلَى اللهِ أَنْ لا يَرْفَعَ شَيْئاً مِنَ الدُّنْيا إِلَّا وَضَعَهُ»[3] واتە: «بێشك ئەرکە بەسەر خوداوە کە هەرچی لە دونیا بەرز بکاتەوە دایبەزێنێتەوە».

حەزرەتی عیساعَلَيۡهِٱلسَّلَامُ فەرموویەتی: کێیە ئەو کەسەی کە لەبەر شاڵاوی شەپۆلی بەحر ماڵ بکاتەوە؟ کەواتە ئێوەش دونیا مەکەنە جێی مانەوەتان[4].

هەروەها عیساعَلَيۡهِٱلسَّلَامُ فەرموویەتی: ئەی هەواڵانی حەواری! ئێوە بە شتە بێنرخەکانی دونیا قەناعەت بکەن، بە مەرجی بێوەیی بوونی دینتان، هەروەك چۆن دنیادۆستان بە دینی

---

١. ابن‌ابی‌الدّنیا فی الزّهد: ٣١ و فی ذمّ الدّنیا: ٣١ بلفظ: «لا تَتَّخِذُوا الدُّنْيا رَبّاً فَتَتَّخِذَكُمُ الدُّنْيا عَبِيداً، اكْنُزُوا كَنْزَكُمْ عِنْدَ مَنْ لا يُضِيعُهُ فَإِنَّ صاحِبَ كَنْزِ الدُّنْيا يَخافُ عَلَيْهِ الْآفَةَ وَ إِنَّ صاحِبَ كَنْزِ اللهِ عَزَّوَجَلَّ لا يَخافُ عَلَيْهِ الْآفَةَ».

٢. بیهقی فی شعب الإیمان: ١٠٩٧ بلفظ آخر.

٣. بخاری: ٢٦٦٠، ابوداود: ٤١٦٩، نسائی: ٣٥٣٦.

٤. «مَنْ ذَا الَّذِي يَبْنِي عَلَىٰ مَوْجِ الْبَحْرِ داراً تِلْكُمُ الدُّنْيا فَلا تَتَّخِذُوها قَراراً» ابن‌ابی‌الدّنیا فی الزّهد: ٣٤٧ و فی ذم الدّنیا: ٣٧٠.

کەم قەناعەت دەکەن بەو مەرجەی دونیایان بێ‌مەترسی بێ[1].

ئیبنووعەبباس رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا فەرموویەتی: خودای مەزن دونیای کردۆتە سێ کەرتەوە: کەرتێکی بۆ ئیمانداران، کەرتێکی بۆ دووڕوویان، کەرتێکی بۆ بێ‌دینان؛ ئیماندار [لە دونیا] تۆشە پاشەکەوت دەکات، دووڕوو خۆی دەڕازێنێتەوە، بێ‌دینیش بۆ خۆی کەیف دەکات.

لەم بارەوە شاعیر دەڵێ:

«يٰا خٰاطِبَ الدُّنْيٰا إِلَىٰ نَفْسِهِ — تَنَحَّ عَـــنْ خِطْبَتِهٰا تَسْلَمْ
إِنَّ الَّتِي تَخْطِبُ غَـــدّٰارَةٌ — قَرِيبَةُ الْعُرْسِ مِـــنَ الْمَأْتَمِ»

واتە: «ئەی خوازبێنیکەری دونیا بۆ خۆت! دەس هەڵگرە لەو خوازبێنییەت تا بێوەی بمێنی.

چونکە بێ‌شك ئەوەی کە تۆ خوازبێنی دەکەی شۆڤار و دەسبڕە، ئەم شاییەت لە شیوەن نزیـکە».

هەروەها گوتوویـە:

«إِذٰا امْتَحَنَ الدُّنْيٰا لَبِيبٌ تَكَشَّفَتْ — لَهُ عَـنْ عَـدُوٍّ فِي ثِيٰابِ صَـدِيقٍ»

واتە: «هەرکاتێ ژیرێ، دونیا تاقی بکاتەوە بۆی ڕوون دەبێتەوە کە دونیا دوژمنە لە لیباسی دۆستدا (گورگە لە پێستی مەڕدایە).

هەروەها گوتوویـە:

«يٰا رٰاقِدَ اللَّيْلِ مَسْـــرُوراً بِأَوَّلِهِ — إِنَّ الْحَوٰادِثَ قَدْ يَطْرُقْنَ أَسْحٰاراً
أَفْنَى الْقُرُونَ الَّتِي كٰانَتْ مُنَعَّمَةً — كَرُّ اللَّيٰالِي إِقْبٰـــالاً، و إِدْبٰـــاراً»

واتە: «ئەی کەسێ کە ئەوەڵی‌شەو بە شادی نوستووی، بێ‌گومان بەڵا و کارەسات دەمەو بەیان دەرکە دەکوتن. هاتوچۆی شەو و ڕۆژ خەڵکی خۆشگوزەرانی زۆر لەناوبرد».

یەکێ لە حەکیمان گوتوویـە: ڕۆژگار تیرە، خەڵك ئامانجن، زەمانەش هەر ڕۆژە بە تیری خۆی دەتئەنگوێ، لێ‌بڕان شەو و ڕۆژ خەریك دەبێ تا تەواوی ئەندامەکانت دەتەنێ، جا ئەدی چلۆن ساغ دەمێنی لەگەڵ ئەم بەڵایەی ڕۆژگار و بە پەلەبوونی شەوگارەدا.

---

١. «يٰا مَعْشَرَ الْحَوٰارِيِّينَ! اِرْضَوا بِدَنِيءِ الدُّنْيٰا مَعَ سَلاٰمَةِ الدِّينِ كَمٰا رَضَىٰ أَهْلُ الدُّنْيٰا بِدَنِيءِ الدِّينِ مَعَ سَلاٰمَةِ الدُّنْيٰا» ابن‌ابی‌الدّنیا فی الزّهد: ٥٢٢ و فی ذم الدّنیا: ٤٤٩، بیهقی فی المدخل إلی السّنن الکبری: ٤٥٥.

جا ئەگەر ئەو ناتەواوییانەی کە تێیدا ڕوو دەدەن بۆت دەرکەوتنایە، لە ترسی هەرچی ڕۆژە کە دادەهات زیرەت دەکرد و تێپەڕینی کات بۆت زۆر ئەستەم دەبوو، بەڵام ویستی خودا لەسەر هەرچی لێکدانەوە و تەگبیرەوەیە. جا ئەو بێخەبەرییە لە کارەساتەکانی دونیا بۆتە هۆی چێژ لێ وەرگرتن، بەڵام دونیا لەو کاڵەکەمارانەی کە حەکیم بۆ دەرمان دەیشێلێ بە یەکدا تاڵترە. بەم چەشنە دونیا هەرکەسێ کە لە عەیبەکانی شارەزا بێ، بە سەر قاڵییەکانی خۆیەوە دەیخجڵێنێ [و دەرفەتی ئاوڕدانەوەی پێ نادات].

یەکێتر دەڵێ: دونیا لەم ڕووەوە بە خەیاڵات مرۆ دەخەڵەتێنێ و پاشان گەدای دەکات و بە دەستی خشت و خاڵی بەجێی دێڵی، بە چەشنێ خەیاڵاتی خەو و خەوی بەتاڵە.

پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «اَلدُّنْیٰا حُلْمٌ وَ أَهْلُهٰا عَلَیْهٰا مُجٰازُونَ وَ مُعٰاقَبُونَ» واتە: «دونیا خەوێکە، خەڵکەکەشی لەسەر ئەو خەوە پاداش و سزا دەدرێن».

عەلی کوڕی ئەبووتالیبؓ نامەیێکی بەم چەشنە بۆ سەلمانی فارسیؓ نووسی: دونیا بە چەشنی مارە؛ لەکاتی دەست پێداهێناندا نەرمە کەچی ژاری کوشەندەیە، ئەتۆ حەزت لەهەر شتێکی بوو ڕووی لێ وەرچەرخێنە، چونکە زۆر لەگەڵتا هەڵناکات، خەفەتەکانی لە دڵت دەر بکە کە دڵنیای لێت جیا دەبێتەوە، ئەتۆ شادترین کەس بە لە دونیا و خۆپارێزی بکە لەو شتانەی کە هی ئەوە، چونکە هەر دنیادۆستێ بە دڵنیاییەوە پێی خۆشکەیف بێ، ئەوە بە ناخۆشییێك لێی تاڵ دەکات[1].

هەروەها پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «إِنَّمٰا مَثَلُ صٰاحِبِ الدُّنْیٰا کَمَثَلِ الْمٰاشِي فِي الْمٰاءِ هَلْ یَسْتَطِیعُ الَّذِي یَمْشِي فِي الْمٰاءِ أَنْ لا تَبْتَلَّ قَدَمٰاهُ»[2].

واتە: «وێنەی دنیاویست وەکوو ئەو کەسەیە کە لە نێو ئاودا ڕێ دەکات، ئایا دەتوانێ لەنێو ئاودا بڕوات و پێی تەڕ نەبێ».

هەروەها فەرموویەتی: «مَا الدُّنْیٰا فِي الْآخِرَةِ إِلَّا کَمَثَلِ مٰا یَجْعَلُ أَحَدُکُمْ أَصْبُعَهُ فِي الْیَمِّ فَلْیَنْظُرْ مٰا یَرْجِعُ إِلَیْهِ»[3].

---

١. «مَثَلُ الدُّنْیٰا مَثَلُ الْحَیَّةِ لَیِّنٌ مَسُّها یَقْتُلُ سَمُّها فَأَعْرِضْ عَمّٰا یُعْجِبُكَ ...»، بیهقی فی شعب الإیمان: ١٠١٤٢، ابن‌ابی‌الدّنیا فی الزّهد: ١٦٤ و فی ذم الدّنیا: ٧٤.

٢. بیهقی فی شعب الإیمان: ١٠٠٩٩.

٣. ترمذی: ٢٢٤٥، ابن‌ماجه: ٤٠٩٨، احمد: ١٧٣٢٢ بألفاظ مختلفة.

واتە: «دونیا لە دوا ڕۆژدا وەکوو ئەو کەسە وایە کە پەنجەی کردۆتە نێو دەریاوە، ئەدی سەیر بکات بزانێ چەندەی پێوە دەبێ بۆی».

## ڕوونکاری دووهەم: حەقێقەت و ماکی ڕاستەقینەی دونیا

بزانە دونیا و دواڕۆژ بریتین لە دوو قۆناغ، قۆناغی نزیك و هەوەڵ دونیایە کە بریتییە لە هەرچی پێش مەرگ بێت، قۆناغی پاشەوەش کە دواتر دێ، پێی دەڵێن: دواڕۆژ ئەمەش بریتییە لە هەرچی لە پاش مەرگەوە بێت.

[دونیا خۆی سێ بەشە:]

[بەشی یەکەم:] ئەو شتانەی دونیا کە پاش مەرگیش لەگەڵ مرۆڤدان، وەك زانست و کردەوە، ئەوە هەر لەسەر دواڕۆژ دەژمێررێن، هەرچەندەش بە ڕواڵەت لەسەر دونیان؛

هەروەك چۆن پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «حُبِّبَ إِلَيَّ مِنْ دُنْيَاكُمْ ثَلاثٌ: اَلطِّيبُ وَالنِّسَاءُ، وَ قُرَّةُ عَيْنِي فِي الصَّلاةِ»[1] واتە: «سێ شت لەم دنیایەتان بەلامەوە خۆشە: بۆنی خۆش، ژن، ڕووناکی چاویشم لە نوێژدایە».

پێغەمبەری [مەزن] نوێژی لەسەر دونیا و خۆشییەکانی ئەژماردووە، چونکە هەڵسوکەوت و هەستان و دانیشتنی نوێژ لە بەشی ئەو شتانەیە کە بە ڕواڵەت و بە چاوی سەر ئەبینرێ.

[بەشی دووهەم:] ئەم بەشەی دونیا بەرانبەری بەشی یەکەمە ـ کە ڕابورد ـ، تەواوی ئەو شتانە دەگرێتەبەر کە چێژ و تامێکی کەمخایەنی تێدایە، کە پاش مەرگ هیچ بەر و خێرێکی تێدا نییە؛ وەکوو کاری حەرام، یان ئەو شتە ڕەوایانە کە لە ئەندازەی پێویست زیادترن.

[بەشی سێهەم:] لەنێوان ئەو دوو بەشەی پێشوودایە، ئەمەش بریتییە لە هەر نیازێك کە لە ئێستاکەدا پێویستە بۆ ئەوەی یارمەتی بدا کاری دواڕۆژ ڕێك بخات؛ وەکوو: پێویستی ڕۆژانە لە خواردن، خواردنەوە، پۆشەن، ژنهێنان. ئەم بەشەش دیسان لەسەر دونیا حەسێب نین هەر وەکوو بەشی یەکەم.

ئەو فەرموودەیە کە ئەڵێت: دونیا ئەوەیە کە تۆ لە خوای مەزن دوور خاتەوە، ئەم چەند بەشە تێکڕا پێناسە دەکات و کۆیان دەکاتەوە.

١. نسائی: ٣٨٧٨ ـ ٣٨٧٩، احمد: ١١٨٤٥ ـ ١٢٥٨٤ ـ ١٣٥٢٦، طبرانی فی الأوسط: ٥٣٦١.

خودای مەزن مەکۆی هەواو هەوەسی بە پێنج شت داناوە؛ دەفەرمێ: ﴿إِنَّمَا الْحَيَاةُ الدُّنْيَا لَعِبٌ وَ لَهْوٌ زِينَةٌ و تَفَاخُرٌ بَيْنَكُمْ و تَكَاثُرٌ فِي الْأَمْوَالِ وَ الْأَوْلَادِ﴾[1].

واتە: «ژیانی دونیا جگە گەمە وکایە و جوانکاری و خۆ بە سەریەکدا ڕانان و فرەبوونەوەی ماڵ و منداڵ نەبێ چیتر نییە».

ئەو کەرەستانەی کە ئەم پێنج شتەی لێ دەکەوێتە، حەوت کەرەستەن کە لەم فەرمایشتەی خودادا کۆ بوونەتەوە:

﴿زُيِّنَ لِلنَّاسِ حُبُّ الشَّهَوَاتِ مِنَ النِّسَاءِ وَالْبَنِينَ و الْقَنَاطِيرِ الْمُقَنْطَرَةِ مِنَ الذَّهَبِ وَ الْفِضَّةِ وَ الْخَيْلِ الْمُسَوَّمَةِ وَ الْأَنْعَامِ وَ الْحَرْثِ ذَٰلِكَ مَتَاعُ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا﴾[2].

واتە: «لەبەر چاوی بنیادەم خۆشی هەوەسی ژن و منداڵ و دارایی هەرەزۆری زێڕ و زێو و ئەسپی دیاریکراو و مەڕوماڵات و کێڵگە، شیرن کراوە، ئەمانە هەموویان کاڵاو کووتاڵی ژیانی دونیان».

جا بزانە نموونەی بەندەیێ کە خۆی و شوێنی گەڕانەوەی لەبیر چووبێ، وەکوو ئەو حاجیە وایە کە لەناو ڕێدا لە جێ‌دابەزینێکدا، ڕادەوەستێ و بێ‌وچان خەریکە ئاڵف و ئاوی وشتر دەدات و پاك و خاوێنی دەکات و جل و کورتانی جۆراوجۆری لەسەر دەنێت و گیاو ئاڵفی بە کۆڵ بۆ دێنێ و بە بەفرئاوی بۆ سارد دەکاتەوە، هێندە دەوەستێ تا کاروانەکە دەڕوات و ئەو لە حەج چوونی کاروان بێ‌خەبەرە، خۆشی لەو بیابانەدا بە تەنێ بمێنێتەوە دەبێتە نێچیری دڕندە، ئەدی مرۆڤی ژیر ناچێ بە وشترەکەیەوە خەریك بێت مەگەر بەو ئەندازەی کە پێویست بێ.

کەوابوو هەرکەس سەبارەت بە دواڕۆژ شارەزابێ، خۆی بە نەفس و دونیاوە ناخجڵێنێ مەگین بە ئەندازەیێ کە گوڕی ئەوەی هەبێ ڕێی دواڕۆژ بگرێتە بەر. چینێکیش هەن شەهوەت و هەوەس و بێ‌خەبەری بەسەریاندا زاڵ بووە؛ هەر هەوڵ دەدات تا بخۆن و بپۆشن و دەخۆن و دەپۆشن بۆ ئەوە بتوانن هەوڵ بدەن. چینێکی‌تر هەیە کە تێگەیشتوون کە بۆچی دروست کراون و خۆیان ئامادە دەکەن بۆی و بەسەر هەموو شتدا جگە لە پێداویستی و نیازەکان نەبێ، تێ‌دەپەڕن و بەس بۆ ئەم نیازانە نەبێ ئاوڕی لێ نادەنەوە.

والله أعلم

---

١. الحدید: ٢٠.

٢. آل‌عمران: ١٤.

# بابەتی بیست و حەوتەم:
# زەرەر و خراپیی ماڵویستی و چاوچنۆکی

## [بەشی یەکەم: سەبارەت بە خراپی خۆشویستنی ماڵ]

خراپبوونی خۆشویستنی ماڵی دونیا لەم فەرموودەی خودای مەزنەوە دەردەکەوێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لا تُلْهِكُمْ أَمْوَالُكُمْ وَلا أَوْلادُكُمْ عَنْ ذِكْرِ اللهِ وَ مَنْ يَفْعَلْ ذٰلِكَ فَأُولٰئِكَ هُمُ الْخَاسِرُونَ﴾[1].

واتە: «ئەی کەسانێ کە باوەڕتان هێناوە، ماڵ و منداڵ لە یادی خودا غافڵتان نەکات، هەرگرۆیەك وا بکات، ئەوە لە زەرەرمەندانە».

خودای مەزن فەرموویەتی: ﴿إِنَّمَا أَمْوَالُكُمْ وَ أَوْلادُكُم فِتْنَةٌ﴾[2] واتە: «بێ‌گومان ماڵ و منداڵتان بەڵاو فیتنەن بۆتان».

پێغەمبەرصَلَّىٰاللَّهُعَلَيْهِوَسَلَّمَ فەرموویەتی: «حُبُّ الْمَالِ وَالشَّرَفِ يُنْبِتَانِ النِّفَاقَ، كَمَا يُنْبِتُ الْمَاءُ الْبَقْلَ» واتە: «خۆشەویستی ماڵ و مەقام دووبەرەکی دەروێنن، هەروەك چۆن ئاو گیا دەروێنێ».

پێغەمبەرصَلَّىٰاللَّهُعَلَيْهِوَسَلَّمَ فەرموویەتی: «مَا ذِئْبَانِ ضَارِيَانِ أُرْسِلا فِي زَرِيبَةِ غَنَمٍ بِأَكْثَرَ إِفْسَاداً فِيهَا مِنْ حُبِّ الْمَالِ وَ الْجَاهِ، فِي دِينِ الرَّجُلِ الْمُسْلِمِ»[2].

---

١. المنافقون: ٩.    ٢. التغابن: ١٥.

٢. ترمذی: ٢٢٩٨، احمد: ١٥٢٢٤ بلفظ: «مَا ذِئْبَانِ جَائِعَانِ أُرْسِلا فِي غَنَمٍ بِأَفْسَدَ لَهَا مِنْ حِرْصِ الْمَرْءِ عَلَى الْمَالِ وَالشَّرَفِ لِدِينِهِ»، طبرانی فی الكبير: ١٣٨٩٦، بيهقی فی شعب الإيمان: ٩٧٨٣ ـ ٩٧٨٦ بألفاظ مختلفة، و فی رواية: «مَا ذِئْبَانِ ضَارِيَانِ جَائِعَانِ بَاتَا فِي ذَرِيبَةِ غَنَمٍ أَغْفَلَهَا أَهْلُهَا يَفْتَرِسَانِ وَ يَأْكُلانِ بِأَسْرَعَ فِيهَا فَسَاداً مِنْ حُبِّ الْمَالِ وَالشَّرَفِ فِي دِينِ الْمَرْءِ الْمُسْلِمِ» طبرانی فی الكبير: ٣٢٠.

واتە: «هیچکات دوو گورگی دڕندە، کە بەر بدرێنە نێو ڕانە مەڕێك، هێندە زەرەر نادەن، وا خۆشەویستی ماڵ و مەقامی دونیا زەرەر لە دینی پیاوی موسڵمان دەدات».

پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «هَلَكَ الْمُكْثِرُونَ مٰالاً إِلّا مَنْ قٰالَ بِهِ فِي عِبٰادِ اللّٰهِ هٰكَذٰا، و هٰكَذٰا، و قَلِيلٌ مٰا هُمْ»[1].

واتە: «دەوڵەمەندان بەدبەخت بوون و تێدا چوون، مەگەر ئەوانەیان وا دەست نەترسانە گوتوویانە ئەمە بۆ فلانە کەس و ئەوە بۆ فلانەکەس، ئەم جۆرە کەسانەش کەمن».

پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «سَيَأْتِي بَعْدِي قَوْمٌ يَأْكُلُونَ أَطٰايِبَ الدُّنْيٰا وَ أَلْوانَهٰا، وَ يَنْكِحُون أَجْمَلَ النِّسٰاءِ وَ أَلْوانَهٰا، وَ يَلْبَسُونَ أَلْيَنَ الثِّيٰابِ وَ أَلْوانَهٰا، وَ يَرْكَبُونَ فُرَهَ الْخَيْلِ وَ أَلْوانَهٰا و لَهُمْ بُطُونٌ مِنَ الْقَلِيلِ لا تَشْبَعُ، وَ أَنْفُسٌ بِالْكَثِيرِ لا تَقْنَعُ، عٰاكِفِينَ عَلَى الدُّنْيٰا، يَغْدُونَ وَ يَرُوحُونَ إِلَيْهٰا، اِتَّخَذُوهٰا آلِهَةً مِنْ دُونِ إِلٰهِهِمْ، وَ رَبّاً مِنْ دُونِ رَبِّهِمْ، إِلَىٰ أَمْرِهٰا يَنْتَهُونَ وَ لِهَوٰاهُمْ يَتَّبِعُونَ، فَعَزِيمَةٌ مِنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَبْدِاللّٰهِ لِمَنْ أَدْرَكَهُ ذٰلِكَ الزَّمٰانُ مِنْ عَقِبِ عَقِبِكُمْ وَ خَلْفِ خَلْفِكُمْ أَنْ لا يُسَلِّمَ عَلَيْهِمْ، وَلا يَعُودَ مَرْضٰاهُمْ، وَلا يَتَّبِعَ جَنٰائِزَهُمْ، وَلا يُوَقِّرَ كَبِيرَهُمْ، فَمَنْ فَعَلَ ذٰلِكَ فَقَدْ أَعٰانَ عَلَىٰ هَدْمِ الْإِسْلامِ»[2].

واتە: «لەپاش من بەرەیێك دێن کە خۆراکی جۆراوجۆر و خۆشترینی دەخۆن، جوانترین لە ژنان دەخوازن، هەرچی جۆرە لیباس و نەرم و نۆڵترینیان لەبەر دەکەن، هەرچی جۆرە ئەسپ و خۆشڕەو و ڕەسەنترینیان سوار دەبن، ورگێکیان هەیە بە کەم تێر نابێ و نەفسێکیان هەیە بە زۆر قەناعەت ناکات، بەسەر دونیاوە مانیان گرتووە، شەو و ڕۆژ دێن و دەچن بۆلای، کردوویانە بەخودایەك لە بەرانبەر خودای خۆیانەوە، پەروەردگارێ لە هەمبەر پەروەردگاری خۆیانەوە، قسەی ئاخریان داوەتە دەستی، شوێنی هەوەسی خۆیان دەکەون. کەواتە ئامۆژگارییێك هەرە گرینگ هەیە لە لایەن موحەممەدی کوڕی عەبدوڵلاوە بۆ تەواوی ئەو کەسانەی کە لەپاشی

---

١. احمد: ١٠٤٩٧ بلفظ: «هَلَكَ الْأَكْثَرُونَ إِلّا مَنْ قٰالَ هٰكَذٰا وَ هٰكَذٰا وَ قَلِيلٌ مٰا هُمْ» و فی روایة: «هَلَكَ الْمُكْثِرُونَ إِلّا مَنْ قٰالَ ...» احمد: ٧٧٣٩.

٢. لم‌نعثر علی هذا اللفظ بأكمله، لكن أخرج الطبرانی فی الكبیر: ٧٣٨٨ ـ ٧٣٨٩ بلفظ: «سَيَكُونُ رِجٰالٌ مِنْ أُمَّتِي يَأْكُلُونَ أَلْوٰانَ الطَّعٰامِ وَيَشْرَبُونَ أَلْوٰانَ الشَّرٰابِ وَيَلْبِسُونَ أَلْوٰانَ اللِّبٰاسِ وَ يَتَشَدَّقُونَ فِي اللِّبٰاسِ أُولٰئِكَ شِرٰارُ أُمَّتِي» جامع الكبیر للسیوطی: ١٣٣٠٦، حرف السّین. و فی روایة بنحو أواخره: «مَنْ مَشَىٰ إِلَىٰ صٰاحِبِ بِدْعَةٍ لِيُوَقِّرَهُ فَقَدْ أَعٰانَ عَلَىٰ هَدْمِ الْإِسْلامِ» طبرانی فی الكبیر: ١٦٦١٤، بیهقی فی شعب الإیمان: ٩٠١٨.

پاشی ئێوەوە و لە پشتی پشتی ئێوەوە دێن و بەو سەردەمە دەگەن سڵاویان مەکەن، سەردانی نەخۆشیان مەکەن، وەدووی تەرمیان مەکەون، ڕێزی گەورەیان مەگرن، چونکە هەرکەس ئاوەها بکات یارمەتی داوە لەسەر لەناوبردنی ئیسلام».

پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «يَقُولُ ابْنُ آدَمَ مٰالِي مٰالِي وَ هَلْ لَكَ مِنْ مٰالِكَ إِلّٰا مٰا تَصَدَّقْتَ فَأَبْقَيْتَ، أَوْ أَكَلْتَ فَأَفْنَيْتَ، أَوْ لَبِسْتَ فَأَبْلَيْتَ»[1].

واتە: «بنیادەم ئەڵێت: داراییەکەم، داراییەکەم، ئەدی تۆماڵت کوا هەیە جگە لەوەی کە خێراتت پێ کردووە کە بۆ هەمیشە ماوەتەوە، یان خواردووتە و لە ناوت بردووە، یان پۆشیوتە و کۆنەت کردووە».

پیاوێ عەرزی پێغەمبەریﷺ کرد: ئەی نێردراوی خودا! چیمە وا حەز لە مەرگ ناکەم؟ فەرمووی: «أَلَكَ مٰالٌ؟» واتە: «ئایا داراییت هەیە؟» گوتی: بەڵێ، فەرمووی: «قَدِّمْ مٰالَكَ أَمٰامَكَ، فَإِنَّ قَلْبَ الْمُؤْمِنِ مَعَ مٰالِهِ، إِنْ قَدَّمَهُ أَحَبَّ أَنْ يَلْحَقَهُ، وَ إِنْ خَلَّفَهُ أَحَبَّ أَنْ يَتَخَلَّفَ مَعَهُ»[2] واتە: «ماڵ و داراییەکەت لەپێشەوە بنێرە، چونکە بەڕاستی ئیماندار لەگەڵ ماڵەکەیدایە، ئەگەر وە پێش خۆی بخات حەز دەکات خۆی پێ بگەیەنێ، ئەگەریش وەدووی خۆی بخات حەز دەکات خۆی لەگەڵیدا لە دواوە بێ».

هەروەها پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «أَخِلّٰاءُ ابْنِ آدَمَ ثَلاثَةٌ: وٰاحِدٌ يَتْبَعُهُ إِلَىٰ قَبْضِ رُوحِهِ، وَالثّٰانِي إِلَىٰ قَبْرِهِ، وَالثّٰالِثُ إِلَىٰ مَحْشَرِهِ، فَالَّذِي يَتْبَعُهُ إِلَىٰ قَبْضِ رُوحِهِ فَهُوَ مٰالُهُ، وَ الَّذِي يَتْبَعُهُ إِلَىٰ قَبْرِهِ فَهُوَ أَهْلُهُ، وَالَّذِي يَتْبَعُهُ إِلَىٰ مَحْشَرِهِ فَهُوَ عَمَلُهُ»[3].

واتە: «سێ شت هاوڕێی بنیادەمە: یەکیان تا کاتی گیانکێشانی لەگەڵیدایە، دووهەمیان تا سەر گۆڕی، سێهەمیان تا ڕۆژی حەشر، ئەوەیانە کە تا کاتی گیانکێشان لەگەڵیدایە، ماڵ و سەروەتەکەیەتی، ئەوەش کە تا سەرگۆڕ دێ لەگەڵیدا، خێزانەکەیەتی، ئەوەش تا مەحشەر هاوڕێیی دەکات کردەوەکانیەتی».

---

١. مسلم: ٥٢٥٨، ترمذی: ٢٢٦٤ ـ ٢٢٧٧، نسائی: ٣٥٥٥، احمد: ١٥٧١٥ ـ ١٥٧٣٢ ـ ١٥٧٣٦.

٢. جامع الكبير للسيوطی: ٧٤١١، حرف الهاء، الزّهد و الرّقائق لابن‌المبارك: ٦٢٣، كنز العمال للهندی: ٤٢١٣٩.

٣. حاكم فی المستدرك: ٢٣٠ بلفظ أخری، طبرانی فی الكبير: ٦٩٣١ بلفظ: «إِنَّ لِأَحَدِكُمْ يَوْمَ يَمُوتُ ثَلاثَةَ أَخِلّٰاءَ: مِنْهُمْ ...»: ابن‌حبان فی صحيحه: ٣١٧٣ بلفظ آخر، بيهقی فی شعب الإيمان: ٣٠٦٩ بلفظ: «مٰا مِنْ عَبْدٍ إِلّٰا وَ لَهُ ثَلاثَةُ أَخِلّٰاءَ: فَأَمّٰا خَلِيلٌ فَيَقُولُ ...» «مَثَلُ ابْنِ آدَمَ وَ مٰالِهِ وَ عَمَلِهِ مَثَلُ رَجُلٍ لَهُ ثَلاثَةُ أَخِلّٰاءَ ...» و فی رواية للشيخان: «يَتْبَعُ الْمَيِّتَ ثَلاثَةٌ فَيَرْجِعُ اثْنٰانِ وَ يَبْقَىٰ مَعَهُ وٰاحِدٌ ...» بخاری: ٦٠٣٣، مسلم: ٥٢٦٠، ترمذی: ٢٣٠١، نسائی: ١٩١١، احمد: ١١٦٣٧.

## بەشی دووهەم: ڕوونکاریەك لەسەر خاس و خراپی ماڵ

خودای مەزن لە هەندێ شوێندا ناوی دونیای بە "خێر" هێناوە و فەرموویەتی: ﴿كُتِبَ عَلَيْكُمْ إِذَا حَضَرَ أَحَدَكُمُ الْمَوْتُ إِنْ تَرَكَ خَيْراً الْوَصِيَّةُ﴾[1] واتە: «لە سەرتان فەرزە هەر کاتێ یەکێکتان نزیك گیانەڵا بووەوە، ئەگەر خێرێکی (ماڵ و دارایی) هەبوو، وەسیەت بکات».

هەروەها پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «نِعْمَ الْمَالُ الصَّالِحُ لِلرَّجُلِ الصَّالِحِ»[2] واتە: «بەخ، چەند جوانە! ماڵی چاك بۆ پیاوی چاك».

هەروەها هەرچی باسی خێری سەدەقە و بەخشین و حەج هاتووە ئەوە بەجۆرێك تاریفی ماڵ کراوە. جا بزانە کە ئامانجی مرۆڤە زیرەکەکان و پیاوچاکان بەختەوەری ئەبەدییە و ماڵی دونیاش کەرەستەی گەیشتن بەو بەختەوەرییەیە، جارێك بە لێخواردنی بۆ ئەوەی هێزو گوڕی بێت تا خواپەرستی و عیبادەت ئەنجام بدات، کەڕەتێ بە بەخشینی لە ڕێ خودادا.

بەڵام هەرکەس ماڵی دونیای بۆ ئەوە بوێت تا خۆش ڕابوێرێ، یان بیکاتە کەرەستەی ئەنجامی گوناح و هەواو هەوەس، ئەوە بێگومان خراپە و ناحەزە.

جا وێنەی دونیاش وەکوو مار وایە کە هەم ژاری هەیە، هەم دژەژار، دژەژارەکەی سوود و بەهرەی هەیە و ژارەکەشی بەڵاو کوشەندەیە، جا هەرکەس سەریدەربچێ و بزانێ خۆی لە ژارەکەی بپارێزێ و کەڵك لە دژەژارەکەی وەرگرێ ئەوە کارێکی بەنرخ و بەجێی کردووە.

## بەشی سێهەم: سەبارەت بە خراپیی تەماح و چاکەی قەناعەت و چاو لە دەستی خەڵك نەبوون:

بزانە فەقیری چاکە، بەو مەرجەی ئەو فەقیرە چاوی تەماحی لە دەستی خەڵکەوە نەبێ. ئەوەشی بۆ نالوێ مەگەر بەو هێندە ماڵەی کە هەیەتی لە خۆراك و پۆشاك و قەناعەت بکات. ئەدی با بە سووكترین و خوارترینیان قەناعەت بکات و حەزو تامەزرۆیی بۆ ڕۆژێ یان مانگێ دواتر، دوا بخات، مەبادا هێندەش خۆڕاگری لەسەر نەبوونی بکات، وەهای پێ بکات دەست بۆلای دەوڵەمەندان درێژ بکاتەوە و لەبەردەمیاندا ملکز بێت.

---

١. البقرة: ١٨٠.

٢. احمد: ١٧٠٩٦، بیهقی فی شعب الإیمان: ١١٩٠، ابن‌حبّان فی صحیحه: ٣٢٧٩.

پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «إِنَّ رُوحَ الْقُدُسِ نَفَثَ فِي رَوْعِي أَنَّ نَفْساً لَنْ تَمُوتَ حَتَّىٰ تَسْتَكْمِلَ رِزْقَهٰا، فَاتَّقُوا اللّٰهَ، وَ أَجْمِلُوا فِي الطَّلَبِ»[١].

واتە: «جوبرەئیل ختستیە دڵمەوە کە کەس نامرێت مادامێ بەشە ڕزق و بژیوی تەواو نەبووبێ، کە وابوو لەخودا بترسن و هێندە درێژە بە داواکارییەکانتان مەدەن».

ئەبوو هورەیرەرضي الله عنه ڕیوایەتی کردووە کە: پێغەمبەرﷺ ڕۆژێکیان فەرمووی: «يٰا أَبٰا هُرَيرَةَ، إِذَا اشْتَدَّ بِكَ الْجُوعُ فَعَلَيْكَ بِرَغِيفٍ وَ كُوزٍ مِنْ مٰاءٍ وَ عَلَى الدُّنْيٰا الدَّمٰارُ»[٢].

واتە: «ئەی ئەبوو هورەیرە، هەرکاتێ برسیەتی زۆری بۆ هێنای، ئەوە بۆ تۆ کولێرەیێك و گۆزەیێ ئاو بەسە و بۆ دونیاش کاول بوون».

## بەشی چوارەم: ڕوونکارییەك سەبارەت بە چارەسەری تەماح و حەزی درێژ و دەوای بە دەستهێنانی خوو و ڕەوشتی قەناعەت

بزانە ئەم دەوایە لە سێ ماك تێکەڵە: تاقەت، زانست، کردەوە. [سەرجەمی ئەمانە پێکەوە ئەبنە پێنج‌دانە، کە بریتین لەمانەی خوارەوە:]

یەکەم: کردەوە، واتە میانەڕەوی لە ژیاندا، نەرم و بە بەزەیی‌بوون لە بەخشیندا، کەواتە هەرکەس ئەیەوێ بە سەربەرزی قەناعەت بکات با خەرجی بهێنێتە خوارەوە، لە حەدیسدا هاتووە: «التَّدْبِيرُ نِصْفُ الْمَعِيشَةِ»[٣]، واتە: «ژیرانە و بە تەگبیرەوە خەرج‌کردن نیوەی ژیانە».

دووهەم: کەم‌کردنەوەی ئاوات و ئارەزوو، تا مەبادا بەهۆی نیاز و پێداویستییەوە پەرێشان‌حاڵ بێت.

سێهەم: تێ‌بگەی کە لە قەناعەتدا چەندە سەربەرزی و حەسانەوەی هەیە لە دەستی داواکردن و دەست‌درێژکردنەوە ڕزگار دەبی، هەروەها لە تەماحدا چەندە سەرشۆڕی و کزی هەیە کە بە قەناعەت لێی ڕزگار دەبی.

---

١. طبراني في الكبير: ٧٥٩٤، حاكم في المستدرك: ٢٠٩٥، بيهقي في شعب الإيمان: ١١٤١ ـ ٩٨٩١، بزار في مسنده: ٢٩١٤، الشّافعي في مسنده: ١٠٧٧.

٢. بيهقي في شعب الإيمان: ٩٨٨١ بلفظ: «إِذَا اشْتَدَّ كَلْبُ الْجُوعِ فَعَلَيْكَ بِرَغِيفٍ وَ جَرٍ مِنْ مٰاءِ الْقَرٰاحِ» و في رواية: «إِذَا أَشْتَدَتْ كَلْبَ الْجُوعِ بِرَغِيفٍ وَ كُوزٍ مِنْ مٰاءِ الْقَرٰاحِ فَعَلَى الدُّنْيٰا وَ أَهْلِهٰا الدَّمٰارُ»، جامع الكبير للسيوطي: ١٣٧٩، حرف الهمزة.

٣. الشّهاب القضاعي في مسنده: ٣٢، كشف الخفاء للعجلوني: ٩٦٢، كنز العمال للهندي: ٥٤٣٥، و في لفظ: «التَّدْبِيرُ نِصْفُ الْعَيْشِ وَالتَّوَدُّدُ نِصْفُ الْعَقْلِ وَالْهَمُّ نِصْفُ الْهَرَمِ وَ قِلَّةُ الْعِيٰالِ أَحَدُ الْيَسٰارَيْنِ» الفتح الكبير للسيوطي: ٥٥٠١.

## بەشی پێنجەم: خێری سەخاوەت و دەهەندەیی

بزانە، لە دۆخی نەداریدا پێویستە قەناعەت پیشە بکرێ، لە دۆخی دەوڵەمەندیشدا ئەبێ بەخشش و دڵاوایی و خۆ لە ڕژدی پاراستن پیشە بکرێ.

پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «اَلسَّخٰاءُ شَجَرَةٌ مِنْ شَجَرَةِ الْجَنَّةِ، أَغْصٰانُهٰا مُتَدَلِّيَةٌ إِلَى الْأَرْضِ، فَمَنْ أَخَذَ مِنْهٰا غِصْنًا قٰادَهُ ذٰلِكَ الْغِصْنُ إِلَى الْجَنَّةِ، وَالشُّحُّ فِي النّٰارِ فَمَنْ كٰانَ شَحِيحاً أَخَذَ بِغِصْنٍ مِنْ أَغْصٰانِهٰا فَلَمْ يَتْرُكْهُ ذٰلِكَ الْغِصْنُ حَتَّىٰ يَدْخُلَهُ النّٰارُ»[1].

واتە: «سەخاوەت و دەس‌ئاوەڵایی دارێکە لە دارەکانی بەهەشت، لقەکانی بەرەو زەمین شۆڕبوونەتەوە، جا هەرکەس لقێکی لێ بگرێ، هەر ئەو لقە بەرەو بەهەشتی دەبات، ڕژدییش دارێکە لە جەهەننەمەوە، هەرکەس ڕژد و دەست‌وشك بێ، ئەوە دەستی بە لقێ لەو دارەوە گرتووە و بەری نەداوە تا هەر ئەو لقە بردوویەتیە نێو ئاگری دۆزەخەوە».

هەروەها پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «قٰالَ جِبْرٰائِيلُ: قٰالَ اللّٰهُ: «إِنَّ هٰذٰا دِينٌ ارْتَضَيْتُهُ لِنَفْسِي، وَ لَنْ يُصْلِحَهُ إِلَّا السِّخٰاءُ وَ حُسْنُ الْخُلْقِ فَأَكْرِمُهُ مَا اسْتَطَعْتُمْ». لە ڕیوایەتێ‌تردا «فَأَكْرِمُوهُ بِهِمٰا مٰا صَحِبْتُمُوهُ»[2].

واتە: «جوبرەئیل فەرموویەتی: خودا فەرموویەتی: بێ‌گومان ئەمە دینێکە ئەمن بۆ خۆم هەڵمبژاردووە، هیچێکیش بیجگە دەهەندەیی و ئاکاری جوان ناتوانێ بیپارێزێ، کەواتە تا دەتوانی ڕێزی لێ بگرە».

پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «مٰا جَبَلَ اللّٰهُ وَلِيّاً إِلَّا عَلَى السَّخٰاءِ وَ حُسْنِ الخُلْقِ»[3] واتە: «خودا هیچ دۆستێکی خۆی خەلق نەکردووە مەگەر لەسەر سیفەتی دڵاوایی و ئاکار جوانی».

---

١. بیهقی فی شعب الإیمان: ١٠٣٧٥ ـ ١٠٣٧٧، السّیوطی فی جامع الکبیر: ٢٤، حرف السّین.

٢. طبرانی فی الأوسط: ٩١٦٨، الشّهاب القضاعی فی مسنده: ١٣٣٧، بیهقی فی شعب الإیمان: ١٠٣٦٦ ـ ١٠٣٦٧ ـ ١٠٣٦٨. و فی روایة: «إِنَّ اللّٰهَ عَزَّوَجَلَّ اسْتَخْلَصَ هٰذَا الدِّينَ لِنَفْسِهِ وَلا يَصْلُحُ لِدِينِكُمْ إِلَّا السَّخٰاءُ وَ حُسْنُ الْخَلْقِ فَزَيِّنُوا دِينَكُمْ بِهِمٰا» طبرانی فی الکبیر: ١٤٧٦٢ و فی الأوسط: ٨٥١٩، جامع الکبیر للسیوطی: ٢١١٢، حرف الهمزة.

٣. کنز العمال للعجلونی: ١٦٢٠٣، جامع الکبیر للسّیوطی: ٦٥٠، حرف المیم دون قوله: «وَ حُسْنُ الْخُلْقِ» و فی روایة: «مٰا جَبَلَ وَلِيُّ لِلّٰهِ إِلّا عَلَى السَّخٰاءِ وَ حُسْنِ الخُلْقِ» جامع الکبیر للسّیوطی: ٦٥١، حرف المیم، کنز العمال للعجلونی: ١٦٢٠٦، المقاصد الحسنة للسّخاوی: ١٩٥/١، حرف المیم.

جابر رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ لە پێغەمبەرەوە صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دەگێڕێتەوە کە: «قِيلَ يٰا رَسُولَ اللّٰهِ! أَيُّ الْإِيمٰانِ أَفْضَلُ؟ قٰالَ: الصَّبْرُ وَالسَّمٰاحَةُ»[1] واتە: «گوتیان: ئەی پێغەمبەری خودا! کام ئاکاری ئیماندار باشترە؟ فەرمووی: تاقەت و پیاوەتی».

سەبارەت بە حەزرەتی عائیشە رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا دەگێڕنەوە: کە ئیبنو زوبەیر رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا دوو بوخچەی نارد بۆ (عائیشە)، لە یەکیاندا سەد هەزار و لەوی‌تردا هەشتاد هەزار بوو، حەزرەتی عائیشەش داوای سینییێکی کرد و خستیە ناوی و دەستی کرد بە بڵاوکردنەوەی لە نێوان خەڵکدا، کاتی شەو گوتی بە "أم درّة" کە کارەکەری بوو: شێوەکەم بۆ بێنە، ئەویش کولێرەیێك و تۆزێ ڕۆن زەیتوونی بۆ هێنا و گوتی: ئەوە نەدەبوو لەو پارەی کە بڵاوت کردەوە دیرهەمێکی بدەی بە گۆشت تا شێوی لێ بخۆین، فەرمووی: ئەگەر بتخستایەتەوە بیرم، وەهام دەکرد.

## بەشی شەشەم: خراپی بەرچاوتەنگی و دەستوشکی

خودای مەزن فەرموویەتی: ﴿وَمَنْ يُوقَ شُحَّ نَفْسِهِ فَأُولٰئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ﴾[2] واتە: «ئەوانەی لە ڕژدی پارێزراو بن، ئەوە هەر ئەوان بەختەوەرن».

هەروەها خودا فەرموویەتی: ﴿لا يَحْسَبَنَّ الَّذِينَ يَبْخَلُونَ بِمٰا آتٰاهُمُ اللّٰهُ مِنْ فَضْلِهِ هُوَ خَيْراً لَهُم بَلْ هُوَ شَرٌّ لَهُمْ سَيُطَوَّقُونَ مٰا بَخِلُوا بِهِمْ يَوْمَ الْقِيٰامَةِ﴾[3].

واتە: «ئەوانەی لەو بەشە وا خودا پێی‌داون چنۆکی دەکەن، خەیاڵ نەکەن ئەم کارە بۆ ئەوان قازانجە؛ بەڵکوو بۆیان شەڕ و خراپەیە، لە ڕۆژی قیامەتدا هەر ئەو ماڵە وا ڕژدییان پێ کردووە، دەکرێتە تۆق بە سەریانەوە».

پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فەرموویەتی: «إِيّٰاكُمْ والشُّحَّ فَإِنَّهُ أَهْلَكَ مَنْ كٰانَ قَبْلَكُمْ حَمَلَهُمْ عَلَىٰ أَنْ سَفِكُوا دِمٰاءَهُمْ وَاسْتَحَلُّوا مَحٰارِمَهُمْ»[4].

واتە: «ئامان ئێوە و ڕژدی، چونکە بێ‌شك ئەوانەی پێش ئێوە بوون، چاوچنۆکی هەڵی‌نان لەسەر ئەوەی خوێن برێژن و ئیشی حەرام و ناڕەوا بە حەڵاڵ بزانن».

---

١. احمد: ٢١٦٥٨، حاكم فی المستدرك: ٦٧٠٥.

٢. الحشر: ٩. ٣. آل‌عمران: ١٨٠.

٤. مسلم: ٤٦٧٥، احمد: ١٣٩٣٧ بلفظ: «وَاتَّقُوا الشُّحَّ فَإِنَّ الشُّحَّ أَهْلَكَ مَنْ كٰانَ ...». و فی روایة: «إِيّٰاكُمْ وَالشُّحَّ فَإِنَّمٰا هَلَكَ مَنْ كٰانَ قَبْلَكُمْ بِالشُّحِّ أَمَرَهُمْ بِالْبُخْلِ فَبَخِلُوا، وَ أَمَرَهُمْ بِالْقَطِيعَةِ فَقَطَعُوا، وَ أَمَرَهُمْ بِالْفُجُورِ فَفَجَرُوا» ابوداود: ١٤٤٧، احمد: ٦٥٤٢ ـ ٦٥٠٢ و زاد: «... أَمَرَهُمْ بِالظُّلْمِ فَظَلَمُوا ...».

حەزرەتی عیساعَلَیهِالسَّلَامُ فەرموویەتی: «لا يَدْخُلُ الْجَنَّةَ بَخِيلٌ، وَلا خَبٌّ، وَلا خَائِنٌ، وَلا سَيِّئُ الْمَلَكَةِ»[1] واتە: «ڕژد و فریوکار و خەیانەتکار و بەدڕەفتار ناچنە بەهەشت».

## بەشی حەوتەم: خێر و قازانجی لەخۆ بوردوویی

بزانە بەرزترین پلەی سەخاوەت، لەخۆبوردووییە، ئەمەش بریتییە لەوەی کە وێڕای ئەوەی کە پێویستی بە ماڵەکەی هەیە، بیبەخشێ. سەخاوەتی ڕووت ئەوەیە کە لەو شتە ببەخشێ کە لە پێویستی خۆی زیاتر بێت.

پەروەردگاری بەرز و مەزن لە باسی چاکەی هاوەڵانی پێغەمبەرداصَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَسَلَّمَ فەرموویەتی: ﴿وَيُؤْثِرُونَ عَلَىٰ أَنفُسِهِمْ وَلَوْ كَانَ بِهِمْ خَصَاصَةٌ﴾[2]. واتە: «خەڵکی وە پێش خۆیان دەخەن، هەرچەندەش خۆیان زۆر پێویستیان پێ بێت».

## بەشی هەشتەم: ڕێی چارەسەری ڕژدی و چنۆکی

بزانە هۆکاری ڕژدی ماڵویستییە و خۆشەویستی ماڵیش دوو هۆی هەیە:

**هۆی یەکەم:** هەوەسبازی و حەز لە شاوەت، لەگەڵ ئاواتی دوور و درێژدا، بێگومان ئەمانە بە بێماڵ و دارایی ڕێکیان نایێ: مرۆڤ ئەگەر ئاکامی خۆی بە ڕوونی بزانێ بەم شێوە کە بزانێ کە ڕۆژێ یان مانگێ تر دەمێنی ئەوە چی هەبێ دەیبەخشێ، بەڵام وادیارە ئەگەر منداڵی هەبێ، ئەوە منداڵەکەی لەشوێنی ئاواتەدرێژەکانی دادەنێت و ماڵەکەی بۆ بەجێ دەهێڵێ. لەم سۆنگەوەیە کە پێغەمبەرصَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَسَلَّمَ فەرموویەتی: «اَلْوَلَدُ مَبْخَلَةٌ، مَجْبَنَةٌ، مَجْهَلَةٌ»[3] واتە: «منداڵ هۆی چنۆکی و ترس و نەزانینە». جا سەرەڕای ئەمانەش ترسی گەداکەوتن و بێباوەڕی بە دیاریکراویی ڕزق، بێشك ئەبێتە هۆی هێز سەندنی چنۆکی و ڕژدی.

**هۆی دووهەم:** خۆشویستنی خودی ماڵەکە وێڕای ئەوەی دڵنیایە قەت پێویستی بەو ماڵە نییە؛ ئەمەش وەکوو پیرێکی بەساڵاچوو کە ئۆجاخکوێر بێ، کەچی هەر ئەو ماڵەی پڕ

---

١. احمد: ١٣ ـ ٣٢، ترمذی: ١٨٨٦، بیهقی فی شعب الإیمان: ١٠٣٦٤. ئەم حەدیسە لێرەدا نیسبەت لە حەزرەتی عیسا دراوە، بەڵام لە ئیحیا و لە کتێبە حەدیسییەکاندا نیسبەت لە پێغەمبەرصَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَسَلَّمَ دراوە ـ وەرگێڕ.

٢. الحشر: ٩.

٣. ابن‌ماجه: ٣٦٥٦، احمد: ١٦٩٠٤ دون قوله: «مَجْهَلَة»، و طبرانی فی الکبیر: ٢٠٠٨١، حاکم فی المستدرك: ٥٢٩٠، جامع الکبیر للسیوطی: ٦٥٧ ـ ١٠٩٢٩ و بعضهم زادوا: «مَحْزَنَة».

بەدڵ خۆش ئەویّ. ئەم جۆرە نەخۆشە، ـ پەنا بەخوا ـ کاری وەکوو کەسیّ وایە کە عاشقی کەسیّ ببیّ، پاشان عاشقی نێردراوی مەعشووقەکەی بێت و ئەوی لەبیر بچێتەوە، چونکە مەبەست لە پووڵ و پارە گەیشتن بە ئامانجە، ئەمجۆرە ڕیش سپیەش ئامانجەکەی لەبیر چووەتەوە و عاشقی کەرەستە و ئامرازی گەیشتنەکە بووە. ئەدی کەسیّ وابزانیّ لەنێوان پارە و بەردا جیاوازی هەیە ـ جگە لەوەی پارە کەرەستەی پێداویستییە ـ ئەوە زۆر نەزانە.

جا ئێستا بزانە، چارەسەری چنۆکی و ڕژدی کەمکردنەوەی هەوەس و شەهوەتە و زۆر یادی مەرگ‌کردنە و ڕامانە لەسەر مەرگی هاوتەمەنەکاندا و سەردانی گۆڕ و بیر لەو کرم و مارانەی کە لەنێو گۆڕدان و بیر لە حاڵاتی مەرگە.

هەروەها ئەو دڵەڕاوکێیەیشی کە بۆ منداڵەکانی هەیەتی بەمجۆرە چارەسەری بکات:

تێ بگات کە هەر خودای بەدیهێنەری ئەو منداڵە، خۆی بژیوی لەگەڵیدا خەلق کردووە. زۆر منداڵ بووە کە میراتی زۆری دەست کەوتووە و ئەوە نەبووەتە ڕزقی، هەروەها زۆریش بوون کە میراتیان دەست نەکەوتووە و خودا دارایی زۆری بە نسیب کردوون.

ئەگەر منداڵەکەی بە پیاوچاك دەربچیّ ئەوە خودا هۆشی بە لای چاکانەوەیە، ئەگەریش بە خراپەکار دەربچیّ ـ یاخوا وێنەیان هەر لەنێو موسڵماناندا، زیاد نەبیّ ـ ئەوە بەو میراتە کە بۆی بەجیّ ماوە گوناحی زۆرتر دەکات.

هەروەها بۆ چارەسەری ڕژدی، چارەیێك کە کاریگەری هەبیّ ئەوەیە کە بیر لە خراپەوێژی خەڵك بەرانبەر بە چنۆك و دەست‌وشکان بکاتەوە و بیر لە تاریف و چاکەوێژی و حەز پێ‌کردنی خەڵك لە دەس‌کراوەیی و سەخی‌تەبعەکان بکاتەوە. خوداش سەبارەت بە چاوچنۆکان دەفەرمیّ: ﴿اَلشَّيْطَانُ يَعِدُكُمُ الْفَقْرَ وَيَأْمُرُكُمْ بِالْفَحْشَاءِ﴾[1] واتە: «شەیتان [لەکاتی بەخشیندا] وادەی گەداییتان پێ دەدات و فەرمانتان پێ دەکات (لەو بوارەدا) کاری خراپە ئەنجام بدەن».

## بەشی نۆهەم: زەرەری دەوڵەمەندی و خێری گەدایی

دەڵێن: حەزرەتی عیسا عَلَيْهِ‌السَّلَام فەرموویەتی: «ئەی زانا خراپەکان، بە قسەی ئێوە خەڵك ڕۆژوو دەگرن و نوێژ دەخوێنن و خێرات دەکەن، کەچی خۆتان ئەوەی کە وا ئەیڵێن ڕەفتاری پێ ناکەن و وانەیێك ئەڵێنەوە کە خۆتان پێی ڕەفت ناکەن.

١. البقرة: ٢٦٢.

ئیشێك ئێجگار خراپ دەکەن؛ بە زمان تەوبە دەکەن، کەچی بە پێی‌هەوەس ڕەفتار دەکەن! چ سوودێکی بۆتان هەیە جل‌وبەرگتان خاوێن بکەن و بەڵام دڵتان پیس بێت، بەڕاستی و پاکی پێتان ئەڵێم: ئێوە وەکوو بێژنگ مەبن کە دانەوێڵەی چاك لێیەوە دادەوەرێ و کاو کۆتەڵەی تێدا دەمێنێتەوە. ئێوە هەر بەو چەشنە قسەی چاك و پڕحیکمەت لە زارتان دێتەدەر و لە دڵتاندا ڕق و قین دەمێنێتەوە.

ئەی بەندەکانی دونیا! چلۆن کەسێ دەستی لە هەوەسبازی دونیا هەڵنەگرتووە و حەزی لێ دانەبڕاوە، لە دواڕۆژ تێ دەگات. ئەمن دڵسۆزانە پێتان ئەڵێم: دڵتان لەو کردەوانەتان شەرمەزارە و بەخوڕ دەگری، ئێوە دونیاتان خستۆتە ژێر زمانتان و کردەوەشتان هاویشتۆتە ژێر پێتان. بەلای ئێوەوە بەرژەوەندی دونیا خۆشترە تا بەرژەوەندی دواڕۆژ ئەگەر بیر بکەنەوە کێ لە ئێوە زۆرتر زەرەمەند بووە؟! هاوارتان لێ بێ هەتا کەی ڕێی شەوڕەوان خۆش دەکەن و خۆتان بە سەرلێشێواوی دەوەستن، ئەڵێی ئێوە هێور هێور خەڵك بانگ دەکەن بۆ ئەوەی دونیاتان بۆ بەجێ بهێڵن.

هاوار بەماڵتان! بۆ خانووی تاریك چ قازانجێکی هەیە کە چراکەی لەسەر بان دابنرێ و ناو ماڵەکەی تەپ و تاریك و مەترسی‌دار بێت، هەر بەم چەشنەش تیشکی زانست چ قازانجێکی بە حاڵی ئێوە هەیە کە لە زارتاندا بێ و دڵتان شەوەزەنگێکی چۆڵ بێت.

هۆ دونیاپەرستان! ئێوە وەکوو بەندە لەخواترسەکان و ئازادەچاکەکان نین، وەختە دونیا لە ڕیشەتان دەربهێنێ و دەمەو ڕوو بتانخات و لووتتان بە عەرزدا بماڵێ و پاشان بەهۆی گوناحەکانتانەوە ناوچاوتان بگرن و لە پشتەوە هێندە فڕەتان بدەن تا بە دەستی خاڵی و ڕووت و ڕەجاڵی تاق و تەنیا بتانخەنە بەردەستی خودا و خوداش تاوانەکانتان بۆ شی بکاتەوە و پاشان بەسزای شیاوی خۆتان بگەیەنێ»[1].

جا ئێستە بۆت ڕوون بووەوە کە نەداری و نەبوونی چاترە لە دارایی، هەرکەس وا بیر بکاتەوە کە دەوڵەمەندی باشترە، ئەوە ـ پەنا بە خودا ـ تیزی بە موحەممەدﷺ و پێغەمبەرانی‌تر و پیاو چاکە ڕابردووەکان کردووە.

---

١. مختصر تاریخ دمشق لابن‌منظور: ٢١٩/٦، المنتظم لابن‌الجوزی: ١٢٣/١ بروایات مختلفة و فیهم زیادات و نواقصات.

هەندێ‌کەس کە وا شەیتان فریوی داون و دڵیان کرمۆڵە و عاقیبەت‌شەڕی دایای گرتوون، بەڵگە بە عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەوف‌رضي الله عنه ئەهێننەوە، ئێستا ئێمەش لێرەدا چیرۆکێ دەکۆرێنینەوە کە قسەو ئامانجی ئەو کەسانە بەتاڵ دەکاتەوە. ئەڵێین:

[کاتێ کە عەبدوڕڕەحمان فەوتی کرد] هەندێ خەڵك دەیانگوت: ئێمە بۆ عەبدوڕڕەحمان دەترسین سەبارەت بەم شتانە بەجێ هێشتوون، "کەعب"رضي الله عنه فەرمووی: "سبحان الله" لەچی دەترسن کاتێ عەبدوڕڕەحمان کاسبی حەلاڵ و چاکی کردووە و چاکی بەخشیوە و چاکی بەجێ هێشتووە.

ئەم قسە گەیشتە ئەبووزەڕی غەففاری‌رضي الله عنه، دەسبەجێ بە تووڕەیی لە ماڵ هاتەدەر و بەلای ئێسقانی کەللە وشترێکدا تێپەڕی، هەڵی‌گرت و بە پەلە بەشوێن کەعبدا دەگەڕا. بە کەعبیان ڕاگەیاند کە ئەبووزەڕ بە شوێنتا سەراسۆیە، ئەویش بە پەلە ڕای کرد بۆلای حەزرەتی عوسمان‌رضي الله عنه و ڕووداوەکەی گێڕایەوە و داوای یارمەتی لێ کرد. ئەبووزەڕیش بە دوویدا دەگەڕا تا گەیشتە ماڵی عوسمان.

هەر ئەبووزەڕ هاتە ماڵەوە، کەعب گورج چووە پشت سەر حەزرەتی عوسمانەوەرضي الله عنه تا خۆی لە ئەبووزەڕ ڕزگار بکات، ئەبووزەڕ پێی گوت: چییە ئەی کوڕی یەهوودی!

واخەیاڵت کردووە ئەو ماڵەی عەبدوڕڕەحمان بە میرات بە جێی هێشتووە هیچ قەیناکات؟! ڕۆژێ پێغەمبەرصلى الله عليه وسلم بەرەو کێوی ئوحود کەوتە ڕێ، ئەمن لە خزمەتیدا بووم، فەرمووی: ئەی ئەبازەڕ! گوتم: بەڵی ئەی پێغەمبەری خودا لە خزمەتت‌دام!

فەرمووی: «اَلْأَكْثَرُونَ هُمُ الْأَقَلُّونَ يَوْمَ الْقِيٰامَةِ إِلَّا مَنْ قٰالَ: هٰكَذٰا وَ هٰكَذٰا عَنْ يَمِينِهِ، وَ عَنْ شِمٰالِهِ، و قُدّٰامِهِ، وَ خَلْفِهِ، و قَلِيلٌ مٰا هُمْ»[١].

واتە: «ئەوانەی وا [لە دونیا] زۆریان هەیە لە قیامەتدا کەمیان هەیە، مەگەر ئەو کەسە لە چەپ و ڕاستی و خوار و ژووری خۆی بڵێ: ئەمە بۆ فلانەکەس و ئەوە بۆ فیسارە کەس ... ئەم جۆرە کەسانەش زۆر کەمن».

---

١. بخاري: ٨٧٩٧ ـ ٦١٤٧ ـ ٥٩٦٣، مسلم: ١٦٥٢، ترمذي: ٥٦٠، نسائي: ٢٣٩٧، احمد: ٢٠٤٣١/ ٢ ـ ٢٠٥١٦، ابن‌ماجه: ٤١٢٠ بلفظ: «اَلْأَكْثَرُونَ هُمُ الْأَسْفَلونَ ...».

پاشان فەرمووی: ئەی ئەبازەڕ! گوتم: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خودا! باوك و دایکم بە قوربانت، فەرمووی: «مٰا يَسُرُّنِي أَنَّ لِي مِثْلَ أُحُدٍ ذَهَباً، أُنْفِقُهُ فِي سَبِيلِ اللهِ، أَمُوتُ يَوْمَ أَمُوتُ، وَ أُبْقِي مِنْه قِيرٰاطَيْنِ، قُلْتُ: أَوْ قِنْطٰارَيْنِ يٰا رَسُولَ اللهِ، قٰالَ: بَلْ قِيرٰاطِيْنِ، ثُمَّ قٰالَ: يٰا أَبٰاذَرٍّ! تُرِيدُ الْأَكْثَرَ، و أَنَا أُرِيدُ الْأَقَلَّ»[1].

واتە: «ئەمن بەوە کەیف‌خۆش نابم کە بە ئەندازەی کێوی ئوحود زێڕم هەبێ، لەڕێ خودا بیبەخشم، بشمرم هەر ڕۆژێ کە بمرم و بە شوێن خۆمدا دوو قیرات ($\frac{1}{16}$ دیرهەمێ) بەجێ بهێڵم، گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا! یان دوو قینتار (بەکێشانە نزیکەی ١٠٠٠ ڕیتلێ). فەرمووی هەردوو قیرات. پاشان فەرمووی: ئەبووزەڕ! ئەتۆ حەز بە زۆر دەکەیت من بە کەم حەز دەکەم».

پێغەمبەری خوداﷺ ئەمەی حەز پێ کردووە، کەچی تۆ ئەی کوڕی یەهوودی! ئەڵێیت: ئەو ماڵەی عەبدوڕڕەحمان بەجێ هێشتووە هیچ قەیدێ ناکات، ئەتۆ و ئەو کەسەش کە گوتوویە درۆتان کردووە.

ئەبووزەڕ ئەمەی گوت و کەس یەك پیتیشی بەسەرا نەداوە و چووە دەرەوە».

دەڵێن: کاروانێکی بازرگانیی عەبدوڕڕەحمانرضي الله عنه لە یەمەنەوە هاتەوە و بە یەکجاری مەدینە پڕ بوو لە غوڵە و هەرا، حەزرەتی عائیشەرضي الله عنها فەرمووی: ئەمە چییە؟

گوتیان: کاروانێکی عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەوفە، هاتوتەوە.

فەرمووی: پێغەمبەری خوداﷺ ڕاستی فەرموو بوو.

ئەم قسە بە عەبدوڕڕەحمان گەیشتەوە و ئەویش پرسیاری لە عائیشە کرد، عائیشەش فەرمووی: لە پێغەمبەرمﷺ بیست، فەرمووی: «إِنِّي رَأَيْتُ الْجَنَّةَ فَرَأَيْتُ فُقَرٰاءَ الْمُهٰاجِرِينَ وَ الْمُسْلِمِينَ يَدْخُلُونَ سَعْياً، فَلَمْ أَرَ أَحَداً مِنَ الْأَغْنِيٰاءِ يَدْخُلُهٰا مَعَهُمْ غَيْرَ عَبْدُالرَّحْمٰنِ بْنِ عَوْفٍ رَأَيْتُهُ يَدْخُلُهٰا مَعَهُمْ حِبْواً»[2].

---

١. لم نقف على هذه الزّيادات لكن أخصر من هذا اللّفظ: بخاري: ٥٩٦٣، مسلم: ١٦٥٣، احمد: ٢٠٣٥٩ ـ ٢٠٣٦٦، جميعهم بروايات مختلفة.

٢. احمد: ٢٣٦٩٨ بنحوه: «رَأَيْتُ عَبْدَالرَّحْمنِ بنَ عَوْفٍ يَدْخُلُ الْجَنَّةَ حَبْواً ـ». و في رواية: «إِنَّ فُقَرٰاءَ الْمُهٰاجِرِينَ يَسْبِقُونَ الْأَغْنِيٰاءَ يَوْمَ الْقِيٰامَةِ إِلَى الْجَنَّةِ بِأَرْبَعِينَ خَرِيفاً ـ» مسلم: ٥٢٩١، ابن‌ماجه: ٤١١٣، ترمذی: ٢٢٧٤ بلفظ: «بِخَمْسِ مِائَةِ سَنَةٍ»، و في رواية: «بِنِصْفِ يَوْمٍ وَ هُوَ خَمْسُ مِائَةِ عٰامٍ» ابن‌ماجه: ٤١١٤.

واتە: «ئەمن بەهەشتم سەیر دەکرد، هەرچەندە یاری هەژار و نەداری کۆچەر و موسڵمانم هەبوو دیت کە بە گورجی دەچوونە ناو، کەچی هیچکام لە دەوڵەمەندانم نەدیت کە بڕواتە بەهەشت، جگە عەبدورڕەحمانی کوڕی عەوف، دیتم ئەویش لەگەڵ هەژاراندا خۆی بە خزەخز دەخشێنێتە نێو بەهەشت».

عەبدورڕەحمان رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ گوتی: ئەم کاروانە بە بارو بە وشترەوە لەڕێ خودا و هەرچی کۆیلەی تێدایە ئازاد بن، بەشکەم ئەمنیش بە ڕاکردن لەگەڵ ئەواندا بچمە نێو بەهەشتەوە.

لە عومرانی کوڕی حەسینەوە دەگێڕنەوە کە گوتوویە: ئەمن لە خزمەتی پێغەمبەردا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ڕێزو پلەی تایبەتم هەبوو، پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فەرمووی: «يٰا عِمْرٰانُ إِنَّ لَكَ عِنْدَنٰا مَنْزِلَةً وَ جٰاهاً، فَهَلْ لَكَ فِي عِيٰادَةِ فاطِمَةَ بِنْتِ رَسُولِ اللّٰهِ؟» واتە: «ئەی عیمران! ئەتۆ بێ‌شك پلە و پایەی تایبەتیت لەلای ئێمەوە هەیە، ئایا سەردانی فاتمەی کچی پێغەمبەری خودا ئەکەی؟ گوتم: باوك و دایکم بە قوربانت بن، بەڵێ، ئەی نێردراوی خودا!

پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ تەشریفی هەستاو ئەمن لەگەڵی چووم تا بەردەرگای ماڵی فاتمە، دەرکەی کوتا و فەرمووی: "السلام علیکم" ئیزن هەیە بێمە ماڵەوە؟ گوتی: بە ساقەت بم ئەی پێغەمبەری خودا! فەرموو. پێغەمبەریش صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فەرمووی: ئەمن و ئەوکەسەش لەگەڵمدایە؟ گوتی: کێت لە گەڵدایە ئەی پێغەمبەری خودا؟ فەرمووی: عیمرانی کوڕی حەسین.

فاتمە رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا گوتی: سوێند بەو کەسەی کە تۆی بەحەق، بە پێغەمبەری ڕەوانە کردووە، جگە عەبایەك نەبێ هیچم لەبەردا نییە.

فەرمووی: ئاوەها و ئاوەهای پێ بکە و بە دەستی ئاماژەی بۆ کرد.

گوتی: ئەوە خۆمم داپۆشی، ئەدی سەرم چی لێ بکەم؟!

پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، پارچەیێکی کۆنە کە بەسەر شانیەوە بوو، بۆی فڕێ دا و فەرمووی: بەوە سەرت داپۆشە ـ پاشان ئیزنی دا بڕۆنە ماڵەوە ـ فەرمووی: کچم چلۆنی؟ گوتی: وەڵڵاهی ئێشم هەیە و تا دێ ئێشەکەم پتر دەبێ، چونکە جگە لە ئێشەکەم، بە زۆری برسیمە و شتێکمان نییە بیخۆم.

پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فەرمووی: «لا تَجْزِعِي يٰا بِنْتٰاهُ، فَوَاللّٰهِ مٰا ذُقْتُ طَعٰاماً مُنْذُ ثَلاٰثٍ، وإِنِّي لَأَكْرَمُ عَلَى اللّٰه مِنْكِ، وَ لَوْ سَأَلْتُ رَبِّي لَأَطْعَمَنِي، وَلٰكِنْ آثَرْتُ الْآخِرَةَ عَلَى الدُّنْيٰا».

واته: «خەم مەخۆ کچم! سوێند بە خودا، سێ ڕۆژە نانم مێڵاك نەکردووە، ئەدی خۆ من بە لای خوداوە لە تۆ بەڕێزترم، ئەگەر داوام لە خودا بکردایە، خودا نانی دەدا پێم، بەڵام ئەمن دوارۆژم لە دونیا بەلاوە باشترە».

پاشان دەستی دا بەسەر شانیدا و پێ فەرمووی: «أَبْشِرِي فَوَاللهِ إِنَّكِ لَسَيِّدَةُ نِسٰاءِ أَهْلِ الْجَنَّةِ»[1]. واته: «مزگێنیت دەدەمێ کە تۆ سەروەری ژنانی بەهەشتی».

گوتی: ئەدی ئاسیەی هاوسەری فیرعەون و مریەمی کچی عیمران چی؟

پێغەمبەرﷺ فەرمووی: «آسِيَةُ سَيِّدَةُ نِسٰاءِ عالَمِهٰا، وَ مَرْيَمُ سَيِّدَةُ نِسٰاءِ عٰالَمِهٰا، وَ خَدِيجَةُ سَيِّدَةُ نِسٰاءِ عالَمِهٰا، و أَنْتِ سَيِّدَةُ نِساءِ عالَمِكِ إِنَّكُنَّ فِي بُيُوتٍ مِنْ قَصَبٍ لا أَذَىٰ فِيهٰا، وَلا صَخَبٌ»[2].

واته: «ئاسیە سەروەری ژنانی عالەمی (دەورانی) خۆیە، مریەمیش سەروەری ژنانی عالەمی خۆیە، خەدیجەش سەروەری عالەمی خۆیە، ئەتۆش سەروەری عالەمی خۆتی: ئێوە هەمووتان لەنێو ماڵانێکدان کە بە زێڕ تەنراوە هیچ شتێ ئازارتان نادات و هیچ دەنگ و هەرایەکی تێدا نییە».

پاشان پێ فەرموو: «اِقْنِعِي بِابْنِ عَمِّكِ، فَوَاللهِ لَقَدْ زَوَّجْتُكِ سَيِّدًا فِي الدُّنْيٰا وَ سَيِّدًا فِي الْآخِرَةِ»[3].

واته: «بەو کوڕە ئامۆزایەی خۆت قەناعەت بکە، چونکە سوێند بە خودا ئەمن تۆم کردۆتە هاوسەری کەسێ هەم لە دونیا و هەم لە دوارۆژدا سەرۆك و سەردارە».

والله أعلم بالصّواب

---

١. بخاری: ٣٣٥٣، ترمذی: ٣٧١٤ ـ ٣٨٠٨، احمد: ١١٣٣٢ ـ ٢٢٢٤٠ جمیعهم فی حدیث آخر. و فی روایة: «أَوَ مٰا تَرْضَيْنَ أَنِّي زَوَّجْتُكِ أَقْدَمَ أُمَّتِي سِلْماً وَ أَكْثَرَهُمْ عِلْماً وَ أَعْظَمَهُمْ حِلْماً» احمد: ١٩٤٢٠.

٢. احمد: ٢٥٣٦ ـ ٢٨٠٥ ـ ١١٩٤٢، ترمذی: ٣٨١٣ بلفظ: «أَفْضَلُ نِسٰاءِ أَهْلِ الْجَنَّةِ: خَدِيجَةُ بِنْتُ خُوَيْلِدٍ وَ فٰاطِمَةُ بِنْتُ مُحَمَّدٍ وَ آسِيَةُ بِنْتُ مُزٰاحِمٍ امْرَأَةُ فِرْعَوْنَ وَ مَرْيَمُ ابْنَةَ عِمْرٰانَ». و فی روایة: «...بَشِّرُوا خَدِيجَةَ بِبَيْتٍ مِنَ الْجَنَّةِ مِنْ قَصَبٍ لا قَصَبَ فِيهِ وَلا نَصَبَ» بخاری/١٦٦٦ ـ ٣٥٣٥ ـ ٣٥٣٦ـ ٦٩٤٣، مسلم: ٤٦٦٠ ـ ٤٦٦١، ترمذی: ٣٨١١، احمد: ١٦٦٦ ـ ٦٨٥٩ ـ ١٨٣٤٠ ـ ١٨٥٩٣.

٣. مشکل الآثار للطحاوی: ١٤٩ بلفظ قریب من هذا اللّفظ.

# بابەتی بیست و هەشتەم:
# زەرەری مەقامویستی و ڕیابازی

بزانە پلە و مەقام بەلای دڵەوە خۆشـە و حـەزی لێ دەکات، جگە لە سیددیقین و پیاوە هەرەچاکەکان نەبێ کەس ناتوانێ خۆی لێ بوێرێ، بەم بۆنەوەیە کە گوتوویانە: دوایین‌ترین شتێ کە لەسەر سیددیقین دەردەچێ حەزی سەرۆکی و گەورەییە.

ئەم بابەتە لە چەند بەشێکدا شی دەکەینەوە:

## بەشی یەکەم: [خراپی مەقامویستی و ناوبانگ]

بزانە پێگە و پایە لە بنەڕەتدا بە بڵاوەبوونی ناو و ناوبانگە، ئەمەش خۆی خراپە، مەگەر بۆ کەسێ کە خودای مەزن لە ڕێی بڵاوکردنەوەی دین ناوبانگی بڵاو کردبێتەوە.

ئەنەس ڕیوایەتی کردووە کە: پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «حَسْبُ امْرِىءٍ مِنَ الشَّرِّ إِلَّا مَنْ عَصِمَهُ اللهُ تَعَالَىٰ أَنْ يُشِيرَ النَّاسُ إِلَيْهِ بِالْأَصَابِعِ فِي دِينِهِ و دُنْيَاهُ»[1].

واتە: «بەسە بۆ بەدبەختی مرۆڤ هەر ئەوەی خەڵك بۆ دین و دنیای بە پەنجە ئاماژەی بۆ بکەن، مەگەر خودای مەزن بیپارێزێ».

حەزرەتی عەلیرضي الله عنه فەرموویەتی: بێ‌ناو و نیشان بژی، ناوبانگ بۆ خۆت دەرمەکە، کەسایەتیت بۆ ئەوە بەرز مەکەوە تا باست بکرێ، خۆت شاراوە ڕابگرە و بێ‌دەنگ بە تا بێ‌مەزەڕەت بی و دڵی پیاوچاکانت خۆش‌کەیف و دڵی زاڵمانت قەڵس کردبێ.

---

١. ترمذی: ٢٣٧٧ بلفظ: «بِحَسَبِ امْرِىءٍ مِنَ الشَّرِ أَنْ يُشَارَ إِلَيْهِ بِالْأَصَابِعِ فِي دِينٍ أَوْ دُنْيَا إِلَّا مَنْ عَصَمَهُ اللهُ». و فی روایة: «بِحَسَبِ امْرِىءٍ مِنَ الشَّرِّ أَنْ يَحْقِرَ أَخَاهُ الْمُسْلِمَ» مسلم: ٤٦٥٠، ابوداود: ٤٢٣٨، ترمذی: ١٨٥٠، ابن‌ماجه: ٤٢٠٣، احمد: ٧٧٥٦ ـ ٨٣٦٥ ـ ١٥٤٤٤.

ئیبراهیمی کوڕی ئەدهەمرَحِمَهُ‌اللهُ فەرموویەتی: هەرکەس حەز لە ناوبانگ بکات، لەگەڵ خودا ڕاست ناکات[1].

تەلحەرَضِيَ‌اللهُ‌عَنْهُ گرووپێکی دیت لەگەڵیدا ڕێیان دەکرد، فەرمووی: «ئەمانە مێشی تەماح و پەپوولەی ئاورن».

سولەیمانی کوڕی حەنزەلە فەرموویەتی: ئێمە لە دەوروپشتی ئوبەیی کوڕی کەعبرَضِيَ‌اللهُ‌عَنْهُ بە کۆمەڵ دەڕۆیشتین، کوتوپڕ حەزرەتی عومەررَضِيَ‌اللهُ‌عَنْهُ چاوی پێ کەوت و دەست بەجێ چێوی لێ بەرز کردەوە، گوتی: قوربان بڕوانە بزانە ئەتەوێ چی بکەی؟ فەرمووی: ئەمە (واتە: شوێنکەوتن و ناوبلاوکردنەوە) سووکییە بۆ ئەوانەی وا شوێنکەوتوون و بەلایە بۆ پێشەنگەکە»[2].

حەسەنرَضِيَ‌اللهُ‌عَنْهُ فەرموویەتی: ڕۆژێ ئیبنومەسعوودرَضِيَ‌اللهُ‌عَنْهُ لەماڵ هاتەدەر و خەڵك وە دووی کەوتن، فەرمووی: بۆچی وەدووم دەکەون؟ وەڵڵاهی ئەگەر خەبەرتان لەو شتانە بوایە کە من دەرکەم بەسەریاندا داخستووە، ئەوە قەت کەسێ لەئێوەم وەدوو نەدەکەوت[3].

حەسەن دیسان فەرموویەتی: بێشك تەپەی پێلاو لە پشت‌سەرپیاوانەوە، کەمجار هەیە کە دڵی گێل و گەوج لەگەڵیدا دابمەرزێ و ئۆقرە بگرێ[4].

## [بەشی دووهەم:] خێر و بایەخی بێناو و نیشانی

پێغەمبەرصَلَّى‌اللهُ‌عَلَيْهِ‌وَسَلَّمَ فەرموویەتی: «رُبَّ أَشْعَثَ أَغْبَرَ ذِي طِمْرَيْنِ لا يُؤْبَهُ لَهُ، لَوْ أَقْسَمَ عَلَى اللهِ لأَبَرَّهُ، مِنْهُمُ الْبَرَاءُ بْنُ مَالِكٍ»[5].

واتە: «زۆر بنیادەمی شپرزە و تۆزاویی شڕ لەبەر هەیە کە کەس ئاوڕیشی لێ ناداتەوە، ئەگەر سوێندی خودا بدەن، خودا بە گوێیان دەکات، یەکێك لەمانە بەرائی کوڕی مالیکە».

١. «ما صَدَقَ اللهَ مَنْ أَحَبَّ الشُّهْرَةَ»، بخاری فی التّاریخ الکبیر: ٣١٥٦، احمد فی الزّهد الکبیر: ٢٢٧٦، سیر أعلام النّبلاء للذّهبی: ٤٣٩/١٣ فی مناقب ابراهیم بن‌ادهم.

٢. بیهقی فی الزّهد الکبیر: ٣١٤، ابن‌ابی‌شیبه فی مصنفه: ٢١٣/٦، دارمی فی سننه: ٥٣٢.

٣. دارمی فی سننه: ٥٤١.

٤. دارمی فی سننه: ٥٤٤، بیهقی فی المدخل: ٣٩٠.

٥. ترمذی: ٣٧٨٩ بلفظ: «كَمْ مِنْ أَشْعَثَ ...»، مسلم: ٤٧٥٤ ـ ٥٠٩٤ بلفظ: «رُبَّ أَشْعَثَ مَدْفُوعٍ بِالْأَبْوَابِ لَوْ أَقْسَمَ عَلَى اللهِ لَأَبَرَّهُ»، جامع الکبیر للسیوطی: ١٢٨٠٥ دون قوله: «أَشْعَثَ أَغْبَرَ»، حاکم فی المستدرك: ٨٠٥٠، بیهقی فی شعب الإیمان: ١٠٠٠٠، بزّار فی مسنده: ٢٠٣٥، طبرانی فی الکبیر: ٨٧٣ بروایات مختلفة دون ذکر قوله: «مِنْهُمُ الْبَرَاءُ بْنُ مَالِكٍ».

ئیبنو مەسعوود رَضِيَ اللهُ عَنهُ دەڵێ کە: پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم فەرموویەتی: «رُبَّ ذِي طِمْرَيْنِ لا يُؤْبَهُ لَهُ لَوْ أَقْسَمَ عَلَى اللهِ لَأَبَرَّهُ، لَوْ قَالَ: اَللّٰهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ الْجَنَّةَ لَأَعْطَاهُ الْجَنَّةَ، وَ لَمْ يُعْطِهِ مِنَ الدُّنْيَا شَيْئاً»[1].

واتە: «زۆر مرۆڤی شڕ لەبەر هەیە کە کەس سەرنجیان نادات، ئەگەر بێژێ: خودایا! ئەمن بەهەشتم لێت گەرەکە، ئەوە خودا بەهەشتی پێشکەش دەکات و کەچی هیچێ لە ماڵی دونیای پێ نەداوە».

ئەبوو هورەیرە رَضِيَ اللهُ عَنهُ دەڵێ کە: پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم فەرموویەتی: «إِنَّ أَهْلَ الْجَنَّةِ كُلُّ أَشْعَثَ أَغْبَرَ ذِي طَمْرَيْنِ لا يُؤْبَهُ بِهِ، اَلَّذِينَ إِذَا اسْتَأْذَنُوا عَلَى الْأُمَرَاءِ لَمْ يُؤْذَنْ لَهُمْ، وَ إِذَا خَطَبُوا النِّسَاءَ لَمْ يُنْكَحُوا، وَ إِذَا قَالُوا لَمْ يُنْصَتْ لَهُمْ، حَوَائِجُ أَحَدِهِمْ تَتَخَلَّلُ[2] فِي صَدْرِهِ، لَوْ قُسِمَ نُورُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ بَيْنَ النَّاسِ لَوَسِعَهُمْ»[3].

واتە: «بێگومان بەهەشتی، هــەر ئەو بنیادەمە شپرز و تۆزاوی و شڕ لەبەرانەن کە ئەگەر داوای ئیزنی چوونە لای دەسەڵاتداران بکەن، ئیزنیان پێ نادرێ، هەر کاتێکیش خوازبێنی ژنان بکەن ژنیان پێ نادەن، هەرکاتێ قسە بکەن گوێیان بۆ ناگرن، (لەم ڕووەوە) پێداویستییەکانیان لە سینگیاندا قووت دەدەن، ئەگەر لە ڕۆژی قیامەتدا تیشکی یەکێکیان دابەش بکرێ بەسەر خەڵکدا، هەموویان دادەگرێ».

دەگێڕنەوە کە حەزرەتی عومەر رَضِيَ اللهُ عَنهُ تەشریفی بردە نێو مزگەوت، کوتوپڕ مەعازی کوڕی جەبەلی رَضِيَ اللهُ عَنهُ دیت خەریکە لە پەنای گڵکۆی [پیرۆزی] پێغەمبەردا صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم دەگری، پرسیاری کرد: بۆچ دەگری؟ گوتی: لە پێغەمبەری خودام صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم بیستووە کە دەیفەرموو: «إِنَّ الْيَسِيرَ مِنَ الرِّيَاءِ شِرْكٌ، وَ إِنَّ اللهَ تَعَالَى يُحِبُّ الْأَتْقِيَاءَ الْأَخْفِيَاءَ، الَّذِينَ إِنْ غَابُوا لَمْ يُفْقَدُوا، وَ إِنْ حَضَرُوا لَمْ يُعْرَفُوا، قُلُوبُهُمْ مَصَابِيحُ الْهُدَى، يَنْجُونَ مِنْ كُلِّ غَبْرَاءِ مُظْلِمَةٍ»[4].

واتە: «تۆزقاڵێك ڕیا دەبێتە شیرك و هاوبەشیدانان بۆ خودا، بێگومان خودای مەزن، خۆشی لەو خۆپارێزە بێ ناوونیشانانە دێ، ئەوانەی ئەگەر نەبن ناپرسن بە شوێنیاندا،

---

١. طبرانی فی الأوسط: ٧٧٦١ بلفظ قریب منه: «إِنَّ مِنْ أُمَّتِي مَنْ لَوْ جَاءَ أَحَدَكُمْ فَسَأَلَهُ دِينَاراً لَمْ يُعْطِهُ وَ لَوْ سَأَلَهُ دِرْهَماً لَمْ يُعْطِهُ وَ لَوْ سَأَلَهُ فُلْساً لَمْ يُعْطِهُ وَ لَوْ سَأَلَ اللهُ الْجَنَّةَ لَأَعْطَاهُ إِيَّاهُ ذُو طَمْرَيْنِ لا يُؤْبَهُ لَهُ لَوْ أَقْسَمَ عَلَى اللهِ لَأَبَرَّهُ»، جامع الکبیر للسیوطی: ١٨٠٩، حرف الهمزة بنحوه.

٢. وشەی «تتخلل»مان لە ئیحیادا وەرگرت، دەنا لێرەدا «تتلجلج» هاتبوو ـ وەرگێڕ.

٣. بیهقی فی شعب الإیمان: ١٠٠٠٤ بلفظ: «إِنَّ مُلُوكَ أَهْلِ الْجَنَّةِ كُلُّ أَشْعَثَ ... يَتَجَلْجَلُ فِي صَدْرِهِ ...».

٤. ابن‌ماجه: ٣٩٧٩ بلفظه مع زیادات، و جامع الکبیر للسیوطی: ٢٠٤١، حرف الهمزة، طبرانی فی الکبیر: ٥٥٤ بلفظ آخر.

ئەگەریش ببن ناناسرێن، دڵیان چرای ڕێنوێنییە، لە هەرچی بیابانی تاریکەوە دەپەڕنەوە و ڕزگاریان دەبێ».

ئیبنو مەسعوود رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ فەرموویەتی: ئێوە سەرچاوەی زانست بن و چرای هیدایەت، لە ماڵ دابنیشن و خۆ دەرمەخەن، چرای شەو بن، دڵتازە و لیباس کۆنە بن، [ئەگەر وەها بن] لەلای ئاسمان‌نشینەکانەوە دەناسرێن و لەلای خەڵکی عەرزەوە نەناسراو دەبن»[1].

## بەشی سێهەم: خراپی و ناڕەوایی حەز لە پێگە و مەنزڵەت‌کردن

خودای مەزن فەرموویەتی: ﴿تِلْكَ الدَّارُ الْآخِرَةُ نَجْعَلُهَا لِلَّذِينَ لا يُرِيدُونَ عُلُوّاً فِي الْأَرْضِ وَلا فَسَاداً﴾[2]. واتە: «ئەو ماڵی دواڕۆژەمان داناوە بۆ ئەو کەسانە وا گەورەیی و خراپەکارییان لە زەمیندا نەویستووە».

بزانە مەقامی ڕاستەقینە بریتییە لە دەسەڵاتداری بەسەر دڵدا، هەروەك چۆن ماڵ و دارایی بریتییە لە خاوەن موڵك بوون، هەروەها هەر وەك چۆن خاوەن ماڵ بەهۆی ماڵەکەیەوە خۆی دەگەیەنێ بە ئامانجەکەی، ئەدی هەروەهاش خاوەن دڵان خۆیان بەو دڵەیان بە ئامانج دەگەیەنن، ماڵ بە پیشە و سەنعەت و تەقەللا وەدەست دێ، دڵیش هەروەها بە دان‌وستانی جۆراوجۆر وەدەست دێ.

دڵ جگە بە بڕواهێنان نەبێ بەهیچی‌تر دەستەمۆ نابێ، کەواتە هەرکەس باوەڕی وەهابێ کە مرۆڤ، ئاکارێکی تێدایە کە ئاکارێکی لەبار و تەواوە، ئەوە دڵی بۆی لێ دەدات و تەنانەت خەڵك بۆ بەندەیی و کۆیلەیی ئەو خۆی دەکێشێ. جا کاتێ کە ماڵ خۆشەویست بێ، ئەوە مەقام و جێگە زیاتر خۆشەویستە.

جا بزانە مەقام‌ویستی و بەرزی‌ویستی خۆی لەخۆیدا، بژیوی ئەو ڕۆحەیە کە وا بە شوێن بەرزی و خوایەتییەوە، چونکە ڕۆح خۆی لە عالەمی شاراوەی خودایە، ڕۆحیش حەزی لە بەرزی و خودایەتی و بە بەندەکردنی خەڵکە و حەزی لە داراییە و بە دوایدا دەگەڕێ، بەم‌بۆنەوەیە کە کەس ناتوانێ لەم ویست و حەزە خۆی دەرباز بکات.

---

١. «كُونُوا يَنَابِيعَ الْعِلْمِ وَ مَصَابِيحَ الْهُدَىٰ أَحْلاسَ الْبُيُوتِ ...» دارمی فی سننه: ٢٦٢، ابن‌ابی‌الدّنیا فی التّواضع والخمول: ١١.

٢. القصص: ٨٣.

## بەشی چوارەم: چارەسەری حەزی مەقامویستی

بزانە ڕۆحی مرۆڤ بۆیە بە تاریف و پێهەڵگوتن دەگەشێتەوە و پێی شادە، چونکە لەو تاریفەدا هەست بە کەماڵ و تەواوەتی دەکات. نەفسیش حەز دەکات تەواو بێ. بە پێچەوانەشەوە شکاندنەوە و خراپەوێژی بۆ ڕۆح ناحەزە، چونکە هەست بە ناتەواوەتی دەکات و ڕۆحیش خۆشی لە ناتەواوی نایە.

### ڕوونکاریی ئەم چارەسەریە:

بزانە هەرکەس تووشی ئەم نەخۆشی مەقامویستییە بێ، ئیدی تەواوی هەوڵ و تەقالای بۆ مەقامەو وردە وردە بەرەو سەرچوون و ڕاوی دڵی خەڵکانیتر دەڕوا و ئەمەش ناچاری دەکات تووشی ڕیا و دووڕووی ببێت.

لەم سۆنگەوە پێغەمبەری خوداﷺ ئەم دوو خەسڵەتە ـ واتە: ماڵ و مەقامویستی ـ بە دوو گورگی دڕندە شوبهاندووە لەنێو مێگەلێدا و [فەرموویەتی: «مٰا ذِئْبٰانِ ضٰارِيٰانِ أُرْسِلٰا فِي زَرِيبَةِ غَنَمٍ بِأَسْرَعَ إِفْسٰاداً مِنْ حُبِّ الشَّرَفِ، وَالْمٰالِ فِي دِينِ الرَّجُلِ الْمُسْلِمِ»[1]، واتە: «هیچکات دوو گورگ کە بۆ ناو ڕانێ مەڕ بەر بدرێن، بە قەدەر خۆشەویستی ماڵ و مەقام زەرەر نادەن، بەوجۆرە وا ئەوانە زەرەر بەدینی پیاوی موسڵمان دەگەیەنن»[2]].

هەروەها پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «حُبُّ الْمٰالِ وَالْجٰاهِ، يُنْبِتٰانِ فِي الْقَلْبِ كَمٰا يُنْبِتُ الْمٰاءُ الْبَقْلَ»[3] واتە: «ماڵ و مەقامویستی هەروەك چۆن ئاو گیا دەڕوێنێ، ئەم دوانەش دوو بەرەکی و دووڕووی دەڕوێنن».

چارەسەری ئەم حەزە لە دوو شت پێك دێ: زانین و کردەوە.

**چارەسەری لەڕێی زانینەوە:** دەبێ بزانێ کە لە حەقیقەتدا نەفس بە شوێن ئەووەیە خۆی بە دڵاندا داسەپێنێ ـ وەك ڕوونمان کردەوە ـ ئەمەش هەرچەند پاك و خاوێن بێت و لە

---

١. ترمذی: ٢٢٩٨، احمد: ١٥٢٢٤ بلفظ: «مٰا ذِئْبٰانِ جٰائِعٰانِ أُرْسِلا فِي غَنَمٍ بِأَفْسَدَ لَهٰا مِنْ حِرْصِ الْمَرْءِ عَلَى الْمٰالِ وَالشَّرَفِ لِدِينِهِ»، طبرانی فی الکبیر: ١٣٨٩٦، بیهقی فی شعب الإیمان: ٩٧٨٣ ـ ٩٧٨٦ بألفاظ مختلفة، و فی روایة: «مٰا ذِئْبٰانِ ضٰارِيٰانِ جٰائِعٰانِ بٰاتٰا فِي ذَرِيبَةِ غَنَمٍ أَغْفَلَهٰا أَهْلُهٰا يَفْتَرِسٰانِ وَ يَأْكُلانِ بِأَسْرَعَ فِيهٰا فَسٰاداً مِنْ حُبِّ الْمٰالِ وَالشَّرَفِ فِي دِينِ الْمَرْءِ الْمُسْلِمِ» طبرانی فی الکبیر: ٣٢٠.

٢. ئەم دوو حەدیسە ناتەواو بوون، تەواوەکەیمان لە ئیحیاوە هێناوە ـ وەرگێڕ.

ڕووی ڕاستیشەوە بێ، تا مەرگ درێژەی هەیە، ئەدی خۆی زاڵبوون بە سەر دڵی خەڵکدا لە خێرات و چاکەی دواڕۆژ نییە. بەڵکوو تەنانەت ئەگەر تەواوی ئەو شت و کەسانەی کە بەسەر زەوینەوەن، لە ڕۆژهەڵاتەوە تا ڕۆژئاوا، کڕنۆش و سوژدەت بۆ ببەن، پەنجا ساڵ ناخایەنێ کە نە سوژدەبەر و نە سوژدە بۆ براو، نەماون و ئەتۆش هەروەك ئەو مەقامدارانەی کە پێش تۆ بوون و مردوون، وەهایت. کەواتە مەقام و پێگە کەماڵ و تەواوەتێکی خەیاڵییە و هیچ بنەما و بنەڕەتێکی نییە، چونکە بە مەرگ دوایی دێت.

وەکوو ئەوەی وا حەسەنی بەسری رَحِمَهُ اللَّهُ بۆ عومەری کوڕی عەبدولعەزیزی رَحِمَهُ اللَّهُ نووسیوە: «پاشانەکە، ئەتۆ وا بزانە دوایین کەسی کە قەباڵەی مەرگی بۆ نووسراوە و مردووە».

ئەویش لە وڵامیدا نووسی: «پاشانەکە، ئەتۆش لە دونیا وەها ڕەفتار کە قەت لەم دونیا نەبووی، هەروەها وا بزانە هەر لە دواڕۆژ نەبڕاوی». ئەم پیاوانە سەیری داهاتوویان کردووەو دڵنیابوون کە ئەوەی کە بڕیار بێ نزیکە.

**چارەسەری لەڕێی کردەوەوە:** هەندێ لە پیاوانی خودا ساردەمەنییەکی حەڵاڵیان ئەهێنا کە ڕەنگی شەرابی بوایە و دەیانخواردەوە، تا خەڵك وا گومان بەرن شەرابخۆرن و وازیان لێ بێنن.

یەکێ لە پیاوچاکان کە بەخۆپارێز و پیاوی چاك ناوی دەرکردبوو، [بۆ ئەوەی خۆی لە دەست خەڵك ڕزگار بکات] دەچووە حەمامی گشتی پاشان دەهاتە دەرەوە و لیباسی خەڵکی لەبەر دەکرد و لەڕێدا دەوەستا تا دەیانناسی و دەیانگرت و لیباسیان لەبەری دەردەهێنا و دەیانکوتا و دەیانگوت ئەمە دزو جەردەیە، تا لە ئاخردا خەڵك لێی دەکشانەوە.

نزیکترین ڕێ بۆ چارەسەری ئەم حەزە، ئەوەیە خۆت نەناسیاو بکەیت و بەرەو شوێنێ بار بکەی کە نەتناسن، چونکە ئەگەر هەر لە ناوچەی خۆتدا گۆشەنشین بیت، هەر بەوەی کە خەڵك دەزانن ئەو کەسە گۆشەگیر بووە و خۆی لە خەڵك کێشاوەتەوە، تووشی ڕیا و دەمارزلی دەبی.

## شێوازو ڕەوشتی چارەسەری حەز لە تاریفکردن و ڕق لە شکاندنەوە:

پێشتر گوتمان کە ئەم حەزە هۆیەکەی ئەو کەماڵ و تەواوەتییە درۆینەیە، جا کە زانیت جگە کەماڵی دواڕۆژ نەبێ هیچ کەماڵێ بناغە و بنەڕەتێکی نییە، ئەوە تێدەگەی کە ئەم جۆرە کەماڵەی دونیا [کە لە تاریف و هەڵگوتنەوە دەکەوێتە دڵ] هیچ کەڵکێکی نییە.

هەروەها، هەرچەندەش ئەو تاریفە، تاریفی دینداری بێت، ئەوەش دیسان هەر هەوەس و حەزە، چونکە دینداری بە عاقیبەت خێریە؛ کە شتێکی نادیارە و پاش ڕابردنی مەترسی دونیایە.

## لقی دووهەم: زەرەر و خراپی ڕیا

بزانە ڕیا بێ‌شك حەرامە و ڕیاباز لە خزمەت خودادا شەرمەزارە.

خودای گەورە بەمە ئاماژە دەکات: ﴿فَوَيْلٌ لِلْمُصَلِّينَ ④ الَّذِينَ هُمْ عَنْ صَلاتِهِمْ سَاهُونَ ⑤ الَّذِينَ هُمْ يُرَآءُونَ ⑥﴾.[1] واتە: «هاوار بۆ نوێژکەران، ئەوانەی کە لە نوێژ غافڵن، ئەوانەی وا ڕیابازی دەکەن».

خودای مەزن فەرموویەتی: ﴿فَمَنْ كَانَ يَرْجُو لِقَاءَ رَبِّهِ فَلْيَعْمَلْ عَمَلاً صَالِحاً وَلا يُشْرِكْ بِعِبَادَةِ رَبِّهِ أَحَداً﴾[2] واتە: «هەرکەس هیواداری دیداری پەروەردگاریەتی، ئەوە با کاری چاکە ئەنجام بدات و لە عیبادەتی خودادا کەس بە هاوبەشی ئەو نەکات».

عەرزی پێغەمبەریان ﷺ کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! ڕزگاری لە چی‌دایە، فەرمووی: «أَنْ لا يَعْمَلَ الْعَبْدُ بِطَاعَةِ اللهِ تَعَالَىٰ يُرِيدُ بِهَا النَّاسَ» واتە: «(ڕزگاری لەوەدایە) کە عیبادەتێ بۆ خودا ئەنجام نەدات کە بەو تاعەتە خەڵکی پێ ئیرادە بکات».

هەروەها پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «إِنَّ أَخْوَفَ مَا أَخَافُ عَلَيْكُمُ الشِّرْكُ الْأَصْغَرُ»[3] واتە: «ئەوەی کە لە هەموو شت زیاتر بۆ ئێوە لێ دەترسم، شیرکی چووکەیە».

گوتیان: شیرکی بچووك چییە ئەی پێغەمبەری خودا؟ فەرمووی: «اَلرِّيَاءُ، يَقُولُ اللهُ تَعَالَىٰ يَوْمَ الْقِيَامَةِ - إِذَا جَازَى الْعَبِيدَ بِأَعْمَالِهِمْ - : اِذْهَبُوا إِلَى الَّذِينَ كُنْتُمْ تُرَاءُونَ لَهُمْ فِي الدُّنْيَا، فَانْظُرُوا هَلْ تَجِدُونَ عِنْدَهُمُ الْجَزَاءَ».[4]

واتە: «ڕیایە. خودای مەزن لە ڕۆژی قیامەتدا ـ ئەو کاتەی کە پاداشی کردەوەی بەندەکانی دەداتەوە ـ دەفەرمێ: بڕۆن بەرەولای ئەو کەسانە کە کردەوەکانتان لە دونیا لەبەر چاویانەوە بۆ ڕیا ئەنجام داوە، دە بڕوانن بزانن لەلای ئەوانەوە پاداشێکتان گیر دەکەوێ».

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: «اِسْتَعِيذُوا بِاللهِ مِنْ جُبِّ الْحُزْنِ» قِيلَ وَمَا هِيَ يَا رَسُولَ اللهِ؟ قَالَ: «وَادٍ فِي جَهَنَّمَ أُعِدَّ لِلْقُرَّاءِ الْمُرَائِينَ»[3] واتە: «بە خودا پەنا بەرن لە چاڵی خەفەت». گوتیان:

---

١. الماعون: ٤. ٢. الكهف: ١١٠.

٣ و ٤. احمد: ٢٢٥٢٣ ـ ٢٢٥٢٨، طبرانی فی الكبیر: ٤١٧٩، بیهقی فی شعب الإیمان: ٦٤١٢.

٣. ترمذی: ٢٣٠٥، ابن‌ماجه: ٢٥٢ بروایات مختلفة.

چاڵی خەفەت چییە ئەی پێغەمبەری خودا! فەرمووی: «شیوێکە لە دۆزەخدا ساز کراوە بۆ قورئان‌خوێنە ڕیابازەکان».

عەبدوڵڵای کوڕی موبارەك رَحِمَهُ اللَّهُ بە سەنەدی خۆیەوە لە پیاوێکەوە ڕیوایەتی کردووە کە گوتوویە بە مەعازی کوڕی جەبەل رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ: «حەدیسێکم بۆ بگێڕەوە کە لە خودی پێغەمبەرەوە بیستبێتت. گوتی: مەعاز دەستی کرد بە گریان، هێندە گریا. گوتم ئیدی گریانی نابڕێتەوە، پاش ماوەیێ بێ‌دەنگ بوو. پاشان فەرمووی: لە پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بیستم: پێی فەرمووم: ئەی مەعاز! گوتم: بەڵێ قوربان! بە دڵ و گیان لە خزمەتتدام، باب و داکم بە ساقەت بێ، ئەی پێغەمبەری خودا.

فەرمووی: قسەیێکت بۆ دەکەم، ئەگەر لەبەری بکەی قازانج دەکەی، ئەگەریش ئەو زەرەرە لە خۆت بدەی و لەبەری نەکەی، ئەوە بەڵگەت لە ڕۆژی قیامەتدا لە خزمەتی خودای مەزندا پێ نامێنی:

ئەی مەعاز! خودای گەورە پێش ئەوەی ئاسمانەکان و زەمین بخولقێنێ، حەوت فریشتەی بەدی هێنا، پاشان ئاسمانەکانی یەك بە یەك خولقاند و بۆ هەر یەك لەو حەوت ئاسمانە فریشتەیێکی داناو کردیە دەرگاوان و ئەوپەڕی شان و شکۆی پێدان.

فریشتە چاودێرەکان کردەوەی هەر بەندەیێ، کە لە بەیانییەوە تاکوو ئێوارە ئەنجامی داون، بۆ ئاسمان بەرز دەکەنەوە ئەو کردەوانە وەکوو تیشکی خۆر تیشکیان لێ دەدرەوشێتەوە، کاتێ کە فریشتەکان ئەو کردەوانە بۆ ئاسمانی دونیا بەرز دەکەنەوە، دەپیاڵێون و زیادی دەکەن.

فریشتەی بەرپرسی ئاسمانی دونیا بەو فریشتە چاوەدێرانە دەڵێ: ئەم کردەوانە بدەنەوە بە ڕووی خاوەنەکەیدا، ئەمن بەرپرسی کردەوەی "غەیبەتم" پەروەردگارم فەرمانی پێ‌داوم کە کردەوەی کەسێ کە غەیبەتکەرە وەرنەگرم و نەهێڵم لەمن تێپەڕێ.

پاشان فریشتە چاوەدێرەکان کردەوە چاکەکانی بەندەیێکی‌تر، بەسەر دەکەنەوە و دەپیاڵێون و بژاری دەکەن و پێی زیاد دەکەن تا دەیگەننە ئاسمانی دووهەم، لەوێدا فریشتەی بەرپرسی ئاسمانی دووهەم ئەڵێ: ڕاوەستن و ئەم کردەوە بدەنەوە بە ڕووی خاوەنەکەیدا، ئەمن فریشتەی بەرپرسی کردەوەی "فەخرم"، ئەم بەندەیە بەم کردەوانەی ویستوویە خۆی بە خەڵکی بنوێنێ و بنازێ بەسەریاندا، خوداش فەرمانی پێ داوم نەهێڵم کردەوەی ئەم جۆرە کەسانە لێم تێپەڕێ؛ چونکە ئەو لەنێو کۆڕ و کۆمەڵدا بەخۆیدا نازیوە.

فەرمووی: فریشتە چاوەدێرەکان کردەوەی بەندەیی‌تر کە بە بۆنەی خێرات و نوێژ و ڕۆژووەوە نووری لێ دەبارێ و فریشتەکان پێیان سەیرە بۆ ئاسمانی سێهەم بەرز دەکەنەوە، فریشتەی بەرپرسی ئاسمانی سێهەمیش دەڵێ: ڕاوەستن و ئەم کردەوەیە ببەن و بیدەنەوە بە ڕووی خاوەنەکەیدا، ئەمن فریشتەی بەرپرسی کردەوەی "تەکەبور"م، خودای مەزن فەرمانی پێ داوم کە کردەوەی ئەم جۆرە کەسانە گل نەدەمە و نەهێڵم لێم تێپەڕێ، چونکە ئەو بەسەر خەڵکدا و لەنێو کۆڕ و کۆمەڵدا خۆی زل گرتووە.

فەرمووی: فریشتە چاوەدێرەکان کردەوەی بەندەیێکی‌تر بەرز دەکەنەوە کە ترووسکەی وەکوو تروسکەی ئەستێرەی ڕووناك وایە، ویزە ویزی لێوە دێ هەر وەکوو ویزەی پوورە هەنگ، لە سەدای تەسبیحات و ویرد و نوێژ و حەج و عەمرە، تا دەگەنە ئاسمانی چوارەم، لەوێ فریشتەی بەرپرسی ئەوێ پێیان دەڵێ: ڕاوەستن و ئەم کردەوانە ببەن و بیدەنەوە بەسەر و پشتی خاوەنەکەیدا، ئەمن فریشتەی بەرپرسی کردەوەی "خۆپەسەندیم"، پەروەردگارم فەرمانی پێ داوم کە کردەوەی ئەم جۆرە کەسانە گل نەدەمەوە و نەهێڵم لێم تێپەڕ ببێ، چونکە ئەم بەندەیە هەرکاتێ کردەوەیێکی ئەنجام دەدا، خۆپەسەنی و فیزی تێکەڵ دەکرد.

فەرمووی: هەروەها فریشتە چاوەدێرەکان کردەوەی بەندەیی‌تر بەرز دەکەنەوە تا دەیگەیننە ئاسمانی پێنجەم، ئەو کردەوانە بە چەشنی تازەبووکێ وایە کە بۆ ماڵی بەختی دەبەن، فریشتەی بەرپرسی ئاسمانی پێنجەم دەڵێ: ڕاوەستن و ئەم کردەوانە ببەن و بیدەنەوە بە ڕووی خاوەنەکەیدا و لەسەر شانی دانێنەوە، ئەمن فریشتەی بەرپرسی "ئێرییی"م، ئەم پیاوەش ئێرەیی بە خەڵك بردووە و بەخیلی بەوانە بردووە کە فێری عیبادەت دەبوون و وەکوو ئەو تاعەت و عیبادەتیان دەکرد، هەرکەسێکیش زۆرتر لە ئەو عیبادەتی دەکرد، ئەم بەخیلی پێ دەبرد و دەکەوتە گیانیان بۆ پاشەملێ وتنیان، ئەدی خوداش فەرمانی پێم داوە کردەوەی ئەم جۆرە کەسانە گل نەدەمەوە و نەهێڵم لێم تێپەڕێ.

فەرمووی: فریشتە چاوەدێرەکان کردەوەی بەندەیی‌تر، لە نوێژ، ڕۆژوو، زەکات، حەج، عەمرە، بەرز دەکەنەوە تا دەیبەنە ئاسمانی شەشەم، فریشتەی بەرپرسی ئەوێ ئەڵێت: ڕاوەستن و ئەم کردەوە ببەن و بیدەنەوە بە ڕووی خاوەنەکەیدا، چونکە ئەو قەت بەزەی بە کەسێکدا کە لێی قەوماوە، چ کارەساتی تووش بووبێ، چ زەرەری کردبێ، نەئەهاتەوە، بەڵکوو

جنێویشی پێ ئەدان، ئەمنیش فریشتەی بەرپرسی "رەحم"م، خوداش فەرمانی پێ داوم نەهێڵم کردەوەی ئەو جۆرە کەسانە لێم تێپەڕێن و وەری نەگرم.

فەرمووی: فریشتە چاوەدێرەکان کردەوەی بەندەیێ‌تر، لە نوێژ، ڕۆژوو، بژیو، تێکۆشان، خۆپارێزی، بەرز دەکەنەوە تا ئاسمانی حەوتەم، ئەم کردەوانە دەنگێکیان لێوە دێ وەکوو دەنگی چەخماخەیە، تیشکیان هەیە وەکوو تیشکی خـۆر، سـێ هـەزار فریشتە هاوڕێیی دەکەن، تا دەگەنە ئاسمانی حەوتەم، لەوێ فریشتەی بەرپرسی ئاسمانی حەوتەم دەڵێ: ڕاوەستن و ئەو کردەوانە بدەنەوە بەسەر خاوەنەکەیدا، بەو کردەوانە دەرکەی دڵی دابخەن، ئەمن خودا فەرمانی پێ داوم کە لە هەرچی کردەوەیە بەریی بکەم و نەینێرمە بەردەستی خودا، چونکە ئەو کەسە لەو کردەوانەیدا غەیری خودای ویستووە. ئەو کەسە ویستوویە بەو کردەوانە لە لای زانایان و شەرعزانان خۆی بەرز بکاتەوە و ناوی ببرێ و بانگەواز پەیدا بکات و لە شارەکاندا ناوبانگی بڕوات، ئەمنیش خودا فەرمانی پێ داوم کە نەهێڵم ئەوجۆرە کردەوانە لەلای من تێپەڕێ. هەر کردارێ کە خالس و ڕووت بۆ خودای گەورە نەبێ، ئەوە ڕیایە و خوداش کردەوەی ڕیاباز بە هیچ جۆرێ وەرناگرێ.

فەرمووی: فریشتە چاوەدێرەکان کردەوەی بەندەیێ‌تر؛ لە زەکات و ڕۆژوو و نوێژ و حەج و عەمرە و ئاکارچاکی و بێ‌دەنگی و یادی خودای مەزن، بۆ ئاسمانەکان بەرز دەکەنەوە و سەرجەمی فریشتەکانی هەر حەوت ئاسمانەکە لەگەڵی دەکەون، تا تەواوی لەمپەڕەکان دەبڕن و دەگەنە خزمەتی خودای گەورە و لەبەر دەمیدا ڕادەوەستن و هەموویان شایەتی کردەوەچاکی و بێ‌خەوشی بۆ دەدەن. [پێغەمبەرصَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ] فەرمووی: خوداش دەفەرمێ: ئەی فریشتە چاودێرەکانی کردەوەی بەندەی من، ئەمن چاودێری دەروونی ئەوم، ئەو، ئەم کردەوەیە لەبەر من نەکردووە و مەبەستی غەیری من بووە، کەوابوو نفرینی لێ بێ، فریشتەکانیش سەرجەم ئەڵێن: نفرینی تۆ و ئێمەی لێ بێ، لەو کاتەدا هەر حەوت ئاسمان و دانیشتوانی نفرینی دەکەن.

مەعاز گوتی: گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەتۆ نێردراوی خودای و ئەمن مەعازم، ئەدی ڕزگاری چلۆنە؟ فەرمووی: شوێن پێغەمبەرەکەت بکەوە و زمانت لە پاشەملە و خراپەوێژی برادەرانت و ئەوانەی قورئانیان لەسینگە و لە غەیری ئەوانیش، بپارێزە. گوناحی خۆت بخە

ئەستۆی خۆت و لە ئەستۆی ئەوانی مەخە، هەروەها خۆت بەوەی کە ئەوان خراپ بکەی، بە چاك مەزانە، خۆت بە سەریاندا مەگرە، کردەوەی دونیا لەگەڵ کردەوەی دوارۆژدا تێکەڵ مەکە، خۆت بە زل مەگرە مەبادا خەڵك لە ئاکاری نالەبارت بترسن، بە چپە و سرتە لەگەڵ کەسێکدا کە لە پەناتایە قسە مەکە، لەو کاتەدا یەکێ‌ترتان لەگەڵدا بێت، خۆت لە خەڵك بە گەورەتر مەگرە، چونکە لە هەرچی خێر و قازانجی دونیایە بێ‌بەش دەبی.

پەردەی ئابرووی خەڵك مەدڕێنە، تا لە ڕۆژی قیامەتدا، لە دۆزەخدا، سەگەکانی دۆزەخ زگت نەدڕن.

ڕیایێ کە لە غەیری عیبادەتدا بکرێ وەکوو ئەوەی خۆ بە لیباسی زبر و هەڵکراو و ڕەنگی زەرد و چاو قووڵ‌کردن و شپرزاندنی مووی سەر و نەوی‌کردنەوەی دەنگ و بە زۆر و بە هێمنی و لەسەر ۆ ڕێ‌کردن، کەڵپۆس لەبەرکردن، ئەمانە هەر هەمووی دەبنە تەواوکەری ڕیا بە عیبادەت، ئەمانەش هەموویان حەرامن، ئەگەر لەڕووی خۆنواندنەوە بێت.

هەروەها خۆنواندنی زانایان بە ڕستەهایێ کێشەدار، لەبەر ئەوەی چرپوپری زانستی خۆی بگەیەنێ، بە ڕیا دادەنرێ، مەگین مەبەستی بەو ئاو و تاوە ئەوە بێ کە زوو ئەو قسانەی لێ وەربگیرێ و نزیکیان بکاتەوە بە دینەوە و نیەتیشی لەو وتارە لە بنەڕەتدا باش بووبێ، ئەوە دەکرێ بڵێین دروستە.

خودای مەزن فەرموویەتی: ﴿وَالنَّاشِطَاتِ نَشْطاً﴾[1]، ئەدی مەعاز تۆ دەزانی ئەوانە کێن؟ گوتم: باب و دایکم بە ساقەت، ئەی پێغەمبەری خودا! ئەوانە کێن؟ فەرمووی: سەگانی دۆزەخن کە گۆشت و ئێسقانی دۆزەخیان دەکرۆچن. ئەمنیش گوتم: باب و دایکم بە ساقەت بێ، ئەدی کێ توانای بەجێ‌هێنانی ئەو کردەوانەی هەیە و کێ دەتوانێ لە کەڵبەی ئەو سەگانە ڕزگاری ببێ؟، فەرمووی: ئەی مەعاز! ئەوە بۆ کەسێ خودا ئاسانی بکا بۆی، ئاسانە، هەر ئەوەندە شت بەسە کە هەر چیت بۆ خۆت خۆش ئەوێ بۆ خەڵکیشت خۆش بوێ، هەرچیش بۆ خۆت پێ ناخۆشە بۆ ئەوانیش پێت ناخۆش بێت».

ئیبنولموبارەك رَحِمَهُ اللَّهُ گوتوویە: کەسم نەبینی لە مەعاز رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ زیادتر قورئان بخوێنی، لە ترسی ئەم حەدیسەدا.

---

١. النازعات: ٢.

عەکرەمەرَحِمَهُ‌ٱللَّهُ فەرموویەتی: خودای مەزن بە پێی نیەت پاداشی بەندەکانی دەداتەوە، نەك بە پێی کردەوە، چونکە نیەت تەواوترە و خاڵییە لە ڕیا.

## حەقیقەتی ڕیا:

وشەی "الرياء" لە ماکی "الرؤية"وە ـ کە بە مانای دیتنە ـ شەق کراوە، "السمعة"یش لە ماکی "السماع"وە شەق کراوە، کە بە مانای بیستنە. کەوا بوو، ڕیا واتە: داوای تەماشاکردن لە خەڵك بۆ ئەوەی لەلای ئەوانەوە قەدر و نرخ پەیدا بکات. جا ئەم بەشوێن ناوونیشان و پێگە و جێگەوە بوونە، جاری وایە بە عیبادەتە، جاری واشە بە کردەوەیێ‌ترە.

ڕیایێ کە لە خودی عیبادەتەکەدا بێ؛ بەم چەشنە کە کڕنۆش و سوژدەی درێژ لە بەرچاوی خەڵکەوە ببات، بۆ ئەوەی بڵێن: ئەهلی خۆپارێزی و شەرع و وەرعە. جارجاریش ئەم کردەوە دەسکردانە لە چۆڵاییدا بکات بۆ ئەوەی بۆکردنیان لەبەر چاوی خەڵکەوە خۆی ڕابهێنێ. هەروەها ئەو گومانەش بخاتە دڵی خۆیەوە کە گوایا ئەو کردەوانە بۆ ڕیا ناکات، بۆیە لە ماڵی خۆیدا درێژە بە کڕنووش و سوژدەی دەدات. جا ئەگەر بەو نیەتەوە لە ماڵ و چۆڵاییشدا درێژە بە عیبادەتی بدات، ئەوە نەك هەر کەمی ناکاتەوە بەڵکوو ڕیاکەی دووپات دەکاتەوە.

فەرموودەی ڕاست سەبارەت بە ڕیا ئەوەیە کە: ڕیا بریتییە لە بە شوێنی مەقام و پێگەوە بوون، جا چ بە عیبادەت بکرێ، یان بە غەیری عیبادەت، جێگە و مەقام هەروەکوو تێکۆشین بۆ ماڵی حەڵاڵ وایە، واتە: مادامێ فێڵ و تەڵەکە نەکرێ دروستە بە شوێنی مەقامدا بچێ، هەروەك چۆن دروستە بە شوێن کەسبی حەڵاڵەوە بێ، جا فڕو فێڵ هیچ جیاوازی نییە چ بۆ ماڵ بێ یان بۆ مەقام بێ، هەر حەرامە. جا ئەمە بەو مانا نییە کە بە شوێنی مەقام و پێگەدا چوون یەکسەر حەرامە، بەڵکوو هێندەی کە پێویست بێ بۆ ژیان قەیدی نییە، وەکوو چۆن ماڵ لە ئەندازەی پێویستدا بە شوێندا چوونی دروستە. هەر ئەمەشە مەبەستی حەزرەتی یووسفعَلَيۡهِ‌ٱلسَّلَامُ کە فەرموویەتی: ﴿اِجۡعَلۡنِي عَلَىٰ خَزَآئِنِ ٱلۡأَرۡضِۖ إِنِّي حَفِيظٌ عَلِيمٞ﴾[1] واتە: «(یووسف گوتی بە پاشای میسر) ئەمن بکە بەسەرپەرشتی هەنبارەکانی زەمین، چونکە بەڕاستی ئەمن ئەمانەتدار و شارەزای ئەم بوارەم».

---

١. یوسف: ٥٥.

جا هەروەك پێشتر باسمان کرد مەقام و پایە وەکوو: ژەهر و دژەژار لە ماردا وایە، هەروەها وەکوو چۆن دارایی زۆر سەرولاکی مرۆڤ دەپۆشی و لە یادی خودا غافلی دەکات، مەقام و پایەی زۆریش وایە. جا ئەگەر ئەو دەسەڵات و مەقامە بە بێ حەز و تەماحی خۆت بووبێ و لە یادی خودا غافلی نەکرد بێتی، ئەوە خراپ نییە و وەکوو بەکارهێنان و بەڕێوەبردنی ماڵی زۆر وایە کە بە دەس کراوەیی و لەخۆ بوردوویی و خێرۆمەندبوون بۆ خەڵك خەرج بکرێ. چونکە هیچ کات مەقامی کەسێ لە مەقامی پێغەمبەران و پێشەوایان و جێگرەکانی پێغەمبەر زیادتر ناڕوات. بەڵام دەبێ ئەو پێگە و مەقامە لەیادی خودا غافلی نەکات و بە نەمانی پەرۆش و خەمبار نەبێ.

ئێستاکە بە پێی ئەم باسانەی کە ڕابورد، ئەگەر کەسێ بە جلوبەرگی جوان و فاخیرەوە بڕواتە نێو خەڵك و بەسەر خەڵکدا بنازێ ڕیایە، بەڵام حەرام نییە، چونکە پێوەندی بە عیبادەتەوە نییە. ئەو فەرموودەیە کە لە حەزرەتی عائیشەرَضِیَاللَّهُعَنهَا دەگێڕنەوە داکۆکی لەسەر ئەمە دەکات؛ گوتوویە: پێغەمبەرصَلَّیاللَّهُعَلَیهِوَسَلَّمَ کاتێ دەیویست بڕوات بۆلای هاوەڵەکانی لەنێو چاڵی ئاودا سەیر خۆی دەکرد و مێزەر و مووەکانی ڕێکو پێك دەکرد، ئەمنیش پێم گوت: ئەوە تۆش وەها دەکەی ئەی پێغەمبەری خودا؟!

فەرمووی: «نَعَمْ، إِنَّ اللّٰهَ تَعَالَىٰ يُحِبُّ الْعَبْدَ أَنْ يَتَزَيَّنَ لِإِخْوَانِهِ إِذَا خَرَجَ إِلَيْهِمْ». واتە: «بەڵێ، بێگومان خودای مەزن پێی خۆشە بەندەیەکی کاتێ کە دەڕوات بۆ لای دۆستانی، خۆی برازێنێتەوە».

بەڵێ ئەم کارە بۆ پێغەمبەرصَلَّیاللَّهُعَلَیهِوَسَلَّمَ بە عیبادەت دادەنرێ، چونکە پێغەمبەرصَلَّیاللَّهُعَلَیهِوَسَلَّمَ بەرپرسی بانگەوازی خەڵك بوو، ئەدی ئەگەر [بەهۆی شپرزی و...] لەبەر چاوی هاوەڵان و خەڵك کەوتبایە، ئەو ئامانجەی بەتاڵ دەبوو.

## [پلەکانی ڕیا:]

[ڕیا دوو بەشە کە هەر بەشێکی بۆ خۆی چەند پلەی هەیە:]

### [بەشی یەکەم: ئەمیش چەند پلەیە]

[یەکەم:] ئەگەر ئەو کەسە ڕیاکارە یەکسەر مەبەستی بە عیبادەتەکەی ڕیا بێت و بۆ خەڵکی بکات، ئەوە بێ شك بەتاڵە و بە هیچ کلۆجێ ئەو عیبادەتە دانامەزرێ. دیسان ئەگەر یەکسەر بۆ ڕیا نەبێ، بەڵام لایەنی ڕیاکەی زۆرتر بێ، ئەوە هەر لەم پلەیەوە نزیکە.

[دووهەم:] ئەگەر نیەتی عیبادەت و ریابازییە کە هاوچەشن بووەستن، واتە: هەم بۆ ریا و هەم بۆ خواپەرستی بیکات و هەرکامیان سەربەخۆ بهێنێ، ئەوە لەم کاتەدا ئەگەر هەردووك لا سەر بەسەر دەربچن، ئەوە نە خێری دەگاتێ نە زەرەر.

[سێهەم:] ئەگەر نیەتی عیبادەتی هەبێ و لایەنی ریاکە کەمتر بێ و لەخوار بێ، بەم شێوە ئەگەر ریابازییەکەش نەبوایە هەر عیبادەتی ئەنجام دەدا و ئەگەر تەنها لەبەر ریا بوایە و مەبەستی عیبادەت نەبوایە، ئەوە عیبادەتی نەدەکرد. ئەمە رەچاوی ئەوە دەکرێ کە ئەساسی کردەوەکەی ناسووتێ، بەڵام لێ دەقرتێ و کەم دەکرێتەوە، یان لەسەر ئەو ئەندازە ریایە سزا دەدرێ [و لە کردەوەی کەم ناکرێتەوە]. لەوانەیە ئەو فەرموودەیەی خودا کە لە حەدیسی قودسیدا هاتووە: «أَنَا أَغْنَى الْأَغْنِيَاءِ عَـنِ الشِّرْكِ»[1] واتە: «ئەمن لە هەموو کەس لە شیرك بێ‌نیازترم» حەمڵ لەسەر ئەم مانا بکرێ.

## [بەشی دووهەم: ئەمیش چەند پلەیە]

یەکەم: ئەگەر ریاکارییەکە ڕووی لە بنچینەی ئیمان و باوەڕ دەکرد، ئەوە دەبێتە مونافقی و دووڕوویی. مونافقیش لەنێو دۆڵی هەرەقووڵی دۆزەخدا، بۆ هەتاهەتایە دەمێنێتەوە.

دووهەم: ئەگەر ریا ڕوو لە عیبادەتە فەرزەکان بکات، بەم شێوە باوەڕی بە ئەسڵی دین هەبێ، بەڵام فەرزەکان لەبەر ریا ئەنجام بدات، ئەمە لە چاو هەووەڵەکە سووکترە و گوناحی کەمترە.

سێهەم: ئەگەر ریا ڕوو لە سوننەتەکان و شێوازی عیبادەتەکان بکات، ئەوە لە بەشی یەکەم ڕابورد.

## ڕیای شاراوە:

ڕیای شاراوە بێ‌خشپەترە لە جووڵەی پێی مێلوورە[2]، بە چەشنێ کە لەگەڵ عیبادەتەکاندا کۆ نابێتەوە و دیتنی خەڵك کاریگەری لە بەجێ‌هێنانی عیبادەتەکاندا نییە، بەڵام حەز دەکات خەڵك ئاگادار و خەبەرداری عیبادەتەکەی بین و بەم باخەوەربوونەی خەڵك شاد دەبێت و دەگەشێتەوە، ئا ئەمەیە دەبێتە ڕیای شاراوە.

---

١. مسلم: ٥٣٠٠، ترمذی: ٣٠٧٩، احمد: ١٥٢٧٨ ـ ١٧٢١٥، ابن‌ماجە: ٤١٩٢ جمیعهم بروایات مختلفة و بلفظ: «أَغْنَى الشُّرَكَاءِ عَنِ الشِّرْكِ».

٢. ئەم ڕستەیە مەفهوومی ئەم حەدیسەیە: «اتَّقُوا هٰذَا الشِّرْكَ فَإِنَّهُ أَخْفَى مِنْ دَبِيبِ النَّمْلِ» ـ وەرگێڕ.

## [ڕێ چارەسەری ڕیا]

ڕێی بەرگری و چارەسەری ڕیا ئەوەیە کە بزانرێ کە سەرچاوەی ڕیا، خۆشەویستی ماڵ و مەقامە و حەز لە تاریف و پیاهەڵوتنە ـ ئەم باسانە ڕابووران ـ ، ئەوەی وا پێویستە بزانرێ و دایمە تێیدا ڕابمێنێ و لە بەرچاوی بگیرێ ئەوەیە کە بیر لەوە بکاتەوە کە خودای مەزن ئاگاداری نهێنیەکانیەتی و پێی ئەڵێ: ئەمن بێ‌خشپەترین بینەرم کە چاوم لێتە. جا ئەگەر سەیری دەرئەنجامی خۆی و کردەوەکانی بکات و بیر بداتە ئەوەی کە بە مەرگ هەموو شت دەپێچرێتەوە، بەو قەناعەتە دەگات کە باشتر وایە دەس لەو ڕیابازییە هەڵگرێ.

## شاردنەوەی گوناح

بزانە بنەڕەتی ئیخلاس و دڵپاکی یەکڕەنگییە لە ئاشکرا و پەنامەکیدا.

حەزرەتی عومەر رَضِيَ اللهُ عَنْهُ فەرموویەتی: لەسەرتانە کردەوەی ئاشکرا ئەنجام بدەن، پرسیاریان لێ کرد کە کردەوەی ئاشکرا چییە ئەی سەرۆکی موسڵمانان؟، فەرمووی: ئەو کردەوەیەیە کە ئەگەر خەڵك ئاگاداری بن ئەو کەسە شەرم نەکات لە کردنی.

پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فەرموویەتی: «مَنِ ارْتَكَبَ مِنْ هٰذِهِ الْقَاذُوراتِ، فَلْيَسْتَتِرْ بِسَتْرِ اللهِ»[1].

واتە: «هەرکەس تووشی یەکێ لەم چەپەڵکاریانە بێت، ئەوە با خۆی بە پەردەی خودا داپۆشێ».

## تەرکی عیبادەت لە ترسی تووشبوونی ڕیا

ئەڵێن: هەرکاتێ هۆی ئەنجامدانی کردەوە ڕیا نەبوو، بەڵام لەوە دەترسا کە لەکاتی ئەنجامدانیدا تووشی ڕیا بێت، نابێ بەم بۆنەوە تەرکی عیبادەت بکات، چونکە ئامانجی شەیتان ئەوەیە کە بەهەر چەشنێ بێ عیبادەت نەکرێ. بەڵکوو باش وایە عیبادەت ئەنجام بدات و ئەگەریش تووشی ڕیا بوو بە دەرمانی تایبەتیی خۆی چارەسەری بکات.

---

١. مالك في الموطأ: ١٢٩٩ بلفظ: «مَنْ أَصَابَ مِنْ هٰذِهِ الْقَاذُورَاتِ ...»، و معرفة السّنن والآثار للبيهقي: ٥٥٠٧، سيوطي في جامع الكبير: ٦١١، حرف الهمزة بلفظ: «اِجْتَنِبُوا هٰذِهِ الْقَاذُوراتِ ...».

لەم سۆنگەوەیە یەکێك لە گەورەیان فەرموویەتی: ڕیا ئەوەیە کە لەبەر چاوی خەڵکەوە تەرکی خواپەرستی بکرێ، بەڵام ئەوەی کە لەبەر چاوی خەڵکەوە، لەبەر ئەوان، خواپەرستییەك بکات، ئەوە تەنها دووڕوویيەکی ڕووتە.

## [دوایین بەش: سەبارەت بەو کردەوانەیە کە تایبەتن بە خەڵکەوە]

بزانە هەندێ لە عیبادات پێوەندییان بە خەڵکەوەیە، وەکوو: جێنشینی، ئیمامەت، حکوومەت، وانەبێژی، وتاربێژی...

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «يَوْمٌ مِنْ إِمامٍ عادِلٍ خَيْرٌ مِنْ عِبادَةِ الرَّجُلِ وَحْدَهُ سِتِّينَ عاماً»[1].

واتە: «یەك ڕۆژی پێشەوایێکی دادپەروەر، چاترە لەوەی پیاوێ شەست ساڵی ڕەبەق عیبادەتی خودا بکات».

بزانە خۆپارێزان لەم ئەرکانە ڕا دەکەن، چونکە مەترسیی گەورەی تێدایە، چونکە ئەو خەسڵەتە دەروونیانە لە حەزکردن بە ماڵ و مەقام و ئافەتەکانی ترەوە بەتەواوی دەجووڵێن، بەمبۆنەوە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:

«ما مِنْ والِي عَشِيرَةٍ إِلّا جاءَ يَوْمَ الْقِيامَةِ مَغْلُولَةً يَدُهُ إِلَىٰ عُنُقِهِ، أَطْلَقَهُ عَدْلُهُ، أَوْ أَوْبَقَهُ جَوْرُهُ»[2].

واتە: «هەرچی سەرۆكهۆزە، لە ڕۆژی قیامەتدا دەستیان بەستراوە بە ملیانەوە، یان دادوەرییەکەیان ڕزگاریان دەکات، یان زوڵم و ستەمەکەیان عەزابیان دەدات».

مرۆڤی بە ئاوەز مافی ئەوەی هەیە کە لە شوێنێك کە مەترسی هەبێ هەڵێ، بەڵام با ئەو مرۆڤە ئاوەزدارە سەیری دەروونی خۆی بکات، ئەگەر لایەنی خێرخوازی زاڵ بوو بەسەریدا، ئەوە با ئەو ئەرکە وە ئەستۆ بگرێ، نیشانەکەشی ئەوەیە هەرکاتێ کەسێ پەیدا ببێ کە جێگری ئەو بکات و جێی پڕ بکاتەوە، ئەوە ئەو بە دەرفەتی بزانێ و دڵی لێ نەڕەنجێ.

والله أعلم بالصّواب

---

١. طبرانی فی الکبیر: ١١٧٦٤، بیهقی فی شعب الإیمان: ٦٩٩٥، جامع الکبیر للسیوطی: ١١٤٩٦، حرف الیاء و آخره: «... وَحَدٌّ يُقامُ فِي الْأَرْضِ بِحَقِّهِ أَزْكَىٰ فِيها مِنْ مَطَرِ أَرْبَعِينَ عاماً» بروایات مختلفة.

٢. احمد: ٢١٢٦٨ ـ ٢١٧١٦ بلفظ: «ما مِنْ رَجُلٍ يَلِي أَمْرَ عَشَرَةٍ فَما فَوْقَ ذٰلِكَ إِلّا أَتَى اللهَ عَزَّوَجَلَّ مَغْلُولاً يَوْمَ الْقِيامَةِ يَدُهُ إِلَىٰ عُنُقِهِ فَكَّهُ بِرُّهُ أَوْ أَوْبَقَهُ إِثْمُهُ ...»، و فی روایة: «أَوْ يُوبِقُهُ الْجَوْرُ» احمد: ٩٢٠٤ و فی روایة: «ما مِنْ أَمِيرِ عَشَرَةٍ ...» احمد: ٢١٤١٩ ـ ٢١٦٩٦.

# بابەتی بیست و نۆهەم:
# زەرەر و خراپی دەمارزلی و خۆپەسەندی (کبر، عجب)

ئەم پاژە لە دوو لق پێك هاتووە:

## [لقی یەکەم: دەمارزلی]

بزانە خۆ بەزل‌زانین لە شەریعەتدا بە خراپی باسی کراوە، خودای مەزن فەرموویەتی: ﴿سَأَصْرِفُ عَنْ آيَاتِيَ الَّذِينَ يَتَكَبَّرُونَ فِي الْأَرْضِ بِغَيْرِ الْحَقِّ﴾[1] واتە: لە داهاتوودا ئەوانەی کە بێخود لەسەر عەرزدا لەخۆبایی بوون، لە نیشانەکانم لادەدەم».

خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿كَذَٰلِكَ يَطْبَعُ اللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ قَلْبِ مُتَكَبِّرٍ جَبَّارٍ عَنِيدٍ﴾[2] واتە: «ئاوەها خودا مۆر دەکوتێ بە سەر دڵی ئەوانەی وا خۆ بەزل‌زان و زۆردار و لاساران».

خودای مەزن فەرموویەتی: ﴿وَاسْتَفْتَحُوا وَخَابَ كُلُّ جَبَّارٍ عَنِيدٍ﴾[3] واتە: «(پێغەمبەران) داوای سەرکەوتنیان لەخودا کرد و (لە ئەنجامدا) هەرچی ملهوڕ و ڕق لە دڵە، مەئیووس بوون».

پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «لا يَدْخُلُ الْجَنَّةَ مَنْ كَانَ فِي قَلْبِهِ مِثْقَالُ ذَرَّةٍ مِنَ الْكِبْرِ»[4] واتە: «کەسێك بە قەدەر تۆزقاڵێك دەمارزلی لە دڵیدا بێت ناڕواتە بەهەشت».

---

١. الأعراف: ١٤٦.
٢. غافر: ٣٥.
٣. إبراهيم: ١٥.
٤. مسلم: ١٣١ ـ ١٣٣، ترمذی: ١٩٢٢، ابن‌ماجه: ٥٨، احمد: ٣٧٥١.

پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «قَالَ اللهُ ـ تَعَالَىٰ ـ اَلْكِبْرِيَاءُ رِدَائِي، وَ الْعَظَمَةُ إِزَارِي، فَمَنْ نَازَعَنِي وَاحِداً مِنْهُمَا أَلْقَيْتُهُ فِي جَهَنَّمَ»[1].

واتە: «خودای مەزن فەرموویەتی: خۆ بە مەزن دانان و گەورەیی جلوبەرگی تایبەتی منە، جا هەرکەس لە یەکێ لەم دوانەدا هاوبەشیم بکات، لە ئاوری دۆزەخی دەهاوێم».

خۆ بەزلزانی حاڵەتێکە بە هۆی خۆپەرەستی و خۆ بە چاکزانینەوە لە دەروون‌دا پەیدا دەبێ، جا هەرچی لە ڕواڵەتی مرۆڤدا بۆنی خۆ بەزلزانینی لێ بێ، ئەوە لە ژێر کاریگەریی ئەو خەسڵەتە دەروونیەوەیە.

پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «اَللّٰهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ نَفْخَةِ الْكِبْرِيَاءِ»[2] واتە: «خودایە! ئەمن لە هەوای خۆ بەزلزانی پەنا بە تۆ دەگرم».

دەماربەرزی ئەگەر بەرانبەر خودا بکرێ بەم چەشنە کە مل بە دەستووراتی نەدات و باوەڕی پێ نەبێ، ئەوە بێ‌شك کفرە، ئەگەریش بەسەر پێغەمبەراندا بکرێ؛ بەم چەشنە کە ملبەوەدا نەکات کە شوێنی مرۆڤێك وەکوو خۆی بکەوێ، ئەمەش دیسان بێ‌شك کفرە، جۆری سێهەمیش ئەوەیە کە خۆی بەسەر خەڵکدا بە گەورەتر بگرێ و داوا لە خەڵك بکات کە خزمەتی بکەن و سەری بۆ دانەوێنن، ئەم جۆرەش دیسان هاوبەشی‌کردنی خودایە لە سیفەتی کیبردا، چونکە هیچ‌کەس جگە خودا نابێ گوێڕایەڵی بکرێ (مەگەر لەو شوێنانەدا کە خودا خۆی بە پێویستی زانیوە، کە ئەمەش هەر ئەبێتە گوێڕایەڵی خودا).

دەمارزلی ئەگەر لە ماڵ و مەقامەوە سەرچاوەی گرتبێ، ئەوە چارەسەرەکەی ڕابوورا، ئەگەریش لەخۆپەسەندییەوە بێ، ئەدی هەر ئەو دەمارزلییە خۆی، خۆپەسەندی هەڵئەوەشێنێتەوە، ئەگەریش لە ئەنجامدانی کاری خێر و چاکە و زانینەوە تووشی بووە، ئەوە ئەو جۆرە خۆ بە گەورە زانینە تەنها شیاوی خودایە، ئەگەر خۆی بەهۆی ئەوانەوە بەسەر خەڵکدا بگرێ، ئەوە پاداشی ئەو خێراتانەی هەموو بە با ئەدا و لەوانەیە هەمووی بسووتێ. هەروەك چۆن لەم‌بارەوە حەدیسی زۆر هاتووە.

---

١. ابوداود: ٣٥٦٧، ابن‌ماجە: ٤١٦٤ ـ ٤١٦٥، احمد: ٧٠٧٨ ـ ٨٩٩١ ـ ٩٣٢٦، و فی روایة لمسلم: ٤٧٥٢: «اَلْعِزُّ إِزَارُهُ وَالْكِبْرِيَاءُ رِدَاؤُهُ فَمَنْ يُنَازِعُنِي عَذَّبْتُهُ».

٢. لَمْ أَرَهُ بِهذا اللّفظ، لكن ورد بنحوه: «أَعُوذُ بِاللهِ مِنَ الشَّيْطَانِ مِنْ نَفْخِهِ وَ نَفْثِهِ وَ هَمْزِهِ» ابوداود: ٦٥١، ابن‌ماجە: ٨٠٠، احمد: ٣٦٣٦ ـ ١٦١٨١ بروايات مختلفة.

ڕێگەی چارەسەری ئەم ئافەتە، کە لە بەرانبەریشیەوە دڵی دابمەزرێ و لەو خەیاڵاتانە بحەسێتەوە، ئەوەیە هەر کاتێ دڵی بۆ فیزکردن بەسەر خەڵکدا لێ دا، ئەوە نەفس‌شکێنی بکات و بەردەوام بێ لە سەری، بەڵکوو خودا لەم کردەوە چەپەڵە ڕزگاری بکات.

## [تاقیکاری بۆ ڕزگاربوونی دڵ لە دەمارزلی]

هەرکاتێ مرۆڤ وا حاڵی بوو کە لە دەمارزلی ڕزگاری بووە ئەوە پێویستە نەفسی بە چوار ڕەوشت تاقی بکاتەوە:

یەکەم: نەفسی بە کێبەرکێ لەگەڵ ناحەزەکەیدا تاقی بکاتەوە، تا بزانێ ئاخۆ بەوە تووڕە دەبێ کە لە زمانی ناحەزەکەیەوە حەق ببیسێ یان نە؟ ئایا حەز بە سەرکەوتن بە سەریدا دەکات، یان نە؟

دووهەم: هاوتەمەنەکانی خۆی لەنێو کۆڕ و کۆمەڵدا وەپێش خۆی بخات.

سێهەم: پێداویستییەکانی ماڵەوەی لە خواردن و کەل‌وپەل و... لە دەرەوە بۆ ماڵ بباتەوە ـ ئەمە خۆی سوننەتە ـ و [لەگەڵ خێزانەکەیدا کاروباری ناو ماڵ ئەنجام بدات] و لەگەڵ خزمەتکار و منداڵە وردەکانیدا نان بخوات. هەر لەم تاقیکارییەش بە ئەژمار دێ ئەوەی کە بە دەم داوەتی هەژار و فەقیرانەوە بچێ و لەگەڵیاندا بۆ بازاڕ بڕواتە دەر و کەل‌وپەلیان بۆ هەڵبگرێ.

پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «اَلْبَذاذَةُ مِنَ الْإِيمانِ»[1] واتە: «شڕلەبەرکردن نیشانەی ئیمانە».

هەروەها فەرموویەتی: «مَنِ اعْتَقَلَ الْبَعِيرَ و لَبِسَ الصُّوفَ فَقَدْ بَرِيءَ مِنَ الْكِبْرِ»[2]. واتە: «هەرکەس وشتر بدۆشێ و جلی خورینە لەبەر بکات ئەوە لە خۆ بەزل‌زانی ڕزگاری دەبێ».

---

١. ابوداود: ٣٦٣٠، ابن‌ماجه: ٤١٠٨، احمد: ٢١٢٨٩.

٢. لم نجده بهذا اللّفظ، لکن ورد بنحوه: «بَرَاءَةٌ مِنَ الْكِبْرِ لَبُوسُ الصُّوفِ وَمُجَالَسَةُ فُقَرَاءِ الْمُؤْمِنِينَ وَرُكُوبُ الْحِمَارِ وَاعْتِقَالُ الْعَنْزِ أَوْ قَالَ: الْبَعِيرِ» بیهقی فی شعب الإيمان: ٥٧٥١، جامع الکبیر للسیوطی: ٧٦، حرف الباء»، و فی روایة: «عَنْ نَافِعِ بْنِ جُبَيْرِ بْنِ مُطْعِمٍ عَنْ أَبِيهِ: تَقُولُونَ فِيَّ التِّيهُ وَقَدْ رَكِبْتُ الْحِمَارَ وَلَبِسْتُ الشَّمْلَةَ وَقَدْ حَلَبْتُ الشَّاةَ، وَقَدْ قَالَ رَسُولُ اللهِﷺ: مَنْ فَعَلَ هٰذَا فَلَيْسَ فِيهِ مِنَ الْكِبْرِ شَيْءٌ» ترمذی: ١٩٢٤، احمد فی الزّهد: ٧٤ و زاد: «... وَأَجَابَ دَعْوَةَ الرَّجُلِ الدُّونِ ...»، حاکم فی المستدرك: ٧٤٧٩، جامع الکبیر للسیوطی: ٥٨١٨، حرف المیم. «التّیه، أی الکبر». و فی روایة: «... وَقَدْ لَبِسْتُ الصُّوفَ وَاعْتَقَلْتُ الْعَنْزَ... مَنْ فَعَلَ ذٰلِكَ فَقَدْ بَرِيءَ مِنَ الْكِبْرِ» بزار فی مسنده: ٣٤٤٨، و فی روایة: «... وَرَقَّعَ قَمِيصَهُ وَخَصَفَ نَعْلَهُ وَأَكَلَ خَادِمُهُ وَحَمَلَ مِنْ سُوقِهِ ...» معرفة الصّحابة لأبی‌نعیم الأصبهانیّ: ١٦٢٧، جامع الکبیر للسیوطی: ٤٧٨٨، حرف المیم.

هەروەها پێغەمبەرصَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فەرموویەتی: «وَ مَنْ حَمَلَ حاجَتَهُ إِلَىٰ بَيْتِهِ فَقَدْ بَرِیءَ مِنَ الْكِبْرِ»[1] واتە: «هەرکەس پێداویستی ماڵەوەی خۆی بۆ ماڵ هەڵبگرێ، ئەوە بێ‌گومان دوورە لە دەمارزلی».

جا کە ئەمە تێگەیشتی ئەوەش بزانە کە چاکترین کـار میانەڕەوییە، چونکە خۆ بە کەمزانینێکیش پەسندە کە خۆی لە ئاستی هاوتەمەن و هاوشانانی خۆی بە کەم بگرێ، نەك ئەوەندە بێت کە بکێشێ بە لای پەستی و خواریدا.

## [لقی دووهەم: خۆپەسندی]

بزانە کە خۆپەسندی کردەوەیێکی ناشەرعییە و خراپە، خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَ يَوْمَ حُنَيْنٍ إِذْ أَعْجَبَتْكُمْ كَثْرَتُكُمْ فَلَمْ تُغْنِ عَنْكُمْ شَيْئاً﴾[2] واتە: «لە ڕۆژی [جەنگی] حونەیندا کاتێ کە زۆربوونتان لەخۆباییتانی کرد، ئەو زۆربوونە هیچ کەڵکی نەبوو بۆتان».

هەروەها خودا فەرموویەتی: ﴿اَلَّذِينَ ضَلَّ سَعْيُهُمْ فِي الْحَيٰاةِ الدُّنْيا وَهُمْ يَحْسَبُونَ أَنَّهُمْ يُحْسِنُونَ صُنْعًا﴾[3] واتە: «ئەوانەی کە هەوڵ و تێکۆشانیان لە دونیا بێهوودە بووە و وا گومان دەبەن کە ئیشی چاکیان ئەنجام داوە».

پێغەمبەرصَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فەرموویەتی: «ثَلاثٌ مُهْلِكاتٌ: شُحٌّ مُطاعٌ، وَ هَوَىٰ مُتَبَعٌ، وَ إِعْجابُ الْمَرْءِ بِنَفْسِهِ»[4] واتە: «سێ شت کوشەندەیە: ڕژدیێك کە مرۆڤ وەدووی خۆی بخات، هەوەسێ بەگوێی بکرێ، خۆپەسەندی».

بنەڕەتی خۆپەرستی و خۆپەسندی لەوەوەیە کە گومانی کەماڵی زانست و کردەوە لە دەروونیدا پەیدا دەبێ، جا ئەگەر ترسی لەکیسچوونی ئەو کەماڵەی ببێ، ئەوە بە خۆپەرەست دانانرێ، هەروەها ئەگەریش بەوە خۆشحاڵ بێ کە نیعمەتی خودایە و پێی داوە، ئەمەش دیسان بەخۆپەرستی دانانرێ، بەڵکوو ئەوە بە فەزڵ و بەخششی خودا دائەنرێ.

---

١. لم نجده بهذا اللّفظ، لكن ورد بنحوه بلفظ: «مَنْ حَمَلَ بِضاعَتَهُ فَقَدْ ...» بيهقى فى شعب الإيمان: ٧٨٥٣، جامع الكبير للسيوطى: ٤٨٢٨، حرف الميم، و فى رواية: «مَنْ حَمَلَ سِلْعَتَهُ فَقَدْ ...» الشّهاب القضاعى فى مسنده: ٣٧٩. و فى رواية: «إِذٰا وَضَعَ الرَّجُلُ جَبْهَتَهُ فَقَدْ ...» ابن‌ابی‌شيبه فى مصنفه: ٢٣٦/٨.

٢. التوبه: ٢٥.　　٣. الكهف: ١٠٤.

٤. طبرانى فى الكبير: ٦٥١، بزّار فى مسنده: ٣٣٦٦، بيهقى فى شعب الإيمان: ٧٣١، الشّهاب القضاعى فى مسنده: ٣١٥، جامع الكبير للسيوطى: ١١٠، حرف الثّاء.

بەڵام ئەگەر بەو چاوەوە سەیری بکات کە نیعمەتێکە قەت لاچوونی بۆ نییە، یان پێوەندی بەخوداوە نییە، ئەوە بێ‌شك خۆپەرستیەیێکی تەواوە و کوشەندەیە.

چارەسەرەکەشی بەوەیە کە لە پاشەڕۆژی بیر بکاتەوە و تێ‌ڕابمێنێ لە سەرنویشتی "بَلْعَم بن باعوراء"[1] و شەیتان چلۆن عاقیبەت‌شەڕ و کافر بوون. ئەدی کەسێ لەوەدا ڕابمێنێ کە لەوانەیە عاقیبەت شەڕ بێت و بە کوفردا بکێشێ قەت کردەوەی خۆی بە چاك نازانێ و خۆپەسند نابێ.

والله أعلم بالصّواب

١. بەلعەمی باعوورا: یەکێك لە زانایانی بەنی‌ئیسرائیلە کە بە هۆی زانستەکەیەوە تووشی گوناح و تاوانی زۆر بووە و ئەو زانستەی هیچ بە کەڵکی نەهاتووە، بەڵکوو بە کوفریشی کێشا. زۆربەی زانایان لەسەر ئەوەن کە ئەم ئایەتە لەبارەی ئەوەوە هاتووە: ﴿وَاتْلُ عَلَيْهِمْ نَبَأَ الَّذِي آتَيْنَاهُ آيَاتِنَا فَانْسَلَخَ مِنْهَا ... فَمَثَلُهُ كَمَثَلِ الْكَلْبِ إِنْ تَحْمِلْ عَلَيْهِ يَلْهَثْ ...﴾ الأعراف: ١٧٦ ـ وەرگێڕ.

## بابەتی سییەم:
## زەرەر و خراپی لەخۆبایی‌بوون و لەخشتەچوون

بزانە لەخۆبایی‌بوون بەرچاوترین هۆکاری هەرەس‌هێنانی کەسایەتییە.

چینە لەخۆبایی‌بووەکان زۆرن، لێرەدا چواریان دەخەینە بەرباس:

**یەکەم:** زانایان؛

**دووهەم:** ئەهلی تاعەت و عیبادەت؛

**سێهەم:** سۆفییەکان؛

**چوارەم:** دنیاداران و دەوڵەمەندان.

سەرەتا دەچینە سەرباسی ئەو فەرموودانەی کە سەبارەت بە خراپە و زەرەری لەخۆبایی‌بوون و فریوخواردن هاتوون:

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿فَلا تَغُرَّنَّكُمُ الْحَياةُ الدُّنْيا وَلا يَغُرَّنَّكُمْ بِاللهِ الْغَرُورُ﴾[1] واتە: «با ژیانی دونیا هەڵتان نەخەڵەتێنێ و شەیتان و ماڵی دونیا لە [ئاستی] خودا فریوتان نەدات».

خودای مەزن فەرموویەتی: ﴿وَ غَرَّتْكُمُ الْأَمانِيُّ حَتَّى جاءَ أَمْرُ اللهِ﴾[2] واتە: «ئاوات و ئارەزوو تا کاتی هاتنی مەرگ ئێوەی فریو داوە».

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «حَبَّذا نَوْمُ الْأَكْياسِ وَ فِطْرُهُمْ، كَيْفَ يَغْبِنُونَ سَهَرَ الْحَمْقَى وَاجْتِهادَهُمْ، وَ لَمِثْقالُ ذَرَّةٍ مِنْ صاحِبِ تَقْوَى وَ يَقِينٍ أَفْضَلُ مِنْ مِلْءِ الْأَرْضِ مِنَ الْمُغْتَرِّينَ»[3].

---

١. لقمان: ٣٣.

٢. الحدید: ١٤.

٣. احمد فی الزّهد: ٧٤٦، ابن‌ابی‌الدّنیا فی الیقین: ٨.

واتە: «خەو و خۆراکی مرۆڤە زیرەکەکان چەندە جوانە! چلۆن ئەوان بێداری و تێکۆشانی گێل گەوجان بێنرخ دەکەن، تۆزقاڵێك چاکەی لە خۆپارێزان و یەقین لە دڵان، خێری زۆرترە لە پڕزەوی ئیحسان و چاکەی لەخۆبایی بوان».

فریوخواردن بریتییە لەوەی باوەڕی پێچەوانەی ڕاستەقینە بە شتێ ببێ، ئەمەش خۆی جۆرێ نەزانینە و بێدەنگی و قەناعەتێکە کە نەفس بە خەیاڵ و شوبهەگەلێك کردوویە کە لەگەڵ هەوەسدا کۆکە.

## [جۆرەکانی خۆفریودان]

### [یەکەم: خۆفریوی کافرەکان]

هەندێ لە خشتەچوان بەوە خۆیان ئەخەڵەتێنن کە گوایا دونیا نەخت و لەبەر دەستدایە، بەڵام پاشەڕۆژ قەرز و گومانە، ئەدی نەختیش بە قەرز نادرێ.

خوای گەورە هەڕەشە لەمانە دەکات و فەرموویەتی: ﴿أُولَٰئِكَ الَّذِينَ اشْتَرَوُا الْحَيَاةَ الدُّنْيَا بِالْآخِرَةِ فَلَا يُخَفَّفُ عَنْهُمُ الْعَذَابُ﴾[1] واتە: «ئەوانەی کە ژیانی دونیا بە ژیانی دواڕۆژ دەستێنن، ئەوە هەر جەزرەبەیان لەسەر سووك ناکرێتەوە».

ئەم جۆرە باوەڕە تایبەتی کافرانە، ئەوان ئیمان ناهێنن مەگەر بە بەڵگە و دەلیل، یان بە بورهان و بەڵگەی براوە، یان بە شوێنکەوتنی کەسێتر، شك لەمەشدا نییە کە نەخۆش بە پێی گفتی دوکتۆرەکەی دەوا دەخوات، بە هومێدی ساغ بوونەوەی، جا خۆ ئەگەر بڵێ: ئەمن دەوا ناخۆم مەگەر دڵنیابم کە بۆم چاکە، ئەوە بێگومان تێداچوونی بەدواوەیە، چونکە عەقڵ تەنها لەبەر ئەگەرێکی ڕووت دەست لەکار ئەکێشێ.

جا ئەگەر ئەم ڕاوێژە قسەی پێغەمبەران و موعجیزاتی ئەوان بێ، ئەوە قەت ئەو کافرانە دڵنیا نابن و باوەڕیان دانامەزرێ، ئاخرەکەی ئەوەیە گومانێکی زاڵ یان ئەگەرێکی لێ بکەوێتەوە. ئەدی مرۆڤی بە ئاوەز بەس لەبەر بوونی ئەگەرێك خۆی دەپارێزێ.

---

١. البقرە: ٨٦.

حەزرەتی عەلی رَضِيَ اللهُ عَنْهُ پاش ئەوەی بەڵگە و سەنەدی زۆری بۆ بێ‌باوەڕان هێنایەوە ئاوەهای فەرموو: ئەگەر حەق ئەوەیە کە تۆ ئەیڵێیت ئەوە هەم من و هەم تۆ ڕزگارمان بووە، بەڵام ئەگەر ئەوە بێ کە من ئەیڵێم، ئەوە بەس من ڕزگارم و تۆ بەدبەخت دەبی.

## [دووهەم: تاوانباران]

هەندێ خۆیان بەوە فریو دەدەن کە: بێ‌گومان خودا بەخشەندە و خاوەنی بەزەییە [و ئایەتەکانی قورئان کە لەم بارەوە هاتووە دەکەنە بەڵگە]، یان هەندێ‌تر خۆیان بەخێر و خێرات و خۆپارێزی باب و باپیریان دڵنیا دەکەن.

ئەم دوو جۆرە قەت دروست نییە، چونکە ئەوانە وا ئەڵێن: خودا خاوەن بەزەییە و دلۆڤانە، ڕاست دەکەن، بەڵام ئەوەندەی هەیە کە تەواوی ئایەتەکان داکۆکی لەسەر ئەوە دەکەن کە بەزەیی و ڕەحمی خودا بەس بۆ ئەو کەسانەیە کە توانیویانە کاری چاکە و خێر ئەنجام بدەن، خودا فەرموویەتی: ﴿وَ أَنْ لَيْسَ لِلْإِنْسانِ إِلَّا ما سَعَىٰ﴾[1] واتە: «مرۆڤ بەس ئەوەی دەست ئەکەوێ کە بۆی تێدەکۆشێ»، هەروەها فەرموویەتی: ﴿فَمَنْ يُرِدِ اللهُ أَنْ يَهْدِيَهُ يَشْرَحْ صَدْرَهُ لِلْإِسْلامِ﴾[2]، واتە: «هەرکەس خودا بیەوێ بیخاتە سەر ڕێ ڕاستە، دڵی بۆ دینی ئیسلام ئاوەڵا دەکات».

ئەدی باشە ئەو کەسە لە ڕزق و ڕۆزیدا پشت بە کەرەمی خودا دەبەستێ چی؟ لە کاتێکدا کە خودا فەرموویەتی: ﴿وَ مَنْ يَتَوَكَّلْ عَلَى اللهِ فَهُوَ حَسْبُهُ﴾[3]، واتە: «هەرکەس پشت بەخودا ببەستێ خودای بەسە». هەروەها فەرموویەتی: ﴿وَ يَرْزُقْهُ مِنْ حَيْثُ لا يَحْتَسِبْ﴾[4] واتە: «خودا لە شوێنێکەوە بژیوی بۆ دەنێرێ کە خۆیشی گومانی بۆ ناچێ». ئەدی خودا فەرمانی داوە لە ڕزق و ڕۆزیدا پشت بە ئەو و کەرەمی ببەستن، کەچی ئەوان ئاوەها نین و دایمە وان لە تێکۆشاندا بۆ ڕزق و ڕۆزی، بەڵام لەولاوە خودا فەرمانی داوە بە ئەنجامی کاری چاکە، ئەوان بەو حاڵەشەوە دەپەرمن بە خودادا [و کاری چاکە ناکەن و چاوەڕوانی بەخششن] ئەدی ئەمە ئەوپەڕی پێچەوانە کارکردنە!!

---

١. النجم: ٣٩.
٢. الأنعام: ١٢٥.
٣. الطلاق: ٣.
٤. الطلاق: ٣.

بەڵام ئەو کەسانەی کە بە تەمای چاکەی باب و باپیرانن و بەهیوای تەقوای ئەوانن، ئەوە با سەیری فەرموودەی خودای مەزن سەبارەت بە نووح عَلَيْهِ السَّلَامُ بکەن: ﴿إِنَّهُۥ لَيْسَ مِنْ أَهْلِكَ إِنَّهُۥ عَمَلٌ غَيْرُ صَٰلِحٍ﴾[1]. ئەم فەرمووده و گەلێك فەرموودەیتر تا دەگاتە ئەوەی پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دەپاڕێتەوە لە خودا کە ئیزنی بدا سەردانی گۆڕی باب و دایکی بکات و داوای لێبوردنیان بۆ بکات، خوداش ئیزنی دەدات کە بەس سەردانی گۆڕیان بکات و حەقی نەبێ داوای لێبوردنیان بۆ بکات. پێغەمبەریش صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دەستی کرد بە گریان و فەرمووی:

«اَلْكَيِّسُ مَنْ دٰانَ نَفْسَهُ وَ عَمِلَ لِمٰا بَعْدَ الْمَوْتِ، وَ الْأَحْمَقُ مَنْ أَتْبَعَ نَفْسَهُ هَوٰاهٰا، وَ تَمَنّٰى عَلَى اللهِ الْأَمٰانِيَّ»[2].

واتە: «وریا و زیرەك کەسێکە کە نەفسی سەرکەشی خۆی ماڵیی و ڕام کربێ و بۆ پاش مەرگ تێ بکۆشێ بەڵام عەقڵ سووك ئەو کەسەیە کە خۆی شوێنی هەوا و هەوەس خستبێ و وێڕای ئەوەش ئاوات و ئارەزووی [دونیایی] زۆر لە خوا داوا بکات».

پێویستە مرۆڤی عاقڵ و وردبین کە شەو و ڕۆژ خەریکی تاعەت و عیبادەتە و خۆی بەردەوام لە گوناح ئەپارێزێ، ترسی عاقیبەت‌شەڕی و گڕی چەخماخەی چارەنووسی ببێت و لەخودا بپاڕێتەوە، لە ژیانی دونیاو دواڕۆژدا لەسەر قسەی ڕاست دامەزراوی بکات.

ئەگەر تۆ پرسیار بکەی کە: ئەی ئومێدەواری لە کوێیە؟

ئەڵێین: ترس و هومێد دوو ئێشك‌چین، کە هەرکامیان بۆ خۆیان شوێنێکیان هەیە.

هیوا دوو شوێنی هەیە، یەکەم: لە کاتێکدایە کە بە هۆی گوناحی زۆرەوە لە خودا دوور ئەکەوێتەوە و شەیتان دەیفریوێنێ و شوێنی خۆی دەخات و لە بەخشین نائومێدی دەکات، لەو کاتەدایە هیوادار بێ کە بە تەوبەکردن دەبەخشرێ.

شوێنی دووهەمیش ئەوەیە کە ئومێدی بە خۆشی بەهەشت بێ و بەتەمای پلە و پایەی بەرز و نزمی بەهەشت بێ ـ هەروەك چۆن لە حەدیسدا هاتووە ـ تا تەنیا خۆی دەربەستی فەرزەکان نەکات و خەریکی سوننەت بێ.

---

١. هود: ٤٦.

٢. ترمذي: ٢٣٨٣، ابن‌ماجه: ٤٢٥٠، احمد: ١٦٥٠١ جميعهم بلفظ: «... وَالْعٰاجِزُ مَنْ أَتْبَعَ ...».

## چەندچینی فریوخواردوو:

### چینی یەکەم: زانایان

لە باسی زانستدا، لە سەری چوویین کە چلۆن زانایان فریو دەخۆن. زانای ڕاستەقینە کەسێکە کە لە ترسی خودا زانستی ڕۆژ بە ڕۆژ لە زیادبووندایە، پێغەمبەرصَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَسَلَّمَ فەرموویەتی: «أَنَا أَعۡلَمُكُمۡ بِاللّٰهِ وَ أَخۡشَاكُمۡ لِلّٰهِ»[1] واتە: «ئەمن لە هەمووتان زیاتر خودا دەناسم و لە هەمووتان زیاتر لە خودا دەترسم»، کەواتە هەرکەس ئاگاداری عەیبە دەروونییەکانی خۆی نەبێ، یان ئاگای هەبێ بەڵام هیچ هەوڵێ نەدات بۆ لە ناوبردنیان، ئەوە ئەو زانایە هەڵفریواوە و زانستەکەی هیچ بەهرەیێکی بۆی نییە.

### چینی دووهەم: خواپەرستان

عابیدان و خواپەرستان و ئەوانەی هەموو جۆرە خواپەرستییێک [چ فەرز، چ سوننەت] ئەنجام دەدەن بە دەگمەن لە فریوخواردن خۆیان ڕزگار دەکەن، مەگەر ئەوانەیان وا زیرەك و وریابن و خودا یارمەتییان بدات.

[ئەمانەی خوارەوە بریتین لە موسوڵمانە دیندارە فریوخواردووەکان]

١. هەندێکیان بەهۆی خۆ خەریكکردن بە سوننەتەکانەوە فەرزەکان لەکیس خۆیان دەدەن، وەکوو ئەو کەسانە کە هێندە لە دەسنوێژدا وەسواسی دەکەن و خۆیان بە نوێژی کردنی جلوبەرگەوە دەخجلێنن کە کاتی نوێژەکەیان لەدەس دەردەچێ، یان دەکەوێتە ئاخری وەختەوە.

٢. هەندێتریان نییەتیان بۆ نایێ و وەسوەسە دەیانگرێت تا نوێژی جەماعەتیان لەدەس دەردەچێ.

٣. هەندێتریان لە خوێندنی ئەلحەمد و گەڕانەوە بۆ سەر وشەکان، وەسواسی دەکەن و دەڵێن: ئێمە جێی دەرچوونی پیتەکان ڕەچاو دەکەین، کەچی گوێ بە باقی بەشەکانیتری

---

١. احمد: ٢٣٧٦٥ بلفظ: «وَاللّٰهِ أَنَا لَأَعۡلَمُكُمۡ ...»، مسلم: ١٨٦٨ بلفظ: «وَاللّٰهِ إِنِّي لَأَرۡجُو أَنۡ أَكُونَ أَخۡشَاكُمۡ لِلّٰهِ وَ أَعۡلَمَكُمۡ بِمَا أَتَّقِيۡ»، مالك فی الموطأ: ٥٦٤، احمد: ٢٣٢٤٩ ـ ٢٤٠٦٩، نسائی فی السنن الکبری: ٣٠٢٥، الشافعی فی مسنده: ٤٤٢.

نوێژ نادەن، ئەمانە وەکوو ئەو نوێنەرەن کە نامەیێك دەبات بۆ لای پاشا و دەست بە خوێندنەوەی دەکات و سفت و سۆڵ پیتەکان دەخوێنێتە و هەر خەریکی دووپاتکردن و وەسواسییە و ئاگای لەخۆی بڕیوە و بیری لای ڕێز و ئەدەبی کۆڕەکە و پاشا نەماوە. ئەدی ئەم کەسە شیاوی ئەوەیە بخرێتە شێتخانە، یان چارەسەرێکی بۆ بکرێ.

٤. هەروەها ئەو کەسانە کە دەچن بۆ حەج، یان ڕۆژوو دەگرن، یان هەر خواپەرستیێکی تر بەجێ ئەهێنن، کەچی ئامادەسازی بۆ ناکەن و مەرجەکانی لە تەوبە و مافی خەڵك‌دانەوە و... بەجێ ناهێنن، هەروەها ئاگایان لە ئافەتی عیبادەت نییە و نازانن پێویستیان بە خاوێنی و پاکسازی دەروون و ڕواڵەتیان هەیە. ئەدی ئەمانە بێ‌شك کڵاو لە سەرخۆیان دەنێن و خۆیان فریو دەدەن.

## چینی سێهەم: سۆفی و ئەهلی تەریقەت

ئەمانیش چەند جۆرن:

١. دەستەیێکیان هەر بەوە ڕازین کە جلوبەرگ و لیباسی سۆفیانە لەبەر کەن و لە سۆفیەتیش هەر ئەوەندە تێگەیشتوون.

٢. دەستەیەکی‌تریان پێشکەوتووترن و جلوبەرگی شۆڕی گران کە نرخی لە هەورێشم زیادترە، لەبەر دەکەن. چیرۆکی خۆخەڵەتاندنی ئەمانە وەکوو ئەو پیرەژنەیە کە بیستوویەتی کە ناوی سەربازی پیاو لە نێو لیستەی پاشادا دەنووسن [و مووچەیان بۆ دەبڕنەوە]، ئەمیش دێت زرێ لەبەر دەکات و چەك بەدەستەوە دەگرێ و دەچێتە خزمەتی پاشا. لەوێدا پاشان فەرمان دەدات کە چەك و زرێیەکەی لەبەر داکەنن و زۆرانی لەگەڵ بگرن و تاقی بکەنەوە. کەچی کاتێ کە کڵاو و زرێیەکە لەبەر دادەکەنێ، دەردەکەوێ کە پیرەژنە. یەکێ لەوێدا ڕاست ئەبێتەوەو ئەڵێ: ئەم کارە سووکایەتییە بە پاشا! دەسبەجێ دەیگرن و دەیخەنە بەر فیل تا پانی بکاتەوە.

٣. هەندێ‌تر [وەك تووتی] فێری لاسایی‌کردنەوەی قسە و وتار و شتی سۆفیانە بوون و سەبارەت بە زانیارییە نهێنییەکان و کەشف و موکاشەفە و... قسە دەکەن و جگە وشەکانی نەبێ هیچی لێ نازانن. جا ـ پەنا بە خودا ـ ئەمە هۆی بەدبەخت بوون و تیاچوونە.

[ئەم جۆرە کەسانە بە چاوی سووکەوە سەیری زانایان و موفەسیران و شارەزایانی حەدیس و... دەکەن، تا بگا بە خەڵکی سادە و عەوام].

٤. هەندێ‌تر کەوتوونەتە دوای ئەوە کە گوایا خودا پێویستی بە تاعەت و عیبادەتی ئێمە نییە و ئیدی بۆچی نوێژ و ڕۆژوو بکەین...، کەچی نازانن تاعەت و خواپەرستی بۆ خۆیانە و بۆ خودا نییە.

٥. هەندێ‌تریان، نان و خوانی زۆریان بۆ خەڵك ڕژاندووە و جیاوازی لە نێوان هیچ‌کەس و هیچ شتێ ناخەن و [خۆیان تەرخان کردووە بۆ خزمەتکردن بە سۆفی و کۆیان دەکەنەوە و نان و خوانیان بۆ ئامادە دەکەن، بەڵام وێڕای ئەمە چەند ئامانجی‌تریان هەیە؛ پارە کۆکردنەوە و گەیشتن بە ماڵی زۆرتر لە ڕێی ناودەرکردنەوە.[1]].

٦. هەندێ‌تریان چاوی لەنێو تەریقەتدا ئەکرێتەوە و شتانێکی لێ حاڵی ئەبێ، جا هەرکە هەستی بە بای مەعریفەت کرد، ئیدی لەو ئاستەدا ڕادەوەستێ و گومان دەکات بە مەبەست گەیشتووە و تەواوە، کەچی بێ‌خەبەرە لەوەی کە کاری سەیر و سەرسوڕهێنەری ئەم چینە هەر تەواوبوونی بۆ نییە، جا هەرکەسێ لە ئاستی یەکێ لەم عەجایباتەدا ڕابوەستێ و وابزانێ شتێکی لێ حاڵی بووە ئەوە دەخەڵەتێ و هەر لەو شوێنەدا دەمێنێتەوە.

٧. هەندێ‌تریان لە هەمووی ئەمانە تێپەڕیون و ئاوڕیان لە هیچێ لەو تیشك و خێر و نوورە نەداوەتەوە کە ڕژاوە بە سەریاندا، چاویشیان لەو دیارییە زۆرانەی کە هێناویانە بۆیان، نەبووە و قەت دڵیان بەمانە خۆش نەبووە و حەزیان پێ نەکردووە، بەڵکوو بەچاکی چوونەتە پێشەوە تا نزیك بوونەتەوە و بە سنووری قوربی خودای مەزن گەیشتوون، ئا لێرەدا تووشی هەڵەبوون، چونکە وا گومانیان بردووە کە بە خودا گەیشتوون کەچی خودای مەزن حەفتا پەردە لە نوورە، هەر ڕێبوارێکی تەریق بە یەکێ لەم پەردانە بگات وا دەزانێ بە مەبەست گەیشتووە.

لەوانەیە وتەی ئیبراهیم عَلَيْهِ السَّلَام ئاماژە بەمە بێ کە خودا لەبارەیەوە فەرموویەتی: ﴿فَلَمَّا جَنَّ عَلَيْهِ اللَّيْلُ رَأَىٰ كَوْكَبًا قَالَ هَٰذَا رَبِّي﴾[2] واتە: «کاتێ کە شەوی بەسەردا هات ئەستێرەیێکی دیت، گوتی ئەمە پەروەردگاری منە».

١. ئەم دوو ڕستەیە ئاخرەم لە ئیحیا وەرگرت ـ وەرگێڕ.
٢. الأنعام: ٧٦.

مەبەستی ئیبراهیم ئەو جیسمە نوورانییانە نییە کە لە ئاسماندان، چونکە ئەستێرە ورد و بچووکن، ئەویش ئەمەی دەزانی و دەیشیزانی ئەمانە خودای ئەو نین، چونکە زۆرن و یەکێك نین، ئەدی چۆن ئیبراهیمی خەلیل بەشتێ دەخەڵەتێ کە خەڵکی عەوام و نەزانیشی پێ ناخەڵەتێ، بەڵکوو مەبەستی لە ئەستێرە نوورێکە لەو پەردە نوورانییانەی خودای مەزن، کە ئەمە هەووەڵین حیجابە، ئەمەش لە ڕێگەی ڕێبوارانی تەریقدایە و کەسیان ناگەنە بەرەوە مەگەر لەم حیجابانە تێپەڕن، ئەم حیجابانەش لە نوورن؛ هەندێکیان بچووکن و هەندێکیان دورشتن، بەو ئەندازەی کە لە خودا نزیك و دوور بن.

بچووکترین تیشکی ئاسمان ئەستێرەکانن، ئیبراهیمیش بۆ ئەووەڵین پەردەی نوور لە وشەی ئەستێرە کەڵکی وەرگرتووە، چونکە ئەستێرە بچووکترین جیسمی نوورانییە هەروەك چۆن گەورەترینەکەشی خۆرە و لەنێوان ئەو دوانەشدا مانگە. ئیبراهیمیش کاتێ عالەمی مەلەکووتی چاو پێ کەوت، وەك خودا فەرموویەتی: ﴿وَ كَذٰلِكَ نُرِيَ إِبْرٰاهِيمَ مَلَكُوتَ السَّمٰوٰاتِ﴾[1] واتە: «هەروەها عالەمی مەلەکووتی ئاسمانەکانمان نیشانی ئیبراهیم دا».

ئیبراهیمیش جار لە دوای جار بە تیشکێ لەپاش تیشکێ‌تر و بە پەردەیێ لەپاش پەردەیێ‌تر دەگەیشت، جا هەرکاتێ نوورێ لەو نوورانەی بۆ دەردەکەوتن و سەیری مەزنی و گەورەیی ئەو تیشکانەی دەکرد وەها گومانی دەبرد کە بە خودا گەیشتووە و دەیفەرموو: ئەمە خودای منە، بەڵام لە سایەی نووری پێغەمبەرایەتی و یارمەتی خوداوە تێدەگەیشت کە نوورێکی‌تر هەیە لەوە گەورەترە، جا هەرکاتێ نووری دووهەم دەردەکەوت، ئەو کاتە دەیزانی نووری ئەووەڵ چەندە کز و لاواز بووە و هەروەها ئەم نوورانە خامۆشییان بە دواوەیە، بۆیە فەرمووی: ﴿لا أُحِبُّ الْآفِلِينَ﴾[2] واتە: «ئەمن خۆشم لەوانە نایە کە خامۆش دەبن و بێ‌تیشك دەبن».

ئیبراهیم هەر بەم شێوە درێژەی پێدا تا هەموو پلەیێکی تێپەڕاند، تا گەیشت بەو مەقامە کە گومانی لە تێدا نەما و فەرمووی: ﴿إِنِّي وَجَّهْتُ وَجْهِيَ لِلَّذِي فَطَرَ السَّمٰوٰاتِ وَ الْأَرْضَ﴾[3] واتە: «ئەمن ڕووم وەرچەرخاند بەرەو ئەو کەسە کە ئاسمانەکان و زەمینی خەلق کردووە».

کەوابوو ڕێبواری ڕێی تەریق بەم پلە و پایە ناگات و ئەم نوور و حیجابانەی بۆ دەرناکەون، مادامێ لەپێش هەمووشتدا حیجابی نەفسی خۆی تێنەپەڕێنێ، نەفسیش بەشێکە لە عالەمی

---

١. الأنعام: ٧٩.

١ و ٢. الأنعام: ٧٦.

نهێنی خودا، بەڵکوو نوورێکە لە نوورەکانی خودای مەزن کە بریتییە لە ڕۆح و دڵ، ئەو دڵەی کە حەقیقەتی خودا تەنها لەوێدا خۆی دەردەخات، تەنانەت هێندە گەورە ئەبێتەوە کە تەواوی عالەم دادەگرێ و جێی دەکاتەوە و وێنەیێك لە تەواوی هەستی لە نێویدا دەردەکەوێ، تەنانەت هەندێ گوتوویانە مەبەستی خودا بە «لوح المحفوظ» لە قورئاندا، دڵە.

پاشان کە ڕێبواری ڕێی تەریق بە خودا گەیشت پرشنگێ هەرە گەورەی بۆ دەردەکەوێ و تەواوی بوون و هەستی تێدا ڕوون دەبێتەوە و لەسەر شکڵی ڕاستەقینەی خۆی دەنوێنێ.

لە پێشدا وەکوو چرایەك وایە کە شتێ درابێ بە سەریدا و پاشان لابرێ، هەروەك چۆن قورئان بەمە ئاماژە دەکات.

جا هەرکە نووری بۆ دەرکەوت و جوانی و گەورەیی دڵ لەبەر تیشکی خودا بینی، جار جارێ خاوەنی ئەم دڵە بۆ دڵی دەڕوانێ و سەری لەم جوانییە هەرە بەرزە سوڕ دەمێنێ و شك و گومان وردە وردە دەڕەوێتەوە و لەسەر شکڵی ڕاستەقینەی خۆی دەنوێنێ و دەکەوێتە زمانیەوە و ئەڵێ: «أَنَا الْحَق» من خودام. جا ئەگەر لەم قۆناغەدا خودا یارمەتی بدات و لوتف و بەزەیی خودا دەستی بگرێ و تێپەڕێ و لەو شوێنەدا ڕاناوەستێ، دەزانێ نووری خودا چەندە دوورە.

بەڵام ئەگەر ئەم قۆناغە بە سەرکەوتوانە تێنەپەڕێنێ، بێچارە دەبێ و فریو دەخوات و دەخەڵەتێ. چونکە هەندێ‌جار ئەو شتەی کە لە ناو شتێکی‌تردا دەردەکەوێ لێك تێك‌ئەچن هەروەك چۆن جاری وایە ڕەنگێ کە لەنێو ئاوێنەدا دەردەکەوێ، مرۆڤ وا تێدەگات، ئەوە ڕەنگی ڕاستەقینەی ئاوێنەیە، هەروەك چۆن پیاڵەی شیشەی ڕەنگی ئەو شتەی کە تێدایە لە خۆی دەگرێ.

وەك شاعیر دەڵێ:

«رَقَّ الزُّجَاجُ وَ رَقَّتِ الْخَمْرُ فَتَشَـابَهَا فَتَشَـاكَلَ الْأَمْرُ
فَكَأَنَّمَا خَمْـرٌ وَلا قَـدَحٌ وَ كَأَنَّمَا قَـدَحٌ وَلا خَمْـرُ»

واتە: «جامی شەراب ساف و ڕوونە، شەرابیش ساف و خاوێنە، ئەم دوانە لێك دەچن و جیاکردنەوەیان کارێکی سەختە».

«ئەڵێی هەر شەرابە و جام نییە، یان نەخێر ئەڵێی جامەو شەراب نییە».

گاورەکانیش هەر بەم چاوەوە بۆ مەسیحیان دەڕوانی، دەیان‌بینی کە تیشکی خودا تێیدا دەدرۆشێتەوە، بۆیە دەکەوتنە هەڵەوە، وەکوو کەسێ ئەستێرەیێ لەنێو ئاوێنە، یان ئاودا ببینێ، وا گومان ئەبا کە ئەستێرەکە لە نێو ئاوێنە یان ئاوەکەدایە، دەس ئەبا بیگرێ، ئەوسا دەزانێ لێی شێواوە.

شێوەکانی فریوخواردن زۆرە و لە ئەژماردن نایەن.

ڕجا وایە ئەم ئەندازە کە باسمان کرد بەس بێ و بتوانن دەستی لێ بکێشین، چونکە ڕێبواری ڕێی تەریق پێویستی نییە لە غەیری خۆی ببیسێ، ئەو کەسەش کە تامی مەعنەویاتی نەکردبێ نە لەم قسانە، نە لە گوێ بۆ گرتنیان کەڵك وەرناگرێ، بەڵکوو هەندێ جاریش زەرەری بۆی هەیە، چونکە قسەیێ ئەبیسێ کە لێی تێ ناگات و سەری لەم قسانە ئەبێتە تەپڵەوە.

بەڵام با ئەوەش بڵێین کە ئەم باسە هەر تۆزێکیش بووە، خێری بۆ گوێگر تێدایە. ئەوەش بریتییە لە بیستنەکەی، بەڵکوو خودا یارمەتیی بدات و تێ‌بگات کە ئەم باس و بوارە لەوە گەورەترە کە مێشکی تەنگ و کورتی ئەو لێی تێ‌بگات یان قسەی بێهوودە و بێ‌مانا ڕێی پێ ببات، هەروەها لەوانەیە دیسان گوێ بگرێ بۆ حەکایەت و کەرامەتێ کە خۆشەویستان و دۆستانی خودا دەیگێڕنەوە.

هەرکەسیش بەدبەخت و چارەڕەش بێ و گوناح و تاوان سەرتاپای داگرتووە، وادەزانێ ئەم قسانە درۆیە. ﴿وَ سَيَعْلَمُ الَّذِينَ ظَلَمُوا أَيَّ مُنْقَلَبٍ يَنْقَلِبُونَ﴾[1] «ئەدی ئەوانەی کە ستەمیان لەخۆیان کردووە، تێدەگەن عاقیبەت و چارەنووسیان چۆنە».

## چینی چوارەم: [دەوڵەمەندان]

دەوڵەمەندان، ئەوانەی کە مزگەوت و خانەقا و پرد و... دروست دەکەن و داوا دەکەن ناویان بەسەریانەوە بنووسرێ، مەبەستیشیان ئەوەیە کە ناو دەرکەن و ناو و نیشانێکی هەتاهەتاییان لێ بەجێ بمێنێ، بەم‌بۆنەشەوە چاوەڕوانی بەخشین و بەزەیی خودان. ئەم کارە هەڵەیە و لە دوو سەرەوە کڵاو لەسەر خۆیان دەنێن:

یەکەم: ئەگەر ئەو دارایییەیان لە ڕێی زوڵم و زۆر و غەسب و کوشت و بڕەوە دەست کەوتووە، ئەوە باشتر وایە بیدەنەوە بە خاوەنەکەی و دەست لەو جۆرە کارانە هەڵگرن.

---

١. الشعراء: ٢٢٧.

دووهەم: مەبەستیان بەم کارەیان ڕیا و خۆنواندنە؛ بەم چەشنە تەنانەت ئەگەر داوایان لێ بکرێ کە تاقە دینارێ لە شوێنێکدا ببەخشن، بەڵام ناویان بە سەریەوە نەنووسن، نەفسیان ڕێیان پێ نادات. جا ئەگەر نییەتیان ڕیا نییە ئەدی خۆ خودای مەزن ئاگادارە چ ناویان بە سەریەوە بنووسرێ، یان نەنووسرێ، بەمەدا دەردەکەوێ کە تەنها بۆ ڕیا و خۆنواندنە و هیچی‌تر.

دەستەیێک‌تر لەم دەوڵەمەندانە هەیە، کە لە ڕێی حەڵاڵەوەماڵیان وەدەست هێناوە و مزگەوتی پێ دەکەنەوە و دەیڕازێننەوە. ئەمەش لە دوو سەرەوە فریو دەخوات:

یەکەم: لەوانەیە هەر لە هاوسێیەتییەوە هەژارێکی لێقەوماو هەبێ، ئەوە باشتر وەهایە بە ئەو هەژارەی بدات.

دووهەم: بەو نەقش و نیگار و جوانکارییانە سەر لە نوێژخوێنەکان دەشێوێنێ، کە وابوو لەو سەرەوە خەڵەتاوە کە خراپەی بە چاکە زانیوە و وای زانیوە بەو نیگارو نەقشە خێری کردووە کەچی تووشی زەرەریش بووە.

ئەو فەرموودەی حەزرەتی حەسەنە رَضِيَ اللهُ عَنهُ دەبێتە بەڵگە لەسەر ئەم قسە کە فەرموویەتی: کاتێ کە پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم ویستی مزگەوتی مەدینە بکاتەوە، جوبرەئیل عَلَيهِ السَّلَام هاتە خزمەتی و فەرمووی: «ئەم مزگەوتە حەوت گەز بەرز دروست بکە، بەڵام مەیڕازێنەرەوە و نەقش و نیگاری بەسەرەوە مەکێشە»[1].

بە کورتی هەرکەس ماڵ و پارەیێکی بە هەژارێ، نەدارێ یان شوێنێ کە خێری تێدابێ بەخشی، ئەوە با سەیری نەفسی خۆی بکات؛ ئایا ڕێی پێ ئەدات بە نهێنی بیبەخشێ، جا ئەگەر ڕێی پێ نەدا، ئەوە لەوانەیە ڕیای تێکەڵ بێ و لەبەر خۆنواندن بیکات.

جا لێرەدا ئەگەر پرسیارم لێ بکەیت کە پاش ئەمەی تۆ هەرچی چین و گرووپ و دەستە و دایرەیە، بە فریوخواردووت دانا، ڕێگە چارە چییە؟ ئەمنیش ئەڵێم:

«لَوْ صَحَّ مِنْكَ الْهَوَىٰ أُرْشِدتَ لِلْحِيَلِ» واتە: «ئەگەر بەڕاستی عاشق و خوازیاری شتێ بیت، ڕێگەچارەی بۆ دەدۆزییەوە».

---

١. لم نجده بهذا النّص لكن ورد بنحوه: «مَا سَاءَ عَمَلُ قَوْمٍ قَطُّ إِلَّا زَخْرَفُوا مَسَاجِدَهُمْ» ابن‌ماجه: ٧٣٣.

ئەم چارەیەش بۆ کەسێ کە خودا ئاسانکاری بۆ بکات، ئاسانە. بۆچی کەسێ بتوانێ زێڕ و زیو لە کان دەربهێنێ و ماسی لە دڵی بەحر ڕاو بکات و پەلەوەر بە ئاسمانەوە بگرێ، ئاخۆ ناتوانێ کارێك لەمانە سووکتر بکات؟!، بەڵکوو ئەو کەسە مەترسی و سەختیی کارەکان دێتە دەستی. ئەو کەسە دەزانێ ئەو شتانەی کە باسمان کرد، وەك ڕیا و پلە و پێگەی دونیایی و ناو و ناوبانگ لەناو خەڵکدا... نامێنێتەوە، بەڵکوو مەرگ بازاڕی هەمووی ئەمانە دەپێچێتەوە. ئەو کەسە لەخۆی و هیچ و پووچی خۆی تێدەگات و پەروەردگار و عەزەمەت و گەورەیی ئەویش دەناسێ، هەروەها تێدەگات کە دونیا جێی فریوخواردنە و دواڕۆژە جێی ژیان و مان، جا ئیتر بۆچی بەگوێی خودا نەکات و لە ئافەتەکان دووری نەگرێ!.

جا ئەگەر بڵێیت، پاش ئەم ئافەتانەی کە باست کرد شتێ‌تر هەیە کەجێی مەترسی بێت؟ ئەڵێم: ترسی ئەوە هەیە کە لەم کاتە کە خۆی لەم ئافەتانە دەپارێزێ، شەیتان زاڵ بێت بەسەریدا و پێی بڵێ: «ئەتۆ پیاوێکی گەورەیت کە توانیوتە خۆت لەم ئافەتانە بپارێزی، کەواتە لە سەرتە خەڵك بانگ بکەی بۆ سەر ئەم ڕێبازەت و ئامۆژگارییان بکەیت». ئەمە عادەت و بازاڕی شەیتانە، بە هەرکەس کە نەتوانێ لە لایەنی دنیاوە ڕەخنە لێ بکات، لە لایەنی دینیەوە بۆی دەچێت.

پێشتر مەرجەکانی پەند و ئامۆژگاریکردنم باس کردووە، جا ئەگەر مەرجەکانی بەجێ‌هێنا و لەخۆیڕا دیت کە شیاوی ئەو کارەیە، ئەوە پشت بەخودا ببەستێ و ئینشائەڵڵاھ سەرکەوتوو دەبێ.

**چارەکی شتە کوشندەکان دوایی هات!**

# بابەتی سی و یەکەم: تەوبە

ئەم بابەتە لە چەند بەش پێكهاتووە.

## [بەشی یەکەم: حەقیقەتی تەوبە]

بزانە تەوبە بریتییە لە ماناو واتایێ کە لە سێ شت پێك هاتووە: تێگەیشتن، هەستی پەشیمانی، کردەوە.

قۆناغی یەکەم بریتییە لە تێگەیشتن لەوەی گوناح زەرەری هەیە و ئەبێتە پەردەیێ لەنێوان بەندە و خۆشەویستەکەیدا، جا کە ئەمەت زانی، کاریگەرییەك و تەئسیرێ لەو تێگەیشتنەوە لەسەر دڵت پەیدا ئەبێ کە بریتییە لە هەستکردن بە ناڕەحەتی و ترس و لە دەستدانی خۆشەویست، ئەمەش پێی دەڵێن: پەشیمانی، جا بەهۆی زاڵبوونی بەسەر پەشمانیدا هەستی تەوبەکردن و قەرەبووکردنەوەی ئەوەی کە لە دەستت داوە دەجووڵێ. کە وابوو تەوبە ئەوەیە ئێستا تەرکی گوناح بکرێت و عەزم ببەستێ کە ئیدی نەیکات و قەرەبووی لەوەوبەر بکاتەوە.

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «النَّدمُ تَوْبَةٌ»[1] واتە: «پەشیمانی تەوبەیە». کەواتە پەشیمانی لە دوای تێگەیشتنەوەیە، هەروەك گوتمان.

## [بەشی دووهەم: شیکارییەك لەسەر پێویستی تەوبەکردن]

عەقڵ و ئاوەز بەش بەحاڵی خۆی بە پێی ئەوەی کە باسمان کرد، گیرنگایەتی تەوبە هەست دەکات و دیسەلمێنێ.

---

١. ابن‌ماجە: ٤٢٤٢، احمد: ٣٣٨٧ ـ ٣٨٠٩ ـ ٣٨١١.

ئایەت و حەدیس سەبارەت بە واجببوونی تەوبە زۆر هەیە:

خودای مەزن فەرموویەتی: ﴿وَ تُوبُوا إِلَى اللهِ جَمِيعاً أَيُّهَا الْمُؤْمِنُونَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ﴾[1] واتە: «ئەی ئیمانداران بە تێکڕا بۆ لای خودا تەوبە بکەن، هومێد وایە ڕزگار بن».

خودای مەزن فەرموویەتی: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا تُوبُوا إِلَى اللهِ تَوْبَةً نَصُوحاً﴾[2] واتە: «ئەی کەسانێ کە ئیمانتان هێناوە، بە بێگەردی و ڕاستی لەلای خودا تەوبە بکەن».

هەروەها خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿إِنَّ اللهَ يُحِبُّ التَّوَّابِينَ﴾[3]. واتە: «بێشك خودا تەوبەکەرانی خۆش ئەوێ».

پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «اَلتَّائِبُ حَبِيبُ اللهِ وَالتَّائِبُ مِنَ الذَّنْبِ كَمَنْ لا ذَنْبَ لَهُ»[4] واتە: «تەوبەکار دۆستی خودایە، هەرکەس لە گوناح تەوبە بکات، وەکوو ئەو کەسە وایە کە گوناحی نەکردووە».

پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «اَللهُ أَفْرَحُ بِتَوْبَةِ الْعَبْدِ الْمُؤْمِنِ مِنْ رَجُلٍ نَزَلَ فِي أَرْضٍ دَوِيَّةٍ مُهْلِكَةٍ مَعَهُ رَاحِلَتُهُ عَلَيْهَا طَعَامُهُ وَ شَرَابُهُ فَوَضَعَ رَأْسَهُ فَنَامَ نَوْمَةً فَاسْتَيْقَظَ وَ قَدْ ذَهَبَتْ رَاحِلَتُهُ فَطَلَبَهَا حَتَّىٰ إِذَا اشْتَدَّ عَلَيْهِ الْحَرُّ و الْعَطَشُ، أَوْ مَاشَاءَ اللهُ قَالَ أَرْجِعُ إِلَىٰ مَكَانِي الَّذِي كُنْتُ فِيهِ، فَأَنَامُ حَتَّىٰ أَمُوتَ، فَوَضَعَ رَأْسَهُ عَلَىٰ سَاعِدِهِ لِيَمُوتَ، فَاسْتَيْقَظَ فَإِذَا رَاحِلَتُهُ عِنْدَهُ عَلَيْهَا زَادُهُ وَ شَرَابُهُ؛ فَاللهُ تَعَالَىٰ أَشَدُّ فَرَحاً بِتَوْبَةِ الْعَبْدِ الْمُؤْمِنِ مِنْ هٰذَا بِرَاحِلَتِهِ».[5]

واتە: «خودا بە تەوبەی بەندەی ئیماندار لەو پیاوە شـادترە کە لە بیابانێکی وشك و بەرەهووت و کوشەندەدا، وڵاخەکەی لەگەڵدا بێ و ئاوو خۆراکەکەی بەسەریەوە بێ، سەر بنێتەوە و تۆزێ بخەوێ، کاتێ کە دابچڵەکێ وڵاخەکەی ڕۆشتبێ، ئەمیش زۆر بەدوایدا بگەڕێ و تا خودا حەز بکات تینوویەتی و گەرما زۆری بۆ بهێنێ، ئیتر بێتە سەر ئەوەی بڵێ:

١. النور: ٣١. ٢. التحریم: ٨. ٣. البقرة: ٢٢٢.

٤. ابن‌ماجه: ٤٢٤٠، طبرانی فی الکبیر: ١٠١٢٨، بیهقی فی شعب الإیمان: ٦٧٩٩ دون ذکر قوله: «حبیب الله» لکن یفهم ذلك من هذه الآیة: ﴿إِنَّ اللهَ يُحِبُّ التَّوَّابِينَ وَ يُحِبُّ الْمُتَطَهِّرِينَ﴾ البقره: ٢٢٢.

٥. بخاری: ٥٨٣٣ بلفظ آخر: «للهُ أَفْرَحُ بِتَوْبَةِ عَبْدِهِ مِنْ رَجُلٍ نَزَلَ مَنْزِلاً وَ بِهِ مَهْلَكَةٌ وَ مَعَهُ رَاحِلَتُهُ عَلَيْهَا طَعَامُهُ وَ شَرَابُهُ ...»، احمد: ٣٤٤٧ ـ ٣٤٤٩، ترمذی: ٢٤٢٢، و کذا بنحوه: «إِنَّ اللهَ أَفْرَحُ بِتَوْبَةِ أَحَدِكُمْ مِنْهُ بِضَالَّتِهِ إِذَا وَجَدَهَا» ابن‌ماجه: ٤٢٣٧، و فی روایة: «... سَقَطَ عَلَىٰ بَعِيرِهِ وَ قَدْ أَضَلَّهُ فِي أَرْضِ فَلَاةٍ» بخاری: ٥٨٣٤، مسلم: ٤٩٢٧، ترمذی: ٣٤٦١، ابن‌ماجه: ٤٢٣٧ ـ ٤٢٣٩ بنحوه.

ئەگەڕێمەوە بۆ ئەو شوێنەی کە تێیدا بووم و ئەنووم تا ئەمرم، پاشان بێت و قۆڵی لەژێر سەری دابنێت تا بمرێت، پاش تۆزێ دابچڵەکێ لەپڕ ببینێ وڵاخەکەی وا بەلایەوە و ئاو و نانەکەشی بەسەریەوەیەتی. خودای مەزن زیاتر دەگەشێتەوە بە تەوبەی بەندە ئیماندارەکەی تا ئەو بە دۆزینەوەی وڵاخەکەی».

سەرجەمی زانایان لەسەر ئەوە هاودەنگن کە تەوبە واجبە.

ئەگەر تۆ بپرسی: چلۆن تەوبە واجبە لە حاڵێکدا تەوبە لە پەشیمانییەکەوە پەیدا ئەبێت کە لە دڵدا پەیدا بووبێت. ئەدی خۆی ئەم حاڵەتە دەروونییە لەژێر ویست و خواستی مرۆڤدا نییە؟!

ئەڵێم: ڕاستە، بەڵام هۆکاری بەدیهاتنی ئەو حاڵەتە بە پێی ویستی مرۆڤە، ئەوەش بە بەدەستهێنانی تێگەیشتنی ڕاستەقینەیە. هەر بەمبۆنەشەوە بوو کە پێشتر گوتمان، نەفسی تێگەیشتنەکە خۆی بەشێکە لەو تەوبە واجبە، جا ئەو تێگەیشتنە نەك بەو مانا کە بەندە خۆی بەدیی بهێنێ، بەڵکوو تێگەیشتن و پەشیمانی و ویست و هێز، هەر هەمووی لە خواوەیە. [چونکە خودای مەزن فەرموویەتی:] ﴿وَاللَّهُ خَلَقَكُمْ وَمَا تَعْمَلُونَ﴾[1] واتە: «خودا ئێوە و کردەوەکانتانی بەدی هێناوە». لەلای ئەهلی بەسیرەت و زانایانی وردبین، ئەم بۆچوونە، بۆچوونێکی ڕاست و حەققە و لەمە بەولا نادروست و هەڵەیە.

جا ئەگەر بپرسی: مەگەر مرۆڤ لەکردن و نەکردنی کردەوەکانیدا ویست و ئیختیاری نییە؟!

ئەڵێم: بەڵێ ئیختیار و ویستی هەیە. ئەمەش هیچ دژایەتیی لەگەڵ ئەوەدا نییە کە ئەڵێن: هەمووشتێ لەلایەن خواوەیە، بەڵکوو خودی ویست و ئیختیاریش دیسان خودا خەلقی دەکات. مرۆڤ تەنانەت لە ئیختیارەکەشیدا هەمدیسان مەجبوورە، چونکە کاتێ خودای مەزن دەستی ساغ و سالم دروست دەکات، خۆراکی خۆش و بەتام ساز دەکات، لە جەستەدا حەزو شەهوەتی نان و خۆراك خەلق دەکات، هەروەها لە دڵیشدا ئەو تێگەیشتنە خەلق دەکات کە ئەم خۆراکە حەزی برسیەتی دادەمرکێنێ، هەروەها ئەو بیرۆکە جیاوازانە کە ئاخۆ ئەم خۆراکە زەرەری هەیە، یان نە، دەخولقێنێ؛ یان ئەم خۆراکە شتێك هەیە لەگەڵیدا خواردنی باش نەبێ یان نە. پاش هەمووی ئەمانە ئەو زانیارییە لە دڵدا دەخولقێنێ کە هیچ

---

١. الصافات: ٩٦.

مەنع و خراپەیێك لە خواردنەکەدا نییە، جا لەکاتی بەجێ‌هاتنی سەرجەمی ئەم هۆکارانەدا ویستی خواردن پەیدا دەبێ.

ئەم هۆکارانە یەك بە یەك بە پێی ویست و ڕێبازی نەبڕاوە و هەمیشەیی خودا ڕیز کراوە، بۆ وێنە جووڵەی دەست بەو حاڵەتەوە کە بتوانێ بە شێوازی ڕێکوپێك بنووسێ ناخولقێنرێ، مادامێ ژیان و ویست و هێزی تێدا خەلق نەکات و ئەو ویستە ڕاستەوخۆیە کە کارەکە ئەنجام دەدات، نەخولقێنێ. ویستێ کە کاریگەری لە ئەنجامدانی کارەکەدا ببێ ناخولقێنرێ تاکوو ئەو زانیارییەش نەخولقێنرێ کە ئەم کارە هەم لە ئێستا و هەم لە داهاتوودا بە پێی حەزی نەفسە. ئەم زانیارییەش خەلق ناکرێ مەگەر لەبەر هەندێ هۆکار کە پێوەندییان بە دەسەڵات و ویست و عیلمەوە هەیە. کەوابوو هەم زانین و هەم حەزی دەروونی هەردووکیان بە هەمیشەیی شوێنی ویستی کاریگەری مرۆڤ دەکەون. ویست و هێزیش ئەبنە هۆی بەدی‌هاتنی جووڵەی دەست، ئەم ڕیزە لە هەموو کردەوەیەکدا ڕەچاو دەکرێ، ئەمانە هەر هەمووی مەخلووقی خودان، بەڵام هەندێکیان مەرجن بۆ هەندێ‌تریان.

ئەمەش عادەت و ڕێبازی خودایە لە ناو بەندەکانیدا، سەرجەمی ئەم کردەوانەش خودا لە کەمتر لە چاوتوروکانێکدا خەلقی کردوون و بە شێوەیێکی نەگۆڕ و بەڕیزێکی گشتی، گرێیانی داوە بە یەکەوە، خودا بەمە ئاماژە دەکات:

﴿إِنَّا كُلَّ شَيْءٍ خَلَقْنَاهُ بِقَدَرٍ ۝٤٩ وَمَا أَمْرُنَا إِلَّا وَاحِدَةٌ كَلَمْحٍ بِالْبَصَرِ ۝٥٠﴾[1] واتە: «ئێمە هەموو شتێکمان بە پێی ئەندازە و حیساب خولقاندووە، بۆ خولقانەکەشی تەنها یەکجار لە چاوتروکانێدا فەرمانمان داوە».

هەرمووی ئەمانە لە جوملەی ئەو قەدەرە دێنە ئەژمار: خەلقی جووڵەی دەستی نووسەر، پاش خەلقی هێز و ویست و زانین و ئیرادە. کە وابوو هەرکاتێ ئەم چوار شتە لەسەر جەستەی بەندەیێك کە دەستەمۆی قودرەتی خودایە هاتە جێ، خەڵکی ئەم عالەمە و تەواوی ئەوانەی کە عالەمی غەیب نابینن، ئەڵێن: ئەی پیاوەکە! بەڕاستی تۆ خۆت دەست دەجووڵێنی، دەنووسی، دەهاوێژی...، بەڵام لە پشتی پەردەی غەیب و لەپشتی ڕەشماڵی عالەمی ڕۆحانییەوە بانگ دەکرێ ﴿وَمَا رَمَيْتَ إِذْ رَمَيْتَ وَلَٰكِنَّ اللَّهَ رَمَىٰ﴾[2].

---

١. القمر: ٥٠ ـ ٤٩.　٢. الأنفال: ١٧.

واتە: «[ئەی موحەممەد!] ئەو کاتە کە تۆ [مستە خوڵەکەت] هاویشت بە [ڕووی دوژمناندا] ئەوە تۆ نەبووی کە هاویشتت بەڵکوو خودا بوو کە هاویشتی».

هەروەها دەنگ هات: ﴿قَاتِلُوهُمْ يُعَذِّبْهُمُ اللَّهُ بِأَيْدِيكُمْ﴾[1] واتە: «بیانکوژن، ئەوە خودایە کە لەسەر دەستی ئێوە ئەشکەنجەیان ئەدا»[2].

ئا لەم ساتەدایە کە عەقڵ و ئاوەزی دانیشتوانی جەرگەی ئەم عالەمی سروشتە سەریان سوڕ دەمێنێ؛ هەندێکیان ئەڵێن: کردەوەی مرۆڤ جەبرە و زۆرە و لە چوارچێوەی ویستی خۆیدا نییە.

هەندێتر ئەڵێن: کردەوەکان دەسکرد و بەرهەمی هێزی مرۆڤن و مرۆڤ هەرخۆی داهێنەریانە. هەندێتر بە پارێزەوە دەڵێن: کردەوەی مرۆڤ کەسب و دەستکەوتی خۆیەتی [هەرچەندەش خۆی بەدیهێنەری نەبێ].

بەڵام ئەگەر ئەمانە هەرهەموویان دەرگای ئاسمانیان بەڕوودا بکرایەوە و سەیری عالەمی غەیب و پەنهانی خودایان بکردایە، بۆیان ئاشکرا دەبوو کە بۆچوونی هەر هەموویان لەسەرێکەوە ڕاستە، بەڵام بەگشتی هەرهەموویان ناتەواوە، هیچکامیان حەقیقەتیان دەرك نەکردووە و حەقێقەت بەس بە پرشنگی ڕووناکییەك لە درزی عالەمی پەنهانییەوە ڕۆشن دەبێتەوە. خودای مەزنیش خۆی ئاگاداری عالەمی غەیب و سروشتە و کەس ناتوانێ ئاگاداری هەردووکی بێت، مەگەر ئەو کەسەی خودا خۆی پێی ڕازی بێت.

خودای مەزنیش: ﴿عَالِمُ الْغَيْبِ فَلَا يُظْهِرُ عَلَىٰ غَيْبِهِ أَحَدًا ۝ إِلَّا مَنِ ارْتَضَىٰ مِن رَّسُولٍ﴾[3]

واتە: «خودا ئاگاداری عالەمی نهێنیە و ئەو عالەمەی پیشانی کەس نادات مەگەر کەسێ وەك پێغەمبەر، کە خودا خۆی پێی ڕازی بێ»، یان وەکوو کەسێ کە بە شوێنی زنجیرەی عیللەت و مەعلوولدا ڕۆیشتبێ و سەری لەوە دەرهانیبێ کە چلۆن سەری ئاخری ئەم زنجیرە بەخودا دەگاتەوە. ئەوە لەو کاتەدا نهێنی قەزاو قەدەری بۆ ڕوون دەبێتەوەو بە دڵنیایی دەزانێ کە هیچ بەدیهێنەرێ جگە خودا نییە و کەس جگە ئەو داهێنەر نییە.

---

١. التوبة: ١٤.

٢. ئەم ئایەتە سەبارەت بە جەنگی بەدر نازڵ بووە کە کاتێ کافرەکان زۆریان هانی پێغەمبەر ﷺ مشتێ خۆڵی هەڵگرت و پژانی بە سەروچاویاندا کە بە تێکڕا لەو ماوەدا کوێر بوون ـ وەرگێڕ.

٣. الجن: ٢٦ ـ ٢٧.

ئێستا ئەگەر تۆ بڵێی: ئەدی خۆ تۆ حوکمت بەسەر خاوەنی هەرهەمووی ئەو بۆچوونانە کردووە کە لەنێو جەبر و داهێنان و کەسبدان و لە سەرێکەوە ڕاستن و لە سەرێکەوە ناتەواون.

ئەڵێم: ڕاست ئەڵێی و ئێستا بە وێنەیەك تێتدەگەیەنم.

ئەڵێم: کۆمەڵێ کوێر بیستیان کە حەیوانێکی سەیریان هێناوە بۆ شارەکەیان، پێ ئەڵێن: فیل. ئەوانیش تا ئێستا نە ناویان بیستبوو، نە زووتر دیبوویان. بڕیاریان دا کە بچن سەری لێ بدەن و بە دەس پێداهێنان بیناسن و بزانن ـ تا ئەو ئاستەی کە بۆیان دەرەخسێ ـ چلۆنە؟

پێکەوە ڕێ‌کەوتن و هاتن بۆلای و دەستیان پێوە دا؛ یەکیان دەستی کەوت لە پێی، یەکێ‌تریان دەستی لە عاجەکەی کەوت، یەکێ‌تریان دەستی لە گوێی کەوت. پاشان گوتیان ئێستا دەزانین چۆنە. کاتێ گەڕانەوە کوێرەکانی‌تر پرسیاریان لێ کردن، هەر یەکەیان بەجۆرێ وڵامی دەدانەوە:

ئەوەیان وا پێی فیلەکەی گرتبوو، دەیگوت: لە ئەستوونێکی زبر دەچێ، بەڵام ئەم تۆزێ نەرمتر بوو.

ئەو یەکەیان کە عاجەکەی گرتبوو دەیگوت: چ دەڵێی، بەڵکوو: ڕەقێك بوو، هیچ نەرم نەبوو، ساف بوو و هیچ زبری تێدا نەبوو، هیچشی لە کۆڵەکەی زل نەدەچوو، بەڵکوو باریك وەکوو لقی دار وابوو.

ئەوەشیان وا گوێی گرتبوو، دەیگوت: نەخێر بەڵکوو وەکوو پاڵتاوی بەر وابوو.

ئێستا، بەڕاستی هەر هەموویان ڕاستیان وتووە، چونکە هەواڵیان لە شتێکەوە داوە کە لە فیلەکەدا دەستیان لێ کەوتووە، خۆ لەوە زیاتریان نەگوتووە، بەڵام سەرجەم هەڵەیشیان کردووە؛ چونکە وایان زانیوە کە دەستیان لە تەواوی جەستەی فیلەکە کەوتووە و لێی تێگەیشتوون، ئیدی هەر بەو نەختە تەعبیریان لە گشتەکەی داوەتەوە.

زۆربەی ئەو شتانەی کە لەنێو خەڵکدا تێك‌گیرانی لەسەرە هەر وەك ئەم باسە وایە.

جا بگەڕێینەوە سەر باسەکەی خۆمان، ئەڵێم: ڕوونمان کردەوە کە تەوبە سێ بەش بوو (تێگەیشتن، هەستی پەشیمانی، کردەوە)، ئێستاش دەڵێم: تەوبە واجبە دەست‌بەجێ بکرێ، چونکە خۆ داڕووتان لە گوناح بەردەوام پێویستە، هەروەك چۆن خواپەرستی بەردەوام واجبە.

خودای مەزن فەرموویەتی: ﴿وَ تُوبُوا إِلَى اللهِ جَمِيعاً﴾[١] واتە: «بەتێکرا بۆلای خودا تەوبە بکەن». بەپێی ئەم ئایەتە دیارە کە تەوبە لەسەر هەمووکەس بەگشتی واجبە، چونکە کەس نییە تووشی گوناح نەبووبێ چ بە ئەندام، چ بە فکر و خەیاڵ، لانیکەم بۆ ماوەیێکی کورتیش بێ خودای لەبیر کردووە، کەوابوو تۆبەش لەوە واجبە. هەروەك چۆن پێغەمبەران و دنیانەویستان تەوبەیان لەم غەفڵەتە کردووە.

خۆشەویستان و دۆستانی خوا، ئەوانەی کە خوا دڵیانی بۆ دین ئاوەڵا کردووە و ئیمانی لە دڵیاندا نووسیوە، دەزانن: کە هەر هەناسەیەك لە هەناسەکانیان گەوهەرێکە کە لە نرخاندن نایەت، تەنانەت ئەگەر دونیا و ئەوەی لە دونیادایە بە هەناسەیەك کێشانە بکرێ ناگاتە نرخ و ئاستی ئەو تاقە هەناسەیە. ئیتر لەم سۆنگەوە زۆر هۆشیان بە کاتەکانیانەوە بووە، خەڵکانیتریش لە غەفڵەتی خۆیاندا نوقمەسار بوون:

﴿مِنْ قَبْلِ أَنْ يَأْتِيَ أَحَدَكُمُ الْمَوْتُ فَيَقُولَ رَبِّ لَوْلا أَخَّرْتَنِي إِلَىٰ أَجَلٍ قَرِيبٍ فَأَصَّدَّقَ وَ أَكُنْ مِنَ الصَّالِحِينَ ۝ وَلَنْ يُؤَخِّرَ اللهُ نَفْساً إِذٰا جٰاءَ أَجَلُهٰا﴾[٢].

واتە: «پێش ئەوەی مەرگ سۆراخی یەکێکتان بگرێ، بڵێ: پەروەردگارا! نەدەبوو مەرگی منت بۆ ماوەیێکی نە دوور وەدوا بخستایە، تا سەدەقە و خێرات بکەم و ببمە پیاوی چاك، ئەدی خوداش کاتێ کە ئەجەلی یەکێ هاتەبەرەوە قەت وەدوای ناخات».

واتە: ئەگەر بەندە لە سەرەمەرگدا، لەکاتی لاچوونی پەردەی غەیبدا، بڵێ: ئەی فریشتەی مەرگ! وازم لێ بێنە و بۆ ڕۆژێك بمخە دواوە با تەوبە بکەم و دەسمایەیەکی چاك بۆ دوارۆژ وەدەست بخەم. ئەویش ئەڵێ: ڕۆژگاری زۆرت لەکیس داوە، ڕۆژێکیشت بۆ نەماوەتەوە.

پاشان ئەڵێ: ئەدی سەعاتێك بیخە دواوە. ئەویش ئەڵێ: سەعاتهایێکی زۆرت بەفیڕۆ داوە، سەعاتێکیشت بۆ نەماوەتەوە. ئیدی ئا لەم کاتەدایە کە دەرگای تەوبەی لەسەر دادەخرێ و دەکەوێتە گیانەڵڵا و هەناسەبڕێکێی پێ دەکەوێ و خەفەتی ناهومێدی لە قەرەبووکردنەوەی ئەو کاتانەی کە بە فیڕۆی دابوون دەنۆشێ و حەسرەتی پەشیمانی لەکیسچوونی تەمەن هەڵدەکێشێ و ـ پەنا بەخودا ـ ئیمانی لەو تەنگانەدا لەق دەبێ.

---

١. النور: ٣١.

٢. المنافقون: ١١ ـ ١٠.

پاشان کاتێ کە گیانی دەرچوو، ئەگەر لەچارەنووسدا عاقیبەتخەیر بووبێ، ئەوە لەسەر ئیمان بەخودا گیانی دەرچووە، هەر ئەمەشە پێی ئەڵێن: عاقیبەتخێری. بەڵام ئەگەر خودا چارەنووسی ڕەشی بۆ نووسیبێ ـ پەنا بەخودا ـ ئەوە گیانی لەسەر ئیمان و باوەڕێکی لەنگ و ناتەواو، دەردەچێ و ئەمەش پێی ئەڵێن: عاقیبەتشەڕی.

خودا سەبارەت بەم باسە فەرموویەتی: ﴿وَ لَيْسَتِ التَّوْبَةُ لِلَّذِينَ يَعْمَلُونَ السَّيِّئَاتِ حَتَّىٰ إِذَا حَضَرَ أَحَدَهُمُ الْمَوْتُ قَالَ إِنِّي تُبْتُ الْآنَ﴾[1].

واتە: «تەوبە لە دەرگانەی خودادا بەس بۆ ئەو کەسانەیە کە بە نەفامی گوناح دەکەن و پاشان زوو تەوبە دەکەن». واتە: دەستبەجێ پاش تاوانەکە، چاکە دەکەن تا ئەو گوناحە بسڕێتەوە، هەر وەك چۆن لە حەدیسدا ئەمە هاتووە.

## ڕوونکردنەوەی ئەوەی هەرکاتێ تەوبە مەرجەکانی بێتەجێ، ئەوە بێشك وەرگیراوە:

بزانە هەرکاتێ لە مانای وەرگرتن تێگەیشتی، ئەبێ ئەوەش بزانی کە هەر تەوبەیێ کە مەرجەکانی بێتەجێ ئەوە بێگومان وەردەگیرێ.

ئەوانەی وا بە تیشکی بەسیرەتەوە بۆ پرشنگی قورئان دەڕوانن:

دەزانن کە هەر دڵێ ساغ بێت و لەلای خوداوە وەرگیرابێ ئامادەیی ئەوەی هەیە کە بە چاوی خۆی بۆ خودا بڕوانێ.

دەزانن کە دڵ لە بنەڕەتدا بە ساغی و پاکی دروست کراوە، ساغ و سەلامەتی خۆی کاتێ لە دەست ئەدا کە بە تۆز و تاریکی گوناح و تاوان ڕەش ببێ.

دەزانن کە ئاوری پەشیمانی ئەو تۆزە دەسووتێنێ و تیشکی خێرات و چاکە دڵ ڕووناك دەکاتەوە و لێڵایی لا ئەبا.

هەروەها دەزانن کە تاریکایی گوناح بەرگەی تیشکی چاکە ناگرێت، هەروەك چۆن تاریکایی شەو بە پرشنگی ڕۆژ لادەچێ، بەڵکوو هەروەك چۆن چەپەڵی چڵك بە سپیەتی سابوون پاك دەبێتەوە، هەروەها گوناحیش بە پرشنگی تەوبە و داوای بەخشین و پەشیمانی

---

١. النساء: ١٧.

دەشۆرڕێتەوە. مەگەر ـ پەنا بە خوا ـ هێندە لەسەر تاوان و گوناح بەردەوام بووبێ کە دڵی زایە کردبێ و هومێدی ساغبوونەوەی نەبێ.

وەکوو چۆن خودای مەزن سەبارەت بە کافران فەرموویەتی: ﴿كَلَّا بَلْ رَانَ عَلَىٰ قُلُوبِهِم مَّا كَانُوا يَكْسِبُونَ﴾[1] واتە: «نەخێر هەرگیز، بەڵکوو ئەو کارانەی کە کردوویانە دڵیانی ژەنگاوی کردووە».

هەروەك چۆن فەرموویەتی: ﴿وَ طَبَعَ اللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ﴾[2] واتە: خودا مۆری کوتاوە بە سەر دڵیاندا» خوداوەند ئەمەی سەبارەت بە کافران و مونافقان فەرموو، بەڵام سەبارەت بە موسڵمانان وەها نییە.

پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «لَوْ عَمِلْتُمُ الْخَطَايَا حَتَّىٰ تَبْلُغَ السَّمَاءَ ثُمَّ نَدِمْتُمْ لَتَابَ اللَّهُ عَلَيْكُمْ»[3] واتە: «ئەگەر ئێوە هێندە گوناح بکەن کە بگاتە ئاسمان، پاشان پەشیمان بینەوە، ئەوە خودا تەوبەتان لێ وەردەگرێ».

## ڕوونکردنەوەیێ لەسەر ئەو کردەوانەی کە تەوبەیان لەسەر دەکرێ:

ئەبێ تەوبە لە هەرچی تاوانە بکرێ. پێشتریش ئەم باسەمان لە بەشی سیفاتی خراپە و ئەوەی کە لەو سیفاتانەوە پەیدا دەبێ، کرد. تەوبە پێویستە لەسەرجەمی گوناحی گەورە و بچووك بکرێ.

هێندێکیش گوتوویانە: گوناحی بچووك ئەگەر بەردەوامی لەسەر بکرێ، ئیتر گوناحی بچووك نییە، هەروەها گوناحی گەورەش بە تەوبە دەبەخشرێ.

جا کاتێ کە لەمە تێگەیشتی، بزانە هەر شتێ کە پێوەندی بە مافی خەڵکەوە هەبێ، قەت تۆبە بۆی دروست نییە و نابەخشرێ مەگەر لەسەر داوای ئەو کەسە و ئازادکردنی خاوەن مافەکە؛ ئەو مافانە وەکوو: قیساس، حەق‌خۆری، هەموو جۆرە جەریمە و غەرامەیێ، حەددی تۆمەتی ناموسی خەڵك، ئەمە بۆ کەسێ بوو کە خۆی تەوبە بکات.

---

١. المطفّفين: ١٤.   ١. التوبة: ٩٣.

٣. احمد: ٢٠٥٢٩ بلفظ: «...ثُمَّ اسْتَغْفَرْتَنِي...»، ابن‌ماجه: ٤٢٣٨ بلفظ: «لَوْ أَخْطَأْتُمْ حَتَّىٰ تَبْلُغَ خَطَايَاكُمُ السَّمَاءَ ثُمَّ تُبْتُمْ لَتَابَ عَلَيْكُمْ». و فی لفظ آخر: «...لَوْ بَلَغَتْ ذُنُوبُكَ عَنَانَ السَّمَاءِ ثُمَّ اسْتَغْفَرْتَنِي غَفَرْتُ لَكَ وَلَا أُبَالِي...» ترمذی: ٣٤٦٣، احمد: ٢٠٤٩٩.

بەڵام هەرکەس تەوبە نەکات، ئەوە ڕێگە چارەی ئەوەیە تا گرێ‌کوێرەی دڵی لەسەر ئەنجامی گوناح دەکرێتەوە، پێویستە ئایەت و حەدیسی زۆری لەبارەی حاڵ و بارودۆخی گوناحبارانەوە بۆ باس بکرێ و حاڵ و وەزعی ئەو کەسانەی بۆ باس بکرێ کە بە فاسیقی و خراپەکاری مردوون، پێش ئەوەی تەوبە بکەن و سزایەك کە بە گەردنیانەوە بووە بیکێشن. هەروەها بۆی ڕوون بکەینەوە کە هەندێ جار خودا سزای ئەنجامی ئەو گوناحانە لە دونیا دەستێنێتەوە. با ئەگەر خۆی لە سزای قیامەت کوێر و کەڕ کرد بێ، لانی‌کەم لە ئابڕووچوونی دونیا بترسێ.

والله أعلم

# بابەتی سی و دووهەم: خۆڕاگری و شوکرانەبژێری

بزانە ئیمان بە پێی حەدیس و فەرموودەی ڕابردوان دوو بەشە، بەشێکی بریتییە لە خۆڕاگری و بەشێکی شوکرانەبژێرییە.

## بەشی یەکەم: خۆڕاگری

خودای مەزن لە بارەی تاقەت و خۆڕاگرییەوە فەرموویەتی: ﴿وَ جَعَلْنَا مِنْهُمْ أَئِمَّةً يَهْدُونَ بِأَمْرِنَا لَمَّا صَبَرُوا﴾[1] واتە: «هەندێ لە بەنی ئیسرائیلیانمان لەبەر ئەوەی خۆڕاگر بوون کردە پێشەوا تا بە پێی فەرمانی ئێمە خەڵك ڕێنوێنی بکەن».

خودای مەزن فەرموویەتی: ﴿وَ تَمَّتْ كَلِمَةُ رَبِّكَ الْحُسْنَىٰ عَلَىٰ بَنِي إِسْرَائِيلَ بِمَا صَبَرُوا﴾[2] واتە: «بەڵێنی پیرۆزی پەروەردگارت سەبارەت بە بەنیئیسرائیل هاتە دی، لەبەر ئەوەی خۆڕاگر بوون».

هەروەها خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَ لَنَجْزِيَنَّ الَّذِينَ صَبَرُوا﴾[3] واتە: «بێ شك پاداشتی ئەوانە کە خۆڕاگر بوون دەدەینەوە».

لە پێغەمبەرﷺ سەبارەت بە ئیمان پرسیار کرا، فەرمووی: «اَلصَّبْرُ وَ السَّمَاحَةُ»[4]، واتە: «ئیمان بریتییە لە خۆڕاگری و پیاوەتی».

---

١. السجدة: ٢٤.

٢. الأعراف: ١٣٧.

٣. النحل: ٩٦.

٤. احمد: ١٨٦١٨، ابی شیبه فی مصنفه: ٢٢٢/٧، بیهقی فی شعب الإیمان: ١٠٣٤٣.

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «اَلصَّبْرُ كَنْزٌ مِنْ كُنُوزِ الْجَنَّةِ»[1] واتە: «خۆڕاگری خەزێنەیێکە لە خەزێنەکای بەهەشت».

## حەقیقەتی تاقەت و خۆڕاگری:

بزانە خـــۆڕاگری تێکەڵە لە: تێگەیشتن، بارودۆخ، کردەوە. تێگەیشتن وەکوو دار وایە، بارودۆخ وەکوو لق و پۆپ وایە، کردەوەش وەکوو بەری دارەکەیە. جا تۆ کاتێ تێبگەی کە خێر و بەرژەوەندیی دینی لە خۆڕاگریدایە، هەر ئەمە هێز و توانایەکت تێدا دەخولقێنێ کە لەو بارودۆخەدا بە تاقەت و خۆڕاگر بی.

خۆڕاگری و تاقەت یان لەسەر ئەنجامی عیبادەتە، یان لەسەر بەرکوتانی هەوەس و نەفسە، واتە بێ جیاوازی هەرکام لەم دوانە پێویستی بە خۆڕاگری و بەرخۆدان هەیە، تا مەبادا لە کارە موباح و دروستەکاندا لە ئەندازەی شەرع پەسند بەرەو لای ئیسراف و زیادەڕەوی لانەدات.

جا خۆڕاگری لەسەر خواپەرستی بەم چەشنەیە کە ئەم چەند ڕۆژە کەمەی دونیا بەر خۆی بگرێ تا بۆ هەتاهەتایی بەختەوەر بێ. بۆ بەردەوامی لەسەر خواپەرستی پێویستە خۆڕاگری لەسەر ئەوە بکات کە باسی ئەو تاعەت و عیبادەتەی لای کەسەوە نەکات و ڕیا و فیزی پێوە نەکات.

گەورەترین خۆڕاگری لەوەدایە کە بەرخۆدان بکات لە شەهوەت و هەوەس و هۆکاری بزاوتنی ئەو شەهوەتە، هەر وەك چۆن کە باسەکەی ڕابرد.

یەکێك لەو بابەتانەی کە پێویستە لەسەری خۆڕاگری هەبێت لەو کاتەدایە کە کەسێ خراپەیێکی بەرانبەر بکات، چ بە قسە، چ بە کردەوە. هەندێ لە هاوەڵانی پێغەمبەر فەرموویانە: «ئێمە ئیمانی ئەو کەسەی کە لەسەر ئازار و ئەزیەت خۆڕاگر نەبێ بە ئیمان نازانین».

خودای مەزن فەرموویەتی: ﴿وَلَنَصْبِرَنَّ عَلَىٰ مَا آذَيْتُمُونَا وَعَلَى اللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ الْمُتَوَكِّلُونَ﴾[2] واتە: «ئێمە لەسەر ئەو ئازارانەی ئێوە پێمان دەگەیەنن تاقەت دەگرین، با ئەوانەی وا پشت دەبەستن، بەس بە خودا پشت ببەستن».

---

١. کشف الخفاء للعجلوني: ١٥٨٩.

٢. ابراهیم: ١٢.

خۆڕاگریش جاری وایە لەسەر ئەنجامی کردەوەیە و بەردەوامبوونە لەسەری، جاری واشە لەسەر تووشبوونی بەڵاو کارەساتە، تا مرۆڤ ئەم دوو خۆڕاگرییە لەخۆی نیشان نەدات ئیمانی تەواو نابێ.

ئەم جۆری دووهەمەش، بە بێویستی مرۆڤ هێرش دێنێ، وەکوو: بەڵا و ئافەت و نەخۆشی و کوێری و سەقەتبوونی ئەندامەکان و مەرگی خۆشەویستان.

ئیبنوعەبباس رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا فەرموویەتی: سەبر لە قورئاندا سێ شێوەیە:

[١.] خۆڕاگری لەسەر بەجێهێنانی فەرزەکانی خودای مەزن، کە پاداشتی ئەمە سێسەد هەزار دەرەجەیە.

[٢.] خۆڕاگری لەسەر ئەنجامنەدانی ئەو کارانەی کە خودا حەرامی کردوون، ئەمەش شەشسەد دەرەجەی هەیە.

[٣.] خۆڕاگری لە هەووەڵی تووشبوونی بەڵاوە، ئەمەش نۆسەد دەرەجەی هەیە.

سەبارەت بە خۆڕاگری جوان (صبر جميل) فەرموویانە، ئەبێ وەهابێ کە نەزانرێ کێ خاوەن بەڵاو کارەساتەکەیە.

بۆ گەیشتن بەم پلەیە ڕاهێنان و کارکردنی زۆری پێویستە کە بۆ ماوەیێکی درێژ، لەگەڵ نەفسدا بکرێ ـ والله أعلم.

## [بەشی دووهەم]: شوکرانەبژێری

شوکرانەبژێری گەورەییەکەی لەوەدایە کە خودای مەزن وێڕای ئەوەی لەبارەی یادی خۆیەوە فەرموویەتی: ﴿وَلَذِكْرُ اللَّهِ أَكْبَرُ﴾[1] واتە: «یادی خودا لەهەموو شتێ گەورەترە».

شوکرانەبژێری لەگەڵ یادی خۆیدا پێکەوە هێناوە و فەرموویەتی: ﴿فَاذْكُرُونِي أَذْكُرْكُمْ وَاشْكُرُوا لِي وَلَا تَكْفُرُونَ﴾[2] واتە: «یادم بکەن، یادتان ئەکەم، شوکرانەبژێرم بن و سپڵە مەبن».

خودای مەزن فەرموویەتی: ﴿وَسَيَجْزِي اللَّهُ الشَّاكِرِينَ﴾[3] واتە: «خودا بەم زوانە پاداشتی شوکرانەبژێران دەداتەوە».

---

١. العنكبوت: ٤٥. ٢. البقرة: ١٥٢. ٣. آل‌عمران: ١٤٤.

هەروەها فەرموویەتی: ﴿وَ قَلِيلٌ مِنْ عِبادِيَ الشَّكُورُ﴾[1] واتە: «عەبدە شوکورانەبژێرەکانم کەمن».

لە فەرموودەکانی پێغەمبەردا ﷺ هاتووە: «اَلطّاعِمُ الشّاكِرُ بِمَنْزِلَةِ الصّائِمِ الصّابِرِ»[2] واتە: «نان‌دەرێك کە شوکرانەبژێر بێ بە چەشنی ڕۆژووەوانی خۆڕاگرە».

شوکر، واتە: هیچ نیعمەت‌دەرێ نییە جگە خوا نەبێ، جا هەرکاتێ لە وردەکاری نیعمەتەکانی خودا وەك جەستە و ئەندامەکان و ڕۆح و گیان و تەواوی ئەو شتانەی کە بۆ ژیانت پێویستە، سەرت دەرهانی، ئەو کاتە خۆشی دەکەوێتە دڵتەوە و بەوە کامەرانی کە خودا نیعمەتی داوە پێت و منەتی لەسەرت ناوە، پاشان حەز دەکەیت کە بە پێی ئەو شوکرانەبژێرییە بجووڵێیتەوە.

## شوکرانەبژێری بە دڵ و زمان و ئەندامەکانی‌تر دەکرێ:

شوکری دڵ بەم شێوەیە کە لە بەرانبەری تەواوی خەڵکەوە، نییەت و ویستی چاکت بێ و بەردەوام لەیادی خودادا بی و خودا کە نیعمەت‌دەری تۆیە لەبیر نەکەی.

شوکرانەبژێری زمان بەوەیە کە حەمد و سەناو سپاسی پێ بکات و ئەو وشە و ڕستانە کە مانای شوکر دەدەن بەکاریان بهێنێ.

شوکر بە ئەندامەکانیش بەم شێوەیە کە لە ڕێی تاعەتی خودادا بە کاریان بهێنێ و خۆپارێزی بکات لەوەی ئیشی گوناحیان پێ ئەنجام بدات: شوکری چاو بەوەیە کە چاو لە ئاستی هەر عەیب و ناتەواوییەکدا کە لە خەڵکەوە ئەیبینێ، بقونجێنێ، بە چاو سەیری گوناح و حەرام نەکات. شوکری گوێ بەوەیە کە لە حەنای عەیبی خەڵکدا کەڕ بێت و تەنها قسەی ڕاست و حەلاڵی پێ ببیسێ.

پێغەمبەر ﷺ بە پیاوێکی فەرموو: «كَيْفَ أَصْبَحْتَ؟ قالَ: بِخَيْرٍ، فَأَعادَ السُّؤالَ فَأَعادَ الْجَوابَ حَتَّىٰ قالَ فِي الثّالِثَةِ بِخَيْرٍ أَحْمَدُ اللهَ تَعالَىٰ و أَشْكُرُهُ»، قال ﷺ: «هَذَا الَّذِي أَرَدْتُ مِنْكَ و كُلُّ أَحَدٍ سُئِلَ عَنْ شَيْءٍ وَ هُوَ بَيْنَ أَنْ يَشْكُرَ فَيَكُونَ مُطِيعاً، أَوْ يَشْكُوَ فَيَكُونَ بِهِ عاصِياً»[3].

١. سبأ: ١٣. ٢. ترمذى: ٢٤١٠، ابن‌ماجه: ١٧٥٤ ـ ١٧٥٥، احمد: ١٨٢٤٢.

٣. لم نجده بهذا اللفظ، لكن ورد بنحوه: «قِيلَ لِلنَّبِيِّ ﷺ: كَيْفَ أَصْبَحْتَ؟ قالَ: بِخَيْرٍ...» بخارى فى الأدب المفرد: ١١٧٤، ابن‌ماجه: ٣٧٠٠، احمد: ١٣٠٨٦ بروايات و ألفاظ مختلفة. و فى رواية: «قالَ النَّبِيُّ ﷺ لِرَجُلٍ: كَيْفَ أَصْبَحْتَ يا فُلانُ؟ قالَ: أَحْمَدُ اللهَ إِلَيْكَ يا رَسُولَ اللهِ! فَقالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: هٰذَا الَّذِي أَرَدْتُ مِنْكَ...» طبرانى فى الكبير: ١٤٧٥.

واتە: «چلۆنی؟گوتی: باشم، دیسان پێغەمبەرﷺ پرسیارەکەی دووپات کردەوە، ئەویش هەر ئەوە وڵامەی دایەوە تا جاری سێهەم گوتی: حەمد و شوکر بۆ خوا، باشم» پێغەمبەرﷺ فەرمووی: «ئائەمەم لێت گەرەك بوو، هەرکەس پرسیاری لەبارەی شتێکەوە لێ بکرێ، لەم دوو حاڵە بەدەر نییە: یان شوکر دەکات، بەمە تاعەتی خودا بەجێ دێنێ، یان گلەیی و ناشوکری دەکات، بەمە خۆی گونەهبار دەکات».

جا ئەگەر لێرە کەسێ پرسیار بکات کە شوکر بە چ مانایە؟ مەگەر شوکرانەبژێری خۆیشی یەکێ لە نیعمەتەکانی خودا نییە؟!

ئەڵێم: ئەم پرسیارەش زووتر هاتبوو بەدڵ حەزرەتی مووسا و داوودعَلَيۡهِمَاالسَّلَامْ حەزرەتی مووسا فەرمووبووی: ئەدی خودایە! ئەمن چلۆن شوکری تۆ بکەم لە کاتێکدا کە ناتوانم شوکرت بکەم مەگەر ئەوەی نیعمەتێ‌ترم پێ عەتا بفەرمووی؟!

خودای مەزن سرووشی بۆکرد: ئەگەر لەمە تێگەیشتبێتی، هەر ئەوە خۆی شوکرانەبژێرییە[1].

لە ڕیوایەتێکدا هاتووە کە خودا فەرموویەتی: ئەگەر تۆ هەر لەوە تێ بگەی کە هەموو نیعمەتێ لە منەوەیە، بە شوکر لێتی وەر دەگرم[2].

جا ئەگەر بڵێی: دیسان ئەم وڵامەت دڵنیای نەکردم، چونکە هەر ئەو تێگەیشتنەش خۆی نیعمەتێکە!

[ئەڵێم:] بزانە ئەمە کوتانی دەروازەی تەوحید و خواناسییە، چونکە خوا هەم سوپاسگوزارە هەم سپاس لێ‌کراوە، هەم عاشقە هەم مەعشووقە، هیچ شتێ نییە جگە خودا نەبێ. هەموو شت جگە خودا لەناو دەچێ، ئەمەش لە ئەزەلەوە بۆ ئەبەد ڕاستە، چونکە لە بووندا شتێ جگە خودا نییە کە بوونی بەخۆیەوە بەسرا بێ، بەڵکوو هەر ئەوە بوونی بەزاتی خۆیەوەیەتی، جگە ئەو هەموو بە ئەوەوە ڕاوەستاوە. ئەو هەمیشە هەیە و زیندووە، کەوا بوو جگە ئەوی هەمیشە زیندوو، کەسی‌تر نییە، کەواتە دەبێ هەر ئەو سپاسگوزار و سپاس لێ کراو بێ و هەر ئەو عاشق و مەعشووق بێ.

---

١. الخرائطي في شكر اللّه على نعمه: ٣٩، تفسير الدّرّ المنثور للسيوطي على آية ١٥٢ من سورة البقرة بلفظ: «... فَكَيْفَ أَشْكُرُكَ؟ قٰالَ: يٰا مُوسَىٰ! اَلْآنَ شَكَرْتَنِي».

٢. ورد بنحوه: «قٰال مُوسَىٰ: عَلَيۡهِٱلسَّلَامُ يٰارَبِّ! كَيْفَ اسْتَطٰاعَ آدَمُ أَنْ يُوَدِّيَ مٰا أَجْرَيْتَ عَلَيْهِ مِنْ نِعَمِكَ ... فَأَوْحَى اللّٰهُ إِلَيْهِ: إِنَّ آدَمَ عُلِّمَ إِنَّ ذٰلِكَ كُلُّهُ مِنِّي وَ مِنْ عِنْدِي فَذٰلِكَ شُكْرٌ» تفسير الكشف والبيان للنيسابوري في تفسير آيات ٤٩ إلى ٥٤ من سورة البقرة.

لەم ڕوانگەوە بوو کە حەبیبی کوڕی ئەبی حەبیب ئەم ئایەتەی دەخوێندەوە: ﴿إِنَّا وَجَدْنَاهُ صَابِراً نِعْمَ الْعَبْدُ إِنَّهُ أَوَّابٌ﴾[1] واتە: «بێگومان ئێمە ئەومان بە پیاوێ خۆڕاگر هاتە بەرچاو، چاك بەندەیێ بوو، بەڕاستی زۆر تەوبەکار بوو». دەیگوت: سەرم سوڕ دەمێنێ، خوداوەند خۆی دەبەخشێ و سپاسگوزاریش دەکات. مەبەستی ئەوە بوو کاتێ کە خودا خۆی پەسنی بەخشینی خۆی دەکات وەکوو ئەوە وایە خودا خۆی پەسنی خۆی بکات کەواتە خوداوەند هەم سپاسگوزارە هەم سپاس لێکراوە.

شێخ ئەبوو سەعیدی ئەبولخەیریش رَحِمَهُ اللهُ، بۆچوونی وایە کاتێ کە ئەم ئایەتەی خوێندۆتەوە: ﴿فَسَوْفَ يَأْتِي اللَّهُ بِقَوْمٍ يُحِبُّهُمْ وَيُحِبُّونَهُ﴾[2]واتە: «لە داهاتوودا خوداوەند هۆزێك دێنێ کە هەم خودا خۆشیانی گەرەکە و هەم ئەوان خودایان خۆش ئەوێ»، دەیگوت: «بە گیانم قەسەم خودا ئەوانی خۆش ئەوێ و بەڕاستی خۆشیانی ئەوێ، چونکە ئەو خۆی خۆش ئەوێ» مەبەستیشی ئەمە بوو کە خودا هەم عاشقە و هەم مەعشووقە [واتە: خوا لە چاو ئەوەی کە بەندەکانی خۆش ئەوێ عاشقە و لەچاو ئەوەوە کە بەندەکان خۆشیان ئەوێ، مەعشووقە].

ئەم باسە گرانە و ئاستی لە سەرەوەیە و لەوانەیە تەنها بە نموونەیێك کە لە ئاستی مێشکدا نەبێ، مرۆڤ لێی تێنەگات:

خۆ دەزانی کە ئەگەر نووسەرێ نووسراوەکەی خۆی خۆش بوێ، بەو مانایەیە کە خۆی خۆش ئەوێ. هەروەها پیشەسازێك ئەگەر شتومەکە دروستکراوەکەی خۆی خۆش لێ‌دێ، ئەوە هی ئەوەیە خۆی خۆش ئەوێ. باوك و دایکی ئەگەر زارۆکەکەیان خۆش ئەوێ، لەبەر ئەوەیە خۆیان خۆش ئەوێ. ئەدی هەرچی هەیە جگە لەخوا خۆی ئەوە دەسکرد و بەرهەمی خودایە، ئەگەر خۆشی بوێ بەس خۆی خۆشویستووە، ئەمەش ڕوانگەی تەوحید و خوداناسییە.

دەستەی سۆفییەکان بۆ ئەم مانایە ئاماژە دەکەن، کاتێ کە ئەڵێن: «فڵانە کەس خۆی و خەڵکی لێ فەنا بووە و بەس خودا ئەبینێ» کەچی خەڵك لەم مانایە تێناگەن و ڕەددی دەکەنەوە و ئەڵێن: یانی چی فەنا بووە، لە کاتێکدا سێبەری هەر وەك جاران درێژە، لە شەو و ڕۆژێکدا چەن قەفیز نان دەخوات. ئەوانیش بەم گێل و گەوجی خەڵکە پێ‌دەکەنن.

---

١. ص: ٤٤.

٢. المائدة: ٥٤.

یەکێ لە مەرجەکانی خواناسانیش ئەوەیە بە نەزانان پێ بکەنێ، خودا بەمە ئاماژە دەکات و دەفەرمێ: ﴿إِنَّ الَّذِينَ أَجْرَمُوا كَانُوا مِنَ الَّذِينَ آمَنُوا يَضْحَكُونَ﴾ ـ إلى قوله ـ : ﴿فَالْيَوْمَ الَّذِينَ آمَنُوا مِنَ الْكُفَّارِ يَضْحَكُونَ﴾[1]

واتە: «تاوانباران بە ئیمانداران پێ دەکەنن» ـ تا دەگاتە ـ : «کەچی ئەوڕۆ ئیمانداران بە کافران پێ‌دەکەنن».

با بگەڕێینەوە سەر باسەکەی پێشمان. ئەڵێین: شوکر، واتە: بەکارهێنانی نیعمەت لەو ڕێگەدا کە بۆی خولقێنراوە؛ نموونەکەشی بەم شێوە کە پاشایەك ئەسپێك وێڕای هەرچی پێداویستی سوارییە، بۆ یەکێ لە کوڕەکانی نارد، تا سواری ببێت؛ جا ئەگەر سواری بوو و بۆ ئەو کارەی کە پاشا ناردبووی ئەسپەکەی برد، ئەوە ئەو نیعمەتەی لە ڕێگەی خۆیدا بەکار هێناوە. بەڵام ئەگەر سواری بێت و پێی لە پاشا دوور کەوێتەوە و هەڵبێ، ئەوە کارێکی نالەبار و گەوجانەیە و ناسپاسی و سپڵەییە.

واللە أعلم بالصّواب

---

١. المطفّفین: ٢٩.

# بابەتی سی و سێهەم: ترس و هومێد (خوف و رجا)

[ئەم بابەتە لە دوو بەش پێك هاتووە:]

## [بەشی یەکەم: هومێد (رجاء)]

### [حەقێقەتی هومێد]

بزانە هومێد، حاڵ و مەقامێکە لە حاڵ و مەقاماتی ڕێبوارانی ڕێی تەریق و هۆگرانی تەسەووف. هەر سیفەتێ تا کاتێ هەڵگری ئەوە بێ کە لابچێ و نەمێنێ، پێی دەڵێن: حاڵ، بەڵام هەرکات وای لێهات کە نەگۆڕێ و لانەچێ، ئەودەم پێ ئەڵێن: مەقام.

جا ئەڵێن: هەرکاتێ ئەو شتەی کە چاوەڕوانیی ئەکەین، ئەگەر لەوانە بێ کە دڵ بۆی بە پەرۆش بێ، ئەوە پێی دەڵێن: ترس و خەوف. ئەگەریش لەوانە بێ کە دڵ پێی بگەشێتەوە و شاد بێ، پێی دەڵێن: هومێد و ڕەجا. کەوابوو هومێد بریتییە لە شاد و بە کەیفبوونی دڵ لە هەمبەر چاوەڕوانی ئەوەی کە خۆشی ویستوون. بەڵام ئەبێ وریای ئەوە بێ کە ئەگەر بۆ گەیشتن بە خۆشەویستەکەی هۆکار ببێ و زۆرینەی زۆری نیشانە و هۆیەکانی هاتبێتەجێ و ئامادەکاری بۆ کردبێ، ئەو کاتە ئەتوانین ناوی بنێین: هومێد. بەڵام ئەگەر لە خۆڕا چاوەڕوان بێ، بەبێ ئەوەی هـۆکاری ببێ و ئامادەکاری بۆ کردبێ، ئەوە نێوی: خـۆفریودان و کڵاو لەسەرخۆنانە.

ئەگەریش هەردوو لایەنەکە هاوچەشن بوون؛ چ بەجێ هاتنی هۆ و نیشانەکان، چ بەجێ نەهاتنیان ئەوە نێوی: ئاواتەخوازی بۆی گونجاوترە.

ئەهلی دڵ و گەورە پیاوانی تەسەووف وەها ڕوونیان کردۆتەوە: دنیا کێڵگەی دوارۆژە و دڵیش وەکوو جارێك وایە و ئیمان تۆوە، تاعەت و خواپەرستیش ئاو دێریکردن و شێف و وەرددان و کووت لێدانیەتی.

هەروەها دڵێك کە لە دنیاپەرستیدا ڕۆچووبێ، وەکوو زەمینێکی قاقڕ و ڕەققانیە کە هیچی لێ شین نابێ و تۆوی تێدا سەوز نابێ. ئەدی ڕۆژی قیامەتیش ڕۆژی دروێنەیە و هەرکەس هەرچی داوەشاندبێ ئەوە درووێنە دەکات. حاسڵیش تەنها لە تۆوی ئیمانەوە دەڕوێ. زۆر کەم ڕێ دەکەوێ کە ئیمان لە دڵی پیس و ئاکار خراپدا، بڕوێت هەر وەك چۆن توو لە زەمینی قاقڕ و ڕەققانیدا قەت ناڕوێ.

کەوابوو هەرکەس هۆکارەکانی دابین کرد: زەمینی شیرەدار و چاك، ئاو، کووت، بژارکردن، ـ هەروەك باسمان کرد ـ جا تۆوی چاکی تێدا بچێنێ، پاشان چاوەڕوانی درووێنەکردن بێ و لە خودا بپاڕێتەوە کە خودای مەزن لە ئافەت و بەڵای لابدا، ئەم چاوەڕوانییە شیاوی ئەوەیە کە نێوی بنێن: هومێدەواری. بەڵام ئەگەر توو لە زەمینێکی وشك و ڕەق و تەقدا بچێنێ کە ئاویشی نەبێ، بەم حاڵەوە چاوەڕوان خەرمانی پڕ بێ، ئەمە بێگومان نێو دەنرێ: خۆفریودان و خۆ دەسخرەکردن. ئەگەریش تۆو لە زەمینێکی شیرەدار و چاك بچێنێ، بەڵام ئاو نەبێ تا ئاودێری بکات و بەهیوای باران بێ ئەوە پێی دەڵێن: ئاواتەخوازی.

بەم چەشنە بۆت ڕوون بووەوە کە هەرکەس تۆوی ئیمان لە دڵیدا بچێنێ و بە ئاوی تاعەت و عیبادەت ئاودێری بکات و لە پیسی و گوناح خاوێن و بژاری بکات، ـ هەروەك چۆن زەمین لە دڕك و داڵ و بەرد خاوێن دەکرێتەوە ـ ئەوە ئەو دەمە بۆی هەیە هومێدەوار بێ. بەڵام ئەگەر کەسێ ئەم ئامادەکارییانەی لە دڵیدا نەکردبێ ئەوە یان ئاواتەخوازی دەکات، یان خۆی دەسخرە دەکات.

پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «اَلْكَيِّسُ مَنْ دٰانَ نَفْسَهُ وَ عَمِلَ لِمٰا بَعْدَ الْمَوْتِ وَ الْأَحْمَقُ مَنِ اتَّبَعَ نَفْسَهُ هَوٰاهٰا وَ تَمَنَّىٰ عَلَى اللهِ الْأَمٰانِيَّ»[1].

واتە: «مرۆڤی زیرەك و وریا کەسێکە کە نەفسی سەرکەشی خۆی ماڵیی و ڕام بکات و بۆ دوارۆژ هەوڵ بدات، بەڵام گێل و سووك عەقڵ کەسێکە کە نەفسی شوێنی هەوەسی بخات و بەو حاڵە شەوە ئاواتەخوازی خوداش بێت».

١. ترمذی: ٢٣٨٣، ابن‌ماجه: ٤٢٥٠، احمد: ١٦٥٠١ جمیعهم بلفظ: «... وَالْعٰاجِزُ مَنْ أَتْبَعَ ...».

خوای مەزنیش سەبارەت بەم چەشنە کەسانە فەرموویەتی: ﴿فَخَلَفَ مِنْ بَعْدِهِمْ خَلْفٌ وَرِثُوا الْكِتَابَ يَأْخُذُونَ عَرَضَ هٰذَا الْأَدْنَىٰ وَ يَقُولُونَ سَيُغْفَرُ لَنَا﴾[1].

واتە: «پاش ئەوان جێگرانێ نالەبار جێگەیان گرتەوە کە تەوراتیان بە میرات بردبوو (کەچی هیچ کردەوەیێکیان بەپێی ئەو کتێبە ئەنجام نەدابوو)، کاڵا و کووتاڵی ئەم دنیا پەستەیان دەس دەخست و دەیانگوت: خوا لێمان خۆش دەبێ». خودای مەزن ڕوونی کردۆتەوە بۆمان کە ئەم جۆرە هومێد و چاوەنۆڕییە بێهوودەیە مادامێ شتێکت پێش‌دەست نەخستبێ.

ئەو حەدیسەی پێغەمبەریش ﷺ کە لە "زەیدی خەیلە"وە ڕیوایەت کراوە کە گوتوویە بە پێغەمبەر ﷺ هاتووم سەبارەت بە نیشانەی خودا هەم لەو کەسانەدا کە خودا خۆشیانی ئەوێ و هەم لەوانەی کە خۆشیانی ناوێ، پرسیار بکەم. فەرمووی: «كَيْفَ أَصْبَحْتَ؟» واتە: «چلۆن ڕۆژت کردەوە؟» گوتی: خۆم کاتێ سبەینان هەڵدەستم سەرنجی کاری چاکە و هەروەها سەرنجی ئەو کەسانە دەدەم کە کاری چاکە دەکەن، جا ئەگەر تواناییم هەبوو کاری چاکە بکەم بە پەلە دەچم دەیکەم و دڵنیاشم پاداشتی بۆم هەیە، ئەگەریش ئەو خێر و چاکانەم لەدەس دەربچێ، دڵم پڕ دەبێ و خەفەتی بۆ دەخۆم.

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: «هٰذا عَلامَةُ اللهِ فِيمَنْ يُرِيدُ وَ لَوْ أَرادَكَ لِلْأُخْرَىٰ هَيَّأَكَ لَها ثُمَّ لا يُبالِي فِي أَيِّ وادٍ مِنْ أَوْدِيَتِها هَلَكْتَ»[2].

واتە: «ئەمە نیشانەی خوایە بەسەر کەسانێکەوە کە خۆشیانی ئەوێ، بەڵام ئەگەر جۆرێکی تری (خراپەی) بۆت بویستایە، ئەوە ئامادەی دەکردی بۆی، ئیتر پاشان کاری بەسەر کارتەوە نەبوو لەچ شیوێ لە شیوەکانیدا، قڕت دەکرد».

پێغەمبەر ﷺ لێرەدا باسی نیشانەی ئەو جۆرە کەســانەی کردووە کە خودا خۆشی ویستوون و بۆیان هەیە چاوەنۆڕ و هومێدەوار بن.

---

١. الأعراف: ١٦٩.

٢. طبرانی فی الکبیر: ١٠٣١٢، معرفة الصّحابة لأبی‌نعیم الأصبهانی: ٢٦٥٩، کنز العمال للهندی: ٣٠٨٠٩ بألفاظ مختلفة منها ما جاء فی أواخره: «...ثُمَّ لَمْ يُبالِ فِي أَيِّ وادٍ سَلَكْتَ» و فی روایة: «هَلَكْتَ».

## خێرو چاکەی هومێدەواری

دیارە ئەگەر کردەوە بە هومێدەوە ئەنجام بدرێ زۆر چاکترە لەوەی لە ترسان بکرێ، چونکە نزیکترین بەندە بەخواوە ئەوەیانە کە زۆرتر خودای خۆش بوێ، ئەو خۆشەویستییەش بە هومێدەواری زیادتر دەبێ. هومێد و چاوەنۆڕی هۆی نزیکی و خۆشەویستی زیاد کردنن، بە پێچەوانەوە ترس و خۆف هۆی هەلاتنن.

پێغەمبەرﷺ بەمە ئاماژە دەکات و دەفەرمێ: «لا يَمُوتُ أَحَدُكُمْ إِلَّا وَ هُوَ يُحْسِنُ الظَّنَّ بِاللّٰهِ»[1] واتە: «کەستان نەمرێ مەگەر کاتێك کە گومانی چاکتان بەخودا هەبێ (واتە: هومێدی بەخشینیتان هەبێ))».

پێغەمبەرﷺ سەردانی پیاوێکی کرد کە لە سەرەمەرگدا بوو، پێی فەرموو: «كَيْفَ تَجِدُكَ فَقَالَ: أَجِدُنِي أَخَافُ ذُنُوبِي وَ أَرْجُو رَحْمَةَ رَبِّي» واتە: «لەچ حاڵێکدا دەتبینم؟، گوتی: خۆم لە حاڵێکدا دەبینم کە لە گوناحانم دەترسم و بە بەزەیی و ڕەحمی پەروەردگارم هومێدەوارم».

پێغەمبەرﷺ پێی فەرموو: «مَا اجْتَمَعَا فِي قَلْبِ عَبْدٍ فِي هٰذَا الْمَوْطِنِ إِلَّا أَعْطَاهُ اللّٰهُ تَعَالَىٰ مَا يَرْجُو وَ آمَنَهُ مِمَّا يَخَافُ»[2] واتە: «ئەم دوو حاڵەتە (هومێد و ترس) لەم کاتەدا (گیانکەنشت) لە دڵی هیچ بەندەیەکدا کۆ نابێتەوە مەگەر ئەوەی کە خودا ئەوەی وا پێی هومێدەوارە پێی دەدات و لەوەی وا لێی دەترسێ دەیپارێزێ».

## دەرمانی هومێدەواری (رجاء)

دیارە هەرکەس هەستی ناهومێدی بە سەریدا زاڵ ببێ، بەجۆرێ هیوابڕ بێ لە ڕەحمی خودا، یان ترسێ بەسەریدا زاڵ ببێ کە لەخۆی و بنەماڵە و دەور و بەری زەرەر بدات، ئەوە بێگومان پێویستی بە دەرمان و چارەسەر هەیە.

بەڵام کەسێ کە ئاوات و ئارەزووی دونیایی بەسەریدا زاڵ ببێ، ئەوە بەو حاڵەوە هومێدەواری بۆی سەمی کوشندەیە. هەروەك چۆن هەنگوێن بۆ کەسی سەرما بردوو چاکە و شیفای پێوەیە،

---

١. « ... لا يَمُوتَنَّ ... » مسلم: ٥١٢٥، ابن‌ماجه: ٤١٥٧، احمد: ١٤٠٥٣، ابوداود: ٢٧٠٦.

ترمذی: ٩٠٥، ابن‌ماجه: ٤٢٥١. ٢.

ئەگەر گەرما بردووێ بیخوات، دەسبەجێ دەیکوژێ. هەرکەسیش تاوانی زۆر بکات و بەو حاڵەشەوە دڵنیا و ئاواتەخوازی ڕەحمی خودا بێ، ئەوە ئەبێ بەو شتانەی کە ترس دەخەنە دڵیەوە چارەسەری بکرێ.

حەزرەتی عەلیرَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ فەرموویەتی: زانای ڕاستەقینە ئەو کەسەیە کە خەڵك لە ڕەحم و بەزەیی خودا ناهومێد نەکات و لە فێڵ و مەکری خوداش دڵنیایان نەکات[1]. جا لەم سۆنگەوە، کە زانایان میراتبەری پێغەمبەرانن، هەر ئەوانیشن دۆکتۆری دەروون و دڵان و دەزانن بۆ هەر نەخوشێ چی بنوێنن و چ دەرمان و دەوایێ بۆ زیادکردنی هومێد و ڕجا کارسازە، [بۆ وێنە] سەیری ئەمە بکات و تێیدا ڕابمێنێ کە چلۆن خودای مەزن نیعمەتی لەش‌ساغی و ئەندام ساغی پێ عەتا فەرمووە، پاشان پێغەمبەرانی پەیتا پەیتا بۆ ڕێنوێنی هەناردووە، پاشان خۆراك و نان و خوان و دەوا و دەرمانی بۆ بژیو و سەلامەتی ناردووە.

لەو ڕێگە چارانەی کە هومێد لە دەرووندا زیاد دەکەن، ئەوەیە کە خودا فەرموویەتی: ﴿قُلْ يٰا عِبٰادِيَ الَّذِينَ أَسْرَفُوا عَلَىٰ أَنْفُسِهِمْ لا تَقْنَطُوا مِنْ رَحْمَةِ اللّٰهِ، إِنَّ اللّٰهَ يَغْفِرُ الذُّنُوبَ جَمِيعاً﴾.[2]

واتە: «(ئەی پێغەمبەر) بڵێ: ئەی ئەو بەندانەی کە سەبارەت بە خۆتان تاوانی زۆرتان کردووە، لە بەزەیی خودا ناهومێد مەبن، بێ‌شك خوداوەند هەموو تاوانەکان دەبەخشێ».

خودای مەزن فەرموویەتی: ﴿وَ الْمَلائِكَةُ يُسَبِّحُونَ بِحَمْدِ رَبِّهِمْ وَ يَسْتَغْفِرُونَ لِمَنْ فِي الْأَرْضِ﴾[3] واتە: «فریشتەکان پەسن و ستایشی پەروەردگاریان دەکەن و خوازیاری لێبوردنن بۆ سەرجەمی ئەوانەی لە زەمینداناند».

خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿لَهُمْ مِنْ فَوْقِهِمْ ظُلَلٌ مِنَ النّٰارِ وَ مِنْ تَحْتِهِم ظُلَلٌ ذٰلِكَ يُخَوِّفُ اللّٰهُ بِهِ عِبٰادَهُ يا عِبٰادِ فَاتَّقُونِ﴾[4].

---

١. ابوداود فی الزّهد: ١٠٤، الفقيه و المتفقّه للخطيب البغدادی: ١٠٥٦، جامع الأصول لابن‌الأثير: ٨٤٧٨، جامع الكبير للسيوطی: ٢٠٧، حرف الهمزة جميعهم بلفظ: «أَلَا أُنَبِّئُكُمْ بِالْفَقِيهِ حَقِّ الْفِقْهِ؟ مَنْ لَمْ يَقْنَطِ النّٰاسَ مِنْ رَحْمَةِ اللّٰهِ وَ لَمْ يَرْخَصْ لَهُمْ فِي مَعٰاصِي الله وَ لَمْ يُؤْمَنْهُمْ مِنْ مَكْرَ اللّٰهِ وَ لَمْ يَتْرُكِ الْقُرْآنَ إِلَىٰ غَيْرِهِ، أَلا لا خَيْرَ فِي عِبٰادَةٍ لَيْسَ فِيهٰا تَفَقُّهٌ وَلا خَيْرَ فِي فِقْهٍ لَيْسَ فِيهِ تَفَهُّمٌ وَلا خَيْرَ فِي قِرٰاءَةٍ لَيْسَ فِيهٰا تَدَبُّرٌ».

٢. الزمر: ٥٣. ٣. الشوری: ٥. ٤. الزمر: ١٦.

واتە: «ئەو کەسانەی کە لەسەر و ژێریانەوە ئاور چەتری بەستووە، خودا بەمە بەندەکانی دەترسێنێ، ئەی بەندەکانم ترسی منتان لە دڵا بێ» واتە: خودا تەنها بەم ئاورە بەندە ئیماندارەکانی چاوترسێن دەکات، دەنا بۆ کافرەکان ئامادە کراوە.

ئەبوو مووسای ئەشعەری رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فەرموویەتی: «أُمَّتِي أُمَّةٌ مَرْحُومَةٌ لا عَذابَ عَلَيْها فِي الْآخِرَةِ»[1].

واتە: «ئوممەتی من ئوممەتێکی بەخشراوە، لەدوارۆژدا هیچ عەزابێکی لەسەر نییە». لەم بوارەدا هێندە ئایەت و حەدیس زۆرە کە لە ئەژماردن نایە.

لە حەدیسێکی درێژدا کە ئەنەس رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ ڕیوایەتی کردووە، هاتووە: عەرەبێکی دەشتەکی بە پێغەمبەری صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ گوت: ئەی نێردراوی خودا! کێ لە ڕۆژی قیامەتدا سەرپەرشتی حیسێب و کیتێبی مەخلووقات دەکات؟ پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وڵامی دایەوە: «اللهُ عَزَّوَجَلَّ» واتە: «خودای گەورە ومەزن». گوتی: هـەر خـۆی؟! پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فەرمووی: بەڵێ. کابرای دەشتەکی زەردە خەنەیێك کەوتە سەر لێوی.

پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فەرمووی: «مِمَّ ضَحَكْتَ يا أَعْرابِيّ؟!» واتە: «بەچی پێ‌کەنیت ئەی کابرای دەشتەکی؟»

گوتی: کەسێ چاك و خاوەن‌کەرەم بێ، هەرکاتێ دەسەڵاتی ببێ دەبەخشێ و هەرکاتێ حسێب و کتێب بکات، چاوپۆشی دەکات.

پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فەرمووی: «صَدَقَ الْأَعْرابِيُّ أَلا وَلا كَرِيمَ أَكْرَمُ مِنَ اللهِ تَعَالَىٰ، وَ هُوَ أَكْرَمُ الْأَكْرَمِينَ». واتە: «ئەم عەرەبە دەشتەکییە ڕاست دەکات، چونکە هیچ خاوەن کەرەمێك لە خودا چاکتر نییە، ئەو بەرێزترینی بەرێزانە».

پاشان فەرمووی: «قَالَ اللهُ تَعَالَىٰ "سَبَقَتْ رَحْمَتِي غَضَبِي"»[2]. واتە: «خودا فەرموویەتی: ڕەحمم ها لە پێش تووڕەییمەوە».

---

١. ابوداود: ٣٧٣٠، احمد: ١٨٨٤٧ ـ ١٨٩١٧.

٢. بخاری: ٦٨٧٢ ـ ٦٨٩٩ ـ ٦٩٩٨ ـ ٦٩٩٩، مسلم: ٤٩٤٠، ابن‌ماجە: ١٨٥، احمد: ٦٩٩٨ ـ ٧١٨٧ ـ ٨٦٠١ ـ ٨٧٩٤ ـ ٩٦٣٣.

## بەشی دووهەم: ترس و خۆف

### [حەقێقەتی ترس]

بزانە هومێد و ترس جڵەوکێشی ئەو کەسانەن کە نەگەیشتوونەتە ئەو پلەیە کە ڕوخساری جوانی خودا بۆ دڵیان دەرکەوتبێ، چونکە هەرکەس ئەو جوانییە بەدڵ ببینێ لەو دوو حاڵەتی هومێد و ترسە دەپەڕێتەوە. "واسیتی" بەمە ئاماژە دەکات کە دەفەرمێ: «ترس پەردەیێکە لە نێوان بەندە و خودادا»، هەروەها گوتوویە: «هەرکاتێ خودا بۆ دڵ و دەروون دەرکەوێ ئیدی شتانی بچووکی تێدا نامێنێ؛ نە هیوا، نە ترس»[1].

بە کورتی هەرکاتێ عاشق بە خۆشەویستەکەی بگات، ئیدی ترسی دووری و دڵەڕاوکێی جودابوونەوە تەنها خۆشیی ویسال و پێك‌گەشتنەکەی لێ تاڵ دەکات و هیچی دی لێ ناکەوێتەوە.

ئێستا ئێمە تەنها باسی پلە سەرەتاییەکان دەکەین، ئەڵێین: چارەی ترس کەوتنە دڵەوە ئەوەیە کە سەیر و تێڕامانی ئەو ئایەت و حەدیسانە بکات کە لەبارەی سەختیی ئەشکەنجە و جەزرەبە و تووشیی حیسێب و کتێبەوە هاتوون. دیسان هاوکات سەیری خۆیشی لە ئاست گەورەیی و مەزنی خوداوە بکات، ئەو فەرموودە [بێ‌باکانەی] خودا کە فەرموویەتی:

﴿هٰؤُلاءِ فِي الْجَنَّةِ وَلا أُبَالِي، وَهٰؤُلاءِ فِي النَّارِ وَلا أُبَالِي﴾[2] واتە: «ئەو چینە لە بەهەشتدان و ئەمن گوێ نادەم، ئەم چینەش لەنێو دۆزەخدان و ئەمن گوێ نادەم».

هەروەها سەرنجی ئەوەش بدا کە ئەم بەهۆی خراپە و تاوان و بەجێ نەهێنانی دەستووراتی خودا و تووشی حەرامبوون، شیاوی ئەوەیە بەر تووڕەی و غەزەبی خودا بکەوێ.

خودای مەزن ئەگەر بە جارێك تەواوی عالەم قڕ تێ‌بخات و کاولی بکات، بۆی گیرنگ نییە، ئەدی عەزاب و ئەشکەنجەی ئەم بەندە هەژار و بێ‌دەسەڵاتە بۆ ئەو چییە؟!

کە وایە ئەبێ وریا بێ و ترسی خودای هەبێ، چونکە خودا بێ‌باکە و هیچ شتێ بۆی گیرنگ نییە.

---

١. طبقات الصوفيّة لأبي‌عبدالرّحمن السلمي: ٩٠/١.

٢. احمد: ١٧٠٠٠، طبراني في الكبير: ١٦٥٧، ابن‌حبان في صحيحه: ٣٣٩.

لەم ڕووەوەیە کە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «أَنَا أَعْلَمُكُمْ بِاللهِ وَ أَخْشَاكُمْ لِلّٰهِ»[1]. واتە: «ئەمن لە هەمووتان چاکتر خودا دەناسم و زۆرتر لە هەمووتان لێی دەترسم».

خودای گەورە وەحیی ناردۆتە سەر داوودعليه السلام: «ئەی داوود! لێم بترسە هەروەك چۆن ترسی حەیوانی دڕندەت لە دڵدایە» جانەوەری دڕندەش تایبەتمەندی ئەوەیە کە سك دەدڕێت و گوێ نادات.

پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «مَنْ خَافَ مِنَ اللهِ خَافَهُ كُلُّ شَيْءٍ وَ مَنْ خَافَ غَيْرَ اللهِ خَافَ مِنْ كُلِّ شَيْءٍ»[2] واتە: «هەرکەس لە خودا بترسێ، هەموو شت لێی دەترسن، هەرکەسیش لە غەیری خودا بترسێ، ئەوە لە هەموو شت دەترسێ».

حەزرەتی عائیشەرضي الله عنها فەرموویەتی: گوتم ئەی پێغەمبەری خودا! مەبەستی ئەم ئایە: ﴿الَّذِينَ يُؤْتُونَ مَا آتَوْا وَ قُلُوبُهُمْ وَجِلَةٌ﴾[3] ئەو کەسانەیە کە زینا دەکەن و دزن؟

فەرمووی: «لا، بَلِ الرَّجُلُ يَصُومُ وَ يُصَلِّي وَ يَتَصَدَّقُ وَ يَخَافُ أَنْ لا يُقْبَلَ مِنْهُ»[4]. واتە: «نا، نەخێر. بەڵکوو مەبەست ئەو پیاوەیە کە نوێژ دەخوێنێ و ڕۆژوو دەگرێ و خێرات دەکات، وێڕای ئەوە ترسی هەیە کە لێی قەبووڵ نەکرێ».

پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «مَا مِنْ عَبْدٍ مُؤْمِنٍ يَخْرُجُ مِنْ عَيْنِهِ دُمُوعٌ وَ إِنْ كَانَتْ مِثْلَ رَأْسِ الذُّبَابِ، مِنْ خَشْيَةِ اللهِ تَعَالَىٰ ثُمَّ تُصِيبُ شَيْئاً مِنْ حَرِّ وَجْهِهِ إِلَّا حَرَّمَهُ اللهُ عَلَى النَّارِ»[5].

واتە: «هەر بەندەیێك ئیماندار لە ترسی خودا فرمێسك لە چاوانی بێتەخوار - هەرچەندەش بەقەدەر سەری مێشێکیش بێ - پاشان بتلێ بە ڕوومەتی گەرمیەوە، ئەوە بێشك خودا ئاگری دۆزەخی لێ حەرام دەکات».

---

١. احمد: ٢٣٧٦٥ بلفظ: «وَاللهِ أَنَا لَأَعْلَمُكُمْ ...»، مسلم: ١٨٦ بلفظ: «وَاللهِ إِنِّي لَأَرْجُو أَنْ أَكُونَ أَخْشَاكُمْ لِلّٰهِ وَ أَعْلَمَكُمْ بِمَا أَتَّقِي»، مالك في الموطأ: ٥٦٤، احمد: ٢٣٢٤٩ ـ ٢٤٠٦٩، نسائی فی السنن الکبری: ٣٠٢٥، الشافعی فی مسنده: ٤٤٢.

٢. بیهقی فی شعب الإیمان: ٩٤٣ ـ ٩٤٦، الشهاب القضاعی فی مسنده: ٤٠٩، سیوطی فی جامع الکبیر: ٤٨٤٣، حرف المیم.

٣. المؤمنون: ٦٠. واتە: ئەو کەسانەی کە کارانێك دەکەن و دڵەڕاوکێیانە ـ وەرگێر.

٤. ترمذی: ٣٠٩٩، ابن‌ماجە: ٤١٨٨، احمد: ٢٤١٠٢ ـ ٢٤٥٢٣ جمیعهم بألفاظ مختلفة.

٥. ابن‌ماجە: ٤١٨٧ بلفظە، و کذا بیهقی فی شعب الإیمان: ٧٨١، لکن أخرج: طبرانی فی الکبیر: ٩٦٧٨ دون قوله: «ثُمَّ تُصِيبُ شَيْئًا مِنْ حَرِّ وَجْهِهِ» و ابی‌حاتم الرّازی فی الزّهد: ١٧.

## ترس و خۆفی پێغەمبەران

حەزرەتی عائیشە رَضِيَ اللهُ عَنْهَا ڕیوایەتی کردووە کە پێغەمبەری خودا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ هەرکاتێ هەوا بگۆڕایە و با بهاتایە، ڕەنگی تێك دەچوو و لە ناو ماڵەکەدا دەستی بە هاتوچۆ دەکرد، دەچووە دەرەوە و دەهاتە ماڵەوە، هەمووی ئەم ترس و دڵەڕاوکێیانەی لە ترسی عەزاب و بەڵای خودا بوو[1]، پاشان چەند ئایەتێکی لە سوورەتی "حاقە"ی دەخوێندەوە و دەستبەجێ لەسەر خۆی دەچوو[2].

خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَ خَرَّ مُوسَىٰ صَعِقاً﴾[3] واتە: «مووسا لەسەرخۆی چوو و دەمەوڕوو کەوت».

پێغەمبەری خودا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ جوبرەئیلی چاو پێ‌کەوتبوو لە "ئەبتەح"دا، دەست بەجێ لەهۆش چوو بوو[4].

پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فەرموویەتی: «مٰا جٰاءَنِي جِبْرِيلُ قَطُّ إِلّٰا وَ هُوَ يَرْعَدُ فَرَقاً مِنَ الْجَبّٰارِ»[5] واتە: «هەرکات جوبرەئیل دەهات بۆلام لە ترسی خودا دەلەرزی».

دەڵێن: کاتێ ئەو کارەساتە تووشی شەیتان بوو، جوبرەئیل و میکائیل ـ دروودی خودایان لەسەر ـ دەستیان کرد بە گریان، خودای گەورەش پێیانی فەرموو کە بۆچ هێندە دەگرین؟! گوتیان: پەروەردگارا! ئێمە لە غەزەب و مەکری تۆ پارێزراو نین. خوداش فەرمووی: ئەدی

١. مسلم: ١٤٩٥ ـ ١٤٩٦ و لفظه: «إِذٰا كٰانَ يَوْمُ الرِّيحِ وَالْغَيْمِ عُرِفَ ذٰلِكَ فِي وَجْهِهِ وَ أَقْبَلَ وَ أَدْبَرَ فَإِذٰا مَطَرَتْ سُرَّ بِهِ ... فَقٰالَ: إِنِّي خَشِيتُ أَنْ يَكُونَ عَذٰاباً سُلِّطَ عَلَىٰ أُمَّتِي ...»، احمد: ١٢١٥٩ ـ ٢٣٧٤٧ و لفظه: «إِذٰا رَأَى الرِّيحَ قَدِ اشْتَدَّتْ تَغَيَّرَ وَجْهُهُ».

٢. المعروف فيما يروى من هذه القصّة: «أَنَّ رَسُولَ اللّٰهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ سَمِعَ رَجُلاً يَقْرَأُ: إِنَّ لَدَيْنٰا أَنْكٰالاً وَ جَحِيماً وَ طَعٰاماً ذٰا غُصَّةٍ وَ عَذٰاباً أَلِيماً فَصَعِقَ» بيهقى فى شعب الإيمان: ٨٨٩، احمد فى الزّهد: ١٤٩.

٣. الأعراف: ١٤٣.

٤. «سَأَلَ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ جِبْرِيلَ أَنْ يَرٰاهُ فِي صُورَتِهِ فَقٰالَ: اُدْعُ رَبَّكَ، قٰالَ: فَدَعٰا رَبَّهُ، قٰالَ: فَطَلَعَ عَلَيْهِ سَوٰادٌ مِنْ قِبَلِ الْمَشْرِقِ، قٰالَ: فَجَعَلَ يَرْتَفِعُ وَ يَنْتَشِرُ، قٰالَ: فَلَمّٰا رَآهُ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ صَعِقَ، فَأَتٰاهُ وَ فَنَعَشَهُ وَ مَسَحَ الْبُذٰاقَ عَنْ شِدْقَيْهِ» احمد: ٢٨١٢، طبرانى فى الكبير: ١٠٨٧٠.

٥. لم نجده بهذا اللّفظ، لكن ورد بلفظ: «إِنَّ جِبْرِيلَ يَوْمَ الْقِيٰامَةِ لَقٰائِمٌ بَيْنَ يَدَيِ الْجَبّٰارِ تَبٰارَكَ وَ تَعٰالَىٰ تَرْعَدُ فَرٰائِصُهُ فَرَقاً مِنْ عَذٰابِ اللّٰهِ ...» ابوالشّيخ الأصبهانى فى العظمة: ٣٥٦.

هەر ئاوەها ترس لە دڵ بن[1].

ئەبوودەرداڕەزیاللەعەنهو گوتوویە: ئیبراهیمعەلەیهیسسەلام کاتێ نوێژی دەکرد زریکەی دڵی لە میلێ ئەولاترەوە لە ترسی خودا دەبیسترا[2].

"موجاهید"ڕەزیاللەعەنهو گوتوویە: داوودعەلەیهیسسەلام چل ڕۆژ لە سوژدەدا دەگریا و سەری لە سوژدە بەرز نەئەکردەوە تا لە فرمێسکەکانیەوە گیا سەوز دەبوون و سەری دادەپۆشی. خزم و خوێش بانگیان لێ دەکرد: ئەی داوود ئەوە برسیتە، تا نانت بۆ بهێنین؟ یان تینووتە، تا ئاوت بۆ بهێنین؟ یان ڕووتیت، تا کراست بۆ بهێنین؟

داوودعەلەیهیسسەلام هەناسەیێکی هەڵکێشاو شیوەنێکی بەرپا کرد، بەجۆرێ پووشی دەورو بەری لە گەرمای دەروونیەوە گڕی تێ بەربوو، پاشان خوا تەوبەی لێ وەرگرت و لێی خۆش بوو. پاشان فەرمووی: خوایە! تاوانەکانم لە نێو مشتمدا پیشان بدە، خوداش کارێکی کرد کە تاوانەکانی لەنێو مشتیدا نووسران، ئیدی لەو ساتەوە داوود هەرکە دەستی بۆ خواردن و خواردنەوە و کارەکانی‌تر ئاوەڵا دەکرد چاوی پێیان دەکەوت و دەسبەجێ دەستی بەگریان دەکرد[3].

دەڵێن: جارێ سێیەکی پەرداخێ ئاویان بۆ هانی، هەرکە نای بەسەریەوە بیخواتەوە چاوی بە گوناحەکانی لەنێو مشتیدا کەوت، هێندە گریا تا پەرداخەکەی پڕ کرد لە فرمێسك[4].

دەگێڕنەوە کە داوودعەلەیهیسسەلام هەرکاتێ سەری بۆ ئاسمان بەرز دەکردەوە، وەختبوو لە شەرمی خودا بمرێ[5].

---

١. « ... هٰكَذٰا فَافْعَلا فَإِنَّهُ لا يَأْمَنُ مَكْرِي إِلَّا كُلُّ خاسِرٍ» ابوالشّيخ الأصبهانى فى العظمة: ٣٧٦.

٢. لم نعثر عليه بلفظه، لكن ورد بنحوه فى النّبىّصلى‌الله‌عليه‌وسلم: «عَنْ مُطَرِّفٍ عَنْ أَبِيهِ قالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللّٰهِصلى‌الله‌عليه‌وسلم يُصَلِّيْ وَ فِي صَدْرِهِ أَزِيزٌ كَأَزِيزِ الرَّحَىٰ مِنَ الْبُكٰاءِ» ابوداود: ٧٦٩، و فى رواية: « ... وَ لِجَوْفِهِ أَزِيزٌ كَأَزِيزِ الْمِرْجَلِ يَعْنِيْ يَبْكِي» نسائى: ١١٩٩، احمد: ١٥٧٢٢ ـ ١٥٧٢٧ ـ ١٥٧٣٥.

٣. مؤيّد لهذا قوله تعالى: ﴿وَ ظَنَّ دٰاوُدُ أَنَّمٰا فَتَنّٰاهُ فَاسْتَغْفَرَ رَبَّهُ وَ خَرَّ رٰاكِعاً وَ أَنٰابَ﴾ ص: ٢٤. تفسير الطّبرى على آية ٢٥ من سورة ص، هكذا تفسير ابن‌كثير و تفسير البغوى و تفسير روح المعانى للآلوسى و تفسير الكشّاف للزمخشرى و تفسير الدّرّ المنثور للسيوطى و الأحكام الجامع للقرطبى و زاد المسير لابن‌الجوزى و... و بعض لفظه: «لَمّٰا أَصٰابَ دٰاوُدُ الْخَطِيئَةَ ... خَرَّ سٰاجِداً أَرْبَعِينَ لَيْلَةً ... حَتَّىٰ نَبَتَ الْمَرْعَىٰ مِنْ دُمُوعِ عَيْنَيْهِ ... » ابن‌ابى‌شيبه فى مصنفه: ٤٦٤/٧، ابن‌السّرّى فى الزّهد: ٤٤٨، ابن‌المبارك فى الزّهد والرّقائق: ٤٦٨ ـ ٤٦٥ ـ ٤٦٦ و فى رواية: «حَتَّىٰ نَبَتَ الْبَقْلُ» و فى رواية: «حَتَّىٰ نَبَتَ الزَّرْعُ أَوِ الْعَشَبِ» بروايات مختلفة.

٤. «لَيُؤْتِي بِالْقَدَحِ ثُلُثٰاهُ مٰاءٌ فَإِذٰا تَنٰاوَلَهُ أَبْصَرَ خَطِيئَتَهُ ... » ابن‌المبارك فى الزّهد والرّقائق: ٤٦٨.

٥. ابن‌المبارك فى الزّهد والرّقائق: ٤٦٩، محمد بن نصر المروزى فى تعظيم الصّلاة: ٧٤٩.

لە موناجات و دۆعاکانیدا دەیفەرموو: خودایە! هەرکاتێ بیر لە گوناحانم دەکەمەوە، عەرزێ بەم پانییەم لێ تەنگ ئەبێ، هەرکاتێکیش بیر لە بەزەیی و ڕەحمی تۆ دەکەمەوە ڕۆحم بۆ جەستەم دەگەڕێتەوە. پاك و خاوێنی لە عەیب خودایە! ئەمن چووم بۆلای هەرچی دۆکتۆرە لەنێو بەندەکانتا، تا چارەسەری گوناحەکانم بکەن، هەموویان بۆلای تۆم دەنێرن. ئەدی قوڕ بەسەر ئەو کەسانەی کە لە ڕەحمەتی تۆ بێبەرین[1].

"فوزەیل" رَحِمَهُ‌اللَّهُ گوتوویە: بیستوومە کە داوودعَلَيْهِ‌السَّلَامُ ڕۆژێکیان گوناحێکی کەوتەوە بیر، کوتوپڕ هۆشی لە خۆی بڕا و دەستی لەسەری دانا و بە هەڵتەك و داتەك تا بن کێوەکان ڕۆیشت. جانەوەرە دڕندەکان لە دەوری خڕبوونەوە، فەرمووی: وەرگەڕێن ئەمن ئێوەم ناوێ، ئەمن بەس کەسێکم دەوێ کە بۆ تاوانەکانی زۆر بگری، جگە ئەوەی کە دەگری با کەس ڕووم تێ نەکات. کەسێکیش کە تاوانی نەکردووە چی لە داوودی هەرە گونەهبار ئەوێ و ئەوی بۆ چییە؟!

داوودیانعَلَيْهِ‌السَّلَامُ لۆمە دەکرد و پێیان دەگوت: هێندە مەگری، ئەویش لەوڵامدا دەیفەرموو: لێم گەڕێن با تێر بەدڵ بگریم پێش ئەوەی ڕۆژی گریانم لەدەس دەربچێ، پێش ئەوەی ئێسکەکانم بسووتێنن، پێش ئەوەی دەروونم گڕ تێبەربدەن، پێش ئەوەی دەستوور بدەن بە فریشتە دڵڕەقەکان کە لە ئەمری خودا سەرپێچی ناکەن و هەرچیان پێ دەستوور بدەن، هەر ئەوە دەکەن.

"عومەری کوڕی عەبدولعەزیز" رَحِمَهُ‌اللَّهُ فەرموویەتی: کاتێ کە داوودعَلَيْهِ‌السَّلَامُ تووشی ئەو تاوانە بوو، دەنگی شکا، گوتی: خودایە! دەنگم لەنێو دەنگی بێ‌کشەی پێغەمبەراندا هەڵبڕە[2].

دیسان دەگێڕنەوە کە داوودعَلَيْهِ‌السَّلَامُ وەختێ کە زۆر گریا، بەڵام گریان سوودی نەبوو بۆی، دڵی تەنگ بوو و خەفەتی زۆر دایگرت و گوتی: پەروەردگارا! ئەرێ بەم گریانەمدا بەزەییت نایێتەوە؟

خودا وەحیی بۆ نارد: ئەی داوود! ئەتۆ تاوانەکەتت لەبیرەوە چووە و خەریکی سەبارەت بە گریانەکەت باس دەکەی!

---

١. المجالسة و جواهر العلم لأبی‌بکر الدّینوری المالکی: ٢٨٨، الرّقّة والدّعاء لابن‌أبی‌الدّنیا: ٣٥٤، الدّرّ المنثور للسیوطی فی سورة ص الآیة٢٤، الجامع الأحکام القران للقرطبی آیة٢٤ من سورة ص، کلّهم بروایات مختلفة.

٢. ابن‌ابی‌الدّنیا فی الرّقّة والبکاء: ٣٩٠، المواعظ لابن‌الجوزی: ١٥/١.

گوتی: خودایە! ئەمن چلۆن تاوانەکەم لەبیر چۆتەوە، لە حالێکدا کە زەبوور دەخوێنم ئاو لە خورە دەکەوێ، "با" کشەی لێ دەبڕێ، باڵندەکان چەتر دەکەن بە سەرمەوە، دڕندەکان دێنە لای میحرابەکەم. ئەدی خودایا ئەم دوورییەی نێوان من و تۆ لە چییەوەیە؟!

خودا فەرمووی: ئەی داوود! ئەوە کە باست کرد لە خوو و عادەتگرتنت بوو بە عیبادەتەوە ئەمەشت (دوورییەکە) لەو تاوانەوە بوو کە تووشی بووی.

ئەی داوود! ئەمن ئادەمم لە خۆم خەلق کرد، بەدەستی خۆم بەدیم هێنا، لە ڕۆحی خۆمم کردە بەری، فەرمانم بە فریشتەکانم دا سوجدەی بۆ ببەن، بەرگی ڕێزم لەبەری کرد، تاجی عیززەتم لەسەری نا، گلەیی تەنیایی کرد بەلامەوە "حەوام" کردە هاوسەری و ناردمە بەهەشتی خۆم، بەڵام کاتێ بێگوێیی منی کرد دەسبەجێ بەڕووت و ڕەجاڵی و کزی لەژێر سێبەری خۆم دەرم کرد.

ئەی داوود! گوێم لێ بگرە، ئەمن ئەوی ڕاست بێ ئەیڵێم: ئەگەر بە گوێمان بکەی بەگوێت ئەکەین، داوامان لێ بکەی پێت ئەدەین، نافەرمانیمان بکەی دەرفەتت پێ دەدەین، ئەگەر گەڕایتەوە بۆلامان هەر بەو شێوە کەوا بوویت، دیسان وەرت دەگرینەوە.

یەحیای کوڕی ئەبی‌کەسیر گوتوویە: بیستوومە کە دەڵێن: داوودعَلَيْهِالسَّلَامُ هەرکاتێ بیویستایە بڕواتە نێو خەڵك، حەوت ڕۆژ پێش ئەوە دەستی لە نان و ئاو ئەکێشایەوە و نزیکیی ژنەکانی نەدەکرد. ڕۆژێك پێش ئەوەی بڕواتە دەرەوە مینبەرێکیان لە گۆڕەپانێکدا بۆی ساز کرد، پاشان ئەمری بە سولەیمان دەکرد کە بە نێو شار و دێ و دەشت و کێو و دەرو دۆڵدا جاڕ بدات. لەپاش ئەم جاڕە بەرە بەرە دڕندە لە جەنگەڵ دەردەپەڕی، جڕ و جانەوەری وردیلە لە کون و قوژبنی زەمیندا دەهاتنەدەر، باڵندە لە هێلانە باڵیان دەگرتەوە، کچانی نازادار و جوان، لە ماڵ دەهاتنەدەر و سەرجەمی خەڵك لەوێ ئامادە دەبوون.

داوودیشعَلَيْهِالسَّلَامُ دەهات و دەچووە سەر مینبەرەکە، لە دەور و بەریدا بەنیئیسرائیل و هەر هۆز و عەشرەتێ بەش بە حاڵی خۆی ئاپۆرەیان دەدا، سولەیمانیشعَلَيْهِالسَّلَامُ بەسەریانەوە ڕادەوەستا.

داوودعَلَيْهِالسَّلَامُ ورده ورده دەستی بە پەسن و ستایشی خودا دەکرد، کۆمەڵی دانیشتوان گریان و ناڵە دای‌دەگرتن. پاشان هێندە بەسۆز باسی بەهەشتی دەکرد، دەستبەجێ جانەوەرە

وردیلەكان و هەندێ لە دڕندە و جانەوەرانی‌تر مردار دەبوونەوە. پاشان كە دەهاتە سەرباسی ڕۆژی قیامەت و تەنگ و چەڵەمەی ئەوێ لە هەر چینێ هەندێ دەمردن.

سولەیمانعَلَيْهِالسَّلَامُ كاتێ كە سەرنجی‌دا كە خەڵك و جانەوەران بە زۆری خەریكە دەمرن، گوتی: بابە! ئەتۆ تەواوی گوێگرانت شڕو شیتاڵ كردووە؛ هۆزی بەنی‌ئیسرائیل كۆمەڵێكیان لێ مردن، باڵندەو دڕندە و جڕو جانەوەرە وردیلەكان كۆمەڵ كۆمەڵ خەریكە دەمرن.

داوودعَلَيْهِالسَّلَامُ پاشان دەستی بە دوعا و پاڕانەوە دەكرد و بەردەوام خەریك دەبوو، لەناكاو هەندێك لە بەنی ئیسرائیلیان هاواریان دەكرد: ئەی داوود! تۆ لە وەرگرتنی پاداش لە خودا زۆر بە پەلەی!

لەم كاتەدا داوودعَلَيْهِالسَّلَامُ لەسەر خۆی چوو، سولەیمانعَلَيْهِالسَّلَامُ سەرنجی دا و چوو دار تەرمێكی هێناو بردیەوە ماڵ، پاشان فەرمانی بە جاڕچییەك دا كە جاڕ بدات: هەركەس خزم و كەسێكی لێرە لەگەڵ داوودا بووە با دارتەرمێك بهێنێ و بیباتەوە، چونكە هەركەسی لەگەڵدا بووە باسی بەهەشت و دۆزەخ كوشتوویەتی، ژنان یەك بە یەك دەهاتن و خزم و كەسانی خۆیان بەسەر دار تەرمەوە دەبردەوە و هاوارو ناڵەیان دەكرد دەیان لاواندنەوە و دەیانگوت: ئەی كەسانێ كە باسی بەهەشت و دۆزەخ كوشتوونی! ئەی كەسانێ كە لە ترسی خودا مردوون.

پاش ماوەیێك داوودعَلَيْهِالسَّلَامُ هاتەوە هۆشی خۆی و دەستی لەسەر سەری داناو و چووە نێو هۆدەی عیبادەتەكەی و دەركەی گاڵە دا. هاواری لە خودا كرد: ئەی خودای داوود! بۆچ ئەتۆ تووڕەی بە دەس داوودەوە؟! بەردەوام ئاه و ناڵەی بوو و هانا و تەمەنای بوو، تا سولەیمان هات و لە دەم دەرگاكەدا دانیشت و داوای كرد كە بڕواتە ماڵەوە، پاشان چووە ماڵەوە و كولێرە جۆیینەیەكی لەگەڵدا بوو و دەیگوت: بابەگیان لەمە بخۆ با گوڕێكت تێ بكەوێ، پاشان لەو كولێرەیەی دەخوارد و پاشان لە ماڵ ئەهاتەدەرەوە و دەچوو بۆلای هۆزی بەنی ئیسرائیل و ئامۆژگاری خەڵكی دەكرد و دەیانی ترساند. كاتێ كە هاتبووە دەرەوە چل هەزار كەسی لەگەڵدا بوو، لەوێ سی هەزاری لەهۆش خۆیان چوون و لەگەڵیدا نەگەڕانەوە. داوود هەمیشە دوو جاریەی دەخستە تەك خۆی مەبادا ئەو ترسەی لێ بنیشێت و بكەوێ و هێندە پەلەقاژە و خۆكوتان بكات و ئەندامەكانی و دەست و پێی خۆی بشكێنێ، تا ئەوان بیگرن و بیپارێزن.

## هەڵوێستی سەحابە و تابیعین بەرانبەر بە ترس و خۆف:

حەزرەتی ئەبووبەکر رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ بە باڵندەکانی دەگوت: هۆ باڵندەکان! خۆزگە ئەمن وەك ئێوە بووایەم و نەبوومایە بە مرۆڤ[1].

ئەبووزەڕ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ گوتوویە: خۆزگە ئەمن دارێکی براو بوایەم[2].

حەزرەتی عوسمان رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ فەرموویەتی: خۆزگە ئەمن بمردایەم و بۆ ڕۆژی حەشر زیندوو نەکرابامەوە[3].

حەزرەتی عائیشە رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا فەرموویەتی: ئاواتم ئەوە بوو کە خۆزگە هەر نەبووبام و بە تەواوی لە بیرەوە چووبام[4].

ڕوومەتی حەزرەتی عومەر رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ شوێنی فرمێسکەکانی دوو هێڵی ڕەشی تێکەوتبوو[5]. هەمیشەش دەیگوت: هەرکەس ترسی خودای لە دڵدا بێت، قەت کوڵی دڵی دانامرکێ و هەرکەسیش تەقوای خودای بێت قەت ئەوە ناکات وا نەفسی حەزی لێیەتی. ئەگەریش ترسی ڕۆژی قیامەت نەبووبا، ئاوەها نەتان دەبینیم[6].

حەزرەتی عەلی رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ بەیانییەك سڵاوی نوێژی سبەینانی داوە، یەکسەر خەم و کەسەر دایگرتبوو و دەست و پلی هەڵدەگلۆفی و دەیگوت: ئەمن هاوەڵانی پێغەمبەرم رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ دیتووە، بەڵام ئەورۆ هیچکەس نابینم کە لەوان بچێ؛ ئەوان ڕۆژیان دەکردەوە بە ڕەنگی زەرد و سەر و ڕوومەت و ناوچاوانی شپرزاو و خەم داگرتوو، هەروەك کاروانی تازیەتباران؛ ئەوان شەو تا سبەی سەریان لە سوژدەبوو، یان بەپێوە تا بەیانی ڕادەوەستان و عیبادەتیان دەکرد،

---

١. «... يا لَيْتَنِي كُنْتُ مِثْلَكَ، وَاللهِ لَوَدِدْتُ أَنِّي كُنْتُ شَجَرَةً إِلَىٰ جانِبِ الطَّرِيقِ ...» بيهقى فى شعب الإيمان: ٧٦٨، هنّاد بن‌السّرى فى الزّهد: ٤٤٣.

٢. «لَوَدِدْتُ أَنِّي كُنْتُ شَجَرَةً تُعْضَدُ» ترمذى: ٢٢٣٤، ابن‌ماجه: ٤١٨٠، احمد: ٢٠٥٣٩.

٣. «وَدِدْتُ أَنِّي إِذا مُتُّ لَمْ أُبْعَثْ» ابن‌ابى‌شيبه فى مصنّفه: ١٦١/٨.

٤. «وَدِدْتُ أَنِّي كُنْتُ نَسْياً مَنْسِيّاً» بخارى: ٤٣٨٤، احمد: ٢٣٦٦ ـ ٣٠٩٢.

٥. «كانَ فِي وَجْهِ عُمَرَ بْنِ الْخَطّابِ خَطّانِ أَسْوَدانِ مِنَ الْبُكاءِ» بيهقى فى شعب الإيمان: ٧٨٥، اخبار مكه للفاكهى: ١٥٨٥، ابن‌ابى‌الدّنيا فى الرّقّة والبكاء: ٢٠٩.

٦. «مَنْ خافَ اللهَ لَمْ يَشْفِ غَيْظَهُ وَ مَنِ اتَّقَى اللهَ لَمْ يَصْنَعْ كُلَّ ما يُرِيدُ ...» ابوداود فى الزّهد: ٩٨ بلفظه، و فى روايةٍ بيهقى فى شعب الإيمان: ٧٧٣٦ عن عمر بن عبدالعزيز رَحِمَهُ اللَّهُ. و فى رواية: «مَنِ اتَّقَى اللهَ لَمْ يَشْفِ غَيْظَهُ ...» المجالسة و جواهر العلم لأبى‌بكر المالكى الدّينورىّ: ٢٣٦٤ عن عمر بن‌الخطّاب رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ.

قورئانیان دەخوێندەوە، تاوێ لەسەر پێ و تاوێ بە سوژدەوە دەوەستان، کاتی بەیانی کە نوێژیان دەکرد زیکرو ویردیان تەواو دەکرد، هەر وەك دارێ وا ڕۆژی باو بۆران کێشی دێ و دەشکێ بە یەکدا، ئەوانیش ئاوەها کێشیان دەهات و دەشپرزان، چاوەکانیان پڕ بوو لە فرمێسك و هێندەیان داوەراندبوو کە کراسی بەریانی تەڕ کردبوو. بەڵام ئێستا کە وەڵڵاهی ئەڵێی هام لەگەڵ کەسانێکدا کە لە خوا غافڵن.

پاشان هەستا و ڕۆیشت و ئیدی پاش ئەوە تا ئیبنومولجەم شەهیدی کرد، قەت بزەی کەنین نەکەوتە سەر لێوی[1].

حەزرەتی عومەرﷺ هەرکاتێ ئایەتێکی لە قورئان دەبیست لە ترسی خودا دەمەوڕوو دەکەوت و لەسەر خۆی دەچوو. ڕۆژێك پەڕەکایێکی لە زەمین هەڵگرت و گوتی: خۆزگە ئەمن ئەم پەڕەکایە بووایەم، خۆزگە ئەمن نەبوایەم، خۆزگە دایکم منی نەدەبوو، خۆزگە هەر بە تەواوی لەبیر چووبوومایەتەوە[2].

عەلی کوڕی حوسەینرحمه الله هەرکاتێ دەستنوێژی دەگرت ڕەنگی دەپەڕی و زەرد هەڵئەگەڕا، پێیان دەگوت: هەرکاتێ دەسنوێژ بگری عادەتە وات لێ بێ؟ دەیفەرموو: مەگەر نازانن دەمەوێ لە بەردەم کێدا ڕابووەستم؟![3]

دەگێڕنەوە کە "فوزەیل"ﷺ لە ڕۆژی عەرەفەدا دیبوویان، لەوکاتەدا وا خەڵك خەریکی دوعا و نزا بوون، ئەو وەك ژنی کوڕمردووی جگەرسووتاو دەگریا، تا نزیك ئاوابوونی خۆر بەردەوام بوو، پاشان دەستی برد ڕیشی گرت و سەری بەرزەوە کرد و گوتی: هاوارو ڕۆ بۆ تۆ ئەی فوزەیل، هەرچەندەش خودا بتبەخشێ! پاشان لەگەڵ خەڵك ڕۆیشت[4].

لە ئیبنو عەبباسﷺ سەبارەت بەوانەی کە دڵەڕاوکێیانە و ترسی خودایان لە دڵە، پرسیار کرا، فەرمووی: ئەوان دڵیان بریندارە و زەخمە، چاویان پڕ لە گریانە، ئەڵێن: چلۆن شاد بین

---

١. البداية والنّهاية لابن‌الكثير: ٧/٨، تاريخ دمشق لابن‌عساكر: ٤٩٢/٤٢.

٢. «يا لَيْتَنِي لَمْ أَكُنْ شَيْئاً لَيْتَ أُمِّي لَمْ تَلِدْنِي لَيْتَنِي كُنْتُ نَسْياً مَنْسِيّاً» بيهقى فى شعب الإيمان: ٧٦٩، ابن‌ابى‌شيبه فى مصنفه: ١٥٢/٨.

٣. «... مٰا هٰذَا الَّذِي يَعْتٰادُكَ عِنْدَ الْوُضُوءِ؟ فَيَقُولُ: تَدْرُونَ بَيْنَ يَدَي مَنْ أُرِيدُ أَنْ أَقُومَ؟» المجالسة و جواهر العلم لأبى‌بكر الدّينورىّ المالكىّ: ٧٨٧، ابن‌ابى‌الدّنيا فى الرّقّة والبكاء: ١٤٥.

٤. «وٰا سَوْأَتٰاهُ مِنْكَ وَ إِنْ غَفَرْتَ» المنثور لابن‌الجوزى: ١٠/١.

کاتێ کە مەرگ بە دوومانەوەیە و گۆڕمان لە پێشە و ڕۆژی قیامەتیش وادەمانە، ڕێمان بە سەر دۆزەخەوەیە و خوداش بە سەرمانەوەیە و ئاگادارمانە.

"حیمادی کوڕی عەبدی ڕەببە" کاتێ کە دادەنیشت، وەك کەسێ کە بیەوێ ڕا بکات دادەنیشت، دەیانگوت: بۆچ ڕاحەت دانانیشی؟ دەیگوت: کەسێ ئەبێ بەو جۆرە دابنیشی کە دڵی تەخت بێ، ئەمن دڵەڕاوکێمە، چونکە تاوانم تووش بووە.

عومەری کوڕی عەبدولعەزیز رَحِمَهُ ٱللَّهُ فەرموویەتی: خودا لە ڕووی ڕەحمەتەوە غەفڵەتی لە دڵی مرۆڤدا داناوە، مەبادا تێبگەن و لە ترسی خودا بمرن.

دەگێڕنەوە کە گەنجێکی ئەنساری ترس و خۆفی ئاگری دۆزەخ لە دڵی نیشت و [شیوەن و گرینی نەدەبڕاوە و خۆی لە ماڵدا بەند کردبوو و نەئەهاتە دەر].

پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ چوو بۆلای و لە ئامێزی گرت، دەست بەجێ لاوەکە کەوت و گیانی دەرچوو.

پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فەرمووی: «جَهِّزُوا صَاحِبَكُمْ فَإِنَّ الْفَرَقَ فَتَّتَ كَبِدَهُ»[1] واتە: «ئەم دۆستانە ئامادەی کفن و دفن بکەن، چونکە بەڕاستی ترس و خۆفی خودا جەرگی بڕیوە».

والله أعلم بالصّواب

١. حاکم فی المستدرك: ٣٧٨٧، بیهقی فی شعب الإیمان: ٩٠٨، احمد فی الزّهد: ٢٣٨٨، ابن‌المبارك فی الزّهد والرّقائق: ١٩٣٤ بلفظ: «...فَلَذَ كَبِدَهُ»، سیوطی فی جامع الکبیر: ٤١٢، حرف الجیم بلفظ: «...هَلَكَ كَبِدَهُ».

# بابەتی سی و چوارەم: نەداری و دنیانەویستی

[ئەم بابەتە لە دوو بەش پێك هاتووە:]

## [بەشی یەکەم: دەستەنگی و نەداری]

خودای مەزن فەرموویەتی: ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ أَنْتُمُ الْفُقَرَاءُ إِلَى اللَّهِ﴾[1] واتە: «ئەی مەردم! ئێوە نیازمەندن بە خودا».

دەستەنگ و نەدار کەسێکە کە پێویستی بە شتێ بێ کە خۆی نەیبێ، ئەدی مرۆڤ بە گشتی نیازمەند و گەدای خودان، چونکە لە هەموو شتێکدا پێویستیان بە ئەو هەیە، بوونیان لە ئەوەوە دەستی پێ کردووە، بوونیشیان هی خۆیان نییە بەڵکوو هی خودایە، هەر خودایە کە لە هەموولایەنێکەوە بێ‌نیازە.

ئێستا ئێمە باسمان لەسەر دەستەنگی و نەداری ماڵییە، کە بریتییە لەوە کەسێ: «هێندەی نەبێ کە پێی بژی».

### نەدار و دەستەنگ چەن جۆرن:

یەکەم: کەسێ کە هەر ماڵ و دارایی خۆش نەوێ و لە دەستی ڕابکات، ئەمە پێی دەڵێن: خۆپارێزی و گۆشەگیری.

دووهەم: کەسێ کە بوون و نەبوونی ماڵی دونیای بەلاوە بێ‌فەرق بێ؛ نە لە دەستی ڕابکات، نە حەزی لێ بێ، بەجۆرێ ئەگەر ماڵی دونیای دەست کەوێ پێی ناخۆش نییە. ئەم کەسە پێی دەڵێن: ڕازی بە بەشی خودا.

---

١. فاطر: ١٥.

**سێهەم:** کەسێ کە بوونی ماڵی لە نەبوونی بەلاوە خۆشتر بێ و زیادتر حەزی لێ بکا، بەڵام بەو مەرجەی زۆر خۆی پێوە ماندوو نەکات و بە حەلاڵی دەستی بکەوێ، [ئەم جۆرە کەسایەتییە پێی دەڵێن: قانیع.]

**چوارەم:** کەسێ کە حەزی لە ماڵ و داراییە و هەوڵی زۆری بۆ دەدات، بەڵام ناتوانێ بە دەستی بهێنێ و دەستی پێ ڕاناگات.

جا ئەوەی کە لە هەمووی ئەم حاڵەتانە بەرزترە ئەوەیە کە بوون و نەبوونی ماڵ و دارایی بەلایەوە فەرقی نەبێ، چ زۆری بێ، چ کەمی بێ، ئەوگوێی پێ نادات وبەرهیچ کارێکی ناگرێ و قەت نەبوونی و پێویستی خۆی نایەت بەدڵیدا، هەروەك چۆن لە حەزرەتی عائیشەوەرَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا دەگێڕنەوە کە سەد هەزار دیرهەمیان بە دیاری بۆ هێنا، بڵاوی کردەوە و خۆی بۆ بەربانگ لە بیری چووبوو کە هیچی نییە، تا کارەکەرەکەی پێ گوت: خۆزگە دیرهەمێکت بهێشتایەتەوە تا نەختێ گۆشتمان پێ بکڕیایە و بەربانگمان پێ بکردایەتەوە، فەرمووی: ئەگەر بتخستایەتەوە بیرم، دامدەنا[1].

## بەشی دووهەم: خێری نەداری

دەگێڕنەوە کە ئیبنوو عەمومەررَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەرصَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بەهاوەڵەکانی فەرموو: «أَيُّ النَّاسِ خَيْرٌ؟»، واتە: «چ کەسێ چاکە» گوتیان: دەوڵەمەندێ کە حەقی خودای مەزن بەسەر ماڵ و گیانیەوە بەجێ بهێنێ. فەرمووی: «نِعْمَ الرَّجُلُ هٰذٰا وَ لَيْسَ بِهِ» واتە: «ئەمەش پیاوێکی چاکە، بەڵام ئەوە نییە». گوتیان: ئەدی کێیە ئەی پێغەمبەری خودا؟ فەرمووی: «فَقِيرٌ يُعْطِي جُهْدَهُ»[2] واتە: «هەژارێك کە لە هیچ هەوڵدانێ درێغی نەکردبێ».

لە حەدیسێکی مەشهووردا هاتووە: «يَدْخُلُ فُقَرَاءُ أُمَّتِي الْجَنَّةَ قَبْلَ أَغْنِيٰائِهٰا بِخَمْسِ مِائَةِ عامٍ»[3] واتە: «هەژارانی ئوممەتم پێنجسەد ساڵ پێش دەوڵەمەندان دەچنە بەهەشت».

---

١. «...لَوْ ذَكَّرْتِينِى لَفَعَلْتُ» جامع الأصول من أحاديث الرّسول لابن‌الأثير: ٢٧٧١.

٢. الطّيالیسى فى مسنده: ١٩٥٢، المطالب العالية لابن‌حجر العسقلانى: ٩٧٦.

٣. احمد: ١٠٣١٢ ـ ٧٦٠٥ ـ ٨١٦٥، ابن‌ماجه: ٤١١٢ ـ ٤١١٤، ترمذى: ٢٢٧٧، بلفظ: «بِنِصْفِ يَوْمٍ وَ هُوَ خَمْسُ مِائَةِ عٰامٍ». و فى رواية: «...بِأَرْبَعِ مِائَةِ عٰامٍ» احمد: ٢٢٠٢٤. و فى رواية: «...بِأَرْبَعِينَ خَرِيفاً» ترمذى: ٢٢٧٨، احمد: ١٣٩٥٢ و فى رواية: «إِنَّ فُقَرٰاءَ الْمُهٰاجِرِينَ يَسْبِقُونَ الْأَغْنِيٰاءَ يَوْمَ الْقِيٰامَةِ إِلَى الْجَنَّةِ بِأَرْبَعِينَ خَرِيفاً...» مسلم: ٥٢٩١، ابن‌ماجه: ٤١١٣، ترمذى: ٢٢٧٤ بلفظ: «...بِخَمْسِ مِائَةِ سَنَةٍ».

دەگێڕنەوە کە مووساعَلَيهِالسَّلَامُ بەلای پیاوێکدا تێپەڕی کە لەسەر خاك نوستبوو و خشتێکی لەژێر سەردا بوو و ڕیش و سەروچاوی لەسەر خاکەوە بوو و عابایەکی بە خۆیەوە پێچاندبوو. فەرمووی: خودایە! ئەم بەندەیەت حاڵ و وەزعی لە دنیادا باش نییە!

خودای مەزن وەحیی ناردەسەری: ئەی مووسا! مەگەر نازانی ئەمن هەرکات ڕوو لە بەندەیەکم بکەم، دونیا بە تەواوی لێی دوور دەکەوێتەوە.

پێغەمبەرصَلَّىاللَّهُعَلَيهِوَسَلَّمَ فەرموویەتی: «إِنَّ لِي حَبِيبَيْنِ اثْنَيْنِ فَمَنْ أَحَبَّهُمٰا فَقَدْ أَحَبَّنِي، وَ مَنْ أَبْغَضَهُمٰا فَقَدْ أَبْغَضَنِي: اَلْفَقْرُ وَ الْجِهٰادُ».

واتە: «ئەمن دوو خۆشەویستم هەیە، هەرکەس خۆشیانی بوێ ئەوە منی خۆشویستووە، هەرکەسیش ڕقی لێیان بێ ئەوە ڕقی لە منە،: نەداری و جیهاد».

دەگێڕنەوە کە جوبرەئیلعَلَيهِالسَّلَامُ هاتە خزمەتی پێغەمبەرصَلَّىاللَّهُعَلَيهِوَسَلَّمَ فەرمووی: «يٰا مُحَمَّدُا إِنَّ اللّٰه تَعٰالَىٰ يُقْرِأُ عَلَيْكَ السَّلامُ و يَقُولُ لَكَ: أَتُحِبُّ أَنْ أَجْعَلَ لَكَ هٰذِهِ الْجِبٰالَ ذَهَباً و تَكُونَ مَعَكَ حَيْثُمٰا كُنْتَ؟ فَأَطْرَقَ رَسُولُ اللّٰهِصَلَّىاللَّهُعَلَيهِوَسَلَّمَ سٰاعةً ثُمَّ قٰالَ: يٰا جِبْرِيلُ إِنَّ الدُّنْيٰا دٰارُ مَنْ لا دٰارَ لَهُ، وَ مٰالُ مَنْ لا مٰالَ لَهُ، وَ يَجْمَعُها مَنْ لا عَقْلَ لَهُ، فَقٰالَ جِبْرِيلُ: يٰا مُحَمَّدُ! ثَبَّتَكَ اللّٰهُ بِالْقَوْلِ الثّٰابِتِ»[1]

واتە: «ئەی موحەممەد! خودا سڵاوی دەگەیاندی و پێتی دەفەرموو: ئاخۆ حەز دەکەی ئەم کێوانە بکەمە زێڕ و بۆ هەرکوێ بچیت بیخەمە شوێنت؟ پێغەمبەرصَلَّىاللَّهُعَلَيهِوَسَلَّمَ ماوەیەك سەری داخست و پاشان فەرمووی: ئەی جوبرەئیل! دونیا خانووی کەسێکە کە خانووی نەبێ و ماڵ کەسێکە کە ماڵی نەبێ و کەسێ کۆی دەکاتەوە کە بێعەقڵ بێ. جوبرەئیل فەرمووی: ئەی موحەممەد! خودا لەسەر وتەی پایەدار بەردەوامت بکات».

دەگێڕنەوە کە عیساعَلَيهِالسَّلَامُ لە گەشت و گوزارەکەیدا بەلای پیاوێکی نوستوودا تێپەڕی کە عابایەکی بەخۆیەوە پێچابوو. حەزرەتی عیسا ڕای چڵەکاند و فەرمووی: «ئەی نوستوو!

---

١. قاضی عیاض فی الشّفاء فصل الثّانی و عشرون فی الزّهد فی الدنیا قسم الأوّل ص٢٠٠ کاملاً، لکن ورد نصفه فی حدیث مستقلا: «الدُّنْيٰا دٰارُ مَنْ لا دٰارَ لَهُ وَ مٰالُ مَنْ لا مٰالَ لَهُ وَ لَهٰا يَجْمَعُ مَنْ لا عَقْلَ لَهُ» احمد: ٢٣٢٨٣، بیهقی فی شعب الإیمان: ١٠١٥٣ ـ ١٠١٥٤، جامع الکبیر للسّیوطی: ١٢٦٧٣، حرف الدّال و نصفه الأخری فی لفظ بنحوه: «عَرَضَ عَلَيَّ رَبِّي لِيَجْعَلَ لِي بَطْحٰاءَ مَكَّةَ ذَهَباً، قُلْتُ لا يٰا رَبِّ...» ترمذی: ٢٣٧٠، احمد: ٢١١٦٦، طبرانی فی الکبیر: ٧٧٤١، بیهقی فی شعب الإیمان: ١٣٩٤ ـ ٩٩٢٥.

هەستە سەر خۆت و یادی خودا بکە». گوتی: چیت لێم ئەوێ؛ ئەمن دونیام بۆ دونیاویستان جێ هێشتووە. حەزرەتی عیسا فەرمووی: ئەدی ئیتر بخەوە خۆشەویستەکەم!.

پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «اِطَّلَعْتُ فِي الْجَنَّةِ فَرَأَيْتُ أَكْثَرَ أَهْلِهَا الْفُقَرَاءَ، وَ اطَّلَعْتُ فِي النَّارِ فَرَأَيْتُ أَكْثَرَ أَهْلِهَا الْأَغْنِيَاءَ»[1] واتە: «سەری بەهەشتم دا دیم زۆربەی بەهەشتیان هەژار و نەدارن. هەروەها سەردانی دۆزەخیشم کرد دیم زۆربەی دۆزەخییان دەوڵەمەندانن».

پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «يَا مَعْشَرَ الْفُقَرَاءِ أُعْطُوا اللهَ الرِّضَا مِنْ قُلُوبِكُمْ تَظْفَرُوا بِالثَّوَابِ لِفَقْرِكُم وَ إِلَّا فَلَا»[2] واتە: «ئەی هۆزی هەژاران! بەدڵ لەخودا ڕازی بن، بێگومان بەهۆی ئەم فەقیرییەتانەوە خێرتان چنگ دەکەوێ، وەگەرنە، هیچیتان گیر ناکەوێ».

خودای گەورە وەحیی ناردە سەر ئیسماعیلعليه السلام: ئەی ئیسماعیل! لەلای دڵشکاوان بە دووی مندا بگەڕێ. ئیسماعیل پرسیاری کرد: ئەوانە کێن؟ خودا فەرمووی: هەژارانی ڕاست و دروستکار.

کە وابوو بە پێی ئەم حەدیس و فەرموودانە، نەداری و هەژاری خێری زۆرە. [ئەمەش بەو مانا نییە] کە کاسبی خراپە، بەڵکوو پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «اَللّٰهُمَّ اجْعَلْ قُوتَ آلِ مُحَمَّدٍ كِفَافاً»[3] واتە: «خودایە! ڕزقی ئالی موحەممەد بە ئەندازەی پێویست بدە».

جا هەرچی لە ئەندازەی پێویست زۆرتر بێ ئەوە پلەی مرۆڤ دادەبەزێنێ و هەروەها دەستکێشان لە کارو کاسبیش دیسان ئەبێتە هۆی دابەزینی پلە و پایە، هەروەك چۆن لەمبارەوە حەدیس و خەبەری زۆر هەیە.

## بەشی سێهەم:
## حەرامبوونی دەسدرێژکردنەوە بۆ خەڵك بەبێ نیازبوون

بزانە حەدیسی زۆر هەیە کە داکۆکی لە سەر حەرامبوونی دەریۆزەیی و گەدایی دەکات:

---

١. بخاری: ٣٠٠٢ ـ ٤٧٩٩ ـ ٥٩٦٨ ـ ٦٠٦٤، مسلم: ٤٩٢٠، ترمذی: ٢٥٢٧ ـ ٢٥٢٨، احمد: ١٩٨٢ ـ ٣٢١٣ ـ ٧٦١٠ ـ ١٩٠٨٠ لكن جميعهم بلفظ: «...اِطَّلَعْتُ فِي النَّارِ فَرَأَيْتُ أَكْثَرَ أَهْلِهَا النِّسَاءَ»، و فی روايةِ احمد: ٦٣٢٢ بلفظ: «... فَرَأَيْتُ أَكْثَرَ أَهْلِهَا الْأَغْنِيَاءُ وَالنِّسَاءُ».

٢. جامع الكبير للسّيوطی: ١٢٤٢، حرف الياء، كنز العمل للهندی: ١٦٦٥٥.

٣. مسلم: ١٧٤٧، ترمذی: ٢٢٨٤، ابن‌ماجه: ٤١٢٩، احمد: ٩٣٧٧ ـ ٩٨٤٧ جميعهم بلفظ: «... آلِ مُحَمَّدٍ قُوتاً».

پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «مَنْ سَأَلَ عَنْ ظَهْرِ غِنًى فَإِنَّمَا يَسْتَكْثِرُ مِنْ نَارِ جَهَنَّمَ»[1] واتە: «هەرکەس لە ڕووی بێنیازییەوە دەست بۆ خەڵك درێژ بکاتەوە، ئەوە بێشك داوای زۆربوونی ئاگری دۆزەخ دەکات».

دیسانەکە سەبارەت بە دەریۆزەیی و گەداییش حەدیس هاتووە کە ئاماژە بە دروستبوونی دەکات، وەکوو فەرموودەی پێغەمبەرﷺ: «لِلسَّائِلِ حَقٌّ وَ إِنْ جَاءَ عَلَى فَرَسٍ»[2]. واتە: «گەدا حەقی هەیە، هەرچەندەش بەسەر ئەسپەوە بێت». بەم پێیە ئەگەر گەدایی دروست نەبوایە حەقی نەدەبوو. کە وابوو گەدایی و دەستدرێژکردنەوە بە ئەندازەی پێویست و نیاز دروستە، ئیدی لەوە تێپەڕێ بە هیچ لەونێ دروست نییە.

## تێبینییێك لەسەر چینی فەقیران:

"بیشری حافی"ؒ دەفەرمێ: «فەقیران سێ جۆرن:

فەقیرێ کە داوا ناکات، ئەگەریش شتی پێ بدرێ گلی ناداتەوە. ئەمە لە «علیین»دا لەگەڵ ڕۆحانیەکاندایە.

فەقیرێ کە دەستدرێژ ناکاتەوە، بەڵام ئەگەر شتی پێ بدرێ گلی دەداتەوە. ئەم لەگەڵ نزیکانی خودایە (مقربین) لە بەهەشتدا.

فەقیرێ کە لە کاتی پێویستیدا داوا دەکات. ئەمە لەگەڵ ڕاستان (صادقین)دایە و لە ئەسحابولیەمین دێتە ئەژمار»[3].

بەم پێیە حاڵ و وەزعی ئەو پێنج چینە فەقیرە کە لە سەرەتاوە ڕوونمان کردەوە، ڕوون بووەوە. کە وابوو گەدایی هەرچەندەش لە ڕووی پێویستی و نیازەوە بێ هەر پلە و پایەی مرۆڤ دەشکێنێ و دایدەبەزێنێ.

---

١. احمد: ١١٨٨ بلفظ: «مَنْ سَأَلَ مَسْأَلَةً عَنْ ظَهْرِ غِنًى اسْتَكْثَرَ بِهَا مِنْ رَضْفِ جَهَنَّمَ». و فی روایة: «... جَاءَتْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ كُدُوحاً فِي وَجْهِهِ» احمد: ٤٢٠٨. و فی روایة: «مَنْ سَأَلَ النَّاسَ أَمْوَالَهُمْ تَكَثُّراً فَإِنَّمَا يَسْأَلُ جَمْرَ جَهَنَّمَ ...» مسلم: ١٧٢٦، ابن‌ماجه: ١٨٢٨، احمد: ٦٨٦٦. و فی روایة من صحیح البخاری: «مَا يَزَالُ الرَّجُلُ يَسْأَلُ النَّاسَ حَتَّى يَأْتِيَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ لَيْسَ فِي وَجْهِهِ مُزْعَةُ لَحْمٍ ...» بخاری: ١٣٨١، مسلم: ١٧٢٥.

٢. ابوداود: ١٤١٨، احمد: ١٦٤٠.

٣. بیهقی فی شعب الإیمان: ٣٢٥٦ بلفظ: «... وَ فَقِيرٌ يَسْأَلُ كَفَّارَتُهُ صَدَقَةٌ فِي سُؤَالِهِ» و کذا رواه بیهقی فی شعب الإیمان: ١٢٢٥ بلفظ: «... وَ فَقِيرٌ يَسْأَلُ وَ كَفَّارَةُ مَسْئَلَتِهِ صَدَقَةٌ» من قول جنید بن محمد.

ئیبراهیمی کوڕی ئەدهەمرَحِمَهُاللَّهُ کاتێ کە شەقیقی کوڕی ئیبراهیم لە خوراسانەوە هاتبوو بۆلای، پێی گوت: ئەو هاوەڵانەت کە دەستەنگن چلۆن ڕایانت هێناوە؟

گوتی: ئەگەر شتیان پێ بدرێ شوکرانەبژێری دەکەن، ئەگەریش شتیان پێ نەدەن خۆڕاگرن.

شەقیق وای دەزانی کە ئەگەر ئاوەها لەبارەیانەوە بڵێ ئەوە لای ئیبراهیمەوە تاریفی کردوون. کەچی ئیبراهیم گوتی: ئەدی خۆ سەگەکانی "بەڵخیش" هەروان!!

شەقیق گوتی: ئەدی قوربان! فەقیرانی لای جەنابت چلۆنن؟

فەرمووی: فەقیران لای ئێمە ئاوەهان: ئەگەر شتیان پێ نەدرێ شوکرانەبژێری دەکەن و ئەگەریش شتیان پێ بدرێ لەخۆ بوردووی دەکەن.

شەقیق سەری ماچ کرد و گوتی: ئەتۆ ڕاست دەفەرمی قوربان!

هەندێ جار بۆ کەسانێ وا ڕێك دەکەوێ کە داواکردن بۆیان باشترە لە داوانەکردنیان. لەمبارەوە پیاوێ دەڵێ: ئەبوو حەسەنی نووری دەدیت کە لە هەندێ شوێندا دەستی بۆ خەڵك درێژ دەکردەوە و داوای دەکرد. دەڵێ: زۆرم پێ سەخت بوو، لە خزمەت جونەیدا باسم کرد. ئەویش فەرمووی: زۆر بەلاتەوە سەیر نەبێ، چونکە ئەبولحەسەنی نووری لە کەس داوا ناکات مەگین لەبەر ئەوەی شتیان پێ بدات، ئەو بۆیە داوایان لێ دەکات تا لە دوا ڕۆژدا خێر و سەوابیان پێ بگەیەنێ، جا بە جۆریکیش زەرەر لە خۆی نەدات. ئەڵێی بەو فەرموودەی پێغەمبەرەصَلَّىٰاللَّهُعَلَيْهِوَسَلَّمَ ئاماژە دەکات کە فەرموویەتی: «يَدُ الْمُعْطِي هِيَ الْعُلْيَا»[1] واتە: «دەستی بەخشێنەر بەرزترین دەستە». فەرمووی: هەندێ گوتوویانە: دەستی ئەو کەسەی کە ماڵ وەردەگرێ لەبەر ئەوەیە تا پاداش بە بەخشێنەرەکە بگەیەنێ. کەوابوو ڕێز بۆ ئەو کەسەیە کە ئەبێتە هۆی پاداشەکە نەك ئەوەی پاداش ئەدرێتەوە.

پاشان جونەیدرَحِمَهُاللَّهُ فەرمووی: ئەدی تەرازووێکم بۆ بهێنن. تەرازوویان بۆ هانی و ئەویش سەد دیرهەمی کێشانە کرد و پاشان مشتێتری خستە سەر سەد دیرهەمەکە، پاشان گوتی: ئەمە ببە بۆ نووری.

---

١. نسائی: ٢٤٨٥ بلفظ: «يَدُ الْمُعْطِي الْعُلْيَا...»، احمد: ٦٨٠٨ ـ ٢٢١١٨.

منیش لە دڵی خۆمەوە دەمگوت: شت بۆ ئەوە کێشانە دەکرێ کە ئەندازەی بزانرێ ئەدی چلۆن شتێ کە کێشەکەی نازانێ خستیە سەری و تێکەڵی کرد.

لەبەر گەورەیی و ڕێزیشی لە ڕووم نەئەهات پرسیاری لێ بکەم. ئەمنیش کیسەکەم هەڵگرت و بۆ نووریم برد.

ئەویش فەرمووی: تەرازووێکم بۆ بێنن. تەرازوویان هانی و سەد دیرهەمەکەی کێشا و گوتی: ئەم سەد دیرهەمەی بۆ ببەرەوە و پێ بڵێ: ئەمن شتێکی لێ وەرناگرم، ئەمن زیادەی ئەم سەد دیرهەمە وەردەگرم.

ئەم پیاوەش دەڵێ: زۆر سەرمسوڕما و خۆم بۆ ڕانەگیراو پرسیارم لێ کرد. ئەویش فەرمووی: جونەید پیاوێکی گەورە و مەزنە، حەز دەکات هەر دوو سەر گوریسەکە بگرێ؛ سەد دیرهەمەکە بۆ خۆی لەبەر دواڕۆژ دەکێشێ و مشتێکیش بە بێ‌کیشانە لەبەر ڕەزای خودای مەزن دەخاتە سەری. ئەمنیش هەرچێکی لەبەر ڕەزای خودا بوو وەرمگرت و هەرچیشی لەبەر خۆی بوو دامەوە بە سەریدا.

پیاوەکە دەڵێ: ئەمن پارەکەم بردەوە بۆ جونەید. ئەویش دەستی کرد بە گرین و پاشان گوتی: ئەو پارەکەی خۆی وەرگرت و پارەکەی منی داوە.

جا ئێستاکە سەیرکە بزانە دۆستانی خودا شێواز و حاڵ و باڵ و هەڵسوکەوتیان سەبارەت بەیەك چۆنە و چلۆن کردەوەکانیان تەنها لەبەر ڕەزای خودا ئەنجام دەدەن تا جێگەیێ کە هەرکامیان بە بێ ئەوەی قسەی بکەن، لە دڵی ئەویان ئاگادارە.

## بەشی دووهەم: دنیانەویستی

### حەقێقەتی دونیانەویستی

زوهد و پارێزکاری بریتییە لەوەی پشت لەشتێ هەڵکەیت و ڕوو لە شتێ‌تر بکەی. کە وابوو هەرکەس دنیاو شتە بێ‌نرخەکانی پشت‌گوێ بخات و ڕووی لێ هەڵبکات، ئەوە پێی ئەوترێ زاهید و دونیانەویست.

بەرزترین پلەی دونیانەویستی ئەوەیە کە پشت لە غەیری خودا هەڵچەرخێنی و تا ڕۆژی قیامەت لەسەری بەردەوام بیت. دونیانەویستی ڕیشەی لەوەدایە کە بەڕاستی بزانی کە دواڕۆژ چاکترە لە دونیاو بە کردەوەش ئەوە بسەلمێنی کە هەرچی حەز و ئاواتت هەیە بۆ دواڕۆژە.

کردەوەی دنیانەویستانە ئەوەیە کە مرۆڤ پارەی کڕینی دواڕۆژ بدات و ئیدی هیچ کارێکی لێ نەوەشێتەوە کە تێکدەری ئەم مامەڵەیە بێت.

سەبارەت بە خێرو چاکەی دونیانەویستی حەدیس و ئایەتی زۆر هاتووە:

خودای مەزن فەرموویەتی: ﴿إِنَّا جَعَلْنَا مَا عَلَى الْأَرْضِ زِينَةً لَهَا لِنَبْلُوَهُمْ أَيُّهُمْ أَحْسَنُ عَمَلاً﴾[1] واتە: «بێگومان ئێمە هەرچی کە لەسەر ئەرزدایە کردوومانەتە خشڵ و جوانکاری بۆی، تا تاقییان بکەینەوە کە کامیان کردەوەیان لەویتریان چاکترە».

هەروەها خودا فەرموویەتی: ﴿مَنْ كَانَ يُرِيدُ حَرْثَ الْآخِرَةِ نَزِدْ لَهُ فِي حَرْثِهِ وَ مَنْ كَانَ يُرِيدُ حَرْثَ الدُّنْيَا نُؤْتِهِ مِنْهَا وَ مَا لَهُ فِي الْآخِرَةِ مِنْ نَصِيبٍ﴾[2].

واتە: «هەرکەس داهاتی دواڕۆژی بوێ، داهاتی بۆ زیاد دەکەین، هەرکەسیش داهاتی دونیای گەرەك بێ لە دونیا بەشی دەدەین و ئیدی لە دواڕۆژدا هیچی بەر ناکەوێ».

پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «مَنْ أَصْبَحَ وَ هَمُّهُ الدُّنْيَا شَتَّتَ اللهُ تَعَالَىٰ عَلَيْهِ أَمْرَهُ، وَ فَرَّقَ عَلَيْهِ ضَيْعَتَهُ، وَ جَعَلَ فَقْرَهُ بَيْنَ عَيْنَيْهِ، وَ لَمْ يَأْتِهِ مِنَ الدُّنْيَا إِلَّا مَا كُتِبَ لَهُ مِنْهَا، وَ مَنْ أَصْبَحَ وَ هَمُّهُ الْآخِرَةُ جَمَعَ اللهُ لَهُ هَمَّهُ، وَ حَفَظَ عَلَيْهِ ضَيْعَتَهُ، وَ جَعَلَ غِنَاهُ فِي قَلْبِهِ، وَ أَتَتْهُ الدُّنْيَا وَ هِيَ رَاغِمَةٌ»[3].

واتە: «هەرکەس لەسەر ئەوە ڕۆژ بکاتەوە کە غەم وپەژارەی دونیا بێ، ئەوە خودای گەورە سەری لێ دەشێوێنێ و کار و کاسبیەکەی لێ ئاڵۆز و بڵاو دەکاتەوە و پێویستی و نیازەکەی دایمە دەخاتە بەرچاوی و هێندەی دەست دەکەوێ کە بۆی نووسراوە. هەروەها هەرکەس لەسەر ئەوە ڕۆژ بکاتەوە کە غەم و پەژارەی دواڕۆژ بێ، خودای گەورە خاترجەمی دەکات و کارو کاسبیەکەی بۆی دەخاتە برەوە و دەوڵەمەندی و بێنیازی دەخاتە دڵیەوە و ماڵی دونیا خۆی دێ بۆ لای کەچی ئەم لووتی لێ نادات».

---

١. الكهف: ٧.

٢. الشورى: ٢٠.

٣. ابن‌ماجه: ٤٠٩٥ بلفظ: «مَنْ كَانَتِ الدُّنْيَا هَمَّهُ فَرَّقَ اللهُ عَلَيْهِ أَمْرَهُ وَ جَعَلَ فَقْرَهُ بَيْنَ عَيْنَيْهِ ...»، ترمذى: ٢٣٨٩ بنحوه، احمد: ٢٠٦٠٨ بنحوه. و فى رواية بنحوه: «مَنْ أَصْبَحَ وَ هَمُّهُ الدُّنْيَا فَلَيْسَ مِنَ اللهِ فِي شَيْءٍ وَ مَنْ لَمْ يَهْتَمَّ بِالْمُسْلِمِينَ فَلَيْسَ مِنْهُمْ ...» طبرانى فى الأوسط: ٤٧٨، حاكم فى المستدرك: ٨٠٠٢ ـ ٨٠١٦، بيهقى فى شعب الإيمان: ١٠١٠١، جامع الكبير للسيوطى: ٤٠٠٣، حرف الميم.

پێغەمبەرﷺ: «إِذٰا رَأَيْتُمُ الْعَبْدَ قَدْ أُوتِيَ صَمْتاً وَ زُهْداً فِي الدُّنْيٰا فَاقْرَبُوا مِنْهُ، فَإِنَّهُ يُلَقِّي الْحِكْمَةَ»[1] واتە: «هەرکاتێ بەندەیێکتان دی کە بێدەنگ و دونیانەویست بوو، ئەوە لێ نزیك بکەونەوە، چونکە ئەو کەسە حیکمەت و خێری لێ دەوەشێتەوە».

هەروەها دەفەرمێ: «إِنْ أَرَدْتَ أَنْ يُحِبَّكَ اللّٰهُ فَازْهَدْ فِي الدُّنْيٰا»[2] واتە: «ئەگەر ئەتەوێ خودا خۆشی بوێی، خۆت لە دونیا دوور ڕابگرە».

کاتێ کە حاریسە گوتی بە پێغەمبەری خوداﷺ: «ئەمن ئیمانی ڕاستەقینەم هەیە». پێغەمبەری خوداﷺ فەرمووی: «وَمٰا حَقِيقَةُ إِيمٰانِكَ؟» واتە: «ڕاستەقینەی ئیمانت لە چیدایە؟» گوتی: «ئەمن پشتم لە دونیا هەڵکردووە و بەلامەوە بەرد و زێڕی بێ فەرقە، ئەڵێی هەم وام لە بەهەشتدا و هەم لە دۆزەخدا، ئەڵێی لە عەرشی خودادا دەرکەوتووم».

پێغەمبەرﷺ پێی فەرموو: «عَرَفْتَ فَالْزَمْ عَبْداً نَوَّرَ اللّٰهُ قَلْبَهُ بِالْإِيمٰانِ»[3] واتە: «چاك تێگەیشتووی لەسەری بەردەوام بە و لەگەڵ بەندەیێکدا بە کە خودا دڵی بە تیشکی ئیمان ڕووناك کردۆتەوە».

کاتێ کە سەبارەت بە مانای "شەرح" لە فەرموودەی خودای مەزندا: ﴿أَفَمَنْ شَرَحَ اللّٰهُ صَدْرَهُ لِلْإِسْلاٰمِ فَهُوَ عَلَىٰ نُورٍ مِنْ رَبِّهِ﴾[4] وە هەروەها لە ئایەتی: ﴿فَمَنْ يُرِدِ اللّٰهُ أَنْ يَهْدِيَهُ يَشْرَحْ صَدْرَهُ لِلْإِسْلاٰمِ﴾[5] پرسیار لە پێغەمبەرﷺ کرا، فەرمووی: «إِنَّ النُّورَ إِذٰا دَخَلَ الْقَلْبَ انْشَرَحَ لَهُ الصَّدْرُ فَانْفَتَحَ». واتە: «بێ‌شك هەرکاتێ تیشکێ بڕواتە نێو دڵەوە، سینگی بۆ ئاوەڵا دەبێ و دەکرێتەوە».

---

١. ابن‌ماجه: ٤٠٩١ بلفظ: «إِذٰا رَأَيْتُمُ الرَّجُلَ قَدْ أُعْطِيَ زُهْداً فِي الدُّنْيٰا وَ قِلَّةَ مَنْطِقٍ فَاقْتَرِبُوا مِنْهُ فَإِنَّهُ يُلَقِّي الْحِكْمَةَ» طبرانی فی الکبیر: ٤٥٣، بیهقی فی شعب الإیمان: ١٠٠٥٢.

٢. ابن‌ماجه: ٤٠٩٢ بلفظ: «اِزْهَدْ فِي الدُّنْيٰا يُحِبَّكَ اللّٰهُ وَ ازْهَدْ فِيمٰا فِي أَيْدِي النّٰاسِ يُحِبُّوكَ» حاکم فی المستدرك: ٧٩٨٥، طبرانی فی الکبیر: ٥٨٣٩، بیهقی فی شعب الإیمان: ١٠٠٤٣ ـ ١٠٠٤٤.

٣. طبرانی فی الکبیر: ٣٢٨٩ بلفظ: «... فَمٰا حَقِيقَةُ إِيمٰانِكَ؟ فَقٰالَ: قَدْ عَزَفَتْ نَفْسِي عَنِ الدُّنْيٰا، وَ أَسْهَرْتُ لِذٰلِكَ لَيْلِي وَاطْمَأَنَّ نَهٰارِي وَ كَأَنِّي أَنْظُرُ إِلَىٰ عَرْشِ رَبِّي بٰارِزاً وَ كَأَنِّي أَنْظُرُ إِلَىٰ أَهْلِ الْجَنَّةِ يَتَزٰاوَرُونَ فِيهٰا وَ كَأَنِّي أَنْظُرُ إِلَىٰ أَهْلِ النّٰارِ يَتَضٰاغَوْنَ فِيهٰا، فَقٰالَ: يٰا حٰارِثُ عَرَفْتَ فَالْزَمْ» ابونعیم الأصبهانی فی معرفة الصّحابة: ١٩١٦، بیهقی فی شعب الإیمان: ١٠١٠٧ ـ ١٠١٠٦ فی روایة فیه زیادات فی قصّة أمّه.

٤. الزمر: ٢٢. واتە: «هەرکەس خودا دڵی بۆ ئیسلام ئاوەڵا بکات، ئەوە لەسەر تیشکی پەروەردگاریەوەیەتی».

٥. الأنعام: ١٢٥. واتە: «هەرکەس خودا بیەوێ بیخاتە سەر ڕێی ڕاستە، سینگی بۆ ئیسلام ئاوەڵا دەکات».

گوتیان: ئەی نێردراوی خودا! ئایا ئەمە نیشانەی هەیە؟ فەرمووی: «نَعَمْ، اَلتَّجافِي عَنْ دارِ الْغُرُورِ وَ الْإِنابَةُ إِلَى دارِ الْخُلُودِ وَ الْإِسْتِعْدادُ لِلْمَوْتِ قَبْلَ نُزُولِهِ»[1].

واتە: «بەڵی، [نیشانەکانی ئەمانەن:] دوورەپەرێزی لە دونیا کە ماڵی لەخۆبایی‌بوونە و گەڕانەوە بۆ دوارۆژ کە ماڵی هەرمانە و خۆ ئامادەکردن بۆ مەرگ پێش ئەوەی کە بێت».

جابر رَضِيَ اللهُ عَنْهُ فەرموویەتی: پێغەمبەری خودا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ئامۆژگاری دەکردین؛ فەرمووی: «مَنْ جاءَ بِـ"لا إِلٰهَ إِلَّا اللهُ" لا يَخْلُطُ مَعَها غَيْرَها دَخَلَ الْجَنَّةَ» واتە: «هەرکەس "لا إِلٰهَ الَّا اللهُ" بەجێ بهێنێ و جگە لەوە هیچ‌تری تێکەڵ نەکات، ئەوە دەڕواتە بەهەشت».

حەزرەتی عەلی رَضِيَ اللهُ عَنْهُ فەرمووی: باوك و دایکم بە ساقەت بێ ئەی پێغەمبەری خوا! لەبارەی ئەوەی کە ئەبێ تێکەڵی نەبێ، ڕوونکردنەوەیێکمان بۆ بفەرموو، ئەویش فەرمووی:

«حُبُّ الدُّنْيا طَلَباً لَها وَ اتِّباعاً لَها. قَوْمٌ يَقُولُونَ قَوْلَ الْأَنْبِياءِ وَ يَعْمَلُونَ أَعْمالَ الْجَبابِرَةِ فَمَنْ جاءَ بِـ"لا إِلٰهَ إِلَّا اللهُ لَيْسَ فِيها شَيْءٌ مِنْ هٰذا وَجَبَتْ لَهُ الْجَنَّةُ»[2].

واتە: «خۆش‌ویستنی دونیا، بەوەی کە شوێنی بکەوی و بەدوویدا بچی، کەسانێك هەن کە قسەیان قسەی پێغەمبەرانە و کردەوەیان کردەوەی زاڵم و زۆردارانە. ئەدی کەسێ بەڕاستی "لا إِلٰهَ الَّا اللهُ" بەجێ‌بهێنێ ئەوە هیچکام لەم ئاکارانەی تێدا نییە و بەهەشتی بۆ مسۆگر دەبێ».

لە حەدیسدا هاتووە: «اَلسَّخاءُ مِنَ الْيَقِينِ وَلا يَدْخُلُ النّارَ مُوقِنٌ وَ الْبُخْلُ مِنَ الشَّكِّ وَلا يَدْخُلُ الْجَنَّةَ مَنْ شَكَّ»[3].

---

١. حاكم فى المستدرك: ٧٩٧٤، بيهقى فى شعب الإيمان: ١٠٠٦٨، جامع الكبير للسيوطى: ٦٤٥، حرف الهمزة جميعهم بلفظ: «إِنَّ النُّورَ إِذا دَخَلَ الصَّدْرَ انْفَسَحَ ...».

٢. بيهقى فى شعب الإيمان: ١٠٠١٧ بلفظ: «لا يَلْقَى اللهُ أَحَدٌ بِشَهادَةِ أَنْ لا إِلٰهَ إِلَّا اللهُ وَحْدَهُ لا شَرِيكَ لَهُ إِلَّا دَخَلَ الْجَنَّةَ ما لَمْ يَخْلِطْ مَعَها غَيْرَها ... قالَ: حُبُّ الدُّنْيا و أُثْرَةً لَها وَ جَمْعاً لَها وَ رَضِيَ بِها وَ عَمَلَ الْجَبّارِينَ» الحارث فى البُغية: ٢٠١ و فى مسنده: ٢٠٤، ابن‌حجر العسقلانى فى المطالب العالية: ٢٩٤٤ براوايات مختلفة.

٣. لم نجد له أصل بهذا اللّفظ لكن ورد بنحو معناه: «السَّخاءُ شَجَرَةٌ مِنْ شَجَرِ الْجَنَّةِ أَغْصانُها مُتَدَلِّياتٌ فِي الدُّنْيا مَنْ أَخَذَ بِغُصْنٍ مِنْها قادَهُ ذٰلِكَ الْغُصْنُ إِلَى الْجَنَّةِ، وَالْبُخْلُ شَجَرَةٌ مِنْ شَجَرِ النّارِ أَغْصانُها مُتَدَلِّياتٌ فِي الدُّنْيا مَنْ أَخَذَ بِغُصْنٍ مِنْها قادَهُ ذٰلِكَ الْغُصْنُ إِلَى النّارِ» بيهقى فى شعب الإيمان: ١٠٣٧٥ ـ ١٠٣٧٧، جامع الكبير للسيوطى: ٢٤، حرف السّين و فى فتح الكبير: ٧٠٠١.

واتە: «سەخاوەت لە بڕوای ڕاستەقینەوەیە، هەرکەسیش بڕوای ڕاستەقینەی هەبێ ناڕواتە دۆزەخەوە. هەروەها چنۆکی و ڕژدیش لە دوودڵی و دڕدۆنگییەوەیە، هەرکەسیش دوودڵ بێ ناڕواتە بەهەشت».

## پلە و مەقامەکانی دونیانەویستی:

**سێ پلەی هەیە:**

**یەکەم:** کەسێ کە بە زۆر تەرکی دونیا بکات و بە تێکۆشان و هەوڵ و تەقالا دنیا لە خۆی دوور بخاتەوە، لەگەڵ ئەوەی حەزی لێیەتی. ئەمجۆرە کەسە زاهید نییە و موتەزەهیدە واتە: بە زۆر تەرکە دونیایە. ئەمە هومێد هەیە بەردەوام بێت تا زاهید و دونیانەویستی ڕاستەقینەی لێ دەربچێ.

**دووهەم:** کەسێ کە بە ڕەزایەتی دڵ دنیا تەرك بکات، لەبەر ئەوەی بە سووك و پووچەڵی دەزانێ، وێڕای ئەوەی بەچاوی تەماحەوە سەیری دوارۆژ دەکات، هەروەك ئەو کەسەی کە لە دیرهەمێ چاوپۆشی دەکا بۆ ئەوەی بە دوو دیرهەم بگات، ئەمەش لەسەر شانی گران نییە، بەڵام وێڕای ڕەچاوکردنی ئەمانە هەمووی دیسان هەردڵی بەلای ئەو شتەوەیە کە بەجێی هێشتووە، ئەمەش خۆی جۆرێك ناتەواوییە.

**سێهەم:** ـ کە بانترین پلەی هەیە ـ بریتییە لە کەسێ کە بە ڕەزایەتی دڵ تەرکی دونیا بکات و لە خۆپارێز و دوورەپەرێزییەکەیشیدا خۆپارێزی بکات؛ بەم چەشنە کە وا بیر نەکاتەوە کە شتێکی تەرك کردبێ، چونکە لەو بڕوایەدایە کە دنیا هەر شت نییە. وەکوو کەسێ وایە کە قاپە شکاوێ بدات و گەوهەر لەباتی وەربگرێ. ئیدی ئەم دوانە قەت لە بەرانبەر یەکەوە ناوەستن و دونیا لە چاوی دوارۆژ هەر هیچ نییە.

ئەبوویەزید رَحِمَهُ اللَّهُ بە ئەبوومووسای کوڕی عەبدورڕەحیمی گوت: لەبارەی چییەوە قسە دەکەن؟ گوتی: لەبارەی زوهد و پارێزەوە. گوتی: زوهد و پارێز لەچی؟ گوتی: لەدونیا. دەستی تەکان دا و گوتی: وام ئەزانی لەبارەی شتێکەوە قسە دەکەن، دەیخۆ دونیا هەر شت نییە، تا پارێزی لێ بکرێ.

بەلای خاوەن دڵان و دڵڕووناکان و ئەهلی بەسیرەتەوە، نموونەی کەسێ کە لەبەر دوارۆژ تەرکی دونیا دەکات، وەکوو ئەو کەسە وایە کە سەگێ لەبەر دەرکەی ماڵی پاشا بەری گرتووە

و ناهێڵێ بڕواتەماڵەوە. ئەمیش لەتە نانێ دەخاتە بەری و بەوەوە خەریکی دەکات و خۆی دەڕواتە ماڵەوە بۆلای پاشا تا پاشا دەسەڵاتی پێ بدا و لەو وڵاتەدا قسەی بخاتە بڕەوەوە.

جا ئێستا کە ئەم دەسەڵات و ڕێزە کە لای پاشاوە بەدەستی هێناوە لەبەر ئەو لەتە نانەیە کە هاویشتوویەتیە بەر ئەو سەگە!

کە وابوو شەیتان سەگێکە لە بەردەرگانەی خودای مەزن، بەری خەڵك دەگرێ لەوەی کە بڕۆنە ماڵەوە وێڕای ئەوەی کە دەرکە کراوەیە و پەردەش هەڵدراوەتەوە. دنیاش وەکوو ئەو لەتە نانەیە، ئەگەر بیخۆی ئەوە لەو کاتەدا خۆشە، بەڵام کە قووتت دا ئەبێتە هۆی لە دەست دەرچوونی نزیكبوونەوە بە خوداوە و دوابەدواش مەعیدە قورس دەکات، پاشان بۆنی قیزەونیشی لێ دەکەوێتەوە و پێویستی بەوە هەیە کە پیسییەکە لە زك دەربکەی. جا کەسێ کە بە هۆی ئەوەی کە لەتە نانێ نەخوات بە پاشا نزیك بێتەوە، ئیدی چلۆن سەیری ئەو لەتە نانیشە دەکات.

دنیاش ـ مەبەستم ئەوەیە وا هەرکەسێ بەش بە حاڵ خۆی هەیەتی ـ لەچاو دوارۆژدا لە لەتە نانێ بێ‌نرخترە. ئەدی خۆ شتێ کە دوایی دێ لە چاو شتێ کە قەت دوایی نایە بەراورد ناکرێ. دنیاش وێڕای ئەوەی پێ‌گەیشتنی هاسان و نزیکە کەچی زووش دوای دێ هەرچەندەش هەزاران هەزار ساڵ بە بێ‌کۆسپ و لەمپەڕ درێژەی هەبێ، هەر دەستی ئاخر لە ناو دەچێ و نامێنێ.

جا ئێستا کە ئەمانە تێگەیشتی، بزانە کە بەرزترین پلەی پارێز و زوهد ئەوەیە کە لە غەیری خودا پارێز بکەی بۆ ئەوەی بە زاتی خودا بگەی. ئەمەش تەنها بە تێگەیشتنی قووڵ ئەبێ و بە گەیشتن بە پلەی بەرز ئەبێ. ئەدی تۆش لە خۆراك و پۆشاك و ژن و ماڵ و هەرشتێ کە پێویستت پێی هەیە، خۆت بپارێزە، مەگەر هێندەی کە پێی بژی و خۆتی پێ ڕاگری و بەری مەرگی پێ بگری. ئەمەش خۆی زوهد و پارێز و دونیانەویستی ڕاستەقینەیە.

والله أعلم

# بابەتی سی و پێنجەم:
# تاکەپەرستی و پشتبەخوابەستن (توحید و توکل)

## [بەشی یەکەم: خێر و گەورەیی پشت بە خوابەستن]

سەبارەت بە تەوەککول و پشت بە خوابەستن ئایەت و حەدیسی زۆر هاتووە.

خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَ عَلَى اللهِ فَتَوَكَّلُوا إِنْ كُنْتُمْ مُؤْمِنِينَ﴾[1] واتە: «ئەگەر بروادارن، بەس بە خودا پشت ببەستن».

هەروەها خودای مەزن فەرموویەتی: ﴿وَمَنْ يَتَوَكَّلْ عَلَى اللهِ فَهُوَ حَسْبُهُ﴾[2] واتە: «هەرکەس پشت بە خودا ببەستێ، ئەوە خودای بەسە».

هەروەها خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿إِنَّ اللهَ يُحِبُّ الْمُتَوَكِّلِينَ﴾[3] واتە: «بەڕاستی خودا ئەوانەی وا پشتی پێ دەبەستن خۆش دەوێ».

پێغەمبەرﷺ بە پێی ئەوەی ئیبنومەسعوودرضي الله عنه ڕیوایەتی کردووە، فەرموویەتی: «رَأَيْتُ الْأُمَمَ فِي الْمَوْسِمِ فَرَأَيْتُ أُمَّتِي قَدْ مَلَأُوا السَّهْلَ وَ الْجَبَلَ فَأَعْجَبَنِي كَثْرَتُهُمْ وَ هَيْأَتُهُمْ، فَقِيلَ لِي: أَرَضِيتَ؟ قُلْتُ: نَعَمْ، قَالَ وَ مَعَ هٰؤُلاءِ سَبْعُونَ أَلْفاً يَدْخُلُونَ الْجَنَّةَ بِغَيْرِ حِسَابٍ، قِيلَ: مَنْ هُمْ؟ قَالَ اَلَّذِينَ لا يَكْتَوُونَ، وَلا يَتَطَيَّرُونَ، وَلا يَسْتَرْقُونَ وَ عَلَىٰ رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ. فَقَامَ عَكَّاشَةُ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ! أُدْعُ اللهَ أَنْ يَجْعَلَنِي مِنْهُمْ. فَقَالَﷺ اَللّٰهُمَّ اجْعَلْهُ مِنْهُمْ، فَقَامَ آخَرُ فَقَالَ: ادْعُ اللهَ تَعَالَىٰ أَنْ يَجْعَلَنِي مِنْهُمْ، فَقَالَﷺ سَبَقَكَ بِهَا عَكَّاشَةُ»[4].

---

١. المائدة: ٢٣. ٢. الطلاق: ٣. ٣. آل‌عمران: ١٥٩.

٤. بخاري: ٥٢٧٠ ـ ٥٣١١، ترمذی: ٢٣٧٠، احمد: ٣٧٩٠ ـ ٤١١١ بألفاظ مختلفة.

واتە: «لە کۆبوونەوەیێکدا گشت ئوممەتەکانم چاو پێ کەوت کە دەشت و کێویان پڕ کردبوو، سەرمسوڕما لە زۆری و تەرزی بوونیان. پرسیارم لێ کرا کە: ڕازیت؟ گوتم: بەڵێ. گوتی: لەگەڵ ئەمانەدا حەفتاد هەزار کەس بە بێ لێ پرسینەوە دەچنە بەهەشت. بە پێغەمبەریان ﷺ گوت: ئەوانە کێن؟ فەرمووی: ئەوانە کەسانێکن کە بڕوایان نە بە داخکردن هەیە، نە بە فاڵ و حسێب‌گرتنەوە هەیە، نە بە نوشتە و دوعانووسیی ڕەماڵان هەیە، بەڵکوو تەنها بە خودا پشت دەبەستن. عەکاشە رضي الله عنه هەستا و گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! لە خودا داوا بکە بمخاتە ڕیزی ئەوانەوە. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: خودایە! بیخە ڕیزی ئەوانەوە. یەکێ‌تر هەستا و گوتی: لە خودا داوا بکە منیش بخاتە ڕیزی ئەوانەوە.پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: عەکاشە لەمەدا دەست پێش‌خەری کرد.

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «لَوْ أَنَّكُمْ تَتَوَكَّلُونَ عَلَى اللهِ تَعالَىٰ حَقَّ تَوَكُّلِهِ لَرَزَقَكُمْ كَما يَرْزُقُ الطَّيْرَ؛ تَغدُوَ خِماصاً و تَرُوحُ بِطاناً»[1].

واتە: «ئەگەر ئێوە بەو شێوە وا شیاوە پشت بە خودا ببەستن، ئەوە خودا دەتان‌ژیێنێ هەر وەك چۆن پەلەوەر دەژیێنێ؛ بەیانی بە سکی خاڵی لە هێلانە دەردەچێ و ئێوارن بە سکی پڕ دەگەڕێتەوە».

هەرکاتێ کە خەوواس رحمه الله ئەم فەرموودەی خودای گەورەیە: ﴿وَ تَوَكَّلْ عَلَى الْحَيِّ الَّذِي لا يَمُوتُ وَ سَبِّحْ بِحَمْدِهِ وَ كَفَىٰ بِهِ بِذُنُوبِ عِبادِهِ خَبِيراً﴾[2] واتە: «پشت بەو هەمیشە زیندووەی کە قەت نامرێ، ببەستە و پەسن و سپاسی بەجێ بهێنە و هەر ئەمە بەسە کە خودا ئاگاداری گشت گوناحی بەندەکانیەتی»، دەخوێندەوە، دەیگوت: پاش ئەم ئایەتە کەس حەققی نیە پەنا بە کەسی‌تر جگە خودای مەزن بیا.

## بەشی دووهەم: تاکەپەرەستی، بناغەی پشت بە خودا بەستنە

بزانە تاکەپەرەستی ـ کە بناغەی پشت بە خوا بەستنە ـ ئەم وتەیە مانای لێ دەداتەوە: «لا إِلٰهَ إِلَّا اللهُ وَحدَهُ لا شَرِيكَ لَهُ» واتە: «هیچ خودایێ نییە جگە ئەڵلاهـ نەبێ کە تاقە و بێ‌هاوەڵە».

---

١. احمد: ٢٠٠، ترمذی: ٢٣٦٦، ابن‌ماجه: ٤١٥٤، بیهقی فی شعب الإیمان: ١١٣٩ بألفاظ مختلفة.

٢. الفرقان: ٥٨.

هەروەها بریتییە لە ئیمان بە ئەو هێزەی کە ئەم وتەیە مانای لێ دەداتەوە «لَهُ الْمُلْكُ» واتە: «دەسەڵات بەس بۆ خودایە».

هەروەها بریتییە لە ئیمان بە کەرەم و بەخشش و حیکمەتێ کە ئەم وتەیە مانای لێ دەداتەوە: «وَ لَهُ الْحَمْدُ» واتە: «پەسن و ستایش بەس بۆ خودایە».

جا هەرکەسێ مانای ئەم وتەیە بەو شێوە کە شیاوە لە دڵیدا جێگیر ببێت، ئەوە ئەبێت بە کەسێ کە پشت بە خودا دەبەستێ.

## تاکەپەرەستی چوار پلەیە:

تەوحید و تاکەپەرەستی دابەش دەبێ بەسەر «لُبٌّ، لُبُّ اللُّبِّ، قِشْرُ اللُّبِّ، قِشْرُ الْقِشْرِ» واتە: هەروەکوو گوێز چوار تۆوە، کاکڵە، پێستی کاکڵە، توێکڵی سەر کاکڵە، کەمکۆڵی سەر توێکڵەکە».

یەکەم: بەس بە زمان ئیمانهێنان، وەکوو کەمکۆڵی سەر توێکڵە و ئیمانی ـ خودا بمانپارێزێ ـ مونافقان و دووڕوانە.

دووهەم: ئیقرار و دانپێدانان بە دڵ و بە زمان بەو شێوە کە شیاوە. ئەمە ئیمانی گشت موسڵمانانە.

سێهەم: ئیمانێکە کە لە ڕێی کەشفەوە پەیدا دەبێ، ئەمە تایبەتی موقەڕڕەبین و نزیکانی خودایە، ئەمەش بە دیتنی زۆر هۆکار پەیدا ئەبێ، بەڵام وێڕای زۆربوونی ئەم هۆکارانە، هەر هەمووی لەلایەن تاکە کەسێکەوە دەردەچێ.

چوارەم: جگە خودای تاق نەبێ هیچیتر نابینێ، ئەمەش بریتییە لە ئیمانی سیددیقین، ئەمەش لە زاراوەی ئەهلی تەسەووفدا پێی ئەڵێن: «اَلْفَناءُ فِي التَّوْحِيدِ» ئیدی ئەم کەسە تەنانەت خۆیشی نابینێ مەگەر ئەوەی کە لە زاتی حەقدا نوقم بووە. مەبەستی ئەبوو یەزیدیش هەر ئەمە بوو کە دەیفەرموو: «یادی ئەو یادی خۆمی لەبیر بردمەوە».

یەکەمینیان: کە ئیمانهێنانە بەس بە زمان، هیچ کەڵکێکی نییە جگە لەوەی گیان و ماڵی لە شمشێری موسڵمانان حەرام ئەبێ، چونکە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «فَإِذَا قَالُوهَا عَصَمُوا مِنِّي دِمَاءَهُمْ وَ أَمْوَالَهُمْ»[1] واتە: «هەرکاتێ ئەو وتە بڵێن (لا اله الا اللّه...) خوێن و ماڵیان پارێزراوە».

---

١. بخاري: ٢٤ ـ مسلم: ٣١ ـ ٣٢ ـ ٣٣، ترمذي: ٣٢٦٤، نسائي: ٣٠٤٢ ـ ٣٩٠٨ ـ ٣٩١٢ ـ ٣٩١٦، ابن‌ماجه: ٣٩١٧ ـ ٣٩١٨.

**دووهەمینیان:** موەحەید و تاکەپەرەستە، بەم مانایە کە بە دڵ بڕوای هەیە بە مانای ئەم وشەیە، بە بێ ئەوەی گومانی لە دڵدا بێ، بەڵام هێندەی هەیە کە دڵی هێشتا نەکراوەتەوە ئەم حاڵەتە خاوەنەکەی لە ئەشکەنجە و عەزابی دۆزەخ دەپارێزێ، بەو مەرجەی لەسەر ئەو بڕوایە بمرێ و بە گوناحکردن ئەم ئیمانەی لاواز نەکات...

**سێهەمینیان:** تاکەپەرەستە، بەو مانایەی کە دڵی کراوەتەوە و جگە تاك نەبێ چیتر نابینێ، دەزانێ هەرچەندەش هۆکارەکان زۆر بن، بەڵام هەموو هەر لەلای خودایەوەی دەزانێ.

**چوارەمینیان:** تاکەپەرەستە، بەو مانایەی کە تەنانەت لە دڵ و لە شهوودیشدا جگە لە حەق تەعالا نەبێ هیچیتر لە دڵیدا جێی نابێتەوە و هیچ هۆکارو واسیتەیێ لە نێواندا نابینێ و تەنانەت خۆیشی نابینێ، [بەڵکوو هەموو بە تێکڕا لە خودا فەنا بوون]، ئەم پلەیەش بەرزترین پلەیە کە بریتییە لە ڕۆنی کاکڵە گوێزەکە کە باسی ڕابورد، هیچ گوتە و قسە و دەربڕینێ لەم حاڵەتە چوارەمدا نییە، بەڵکوو گوتەو قسەو دەربڕین لە حاڵەتی سێهەمدایە، واتە: ئەو حاڵەتەی کە خودای تاك دەبینێ و هەرچی شتە بەیەك دەبینێ، چونکە دەزانێ هەر هەمووی لە خودای تاکەوە دەکەوێتە ڕوو.

لەم کاتەدایە ئەو کەسەی کە هێشتا پرشنگی نووری خودا کە لەم ئایەتەدا باسی دەکات: ﴿أَفَمَنْ شَرَحَ اللَّهُ صَدْرَهُ لِلْإِسْلَامِ فَهُوَ عَلَىٰ نُورٍ مِنْ رَبِّهِ﴾[1]. واتە: «ئایا مەگەر هەرکەسێ کە خوداوەند دڵی بۆ ئیسلام ئاوەڵا بکات، وا بە سەر تیشکی خوداوە؟» نەکەوتۆتە دڵی و بەو نوورە ڕووناك نەبۆتەوە، دەڵێ: چلۆن ئەکرێ ئەم گشتە بە تاك ببینرێ؟!

ئەم کەسە دیارە فرەبوونی ئاسمانەکان و زەمین و فرەبوونی ژمارەکان دەبینێ.

جا ئێستا بزانە کەشف و درکاندنی ئەم سیڕڕ و نهێنییانە بە هیچ لەونێ دروست نییە، چونکە هەندێ لە خواناسان و دڵڕووناکان فەرموویانە: «إِفْشَاءُ سِرِّ الرُّبُوبِيَّةِ كُفْرٌ» واتە: «درکاندنی نهێنییەکانی خوداوەند کوفرە». بەڵام لێرە هێندە باس دەکەین کە دڵت تەسکینی بۆ بێت و دابمەزرێ: شت هەیە بەجۆرێ بۆی بڕوانی زۆرە و بە جۆرێتر کەمە وەکوو ئینسان کە بە پێی ئەندام زۆرە کەچی تاکە کەسێکیشە و هەر بەیەك کەس دەبینرێ، نە زۆرتر. ئەدی هەمووشتێکیش کە لە بوونەوەردایە هەر وایە، چ خالق و چ مەخلوق، واتە: بە چەند لایەن

---

١. الزمر: ٢٢.

و ئیعتیبار زۆرە و بەپێی لایەن و ئیعتیبارێکیش تاکە، ئەو نموونەی ئینسانە کە هێنامانەوە ـ هەرچەندەش کە پرپێستی نییە و بەرانبەری بە تەواوی دروست نییە ـ بەڵام هێندەی هەیە کە ئاگادارمان دەکاتەوە کە شت هەیە بە ئیعتیباریّ زۆرە و بە ئیعتیباریّتر تاك و یەکە.

حوسەینی کوڕی مەنسووری حەللاج رَحِمَهُ اللَّهُ بەمە حاڵەتە ئاماژە دەکات، کاتیّ کە دەبینیّ خەوواس رَحِمَهُ اللَّهُ لەنێو بیابان و سارادا خۆی وێڵ و دوور دەخاتەوە، دەپرسیّ: لەچیدای؟

دەفەرمیّ: خۆم لەم بیابان و دەشتەدا وێڵ کردووە تا حاڵەتی خۆم سەبارەت بە تەوەککول و پشت بەخودا بەستن چاك بکەم.

حوسەینیش رَحِمَهُ اللَّهُ دەفەرمیّ: ئەتۆ تەمەنت بۆ ئاوەدانیی دەروونت بەسەر بردووە، ئەدی فەنابوون لە خودا لە کوێدایە و کەیە؟!

خەوواس رَحِمَهُ اللَّهُ لەم کاتەدا لە پلەی سێهەمدا بووە و حوسەین داوای لیّ کردووە کە بۆ پلەی چوارەم تێپەڕیّ.

ئێستا ئەگەر داوام لیّ بکەن کە گوایا پلەی چوارەم بۆ ڕوونکردنەوە ناشیّ، ئەدی پلەی سێهەمان بۆ شی بکەرەوە.

ئەمنیش ئەڵێم: ئەم پلەیە بەمجۆرەیە کە ئیمانت هەبیّ جگە خودا نەبیّ هیچ خالقیّ نییە، هەروەها زەڕڕەیەکیش لە ئاسمان و زەمیندا بە بیّ ویستی خودا ناجووڵیّ، هەروەها نە گەدایی، نە دەوڵەمەندی نە مەرگ، نە ژیان بە بیّویستی خودا نابیّ، هەر خودایە کە بەدیهێنەری هەموو شتە، هەرکەسیّ ئەمە ببینیّ و بزانیّ کە هیچ خودایی جگە ئەڵڵاه نییە، لە غەیری خودا بیّنیاز دەبیّ و ئاوڕ لە هیچ ناداتەوە، چونکە تێگەیشتووە کە هەمووشتیّ لە ژێر دەسەڵاتی خودادایە.

ئەمەش وەکوو ئەوەیە کە کاتیّ کەسیّ بڕیاری ئازادی لەلایەن پاشاوە بۆ دەربچیّ، دیارە ئەو کەسە بۆ قەڵەم و قاقەز ناڕوانیّ و سپاس لە ئەوان بکات، بەڵکوو بۆ ئەو کەسە دەڕوانیّ و سپاسی دەکات کە بڕیارەکەی دەرکردووە، ئەو کەسەش پاشایە. جا هەرکەسیش بۆ غەیری خودا لە ئەسبابەکانیتر بڕوانیّ ئەوە هەر وەکوو ئەو کەسە وایە کە بۆ قەڵەم و قاقەز و جەوهەر بڕوانیّ و سپاس و دەسخۆشی لەوان بکات. ئەو تاکە پەرەستەی کە باسمان لێوە کرد (تاکەپەرەستی پلەی سێهەم) کەسێکە کە جوانی و مەزنی پاشا (خودا) نوقمی خۆی کردووە

و ماق بووه و ناتوانێ ئاوڕ له قەڵەم و قاقەز بداتەوە یان تەنانەت بێ بە دڵیشیدا کە هەر قەڵەم و قاقەزێ بوونی هەیە، یان هەر ببینێ و باسی بکات.

جا ئێستا ئەگەر بڵێی: ئەمە لە شتە بێگیانەکاندا کە وان لە بەردەستدا و بێویستن قەناعەتی پێ دەکەم و لێی تێگەیشتم، بەڵام ئێستا ئەبێ چلۆن لەمەڕ ئینسانێکدا کە ویستی بە دەست خۆیە؛ چ بۆ خێر، [چ بۆ شەڕ،] چ بۆ بەخشین و چ بۆ نە بەخشین، ئەمە تێبگەم؟!

هەروەها چلۆن ئەم کردەوانەی بگەڕێنمەوە سەر سەرچاوە و نیسبەتی لەخودا بدەمەوە؟!

منیش ئەڵێم: ئەمە هەڵەتێکە کە زۆر کەس پێیان تێیدا هەڵخلیسکاوە مەگەر ئەو بەندە چاکانەی کە پوخت بوون و شەیتان هیچجۆرە دەسەڵاتێکی بەسەریانەوە نییە، ئەوانەی کە بە تیشکی چاوی بەسیرەتیان دەبینن کە نووسەرەکەش خۆی مەجبوور و دەستەمۆیە، هەر وەك چۆن خەڵکی ئاسایی دەزانن کە قەڵەم خۆی خاوەن ویست نییە بەڵکوو لە ئیختیاری نووسەردایە. ئەو بەندە پوختانە دەزانن کە هەڵەی ئاسایی لەوەدایە کە وا دەزانن کە نووسەرەکەش خاوەن ئیختیارە، وەکوو هەڵەی مێلوورەیێ وایە کە بەسەر کاغەزێکەوە ڕێ بکات و نووسەرەکەش بە قەڵەمەکەی لەسەری بنووسێ، ئەو مێلوورە لەبەر تەنگی و بڕنەکردنی چاوانی وا دەزانێ کە ئەو قەڵەمەیە کە خەریکە ئەنووسێ و بە ویستی خۆیشی هەڵدەسووڕێ، ئیدی چاوی بڕ ناکات تا دەست و پەنجەی نووسەرەکە ببینێ چ بگات بەوەی کە خاوەن دەست و پەنجەکە ببینێ. بۆ خۆی لێرەدا دەکەوێتە هەڵەوە و وا دەزانێ کە ڕەشکەرەوەی ئەم کاغەزە هەر قەڵەمەکەیە و بەس. ئەمەش لەبەر بڕنەکردنی چاوی بۆ بینینی دەست و خاوەن دەستەکەیە. ئەدی هەر ئاوەهاش ئەوانە کە دڵیان بە تیشکی خودا ڕووناك نەبۆتەوە و سینیگیان بۆ ئیسلام ئاوەڵا نەکراوە، بەرچاویان تەنگە و بڕ ناکات لەوەی کە ببینن ئەم بوونەوەرانە؛ بە ئاسمانەکان و زەمینەوە هەر هەمووی لە خودای بێباکەوەیە و لە ژێر دەسەڵاتی ئەودایە[1].

ئەوانەی کە خودا خستوونیەتە بەر تەوفیق و یارمەتی خۆی و سینگیانی بە تیشکی خۆی ڕووناك کردۆتەوە، لە سەرەوەی ئەمانە شت دەبینن، چونکە خودای مەزن سەبارەت بەوان هەرچی زەرڕاتی بوونەوەرە لە ئاسمان و زەمیندا بە دەسەڵاتی خۆی هێناویەتیە قسە، ئەو

---

١. ئەم بەندە لە ڕووی ئیحیاوە هەندێ گۆڕانکاری تیا کراوە ـ وەرگێڕ.

دەسەڵاتەی کە هەموو شتێکی پێ هێناوەتە گوفتار؛ تەنانەت ئەم جۆرە کەسانە (پیاوچاکان) دەنگی تەسبیح و تەقدیسیان بۆ خودا دەبیسن و گوێیان لێیە کە بە زمانێکی پاراو دان‌دەنێن بەوەی کە عاجز و ناتەوانن بەرانبەر بەخودا. ئەم تەسبیح و ئیقرارانە هەر هەمووی بە زمانێکی پاراو و بێ‌گرێ و گۆڵ دەیڵێن، بە بێ‌ئەوەی پیت و دەنگێکی هەبێ، ئیدی کەسانێ کە لەگوێی مەعنەوی بێ بەشن نایبیسن.

هەر زەڕڕە و نیتکەیێ لەم بوونەوەرەدا، هاوڕای خاوەن دڵان نزا و پاڕانەوەیان بۆ خودا هەیە، ئەمەش خۆی لە وتە نهێنییەکانی خودای مەزن دێتە ئەژمار، ئەو وتانەی کە دوایی هاتنیان بۆ نییە، هەروەك چۆن خودای مەزن فەرموویەتی:

«قُلْ لَوْ كٰانَ الْبَحْرُ مِدٰاداً لِكَلِمٰاتِ رَبِّي لَنَفِدَ الْبَحْرُ قَبْلَ أَنْ تَنْفَدَ كَلِمٰاتُ رَبِّي وَ لَوْ جِئْنٰا بِمِثْلِهِ مَدَداً»[1].

واتە: «بێژە: ئەگەر بۆ نووسینی وتەکانی پەروەردگارم دەریا هەموو مەرەکەف بێ، بەرلەوەی وتەکانی پەروەردگاری من تەواو بێ، بەحر وشکاوی دێ، هەرچەندەش هێندەی‌تری بەسەردا بکەین».

بەم چەشنە بۆ هەتاهەتایی خاوەن دڵان لەگەڵ نهێنییەکانی خودای مەزندا موناجات و دەنگ‌وباسیانە، بەڵام درکاندنی هەر نهێنییەك تاوانە، بەڵکوو سینگی پیاوچاکان گۆڕیچەی نهێنیەکانە، ئاخۆ ئەتۆ قەت دیوتە کە ئەمینداری نهێنییەکانی پاشا، نهێنییەکان بدرکێنێ و لەنێو خەڵکدا بڵاویان بکاتەوە.

جا خۆ ئەگەر نهێنی و سیرڕی حەقێقەت درکاندنی دروست بوایە، هیچ‌کات پێغەمبەر ﷺ ئاوەهای نەدەفەرموو: «لَوْ عَلِمْتُمْ مٰا أَعْلَمُ لَضَحِكْتُمْ قَلِيلاً وَ لَبَكَيْتُمْ كَثِيراً»[2]. واتە: «ئەگەر ئەوەی من دەیزانم ئێوە بتانزانیایە، کەم پێ‌دەکەنین و زۆر دەگریان».

پێغەمبەرﷺ ئەمەی باس کردووە بۆیان تا چیدی پێ‌نەکەنن و خەریکی گریان بن.

---

١. الکهف: ١٠٩.

٢. بخاری: ٩٨٦ ـ ٤٢٥٥ ـ ٤٨٢٠ ـ ٦٠٠٤ ـ ٦٠٠٥، مسلم: ٤٣٥١، ترمذی: ٢٢٣٤ ـ ٢٢٣٥، نسائی: ١٤٥٧ ـ ١٤٨٣، ابن‌ماجە: ٤١٨٠ ـ ٤١٨١.

هەروەها ئەگەر درکاندنی سیرڕی قەزاو قەدەر دروست بوایە، نەهیی نەدەفەرموو و نەیدەگوت: «إِذَا ذُكِرَ النُّجُومُ فَأَمْسِكُوا، وَإِذَا ذُكِرَ الْقَدَرُ فَأَمْسِكُوا، وَإِذَا ذُكِرَ أَصْحَابِي فَأَمْسِكُوا»[1].

واتە: «هەرکاتێ باسی ئەستێرەکان (ئەستێرەشناسی) هاتە پێشەوە دەست هەڵگرن، هەرکاتێ باسی قەزاو قەدەر هاتە بەرەوە دەست هەڵگرن، هەرکاتێ باسی یارانی من هاتە پێشەوە دەست هەڵگرن (واتە بێ خەبەرانە لە بارەیانەوە قەزاوەت مەکەن)».

هەروەها ئەگەر ڕازی ئیلاهی درکاندنی ڕەوا بوایە، پێغەمبەرﷺ حوزیفەی نەدەکردە ڕازداری هەندێ لە ڕازەکانی.

ئێستاش بەهیوای ئەوەی لەم باسە تێبگەی و ڕوون ببێتەوە، وێنەیێك ئەهێنینەوە و ئەڵێین: یەکێك لەو کەسایەتیانە کە لەبەر ڕووناکی نووری خوداوە بۆ شتەکان دەیڕوانی، جارێك لەگەڵ لاپەڕە قاقەزێکدا کە ڕووەکەی بە مەرەکەف ڕەش بوو بووەوە، هاتە قسە و فەرمووی: ئەرێ بۆچی ڕووت ڕەش کراوە و لە چییەوەیە کە وات لێ هاتووە. قاقەزەکەش گوتی: سەبارەت بەم پرسیارە لەگەڵ مندا بێ ئینسافی بە خەرج مەدە! ئەمن خۆ ڕووی خۆمم ڕەش نەکردووە، بەڵکوو لەمبارەوە مەرەکەف بەرپرسیارە، چونکە ئەو سەرجەم لەنێو جەوهەردانێکدا بوو و لەوێ هەڵسا و بە زۆرەملێ و لەڕووی دوژمنییەوە خۆی بەسەر ڕوومەتی مندا ڕژاند.

پیاوە وەلیەکەش گوتی بە قاقەزەکە: ڕاست دەکەی.

هات و پرسیاری لە مەرەکەفەکە کرد. ئەویش گوتی: ئەمنیش بێتاوانم و سەبارەت بە من بە ویژدان نەبووی، چونکە ئەمن بێکشە لەبن جەوهەردانەکەدا دانیشتبووم و ئەمویست لەو جێگەی خۆمە قەت نەجووڵێم، لەناکاو قەڵەم تێم هەڵچەقی و لەجێی خۆمی کەندم و لەت و پەت و پرشە پرشەی کردم بەسەر لاپەڕەی سپی ئەم قاقەزەوە، هەروەك چۆن دەیبینی. ئەبێ لەو پرسیار بکەی نەك لەمن.

پیاوە وەلییەکە دیسان بەمیشی گوت: ڕاست دەکەی.

پاشان پیاوەکە سەبارەت بەم دەستدرێژی و زوڵمە کە بەرانبەر بە مەرکەفەکە کراوە، لە قەڵەمەکە پرسیاری کرد: کە بۆچی لە ماڵی خۆی دەری کردووە؟!

---

١. طبراني في الكبير: ١٤١١ ـ ١٠٢٩٦، جامع الكبير للسّيوطي: ١٩٦٢، حرف الهمزة، بيهقي في القضاء والقدر: ٣٧٨.

قەڵەمیش هاتە جواب و گوتی: لە دەست و پەنجە بپرسە، ئەمن قامیشێك بووم لە لێوی ڕووبارێكدا لە نێوان سەوزەڵانی و داراندا بە ڕێكوپێكی ڕوا بووم. لە ناكاو دەستێك بە چەقۆییێكەوە هات و تۆڵاشەی لەبەرم دارنی و لە ڕیشەمی كەند و قەڵەمەی كردم و تاشیمی و سەری لەت كردم و چەقاندمی بە نێو مەرەكەفدا، هەر ئەویش سووری دام و بەسەر سەرمدا هەڵی خولاندم. ئێستاش ئەتۆ بەم گلەیی و پرسیارەت خوێت كردە سەر برینم. داوات لێ دەكەم لێم‌گەڕێ و لەو كەسە پرسیار بكە كە ئەم پەنەی بە سەرما هێناوە.

پیاوەكە گوتی: ئەتۆش ڕاست دەكەی.

پاشان سەبارەت بەم زوڵم و دەستدرێژییە بەرانبەر بە قەڵەم پرسیاری لە دەست كرد. ئەویش گوتی: ئەمن چیم؟ من جگە لە گۆشت و خوێن و ڕەگ و پێشە هیچی‌تر نیم. ئەتۆ بۆچی دیوتە جەستەی لە خۆیەوە هەڵسووڕێ؟! ئەمن وەك بارگینێك بێ‌دەسەڵات وام كە بەرگوێ و دەستەمۆی سوارەكەیە. سوارێ بە ناوی هێزو گوڕ سواری من بووە و ئەوە من هەڵدەسووڕێنێ و سووچاوسووچی دونیا دەمگەڕێنێ. ئەتۆ سەیر ناكەی كە خاك و خۆڵ و دار و بەرد لەسەر جێی خۆی ناجمێ و بە خۆی ناسووڕێ، چونكە سوارێ وەكوو ئەم سوارە بە دەسەڵات و بەهێزە سواری نەبووە. مەگەر نەتدیتووە دەستی مردوو هەر وەكوو ئەو شتە بێ‌گیانانە وایە و نە ئەجووڵێ، نە قەڵەم لەخۆی ئەگرێت. ئەمنیش لەو بوارەوە كە هەر خۆم بم هیچ پێوەندی و دان‌وستانێكم لەگەڵ قەڵەمدا نییە. ئەدی تۆش لە هێزو گوڕ سەبارەت بە من پرسیار بكە، چونكە ئەمن بێ‌دەسەڵاتم و هەوسارم بە دەست هێزو گوڕەوەیە.

پیاوەكەش بە دەستی گوت: ئەتۆش ڕاست دەكەی.

پاشان پیاوەكە سەبارەت بە بەكارهێنان و هەڵسووڕانی دەست، لە هێزو قودرەت پرسیاری كرد. ئەویش گوتی: ڕووی گلەی لە من مەكە؛ چونكە زۆر لۆمەكەر هەیە كە خۆی لۆمەكراوە و زۆر لۆمەكراویش هەیە بێ‌تاوانە. ئەدی ئێستا تۆ چلۆن لێت تێك چووە و وا دەزانی ئەمن ستەمم بەرانبەر بە دەست كردووە و ئەمن پێش ئەوەی دەست بشجووڵێ هەر لە نێویدا بووم و نەشم ئەجووڵاند و هەڵمنەئەسووڕاند، بەڵكوو بێ‌دەنگ و كش‌ومات مانم گرتبوو، بەجۆرێ گومانبەران وایان دەزانی كە من مردووم، یان هەر نەماوم؛ چونكە نە دەجووڵامەوە و نە ئەمجووڵاند، تا كاتێ كە نوێنەرێ هاتە لام و هانی‌دام تا بەو شێوەی كە دەیبینی، كایەی

پێ کردم. ئەمن دەتوانم یارمەتی ئەو نوێنەرە بدەم، بەڵام ناتوانم بێگوێیی بکەم. ئەم نوێنەرە پێی دەڵێن: ویست و ئیرادە. ئەمن جگە ناو و هێرش و زاڵبوونی نەبێ، هیچی لەبارەوە نازانم، چونکە بە گوشاری بۆ هێناوم و لە خەوی شیرین ڕاپچڵەکاندووم و ئەو ئیشەی پێ کردووم، خۆزگە دەستی لەسەرم هەڵدەگرت.

پیاوە وەلییەکە گوتی: ئەتۆش ڕاست دەکەی.

پاشان پرسیاری لە "ویست و ئیرادە" کرد: ئەرێ چی تۆی هەڵناوە تا بەم شێوە بەسەر "هێزو قودرەت"دا ـ کە بێدەنگ و ئارام بوو ـ زاڵ بیت و وەهای لێ بکەی تا دەست بجووڵێنێ بەجۆرێ کە هیچ ڕێگە دەربازبوونێکی لەتۆ نەبێ؟!

ئیرادەش، گوتی: پەلە مەکە، لەوانەیە منیش بیانوو و بەڵگەیێکم بۆ خۆم بێ. ئەمن لە خۆمەوە هەڵنەستاوم، بەڵکوو هەڵسێنراوم، لە خۆمەوە نەهاتووم، بەڵکوو نێردراوم، لە لایەن دەسەڵاتدار و فەرماندارێکی هەرە مەزنەوە. ئەمن پێش ئەوەی فەرمانم پێ بگات بێدەنگ و ئارام بووم، بەڵام لە لایەن جەنابی دڵەوە پەیامی عیلمم لەسەر زمانی عەقڵەوە بۆ هات کە فەرمان بە قودرەت بدەم و ئەمنیش ئەوم بەزۆر کرد بە دیل و فەرمانبەرداری خۆم. ئەمن بێچارە و بێدەسەڵاتم و لە بەردەست دەسەڵاتی عیلم و عەقڵدام و نازانم لەبەر چی ئاوەها کارم پێ ئەکرێ و بۆچی مەجبوور کراوم؟! بەڵام هێندە دەزانم ئەگەر فەرمان و پەیامی ئەم فەرماندارە عادڵە، یان زاڵمەم پێ نەگیشتبا، ئەوا ئارام و بێدەنگ بووم و ئەم کەتنەم بەسەردا نەدەهات.

ئەمن تۆزێ لەسەر ئەو بڕیارەی ڕاوەستام و بە هەر لەونێ بوو خۆم گوێڕایەڵی فەرمانی کرد، چونکە هیچ دەرەتانێکم بۆ خۆلادان و خۆبواردن نەبوو. بە گیانت قەسەم تا کاتێ کە ئەو فەرماندارە لە نێو ئەندێشە و تێفکریان و دوو دڵیدایە و خەریکی سەراسۆکردنە، ئەمن ئارام و مەندم، وێڕای ئەوەی چاوەڕوان و بەتەمای فەرمانیم. بەڵام هەر ئەوەندە دڵی خۆی یەکلا کردەوە و ویستی کارێ بکات، من پێویستە بە پێی سروشت و خیلقەتم گوێڕایەڵی ویستی ئەو بم و فەرمانی بەجێ بهێنم و هێزو قودرەت بهێنمە ژێر ڕکێفی خۆم، بۆ ئەوەی فەرمانەکەی ئەو جێبەجێ بکەین. ئێستاش ئەتۆ لە عیلم و عەقڵ سەبارەت بە من پرسیار بکە، بزا ئەمن هەر وەکوو شاعیر ئەڵێ وەها نیم:

«مَهْمٰا تَرَحَّلْتَ عَنْ قَوْمٍ وَ قَدْ قَدَرُوا أَنْ لا تُفٰارِقَهُـمْ، فَالرّٰاحِـلُونَ هُـمُ»

واتە: «هەرکاتێ تۆ لەلای هۆزو خێڵێك بار بکەی، کە ئەوان وایان دانابێ کە تۆ هەر لێیان جیا نابیتەوە، ئەوە بێ‌گومان ئەوان کۆچەرن».

پیاوەکە گوتی بە ئیرادەش: ئەتۆش ڕاست دەڵێی.

ئەمجار پیاوە وەلییەکە ڕووی لە عیلم و عەقڵ و دڵ کرد و دەستی کرد بە لۆمە و سەرکۆنەکردنیان، لەسەر ئەوەی کە ئیرادەیان هەڵناوە و دنەیان داوە بۆ ئەوەی قودرەت بخاتە گەڕ و کاری پێ بکات.

لە وڵامدا عەقڵ گوتی: ئەمن بە چەشنی چرایەکم، خۆم بۆ خۆم ڕۆشن نەبووم، بەڵکوو دایانگرساندووم.

دڵیش هەروەها گوتی: ئەمنیش بە چەشنی تەختەیێکم، بۆ خۆم ڕێکوپێك و خەڕاتی کراو نیم، بەڵکوو داتاشراوم و خەڕاتی کراوم.

عیلمیش هەروەها گوتی: ئەمنیش نەقش و نیگارێکم بەسەر سپیایی تەختەی دڵەوە هەڵکەنراوم و لەبەر ڕووناکی عەقڵەوە دەرکەوتووم. دەنا خۆم بۆ خۆم نەکێشراوم و ساڵەهای ساڵ ئەم تەختەی دڵە خاڵی لەمن بووە. ئێستا ئەتۆ پرسیار لە قەڵەم بکە، چونکە نەقش و نیگار بێ قەڵەم ناکێشرێ و ئەو بەرپرسە.

لێرەدا پیاوە پرسیارکەرەکە وەڕز بوو و وڵامی هیچکامیان کەڵکی نەبوو بۆی. گوتی من لەم‌بارەوە پرسیاری زۆرم کرد و زۆر ئەملاو ئەولایان پێ کردم، ئەم بۆلای ئەوم دەنێرێ و ئەویش دەسبەسەری لای کەسێ‌ترم دەکات. بەڵام وێڕای ئەم هەموو هاتن‌و چوونە دیسان هەر شاد و بەکەیفم، چونکە لە زمانی هەر هەمووی ئەمانەوە قسەیێکم بیستووە کە قەناعەتم پێ کردووە و دڵم ڕازی بووە و هەرکامیان بیانوویێکیان هێناوەتەوە کە وەردەگیررێ.

بەڵام ئەی عیلم تۆ ئەوەی کە گوتت: من نەقش و نیگارم، ڕاست دەکەی، بەڵام ئەوە کە گوتت قەڵەم منی کێشاوە بەسەر دڵەوە لێی تێنەگەیشتم. چونکە ئەمن قەڵەمێ جگە ئەو قەڵەمانەی کە لە قامیش ساز دەکرێ و تەختەیێ جگە تەختە چێوی و خەتێ جگە بە مەرەکەف و چرایێ جگە لە ئاگر نەبێ هیچی‌ترم پێ شك نایێ و نەمدیتووە. کەچی ئێستا ئێوە هەمووتان لێرە باسی تەختە و چرا و خەت و قەڵەم دەکەن. ئەمە چ شتێکە کە دەنگی هەیە و ڕەنگی نییە؟!

عیلم گوتی: ئەگەر ڕاست بکەی و خۆت لە گێلی نەدابێ، ئەوە دیارە زۆرکەم شارەزایت و تۆشەی زانستت کەمە و وڵاخی سەفەرەکەت لەڕ و قرخنە، تەنگ و چەڵەمەی زۆرت لەڕێدایە، باش وایە پاشگەز ببیتەوە و لەم بڕیارەی وا داوتە هەڵگەڕێیتەوە.

ئەمە نابێتە نان بۆ تۆ و سەر ڕێگەی خۆت بگرە و وەرگەڕێوە. هەرکەسێ بۆ شتێ دروست کراوە. ئەگەریش هەر سووری لەسەر بڕیارەکەت، ئەوە گوێ شل کە بۆ بیستنی ئەم قسانەم:

## بزانە لە درێژەی ئەم ڕێگەیەتدا سێ عالەم هەیە:

یەکەم: عالەمی شەهادەت، واتە: ئەم عالەمەی کە بە چاوی سەر ئەبینرێ و بە ئەندامەکانی‌تر هەستی پێ دەکرێ. قاقەز و مەرەکەف و قەڵەم و دەست... لەم عالەمەن. تۆش بە ئاسانی ئەم عالەمەت تێپەڕاندووە.

دووهەم: عالەمی مەلەکووت، واتە: عالەمی پشتی پەردە کە بە چاو و ئەندامەکان هەستی پێ ناکرێ و وا لە پشت سەری ئێمەشەوە. ئەگەر لەمن تێ‌پەڕیت و خۆت بگەیێنیتە ئەوێ تووشی دەشتێکی فەراخ و بەربڵاو ئەبیت کە کێوەکانی بەرز و سەرکەشن و بەحرەکانی قووڵ و بێ بنن، منیش نازانم پێت بڵێم کە چۆن خۆت بپارێزیت.

سێهەم: عالەمی جەبەرووت، واتە: عالەمێ کە لە نێوان عالەمی مەلەکووت و شەهادەتدایە. ئێستا ئەتۆ سێ قۆناغت لەم عالەمە تێپەڕاندووە کە بریتین: لە قۆناغی قودرەت، ئیرادە، عیلم. ئەم سێ قۆناغە لە نێوان دوو عالەمی مەلەکووت و شەهادەتدایە، چونکە نە بە ئاسانی عالەمی شەهادەتن و نە بە سەختی عالەمی مەلەکووتن.

ئەم عالەمی جەبەرووتە لە نێوان ئەو دوو عالەمەکەی‌تردایە، بە چەشنی کەشتییێك کە لە نێوان ئاو و زەمیندایە، نە بە قەدەر ئاوەکە ناسەقامگیر و شەپۆلاوییە، نە بە قەدەر زەمینیش بێ جووڵە و ئارامە. هەرکەسێ کە بە سەر زەمیندا هەنگاو بنێ، لە نێو عالەمی شەهادەدایە، جا ئەگەر توانی سواری کەشتی ببێت ئەوە توانیویەتی بچێتە عالەمی جەبەرووت، جا ئەگەر توانی بە پێ‌پەتی بەسەر ئاودا بگەڕێ ئەوە وەکوو عالەمی مەلەکووت وایە و دەتوانێ لەوێ بە بێ هیچ سەختییێك بگەڕێ. جا ئێستا ئەگەر تۆ ناتوانیت بەسەر ئاودا بچی بەڕێوە، بگەڕێرەوە، چونکە تۆ لە زەمین و کەشتی تێپەڕیویت و لە ژێر پێتدا تەنها ئاو هەیە.

ئەووەڵین قۆناغی عالەمی مەلەکووت ئەوەیە کە بتوانی قەڵەم ببینی، ئەو قەڵەمە خوداییە کە عیلمی پێ دەنووسرێ و ئەو دڵنیاییەت بۆ پەیدا دەبێ کە دەتوانی بەسەر ئاودا پێ بنێیت. مەگەر فەرموودەی پێغەمبەرتﷺ سەبارەت بە حەزرەتی عیساعَلَيْهِ‌السَّلَامُ نەبیستووە؟

«لَوِ ازْدَادَ يَقِيناً لَمَشَىٰ عَلَى الْهَوَاءِ»[1] واتە: «ئەگەر دڵنیایی و یەقینی پتر بوایە، بەسەر هەوادا دەگەڕا». کاتێ کە بە حەزرەتی پێغەمبەریانﷺ گوت: کە عیساعَلَيْهِ‌السَّلَامُ بەسەر ئاودا دەچوو بە ڕێدا.

پیاوە وەلییەکە گوتی: لەخۆم سەرم سوڕماوە و هەست بە ترس دەکەم و دڵەڕاوکێم هەیە لەو شتانەی کە تۆ لە بارەی مەترسی ئەم ڕێگەوە باست کرد. نازانم بتوانم ئەم ڕێگە ببڕم یان نا. ئاخۆ مەشخەڵ و نیشانەی ڕێ هەبێ؟ عیلم گوتی: بەڵێ هەیەتی. ئەتۆ چاوت بکەرەوە و چاو ببڕە من و لە سەرم واق بمێنە، ئەگەر ئەو قەڵەمەی کە منی پێ دەنووسرێ، کەوتە بەرچاوت، ئەوە دیارە گەیشتوویتە ئەو پلەیەی کە بتوانی ئەو ڕێگەیە ببڕی. چونکە هەرکەسێ عالەمی جەبەرووت تێپەڕێنێ و دەرگای عالەمی مەلەکووت بکوتێ، ئەوە دەتوانێ قەڵەم ببینێ. مەگەر نەتزانیوە کە پێغەمبەرﷺ هەووەڵین کەسێك بوو کە قەڵەمی چاو پێ کەوت و خودا سەبارەت بە ئەو فەرمووی:

﴿إِقْرَأْ وَرَبُّكَ الْأَكْرَمُ ۝ الَّذِي عَلَّمَ بِالْقَلَمِ ۝ عَلَّمَ الْإِنْسَانَ مَا لَمْ يَعْلَمْ ۝﴾[2] واتە: «بخوێنە، چونکە پەروەردگارت بەخشەندەیە، ئەو زاتەی کە بە هۆی قەڵەمەوە زانستی فێر کردووە، ئادەمیزادی فێری ئەو شتانە کردووە کە نەیزانیوە».

پیاوە وەلییەکە گوتی: بەخودا هەرچی چاو ئەگێڕم و چاو ورد دەکەمەوە جگە لە قامیش و تەختە چێو نەبێ هیچ نابینم و قەڵەمێ جگە ئەوە شك نابەم.

عیلم گوتی: بێ‌گومان لەم داخوازییەت دوور کەوتوویتەوە. مەگەر نەتبیستووە کەلوپەلی ناوماڵ لە خاوەن ماڵەکە ناچێ؟ مەگەر نازانی خودای مەزن لە هیچێ ناچێ؟ ئەدی دەستی خودا وەکوو دەستەکانی‌تر نییە، قەڵەمی ئەو وەکوو قەڵەمەکانی‌تر نییە، ئاخاوتنی ئەو وەکوو ئاخاوتنی کەسانی‌تر نییە، خەت و نیگاری وەکوو خەت و نیگاری کەس نییە. ئەمە بازاڕی خوداییە، لە بەشی عالەمی مەلەکووتە؛ زاتی خودای گەورە نە جیسمە، نە لە شوێن و

---

١. جامع الكبير للسّيوطى: ١٣١٨، حرف الهمزة.

٢. العلق: ٥ ـ ٣.

جێگەیێکدایە، نە دەستی لە گۆشت و پێشە و خوێنە، وەکوو دەستی مرۆڤ. نە قەڵەمی ئەو لە زەل و قامیشە، نە تەختەی ئەو لە چێو و پووشە، نە وتەی ئەو لە پیت و وشەیە، نە خەتیشی لە ژمارە و نیگارە، نە مەرەکەفی لە زاگ و مازووە.

جا ئەگەر ئەم دوانە لێك جیا ناکەیتەوە، ئەوە وەکوو نێرامۆکێ دێتە بەرچاوم کە یەکلا نەبووەتەوە و لە نێوان دڕدۆنگی تەنزیـه و تەشبیهی خودادایە، نە لەسەر ئەم لایت، نە ئەولا، ئەدی چلۆن زات و سیفاتی خودای مەزن لە ئەجسام هەڵداوێری؟!

هەروەها چلۆن وتەکانی خودا لە واتای پیت و وشە و دەنگ جیا دەکەیتەوە؟!

ئەتۆ لەسەر قەڵەم و دەست و تەختە و خەتی خودا گیرت کردووە. ئەگەر لەم فەرموودەی پێغەمبەرە: «إِنَّ اللهَ خَلَقَ آدَمَ عَلَىٰ صُورَتِهِ»[1] واتە: «خودا ئادەمی لەسەر ڕوخساری خۆی خەلق کردووە». وەها تێ دەگەی کە گوایا مەبەست ئەوەیە خودا ئادەمی وەکوو ڕوخسارو ئەندامی ڕواڵەتی و بەرچاوی خۆی خەلق کردووە و ئادەم وەکوو خودایە، ئەوە کاری خۆتت یەکلا کردۆتەوە و خودات بە مەخلۆقاتەوە شوبهاندووە، بێ‌گومان لەوانەیت وا وێنە بۆ خودا دادەنێن، هەرودك عەرەب ئەڵێ: ئەتۆ یەهوودییێك خالس بە و گەمە بە تەورات مەکە.

بەڵام ئەگەر وەها لەم فەرموودەی پێغەمبەرە تێ‌دەگەی کە مەبەست بەم ڕوخسارە ڕوخساری نهێنی خودایە کە بەس بەچاوی بەسیرەت و دەروونی ئەبینرێ نەك بە چاوی سەر، ئەوە خودات لەم عەیبی شوبهاندنە دوور خستۆتەوە و تەنزیـه و تەقدیسی زاتی ئەوت کردووە و هەر بەم ڕێگەدا بچۆ، چونکە لە شیوی موقەددەسی "طوی"دای. بە سیرڕی قەلبت گوێبیستی وەحی و فەرموودەکانی خودا بە، بەڵکوو [هەروەك حەزرەتی مووساعَلَيۡهِٱلسَّلَامُ]چاوت بە ئاگری هیدایەت بکەوێ، بەشکەم لە چادری بەرزی خوداوە بانگت لێ بکەن، هەروەك چۆن بانگیان لە مووساعَلَيۡهِٱلسَّلَامُ کرد: «إِنِّي أَنَا رَبُّكَ»[2]. واتە: «بێ‌شك ئەمن خودای تۆم».

کاتێ پیاوە پرسیارکەرەکە ئەمەی لە عیلم بیست، هەستی بە ناتەواوی خۆی کرد و زانی لە نێوان تەشبیە و تەنزیهی خودادایە و تووشی ئەو تاوانە بووە، بۆیـە ئاگری دڵی کڵپەی سەندو بە توندی لە خۆی تووڕە بوو، چونکە زانی بە تەواوی بە هەڵەدا چووە.

---

١. بخاري: ٥٧٥٩، مسلم:٤٧٣١، احمد: ٧٠٢١ ـ ٧٩٤١ ـ ٩٢٣١ ـ ١٠٣١٤.

٢. طه: ١٢.

لەم کاتەدا ڕۆن زەیتوونێ کە لە نێو تاقچەی دڵیدا بوو، خەریك بوو بەبێ ئەوەی ئاگری پێ بگات، داگیرسێ، بەڵام هەر کە عیلم بە توندی فووی لێ کرد، گڕی تێ بەربوو و بوو بە نوور لەسەر نوور.

عیلم لەم وەختەدا پێی گوت: ئەم دەرفەتە لە دەست نەدەی و چاو بکەرەوە، بەڵکوو لەم ئاورەوە هیدایەتت [وەکوو مووساعَلَيۡهِٱلسَّلَامُ]دەست کەوێ، پیاوەکەش چاوی کردەوە، لە ناکاو: قەڵەمی خودای چاو پێ کەوت، بەڵێ ئەو قەڵەمە هەر بەو شێوە وا عیلم گوتی: لە هیچ مەخلۆقی نەدەچوو، نە دار بوو، لە قامیش بوو، نە سەری بوو نە بنی بوو، بەردەوام خەریك بوو لەسەر دڵی بنیادەم بە تێکڕا، دەینووسی. لەنێو هەموو دڵێکدا سەرێکی هەبوو، کەچی سەریشی نەبوو.

پیاوەکە کاتێ ئەم سەرسامییەی بەسەر چوو، گوتی: عیلم باشترین دۆستە بۆ ئادەمیزاد ـ خودا لە باتی ئێمە پاداشتی بداتەوە ـ چونکە تا ئێستا ئەو هەرچییێکی گوتووە ڕاست دەرهاتووە و سەبارەت بە قەڵەم هەرچی فەرمووە ڕاستە، ئێستا کە: قەڵەمی خودایی دەبینم و دەزانم لە هیچ قەڵەمێك ناچێ.

پیاوەکە سپاسی لە عیلم کرد و گوتی: لە زووەوە لە خزمەتاندا دانیشتووم و لەم مانەوەمدا بە ئامانجم گەیشتم، ئێستا من ڕێبوارم و ئەمەوێ بڕۆم بۆلای حەزرەتی قەڵەم و برێ پرسیاری لێ بکەم.

پیاوەکە ڕۆیشت بۆلای قەڵەم و گوتی: ئەوە بۆچی بەردەوام خەریکی لەسەر دڵانەوە عیلم و زانست دەنووسی، ئەو عیلم و زانستەی کە ئیرادە هەڵدەنێن بۆ سەر قودرەت و قودرەتیش کارەکان ئەنجام دەدات.

قەڵەمیش گوتی: ئەرێ تۆ مەگەر لەبیرت چووەتەوە کە چیت لە عالەمی غەیب و عالەمی شەهادەتدا دیوە و چیت لە وڵامی قەڵەمی عالەمی شەهادەتدا بیست؟! ئێستا منیش بتنێرم بۆلای دەست؟

پیاوەکە گوتی: نا!

گوتی: ئەدی وڵامی منیش وەکوو وڵامی ئەوە.

گوتی: ئەدی تۆ چلۆن لەئەو ناچی؟

قەڵەم گوتی: مەگەر نەتبیستووە خودای گەورە، ئادەمی لەسەر شێوازی ڕوخساری خۆی خەلق کردووە؟

گوتی: بەڵێ.

گوتی: ئەدی ئێستاش تۆ لەبارەی منەوە لە دەستی خودا بپرسە، چونکە من لە ژێر دەسەڵاتی ئەودام و ئەوە کە من بە هەرچی باردا سوور دەدا، من بێ‌دەسەڵات و دەستەمۆی قودرەتی خودام. ئا لەم ڕوانگەوە هیچ جیاوازییێك لە نێوان قەڵەمی بنیادەم و قەڵەمی خودادا نییە، چونکە هەردووکمان بێ دەسەڵاتین، بەڵکوو فەرمانم بەس لە ڕواڵەت و ڕوخساردایە.

پیاوەکە گوتی: ئەدی دەستی خودا کامەیە؟

قەڵەم گوتی: مەگەر نەتبیستووە خودا دەفەرمێ: ﴿وَ السَّمٰوَاتُ مَطْوِيَّاتٌ بِيَمِينِهِ﴾[1] واتە: «ئاسمانەکان بە دەستی خوداوە پێچراون».

گوتی: بەڵێ، بیستوومە.

گوتی: دەی وەختێ ئاوەها بێ قەڵەمیش هەر لە ژێر دەسەڵاتی خودادایە، ئەوە بە هەرچی باردا سووری دەدات و پێی دەنووسێ.

پیاوەکە چووبۆلای دەست، تا لە نزیکەوە ببینێ و عەجاباتی خەلقی ئەویشی چاو پێ بکەوێ. خۆیشی دەزانێ کە حاڵ و سیفاتی دەست لەباس‌کردن نایێ، بەڵکوو ئەبێ کتێب‌گەلێکی ئێجگار زۆر لەبارەیەوە بنووسرێ، تا دەیەکی دەیەکی وەسفی باس بکرێ.

تەنها شتێ کە سەبارەت بە ئەو ئەوێژرێ ئەوەیە: کە دەستی ئەو دەستێکە نەك وەك دەستی‌تر، پەنجەکانی نە وەك پەنجەیێ‌تر.

پیاوەکە چووەلای دەست و پرسیارەکانی سەبارەت بە خۆی و قەڵەمی ئاراستەی کرد.

ئەویش گوتی: وڵامی منیش هەر ئەوەیە کە لە دەمی دەستی دونیاوە بیستووتە، منیش هام لە ژێر دەسەڵاتی قودرەتدا، چونکە دەست بۆ خۆی هیچ هێزێکی نییە، بەڵکوو قودرەتە کە ئاوەها دەیسووڕێنێ و خۆی بێ‌دەسەڵاتە.

پیاوەکە چوو بۆلای قودرەت و لەوێ عەجاباتێ سەرسامهێنەری چاو پێ‌کەوت و پاشان لە قودرەت سەبارەت بە جووڵاندنی دەست پرسیاری کرد؟

---

١. الزمر: ٦٧.

ئەویش گوتی: منیش سیفەتی خودام، ئەتۆ ئەم پرسیارەت لە دەسەڵاتدار و هێزدار کە خودایە بپرسە.

پیاوەکە لەم کاتەدا ویستی لا بدات و بوێرانە پرسیار بکات، کەچی دڵی دامەزرا و لە پشتی پەردەی غەیبەوە دەنگێ هات: ﴿لا يُسْأَلُ عَمَّا يَفْعَلُ وَهُمْ يُسْأَلُونَ﴾[1].

واتە: «ئەو [خودا] سەبارەت بەو کارانەی کە دەیکات پرسیاری لێ ناکرێ، بەڵکوو ئەوانن بەرپرسی کردەوەکانیانن». لەم کاتەدا سامێك دایگرت و دەمەوڕوو کەوت و بۆ ماوەیێ لەرزە تەواوی بەدەنی داگرت.

کاتێ کە بەخۆیا هاتەوە گوتی: خودا ئەتۆ پاك و بێعەیبی، زۆر مەزنی، ئەمن تۆبەم کردووە و بۆلای تۆ گەڕاومەتەوە و پشتم هەر بەتۆ بەستووە و ئیمانم بەوە هێناوە کە تۆ پاشایێکی بێباك و تاك و تۆڵە ئەستێنی، ئەمن جگە تۆ نەبێ لە کەس ناترسم، هیوام بەتۆ نەبێ بە کەس نییە، لە دەست ئەشکەنجەکەت تەنها پەنا بە عەفو و گوزەشتی تۆ دەبەم، لە غەزەبت بە ڕەزایەتت پەنا دەبەم.

ئێستا با بگەڕێینەوە سەر مەبەستەکەمان کە مانای تەوەککول و پشت بە خودابەستن بوو، ئەڵێین: پشت بە خودابەستن وایە: تەنها خودا بە پشت و پەنای خۆی بزانێ، بەم چەشنە کە بزانێ کە هیچێ لەخودا شارراوە نییە و لە ژێر دەسەڵاتیدا هیچ شتێ دەرناچێ و غەیری خودا کەس ناتوانێ نە زەرەر نە خێری پێ بگەیەنێ، هەروەك باسمان کرد.

## ڕوانگەی گەورەکان سەبارەت بە تەوەککول:

ئەبوموسای دەیلەمی فەرموویەتی: بە بایەزیدم گوت: تەوەککول چییە؟ فەرمووی: تۆ خۆت چی لەو بارەوە دەڵێی؟ گوتم: دۆستانمان ئەڵێن: ئەگەر جانەوەری دڕندە و ماری ئەفعی لە لای چەپ و ڕاستەوە بوون، تۆ دڵت نەیتە لەرزە و هیچ نەترسی.

بایەزید فەرمووی: لێی نزیك کەوتوویتەوە. بەڵام ئەگەر بزانی کە خەڵکی بەهەشت وان لە بەهەشتدا و خۆش ڕادەبوێرن، لەملاشەوە بزانی کە خەڵکی جەهەننەم وان لە نێو عەزاب و ئەشکەنجەدا، پاشان دڵت لەبارەی ئەم دوانەوە بگۆڕدرێ، ئەوە لە ڕیزی ئەوانە دەبی کە پشت بە خودا ئەبەستن!

---

١. الأنبیاء: ٢٣.

لە ئەبوو عەبدوڵڵای قورەیشی سەبارەت بە تەوەککول پرسیار کرا.

فەرمووی: ئەوەیە کە پێوەندیت بەس بەخوداوە بێت لە هەموو حاڵو وەختێکدا.

وتیان زۆرتر بفەرموو، فەرمووی: تەرکی هەر سەبەب و دەلیلێ کە بە خودا نەگەیەنێت.

## بەشی دووهەم: پلەکانی پشت بە خودابەستن

**سێ پلەی هەیە:**

یەکەم: متمانەی بەخودا وەکوو متمانەی کەسێك بە وەکیلەکەی کە چاك دەیناسێ و شارەزای ڕاستی و ئەمانەت و هیدایەت و دڵسۆزی و ئەمەکی بێت.

دووهەم: بەرانبەر بەخودا وەکوو کۆرپەیێ بێ لەگەڵ دایکیدا، چونکە منداڵ جگە دایکی نەبێ کەسیتر ناناسێ و بۆ پێویستییەکان تەنها بۆلای ئەو دەچێ، دایك ئەووەڵین پەناییکە کە دێ بە دڵی منداڵدا و پەنای بۆ ببات ئەم پلەیە خوازیاری ئەوەیە کە جگە خودا نەبێ پەنا بۆ کەس نەبات و لەکەس نەپاڕێتەوە، چونکە متمانەی بە سۆز و بەزەیی خودا هەیە.

سێهەم: کە باترین پلەی پشت بەستن بەخودایە، ئەوەیە کە وەکوو مردووی بەردەستی مردووشۆر وابێ؛ کە لە ژێر دەستی مردووشۆردایە و ئەوە بە هەر بارێکدا کە بیەوێ هەڵی دەسووڕێنێ. ئەبێ بەرانبەر بەخوداش ئاوەها بێ.

جا ئێستا لەوانەیە تۆ بڵێی: کەوایە ئایا بەندە تەگبیر و پێوەندیێکی لەگەڵ بەکارهێنانی سەبەب و هۆکارەکاندا ئەمێنێ؟

[ئەڵێم:] بزانە پلەی سێهەم بە تەواوەتی تەگبیر و پێوەندی لەگەڵ ئەسبابدا بنەبڕ دەکات مادامێ لەسەر ئەو حاڵەتە بەردەوام بێت. مەقام و پلەی دووهەم مەنعی تەگبیر و دەست تێوەردان و... دەکات مەگەر لە حاڵەتی تەنگانەدا، ئەویش بە پاڕانەوە و تکا لە خودا، وەکوو کۆرپەیێ کە بەس لە دایکی بانگ دەکات، ئەویش کاتێ کە پێویستی پێ بێت.

### ڕوونکارییەك لەسەر کرداری کەسانێ کە پشت بە خودا دەبەستن

هەندێ بە هەڵەدا چوون و وا گومانیان بردووە کە کەسێ کە پشت بەخودا دەبەستێ پێویستە وەکوو گۆشتی سەر تەختەی قەساب وابێ و هیچ کاریگەرییێکی لەسەر چارەنووسی

خۆیدا نەبێ، ئەمەش شتێکی هەڵە و نادروستە. بەڵکوو ئێمە لەو بڕوایەداین کە کردەوەکان دابەش دەکرێن بەسەر ئەمانەدا: بۆ قازانج وەدەستهێنان و پاراستنی قازانجەکان، بەرگری لە زەرەرەکان و دوورخستنەوەیان.

## ئەو کردەوانە کە بۆ قازانج وەدەستخستن ئەنجام دەدرێن دوو بەشن:

**یەکەم:** بەپێی سروشت و ڕێبازی باوی خودا ئەنجام دەدرێن و پێچەوانەیان لادانە لە نەریت و عادەت وەکوو خواردنی نان و خۆراکێ کە لە بەردەمدا دانرا بێ، یان بەرزەوەکردنی نان بۆ دەم. نەکردنی ئەم جۆرە کردەوانە گەوجی و جۆرێ شێتییە.

**دووهەم:** ئەو کردەوانەی کە زۆربەی کات بە ئەنجامدانی مەبەست نایێتەجێ و ئامانجی لێ ناکەوێتەوە، وەکوو ئەو کەسەی کە شار و قافڵە بەجێ ئەهێڵێ و لە دەشت و بیاباندا سەر هەڵدەگرێ کە خەڵك بە کەمی لێیەوە تێدەپەڕێن، بە بێئەوەی تۆشە و بژیوێکی لەگەڵ خۆی بردبێ. ئەم جۆرە کارە مەرجی پشتبەستن بەخودا نییە. بەڵام ئەگەر کەسێ ئەم کارەی کرد بێئەوەی تۆشەی لەگەڵ خۆی هەڵگرتبێ ئەوە ئەو کەسە بانترین پلەی موتەوەکیلانی دەست کەوتووە.

بەڵام ئەو کردەوانەی کە مەگەر بە ڕێکەوت، دەنا هیچ مەبەستێکی لێ ناوەشێتەوە وەکوو ڕامان و وردبیرکردنەوە و لێکۆڵینەوە لەسەر کەسب و کار و لێکدانەوەی تەواوی ئیحتیمالەکان، ئەوە بێگومان ڕیشەی تەوەککول دەردەهێنێ و لە بەینی ئەبات.

## [هەڵویستی پشت بە خودابەستەکان بەرانبەر بە هۆکارەکان]:

**پلەی یەکەم:** پلەی خەواس و خواشناسە تایبەتەکان، ئەم جۆرە کەسانە لە بیاباندا دەگەڕێن بەبێ ئەوەی تۆشە و خۆراکێکیان هەڵگرتبێ، پشت بە فەزڵ و کەرەمی خوداوەند دەبەستن و بە حەفتە و مانگ خۆیان لەسەر ئەو حاڵەتە ڕادەهێنن، یان گژ و گیا دەخۆن.

**پلەی دووهەم:** لە ماڵی خۆی یان لە مزگەوتدا، لە گوند، یان شار دابنیشێ و دەست بۆ کار نەبات. ئەمە لەو لایەنەوە کە کارو کاسبی جێ هێشتووە لە پشت بەستن بەخودا دێتە ئەژمار، بەڵام لەم لایەنەوە کە لە شوێنێ دانیشتووە کە قەرەباڵغە و خەڵك ڕێی لێ دەکەوێ زۆر کارەکەی لاوازە.

**پلەی سێهەم:** بە پێی نەریت و عادەتی ژیان کارو کاسبی بکات ـ هەروەك چۆن لە بابەتی کارو کاسبیدا ڕابرد ـ هەندێ گوتوویانە: ئەم کارو کاسبیە لە پشت بەخودا بەستن دەری ناکات، بەڵام نزمترین پلەیە. بەڵام لەم کاتەدا ئەبێ پشت بە کاڵاو پیتاك و... نەبەستێ. نیشانەکەشی ئەوەیە کە بە دزین و بڕینی ماڵەکەی خەفەت نەخوات.

## تەوەککولی کەسێ کە خێزاندار بێ:

بزانە کەسێ کە خێزاندار بێ دروست نییە لە حەق خێزانەکەیدا تەوەککول بکات و هەوڵ و تاقالا نەدات. چونکە ئەم بەرخۆدانە بۆ دروست بوونەکەی چەند مەرجێك هەیە. یەکیان ئەوەیە کە بۆ وێنە حەفتەیەك هێزی دەمگرتنەوەی لە خۆراك ببێ، یان ئەگەر ڕزقی لەلای خوداوە بۆ نەهات ڕازی بە مەرگ بێ و شتانیتر.

کەوابوو ئەم مەرجانە بۆ خێزان و بنەماڵە ڕەچاو ناکرێ و ئەو بەرپرسە کەسب و کاری ببێ و بژیویان بۆ دەربهێنێ. هەروەك چۆن لە حەزرەتی ئەبووبەکری سیدیقەوە رضي الله عنه دەگێڕنەوە کە لە ماڵ چووەتە دەر بەشوێن ڕزق و ڕۆزیدا بۆ ژن و منداڵەکەی. ئەمەش هەر ئەو پلەی سێهەمە بوو کە باسمان کرد.

بەشی ساڵێك ڕزق و نان و خۆراك پاشەکەوت بۆ خێزان و ژن و منداڵ لە گەورەکانەوە دەگێڕنەوە. بەڵام کەسێ کە ژن و منداڵی نەبێ و بزانێ ماڵێکی لە ڕێی میراتەوە بۆ وێنە چنگ دەکەوێ، ئەوە باشترین ئیش بۆ ئەو ئەوەیە کە بەشی خۆی لێ هەڵگرێت و باقیەکەی بڵاو بکاتەوە و پاشەکەوتی نەکات.

## سەبارەت بە ئەنبار و پاشەکەوتکردن، سێ حاڵەت هەیە:

**یەکەم:** بەو ئەندازە پاشەکەوت بکات کە کاتێ برسی بوو بیخوات، یان کاتێ کە ڕووت بوو خۆی پێ پۆشتە بکات.

**دووهەم:** بۆ چل ڕۆژ یان کەمتر پاشەکەوت بکات. لەسەر ئەمەش کێشە هەیە کە ئاخۆ لە موتەوەککلین دێتە ئەژمار یان نە؟ ئاخۆ لەو پاداشتە کە بۆ موتەوەککلین دیاری کراوە بێبەش ئەبێ، یان نە؟

سێهەم: بۆ چەند مانگ، یان ساڵێك بژیو پاشەکەوت بکات، ئەمە بێ‌گومان خۆی لە پلە و پاداشتی موتەوەککلین بێ‌بەش کردووە.

هەندێ گوتوویانە: جگە لە سێ جانەوەر نەبێ چی‌تر بژیو پاشەکەوت ناکات: مشك و مێلووره و بنیادەم.

[تێبینی:] زەرەر و شەڕ لەخۆ دوورخستنەوە، یان خۆپاراستن بەم شێوە کە لەبەر دیوارێ کە سکی دابێ ڕا بکات، یان لە چنگ دڕندەیێ هەڵێ، یان لە ژێر میچێ کە داری شکاوە دەرچێ، ئەمانە هیچکامیان مرۆڤ لە زنجیرەی تەوەککولی دەرناکەن، بەڵکوو گشت ئەم حاڵەتانە لە پیاوە گەورەکانەوە ڕیوایەت کراوە.

## ئەو هۆکارانەی کە خەڵك پشتی پێ دەبەستن سێ جۆرن:

پووچەڵ و خورافات، جێ گومان و ڕێ تێ‌چوون، یەقین و دڵنیایی. بەڵام ئەوەی وا پووچەڵ و خورافاتە پێویستە تەرك بکرێ، وەکوو دوعانووسی و نوشتە بڕین...

پێغەمبەرﷺ سەبارەت بە موتەوککلین فەرموویەتی: کەسانێکن دەست لە فاڵ و دوعا و نوشتەنووسی هەڵدەگرن. ئەدی خۆ پێغەمبەرﷺ نەیفەرمووە: ئەمانە کەسانێکن کە لەبەر سەرماوە لیباس ناکەنە بەریان.

[تێبینی:] کەسێ کە بتوانێ خۆی لەسەر ئازار و ئەزیەتی خەڵکی‌تر ڕابگرێ ئەوە مەرجی تەوەککولی بەجێ هێناوە. چونکە خودای مەزن فەرموویەتی: ﴿وَ دَعْ أَذٰاهُمْ وَ تَوَكَّلْ عَلَى اللّٰهِ﴾[1] واتە: «خۆت ڕابگرە لەسەر ئازاردانیان و پشت بە خودا ببەستە».

کەوابوو هەندێ‌جار نەچوون بۆلای دوکتۆر دەبێتە تەوەککول. ئەمەش لە گەورەکانەوە گێڕدراوەتەوە، ئەم‌کارەش بە گۆڕانی کەسەکان دەگۆڕدرێ.

والله أعلم

---

١. الأحزاب: ٤٨.

# بابەتی سی و شەشەم:
# خۆشەویستی، تاسە، ڕەزامەندی[1]

## [بەشی یەکەم: بەڵگە شەرعیەکان سەبارەت بە خۆشەویستی خودا]

بزانە خۆشەویستی خودا بانترین ئامانجە و بەرزترین پلەیە، ئیدی تاسە و خووپێوە گرتن و ڕازیبوون لە دووی خۆشەویستیەوەیە.

هەندێ لەو کەسانە کە خودا لە نیعمەتی خۆشەویستی بێبەری کردوون، ئینکاری خۆشەویستی خودا دەکەن. بەڵام لێرەدا ئێمە بە چەند ئایەت و حەدیس دەیسەلمێنین.

خودای مەزن فەرموویەتی: ﴿وَ الَّذِينَ آمَنُوا أَشَدُّ حُبّاً لِلّهِ﴾[2] واتە: «ئەوانەی کە ئیمانیان هێناوە خودایان زۆرتر خۆش ئەوێ».

هەروەها خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿يُحِبُّهُمْ وَ يُحِبُّونَهُ﴾[3] واتە: «خودا ئەوانی خۆش دەوێ و ئەوانیش خودایان خۆش ئەوێ».

لە حەدیسدا هاتووە: «لا يُؤْمِنُ أَحَدُكُمْ حَتَّىٰ يَكُونَ اللّهُ وَ رَسُولُهُ أَحَبَّ إِلَيْهِ مِنْ أَهْلِهِ وَ مٰالِهِ وَ النّٰاسِ أَجْمَعِينَ»[4].

واتە: «هیچکەستان ئیمانی تەواو نابێ مەگەر خودا و پێغەمبەری لە ماڵ و منداڵ و خەڵك بە تێکڕا، خۆشتر بوێ».

---

١. خۆشەویستی: مەحەببەت، تاسە، شەوق. ڕەزامەندی: رەزا. ئەم زاراوانە عیرفانین ـ وەرگێڕ.

٢. بقره: ١٦٥.

٣. مائده: ٥٤.

٤. مسلم: ٦٢، نسائی: ٤٩٢٨، و فی روایة: دون ذکر قوله: «وَ النّٰاسِ أَجْمَعِينَ»: بخاری:١٣.

لە ڕیوایەتێکی مەشهووردا هاتووە کە ئیبراهیمعَلَيهِالسَّلَامُ کاتێ کە فریشتەی مەرگ هات بۆلای بۆ ئەوەی گیانی بکێشێ، پێی فەرموو: ئەرێ تۆ خۆشەویستێکت (مەبەستی خودا بوو) دیتووە خۆشەویستەکەی خۆی بمرێنێ؟!

خێرا لە لایەن خوداوە وەحیی بۆ هات: ئەرێ تۆش خۆشەویستێك دیوە کە دیدار و وەسڵی خۆشەویستەکەی پێ ناخۆش بێت؟!

ئیبراهیمعَلَيهِالسَّلَامُ گوتی: فریشتەی مەرگ! هەر ئێستا گیانم بکێشە.

پێغەمبەرصَلَّىاللَّهُعَلَيهِوَسَلَّمَ فەرموویەتی: «اَللّٰهُمَّ ارْزُقْنِي حُبَّكَ وَ حُبَّ مَنْ أَحَبَّكَ، وَ حُبَّ مٰا يُقَرِّبُنِي إِلَىٰ حُبِّكَ، وَاجْعَلْ نَفْسَكَ أَحَبَّ إِلَيَّ مِنَ الْمٰاءِ الْبٰارِدِ»[1].

واتە: «خودایە! خۆشەویستی خۆت و خۆشەویستی هەرکەسێ کە تۆی خۆش دەوێ و خۆشەویستی هەر شتێك کە لە تۆوە نزیکم دەکاتەوە، بکە بە نسیبم. [خودایە!] خۆتم بەلاوە خۆشەویستر بکە لە ئاوی سارد [بۆ کەسێ کە تینوو بێ]».

عەرەبێکی بیابانی گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! کەی ڕۆژی قیامەتە؟

پێغەمبەرصَلَّىاللَّهُعَلَيهِوَسَلَّمَ فەرمووی: چیت بۆ ئەو ڕۆژە ئامادە کردووە؟

گوتی: ئەمن نوێژ و ڕۆژووی زۆرم بۆ ئەو ڕۆژە دانەناوە، بەڵکوو خۆشەویستی خودا و پێغەمبەرەکەیم بۆ داناوە.

پێغەمبەرصَلَّىاللَّهُعَلَيهِوَسَلَّمَ فەرمووی: «اَلْمَرْءُ مَعَ مَنْ أَحَبَّ»[2] واتە: «مرۆڤ [لە قیامەتدا] لەگەڵ ئەو کەسەدایە کە خۆشی ئەوێ».

ئەنەسرَضِيَاللَّهُعَنْهُ فەرموویەتی: «پاش موسڵمانبوونی موسڵمانەکان کەسیانم نەدی کە بەشتێ شاد و خۆشکەیف بێ، بەو ئەندازە کە خۆشەویستی خودا و پێغەمبەر شادی دەکرد»[3].

---

١. ترمذی: ٣٤١٣، ابن‌ابی‌شیبة: ٩٦/٧، جامع الأصول لابن‌الأثیر: ٢٣٦٢ جمیعهم بلفظ: «وَ حُبَّ مَنْ يَنْفَعُنِي حُبُّهُ عِنْدَكَ»، و فی روایة: قال النَّبِيُّصَلَّىاللَّهُعَلَيهِوَسَلَّمَ: «قٰالَ دٰاوُدَ عَلَيهِالسَّلَامُ: رَبِّ أَسْأَلُكَ حُبَّكَ وَ حُبَّ مَنْ يُحِبُّكَ ...» حاکم فی المستدرك مع تعلیقات: ٣٦٢١.

٢. بخاری: ٥٧٠١ ـ ٥٧٠٥ ـ ٦٦٢٠، مسلم: ٤٧٧٥ ـ ٤٧٧٦ ـ ٤٧٧٨، ترمذی: ٢٣٠٧، احمد: ١١٥٧٥ ـ ١١٦٣٢ ـ ١٢٣٠٧ ـ ١٣٥٥٩، جمیعهم بلفظ: «أَنْتَ مَعَ مَنْ أَحْبَبْتَ». و فی روایة أخری بلفظ: «جٰاءَ رَجُلٌ إِلَىٰ رَسُولِ اللّٰهِصَلَّىاللَّهُعَلَيهِوَسَلَّمَ فَقٰالَ: يٰا رَسُولَ اللّٰهِ! كَيْفَ تَقُولُ فِي رَجُلٍ أَحَبَّ قَوْماً وَلَمْ يَلْحَقْ بِهِمْ فَقٰالَ رَسُولُ اللّٰهِصَلَّىاللَّهُعَلَيهِوَسَلَّمَ: الْمَرْءُ مَعَ مَنْ أَحَبَّ» بخاری: ٥٧٠٣ ـ ٥٧٠٤، مسلم: ٤٧٧٩، ترمذی: ٢٣٠٩ ـ ٣٤٥٨ ـ ٣٤٥٩، احمد: ١٢١٦٤ ـ ١٢٨٣٨ ـ ١٢٩٠٩ ـ ١٣٣٢٦ ـ ١٧٣٩٦.

٣. «فَمٰا رَأَيْتُ الْمُسْلِمِينَ فَرِحُوا بَعْدَ الْإِسْلَامِ بِشَيْءٍ مٰا فَرِحُوا بِهِ» احمد: ١١٥٧٥ ـ ١٢٣٥٨ ـ ١٢٥٩٥.

حەزرەتی ئەبووبەکری سیدیقﷺ فەرموویەتی: هەرکەس لە خۆشەویستی خالس و بێ‌خەوش و گەردی خودا و پێغەمبەری خودا بنۆشێ، هەر ئەوە خۆی لە شوێن‌کەوتنی دونیا دەپارێزێ و لە تەواوی خەڵك دووری دەخاتەوە.

## بەشی دووهەم: واتای خۆشەویستی

خۆشەویستی بریتییە لە شتێك کە تەبعی مرۆڤ حەزی لێ بکات، لەبەر ئەوەی چێژی لێ وەردەگرێ. ڕقیش دژی ئەمەیە، واتە: ڕق بریتییە لە قین و ناحەزییێك کە تەبع لە شتێك ببێ، لەبەر ئەوەی کە لەگەڵیدا سازگار نییە. جا هەر شتێك کە چێژی زۆرتر بێ خۆشەویستی بۆی زێدەترە؛ چێژ و لەززەتی چاو لە دیتن‌دایە، چێژی گوێ لە بیستن‌دایە و چێژی لووت لە بۆنکردنی بۆنە خۆشەکاندایە، هەروەها هەرکام لە ئەندامەکان شتێکی لەززەت‌بەخشی هەیە کە چێژی لێ وەردەگرێ و لەبەر ئەو لەززەتە خۆشی ئەوێ.

پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «حُبِّبَ إِلَيَّ مِنْ دُنْيَاكُمْ ثَلاثٌ: اَلطِّيبُ وَ النِّسَاءُ وَ قُرَّةُ عَيْنِي فِي الصَّلاةِ»[1]. واتە: «لە دنیای ئێوەدا سێ شت بۆم خۆشەویست کراوە: بۆنی‌خۆش، ژن، ڕووناکی چاوەکانیشم لە نوێژدایە».

پێغەمبەرﷺ، ڕوونی کردەوە کە جگە لە ئەندام و پەنج هەستەوەرەکان، خۆشەویستێکی‌تر هەیە کە چێژی لێ وەردەگیرێ، چونکە نوێژ هیچ ئەندامێ چێژی لێ وەرناگرێ. کە وابوو بەسیرەتی دەروونی و نهێنی بەهێزترە لە دیتنی ڕواڵەتی و بەرچاو. دڵ هێزی تێگەیشتنی لە چاو زۆرترە و جوانی مەعنەوی و نهێنی کە بە عەقڵ دەرك دەکرێ بەهێزتر و گەورەتر و تەواوترە لە جەماڵ و جوانی ڕواڵەتی و زاهیری.

بێ‌شك چێژ و لەززەتی دڵ و دەروون بە دەرك‌کردن و تێگەیشتن لە کاروباری ئیلاهی و خودایی، کە بەرزتر و مەزنترن لەوەی کە حەواسەکان دەرکی بکەن، زۆرتر و تەواوتر و خۆشترە. بەم‌پێیە تەبعی ساغ خۆی بۆ لای ئەوانە زۆرتر دەکێشی. خۆشەویستیش جگە ئەو مەیل و حەزە نەبێ کە بۆ چێژوەرگرتن هەیەتی، مانایەکی‌تری نییە. کەسیش ناتوانێ ئینکاری

---

١. نسائی: ٣٨٧٨ ـ ٣٨٧٩، احمد: ١١٨٤٥ ـ ١٢٥٨٤ ـ ١٣٥٢٦، طبرانی فی الأوسط: ٥٣٦١.

لەززەت و چێژی مەعنەوی بکات، مەگەر کەسێ کە هێشتا لە پلەی حەیوانیدا مابێتەوە و لە چوارچێوەی لەززەتە جەستەییەکان دەرباز نەبووبێ.

شتێکی ڕوون و ئاشکرایە کە خۆشەویسترین شت بەلای ئینسانەوە مانەوەی خۆیەتی، چونکە گەورەترین شتێك کە حەزی لێیەتی و دڵی بۆی لێ دەدا و خۆشی ئەوێ هەر خۆیەتی. پاشان حەز بە کەسێك ئەکات کە چاکەی لەگەڵ دەکات، چونکە ئینسان بەردەی ئێحسانە. جاری واش هەیە کە شتەکانی لەبەر ئەوە خۆش ئەوێ کە ئەو شتە هەر لە زاتی خۆیدا جوان و لەبارە، ئەمەش بانترین پلەی خۆشەویستییە کە شتێك هەر لەبەر خۆی خۆش بوێ. ئەم جۆرە خۆشەویستییە هیچ ئامانج و هەست و ویستی‌تری تێکەڵ نابێ، چونکە هەر شتێ کە جوان بێ، خۆشەویستە.

ئێستا شتێك ماوەتەوە ئەویش ئەوەیە کەسانێ کە هێشتا لە بەندی خەیاڵاتدان وا دەزانن کە جوانی تەنها لە شتە هەست پێکراوەکان، یان شتە خەیاڵیەکاندایە.

ئێمەش ئەڵێین: بزانە جوانی و لەباری بریتییە لە هەر شتێ کە کەماڵ و جەماڵێ کە ئیمکانی هەبێ تێدا کۆ بووبێتەوە. تەنانەت دەزانین ئەسپ بەشتێ دەرازێتەوە کە بنیادەم بەو شتەوە جوان نییە، خەت بە شتێ جوان دەبێ کە دەنگ و ڕوخسار بەوە جوان و ڕازاوە نابێتەوە. کەچی ئەمانە هەموویان بەشەر خۆشی دەوێن.

جا ئەگەر هێشتا لەسەر ئەو بڕوایە بی کە ئەمانە پێوەندییان بە هەست پێکراوەکانەوە هەیە، دەی‌خۆ ئەخلاق و ئاکاری جوان و ڕێکوپێك، زانین، دەسەڵات، عەقڵ، ئەمانە هەر هەموویان جوان و لەبەردڵانن کەچی ئەندامەکان هەستیان پێ ناکەن، بەڵکوو بە تیشکی بەسیرەت و چاوی مەعنەوی هەستیان پێ دەکرێ.

هەر بەم چەشنەش خۆشەویستی پێغەمبەرﷺ و هاوەڵانی و ئیمامی شافیعی و سەر مەزهەبەکانی‌تر و... ئەمانە هەموویان لەبەر چاوی ئێمەوە نین و بە حەواسەکان دەرکیان ناکەین، بەڵکوو لەبەر ئەوەیە خۆشیانمان دەوێ، چونکە بیستوومانە ئەخلاق و ئاکاری جوانیان هەبووە، کەوابوو لە ئاکامدا بەم دەستکەوتە دەگەین: هەر شتێ لە بازنەی شتە مەحسووس و هەست‌پێ‌کراوەکاندا نەبێ، وێڕای ئەوە، جوان و لەبەرەدڵان بێ، ئەوە جوانی مەعنەوی هەیە و بەس بە تیشکی بەسیرەت هەستی پێ دەکرێ.

## [بەشی سێهەم: خۆشەویستی خودا کە بەرزترین خۆشەویستییە]

جا ئێستا کە سەلماندمان خۆشەویستی مەعنەوی لە سەروو خۆشەویستی ماددیەوەیە، بێ‌شك ئەوەش سەلماوە کە هیچ‌کەس جگە خودای مەزن شیاوی خۆش‌ویستن نییە، چونکە ئەو بەدیهێنەر و بەخشێنەرە بە شێوەی ڕەسەن. هەروەها ئەوە کە هۆی دەوام و مانەوەیە و هۆی ساغی و سەلامەتییە، ئەوە کە بە هەرچی لەونە و هەرچی جۆرە چاکە دەکات. هەر ئەوە جوان و لەبەرەدڵانە، ئەو خودایەی کە هەرچی جوانی و شیاوی و لەبارییە لە ئەو وەشاوەتەوە. هەرکەس پێغەمبەران و سەحابەکان و پێشەوایانی خۆش ئەوێ، لەبەر ئەوەیە کە هەرچی ئاکار و ڕەوشتی جوان و چاکی خوداییە لەواندا کۆ بووەتەوە.

کەوابوو هەرچی خێر و چاکەیە لە خوداوەیە و پێوەندی بەوەوە هەیە. ئەو جوانیەیێکی هەیە کە هەرچی جوانییە لە هی ئەو کەوتووەتەوە. ئەدی خۆ دەزانی کە هەر جوانیە لەزاتی خۆیدا و لەبەر خۆی خۆشەویستە و بەردڵ دەکەوێ.

پێشتر باسمان کرد کە تایبەتمەندیی مرۆڤ لەنێو گیانبلەراندا لەوەوەیە کە مرۆڤ دەتوانێ خۆی بە سیفات و ئاکاری لەبار و ڕێکوپێك برازێنێتەوە. تەنانەت هەندێ گوتوویانە: مرۆڤ ئەخلاق و ئاکاری لە هی خودا دەچێ. لە دەروونی ئینساندا حەقیقەتێ هەیە کە جگە خودا نەبێ هیچ شتێکی‌تر لەگەڵی ڕێك ناکەوێ. لە دڵدا غەریزە و خۆماکێ هەیە کە بە نێوی "تیشکی ئیلاهی" نێوی لێوە دەبرێ.

خودای مەزن لەمبارەوە فەرموویەتی: ﴿أَفَمَنْ شَرَحَ اللَّهُ صَدْرَهُ لِلْإِسْلَامِ فَهُوَ عَلَىٰ نُورٍ مِنْ رَبِّهِ﴾[1] واتە: «ئاخۆ کەسێ کە خودا دڵی بۆ ئیسلام ئاوەڵا کردبێتەوە، ئەوە وا لەسەر تیشکێ لە لایەن پەروەردگاریەوە».

ئەم غەریزە، هەر ئەو هەستەیە کە جەماڵ و جوانی حەزرەتی باریی پێ دەرك دەکرێ، بەو ئەندازەی کە هێزی پێ‌بشکێ. جا وەك گوتمان ئەگەر جوانی خۆشەویست بێ، ئەدی ئاخۆ لە بوونەوەردا هەیە کە گەورەتر و بەرزتر و مەزنتر و تەواوتر بێ لە ئەو جەماڵ و جوانیەی کە لە زاتی خوداوە وەربگیرێ. بەم پێیە ئەبێ بە ئەندازەی دەرك لەززەت و چێژ وەربگیرێ و بە ئەندازەی لەززەتیش خۆشەویستی ببێ.

---

١. الزمر: ٢٢.

## [بەشی چوارەم: لەززەتی دیداری خودای مەزن]

بزانە ئەو شتانە کە هەستی پێ دەکرێ دوو جۆرن، یان دەچنە بازنەی خەیاڵەوە وەکوو نەقش و نیگار و...، یا ناچنە نێو ئەو بازنەوە وەکوو زاتی خودای گەورە و هەر شتێ کە جیسم و نیگار نەبێ، وەکوو عیلم و قودرەت و ئیرادە.

هەرکەسێ مرۆڤێ ببینێ، پاشان چاوی بقونجێنێ، دەستبەجێ ڕوخساری ئەو کەسە لە خەیاڵیدا دەبینێتەوە بە شێوەیێ کە ئەڵێی بۆ ئەو ڕوخسارە دەڕوانێ، بەڵام کاتێ کە چاو دەکاتەوەو خودی پیاوەکە دەبینێ هەست بە جیاوازیەك لەنێوان ئەو دیمەنە خەیاڵییە و ئەم دیمەنەی بەرچاوی دەکات، ئەم جیاوازییەش بۆ ئەوە ناگەڕێتەوە کە ئەم دوو دیمەنە یەکێك نەبن، بەڵکوو بۆ ڕوون و ئاشکرابوونی یەکیان و نادیار و ناڕۆشنبوونی ئەوی تریان دەگەڕێتەوە، وەکوو ئەوەی کەسێ لە بوومەلێڵی بەیاندا پێش خۆرکەوتن کەسێ ببینێ و پاشان پاش هەڵاتنی خۆر و تەواو ڕووناکبوونەوەی بیبینێ، ئەم دوو دیمەنە جگە لە ڕووی ئاشکرایی و ڕوونبوونەوە نەبێ، هیچ جیاوازییەك تێیاندا بەدی ناکرێ.

جا کە ئەمەت زانی، بزانە کە عادەتی خودا وەهایە: مادامێ نەفسی ئینسان لە ژێر پەردەی ئاکار و ڕەوشتی خراپ و دزێوەوە بێ، هیچکات ناتوانێ دەرکی مەعنەوییاتێ بکات کە لە دەرەوەی عالەمی حیس و خەیاڵدا بێ، چونکە ئەو سیفەتە دزێو و خراپانە بەسەر دڵەوەیە هەروەك پێڵوو وان بەسەر چاوەوە، هەر بەو ئەندازە کە ئەو سیفەتانە بسڕێنەوە هێندەش ڕووناکی بۆ دەروون دەردەکەوێت و لەززەت و چێژ و خۆشەویستی مەعنەوی هەست پێ دەکات.

## [بەشی پێنجەم: هۆکارەکانی نزیكبوونەوە بە خۆشەویستی خودا]

بزانە بەختەوەرترین کەس لە دوارۆژدا کەسێکە کە خۆشەویستی بۆ خودا لە هەموان بەهێزتر بێ، چونکە دوارۆژ کاتی چوون بۆلای خودا و کاتی دیدار لەگەڵ ئەودایە. چ نیعمەتێ لەوە گەورەتر هەیە! کاتێ عاشقێ پاش تێپەڕینی ماوەیەکی دوور و درێژ و تاسەبارییەکی ئێجگار زۆر، بە خۆشەویستەکەی شاد ببێتەوە و بتوانێ تا دڵی ئەیگرێ بۆی بڕوانێ بەبێ ئەوەی بەرگر و پەردە و تێکدەرێ لە نێوانیاندا هەبێ.

بۆ پتر پتەوبوونی خۆشەویستی خودا دوو هۆکار هەیە:

**هۆی یەکەم:** خاڵیکردنەوەی دڵ لە غەیری خودا، چونکە کاسە هەرچەندە کە خاڵی بکرێتەوە جێ بۆ ئەو شتە وا ئەیەوێ تێی بکات، فەراخ و زۆر دەبێتەوە. دابڕانی پێوەندی و عەلاقەکان هۆی خاڵیبوونەوە و یەکچاو بوونەوەیە بۆ خودا. خودای گەورەش بەمە ئاماژە دەکات و دەفەرمێ: ﴿قُلِ اللّٰهُ ثُمَّ ذَرْهُمْ﴾[1] واتە: «بڵێ: خودا و واز لەوان بێنە».

**هۆی دووهەم:** چاكناسینە. هۆی یەکەم وەکوو بژارو پاك و خاوێنکردنەوەی زەمینە لە دڕك و داڵ و بەرد، هۆی دووهەم وەکوو چاندنی توو و ناوکە لە زەمینەکەدا تاکوو گەورە بێت و پاشان داری ناسینی لێ بکەوێتەوە کە ئەو دارەش وتەی جوانە کە خودا سەبارەت بەوە فەرموویەتی: ﴿أَلَمْ تَرَ كَيْفَ ضَرَبَ اللّٰهُ مَثَلاً كَلِمَةً طَيِّبَةً كَشَجَرَةٍ طَيِّبَةٍ أَصْلُهٰا ثٰابِتٌ وَ فَرْعُهٰا فِي السَّمٰاءِ﴾[2].

واتە: «ئەوە سەیر ناکەی کە خودا چلۆن وێنە دەهێنێتەوە بە وتە و گوفتاری چاك و پاك کە وەك درەختێکی چاك و بەردار وایە کە ڕەگی بە توندی داکوتاوە لە زەمیندا و لق و پۆپەکانیشی گەیشتوونەتە ئاسمان».

## بەشی شەشەم: تاسە و تامەزرۆیی (شوق)

هەرکاتێ سەبارەت بە کەسێ خۆشەویستی سەقامگیر بێت، بێشك تاسەو تامەزرۆییشی بە دواوەیە. ئەم بۆچوونەش ئایەت و حەدیسی لە پشتە. دەگێڕنەوە کە "ئەبوو دەرداء"ﷺ بە کەعبیﷺ گوت: تایبەتیترین ئایەتی تەورات هەڵبدە بۆم. ئەویش گوتی: خودای گەورە لەوێدا فەرموویەتی: «بە درێژایی مێژوو پیاوچاکان تامەزرۆی دیداری من بوون، کەچی من زۆرتر لەوان بە تاسەیان بووم»[3] هەروەها گوتی: لە پەنای ئەم ئایەتەشدا نووسراوە: «هەرکەس بە دوومدا بگەڕێ دەمدۆزێتەوە، هەرکەسیش بەشوێن غەیری منەوە بێ، قەت من نادۆزێتەوە». ئەبوو دەرداء گوتی: شایەتی دەدەم کە ئەمەم لە پێغەمبەری خوداﷺ بیستووە.

---

١. الأنعام: ٩١.  ٢. ابراهیم: ٢٤.

٣. القرطبی فی تفسیر الجامع لأحکام القرآن فی سورة طه علی آیة٨٤.

لە حیکایەتەکانی داوود دا هاتووە کە: خودای گەورە فەرمووی: «ئەی داوود! بە خەڵکی سەرزەوی ڕابگەیەنە ئەمن کەسێکم خۆش‌ئەوێ کە منی خۆش بوێ، هاونشینی کەسێکم کە هاونشینیم لەگەڵدا بکا، هاودەمی کەسێکم کە بەیادکردنم هاودەمم بێت، هاوەڵی کەسێکم کە هاوەڵایەتیم لەگەڵدا بکات، ئەو کەسە هەڵدەبژێرم کە منی هەڵبژاردووە، بەگوێی ئەوە دەکەم کە گوێڕایەڵی من بووبێ، بەندەیێ کە بە ڕاستی منی خۆش بوێ و بزانم بە دڵ منی دەوێ ئەوە منیش بۆ خۆم ئەوم ئەوێ و بە جۆرێ خۆشم ئەوێ کە کەسی‌ترم پێش ئەو ئاوەها خۆش نەویستبێ.

کەسێك لە ڕووی ڕاستییەوە بەدووی مندا بگەڕێ دەمدۆزێتەوە، بەڵام ئەگەر بە شوێن غەیری منەوە بێ قەت نامدۆزێتەوە.

ئەی خەڵکینە! دەست لە دەمارزلی هەڵبگرن و بەرەو عەزەمەت و دۆستایەتی من وەرن. بە منەوە خوو بگرن، من خووتان پێوە دەگرم و دێم بە دەم خۆشەویستییەکانتانەوە. ئەمن سروشتی خۆشەویستانم لە سروشتی ئیبراهیمی خۆشەویستم و مووسای هاودەمم و موحەممەدی هەڵبژاردەم، خەلق کردووە. ئەمن دڵی تاسەبارانم لە تیشکی خۆم و نیعمەتەکانیانم لە عەزەمەتی خۆم خەلق کردووە».

لە یەکێ لە گەورە پیاوانەوە دەگێڕنەوە کە خودای مەزن وەحیی کردووە بۆ یەکێ لە پێغەمبەران کە: «ئەمن بەندەهایێکم هەیە کە منیان خۆش ئەوێ و منیش ئەوانم خۆش ئەوێ. ئەوان تامەزرۆی منن و منیش تاسەباری ئەوانم، یادم دەکەن و منیش یادیان دەکەم، بۆم دەڕوانن منیش بۆیان دەڕوانم، ئەگەر تۆیش ڕێبازی ئەوان بگریتەبەر تۆشم خۆش ئەوێ، ئەگەریش لە ڕێبازی ئەوان لابدەی، دەکەویتە بەر تووڕەییمەوە».

پێغەمبەرەکەش گوتی: خودایە! نیشانەی ئەو بەندانەت چییە؟

خوداش فەرمووی: چاودێری خەڵك و ماڵ و منالی خەڵك دەکەن، هەروەك چۆن شوانێکی دڵسۆز چاودێری مەڕەکانی دەکات، ئێواران بە تاسەوە دەگەڕێنەوە بۆ ماڵ، هەروەك چۆن باڵندەکان بە تاسەوە ئێواران بۆ ماڵ دەگەڕێنەوە. جا کاتێ کە تاریکی بە تەواوی داهات و بوو بە شەوەزەنگ و نوێنی خەو ڕاخران و خێزانەکان بۆ خەوڕاکشان و دڵداران خزانە پەنای خۆشەویستانیان، ئەوسا ئەوان قنج ڕوو بە من ڕادەوەستن و دەچنە سوجدە و لەگەڵ

مندا دەست دەکەن بە ڕاز و نیاز و سپاس و ستایشی نیعمەتەکانم دەکەن، جاری وایە بەرز دەگرین و فرمێسك دەڕێژن، جاریواشە ئاه و حەسرەت هەڵدەکێشن، جارێ سەر لە سوژدە و کرنۆشدا، جاریواشە بە سەر پێوەن، یان دانیشتوون، لە بەرچاوی منەوە لەبەر من ڕەنج دەکێشن، لەبەر گوێی منەوە قەت لە خۆشەویستیم گلەیی ناکەن. ئەمنیش سێ شتیان پێ دەدەم:

یەکەم: ڕووناکیی خۆم دەهاوێمە دڵیانەوە، تا باسی من بکەن وەك چلۆن من باسیان دەکەم.

دووهەم: ئەگەر ئاسمانەکان و زەمین لە عاست و ڕێکی ئەواندا بوایە ئەمخستە ئیختیاریان.

سێهەم: ڕوویان تێ دەکەم. ئەدی خۆ دەزانی کەسێ من ڕووی تێ بکەم، کەسێك هەیە بزانێ من چەندەی دەدەمێ؟!

لە چیرۆکەکانی داوودا هاتووە، کە خودای گەورە وەحیی کرد بۆ داوود: ئەی داوود! هەتا کەی باسی بەهەشت دەکەی و داوای تاسەی دیداری من ناکەی؟

داوود گوتی: باری خودایە! چ کەسانێ تاسەباری تۆن؟

فەرمووی: ئەوانە تامەزرۆی دیداری منن کە لە هەرچی لێڵییە خاوێنیانم کردۆتەوە و لە هەرچی مەترسییە ئاگادارم کردوونەتەوە، ڕۆچنەیێکم لە دڵیاندا بەرەو خۆم کردۆتەوە کە لێیەوە بۆم بڕوانن، ئەمنیش دڵیان بەدەستی خۆم هەڵدەگرم و لە ئاسمانی دادەنێم و پاشان فریشتەکانم بانگ دەکەم، کاتێ کە کۆ دەبنەوە و سوجدەم بۆ دەبەن. پاشان ئەڵێم: ئەمن ئێوەم بۆ ئەوە بانگ نەکردووە کە سوجدەم بۆ ببەن، بەڵکوو بۆ ئەوە بانگم کردوون تا دڵی ئەم کەسانە کە تامەزرۆی منن پیشانتان بدەم و بەمانەوە بنازم. دڵی ئەم کەسانە لە ئاسماندا بەسەر فریشتەکاندا دەدرەوشێتەوە، هەروەك چۆن خۆر بۆ خەڵکی سەرزەمین پرشنگ بڵاودەکاتەوە.

ئەی داوود! ئەمن دڵی ئەم تاسەبارانەمم لە «رضوان»ی خۆم خەڵق کردووە و تیشکی زاتی خۆمم پێیان بەخشیوە، دایانم ناوە قسەم بۆ بکەن، جەستەیانم کردۆتە جێ نەزەری خۆم لە زەمیندا، ڕۆچنەیێکیشم لە دڵیاندا هێشتۆتەوە لەوێوە بۆم بڕوانن و ڕۆژ بە ڕۆژ بەرانبەر بە من عەشقیان پتر بێ.

داوود گوتی: پەروەردگارم! ئەم خۆشەویستانەی خۆتم پێ پیشان بدە.

خودا فەرمووی: ئەی داوود بچۆ بۆ کێوی لوبنان، لەوێدا چواردەکەس هەیە؛ هەندێکیان گەنج و هەندێ بەسالاچوو و هەندێکیان پیرن.

جا هەرکاتێ پێیان گەیشتی سڵاوی منیان پێ بگەیەنە و پێیان بڵێ: خودا سڵاوی دەگەیاندن و دەیفەرموو پێتان: ئەگەر داواکارییێکیان هەیە داوا بکەن، چونکە ئێوە خۆشەویستان و هەڵبژێرراوان و دۆستانی منن، شادم بە شادیتان و منیش تامەزرۆی ئێوەم.

داوود چوو بۆ ئەوێ و لە سەرچاوگەیێکدا چاوی پێکەوتن، سەیری کرد خەریکن سەبارەت بە مەزنی خودا بیر دەکەنەوە. کاتێ کە چاویان بە داوود کەوت، هەستان بڵاوە بکەن، داوود گوتی: ئەمن لە لایەنی خوداوە بۆ لای ئێوە هاتووم، هەواڵی خودام پێیە بۆتان.

دەست بەجێ گشتیان ڕوویان لە داوود کرد و گوێبیستی بوون و چاویان بەرەو زەمین داخست.

داوود گوتی: من لە لایەنی خوداوە هاتووم، خودا سڵاوی دەگەیاندن و دەیفەرموو، ئەگەر داواکارییێکتان هەیە داوا بکەن. بانگم لێ بکەن دەنگ و قسەیان ئەبیسم و هەرچی ساتە وەکوو دایکێکی دڵسۆز و میهرەبان سەیریان دەکەم.

دەستبەجێ چاویان پڕ بوو لە ئاو و فرمێسك بەسەر ڕوومەتیاندا هاتە خوار.

ڕیش سپیەکەیان گوتی: پاك و بێعەیبی خودایە! ئێمە بەندەی تۆین و کوڕی بەندەکانی تۆین. قەت دڵمان تۆی فەرامۆش نەکردووە...[١]

## بەشی حەوتەم: خۆشەویستی خودا سەبارەت بە بەندەکانی

لەم بوارەدا ئایەت و حەدیسی زۆر هاتووە، خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الَّذِينَ يُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِهِ صَفًّا كَأَنَّهُم بُنْيَانٌ مَّرْصُوصٌ﴾[٢].

واتە: «خودا ئەو کەسانەی کە بەیەك ڕیز لە ڕێی ئەودا دەجەنگن و ئەڵێی کۆشکی داڕێژراو لە قورقوشمن، خۆش ئەوێ».

---

١. بۆ پاشماوەی ئەم چیرۆکە و چەند چیرۆکیتر حەزرەتی داوود، سەیری ئیحیا، لەم باسەدا بکە ـ وەرگێڕ.

٢. الصف: ٤.

هەروەها فەرموویەتی: ﴿إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ التَّوَّابِينَ﴾[1] واتە: «بێگومان خودا تەوبەکەرانی خۆش ئەوێ».

ئەنەس رَضِيَ اللهُ عَنْهُ لە پێغەمبەری خوداوە صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ڕیوایەت ئەکات کە فەرموویەتی:

«إِذا أَحَبَّ اللهُ عَبْداً لَمْ يَضُرَّهُ ذَنْبٌ، وَ التَّائِبُ مِنَ الذَّنْبِ كَمَنْ لا ذَنْبَ لَهُ، ثُمَّ تَلا: ﴿إِنَّ اللهَ يُحِبُّ التَّوّابِينَ وَ يُحِبُّ الْمُتَطَهِّرِينَ﴾»[2].

واتە: «هەرکاتێ خودا بەندەیێکی خۆش بوێ، هیچکات گوناح زەرەری پێ ناگەیەنێ (چونکە پێش مەرگ تەوبەی لێ دەکا)، هەرکەسیش لە گوناح تەوبە بکات وەکوو ئەو کەسە وایە کە هەر گوناحی نەکردبێ. پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە ... »

مانای ئەوە کە گوناح زەرەری لێ نادات ئەوەیە کە پێش مەرگ تەوبە لەو گوناحەی دەکات، کەوابوو ئەو گوناحانەی کە تووشی بووە زەرەری پێ ناگەیەنن، هەرچەندەش زۆر بن، وەکوو چۆن کوفری ڕابردوو پاش موسڵمان بوون زەرەری نییە.

خودای گەورە خۆشەویستی خۆی بە بەخشینی گوناحەوە بەستۆتەوە، دەفەرمێ: ﴿يُحبِبْكُمُ اللهُ وَ يَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ﴾[3] واتە: «خودا ئێوەی خۆش ئەوێت و گوناحەکانتان دەبوورێ».

هەروەها پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فەرموویەتی: «إِنَّ اللهَ يُعْطِي الدُّنْيا لِمَنْ يُحِبُّ وَ مَنْ لا يُحِبُّ وَلا يُعْطِي الْإِيمانَ إِلّا لِمَنْ يُحِبُّ»[4] واتە: «خوداوەند دونیا هەم بەوانە دەدا کە خۆشیانی ئەوێ و هەم بەوانەی کە خۆشیانی ناوێ، بەڵام ئیمان بەس بەوانە دەدات کە خۆشیانی ئەوێت».

هەروەها پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فەرموویەتی: «مَنْ تَواضَعَ لِلّهِ رَفَعَهُ وَ مَنْ تَكَبَّرَ لِلّهِ وَضَعَهُ، وَ مَن أَكْثَرَ ذِكْرَ اللهِ أَحَبَّهُ اللهُ»[5].

---

١. البقرة: ٢٢٢.

٢. ابن‌ماجه: ٤٢٤٠، طبرانی فی الکبیر: ١٠١٢٨، جامع الکبیر للسیوطی: ٥، حرف التّاء ـ ١١٤٢، حرف الهمزة و فی الفتح الکبیر: ٥٤٨٦، حرف التّاء، کشف الخفاء للعجلونی: ٩٤٤، کنز العمال للهندی: ١٠١٧٥ ـ ١٠٤٢٨.

٣. آل‌عمران: ٣١.

٤. بیهقی فی شعب الإیمان: ٥١٣٦ و زاد: «... وَ لِمَنْ لا يُحِبُّ، وَلا يُعْطِي الدِّينَ إِلّا مَنْ يُحِبُّ ... ».

٥. جامع الکبیر للسیوطی: ٣٦، حرف الشّین بلفظه، احمد: ١١٢٩٩ بلفظ: «مَنْ تَواضَعَ لِلّهِ دَرَجَةً رَفَعَهُ اللهُ دَرَجَةً حَتَّىٰ يَجْعَلَهُ فِي عِلِّيِّينَ وَ مَنْ تَكَبَّرَ عَلَى اللهِ دَرَجَةً وَضَعَهُ اللهُ دَرَجَةً حَتَّىٰ يَجْعَلَهُ فِي أَسْفَلِ السّافِلِينَ». و فی روایة: «... وَ ما تَواضَعَ أَحَدٌ لِلّهِ إِلّا رَفَعَهُ اللهُ» مسلم: ٤٦٨٩، مالك فی الموطأ: ١٥٩٠، ترمذی: ١٩٥٢، احمد: ٨٦٤٧. و فی روایة: «... وَ مَنْ أَكْثَرَ ذِكْرَ الْمَوْتِ أَحَبَّهُ اللهُ» طبرانی فی الأوسط: ٥٠٥١، و فی روایة: «... وَ مَنْ أَكْثَرَ ذِكْرَ اللهِ فَقَدْ بَرِىءَ مِنَ النِّفاقِ» بیهقی فی شعب الإیمان: ٥٧١، جامع الکبیر للسیوطی: ٢١١٩، حرف الهمزة.

واتە: «هەرکەس ملکەچی خودا بێ سەربەرزی دەکات، هەرکەس لە بەرانبەر خوداوە دەمارزل بێت، دای‌دەبەزێنێ. هەرکەسیش زۆر یادی خودا بکات، خودا خۆشی ئەوێ».

زەیدی کوڕی ئەسلەم گوتوویە: «خوداوەند هێندە خۆشەویستی بۆ بەندەکەی زۆر ئەبێ، تا جێگەیێ کە ئەڵێ بە بەندەکەی: هەرچی کەیفتە بیکە.

هەروەها پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «قَالَ اللهُ تَعَالَیٰ: لا یَزَالُ الْعَبْدُ یَتَقَرَّبُ إِلَيَّ بِالنَّوَافِلِ حَتَّیٰ أُحِبَّهُ، فَإِذَا أَحْبَبْتُهُ فَأَکُونُ سَمْعَهُ الَّذِي یَسْمَعُ بِهِ وَ بَصَرَهُ الَّذِي یُبْصِرُ بِهِ وَ لِسَانَهُ الَّذِي یَنْطِقُ بِهِ»[1].

واتە: «خودای مەزن فەرموویەتی: بەردەوام بەندەکەم خەریکە بە ئەنجامدانی سوننەتەکان خۆی بە من نزیك ئەکاتەوە، تا خۆشیم بوێ، کە خۆشیم ویست، ئەبمە ئەو گوێیەی کە پێی دەبیسێ و ئەبمە ئەو چاوەی کە پێی دەبینێ، ئەبمە ئەو زمانەی کە پێی دەئاخێوێ».

نیشانەی خۆشەویستی خوداش بۆ بەندەکەی ئەوەیە کە لە خەڵك دووری دەخاتەوە و خۆی بەجێی ئەسباب و هۆکارەکان ئیشەکانی جێبەجێ دەکات.

پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «إِذَا أَحَبَّ اللهُ عَبْداً اِبْتَلَاهُ[2]، فَإِنْ أَحَبَّهُ الْحُبَّ الْبَالِغَ اِقْتَنَاهُ، وَ قِیلَ: مَا اقْتَنَاهُ؟ قَالَ: لَمْ یَتْرُكْ لَهُ مَالاً وَلا وَلَداً»[3].

واتە: «هەرکاتێ خودا بەندەیێکی خۆش بوێ تووشی بەڵای دەکات، ئەگەریش زۆر خۆشی بوێ لێی دەگرێتەوە. گوتیان: مەبەست لە لێ‌گرتنەوە چییە؟ فەرمووی: ماڵ و منالی لێ دەگرێتەوە».

بە حەزرەتی عیسایانعَلَيهِالسَّلَام گوت: ئەرێ بۆچی وڵاخێ ناکڕی و سواری بیت؟

فەرمووی: من لەلایەن خوداوە لەوە گەورەترم کە بە بۆنەی وڵاخێکەوە لە خۆیم دوور بخاتەوە.

---

١. بخاری: ٦٠٢١ و زاد: «...وَ یَدَهُ الَّتِي یَبْطِشُ بِهَا وَ رِجْلَهُ الَّتِي یَمْشِي بِهَا...». و فی روایة: «...إِنْ سَأَلَنِي أَعْطَیْتُهُ وَ إِنْ دَعَانِي أَجَبْتُهُ...» احمد: ٢٤٩٩٧.

٢. بیهقی فی شعب الإیمان: ٩٣٢٩ ـ ٩٣٣١ ـ ٩٦١٥، جامع الکبیر للسیوطی: ١١٣٤ ـ ٢٠٨٠، حرف الهمزة و زادوا: «لِیَسْمَعَ صَوْتَهُ».

٣. الآحاد والمثانی لابن‌ابی‌عاصم: ٢٢٠٧، جامع الکبیر للسیوطی: ١١٣٥ ـ ١٢٨٣، حرف الهمزة و فی بعض الرّوایات: «إِذَا أَرَادَ اللهُ بِعَبْدِهِ خَیْراً ابْتَلاهُ...».

لە حەدیسدا هاتووە: «إِذَا أَحَبَّ اللّٰهُ عَبْداً اِبْتَلاهُ، فَإِنْ صَبَرَ اِجْتَبَاهُ، فَإِنْ رَضِيَ اِصْطَفَاهُ»[1]. واتە: «هەرکات خودا بەندەیێکی خۆش بوێ، بە بەڵا تاقی دەکاتەوە، ئەگەر تاقەتی هێنا هەڵی دەبژێرێ، ئەگەریش [نەك تاقەت هێنان بەڵکوو] ڕازیش بوو ئەوە بە تایبەتی جیای دەکاتەوە».

پێشینیان فەرموویانە: نیشانەی خۆشەویستی بەندە بۆ خودا ئەوەیە کە ئەو بەندەیە ئەوەی کە خودا خۆشی ئەوێ هەڵی بژێرێ بەسەر ئەوەی کە خۆی خۆشی ئەوێ، بەردەوام یادی خودا بکات و دەستی لێ هەڵنەگرێ، خەڵوەت و ڕاز و نیازکردنی لە هەرچی شتە خۆشتر بوێ.

## بەشی هەشتەم: ڕازیبوون بە قەزا و قەدەر

خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُمْ وَ رَضُوا عَنْهُ﴾[2] واتە: «خودا لە ئەوان ڕازیە و ئەوانیش لە خودا ڕازی بوون».

لە حەدیسدا هاتووە: «إِنَّ اللّٰهَ تَعَالَىٰ يَتَجَلَّىٰ لِلْمُؤْمِنِينَ فَيَقُولُ: سَلُونِي، فَيَقُولُونَ: رِضَاكَ»[3]. واتە: «خوا خۆی نیشانی بڕوادارە ڕاستەقینەکان دەدات و پێیان ئەفەرمێ: داوام لێ بکەن. ئەوانیش ئەڵێن: ڕەزایەت و دڵخۆشبوونی تۆمان ئەوێ».

دەگێڕنەوە کە پێغەمبەرﷺ پرسیاری لە هەندێ لە هاوەڵانی کرد:

«مَا أَنْتُمْ؟ فَقَالُوا: مُؤْمِنُونَ، فَقَالَ: مَا عَلامَةُ إِيمَانِكُمْ، فَقَالُوا: نَصْبِرُ عِنْدَ الْبَلاءِ وَ نَشْكُرُ عِنْدَ الرَّخَاءِ، و نَرْضَىٰ بِمَوَاقِعِ الْقَضَاءِ، فَقَالَ: مُؤْمِنُونَ وَ رَبِّ الْكَعْبَةِ»[4].

واتە: «ئێوە کێن؟ گوتیان: ئیمە ئیماندارانین، فەرمووی: نیشانەی ئیمانەکەتان چییە؟ گوتیان: لەکاتی بەڵا و تەنگانەدا خۆڕاگرین، لە فەرحانەتی و خۆشیدا شوکرانەبژێرین و بە هاتنی قەزاو قەدەر ڕازین. پێغەمبەرﷺ فەرمووی: سوێند بە خودای کەعبە ئێوە ئیماندارن».

---

١. لم نعثر علیه لکن ورد بنحوه: «عَجَبًا لِأَمْرِ الْمُؤْمِنِ إِنَّ أَمْرَهُ كُلَّهُ خَيْرٌ... إِنْ أَصَابَتْهُ سَرَّاءُ شَكَرَ فَكَانَ خَيْراً لَهُ، وَ إِنْ أَصَابَتْهُ ضَرَّاءُ صَبَرَ فَكَانَ خَيْراً لَهُ» مسلم: ٥٣١٨، احمد: ١٨١٧١ ـ ١٨١٧٥.

٢. المائدة: ١١٩.

٣. طبرانی فی الأوسط: ٢١٦٥، جامع الکبیر للسیوطی: ٣٥٣، حرف الهمزة، الحارث فی البُغیة: ١٩١ و فی مسنده: ١٩٥ بلفظ: «... فَسَلُونِي فَيَأْلُونَ الرِّضَا».

٤. طبرانی فی الأوسط: ١٤٨٤، مجمع الزوائد للهیثمی: ٥٤/١.

لە ڕیوایەتێکی‌تری ئەم حەدیسەدا هاتووە کە لە درێژەیدا فەرموویەتی: «حُکَمَاءُ عُلَمَاءُ کَادُوا مِنْ فِقْهِهِمْ أَنْ یَکُونُوا أَنْبِیَاءَ»[1] واتە: «ئەمانە زانا و بلیمەتانێکن کە نزیکە بە بۆنەی زانستەکەیانەوە بە پلەی پێغەمبەری بگەن».

حەزرەتی مووساعَلَيْهِ‌السَّلَامُ فەرموویەتی: «خودایە! کارێکم پێ پیشان بدە کە ڕەزایەتی تۆم پێ دەست کەوێ، تا ئەنجامی بدەم، خوداش وەحی بۆ نارد: ڕەزایەتی من لە سەختی و ڕەنجی تۆدایە، تۆیش لەسەر ڕەنج و سەختی خۆڕاگر نیت. گوتی: خودایە! پیشانم بدە. خوداش فەرمووی: ڕەزایەتی من لە ڕازی‌بوونی تۆ بە قەزا و قەدەردایە».

پێویستە بزانی کە "ڕەزا" دەروازەی گەورەی خودای مەزنە، هەرکەس ڕێی بچێتە سەری ئەوە بەرزترین و بانترین پلەی دەست کەوتووە.

## بەشی نۆهەم: هەندێ چیرۆکی خۆشەویستانی خودا

دەگێڕنەوە کە ئەبووتوڕابی نەخشەبی لە کاروباری موریدێك سەرسام بوو و لێی نزیك کەوتەوە و لە پەنایدا خەریکی کاروباری خۆی دەبوو و موریدەکەش خەریکی عیبادەت و زیکر و فیکری خۆی دەبوو. ڕۆژێك ئەبوو توڕاب پێی گوت: خۆزگە سەردانی بایەزیدت دەکرد.

موریدەکەش گوتی: من پێویستێکم بەو نییە، ئەبوو توڕاب هێندە دنەی داو داوای لێ کرد کە بڕوا سەری بایەزید بدات، تا موریدەکە ڕقی هەستاو گوتی: من بایەزیدم بۆ چییە، کاتێ کە خودا خۆی بێ‌نیازی کردووم لە بایەزید؟

ئەبوو توڕاب دەڵێ: دڵم هاتەسەر و خۆم پێ ڕانەگیرا و گوتم: هاوار بۆ تۆ خەریکی بەخودا ئەخەڵەتی. باوەڕکە ئەگەر کەڕەتێ بایەزید ببینی خێری لەوە زۆرترە بۆت کە حەفتا جار خودا ببینی!

موریدەکە لەم قسەی منە سەری سوڕما و گوتی: وەها نییە، چلۆن ئەبێ وابێ؟!

گوتم: هاوار بەماڵت! ئەتۆ خودا لەلای خۆتەوە ئەبینی و هەر بە ئەندازەی خۆت دەیبینی. بەڵام ئەگەر بایەزید ببینی، ئەوا خوداش بەو ئەندازە کە بایەزید دەیبینێ تۆ دەیبینی.

---

١. الدرّ المنثور للسیوطی فی تفسیر آیة ١٤٤ من سورة الأعراف.

موریدەکە لەم قسەم تێگەیشت و گوتی: دەباشە بمبە بۆلای.

ئەبوو توراب ئەم چیرۆکە دەگێڕێتەوە تا دەگاتە دوایەکەی و دەڵێ: لەسەر تەپۆڵکەیێك چاوەڕوانی بایەزید بووین تا لە دارستانەکە بێتەدەر ـ چونکە بایەزید ئەچووە نێوان ئەو دارستانانەی کە جانەوەری دڕندەی تێدا بوو ـ دەڵێ: بایەزید لە پەنامانەوە تێدەپەڕی و کەوڵێکی لەبەر کردبوو، کەوڵەکەی هەڵداوە. بە موریدەکەم گوت: ئائەمە بایەزیدە.

موریدەکەش سەیرێکی کرد و لەناکاو قیژاندی و ڕاکشاو کەوت، دەستمان پێوە ژەند، کەچی مرد بوو. پێکەوە موریدمان هەڵگرد و بردمان ئەسپەردەمان کرد. پاشان بە بایەزیدم گوت: گەورەم! نەزەرێکی جەنابت کوشتی. فەرمووی: نا، بەڵام ئەم دۆستەت پیاوێکی ساف و ڕاست بوو و دڵی دامەزرا بوو، لە دڵیدا سیرڕی خودا جێگیر بوو بوو، بەڵام تا ئێستا ئەو سیرڕە کەشف نەبوو بوو. کاتێ ئێمە دیتمان، ئەو سیرڕە کەشف بوو، دڵی ئەویش دەرەتانی نەبوو و تەنگ بوو نەیتوانی جێی ئەو کەشفە بکاتەوە، چونکە هێشتا لە پلەی خواری موریدایەتیدا بوو. ئیدی ئەوە کوشتی.

لە حەدیسدا هاتووە کە خودای مەزن وەحی ناردۆتە سەر یەکێك لە پێغەمبەران:

«بێ‌شك من کەسێ بە دۆستی خۆم وەردەگرم کە لە یادم نەکات، جگە من کەسی‌تر لە دڵیدا نەبێ، شتێ وەپێش من نەخات، ئەم دۆستەم ئەگەر بە ئاوریش بسووتێنرێ، هەست بە ئێشی ئاورەکەش ناکات، ئەگەر بە مشار لەت لەتی کەن هەست بە ئێشی مشارەکە ناکات».

کە وابوو کەسێ کە خۆشەویستی خودا سەبارەت بە ئەو نەگەیشتۆتە ئەم ڕادە، لە کوێوە خەبەری پشتی پەردە دەزانێ و کەشف و کەرامەتی بۆ دەردەکەوێ. ئەمانە هەموویان پاش خۆشەویستی خودا و پاش ئیمان و باوەڕی ڕاستەقینە دەردەکەون.

لە حەدیسدا هاتووە: «إِنَّ لِلّٰهِ تَعَالَىٰ ثَلاثَمِائَةِ خُلُقٍ، مَنْ لَقِيَهُ بِخُلُقٍ مِنْهَا مَعَ التَّوْحِيدِ دَخَلَ الْجَنَّةَ» واتە: «خودای مەزن سێ‌سەد ئاکاری هەیە، هەر کەس ئیمانی بە تاکیی خودا بێ و بە یەکێ لەم ئاکارانەوە لەگەڵ خودا ڕووبەڕوو بێتەوە، ئەوە دەڕواتە بەهەشت». حەزرەتی ئەبووبەکرڕَضِيَ‌اللهُ‌عَنْهُ گوتی: [ئەی پێغەمبەری خودا!] ئاخۆ لەو ئاکارانە لەمندا بێ؟ پێغەمبەرصَلَّى‌اللهُ‌عَلَيْهِ‌وَسَلَّمَ فەرمووی: «كُلُّهَا فِيكَ يَا أَبَابَكْرٍ! وَ أَحَبُّهَا إِلَى اللهِ تَعَالَىٰ السَّخَاءُ» «ئەی ئەبووبەکر! هەموویان لە تۆدا هەیە. [ئەوەش بزانە] خۆشەویسترینیان بەلای خودای

مەزنەوە سەخاوەت و دەست و دڵبازییە».[١]

پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «رَأَيْتُ مِيزَاناً دُلِيَ مِنَ السَّمَاءِ فَوُضِعْتُ فِي كَفَّةٍ، وَ وُضِعَتْ أُمَّتِي فِي كَفَّةٍ فَرَجَحْتُ بِهِمْ و وُضِعَ أَبُوبَكْرٍ فِي كَفَّةٍ، وَجِيءَ بِأُمَّتِي فَوُضِعَتْ في كَفَّةٍ فَرَجَحَ بِهِمْ».[٢]

واتە: «تەرازوویێکم دیت لە ئاسمانەوە داڵوسکە کرابوو، ئەمن نرامە نێو تایێکی و ئوممەتەکەم نرایە نێو ئەو تاکەیتری، کەچی کەفەی من لەوان قورستر بوو، پاشان ئەبووبەکریان نایە نێو تایەکی و ئوممەتمیان نایە نێو ئەو تاکەیتری، کەچی ئەبووبەکر لەوان قورستر بوو».

پێغەمبەرﷺ وێڕای ئەمانە هەمووی، لە زاتی خودای گەورەدا نوقمەسار بوو بوو، بەجۆرێ دڵی جگە لە خودا نەبێ جێی کەسیتری نەدەکردەوە، بەمبۆنەوە فەرموویەتی:

«لَوْ كُنْتُ مُتَّخِذاً خَلِيلاً لاَتَّخَذْتُ أَبَابَكْرٍ خَلِيلاً وَلٰكِنْ صَاحِبُكُمْ خَلِيلُ اللهِ»[٣] واتە: «ئەگەر خۆشەویست و دۆستێ بگرم، ئەوا ئەبووبەکر بە دۆست ئەگرم، بەڵام ئەم هاوەڵەتان (واتە پێغەمبەرﷺ) خۆشەویست و دۆستی خودایە».

شبلی رحمه الله فەرموویەتی: «خۆشەویستی سەرگەردانییێکە لە لەززەتدا، سەرسامییێکە لە گەورەییدا». هەروەها فەرموویەتی: «تاسە، ئاورێکە خودا لە دڵی دۆستەکانیدا هەڵیکردووە تا هەرچی خەتەرە و ویست و نیاز و پێداویستییە، بیسووتێنێ».

والله أعلم بالصواب

---

١. طبرانی فی الأوسط: ١١٤٣، بیهقی فی شعب الإیمان، کلاهما بلفظ: «... خَلَقْتُ عَشْراً وَ ثَلاثِمِائَةِ خُلُقٍ ...»، و فی روایة: «بِضْعَةَ عَشَرَ وَ ثَلاثِمِائَة ...» و زاد الطبرانی والبیهقی: «... مَعَ شَهٰادَةِ أَنْ لا إِلٰهَ إِلَّا اللهُ دَخَلَ الْجَنَّةَ». بزار فی مسنده: ٤٤٦، طیالیسی فی مسنده: ٨٣ کلاهما بلفظ: «إِنَّ لِلّٰهِ مِائَةً وَ سَبْعَ عَشَرَةَ شَرِيعَةً، مَنْ وٰافٰاهُ بِخُلُقٍ مِنْهٰا دَخَلَ الْجَنَّةَ»، بیهقی فی شعب الإیمان: ٨١٩١ بلفظ: «... مِائَةً وَ سَبْعَةَ عَشَرَ خُلُقاً ...»، جامع الکبیر للسیوطی: ٧٣، حرف الهمزة بلفظ أخری: «اَلْإِسْلامُ ثَلاثُمِائَةِ شَرِيعَةٍ ...».

٢. احمد بن‌جنبل فی فضائل الصّحابة: ٢١٥ و فی مسنده: ١٩٦٠٠، طبرانی فی الکبیر: ٧٧٧٢ ـ ٧٨٤٨، ابن‌ابی‌شیبه فی مصنّفه: ٤٧٦/٧ ـ ٢٣٥، نسائی فی سنن الکبری: ٨١٣٦، ابن‌ابی‌عاصم فی السّنة: ٩٤٤ جمیعهم بألفاظ و روایات مختلفة.

٣. بخاری: ٣٣٨٣ ـ ٣٣٨٥، مسلم: ٤٣٩١ ـ ٤٣٩٢ ـ ٤٣٩٣ ـ ٤٣٩٤، احمد: ٣٢١٢ ـ ٣٩٦٨ ـ ١٥٥٣٠ ـ ٤١٨٥١.

# بابەتی سی و حەوتەم: نییەت، ئیخلاس و ڕاستی

## بەشی یەکەم: نییەت

خودای مەزن فەرموویەتی: ﴿وَلَا تَطْرُدِ الَّذِينَ يَدْعُونَ رَبَّهُمْ بِالْغَدَاةِ وَالْعَشِيِّ يُرِيدُونَ وَجْهَهُ﴾[1] واتە: [ئەی موحەممەد!] ئەو کەسانە لە خۆت مەتۆرێنە کە هەموو بەیانی و ئێوارەیەك هانا دەبەنە لای پەروەردگار و تەنیا زاتی ئەویان مەبەستە.

لەم ئایەتەدا مەبەست لە ئیرادەو ویست (یریدون) نییەتە.

پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «إِنَّمَا الْأَعْمَالُ بِالنِّيَّاتِ»[2] واتە: «کردەوە بەس بە نییەتە».

هەروەها دەفەرمێ: «اَلنَّاسُ أَرْبَعَةٌ: رَجُلٌ آتَاهُ اللهُ ـ عَزَّوَجَلَّ ـ عِلْماً وَ مَالاً فَهُوَ يَعْمَلُ بِعِلْمِهِ فِي مَالِهِ، فَيَقُولُ رَجُلٌ لَوْ آتَانِيَ اللهُ تَعَالَىٰ مِثْلَ مَا آتَىٰ فُلاناً كُنْتُ أَعْمَلُ كَمَا عَمِلَ فَهُمَا فِي الْأَجْرِ سَوَاءٌ ...».[3]

واتە: خەڵك چوار جۆرن: پیاوێك، خودای مەزن زانیاری و ماڵی پێ دەدات، ئەویش بە پێی زانیارییەکەی لە ماڵەکەیدا دەست دەجووڵێنێتەوە، پیاوێ‌تر ئەڵێ: خۆزگە خودای

---

١. الأنعام: ٥٢.

٢. بخاری: ١ ـ ٦١٩٥ ـ ٦٤٣٩، مسلم: ٣٥٣٠، ترمذی: ١٥٧١، نسائی: ٧٤ ـ ٣٣٨٣ ـ ٣٧٣٤، ابوداود: ١٨٨٢، ابن‌ماجه: ٤٢١٧، احمد: ١٦٣ و بعضی الرّوايات: «إِنَّمَا الْأَعْمَالُ بِالنِّيَّةِ ...».

٣. ترمذی: ٢٢٤٧، ابن‌ماجه: ٤٢١٨، احمد: ١٧٣٣٦. و فی رواية بنحوه: «لا حَسَدَ إِلَّا فِي اثْنَتَيْنِ: رَجُلٌ آتَاهُ اللهُ مَالاً فَسُلِّطَ عَلَىٰ هَلَكَتِهِ فِي الْحَقِّ، و رَجُلٌ آتَاهُ اللهُ الْحِكْمَةَ فَهُوَ يَقْضِي بِهَا وَ يُعَلِّمُهَا» بخاری: ٧١ ـ ١٣٢٠ ـ ٦٦٠٨ ـ ٦٧٧٢، مسلم: ١٣٥٢، ابن‌ماجه: ٤١٩٨، احمد: ٣٤٦٩ ـ ٣٩٠٠، و فی رواية: «لا حَسَدَ إِلَّا فِي اثْنَتَيْنِ: رَجُلٌ عَلَّمَهُ اللهُ الْقُرْآنَ فَهُوَ يَتْلُوهُ آنَاءَ اللَّيْلِ وَ آنَاءَ النَّهَارِ فَسَمِعَهُ جَارٌ لَهُ فَقَالَ: لَيْتَنِي أُوتِيتُ مِثْلَ مَا أُوتِيَ فُلانٌ فَعَمِلْتُ مِثْلَ مَا يَعْمَلُ وَ رَجُلٌ آتَاهُ اللهُ مَالاً فَهُوَ يُهْلِكُهُ فِي الْحَقِّ فَقَالَ رَجُلٌ: لَيْتَنِي أُوتِيتُ مِثْلَ مَا أُوتِيَ فُلانٌ فَعَمِلْتُ مِثْلَ مَا يَعْمَلُ» بخاری: ٤٦٣٨ ـ ٦٦٩١ ـ ٦٩٧٤ ـ ٦٩٧٥، مسلم: ١٣٥٠ ـ ١٣٥١، ترمذی: ١٨٥٩، ابن‌ماجه: ٤١٩٩، احمد: ٤٣٢٢ ـ ٥٣٦١ ـ ٩٨٢٤.

گەورە وەك فڵانەکەس بەشی بدایەم و ئەمنیش هەروەك ئەوم بکردایە. ئەم دوو کەسە لە پاداشتدا وەکوو یەك وان ... ».

لە حەدیسدا هاتووە: «إِذَا الْتَقَى الْمُسْلِمٰانِ بِسَيْفِيهِمٰا فَقَتَلَ أَحَدُهُمٰا صٰاحِبَهُ فَالْقٰاتِلُ وَ الْمَقْتُولُ فِي النّٰارِ قِيلَ: يٰا رَسُولَ اللهِ هَذَا الْقٰاتِلُ، فَمٰا بٰالُ الْمَقْتُولِ؟ قٰالَ: إِنَّهُ كٰانَ حَرِيصاً عَلَىٰ قَتْلِ صٰاحِبِهِ»[1].

واتە: «هەرکاتێ دوو موسوڵمان بە شمشێرەوە تووشی یەك هاتن و یەکیان ئەویتریانی کوشت، ئەوە هەم بکوژەکە و هەم کوژراوەکە لە نێو ئاوری جەهەننەمدان. پرسیار کرا: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەمەیان بکوژە [ڕاستە]، ئەدی کوژراوەکە بۆچی؟! پێغەمبەرﷺ فەرمووی: چونکە ئەویش ئەیویست هاوەڵەکەی بکوژێ».

هەروەها پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «مَنْ تَطَيَّبَ لِغَيْرِ اللهِ تَعٰالَىٰ جٰاءَ يَوْمَ الْقِيٰامَةِ وَ رِيحُهُ أَنْتَنُ مِنَ الْجِيفَةِ، وَ مَنْ تَطَيَّبَ لِلّٰهِ تَعٰالَىٰ جٰاءَ يَوْمَ الْقِيٰامَةِ وَ رِيحُهُ أَطْيَبُ مِنَ الْمِسْكِ»[2].

واتە: «هەرکەس لەبەر غەیری خودا خۆی بۆنخۆش بکات، ڕۆژی قیامەت دێت و بۆنی پیسترە لە بۆنی کەلاکی تۆپیو، هەروەها هەرکەسیش خۆی بۆ خودا بۆنخۆش بکات، ڕۆژی قیامەت دێت و بۆنی لە هی میسك خۆشترە».

## بناغە و حەقێقەتی نییەت

بزانە نییەت و ئیرادە و قەست چەند وشەن کە هەر هەموویان بۆ یەك مانا هاتوون، ئەویش: حاڵەت و سیفەتێکە کە بۆ دڵ پەیدا دەبێ و زانین و کردەوەش ئەم شان و ئەو شانی دەگرن، زانین وەك پێشەکی و مەرج وایە بۆ نییەت و کردەوەش پاش نییەتەکە پەیدا دەبێ.

بەم پێیە: نییەت، بریتییە لەو ویستە کە دەکەوێتە نێوان زانینێ کە لە پێشیەوە بووە و نێوان کردەوەیێ کە لە دوویەوە دێ. سەرەتا شتەکە دەزانێ، پاشان ویستەکەی هەڵێدەنێ لەسەر ئەوەی کە بە پێی زانیارییەکە کردەوە کە ئەنجام بدات، [کەوابوو ویستەکە زانین و کردەوە گرێدەدابە یەکەوە].

---

١. جاء بلفظ: «... إِنَّهُ كٰانَ حَرِيصاً عَلَىٰ قَتْلِ صٰاحِبِهِ» و كَذٰا بِلَفْظِ: «إِذٰا تَوٰاجَهَ الْمُسْلِمٰانِ بِسَيْفِهِمٰا ...» بخاری: ٣٠ ـ ٦٣٦٧ ـ ٦٥٥٦، مسلم: ٥١٤٠ ـ ٥١٣٩، ابوداود: ٣٧٢٣، نسائی: ٤٠٤٩ ـ ٤٠٥٢ ـ ٤٠٥٣ ـ ٤٠٥٤ ـ ٤٠٥٥، ابن‌ماجه: ٣٩٥٤، احمد: ١٨٧٦٨ ـ ١٨٨٤٥ ـ ١٩٥٧١ ـ ١٨٩١٦ ـ ١٩٦١٣.

٢. عبدالرّزّاق فی مصنفه: ٧٩٣٣.

ئەم فەرموودەی پێغەمبەرە: صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ «نِيَّةُ الْمُؤْمِنِ خَيْرٌ مِنْ عَمَلِهِ»[١] واتە: «نیەت و ویستی ئیماندار چاکترە لە کردەوەکەی».

مەبەستی ئەوەیە: ئەگەر کردەوەکەی بێ نییەت بوو، یان نییەتەکەی بێ کردەوە ماوە، ئەوە شك لەوەدا نییە کە نییەتە بێ‌کردەوەکە باشترە لە کردەوە بێ نییەتەکە.

هەروەها ئەگەر ئەو کردەوەی کە پێشتر نییەتی لەسەر ئەنجامدانی بووە، لە بەرچاو بگرین، دیسان هەر ئەو نییەتە چاکترە لەو کردەوە، چونکە ئەو نییەت و ویستەیە کە هۆکاری بەدیهاتنی بناغەی کارەکەیە. نییەتیش بە دڵەوە نزیکە. کەوابوو بە هەر جۆرێك بۆی بچین هەر نییەتی ئیماندار لە کردەوەکەی چاکترە و خێری زۆرترە، هەر وەك چۆن حەدیسەکە فەرمووی.

## کردەوە خۆی دەبێتە چەند بەشەوە: گوناح، تاعەت و موباح

ئەوانەیان کە گوناح و تاوانن بە گۆڕانی نییەت نابنە تاعەت و عیبادەت. بەڵام ئەو کردەوانە کە تاعەتن، پێویستە نییەتیان لەگەڵدا بێ، چونکە کردەوەکان تا نییەتیان لەگەڵدا نەبێ نابنە تاعەت، پاشانیش بە بەردەوام بوون لەسەر ئەو نییەتە و درێژەدانی بە چاکە، تاعەت و خواپەرستییەکەی چەند بەرانبەر ئەبێتەوە بۆی.

هەندێ کردەوەش هەیە کە لە لایەنی ژمارەوە یەك دانەیە، کەچی ئەکرێ لەجێی نییەتی خێر و چاکەوە ببێتە چەند عیبادەت وەکوو:

[١.] دابنیشێ لەنێو مزگەوتدا و مەبەستی دیدار و ڕاز و نیازی خودای گەورە بێ. هەروەك چۆن لەمبارەشەوە حەدیس هاتووە: «مَنْ قَعَدَ فِي الْمَسْجِدِ فَقَدْ زَارَ اللهَ تَعَالَىٰ وَ حَقٌّ عَلَى الْمَزُورِ أَنْ يُكْرِمَ زَائِرَهُ»[٢].

واتە: «هەرکەس لەنێو مزگەوتدا دابنیشێ، ئەوە بێ‌گومان سەردانی خودای مەزنی کردووە، ئەدی حەققیشە ئەو کەسە کە سەردانی ئەکرێ، ڕێزی میوانەکەی بگرێ».

---

١. طبرانی فی الكبير: ٥٨٠٩، الشّهاب القضاعی فی مسنده: ٤١٤، بیهقی شعب الإيمان: ٦٤٤٧، جامع الكبير للسيوی: ٧٣٦٦، حرف النون و فی رواية: «نِيَّةُ الْمُؤْمِنِ أَبْلَغُ مِنْ عَمَلِهِ» الشّهاب القضاعی فی مسنده: ١٤٠، بیهقی شعب الإيمان: ٦٤٤٥، جامع الكبير للسيوی: ٧٣٦٤، حرف النون.

٢. ابن‌ابی‌شيبه فی مصنفه: ١٧٢/٨ ـ ١٧٣، بیهقی فی شعب الإيمان: ٢٦٨٢ بلفظ: «اَلْمَسَاجِدُ بُيُوتُ اللهِ فِي الْأَرْضِ، وَ حقٌّ ...»، جامع الكبير للسيوطی: ١٦٨، حرف الميم و زاد: «... وَالْمُؤْمِنُونَ زُوّارُ اللهِ ...»، و فی رواية: «مَا مِنْ مُسْلِمٍ يَتَوَضَّأُ فَيُحْسِنُ وُضُوءَهُ إِلَّا كَانَ زَائِرَ اللهِ عَزَّوَجَلَّ ...» طبرانی فی الكبير: ٦٠٢٢٢ ـ ٦٠١٦، ابن‌ابی‌شيبه فی مصنّفه: ١٧٣/٨، ابوداود فی الزّهد: ٤٦٥.

[٢.] چاوەڕوانی نوێژ بکات لەنێو مزگەوتدا، ئەدی هەرکەسێ چاوەڕوانی نوێژ بێت ئەو چاوەڕوانییەی بە نوێژ بۆ ئەژمێردرێ.

[٣.] بە نییەتی مانەوە لە مزگەوتدا (اعتکاف) دابنیشێ.

[٤.] بیەوێ بە مانەوە لە مزگەوتدا خۆی لە گوناح و تاوان بپارێزێ.

[٥.] بیەوێ وێڕای بوون لە مزگەوتدا گوێبیستی قورئان و زیکری خودا بێ.

ئەمانە گشتیان خێرات و عیبادەتانێکن کە بە نییەتکردنیان دەست دەکەوێ و پێکەوە پێك دێن.

کردەوە موباحەکان، ئەگەر نییەتی خێریان لەگەڵدا بێ دەبنە عیبادەت. ئەمەش خوازیاری ئەوەیە کە بە وریاییەوە هەڵسوکەوتی لەگەڵدا بکرێ، چونکە هەرچی جووڵە و هەستان و دانیشتنە، ئەگەر بە نییەتی خێرەوە ئەنجام بدرێن دەبنە عیبادەت. کەوابوو ئاوەها هەڵسوکەوت کردن ئەوەی لێ دەکەوێتەوە کە چرکە ساتێك لە تەمەن بە فێڕۆ نەچێ و بەتەواوی خۆی لە حەیوانات هەڵاوێرێ، چونکە حەیواناتن کە بە بێ قەست و ویست دەجووڵێنەوە.

پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «إِنَّ الْعَبدَ لَيُسْأَلُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ عَنْ كُلِّ شَيْءٍ حَتَّىٰ عَنْ كُحْلِ عَيْنَيْهِ[١]، وَ عَنْ فَتَاتِ الطِّينِ بِأَصْبُعِهِ وَ عَنْ لَمْسِهِ ثَوْبَ أَخِيهِ»[٢].

واتە: «ئادەمیزاد، لە پاشەڕۆژدا سەبارەت بە هەموو شتێ پرسیاری لێ دەکرێ؛ تەنانەت لەبارەی کلەی چاوەکانیەوە، لەبارەی پرواندنی گڵ بە پەنجەکانی، لەبارەی دەستدان بە لیباسی براکەیەوە».

جا هەرکەس بتوانێ هۆشیاری سەرجەمی کردەوەکانی بێت بۆ ئەوەی بەپێی سوننەت و ڕەوشتی چاك و بە نییەتی خێرخوازانەوە ئەنجامیان بدات، ئەوە لە ڕیزی چاکانی نزیکی دەرگانەی خودا دێتە ئەژمار، خودای مەزن فەرموویەتی: ﴿مَا يَلْفِظُ مِنْ قَوْلٍ إِلَّا لَدَيْهِ رَقِيبٌ عَتِيدٌ﴾[٣]

واتە: «هیچ قسەیێ لە دەمی دەرناچێ مەگەر فریشتەیێکی چاوەدێر و ئامادە لە لایدایە و تۆماری دەکات».

---

١. کنز العمال للهندی: ٨١٦، جامع الکبیر للسیوطی: ١١٩٨، حرف الیاء.

٢. المطالب العالیة لابن‌حجر العسقلانی: ٣٢٦٣، الحارث فی مسنده: ٢٠٤ دون ذکر قوله: «عَنْ فَتَاتِ الطِّينِ بِأَصْبُعِهِ».

٣. ق: ١٨.

یەکێك لە پیاوچاکان ئەفەرمێ: قاقەزێکم نووسی و ویستم لە پەنای ماڵی هاوسێکەمانەوە بیکەم بە ژێر خۆڵەوە، هەستم بە گوناح کرد و پاش‌گەز بوومەوە، پاشان گوتم: کورە چییە خۆ خاك خاکە! گوێم نەدا و کردم بە ژێر خۆڵەوە، لەناکاو دەنگێ هات بە گوێما و گوتی: وەها بکە سبەی دەزانی کەسێ سووکایەتی بە خاك بکات چی بەسەر دێ![1].

[دەڵێن:] پیاوێك لەگەڵ سەفیانی سەوریدا رَحِمَهُ اللَّهُ نوێژی خوێند، سەیری کرد کراسەکەی سەفیان هەڵەوگەڕاوەیە، پاشان چووە پێشەوە و پێی گوت و دەستی درێژ کردەوە تا بۆی چاك بکاتەوە، خێرا سەفیان دەستی گرت و نەیهێشت چاکی بکاتەوە بۆی، پیاوەکە لەمبارەوە پرسیاری لێ کرد. ئەویش فەرمووی: ئەمن لەبەر خودا ئەم کراسەم کردۆتە بەر، ئێستا نامەوێ لەبەر غەیری خودا ڕێکوپێکی بکەم.

حەسەنی بەسری رَحِمَهُ اللَّهُ فەرموویەتی: ڕۆژی قیامەت پیاو لەگەڵ هاوسێیەکەیدا دەستەویەخەی یەك دەبن. هاوسێکەی ئەڵێ: لەنێوان من و تۆدا خودا بووە، پیاوەکەش، ئەڵێ: سوێند بەخودا نازانم چی ئەڵێی. هاوسێکەش ئەڵێ: ئەتۆ خشتێکت لە دیواری ماڵەکەم دەرهانی، تاڵێ دەزووت لە کراسەکەم دەرکێشا.

## نییەت لە ژێر دەسەڵاتی مرۆڤدا نییە

ئەڵێین: هەندێ‌جار کەسانێ ئەم قسانەی ئێمە سەبارەت بە نییەت ئەبیسن و بۆ پەیڕەویکردنی لە کردەوەکانیاندا، ئەڵێن: نییەتم هەیە لەبەر خودا دەرس بڵێمەوە، یان نییەتم هەیە لەبەر خودا مامەڵە بکەم، یان نییەتم هەیە لەبەر خودا نان بخۆم... هەیهوو، هەیهوو! ئەمانە هەموویان قسەی نەفس و خەیاڵ و حەزە. چونکە نییەت هیچکام لەمانە نییە. بەڵکوو نییەت بریتییە لە هۆگرییەکی دەروونی و حەز و مەیلێك کە لە دڵەوە سەرچاوە بگرێ، بۆ ئەو کارەی کە ئامانجیەتی بیکات، چ ئێستا، چ لە داهاتوودا. ئەدی خۆ مەیل و حەز مادامێ لە دەروونەوە هەڵنەقوڵێ، قەت ناکرێ بە زۆر وەدەستی بهێنی، بەڵکوو ئاخرەکەی ئەوەیە خەیاڵ ئەکەی لەم شتەوە بۆ شتێ‌تر دەگوێزیتەوە، وەك چۆن کەسێ کە تێرە، بڵێت: ئەوا نییەتم هەیە برسیم بێ. یان نییەتم هەیە لەبەر برسیەتی نان بخۆم، یان کەسێ کە ئەویندارى کەس نییە، بڵێت: نییەتم

---

١. حلية الاولياء لأبي‌نعيم الأصبهاني: ٣٥٩/٤ على بن معبد.

هەیە عاشقی فلانەکەس بم، یان فیسارەکەسم خۆش بوێ، یان ڕێز لە فلانی بگرم. ئەمانە هیچکامیان دەروونی نین، کەوا بوو مەحاڵە بێتەجێ، مادامێ هۆکارەکەیان ـ کە بریتییە لە مەیلی دەروونی و حەزی دڵ ـ پێش نەکەوێ و ئەم لە ولامی داخوازی دڵیدا ئەم کارانە بکات.

نموونەی ئەمە وەکوو ژنخواستنی کەسێك شەهوەت زۆری بۆ بهێنێ و بیەوێ ژن بهێنێ، پاشان بە زۆر ئەم نییەتە بهێنێ کە ئەیەوێ شوێنی پێغەمبەری خودا بکەوێ لە ژنهێناندا و لە منداڵی چاك و ساڵح بووندا. ئەمە بە هیچ جۆرێ جێ ناگرێ، چونکە لە دەروونیدا هیچ پاڵنەرێکی ڕاستەقینە و دەروونی نییە، بەڵکوو گشتەکەی شەهوەتە و بەس.

دەگێڕنەوە کە هەندێ لە پیاوچاکان عیبادەت و تاعەتی خۆیان دەخستە دواوە بۆ ئەوەی بە شێوەی ڕاستەقینە نییەتی بۆ بهێنن، تەنانەت دەڵێن: ئیبنوو سیرین رَحِمَهُ اللَّهُ نەیتوانی نوێژ بەسەر تەرمی حەسەنی بەسرییەوە رَحِمَهُ اللَّهُ بخوێنێ، فەرمووی: لەبەر ئەوەی نییەتم بۆ نەدەهات.

هەروەها دەگێڕنەوە: کە حەمادی کوڕی سولەیمان رَحِمَهُ اللَّهُ ـ یەکێك لە زانا ناودارەکانی کووفە بوو ـ فەوتی کرد، گوتیان بە سەفیانی سەوری رَحِمَهُ اللَّهُ ئەرێ لەگەڵ تەرمەکەیدا ناچی بۆ سەر قەبران، فەرمووی: ئەگەر نییەتم بۆ بێت، دێم.

هەروەها دەگێڕنەوە: تاووسی کوڕی کیسان قسەی بێنییەتی نەدەکرد. داوایان لێ دەکرد قسە بکات، قسەی نەدەکرد و دەیفەرموو: بۆچی ئێوە حەز دەکەن من بێنییەت قسەتان بۆ بکەم، جا خۆ ئەگەر نییەتم بۆ پەیدا بوو، ئەوا قسەتان بۆ دەکەم.

جارێك پێیان گوت: دوعای خەیرمان بۆ بکە، فەرمووی: با نییەتم بۆ پەیدا بێ، بەسەر چاو.

## بەشی دووهەم: ئیخلاس

خودای مەزن فەرموویەتی: ﴿وَمَا أُمِرُوا إِلَّا لِيَعْبُدُوا اللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ﴾[1] واتە: «ئەمریان پێ نەکراوە، مەگەر بۆ ئەوەی عیبادەتی خودا بکەن و بەس شەریعەتی ئەویان لا پەسەند بێ و بە ئیخلاسەوە گەرەکیان بێ».

خودای مەزن فەرموویەتی: ﴿أَلَا لِلَّهِ الدِّينُ الْخَالِصُ﴾[2] واتە: «بزانن کە دینی پاراو تەنیا هی خودایە».

---

١. البيّنة: ٥. ٢. الزمر: ٣.

پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «يَقُولُ اللهُ تَعَالَىٰ: اَلْإِخْلَاصُ سِرٌّ مِنْ سِرِّي، اِسْتَوْدَعْتُهُ قَلْبَ مَنْ أَحْبَبْتُهُ مِنْ عِبَادِي»[1] واتە: «خودای مەزن دەفەرمێ: ئیخلاس و دڵپاکی، سیرڕێکە لە ئەسراری من، لە دڵ ئەو بەندەیەمدا کە خۆشم بوێ دایدەنێم».

دەڵێن لە نێو هۆزی بەنی‌ئیسرائیلدا پیاوێکی خواناس هەبووکە ڕۆژگارێکی درێژ بەندەگی و خواپەرستی دەکرد. هەندێك هاتن بۆلای و گوتیان: لەم دەڤەرەدا هۆزێك هەن کە لەباتیی خودای مەزن، دارێك دەپەرستن!

ئەویش تووڕە بوو و گورج هەستا و تەورەکەی هەڵگرت و نایە سەرشانی و ویستی بڕوات ئەو دارە ببڕێ.

لە ڕێگەدا شەیتانی لە ڕواڵەتی پیرێکدا لێی پەیدا بوو و گوتی: بۆ کوێ دەڕۆی؟

گوتی: دەڕۆم ئەو دارە کە پەرستشی دەکەن ببڕم.

شەیتان گوتی: ئەوە چییە؟ تۆ عیبادەت و تاعەتەکەتت وێڵ کردووە و دەست لە خۆت کێشاوە و دەتەوێ غەیری عیبادەت ئەنجام بدەی؟!

پیاوەکە گوتی: ئەمە لە عیبادەتی من دێتە ئەژمار و ئەمەش خۆی هەر خواپەرستییە.

شەیتان گوتی: دەستت لێ هەڵناگرم و ناهێڵم بیبڕی.

هەرکە ئەمەی گوت، پیاوە عابدەکەش دەستەوئێخەی بوو و کوتای بە عەرزا و لە سەر سینگی دانیشت.

شەیتانیش گوتی: بەرم بدە قسەم بۆت هەیە.

پیاوەکەش هەستا لەسەر سینگی.

پاشان شەیتان گوتی: بەخوا سەیری! خودا ئەم ئەرکەی نەخستۆتە سەرشانت و فەرزی نەکردۆتە سەرت. خۆ تۆش ئەم دارە ناپەرستی و کەسیش نەیناوەتە سەرت ئەم کارە بکەی.

خودایش پێغەمبەرانی ناردۆتە سەر ئەرز، ئەدی ئەگەر بیویستایە ئەم دارە لەبەین بەرێ بە ئەوانی ڕادەسپارد.

---

١. الهيثمی فی مجمع الزوائد: ١٢٦/١، مدارج السالكين لابن‌القيم الجوزی: ١١٣/٢، فتح الباری لابن‌حجر: ١٧٦١، عمدة القاری شرح صحيح البخاری لبدرالدين العينی: ٢٦٠/١٠، الجامع الأحكام للقرطبی فی آية ١٣٩ من سورة بقرة، تفسير القرآن العظيم للطبرانی فی آية ١٣٩ من سورة بقرة، و فی رواية: «اَلْإِخْلَاصُ سِرٌّ بَيْنَ الْعَبْدِ وَ بَيْنَ اللهِ لا يَعْلَمُهُ مَلَكٌ فَيَكْتُبُهُ، وَلا شَيْطَانٌ فَيُفْسِدُهُ وَلا هَوًى فَيَمِيلُهُ». الجامع الأحكام للقرطبی فی آية ١٣٩ من سورة بقرة، تفسير سراج المنير للخطيب الشّربينی فی سورة حجر الآية ٤٠.

پیاوە عابدەکەش گوتی: پێویستە لەسەرم ئەبێ بیبڕم. ئەمجار شەیتان ئێخەی گرت و هات لێی بدا، بەڵام عابدەکە خێرا کوتای بە عەرزدا و لەسەر سینگی دانیشتەوە. ئیدی ئەمجار شەیتان بێدەسەڵات بوو و زەلیل کەوت. بە پیاوەکەی گوت: جارێکتر دەرفەتم پێ دەدەی قسەیێکی‌ترم بۆت هەیە، کە بە قازانجی تۆیە.

عابدەکەش گوتی: چییە؟

گوتی: بەرم دە تا پێت بڵێم.

شەیتان گوتی: ئەتۆ پیاوێکی هەژار و دەست تەنگی و هیچت نییە. تۆ سەرباری خەڵکیت و خەڵك خەریکن ئەتژیێنن، چ دەبێ ئەگەر حەز کەی بێ‌نیاز بیت لە خەڵك و دەستیان بۆ درێژ نەکەیتەوە و تۆ یارمەتی هاوسێکانت بدەیت؟

گوتی: دە باشە.

شەیتان گوتی: ئەدی تۆ بگەڕێرەوە و دەست لەم کارەت هەڵگرە، شەرت بێ من هەرچی شەوە دوو دینار بهێنم و لە پەنای سەرینت دایبنێم، کە ڕۆژ بووەوە ئەم دوو دینارە هەڵگرە و بژیوی خۆت و خێزانتی پێ تەرخان بکە و بەشی دۆست و هاوەڵانتی لێ بدەو خێر و بەخششی خۆتی لێ بکە. ئەمە هەم بۆ خۆت، هەم بۆ موسڵمانەکان خێر و قازانجی زۆرترە، لەوەی کە بڕۆی ئەو دارە کە دانراوە بیبڕی. خۆ بڕینی ئەم دارە هیچ قازانجێکی بۆ دۆست و خزمانت نییە.

عابدەکەش تۆزێ ڕاما و لە دڵی خۆیەوە گوتی: ئەم پیاوە پیرە ڕاست دەکات، خۆ من پێغەمبەر نیم تا لەسەرم بێ ئەم دارە ببڕم و خۆ خوداش ئەمری پێ نەفەرمووم تا بیبڕم، ئەدی خۆ بە نەکردنی گوناحبار نابم. ئەوە وا ئەو پیرە دەیڵێ بە قازانجترە بۆم.

هەردووکیان پەیمانیان بۆ یەکتری بەست و بەڵێنیان بە یەك دا و پیاوە عابدەکەش خێرا گەڕایەوە بۆ پەرستشگاکەی.

بەیانی کە هەستا دیتی دوو دینار لە پەنای سەرینەکەیدا دانراوە، هەڵیگرت. ڕۆژی دووهەمیش هەر بەو شێوە دوو دینارەکە دانرا بوو. بەڵام ڕۆژی سێهەم هەرچی گەڕا دوو دینار نەبوو و تووڕە بوو و تەورەکەی نایەوە سەرشانی و چوو دارەکە ببڕێ. لە ڕێدا تووشی شەیتان هاتەوە کە لە ڕوخساری پیاوە پیرەکەدا خۆی پیشانی دا.

پێی گوت: بۆ کوێ دەڕۆی؟

گوتی: ئەچم دارەکە ببڕم.

شەیتان گوتی: درۆ دەکەی بەخودا، تۆ ناتوانی ئەم کارە بکەی و ڕێت پێ نادەم بچی.

پیاوە عابدەکەش پەلی کوتا شەیتان بگرێ و وەکوو ئەو جارەکانیتر لە عەرزی بدات.

شەیتان گوتی: هەیهوو! ئەیناتوانی!

ئەمجار شەیتان ئەوی گرت و توند لە عەرزی دا و وەکوو چۆلەکە ملۆمەی کرد و لەنێوان دوو ڕانی داینا و تەپی دایە سەرسینگی و گوتی: دەست لەم کارەت دەکێشی، یان بتکوژم.

پیاوە عابدەکەش دیتی هیچ دەسەڵاتێکی نییە و برستی لێ براوە، گوتی: فڵانە کەس بەرمدە و هەستە لە سەر سینگم. پێم بڵێ، خۆ من ئەوجارەکەیتر من تۆم دا بە عەرزدا، کەچی ئەمجارە تۆمنت بەزاند.

شەیتانیش گوتی: ئەوجار تۆ لەبەر خودا توورە بوویت و لەبەر پاشەڕۆژ ئەتویست ئەو کارە بکەیت، ئیدی خودا منی زەلیلی بەردەستی تۆ کردبوو. بەڵام ئەمجارە تۆ لەبەر خۆت و دنیا و پووڵ و پارەکە توورە بوویت، ئیدی خودات لە پشت نەبوو تا من بە عەرزدا بدەی.

ئەم چیرۆکە ڕاستی ئەم فەرموودەی خودای مەزنە دەسەلمێنێ: ﴿لَأُغْوِيَنَّهُمْ أَجْمَعِينَ إِلَّا عِبَادَكَ مِنْهُمُ الْمُخْلَصِينَ﴾[1] واتە: «(شەیتان بەڵێنی داوە) کە بێگومان هەموویان بەلاڕێدا ئەبەم، مەگەر ئەو بەندە موخلیس و پاکدڵانەیان نەبێ».

لەم سۆنگەوەیە کە شێخ مەعرووفی کەرخی رَحِمَهُ اللهُ بە نەفسی خۆی دەگوت: «ئیخلاست بێ، ڕزگار دەبی».

### حەقیقەتی ئیخلاس:

بزانە هەرچی شتە ڕێی تێ دەچێ کە غەیری خۆی تێکەڵ بێ، جا ئەگەر ئەو شتە لە غەیری خۆی خاوێن بکرێ و بشۆرێتەوە ئەوە پێی‌دەڵێن: خالس و خاوێن، بەو کردەوەش کە خاوێنکردنەکەی لێ دەکەوێتەوە ئەڵێن: ئیخلاس و خاوێنکاری.

---

١. الحجر: ٤٠.

خودای مەزن فەرموویەتی: ﴿مِنْ بَيْنِ فَرْثٍ وَ دَمٍ لَبَناً خَالِصاً سَائِغاً لِلشَّارِبِينَ﴾[1]. واتە: «لەنێوان سەنیر و خوێندا شیرێکی خاوێن کە بۆ ئەوانەی دەیخۆنەوە زەلاڵ و خۆش بێ دەردەچێ».

جا ئەگەر کردەوەش ڕووت و خاوێن بێ لە ڕیا و خۆنواندن و بەس بۆ خودا بێ ئەوە خالس و خاوێنە.

## بۆچوونی شێخەکان سەبارەت بە ئیخلاس:

"سووسی" فەرموویەتی: ئیخلاس بریتییە لەوە ئیخلاس لە کردەوەکانتدا نەبینی، چونکە هەرکەس وا بزانێ ئیخلاس لە کردەوەکانیدایە، هەر ئەوەش خۆی پێویستی بە ئیخلاس هەیە[2].

بە "سەهلی توستەری" رَحِمَهُ اللهُ گوتیان: سەختترین ئەرك بەسەر دەروونەوە چییە؟ فەرمووی: ئیخلاس، چونکە بەشی هیچ کەسێکی تێدا نییە[3].

هەورەها فەرمووی: ئیخلاس بریتییە لە جم و جووڵی بەندە بەس لەبەر ڕەزامەندیی خودای گەورە.

"جونەیدیش" رَحِمَهُ اللهُ فەرموویەتی: ئیخلاس، واتە: خاوێن کردنەوەی کردەوەکان لە لێڵایی[4].

"فوزەیلی کوڕی عەیاز" رَحِمَهُ اللهُ فەرموویەتی: نەکردنی کار لەبەر خەڵك ڕیایە، کردنی لەبەر خەڵك شیرکە و هاوبەش بۆ خودا دانانە. ئیخلاسیش ئەوەیە کە خودا لە هەردووی ئەوانە بپارێزی[5].

هەروەها سەبارەت بە ئیخلاس گوتوویانە: ئیخلاس، بەردەوام بوونە لەسەر موراقەبە و پارێزکاری دڵ، بە لە بیربردنەوەی حەزو ئاواتە دونیاییەکان ـ واللّٰه أعلم.

---

١. النحل: ٦٦.

٢. «مَنْ شَهِدَ فِي إِخْلَاصِهِ الْإِخْلَاصَ احْتَاجَ إِخْلَاصُهُ إِلَى الْإِخْلَاصِ» مدارج السالكين لابن‌القيم الجوزی: ١١٣/٢.

٣. «أَيُّ شَيْءٍ أَشَدُّ عَلَى النَّفْسِ؟ فَقَالَ: الْإِخْلَاصُ لِأَنَّهُ لَيْسَ لَهَا فِيهِ نَصِيبٌ» مدارج السالكين لابن‌القيم الجوزی: ١١٤/٢.

٤. قاله صاحب المنازل: «الْإِخْلَاصُ تَصْفِيَةُ الْعَمَلِ مِنْ كُلِّ شَوْبٍ» مدارج السالكين لابن‌القيم الجوزی: ١١٤/٢.

٥. «تَرْكُ الْعَمَلِ مِنْ أَجْلِ النَّاسِ رِيَاءٌ وَالْعَمَلُ مِنْ أَجْلِ النَّاسِ شِرْكٌ وَالْإِخْلَاصُ أَنْ يُعَافِيَكَ اللهُ تَعَالَى عَنْهُمَا» مدارج السالكين لابن‌القيم الجوزی: ١١٣/٢.

## بەشی سێهەم: ڕاستی و دروستی

خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿مِنَ الْمُؤْمِنِينَ رِجَالٌ صَدَقُوا مَا عَاهَدُوا اللَّهَ عَلَيْهِ﴾[1] واتە: «هەندێ ئیماندار هەن کە لەو پەیمانەی کە لەگەڵ خودا بەستوویانە، ڕاست دەکەن».

پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «إِنَّ الصِّدْقَ يَهْدِي إِلَى الْبِرِّ، وَ الْبِرُّ يَهْدِي إِلَى الْجَنَّةِ وَ إِنَّ الرَّجُلَ لَيَصْدُقُ حَتَّىٰ يُكْتَبَ عِنْدَ اللهِ صِدِّيقاً، وَ إِنَّ الْكِذْبَ يَهْدِي إِلَى الْفُجُورِ، وَ الْفُجُورُ يَهْدِي إِلَى النَّارِ، وَ إِنَّ الرَّجُلَ لَيَكْذِبُ حَتَّىٰ يُكْتَبَ عِنْدَ اللهِ كَذَّاباً»[2].

واتە: «ڕاستی، بەرەوچاکی ڕێنوێنی دەکات، چاکەش بەرەو بەهەشت ڕێنوێنی دەکات، ئادەمیزاد ئەوەندە ڕاست دەکات تا لە لای خوداوە بە ڕاستوێژ ناوی دەنووسرێ. هەروەها درۆ بەرەو خراپەکاری ئەکێشێ و خراپەکاریش بەرەو ئاوری دەبات، ئادەمیزادیش هێندە درۆ دەکات تا لە لای خوداوە بە درۆزن ناوی دەنووسرێ».

هەروەها خودای مەزن لە مەقامی پەسن و تاریفی ئیبراهیمداعليه السلام ئەفەرمێ: ﴿وَاذْكُرْ فِي الْكِتَابِ إِبْرَاهِيمَ إِنَّهُ كَانَ صِدِّيقاً نَبِيّاً﴾[3] واتە: «لە قورئاندا باسی ئیبراهیم بکە، بەڕاستی ئیبراهیم پێغەمبەرێکی ڕاستوێژ بوو».

## ڕوونکردنەوەی مانای ڕاستی

بزانە وشەی ڕاستی (صدق) بۆ شەش مانا بەکار هاتووە: ڕاستی لە وتەدا، ڕاستی لە کردەوەدا، ڕاستی لە ویست و نییەتدا، ڕاستی لە وەفا و ئەمەگدا، ڕاستی لە شوێنکەوتنی مەقامەکانی دیندا، ڕاستی لە ئەندێشەدا.

جا هەرکەس لە هەر هەمووی ئەمانەدا ڕاست بێ، ئەوە پێ ئەڵێن: «صدّيق» واتە: هەرە ڕاست. هەروەها چەندە بتوانێ لەم بابەتانەدا ڕاست بێ هەر بەو ئەندازەش پێ ئەڵێن: سادیق و ڕاستوێژە.

والله أعلم

---

١. الأحزاب: ٢٣.

٢. بخاری: ٥٦٢٩، مسلم: ٤٧١٩ ـ ٤٧٢١، ابوداود: ٤٣٣٧، ترمذی: ١٨٩٤، ابن‌ماجه: ٤٥، احمد: ٣٦٥٢ ـ ٣٤٥٦.

٣. مریم: ٤١.

# بابەتی سی و هەشتەم:
# وریابوونەوە و حیساب و کیتاب‌کردنی پێش ڕۆژی جەزا

بزانە ئیمان بە حیساب و لێپرسینەوەی ڕۆژی قیامەت دەبێتە هۆی ئەوەی مرۆڤی موسڵمان پێش‌هاتنی خۆی بۆ ئامادە بکات و هەر خۆی لێپرسینەوەی خۆی بکات.

پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «حاسِبُوا أَنْفُسَكُمْ قَبْلَ أَنْ تُحاسَبُوا»[1] واتە: «حیسابی خۆتان بکەن پێش ئەوەی حیسابتان لەگەڵ بکرێ».

خودای گەورەش فەرموویەتی: ﴿وَ نَضَعُ الْمَوازِينَ الْقِسْطَ لِيَوْمِ الْقِيامَةِ فَلا تُظْلَمُ نَفْسٌ شَيْئاً وَ إِنْ كانَ مِثْقالَ حَبَّةٍ مِنْ خَرْدَلٍ أَتَيْنا بِها وَ كَفَىٰ بِنا حاسِبِينَ﴾[2].

واتە: «لە پاشەڕۆژدا تەرازووی داد دادەنێین، ئیدی هیچ‌کەسێ حەقی ناخورێ، هەرچەندەش ئەو حەقەی بە قەدەر پەڕە کایێ (دانەی خەردەل) بێ دەیخەینە ڕوو، هەر ئەوەش بەسە کە ئێمە پێ ڕادەگەین».

خودای گەورە دیسان ئەفەرمێ: ﴿وَ وُضِعَ الْكِتابُ فَتَرَى الْمُجرِمِينَ مُشْفِقِينَ مِمّا فِيهِ وَ يَقُولُونَ يا وَيْلَتَنا ما لِهٰذَا الْكِتابِ لا يُغادِرُ صَغِيرَةً وَلا كَبِيرَةً إِلّا أَحْصاها وَ وَجَدُوا ما عَمِلُوا حاضِراً وَلا يَظْلِمُ رَبُّكَ أَحَداً﴾[3].

واتە: «دەفتەرەکە دادەنرێ، دەبینی تاوانبارەکان ـ لەبەرئەوەی لەو دەفتەرەدایە ـ ترسیان لێ نیشتووە و ئەڵێن: هاوار بۆ ئێمە، ئەمە چ جۆر دەفتەرێکە کە هیچێك، نە چووك، نە گەورەی

---

١. ترمذی: ٢٣٨٣، احمد بن‌حنبل فی الزّهد: ٦٣٩، ابن‌المبارك فی الزّهد والرّقائق: ٣٠٧، ابن‌ابی‌شیبه فی مصنّفه: ١٤٩/٨ عن عمر بن‌الخطّاب، المجالسة و جواهر العلم لأبی‌بکر الدّینوری المالکی: ١٢٩٠ عن أبی‌بکر الصّدّیق.
٢. الأنبیاء: ٤٧.
٣. الکهف: ٤٩.

لێ دانەکەوتووە، مەگەر ئەوەی ئەژماردوویە، ئەوسا هەرچیان کردووە تێیدا دەیبیننەوە، پەروەردگارت زوڵم لەکەس ناکات».

هەروەها خودای مەزن دەفەرمێ: ﴿وَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ يَعْلَمُ مَا فِي أَنْفُسِكُمْ فَاحْذَرُوهُ﴾[1]. واتە: «بزانن کە بێ‌گومان خوداوەند هەرچی لە دڵی ئێوەدایە دەزانێ، کە واتە لێی بترسن».

جا ئێستا بزانە هەرکەس لەسەر مەترسییەکان و لەسەر ئەو شتانەی کە ترسی لێپرسینەوەیانی هەیە یەخەی خۆی بگرێ و حیسابی خۆی بکات، لە ڕۆژی قیامەتدا خەفەت و ترسی کەم دەبێتەوە. بەڵام هەرکەسێ حیساب و لێپرسینەوەی خۆی نەکات، ترسی لەو ڕۆژەدا پەرەی لێ‌دەستێنێ و وێستگە و بەرکوتەکانی لەو ڕۆژەدا زۆر دەبێتەوە.

خودای مەزن فەرموویەتی: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اصْبِرُوا وَ صَابِرُوا وَ رَابِطُوا وَاتَّقُوا اللَّهَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ﴾[2]. واتە: «هۆ ئەوانەی کە ئیمانتان هێناوە، خۆڕاگر بن (لەسەر تاعەت و عیبادەت)، لە بەرانبەر دوژمنانەوە ڕاوەستاو بن و سنوورەکان ببەستن و لە خواش بترسن، هیوایە ڕزگار بن».

ئەکرێ مەبەست لە وشەی «رابطوا» لەم ئایەتەدا ئەوە بێ کە: نەفسی خۆتان ببەستنەوە بە «مشارطه، مراقبه، محاسبة، معاقبة» کە سەرجەم دەبێتە شەش قۆناغ، کە لێرەدا شی دەکەینەوە.

## شەش قۆناغی جووڵانەوە لەگەڵ نەفسدا:

**قۆناغی یەکەم: «مشارطه» واتە: مەرج پێکەوە بەستن.**

بزانە عەقڵ وەکوو بازرگانێ وایە بۆ ڕێگەی دوارۆژ، نەفسیش شەریك و هاوبەشی نەفسە لەم مامەڵەیەدا و بۆ گەیشتن بەو ئامانجەی ئەبێ هاوبەشی بکات. ئەم هاوبەشەش (نەفس) ناتوانێ ئەمانەتەکەی بەجێ بێنێ مەگەر لەبەر ڕوودەرباسی و حەیا و ڕیا. کە وابوو پێویستە عەقڵ سەرەتا مەرجی بۆ دابنێ و پاشان چاودێری بکات و سەرکۆنە و لۆمەشی بکات، ئەرك بخاتە سەرشانی و مەرجی بۆ دابنێ و ڕێنوێنی بکات کە چلۆن بە ڕێی ڕزگاری بگات و لەم کارانەش لێبراو بێ و ڕوودەرباسی لێ نەکات.

---

١. البقرة: ٢٣.
٢. آل‌عمران: ٢٠٠.

**قۆناغی دووەهەم: «مراقبة» واتە: چاودێری‌کردن.**

وەك گوتمان: ئەگەر نەفس هاوبەشێکی خەیانەتکار بێ، نابێ یەك ساتیش چاوی لێ دابخرێ، مەبادا خەیانەت بکات و سەرمایەکە لەکیس بدات، ئەمەش سەرەڕای ئەوەی ناتوانێ خێر وەدەست بێنێ. کەوابوو پێویستە بەردەوام هەرچی جووڵەو وەستانیەتی لە بەرچاوی بێت.

پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «اُعْبُدِ اللّٰهَ تَعٰالَىٰ كَأَنَّكَ تَرٰاهُ، فَإِنْ لَمْ تَكُنْ تَرٰاهُ فَإِنَّهُ يَرٰاكَ»[1] واتە: «وەها عیبادەت بکە بۆ خودا کە وابزانی ئەیبینی، ئەگەریش تۆ ئەو نابینی، ئەو بێ‌شك تۆ دەبینێ».

خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿إِنَّ اللّٰهَ كٰانَ عَلَيْكُمْ رَقِيباً﴾[2]. واتە: «خودا چاودێری ئێوەیە».

مورتەعیش فەرموویەتی: موراقەبە بریتییە لە هۆشیاری دەروون و سیرڕ، بە ڕەچاوکردنی غەیب، لە هەرچی ساتدا و بۆ هەرچی وتەیە.

**قۆناغی سێهەم: «محاسبه» واتە: لێپرسنەوەی نەفس پاش هەرچی کردەوەیە.**

خودای مەزن فەرموویەتی: ﴿وَلْتَنْظُرْ نَفْسٌ مٰا قَدَّمَتْ لِغَدٍ﴾[3] واتە: «با هەرچی کەسە هوشیاری ئەو شتانە بێ کە بۆ سبەی پێشی خستووە».

لە حەدیسدا هاتووە: کە مرۆڤی عاقڵ، پێویستە چوار ساعەتی هەبێ، لە یەکێکیاندا حیساب و لێپرسینەوەی نەفسی بکات[4].

لە حەزرەتی عومەرؓ دەگێڕنەوە: کە هەرچی شەوە لە خۆی دەپرسییەوە و بە شووڵەکەی دەیدا لەسەر پێیەکانی و بە خۆی دەگوت: ئەمڕۆ چیت کردووە؟

بەم کورتە باسەدا ئەبێ بزانی کە پێویستە هەرچی ئێوارەیە لە خۆت بپرسیتەوە کە ئەو ڕۆژە چیت کردووە.

---

١. بخاری: ٤٨ ـ ٤٤٠٤، مسلم: ٩ ـ ١٠ ـ ١١، ترمذی: ٢٥٣٥، ابوداود: ٤٠٧٥، نسائی: ٤٩٠٤ ـ ٤٩٠٥، ابن‌ماجه: ٦٢ ـ ٦٣، احمد: ١٧٩ ـ ٣٥٢ ـ ٩١٣٧ ـ ١٦٨٥١.

٢. النساء: ١.　　٣. الحشر: ١٨.

٤. «حَقٌّ عَلَى الْعٰاقِلِ أَنْ لا يَغْفُلَ عَنْ أَرْبَعِ سٰاعٰاتٍ... وَ سٰاعَةً يُحٰاسَبُ فِيهٰا نَفْسَهُ...» ابونعیم اصبهانی فی أخبار اصبهان: ١٩٨، هناد بن‌السری فی الزّهد: ١٢١٩، ابن‌المبارك فی الزّهد والرّقائق: ٣١٤، خطیب البغدادی فی الفقیه والمتفقّه: ٨٧٧.

**قۆناغی چوارەم: «معاقبة» واتە: سزادانی نەفس لەسەر کردەوەکانی.**

ئەم سزادانە لە کاتێکدایە کە لە نەفسەوە کەمتەرخەمی سەر بدات سەبارەت بە تاعەت و عیبادەت یان تووشی تاوان و گوناحێ ببێ، پاش ئەوەی لێی بپرسیتەوە و حیسابی لەگەڵدا بکەیت. نابێ هەروا وێڵ بکرێ، چونکە ئەگەر بەری بۆ شل بکرێ، فێر ئەبێ و زۆر بە هاسانی تووشی ئەو تاوانانە ئەبێتەوە. بۆ وێنە ئەگەر پارووە نانێکی شوبهەداری بەبێ‌پرسینەوە خوارد، ئەبێ سزای بە برسی ڕاگرتنی بدرێ. یان بۆ وێنە ئەگەر سەیری نامەحرەمێکی کرد ئەوە با بە بەرگرتنی لە سەیرکردن و بە بێ‌خەوی‌کێشان سزای چاوەکانی بدات، بەم شێوە هەر ئەندامێکی کە تووشی گوناح بوو، بە مەنع‌کردنی لە لەززەت و چێژی تایبەتی خۆی سزای بدات. چونکە ڕێبوارانی ڕێی حەقێقەت ئاوەهایان کردووە.

**قۆناغی پێنجەم: «مجاهدة» واتە: توندکردنەوەی سزاکان و ئەرکی زۆر خستنە سەرشانی نەفس.**

ئەم قۆناغە وەختێکە کە خەیانەت و تاوانی نەفس دەرکەوتبێت و پاشان سزای بدات، بەڵام نەفس نەیبات بە ڕێوە و بەگوێی نەکات، ئەو دەم ئەرکی زۆرتر بخاتە سەرشانی و باری زۆرتری لێ بنێ، بۆ وێنە ئەگەر لە خوێندنی نوێژ بە جەماعەت یان سوننەت خوێندندا سستی و کەمتەرخەمی بکات، ئەوە با مەجبووری بکات شەو تا بەیان بێدار بێت و عیبادەت بکات. ئەگەر سەرەڕەوی کرد و ملی پێ نەدا ئەوە با بەپێی ئەو ئایەت و حەدیسانە کە لەمبارەوە هاتوون لەگەڵیدا بجووڵێتەوە.

**قۆناغی شەشەم: «معاتبة» واتە: سەرزەنش و لۆمەی بەردەوامی نەفس.**

بزانە وەك پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: **«أَعْدَىٰ عَدُوِّكَ نَفْسُكَ الَّتِي بَيْنَ جَنْبَيْكَ»**[1] واتە: «پیسترین دوژمن و ناحەزت نەفستە کە لە نێوان دوو پاڵووتدایە».

نەفس سەرەتا بە «ئەممارە» و فەرماندەری کاری خراپە خولقێنراوە و حەز بە شەڕو تاوان دەکات و لە خێر و تاعەت ڕا دەکات. تۆش بەرپرسی بەری بکوتیتەوە و لەگەڵیدا تێ بکۆشی و ئەرکی قورسی عیبادەت و تاعەتی بەسەرشاندا بدەی و بە زۆر بهێنیتە ژێر ڕکێفی عیبادەتی خودا و تەزکیە و خاوێنی بکەیت و لە گوناح بیپارێزیت. جا ئەگەر سەرکەشی کرد و ملی

---

١. بیهقی فی الزّهد الکبیر: ٣٥٥، جامع الکبیر للسیوطی: ١١٩٠ ـ ١١٩٢، حرف اللام.

نەدات و بەسەر تۆدا زاڵ بوو، هۆشیار بیت بە گوێ نەکەیت. بەڵام ئەگەر تۆ لەسەر سەرکۆنە و لۆمە و سزای بەردەوام ببیت، زۆر جار ڕام دەبێ و دان بە تاوانەکانیدا دەنێ و بەرەبەرە، بەرەو چاکە پێش دەکەوێ تا جێگەیێ خۆی ئەبێتە «لەووامە» و سەرکۆنەکەری خۆی و وردە وردە بەرەو پێش دەڕوات تا بە پلەی «موتمەئیننە» دەگات و دەچێتە ڕیزی بەندەکانی «راضيّةً مرضيةً» واتە: ئەو بەندانە کە خودا لەوان ڕازییە و ئەوانیش لەخودا ڕازین.

کەوابوو نابێ تەنانەت سەعاتێکیش چاو لە نەفس دابخەیت و خۆت بە ئامۆژگاری خەڵکەوە خەریك بکەی، مادامێ نەفست بەو پلە نەگەیشتبێ کە پێویستی بە ئامۆژگاری تۆ نەبێ.

خودای گەورە فەرمووی بە حەزرەتی عیساعَلَيْهِٱلسَّلَامُ: ئەی کوڕی مەریەم! ئامۆژگاری خۆت بکە، جا ئەگەر خۆتت بۆ چارەسەر بوو ئەوسا ئامۆژگاری خەڵك بکە، وە گەرنە ئەبێ حەیا بکەی لەمن لەوەدا کە ئامۆژگاری خەڵك دەکەی.

خودای مەزن فەرموویەتی: ﴿وَ ذَكِّرْ فَإِنَّ الذِّكْرَىٰ تَنفَعُ الْمُؤْمِنِينَ﴾[1]. واتە: «وە بیر خەڵك بخەرەوە، چونکە بەڕاستی بیرخستنەوە خێری هەیە بۆ ئیمانداران».

تۆش لەسەرتە بەردەوام ڕوو بکەیتە نەفست و نەزانکاری و نەفامی و فریوخواردنەکانی دایمە لەسەری دووپات بکەیتەوە و پێی بڵێی: ئەوە شەرم ناکەی تۆ بە خەڵك ئەڵێیت نەزان و نەفام، کەچی خۆت لە هەموو کەس نەفامتری. ئەتۆ مەگەر ئەتەوێ بچی بۆ بەهەشت یان بۆ جەهەننەم وا خۆت بە گەمە و گاڵتەوە سەرقاڵ کردووە؟!.

ئەتۆ بارێ قورست لەسەر شانە، لەوانەیە تۆ مەرگ بە دوور بزانی، کەچی ئەو هەر بەم زوانە بەردەرکەت پێ دەگرێ، یان هەر ئەمڕۆ، یان ئەمشەو یان سبەینێ، چونکە هەرچی کە بڕیار بێ بێت ئەوە نزیکە، مەگەر نازانی کە مەرگ لە پڕ دێ بەبێ ئەوەی نوێنەرێ بنێرێ.

دەگێڕنەوە کە مەنسووری کوڕی عەممار فەرموویەتی: شەوێك لە کووفەدا لە خواناسێکم بیست، کە خەریکی نزا و پاڕانەوە لەگەڵ خوادا بوو، دەیگوت: «خودایە! سوێند بە گەورەیی تۆ، من گەرەکم نەبووە بە گوناحکردن، بێ‌گوێی تۆ بکەم و هەرکاتێ تووشی تاوانێ بووم، نافەرمانی تۆم نەکردووە، ئەمن شوێن و پێگە و جێگەی تۆم دەرك نەکردووە و پەیم بە سزای تۆ

---

١. الذاريات: ٥٥.

نەبردووە، نەمویستووە سووکایەتی بە ڕا و بۆچوونی تۆ بکەم، بەڵام چ بکەم، نەفسم هەڵیناوم و حەزیشم یارمەتی داوە و نادیاربوونی تۆش هەڵیفریواندووم، بەم بۆنەوە، لەبەر نەزانی خۆم تووشی گوناح بووم و بە کردەوەم سەرپێچیم لە فەرمانەکانی تۆ کردووە. ئێستا کێ لە دەستی ئەشکەنجە و عەزابی تۆ ڕزگارم بکات، یان بە تەنافی کێوە دەست بگرم، ئەگەر تۆ تەنافەکەت لێم بپچڕێنی؟

هاوار بۆ ئەو کاتەی کە لەبەر دەستی تۆدا ڕابوەستین، بڵێن: ئەوانەی کە بێ‌گوناحن وەرن و ئەوانەی کە تاوانبارن داکەونەخوار. ئاخۆ من لەوانەم کە دەپەڕمەوە، یان لەوانەم کە دەکەومە خوار.

هاوارە! هەرچی تەمەنم دەڕواتە سەر گوناحم زۆر دەبێ.

هاوارە! هەرچی عومرم درێژ دەبێ تاوانم پتر دەبێ.

کەی تەوبە بکەم و کەی وەرگەڕێمەوە؟

ئاخۆ وەختی نەگەیشتووە کە حەیا لە پەروەردگارم بکەم».

بەم شێوە کە باسمان کرد، دوو ڕێ هەیە بۆ ڕزگاری لە دەست نەفسەوە، ڕێگەیێك لە لۆمە و سەرکۆنەی نەفسدایە و ڕێگەیەتر لە پاڕانەوە و نزا لەگەڵ پەروەردگاری گەورەو مەزندایە و بە پاڕانەوە و داوای یارمەتی لە خودای مەزن و پشت‌گوێ خستنی هێز و دەسەڵاتی خۆت و خۆ بە کەم‌زانین و مل‌کەچی بۆ خودا، هومێد هەیە کە بێتە هاناتەوە و لە شەڕی نەفس بتپارێزێ.

والله أعلم

# بابەتی سی و نۆهەم: ڕامان و تێفکرین

لە حەدیسدا هاتووە: «تَفَكُّرُ سَاعَةٍ خَيْرٌ مِنْ عِبَادَةِ سَنَةٍ»[1] واتە: «سەعاتێك فكركردنەوە خێرۆمەندترە لە عیبادەتی ساڵێك».

سەبارەت بە هەڵنان و قازانجی تێفکرین و ڕامان و ئەندێشە و لێکدانەوەی ئایات و حەدیسی زۆر هاتووە، چونکە ئەندێشە کلیلی دەروازەی نوورە و سەرچاوەی یارمەتیخواستنە و ڕۆچنەی زانستە.

سەبارەت بە خێر و چاکەی ئەندێشە خودای گەورە لە تاریف و هەڵگوتندا فەرموویەتی: «وَ يَتَفَكَّرُونَ فِي خَلْقِ السَّمٰوٰاتِ وَ الْأَرْضِ»[2]. واتە: «ئەوانە بیر لە دروستکردنی ئاسمانەکان و زەمین دەکەنەوە».

ئیبنوو عەبباس رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا بە کۆمەڵێ کە خەریك بوون بیریان لە خودا دەکردەوە، فەرمووی: بیر لە خودا مەکەنەوە، چونکە پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فەرموویەتی:

«تَفَكَّرُوا فِي خَلْقِ اللهِ، وَلا تَتَفَكَّرُوا فِي اللهِ فَإِنَّكُمْ لَنْ تَقْدِرُوا قَدْرَهُ»[3] واتە: «لەبارەی خەلقی خوداوە بیر بکەنەوە، بەڵام بیر لە خودا مەکەنەوە، چونکە بێگومان ئێوە هیچکات پەی بە زاتی ئەو نابەن».

---

١. الفتح الکبیر للسیوطی: ٨١٨٧، حرف الفاء و فی الجامع الکبیر للسیوطی: ٩٣ و العظمَة لأبی‌الشّیخ الأصبهانی: ٤٢ بلفظ: «فِكْرَةُ سَاعَةٍ خَيْرٌ مِنْ عِبَادَةِ سِتِّينَ سَنَةً». و فی روایة: «لَمَجْلِسُ سَاعَةٍ فِي تَفَقُّهٍ خَيْرٌ مِنْ عِبَادَةِ سَنَةٍ» الخطیب البغدادی فی الفقیه و المتفقّه: ٤٩.

٢. آل‌عمران: ١٩١.

٣. جامع الکبیر للسیوطی: ٣٥٥، حرف التّاء، هنّاد بن‌السری فی الزّهد: ٩٤٠، العظمة لأبی‌الشّیخ الأصبهانی: ٣. و فی روایة: «فَكِّرُوا فِي كُلِّ شَيْءٍ وَلا تَفَكَّرُوا فِي اللهِ فَإِنَّ بَيْنَ السَّمَاءِ السَّابِعَةِ إِلَىٰ كُرْسِيِّهِ أَلْفَ نُورٍ وَ هُوَ فَوْقَ ذٰلِكَ» ابوالشّیخ الأصبهانی فی العظَمة: ٢١، ابن‌ابی‌شیبه فی العرش و ما روی فیه: ١٦. و فی روایة: «تَفَكَّرُوا فِي آلاءِ اللهِ وَلا تَتَفَكَّرُوا فِي اللهِ» طبرانی فی الکبیر: ٦٨٣.

لە پێغەمبەرەوەﷺ دەگێڕنەوە کە ڕۆژێك تەشریف دەباتە سەر کۆمەڵێ کە خەریکن سەبارەت بە خودا بیر دەکەنەوە، فەرمووی پێیان: چیتانە وا دەم ناکەنەوە؟!

گوتیان: خەریکین بیر لە مەخلوقاتی خودای مەزن دەکەینەوە. پێغەمبەرﷺ فەرمووی: «فَكَذٰلِكَ فَافْعَلُوا، تَفَكَّرُوا فِي خَلْقِهِ وَلا تَتَفَكَّرُوا فِيهِ، فَإِنَّ بِهٰذَا الْمَغْرِبِ أَرْضًا بَيْضَاءَ نُورُهَا بَيَاضُهَا أَوْ بَيَاضُهَا نُورُهَا مَسِيرَةَ الشَّمْسِ أَرْبَعِينَ يَوْماً، بِهَا خَلْقٌ مِنْ خَلْقِ اللهِ تَعَالَىٰ لَمْ يَعْصُوا اللهَ طَرْفَةَ عَيْنٍ، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ فَأَيْنَ الشَّيْطَانُ عَنْهُمْ قَالَ: مَا يَدْرُونَ خُلِقَ الشَّيْطَانُ أَمْ لا، قَالُوا: مِنْ وُلْدِ آدَمَ هُمْ؟ قَالَ: لا يَدْرُونَ خُلِقَ آدَمُ أَمْ لا»[1].

واتە: «هەروا بەردەوام بن، لە مەخلوقاتی خودادا ڕابمێنن و بیر لە خودا مەکەنەوە، بەڕاستی لەم خۆراوادا ئەرزێکی سپی هەیە کە ڕووناکییەکەی لە سپی بوونەکەیەوەیەتی، یان سپی بوونەکەی لە ڕووناکییەکەیەوەتی، بە پێی چوونی خۆر چل ڕۆژ لێرەوە ڕێگەیە، خەڵکێکی خودای گەورەی تێدایە کە بە قەدەر چاوترووکانێ بێ‌ئەمری خودایان نەکردووە، گوتیان: ئەی نوێنەری خودا! ئەدی شەیتان لەگەڵیاندا چی دەکات؟ فەرمووی: ئەوان هەر نازانن کە شەیتان خەلق کراوە یان نا!، گوتیان: ئەدی ئەوان لە ئەولادەی ئادەمن؟! فەرمووی: ئەوان هەر نازانن ئادەم دروست کراوە یان نە!»

لە "عەتاوە" دەگێڕنەوە کە فەرموویەتی: ڕۆژێك من و عوبەیدی کوڕی عومەیر چووین بۆلای حەزرەتی عائیشەرضي الله عنها لەنێوانماندا پەردەیێك هەبوو، فەرمووی: ئەی عوبەید! لەبەر چی سەردانمان ناکەی؟

ئەویش گوتی: لەبەر ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەرﷺ: «زُرْ غِبًّا تَزْدَدْ حُبًّا»[2] واتە: «کەم سەردان بکە با خۆشەویستیت پتر بێ».

ئیبنووعومەیریش گوتی: داوات لێ دەکەین سەبارەت بە سەیرترین شتێك کە لە پێغەمبەرﷺ دیوتە، قسەمان بۆ بکە.

---

١. ابن‌كثير فی تفسيره فی سورة طلاق آية ١٢.

٢. طبرانی فی الكبير: ٣٤٥٥ ـ ٤٣٩ ـ ٨٤٠، بزّار فی مسنده: ٣٩٦٣، الشّهاب القضاعی فی مسنده: ٥٩٣، بيهقی فی شعب الإيمان: ٨٠٠٧ ـ ٨٠٠٨ ـ ٨٠١٥، ابونعيم فی معرفة الصّحابة: ١٩٨٨، ابوحنيفه فی مسنده: ١٨٣ ـ ١٨٤، الحارث فی مسنده: ٩٠٩، هيثمی فی كشف الأستار: ١٩٢٢ ـ ٢١٠٧.

حەزرەتی عائیشە خێرا دەستی کرد بە گریان و گوتی: ئەو هەموو کارێکی جێی سەرنج بوو. شەوێك هات بۆ لام و هێندە نزیك بووە لێم کە پێستی خواردی بە پێستم، فەرمووی: «ذَرِينِي أُصَلِّي لِرَبِّي» واتە: «لێم گەڕێ نوێژ بۆ پەروەردگارم بخوێنم». پاشان هەستایە سەرپێ و چوو بۆ لای کونەئاوەکە و دەستنوێژی لێ شۆرد و ئەنجا دەستی کرد بە نوێژ و زۆرێ گریا تا ئاستێ ڕیشی تەڕ بوو، پاشان چوو بە سوجدەدا تا زەمینەکەش خووسا، پاشان بە شانا پاڵ کەوت، تا بیلال هات و بانگی نوێژی سبەینێی دا و گوتی: بۆچی دەگری ئەی پێغەمبەری خودا؟ مەگەر خوداوەند لە هەرچی گوناحتە خۆش نەبووە.

پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: «وَيْحَكَ يَا بِلَالُ وَمَا يَمْنَعُنِي أَنْ أَبْكِيَ وَ قَدْ أَنْزَلَ اللهُ تَعَالَىٰ عَلَيَّ فِي هٰذِهِ اللَّيْلَةِ: ﴿إِنَّ فِي خَلْقِ السَّمٰوَاتِ وَ الْأَرْضِ وَ اخْتِلَافِ اللَّيْلِ وَ النَّهَارِ لَآيَاتٍ لِأُولِي الْأَلْبَابِ» ثُمَّ قَالَ: «وَيْلٌ لِمَنْ قَرَأَهَا وَ لَمْ يَتَفَكَّرْ فِيهَا»[1].

واتە: «هاوارە ئەی بیلال! چی بەرم بگرێ لە پرمەی گریان، لە کاتێکدا کە خودای مەزن لەم شەوەدا ئەم ئایەتەی ناردۆتە سەرم «بێ‌شك لە خولقاندنی ئاسمانەکان و زەمیندا و لە گۆڕانکاری شەو و ڕۆژدا نیشانەهایێك هەیە بۆ خاوەن بیران» پاشان فەرمووی: «هاوار بۆ کەسێ بیخوێنێتەوە و تێنەفکرێ»».

بە "ئەوزاعیان" رَحِمَهُ اللهُ گوت: ئامانجی تێفکرین لە چی‌دایە؟ فەرمووی: لە خوێندنەوە و تێگەیشتندایە[2].

"جونەید" رَحِمَهُ اللهُ فەرموویەتی: خێرۆمەندترین و مەزنترین کۆڕ، کۆڕێکە کە لەگەڵ تێفکرین و ئەندێشەدا بێ لە گۆڕەپانی تەوحید و هەڵمژینی بۆنی شەماڵی مەعریفەتی خودا و نۆشینەوەی پیاڵەی خۆشەویستی لە بەحری میهرەبانی و سۆزی خودا و بە گومانی چاکەوە سەیری خودا کردن. پاشان فەرمووی: ماشەڵڵاھ لەم کۆڕانە، چەندە گەورەن! ماشەڵڵاھ لەو شەرابانە چەندە بە تام و لەززەتن! خۆشا بە حاڵ ئەو کەسانە کە ئەم جۆرە کۆڕانە بێ بە نەسیبیان[3].

---

١. ابن‌حبان فی صحیحه: ٦٢٢، موارد الظّمآن للهیثمی: ١٣٩/١، أخلاق النّبیّ لأبی‌الشّیخ الأصبهانی: ٥٣٣.

٢. «مَا غَايَةُ التَّفَكُّرِ فِيهِنَّ؟ قَالَ: يَقْرَؤُهُنَّ وَ هُوَ يَعْقِلُهُنَّ» ابن‌کثیر فی تفسیره فی آیة ١٩٠ من سورة آل‌عمران، فتح القدیر للشّوکانی فی تفسیر آیة ١٩٠ من سورة آل‌عمران، تفسیر سراج المنیر للشربینی فی تفسیر آیة ١٦٤ من سورة البقرة.

٣. بیهقی فی شعب الإیمان: ٤٣٧ عن یحی بن معاذ الرّازی بروایة أخری.

## ڕوونکردنەوەیێك لەسەر حەقیقەتی ئەندێشە و قازانجی تێفکرین

بزانە واتای بیر و فیکر بریتییە لەوەی دوو شتی ناسراو و دیار لە دڵدا بدرێنە پاڵ یەك تا شتێ سێهەمی لێ بکەوێتەوە، بۆ وێنە بزانێ کە دوارۆژ چاکترە و هەر دەمێنێتەوە و هەرشتێکیش چاکتر بێ و بمێنێتەوە، ئەوە بۆ هەڵبژاردن و شوێنکەوتن شیاوترە.

ئامانجیش لە بیرکردنەوە و ئەندێشە ئەوەیە ئەو شناخت و زانستە دەروونییە لە دڵدا بە دەست بهێنێ و ببێتە هۆی زینەت و جەماڵ و کردەوەیێ کە ئەو کەسە ڕزگار بکات، ئەم دوو شناختەش کە لە سەرەوە وتمان بەری درەختی هزر و بیرن.

## ڕوونکردنەوەی شوێنی هاتنەڕووی ئەندێشە

بزانە هەر بەندەیێ کەڕەتێ سەیری خۆی دەکات و تێدەفکرێ ـ هەروەك گوتمان ـ یان کەڕەتێ سەیری خودا و سیفات و کردەوەکانی خودا دەکات و ڕادەمێنێ. ئەبێ ئەوە بزانین کە بیرکردنەوە لەزاتی خودای گەورە، بە هیچ لەونێ دروست نییە، مەگین بەزیکر و یادکردنی، دەنا بە تێفکرین ڕەوا نییە. چونکە ئەبێتە هۆی سەرگەردانی و سەرلێشێوان بەڵام بیرکردنەوە و ڕامان و تێفکرین سەبارەت بە سیفات و مڵك و مەلەکووت و سەرجەمی بوونەوەران، سەرەڕای ئەوەی دروستە، بە هەر ئەندازە کە زیاتر ورد بێتەوە و سەرنجی زۆرتر بدات، بەو ئەندازەش خۆشەویستی خودا لە دڵیدا زۆرتر ئەبێ. بۆیە زۆر داکۆکی لەسەر بیرکردنەوە و ئەندێشە لەسەر مەخلوقاتی خودا دەکەین، چونکە بەوانەدا خودا دەردەکەوێ، هەروەك چۆن بە لێکۆڵینەوە و لێکدانەوەی ناوەکان و سیفەتەکانی خوادەوند و بە وردبوونەوە لە ئاسمانەکان و زەمین و ئەستێرەکان و بە کورتی هەرشتێ کە غەیری خودا بێ، عەزەمەت و گەورەیی خودامان بۆ دەردەکەوێ.

خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿سَنُرِيهِمْ آيَاتِنَا فِي الْآفَاقِ وَفِي أَنْفُسِهِمْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ الْحَقُّ﴾[1] واتە: «بەمزوانە نیشانەکانی خۆمان لە ئاسۆ و گۆشەکانی زەمین و لە خۆیشیاندا دەخەینە بەرچاویان، تا بۆیان ڕوون بێتەوە کە هەر خودا حەق و ڕاستە».

---

١. فصّلت: ٥٣.

لە ئایەتێ‌تردا ئەفەرمێ: ﴿وَفِي الْأَرْضِ آيَاتٌ لِلْمُوقِنِينَ ﴿٢١﴾ وَفِي أَنْفُسِكُمْ أَفَلَا تُبْصِرُونَ ﴿٢٢﴾﴾[1] واتە: «لە زەمین و لە خۆتاندا نیشانەهایێك هەیە بۆ کەسانێ کە باوەڕی یەقینیان هەیە، ئەوە بۆ سەیرناکەن؟».

بەم لێکدانەوانە دەرکەوت کە جێی بیرکردنەوە و ڕامان هەوڵ خۆتی و پاشان تەواوی مەخلۆقات و بوونەوەرەکانی‌تر.

فَافْهَمْ تَغْنَمْ، والله أعلم

١. الذاریات: ٢١ ـ ٢٢.



# بابەتی چلهەم:
# باسی مەرگ و ڕووداوەکانی پاش مەرگ

## [بەشی یەکەم: یاد و بیری مەرگ]

خودای مەزن فەرموویەتی: ﴿قُلْ إِنَّ الْمَوْتَ الَّذِي تَفِرُّونَ مِنْهُ فَإِنَّهُ مُلاقِيكُمْ﴾[1] واتە: «تۆ بڵێ: بێ‌گومان ئەو مەرگەی کە لە دەستی ڕادەکەن، تووشتان ئەبێ».

### بە گوێرەی بیرکردنەوە لە مەرگ خەڵك سێ جۆرن:

**[گرووپی یەکەم]:**

هەندێ خەڵك هەن کە مەگەر بە دەگمەن دەنا بیر لە مەرگ ناکەنەوە. ئەگەریش باسی مەرگ لەلایاندا بهێننە پێش پێیان‌ناخۆشە و تووڕە دەبن، لەبەر ئەوەی زۆر لە دونیا ڕۆچوون و تێیدا خنکاون و جگە دونیا نەبێ چیتر نابینن. باسی مەرگ لای ئەم جۆرە کەسانەدا بەس لە خودا دووریان دەخاتەوە و هیچ کاریگەرێکیان تێدا ناکات.

**[گرووپی دووهەم]:**

هەندێ‌تر لە خەڵك هەن کە ڕوو لە زاتی خودا دەکەن و لە هەرچی کردەوەی خراپەیە تەوبە دەکەن. یاد و بیرکردنەوە لە مەرگ بۆ ئەم جۆرە کەسانە ترس و خۆف دەخاتە دڵیانەوە و ئامادەیان دەکات تا بەو شێوە کە شیاوە حەقی تۆبەکەیان بەجێ‌بهێنن.

---

١. الجمعة: ٨.

ئەم جۆرە کەسانە لە مەرگ خۆشیان نایێ، نەك لەبەر ئەوەی لە دونیادا ڕۆچوون، بەڵکوو لەبەر ئەوەی تۆشەی سەفەری مەرگیان نییە و تەیاری ئەم کۆچە نین. ئەم جۆرە ناخۆشیە لەبەر ئەوە نییە کە بەرەو خودا ئەچنەوە بەڵکوو ئەمە شتێکی ڕەوایە، چونکە ئەم کەسە ئەیەوێ بژی تا چاك خۆی بۆ دواڕۆژ ئامادە بکات. ئەگەر لەسەر ئەم ڕوانگە و بۆچوونە بەردەوام بێت ئەوە مەرگ بەرەولای خودای ئەبات و دەیباتە پەنای کەرەم و بەخشندەگی خودا.

[گرووپی سێهەم]:

خەڵکی عارف و خواناس، بەردەوام یادی مەرگ دەکەن، چونکە مەرگ ڕۆژی ژوان و پێكگەیشتنی خۆشەویستەکەیانە، ئەوینداریش دیارە قەت ڕۆژی ژوانی خۆشەویستەکەی لە بیر ناچێتەوە، ئەم جۆرە بەندانە یاسن بەدەست ئەوەوە کە مەرگ دێر دێت و هەر چاوەڕوانن. وەك چۆن لە "حوزیفە"وەرَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ دەگێڕنەوە کە کاتێ کەوتە ئاویلکە و سەرەمەرگ فەرمووی: خۆشەویستەکەم هەر لەو وەختەدا کە پێویستم پێی بوو هاتووە و لە هاتنی پەشیمان نیم. خودایە! ئەگەر ئەزانیت گەدایی خۆشەویسترە لەلای من لە دەوڵەمەندی، نەخۆشی خۆشترە بەلامەوە لە ساغی، حەزم لە مەرگ زۆرترە تا ژیان، ئەوا مەرگم بۆ هاسان بکە تا بە تۆ بگەم».

بەڵام لەمانە هەموو باشتر ئەوەیە کە ئادەمیزاد ئەم کارە بەخودا بسپێرێ و بۆ خۆی مەرگ یان ژیان هەڵنەبژێرێ. واتە: خۆشەویستی خودا وای لێ بکات کە بۆ خۆی هیچ هەڵنەبژێرێ مەگەر ئەوەی خۆشەویستەکەی کە خوداوەندە هەڵی بژێرێ بۆی.

## خێری یاد و باسی مەرگ

پێغەمبەرصَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فەرموویەتی: «أَكْثِرُوا مِنْ ذِكْرِ هَادِمِ اللَّذَّاتِ»[1] واتە: «بە زۆری یادی دابڕێنەری لەززەتەکان (واتە: مەرگ)، بکەن».

پێغەمبەرصَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دیسان فەرموویەتی: «لَوْ أَنَّ الْبَهَائِمِ تَعْلَمُ مِنَ الْمَوْتِ مَا تَعْلَمُونَ، مَا أَكَلْتُمْ مِنْهَا سَمِينًا»[2].

---

١. ترمذی: ٢٢٢٩ ـ ٢٣٨٤، نسائی: ١٨٠١، ابن‌ماجه: ٤٢٤٨، احمد: ٧٥٨٤.

٢. بیهقی فی دلائل النّبوّة: ٢٣٨٣ و فی شعب الإیمان: ١٠٠٧٣، ابن‌البمارك فی الزّهد والرّقائق: ١٧٦٤، سیوطی فی الفتح الکبیر: ١٠٠١٤ و فی الجامع الکبیر: ٨٠٨ ـ ٨٠٥٢، حرف اللام، الشّهاب القضاعی فی مسنده: ١٣١٥.

واتە: «ئەگەر ئاژەڵ و چوارپێیان ئەوەی کە ئێوە سەبارەت بە مەرگ دەیزانن، ئەوان بیانزانیایە؛ ئێوە قەت چاخ و پڕە گۆشتتان لێیان نەدەخواردن».

حەزرەتی عائیشەرَضِيَاللَّهُعَنْهَا فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئایا کەسێ لەگەڵ شەهیدان حەشر دەکرێ؟ پێغەمبەرصَلَّىاللَّهُعَلَيْهِوَسَلَّمَ فەرمووی: «نَعَمْ، مَنْ يَذْكُرُ الْمَوْتَ فِي الْيَوْمِ، وَاللَّيْلَةِ عِشْرِينَ مَرَّةً»[1] واتە: «بەڵێ، کەسێ کە لە شەو و ڕۆژێکدا بیست کەڕەت بیر لە مەرگ بکاتەوە».

هەروەها پێغەمبەرصَلَّىاللَّهُعَلَيْهِوَسَلَّمَ فەرموویەتی: «تُحْفَةُ الْمُؤْمِنِ الْمَوْتُ»[2]، واتە: «دیاری مرۆڤی ئیماندار مەرگە».

دیسان پێغەمبەرصَلَّىاللَّهُعَلَيْهِوَسَلَّمَ فەرموویەتی: «كَفَىٰ بِالْمَوْتِ وٰاعِظاً»[3] واتە: «مەرگ بەسە بۆ ئامۆژگاری» دەگێڕنەوە کە ڕۆژێك پێغەمبەری خوداصَلَّىاللَّهُعَلَيْهِوَسَلَّمَ چوو بۆ مزگەوت، دیتی خەڵك قسە دەکەن و پێ دەکەنن، فەرمووی:

«اُذْكُرُوا الْمَوْتَ، أَمٰا وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَوْ تَعْلَمُونَ مٰا أَعْلَمُ لَضَحِكْتُمْ قَلِيلاً وَ لَبَكَيْتُمْ كَثِيراً»[4]

واتە: «یادی مەرگ بکەنەوە، سوێند بەو کەسەی کە گیانم بە دەستیەوەیەتی، ئەگەر ئێوە ئەوەی کە من دەیزانم بتانزانیایە، کەم پێ دەکەنین و زۆر دەگریان».

جا بزانە مەرگ کارەساتێکی ترسناك و ڕووخێنەرە، بیرکردنەوە و یادی مەرگیش ئەبێتە هۆی دووربوونەوە لەمماڵی فریوخواردنەی دونیا، ئەبێتە هۆی کەمبوونەوەی خۆشی و شادی و پتربوونی ترس و خۆف. بەڵێ، ئەگەر مرۆڤ ئەو کاتانە بیر لە مەرگ بکاتەوە کە دڵی بەلای

---

١. المناوی فی الفیض القدیر: ١٣٩٥.

٢. حاکم فی المستدرك: ٨٠١٤، عبد بن‌حمید فی مسنده: ٣٤٩، الشّهاب القضاعی فی مسنده: ١٤٣، بیهقی فی شعب الإیمان: ٩٤١٨ ـ ٩٧٣٠.

٣. بیهقی فی شعب الإیمان: ١٠٠٧٢، الشّهاب القضاعی فی مسنده: ١٢٩٦، المجالسة و جواهر العلم لأبی‌بکر الدینوری المالکی: ١٩٢٥، جامع الکبیر للسیوطی: ٦٤١، حرف الکاف.

٤. لم نعثر علی سطره الأوّل بهذا اللّفظ مع نصفه الثّانی، لکن ورد بنحوه: «...أَيُّ الْمُؤْمِنِينَ أَكْيَسُ؟ قٰالَ: أَكْثَرُهُمْ لِلْمَوْتِ ذِكْراً...» ابن‌ماجه: ٤٢٤٩. و فی روایة: «مَنْ أَكْثَرَ ذِكْرَ الْمَوْتِ أَحَبَّهُ اللّٰهُ» طبرانی فی الأوسط: ٥٠٥١. و فی روایة: «إِنَّ هٰذِهِ الْقُلُوبَ تَصْدَأُ، كَمٰا يَصْدَأُ الْحَدِيدُ إِذٰا أَصٰابَهُ الْمٰاء، قِيلَ: يٰا رَسُولَ‌اللّٰهِ! وَ مٰا جِلاءُهٰا؟ قٰالَ: كَثْرَتُ ذِكْرِ الْمَوْتِ وَ تِلاوَةِ الْقُرْآنِ» بیهقی فی شعب الإیمان: ١٨٥٩، الشّهاب القضاعی فی مسنده: ١٠٩٠. و للسطر الثّانی: أخرجه: بخاری: ٩٨٦ ـ ٤٢٥٥ ـ ٤٨٢٠ ـ ٦٠٠٤ ـ ٦٠٠٥، مسلم: ٤٣٥١، ترمذی: ٢٢٣٤ ـ ٢٢٣٥، نسائی/١٤٥٧ ـ ١٤٨٣، ابن‌ماجه/٤١٨٠ ـ ٤١٨١، احمد: ٧٧٧٦ ـ ٩٤٧٠ ـ ١٠١٢٤ ـ ١٢٣٩٤ ـ ١٣١٤٠ ـ ٢٠٥٣٩ و فی روایة: «لَوْ رَأَيْتُمْ مٰا رَأَيْتُ لَضَحِكْتُمْ قَلِيلاً...» مسلم: ٦٤٦، نسائی: ١٣٤٦، احمد: ١١٥٥٩ ـ ١٢١١٠ ـ ١٣٠٨٢ ـ ١٣٥٧٣.

دونیاوەیە، ئەوە هیچ کاریگەری لەسەر دانانێ، بەڵکوو ڕێگەکەی ئەوەیە کە دڵی لە هەرچی شتە خاڵی بکات و بە ڕاستی یادی مەرگ بکات، ئەبێ بەو جۆرە وا ئەیەوێ بڕوات بۆ سەفەر و لە ڕێ سەفەردایە و تەواوی بیرو هۆشی سەفەرەکەیەتی، چ لە وشکی وچ لە بەحردا، هەر بەو چەشنەیش بیری مەرگ بکاتەوە، چونکە ئەم ڕێبوارە زۆربەی زۆری بیرو هزری تەرخان کردووە بۆ بڕینی ئەم ڕێگەیە و خۆی بۆ تەیار و ئامادە دەکات.

## بەشی دووهەم:

## خێری کورتکردنەوەی ئاوات و ئارەزوو و خراپی درێژەپێدانی

پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی بە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرڕضي الله عنهما: «إِذَا أَصْبَحْتَ، فَلا تُحَدِّثْ نَفْسَكَ بِالْمَسَاءِ، و إِذَا أَمْسَيْتَ فَلا تُحَدِّثْ نَفْسَكَ بِالصَّبَاحِ، وَخُذْ مِنْ حَيَاتِكَ لِمَوْتِكَ، وَ مِنْ صِحَّتِكَ لِسُقْمِكَ، فَإِنَّكَ يَا عَبْدَ اللهِ مَا تَدْرِي مَا اسْمُكَ غَداً»[1].

واتە: «هەرکاتێ ڕۆژت کردەوە ئیدی باسی شەو مەکە بۆ خۆت و هەرکاتێ شەوت کردەوە باسی سبەی مەکە بۆ خۆت، لە ژیانت بۆ مەرگ بگرەوە، لە ساغیت بۆ نەخۆشیت بگرەوە، چونکە سبەی بێشك ناوی خۆشت نازانی ئەی عەبدوڵڵاه».

حەزرەتی عەلیڕضي الله عنه دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «إِنَّ أَشَدَّ مَا أَخَافُ عَلَيْكُمْ خَصْلَتَانِ: اِتِّبَاعُ الْهَوَىٰ وَ طُولُ الْأَمَلِ، أَمَّا اتِّبَاعُ الْهَوَىٰ فَإِنَّهُ يَصُدُّ عَنِ الْحَقِّ وَ أَمَّا طُولُ الْأَمَلِ فَإِنَّهُ يُوجِبُ الْحُبَّ لِلدُّنْيَا» ثُمَّ قَالَ: «أَلا إِنَّ اللهَ تَعَالَىٰ يُعْطِي الدُّنْيَا مَنْ يُحِبُّ وَ يَبْغُضُ وَ إِذَا أُحِبَّ لِلدُّنْيَا» ثُمَّ قَالَ: «أَلا إِنَّ اللهَ تَعَالَىٰ يُعْطِي الدُّنْيَا مَنْ يُحِبُّ وَ يَبْغُضُ وَ إِذَا أَحَبَّ عَبْداً أَعْطَاهُ الْإِيمَانَ أَلا إِنَّ لِلدِّينِ أَبْنَاءً وَ لِلدُّنْيَا أَبْنَاءً فَكُونُوا مِنْ أَبْنَاءِ الدِّينِ وَلا تَكُونُوا مِنْ أَبْنَاءِ الدُّنْيَا، أَلا إِنَّ الدُّنْيَا قَدْ ارْتَحَلَتْ وَ هِيَ مُوَلِّيَةٌ، أَلا وَ إِنَّ الْآخِرَةَ قَدْ جَاءَتْ وَ هِيَ مُقْبِلَةٌ، أَلا وَ إِنَّكُمْ فِي يَوْمِ عَمَلٍ لَيْسَ فِيهِ حِسَابٌ، أَلا وَ إِنَّكُمْ يُوشِكُ أَنْ تَصِيرُوا فِي يَوْمِ حِسَابٍ لَيْسَ فِيهِ عَمَلٌ»[2].

---

١. بيهقى فى شعب الإيمان: ٩٧٦٣، و فى رواية: «كُنْ فِي الدُّنْيَا كَأَنَّكَ غَرِيبٌ أَوْ عَابِرُ سَبِيلٍ...» بخارى: ٥٩٣٧، ترمذى: ٢٣٥٥، ابن‌ماجه: ٤١٠٤، احمد: ٤٥٣٤ و زادوا: «... وَعُدَّ نَفْسَكَ مِنْ أَهْلِ الْقُبُورِ...».

٢. ابن‌ابى‌الدّنيا فى قصر الأمل: ٢ ـ ٤٧، بيهقى فى الزّهد الكبير: ٤٧٠، بطوله، ابوداود فى الزّهد: ١٠٦، احمد بن‌حنبل فى الزّهد: ٧٠١، ابن‌المبارك فى الزّهد والرّقائق: ٢٥٦.

واتە: «بۆ ئێوە لە دوو خەسڵەت زۆر دەترسم: شوێن هەواو هەوەس کەوتن، ئارەزووی درێژ، چونکە شوێنی هەوەسکەوتن بەری حەق دەگرێ و درێژەدان بە ئارەزوو و ئاوات هۆی خۆشویستنی دونیایە». پاشان فەرمووی: «بێدار بن خودای گەورە، دونیا هەم بە دۆستانی دەدات هەم بە ناحەزانی، هەرکاتێ بەندەیێکی خۆش بوێ ئیمانی بە نەسیب دەکات، هۆشیار بن! دین ئەهلی خۆی هەیە و دونیاش ئەهلی خۆی هەیە، ئێوە لە ئەهلی دونیا مەبن. وریا بن! دونیا کۆچەرە و پشت هەڵکەرە، بەڵام پاشەڕۆژ تازە هاتووە و هەر ڕووەو پێش دێ، ئاگادار بن! ئێوە لە ڕۆژێکدان کە ئیش دەکەن و حیساب و لێپرسینەوەی لە سەر نییە، بەڵام بەمزوانە تووشی ڕۆژێ دێن کە لێپرسینەوە و حیسابی تێدایە و کردەوەی تێدا نییە».

پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «أَيُّهَا النّاسُ أَمٰا تَسْتَحْيُونَ مِنَ اللهِ تَعٰالَىٰ؟ ـ قٰالُوا: وَ مٰا ذٰاكَ يٰا رَسُولَ اللهِ؟ ـ قٰالَ: تَجْمَعُونَ مٰا لا تَأْكُلُونَ وَ تَأْمُلُونَ مٰا لا تُدْرِكُونَ وَ تَبْنُونَ مٰا لا تَسْكُنُونَ»[1].

واتە: «ئەی خەڵکینە! ئەرێ ئەوە لە خوای گەورە حەیا ناکەن؟ ـ گوتیان: لەچی ئەی پێغەمبەری خودا! ـ فەرمووی: ئێوە شتێ کۆ دەکەنەوە کە نایخۆن، ئاواتێ دەخوازن کە پێی ناگەن، ماڵێ دەکەنەوە کە تێدا دانانیشن».

ئەبووسەعیدی خودریرضي الله عنه فەرموویەتی: ئوسامەی کوڕی زەیدرضي الله عنهما، کۆیلەیێکی بە سەد دینار، بە قەرز تا مانگێ کڕی. پێغەمبەرﷺ ئەمەی بیست و فەرمووی:

«أَلا تَعْجِبُونَ مِنْ أُسٰامَةَ الْمُشْتَرِي إِلَىٰ شَهْرٍ؟! إِنَّ أُسٰامَةَ لَطَوِيلُ الْأَمَلِ، وَ الَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ مٰا طَرَفَتْ عَيْنٰايَ إِلَّا ظَنَنْتُ أَنَّ شَفْرَيَّ لا يَلْتَقِيٰانِ حَتَّىٰ يَقْبِضَ اللهُ رُوحِي، وَلا رَفَعْتُ طَرَفِي فَظَنَنْتُ أَنِّي وٰاضِعُهُ حَتَّىٰ أُقْبَضَ، وَلا لَقَمْتُ إِلَّا ظَنَنْتُ أَنِّي لا أَسِيغُهٰا حَتَّىٰ أَغُصَّ بِهٰا مِنَ الْمَوْتِ» قٰالَ: «يٰا بَنِي آدَمَ إِنْ كُنْتُمْ تَعْقِلُونَ فَعَدُّوا أَنْفُسَكُمْ مِنَ الْمَوْتَىٰ وَ الَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ ﴿إِنَّ مٰا تُوعَدُونَ لاٰتٍ وَ مٰا أَنْتُمْ بِمُعْجِزِينَ﴾»[2].

واتە: «ئەرێ ئێوە لە ئوسامە سەرسام نین کە شتی کڕیوە بە [قەرزی] مانگێ؟! بەڕاستی ئوسامە ئارەزوودرێژە. سوێند بەو کەسەی کە گیانم بەدەستیەتی، قەت چاو نانێم بەیەکدا

---

١. طبرانی فی الکبیر: ٢٠٩٢٨، ١٠٠٧٨، ابونعیم فی معرفة الصّحابة: ٧٤١٧، سیوطی فی جامع الکبیر: ٦٢٥ جمیعهم بلفظ: «... وَ تَبْنُونَ مٰا لا تَعْمُرُونَ ...».

٢. الأنعام: ١٣٤. طبرانی فی مسند الشّامیّن: ١٤٧٦، بیهقی فی شعب الإیمان: ١٠٠٨٠، سیوطی فی جامع الکبیر: ٢٥٥، حرف الهمزة.

مەگەر وا گومان ئەبەم کە پێڵووەکانم یەك ناگرنەوە تا خودا گیانم نەکێشێ، چاوم بەرز ناکەمەوە مەگەر خێرا گومان ئەبەم کە داینانێمەوە تا گیانم دەرنەچێ، هەروەها تیکەیێك نان نانێمە دەمم، مەگەر ئەوەی گومان ئەبەم کە قووتی نادەم و لە قورگمدا ئەمێنێتەوە و پێوە دەمرم» پاشان فەرمووی: «ئەی بنیادەم! ئەگەر عەقڵتان هەیە، خۆتان بۆ مەرگ ئامادە بکەن، سوێند بەو کەسە کە گیانم بەدەستیە: (ئەو شتەی کە بەڵێنیتان پێ دراوە، دێت، ئێوە ناتوانن خودا بێ دەسەڵات بکەن)».

ئیبنوعەبباس رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بە خاك تەیەممومی دەکرد، گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا! ئاو لێرەوە نزیکە، دەیفەرموو: «مٰا يُدْرِينِي لَعَلِّي لا أَبْلُغُهُ»[1]. واتە: «کێ دەزانێ، شایەد نەگەم پێی (واتە: بمرم)».

دەگێڕنەوە کە پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ سێ چڵ داری داچەقاند، چڵێك لە بەردەمیدا، چڵێکی تر لە پەنایدا چڵێکیشی لە دوورەوە داچەقاند و پاشان فەرمووی:

«هَلْ تَدْرُونَ مٰا هٰذٰا؟ ـ قٰالُوا: اَللّٰهُ وَ رَسُولُهُ أَعْلَمُ ـ قٰالَ: هٰذَا الْإِنْسٰانُ، وَ هٰذَا الْأَجَلُ، وَ ذٰلِك الْأَمَلُ يَتَعٰاطٰاهُ ابْنُ آدَمَ وَ يَخْتَلِجُهُ الْأَجَلُ دُونَ الْأَمَلِ»[2].

واتە: «ئایا دەزانن ئەمە چی بوو؟ ـ گوتیان: خودا و پێغەمبەری خودا ئاگادارن ـ فەرمووی: ئەمە بنیادەمە و ئەمەشیان ئەجەلە، ئەو دوورەش ئاوات و ئارەزووە، کە بنیادەم دەیکات و لە بیری دایە، کەچی ئەجەل بنیادەم ئەیبات، نەك ئاوات و ئارەزوو».

## بەشی سێهەم: سەرەمەرگ و ڕووداوەکانی

### [یەکەم: سەختی سەرەمەرگ]

بزانە ئەگەر بنیادەم هیچ خەفەت و ترسێکی نەبێ جگە لە سەرەمەرگ و سەختییەکانی، هەر ئەوەی بەسە و ئەبێتە هۆی ئەوەی هیچ خۆشییەك لە ژیان نەبینێ، ئەگەر بیری پێ بدات بۆ ئەوە ئەشێ کە هیچ ئارەزوو و ئاواتی درێژی نەبێت و خۆی بۆ ئەو دەمە ئامادە

١. احمد: ٢٤٨٣ ـ ٢٦٢٨، طبرانی فی الکبیر: ١٢٨١٢، ابن‌المبارك فی الزّهد والرّقائق: ٢٩٣، ابن‌حجر العسقلانی فی المطالب العالیة: ١٧٣، الحارث فی مسنده: ٩٧.

٢. ابن‌ماجه: ٤٢٣١ بلفظ: «... أَنَّهُ خَطَّ خَطّاً مُرَبَّعاً وَ خَطّاً وَسَطَ الْخَطِّ الْمُرَبَّعِ ... فَقٰالَ: أَتَدْرُونَ مٰا هٰذٰا؟ قٰالُوا: اللّٰهُ وَ رَسُولُهُ أَعْلَمُ ...».

بکات. هەروەك یەکێك لە زانایان ـ خودا ڕەحمی پێ بکات ـ فەرموویەتی: «كَرْبٌ بِيَدِ سِوَاكَ، لا تَدْرِي مَتَىٰ يَغْشَاكَ» واتە: «سەختی و تەنگانەیێك، کە بە دەستی تۆوە نییە نازانی کەی تووشیاری تۆ دەبێت».

لوقمانی حەکیم بە کوڕەکەی فەرمووە: کوڕیلەم! مەرگ ڕووداوێکە تۆ نازانی کەی تووشت دێ، خۆتی بۆ تەیار بکە پێش ئەوەی ئێخەت پێ بگرێ».

جێی سەرسووڕمانە کە ئادەمیزاد ئەگەر چاوەڕوانی سەربازێك بێت، کە بێت و پێنج شووڵی لێ بدات، ژیانی لێ تاڵ ئەبێ و خۆشیی لێ زەوت ئەکرێ. کەچی هەر ئەم ئادەمیزادە هەر سات چاوەڕوانی ئەوەیە کە فریشتەی مەرگ بێت و گیانی بکێشێ، کەچی هیچ ژیانی لێ تاڵ نابێت و لە خۆشییەکانی کەم ناکاتەوە.

جا پێویستە بزانی کەس ئەندازەی ئێشی سەرەمەرگ نازانێ مەگەر ئەوەی کە خۆی بیچێژێ. کەسێك نەیچێژتبێ، هەر هێندەی لێ دەزانێ کە لەگەڵ ئەو ئێشانەی کە کێشاویە و چێژتوویە هەڵیسەنگێنێ و بەراوردی بکا، یان بە بەڵگەی ئەوانەی ئەمرن و ئەم بینەری مەرگیانە، بۆ بەراوردکردن ئەبێ بزانین کە ئێشێك کە بە ڕۆح دەگات زۆر کەمە و بەراوردی لەگەڵ ئێشی مەرگدا ناکرێ.

مەرگ دەرد و ئێشێکە، لە نێو ڕۆحدایە و برك و ژانەکەی لێوە دێتە نێو گشت ئەندامەکان، ئاخ چەندە ئەو ژانە ناسۆرە و بێپەیە! ئاگرت دیوە بگات بە جەستە و بیسووتێنێ، جگە لە شوێنی سووتانەکە و ئێشەکە بە تەواوی ئەندامەکاندا بڵاوە دەکات و بە ڕەگەکاندا باقی ئەندامەکان دەتەنێتەوە. بەڵام ئێشی مەرگ سەرەڕای ئەوەی لە تەواوی ئەندامەکاندایە کەچی دەنگ لە مردووەکەوە نایێت، چونکە ئێشەکە داویە لە دڵ و ڕۆحی و تەواوی ئەندامەکانی نوقمەسار کردووە و بڕستی لەگشتیان سەندووە و هێز و گوڕی لە هیچکامیاندا نەماوە تا ناڵەو جووڵەیان لێوە بێ.

عەقڵ تێك دەچێ و دەشێوێ، زمان دەشکێ، چاوەکان سۆمای نامێنێ، مرۆڤ لەو وەختەدا حەز دەکات وچانێ دەربکات بە قیڕە و ناڵە و هاوار و داوای یارمەتی، کەچی ناتوانێ، ئەگەریش تۆزە هێزێکی تێدا بمێنێت، هەر هێندەیە کە لرخە لرخێك لە سین و قورگیەوە دەبیسرێ و ڕەنگی دەپەڕێ و زەرد هەڵئەگەڕێ، دەڵێی ڕەنگی ئەو خاکەیە کە لێیەوە خەلق کراوە، جا گیان

لەگشت ڕەگەکانی دەردەچێ و پاشان گشت ئەندامەکانی وردە وردە دەمرێ و سارد دەبێتەوە، هەوڵ پێیەکانی، جا چۆکەکانی، جا ڕانەکانی... هەر ئەندامێ بۆ خۆی گیان کێشانێکی تایبەتی هەیە و ئێشی تایبەتی خۆی هەیە، تا ئەم گیان کێشانە وردە وردە دەگاتە قوڕ قوڕانچکە، لەو کاتەدایە کە ئیدی ناتوانێ بۆ دونیا و خەڵکی دونیا بڕوانێ و دەرگای تەوبەشی لێ دادەخرێ.

پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «تُقْبَلُ تَوْبَةُ الْعَبْدِ مٰا لَمْ يُغَرْغِرْ»[1]. واتە: «تا بەندە نەکەوێتە لرخە لرخ تەوبەی لێ قەبوول دەکرێ».

لە حەزرەتی حەسەنەوەرضي الله عنه دەگێڕنەوە کە فەرموویەتی: پێغەمبەرﷺ باسی مەرگی دەکرد و لە سەختی و ئێشەکانی دەدوا، دەیفەرموو: «قَدْرُ ثَلاثُمائَةِ ضَرْبَةٍ بِالسَّيْفِ»[2] واتە: «ئێشەکەی بە قەدەر ئێشی سێسەد زەربەی شمشێرە».

زیادی کوڕی ئەسلەم، لە بابیەوە دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: «ئەگەر پلە و پایەهایێك ببێ کە مرۆڤ بە ئەنجامی عەمەلی چاك پێیان نەگەیشتبێ، ئەوە مەرگ بۆ ئەو سەختتر دەبێ، تا هێندە ڕەنج بکێشێ بەوە شیاوی گەیشتن بەو مەقاماتە ببێ لە بەهەشتدا. ئەگەریش کافرێ هەبێ کە کاری چاکەی ئەنجام دابێ و پاداشی نەدرابێتەوە ئەوە خودا بە هاسانی گیانی دەکێشێ، تا پاداشی ئەو چاکەیە هەر لە دونیا بدرێتەوە و ئیدی پاش ئەوە دەستبەجێ بەرەو جەهەننەم ڕەوانە بکرێ».

دەگێڕنەوە پیاوێك بوو زۆر لە نەخۆش و پەککەوتە سەبارەت بە مەرگ پرسیاری ئەکرد، تا جارێ نەخۆش کەوت و کەوتە هەڵا کات، پێیان گوت: حاڵت چۆنە؟ گوتی: وا دەزانم تەواوی ئاسمان و زەمنیان ناوەتە سەرسکی من و منیش لە کونە دەرزییەکەوە خەریکم هەناسە دەکێشم.

پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «مَوْتُ الْفُجْأَةِ رٰاحَةٌ لِلْمُؤْمِنِ وَ أَسَفٌ عَلَى الْفٰاجِرِ»[3] واتە: «مەرگی کوتوپڕی بۆ مرۆڤی ئیماندار ڕاحەتی و ئاسایشە و بۆ گونەحبار مەترسییە».

---

١. ترمذی: ٣٤٦٠، ابن‌ماجە: ٤٢٤٣، احمد: ٥٨٨٥ ـ ٦١٢٠ ـ ١٤٩٥٢.

٢. الحارث فی البُغية: ٩ و فی مسنده: ٢٥٥، عبدالرَّزّاق فی مصنفه: ٦٧٧٣، جامع الكبير للسيوطی: ٨١١، حرف الهمزة ـ ٦٢٧، حرف اللام ـ ٢٣٢، حرف الميم و فی الفتح الكبير: ٩٩٣٤، حرف اللام، المطالب العالية لابن‌حجر العسقلانی: ٨١٨ جميعهم بلفظ: «لَمُعٰالَجَةُ مَلَكِ الْمَوْتِ أَشَدُّ مِنْ أَلْفِ ضَرْبَةٍ بِالسَّيْفِ».

٣. احمد: ٢٣٨٩١، بيهقی فی شعب الإيمان: ٩٧٤٠، الفتح الكبير للسيوطی: ١٢٤٦٣، حرف الميم، جميعهم بلفظ: «... رٰاحَةٌ لِلْمُؤْمِنِ وَ أَخْذَةَ أَسَفٍ لِلْفٰاجِرِ». و فی رواية: «مَوْتُ الْفُجْأَةِ أَخْذَةُ أَسَفٍ» ابوداود: ٣٧٠٣، احمد: ١٤٩٤٩ ـ ١٧٣٤٦.

## [دووهەم: هاتنی فریشتەی مەرگ (قابض)]

بەڵای دووهەم کە لە سەرەمەرگدا تووشی ئادەمیزاد دێ، دیتنی ڕوخساری فریشتەی مەرگە و دەست پێکردنی ترس و خۆف و داگرتنی دڵە.

لە حەزرەتی ئیبراهیمەوەعَلَیهِالسَّلَامْ دەگێڕنەوە کە بە فریشتەی مەرگی گوت: دەتوانی لەسەر ئەو ڕوخسارەی کە گیانی تاوانباری پێ دەکێشێ خۆت پیشانی من بدەی؟ گوتی: تاقەت ناهێنی، [گوتی: ئەتوانم]، عیزرائیل گوتی: دەباشە ڕوو وەرچەرخێنە. ئەویش پشتی هەڵکرد. کوتوپڕ عیزرائیلی لە ڕوخساری پیاوێکدا کە ڕەنگی پێستی ڕەش بوو چاو پێ کەوت، مووەکانی هەموو وەك سێخ وەستابوون، بۆنی پیسی لێوە دەهات، لیباسێ ڕەشی قیزەونی لەبەردا بوو، بە دەم و لووتیەوە ئاگر بڵێسەی دەکێشاو دووکەڵ سەرتاپای داگرتبوو. ئیبراهیم کە چاوی پێ کەوت لەسەر خۆی چوو، پاشان هاتەوە سەر هۆش و عیزرائیل بەو شێوە پێشووەکە هاتەوە بەرچاوی، ئیبراهیم گوتی: ئەی فریشتەی مەرگ! ئەدی خۆ ئەگەر تاوانباران لە سەرەمەرگدا هیچ سەختی و ترسێکیان نەبێ، هەردیتنی ڕوخساری تۆیان بەسە.

ئەبوو هورەیرەرَضِیَاللَّهُعَنْهُ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەرصَلَّىاللَّهُعَلَیهِوَسَلَّمْ فەرموویەتی: «داوودعَلَیهِالسَّلَامْ پیاوێکی لێهاتوو و جوامێر بوو، هەر کاتێ لە ماڵ دەچووە دەر دەرگاکانی پێوە دەدا. ڕۆژێك دەرگای پێوە دا و چووە دەرەوە، خێزانەکەی کە لە ماڵدا بوو، کوتوپڕ چاوی بە پیاوێ کەوت کە لە نێو ماڵەکەدایە، خێرا گوتی: کێ ئەم پیاوەی ڕێ داوە بێتە ماڵەوە، دەیخۆ ئەگەر داوود بێتەوە، بێ شك تووڕە دەبێ. زۆری نەخایاند داوود هاتەوە، پیاوەکەی چاو پێ کەوت. گوتی: ئەتۆ کێیت؟ گوتی: ئەمن کەسێکم کە لە هیچ شاە و وەزیرێ ناترسم و هیچ شتێ بەریشم پێ ناگرێ، داوود گوتی: کەوابێ وەڵڵاهی تۆ عیزرائیل و فریشتەی مەرگی. داوود لەجێ خۆیدا وشك بوو»[1].

دەگێڕنەوە حەزرەتی عیساعَلَیهِالسَّلَامْ لە پەنای کاسە سەرێکەوە تێپەڕی و ڕووی لێ کرد و پێ گوت: بە ئیزنی خودا بۆم بڵێ، کاسە سەرەکەش هاتە قسە و گوتی: ئەمن پاشای فڵانە سەردەمم. ڕێبوارێ هاتە لام، ئەمن لەسەر تەختی پاشاییم دانیشتبووم و تاجم لەسەردا بوو و لەشکری سەرباز ئاپۆرەی دابووم و دەوروبەرم پڕ بوو لە خزمەتکار و خزم و کەسم لەسەر

---

١. احمد: ٩٠٦٣، سیوطی فی جامع الکبیر: ٥٠٧، حرف الکاف، غایة المقصد للهیثمی فی ذکر داود.

تەختی من بوون، ئەو ڕێبوارە بە عیزرائیل لێم دەرکەوت و هەرچی ئەنداممە وشك بوون و گیانمی لە جەستەم دەرکرد. هاوار لەو پێكگەیشتنە چەندە ترسناك بوو![1]

لە ئیبنووعەبباسەوە رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا دەگێڕنەوە کە ئیبراهیم عَلَيْهِ السَّلَامُ پیاوێکی بە دەسەڵات و بە ورە بوو، ماڵێکی هەبوو لەوێدا عیبادەتی خودای دەکرد، هەرکاتێ لەو پەرستشگایە دەهاتەدەر دەرکەکەی دادەخست و قوفڵی دەدا. ڕۆژێك گەڕاوە ماڵەکەی، دیتی پیاوێك لە نێو ماڵەکەدایە و پێی گوت: ئەتۆ کێ ڕێی پێ داوی بێیتە ئێرە. گوتی: ئەو کەسە ڕێی داوە پێم کە لە من و تۆ بە دەسەڵاتترە. گوتی: تۆ کێیت؟ لە پەرییانی؟

گوتی: ئەمن عیزرائیلم. گوتی: دەتوانی بەو ڕوخسارە کە گیانی ئیمانداران دەکێشی خۆتم پیشان بدەی، گوتی: بەڵێ. پشتی هەڵ کرد و خێرا ڕووی وەرچەرخاندەوە، بوو بووە لاوێك سەرو سیما جوان، پۆشتە و بۆنخۆش. ئیبراهیم گوتی: ئەی فریشتەی مەرگ ئەگەر ئیمانداران هیچ شتێکیان نەدیتبێ جگە ئەم ڕوخسارە جوانەی تۆ، هەر ئەمەیان بەسە[2].

یەکێتر لە ڕووداوەکانی سەرەمەگ، دیتنی دوو فریشتەی نووسەری کردەوەکانە کە لە دنیادا کردەوەکان دەنووسن. "وەهیب" دەفەرمێ: بیستبوومان کە هەرکەسێك ئەو دوو فریشتەیەی چاو پێئەکەوێ کە کردەوەکانی دەنووسن. جا ئەگەر ئەو کەسە بەندەیێکی گوێڕایەڵ بووبێ، پێی ئەڵێن: خودا لەباتی ئێمە خێرو جەزات بداتەوە. چونکە بۆ زۆر کۆڕی ڕاستی و پاکی ئێمەت برد، زۆر کردەوەی چاکت لەبەر چاومانەوە ئەنجام دا.

هەروەها ئەگەریش کەسێك خراپ و گونەهکار بێ، پێی ئەڵێن: خودا خێرت نەداتەوە، چونکە بۆ زۆر شوێنی خراپ ئێمەت برد، زۆر قسەی قۆڕ و خراپمان بیست. ئەو پیاوەش واقی وڕدەمێنێ و وشك دەبێ[3].

## [سێهەم: دیتنی گونەهکاران لەنێو دۆزەخدا]

یەکێتر لە ڕووداوەکان دیتنی گونەهکارانە لەنێو دۆزەخدا و ترس و خەوفیان لەو شوێنەدا، چونکە هەرکەس بمرێ دەستبەجێ یەکێ لەم دوو ڕستەیە لەدەم فریشتەی مەرگەوە دەبیسێ:

---

١. حلية الأولياء لأبي‌نعيم الأصبهاني: ٤٥٦/٢ برواية أخرى.

٢. حلية الأولياء لأبي‌نعيم الأصبهاني في ذكر كعب الأحبار: ٤٦٦/٢ برواية أخرى، التذكرة في أحوال الموتى الآخرة للقرطبي: ٨١/١.

٣. حلية الأولياء لأبي‌نعيم الأصبهاني في ذكر وهيب بن‌الورد: ٤٢٣/٣.

مزگێنی ئەی دۆستی خودا بۆ بەهەشت! یان، هاوار بۆ تۆ ئەی دوژمنی خودا بۆ دۆزەخ. ئەوی خاوەن هزر و عەقڵە لەم ساتە دەترسێ.

پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «لَنْ يَخْرُجَ أَحَدُكُمْ مِنَ الدُّنْيا حَتَّىٰ يَعْلَمَ أَيْنَ مَصِيرُهُ، وَ حَتَّىٰ يَرَىٰ مَقْعَدَهُ مِنَ الْجَنَّةِ وَ النّارِ»[1].

واتە: «کەس لە دونیا دەرناچێ، مەگەر خۆی دەزانێ چارەنووسی کوێیە: تەنانەت شوێنی خۆی لە بەهەشت یان دۆزەخدا دەبینێ».

## [چوارەم: ئەو شتانەی کە مرۆڤی دەمە و مەرگ پێویستە بیزانێ]

سوننەتە بنیادەم لە سەرە مەرگدا ئارام و لەسەرخۆ بێ، بەردەوام شایەتیمان بهێنێ و بەخوداش دڵخۆش بێ کە دەیبەخشێ و هومێدەواری عەفوی بێت.

پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «أُرْقُبُوا الْمَيِّتَ عِنْدَ ثَلاثٍ: إِذا رَشَحَ جَبِينُهُ وَ دَمَعَتْ عَيْناهُ، و يَبِسَتْ شَفَتاهُ، فَهِيَ مِنْ رَحْمَةِ اللهِ قَدْ نَزَلَتْ بِهِ وَ إِذا غَطَّ غَطِيطَ الْمَخْنُوقِ وَاحْمَرَّ كَوْنُهُ وَ ازْبَدَتْ شَفَتاهُ فَهُوَ مِنْ عَذابِ اللهِ قَدْ نَزَلَ بِهِ»[2].

واتە: «سەرنجی سێ حاڵەتی کەسێك کە لە گیانکەنشتدایە بدەن: کاتێ ناوچاوانی عارەقی لێ بتکێ، چاوەکانی فرمێسکی تێ بزیێ، لێوەکانی وشك ببێ، ئەوە لە ڕەحمی خوایە کە نازڵ بووەتە سەری. هەرکاتێ لرخە لرخی پێ بکەوێ وەك کەسێ بیخنکێنن، ڕەنگی سوور بێتەوە، لێوەکانی ڕەش بێتەوە، ئەوە نیشانەی عەزابی خودایە کە تووشی بووە».

ئەبوو سەعیدی خیدریرضي الله عنه دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «لَقِّنُوا مَوْتاكُمْ قَوْلَ لا إِلٰهَ إِلَّا اللّٰهُ»[3] و فی روایة حُذَيْفة «فَإِنَّها تَهْدِمُ ما قَبْلَها مِنَ الْخَطايا»[4].

واتە: «بە مردووەکانتان "لا إِلٰهَ إِلَّا اللّٰهُ" تەڵقین بکەن». لە ڕیوایەتی حوزیفەدا ئەمەی پێ زیاد کراوە «بە ڕاستی ئەم وتەیە هەر گوناحێك پێش خۆی کرابێت تێك دەدات».

---

١. لم نعثر علیه بهذا اللّفظ لکن ورد بألفاظ آخر منها: بخاری: ٦٠٢٦ بلفظ: «... الْمُؤْمِنُ إِذا حَضَرَهُ الْمَوْتُ بُشِّرَ بِرِضْوانِ اللهِ وَ كَرامَتِهِ... وَ إِنَّ الْكافِرَ إِذا حُضِرَ بُشِّرَ بِعَذابِ اللهِ وَ عُقُوبَتِهِ...». و فی روایة: «حَرامٌ عَلَىٰ كُلِّ نَفْسٍ أَنْ تَخْرُجَ مِنَ الدُّنْيا حَتَّىٰ تَعْلَمَ إِلَىٰ أَيْنَ مَصِيرُها» ابن‌ابی‌شیبه فی مصنّفه: ٣٢٠/٨.

٢. جامع الكبیر للسیوطی: ١٤٤، حرف الهمزة، کنز العمال للهندی: ٤٢١٧٨.

٣. مسلم: ١٥٢٣ ـ ١٥٢٤، ابوداود: ٢٧١٠، ترمذی: ٨٩٨، نسائی: ١٨٠٣، ابن‌ماجه: ١٤٣٤ ـ ١٤٣٥ ـ ١٤٣٦، احمد: ١٠٥٧٠.

٤. عبد الرّزّاق فی مصنفه: ٦٠٤٨، جامع الکبیر للسیوطی: ٣٨٣، حرف اللام، معرفة الصّحابة لأبی‌نعیم الأصبهانی: ٤٩١٢. و فی روایة: «مَنْ كانَ آخِرُ كَلامِهِ لا إِلٰهَ إِلَّا اللّٰهُ دَخَلَ الْجَنَّةَ» ابوداود: ٢٧٠٩، ترمذی: ٨٩٩، احمد: ٢١٠٢٤ ـ ٢١١١٠.

ئەبوو هـورەیرەرَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ فەرموویـەتی: بیستم لە پێغەمبەری خـوداصَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دەیفەرموو: «حَضَرَ مَلِكُ الْمَوْتِ رَجُلاً يَمُوتُ فَنَظَرَ فِي قَلْبِهِ، فَلَمْ يَجِدْ فِيهِ شَيْئاً فَفَكَّ لَحْيَيْهِ، فَوَجَدَ طَرَفَ لِسَانِهِ لاصِقاً بِحُنُكِهِ وَ هُوَ يَقُولُ: لا إِلٰهَ إِلَّا اللّٰهُ فَغُفِرَ لَهُ بِكَلِمَةِ الْإِخْلَاصِ»[1].

واتە: «فریشتەی مەرگ هاتە سەر پیاوێك کە خەریك بوو دەمرد، سەیری دڵی کرد، هیچی تێدا نەدیت، دەمیی کردەوە دیتی زمانی بە مەڵاشوویەوە لکاوە و خەریکە ئەڵێ: "لا إِلٰهَ إِلَّا اللّٰهُ"، ئەو پیاوە لەبەر ئەو وتەی تەوحیدە خودا لێی خۆش بوو».

هەروەها سوننەتە «لا إِلٰهَ إِلَّا اللّٰهُ» بە ئارامی بەسەریا بخوێنرێ، مەبادا زمانی نەگەڕێ و نەتوانێ گورج بیڵێ و ئەگەریش زۆری لێ بکرێ ترسی ئەوە هەیە کە ئەو وتەیە بە ناخۆش بڵێ و پێی ناخۆش بێ.

هەروەها سوننەتە سەبارەت بە خودا گومانی چاکیان هەبێ و هیوای لێبوردنیان بە خودا بێ، چونکە پێغەمبەرصَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لە زمانی خوداوە فەرموویـەتی: «أَنَا عِنْدَ ظَنِّ عَبْدِي فَلْيَظُنَّ بِي خَيْراً»[2] واتە: «ئەمن بە پێ گومانی بەندەکەم لەگەڵیدا دەجووڵمەوە، ئەدی با گومانی چاکم پێ ببەن».

## [پێنجەم: ئاخ و حەسرەت هەڵکێشان لە کاتی تووشبوونی فریشتەی مەرگ]

وەهەبی کوڕی مونەببەهرَحِمَهُ اللَّهُ فەرموویـەتی: پاشایەك ئەیەویست بۆ شوێنێ بڕوات، داوای لیباسی سەفەری کرد تا لەبەری بکات، بۆیان هێنا، بەڵام خۆشی لێ نەهات، پاشان داوای قاتێکیتری کرد تا لەبەری بکات، دیسان بە دڵی نەبوو، هێندەیان بۆ هێنا تا دەستێکی لەبەر کرد کە بە دڵیەوە نیشت، هەروەها ناردی ئەسپێکی بۆ بهێنن، یەکێکیان بۆ هانی، بەڵام بەدڵی نەبوو، هێندەیان بۆ گۆڕی تا یەکێکی بەردڵ کەوت. پاش ئەمانە شەیتان هات بۆلای و بای کردە قولی و سەری پڕ لە دەمار کرد.

---

١. ابن‌ابی‌الدّنیا فی المحتضرین: ٩، بیهقی فی شعب الإیمان: ٩٨٤ـ٨٧٩٩، سیوطی فی جامع الکبیر: ١٢٠٦٠، حرف الحاء.

٢. بخاری: ٦٨٥٦ ـ ٦٩٥١، مسلم: ٤٨٣٢ ـ ٤٨٤٩ ـ ٤٨٥١ ـ ٤٩٢٧، ترمذی: ٢٣١٠، ٣٥٢٧، ابن‌ماجه: ٣٨١٢، احمد: ٧١١٥ ـ ٨٧١٥ ـ ٨٩٨٣ ـ ١٠٢٦٧، ١٥٤٤٢ ـ ١٦٣٦٥، و زادوا فی بعض الرّوایات الّتی ذکرنا: «... وَ أَنَا مَعَهُ إِذَا ذَكَرَنِي فَإِنْ ذَكَرَنِي فِي نَفْسِهِ ذَكَرْتُهُ فِي نَفْسِي وَ إِنْ ذَكَرَنِي فِي مَلَاءٍ ذَكَرْتُهُ فِي مَلَاءٍ خَيْرٍ مِنْهُ...». و فی روایة: «... وَ أَنَا مَعَهُ إِذَا دَعَانِي». و فی روایة: «إِنْ ظَنَّ بِي خَيْراً فَلَهُ وَ إِنْ ظَنَّ بِي شَرّاً فَلَهُ».

پاشا وەڕێ کەوت و لەشکەرێکی کەوتە شان، هێندە دەماری زل بوو سەیری خەڵکی نەدەکرد، پیاوێك شپرزە و شڕ لەپڕ هاتە پێشەوەی و سڵاوی لێ کرد. وڵامی سڵاوەکەی نەداوە. پیاوەکە هەوساری ئەسپەکەی گرت. پاشا گوتی: ئەو هەوسارە بەردە ئیشی گەورەم لە پێشە ئەبێ بڕۆم. پیاوەکە گوتی: منیش کارێکم پێتە. پاشا گوتی: دەباشە ڕاوەستە تا دادەبەزم، پیاوەکە گوتی: نا، هەر ئێستا و بە زۆر هەوسارەکەی گرت و سەری بردە لای سەری پاشاوە، پاشاش گوتی: دەبڵێ، گوتی: ناتوانم، نهێنیە. پاشا بە دەم ڕێگەوە سەری لێ نزیك خستەوە، پیاوەکە گوتی: ئەمن عیزرائیلم. پاشا دەستبەجێ ڕەنگی گۆڕاو زمانی کەوتە پرتە پرت، پاشان گوتی: لێم‌گەڕێ با بگەڕێمەوە ماڵ و پێداویستیەکانم جێ بەجێ بکەم و ماڵاوایان لێ بکەم. عیزرائیل گوتی: سوێند بە خوا تازە چاوت بە خێزان و بە کەس و کارت ناکەوێ. خێرا لەوێ گیانی کێشا، پاشاش زرم داکەوت، وەك چۆن دارێ بدارێتەوە.

عیزرائیل هەر لەم سەرو بەندەدا بە بەندەیێکی ساڵح گەیشت و سڵاوی لێ کرد و ئەویش جوابی داوە. پاشان گوتی: پیاوەکە! ئیشم پێتە پیاوەکەش گوتی: باشە بفەرموو. چووە لای سەریەوەو پێی گوت: ئەمن عیزرائیلم. گوتی: دەباشە بەخێر بێی، سەرچاوان، سوێند بەخودا لەم سەرزەمینەدا کەس نەبووە بە قەدەر تۆ بێ‌تاقەتی بوو بێتم و تاسەم کردبێ.

پاشان عیزرائیل گوتی: بۆ چ کارێ بۆ ئێرە هاتبووی ئەنجامی بدە. پیاوەکەش گوتی: هیچ ئیشێك گەورەتر لە گەیشتن بە تۆم نییە و هیچ شتێ بەلامەوە لە دیداری خودا خۆشتر نییە. گوتی: حەز دەکەی چلۆن و لەسەر چ حاڵەتێك گیانت بکێشم، گوتی: فەرمانت پێ دراوە و دەتوانی؟ گوتی: بەڵێ دەستوورم پێ دراوە. پیاوەکەش گوتی: دەباشە، لێم گەڕی تا دەست‌نوێژێ ئەشۆرم و نوێژێك ئەخوێنم، تۆش لەو کاتەدا کە لە سوجدەدام گیانم بکێشە، فریشتەی مەرگ بە گوێی کرد و بەدەم سوجدەبردنەوە ڕۆحی کێشا[1].

ئەبووبەکری کوڕی عەبدوڵڵای مەزنی دەگێڕێتەوە: پیاوێك لە هۆزی بەنی ئیسرائیل زۆر دەوڵەمەند بوو، لە سەرەمەرگدا گوتی بە منداڵ و زارۆکانی: چی ماڵ و دارییم هەیە بە هەرچی جۆریەوە بۆم بێنن، ئەوانیش شتانێ جۆراو جۆری زۆریان بۆ هێنا، لە وشتر، ئەسپ، کوێلە و... کاتێ کە خەریك بوو سەیریانی ئەکرد بە دڵپڕیەوە دەستی بەگریان کرد.

---

١. حلیة الأولیاء لأبی‌نعیم الأصبهانی: ٥٢/٣ فی ذکر سعید بن ایاس الجریری.

فریشتەی مەرگ لەو حاڵەدا چاوی پێ کەوت، پێی گوت: بۆچ دەگری؟ سوێند بەو کەسەی ئەم ماڵ و سەروەتەی بەتۆ بەخشیوە، ئەمن لەم ماڵە نارۆمەدەر تاگیانت لە جەستەت جیا نەکەمەوە، گوتی: ئەدی سەبرم لێ بکە تا ئەم ماڵ و داراییەم بڵاوە پێ بکەم. گوتی: هەیهات، تازە هیچ دەرفەتت بۆ نەماوەتەوە، بۆچی نەتئەتوانی پێش هاتنە پێشەوەی ئەجەلت ئەو کارە بکەیت. عیزرائیل خێرا گیانی کێشا.

## بەشی چوارەم:
## کارەساتی فەوتی پێغەمبەرﷺ و خەلیفەکانی راشیدین رضي الله عنهم

بزانە پێغەمبەرﷺ نموونەیێکی ڕاستەقینە و تەواو بوو، چ لە ژیانیدا و چ لە وەفاتیدا. کاتێ کە پێغەمبەرﷺ فەوتی فەرموو، کەس ئیدی حەزی لە ژیان نەدەکرد.

خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿أَفَإِنْ مِتَّ فَهُمُ الْخَالِدُونَ﴾[1] واتە: «ئاخۆ ئەگەر تۆ بمریت، ئەوان بۆ هەتاهەتایی دەمێننەوە».

خودای مەزن فەرموویەتی: ﴿كُلُّ نَفْسٍ ذَائِقَةُ الْمَوْتِ﴾[2] واتە: «هەرچی کەسە تامی مەرگ دەچێژێ».

ئیبنوو مەسعوودرضي الله عنه فەرموویەتی: «چووینە خزمەتی پێغەمبەرﷺ لە مەنزڵی دایکماندا، حەزرەتی عائیشەرضي الله عنها ئەو کاتە کە نزیك بوو پێغەمبەرﷺ کۆچ بکات، سەیری کردین، چاوە پیرۆزەکانی پڕ بوو لە فرمێسك، پاشان فەرمووی: بەخێرهاتن، دروودی خواتان لەسەر، خودا پەناتان بدات، خودا یارمەتیتان بدات، داواتان لێ دەکەم لەخودا بترسن، تاعەت و عیبادەتی خودا بەجێ بهێنن، ئەمن ترسێنەری ئێوەم لەخودا و ڕوونکەرەوەی فەرموودەکانی ئەوم، ئێوە لە ژیانتاندا دەمارزلی مەکەن، نە لە زەمیندا، نە لە نێو بەندەکانی خودادا. مەرگ نزیکە و گەڕانەوەمان بۆلای خودایە، بۆلای «سدرة المنتهىٰ» بۆ بەهەشتی هەمیشەیی، بۆ سەر جام و شەرابی بەهەشت. ئێوە لە زمانی منەوە سڵاوی خۆتان و سڵاوی سەرجەمی ئەو کەسانە کە دێنە سەردینی ئیسلام بگەیەنن»[3].

---

١. الأنبياء: ٣٤. ٢. آل‌عمران: ١٨٥.

٣. طبراني في الأوسط: ٤١٤٣ و في الدّعاء: ١١٢١، الهيثمي في كشف الأستار: ٨٤٧، بيهقي في دلائل النّبوّة: ٣١٧٥، بزّار في مسنده: ٢٠٢٨، ابونيعم في الحلية الأولياء: ١٥٣/٢ في ذكر مرّة بن‌شراحيل.

دەگێڕنەوە کە حەزرەتی عائیشەﷺ فەرموویەتی: «پێغەمبەرﷺ لە هۆدەکەی من و لە نۆرەی مندا و سەری لە ئامێزمدا بوو، فەوتی کرد. خودای گەورە ئاوی دەمی من و ئەوی لە سەرەمەرگدا ئاوێتەی یەك کرد. عەبدوڕڕەحمانی برام هاتەماڵەوە، بە دەستیەوە سیواکێ هەبوو، پێغەمبەرﷺ چاوی لێ بڕیبوو، زانیم کە حەزی لێ دەکات، خێرا پێم گوت: بیهێنم بۆت؟ بەسەر ئاماژەی کرد کە بەڵێ بیهێنە، منیش سیواکەکەم بۆ هانی و نامە نێو دەمی، ڕەق و وشك بوو ئازاری دەدا، پێم گوت: نەرمی کەمەوە بۆت، دیسان بەسەر ئاماژەی کردەوە کە بەڵێ، منیش بە ئاوی دەمم نەرمم کرد بۆی. لە بەردەمیدا تەشتێ ئاو بوو، هەر خەریك بوو دەستی تێ دەخست و دەیفەرموو:

«لا إِلٰهَ إِلَّا اللّٰهُ، إِنَّ لِلْمَوْتِ لَسَكَرَاتٌ» واتە: «بەڕاستی مەرگ سەختی زۆری هاتێدا». پاشان دەستی ڕاست کردەوە و فەرمووی: «الرَّفِيقُ الْأَعْلَىٰ، الرَّفِيقُ الْأَعْلَىٰ» واتە: «دۆستی هەرە بەرز، دۆستی هەرە بەرز [هەڵدەبژێرم]»، ئەمنیش گوتم تازە بەخودا ئێمە هەڵنابژێرێ و [بۆلای خودا دەگەڕێتەوە]»[1].

ئیبنومەسعوودﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەرﷺ بە حەزرەتی ئەبووبەکرﷺ فەرمووی: «پرسیار بکە، ئەی ئەبووبەکر!» ئەویش گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! بۆچی ئەجەل نزیك بووەتەوە؟ فەرمووی: «بەڵێ نزیك بووەتەوە و هەر وردە وردە خەریکە نزیك ئەبێتەوە».

گوتی: ئەدی ئەی پێغەمبەری خودا! هەرچی لە لایەنی خوداوە بێت پیرۆزت بێ، خۆزگە منیش دەمزانی بۆ کوێ دەگەڕێمەوە.

پێغەمبەرﷺ فەرمووی: «دەگەڕێتەوە بۆلای خودا، بۆ "سدرةالمنتهىٰ" پاشان بۆ بەهەشت و فیردەوسی بەرین و سەری «الكأس الأوفىٰ» و بۆلای «الرفيق الاعلىٰ» بۆ ژیان و گوزەرانێکی پاك و خۆش و خاوێن».

پاشان ئەبووبەکرﷺ گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! کێ بتشۆرێ؟، فەرمووی: «یەکێ لە نزیکترین خزمەکانم، هەر بە پێی نزیکتر جا نزیکتر» گوتمان لە چیدا کفنت بکەین؟ فەرمووی: «هەر لەم کراسەی کە لەبەرمدایە و لە پارچەی یەمەنی و پارچەی میسریدا».

1. بخاري: ٤٠٩٤ بلفظه مسلم: ٤٤٧٦ برواية أخرى، طبراني في الكبير: ١٨٦٠٩، ابن‌الأثير في جامع الأصول: ٨٥٣٠، بيهقي في دلائل النبوّة: ٣١٣٨.

پاشان گوتی: چلۆن نوێژ بکەین بە سەرتەوە؟

ئێمە بە تێکڕا دەستمان کرد بە گریان و پێغەمبەریشﷺ دەستی کرد بە گریان و پاشان فەرمووی:

ڕاوەستن ـ خودا لەباتی پێغەمبەرەکەتان پاداشتان بداتەوە ـ هەرکاتێ منتان شۆرد و کەفەنتان کردم، لەسەر تەختەکەم لە ژوورەکەی خۆمدا، بەسەر لێوی گۆڕەکەمەوە دامبنێن، پاشان بە مەودای سەعاتێك لام چۆڵ کەن. هەووەڵین کەس کە سەڵەواتم بۆ بنێرێ خودایە ئەو خودایەی کە خۆی و فریشتەکانی درووود بۆ ئێوەش دەنێرن ـ پاشان خودای گەورە ئیزن دەدات کە بێنەسەرم و نوێژم بە سەرەوە بکەن، هەووەڵین فریشتە کە دێتە سەرم جوبرەئیلەعليه السلام جا میکائیلعليه السلام دێ جا ئیسرافیلعليه السلام دێ، پاشان فریشتەی مەرگ (عیزرائیل) لەگەڵ کۆمەڵێ فریشتەی هاوڕێی خۆیدا دێت، پاشان سەرجەمی فریشتەکان بە تێکڕا دێن، جا پاشانەکە ئێوەش بێن، ئێوە پۆل پۆل وەرن و نوێژم لەسەر بکەن و سەڵوات و درووودم بۆ بنێرن.

بەڵام وریا بن بە شین و ڕۆ و خۆ کوتان و خۆڕنین و هـاوارەوە نەیێنە سـەرم. هەوەڵ پێش‌نوێژەکەتان، جا خێزان و بنەماڵەکەم، جا بە گوێرەی نزیکی چین چین بێنە سەرم، پاش ئێوەش سەرجەم ژنان بێنە سەرم، جا هەموو منداڵ و زارۆکان.

ئەبووبەکررضي الله عنه فەرمووی: کێ لە نێو گۆڕ بتنێژێ؟ فەرمووی: هەرکەس لە خزم و کەسەکانم بوون، بەپێی نزیکی، لەگەڵ کۆمەڵێکی زۆر لە فریشتەکان کە ئێوە نایان بینن، بەڵام ئەوان ئێوە دەبینن. جا ئێستا هەستن و لە زمانی منەوە سڵاوم بگەیەنن بە تەواوی ئەو کەسانە کە بە شوێن مندا لێرە بە دواوە دێن[1].

حەزرەتی عائیشەرضي الله عنها فەرموویەتی: «ئەو ڕۆژە کە پێغەمبەرﷺ کۆچی دوایی کرد، سەر لە بەیانەکەی سەحابەکان لەبەر ئەوەی دیتیان حاڵی پێغەمبەرﷺ چاك بووەتەوە و ڕوو بە چاکە دەڕوات، بڵاوەیان کرد و چوونەوە بۆ ماڵی خۆیان و سەر کار و کاسبیەکانیان و مزگێنی چابوونەوەی پێغەمبەریانﷺ دەدا. لەو کاتەدا بەس ژنان لە خزمەتی پێغەمبەرداﷺ بوون.

---

١. طبرانی فی الکبیر: ٢٦١٠، بزّار فی مسنده: ٢٠٢٨، طبرانی فی الأوسط: ٤١٤٣، بیهقی فی دلائل النبوّة: ٣١٧٥ بروایات مختلفة.

ئێمە لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ بووین و تا ئێستا هێندە شادمان و بە کەیف نەبووین (بە بۆنەی چاکبوونەوەی پێغەمبەرەوە). پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: با ئەم ژنانە بڕۆنە دەرەوە ئەو فریشتە هاتووە داوای هاتنەژوورەوە دەکات. خێرا ژنان پاکیان چوونە دەرەوە، جگە لە من نەبێ کە سەری پێغەمبەر ﷺ لە کۆشم دا بوو. پێغەمبەر ﷺ ڕاست بووەوە و دانیشت و ڕووی لە سووچی ماڵەکە کرد و لەگەڵ ئەو فریشتەدا زۆرێ گفت و گۆیان کرد.

پاشان هەڵگەڕایەوە و سەری هێنایەوە کۆشم و فەرمووی: با ئەو ژنانە بێنەوە ژوور.

منیش گوتم: وەها هەستم نەکرد کە ئەم فریشتەیە جوبرەئیل عَلَيْهِ السَّلَامُ بێ؟

فەرمووی: بەڵێ ڕاست دەکەی ئەی عائیشە! ئەمە «قابض» بوو، هاتبوو و دەیگوت: ئەی پێغەمبەری خودا! خودای گەورە ڕایسپاردووم و فەرمانی پێ داوم کە نەیێمە خزمەتت مەگەر بە ئیزنی خۆت، جا ئێستا ئەگەر ئیزنم نەدەیت دەگەڕێمەوە، ئەگەریش ئیجازەت ببێت دێمە ناوەوە، هەروەها خوداوەند فەرمانی پێ داوم تا جەنابت ئیزنم نەدەیت گیانت نەکێشم، ئێستا چی دەفەرمی؟

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: لێم گەڕێ تا جوبرەئیل لە ساعەتە تایبەتیەکەی خۆیدا دێت، ئەم ساعەتە ساعەتی جوبرەئیلە.

حەزرەتی عائیشە رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا دەفەرمێ: پێغەمبەر ﷺ ئێمەی لەگەڵ کارەساتێ ڕووبەڕوو کردەوە، کە هیچ وڵامێکمان بۆی نەبوو و هیچمان لێ نەئەخێزیا، هێندە ئەم کارەساتە دڵتەزێن بوو ئەڵێی: وەها لێ دابووین کە کاس بووین و کەسمان نقی لێوە نەدەهات.

حەزرەتی عائیشە رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا دەفەرمێ: جوبرەئیل عَلَيْهِ السَّلَامُ لە سەعاتە دیاری کراوەکەی خۆیدا تەشریفی هێنا و فەرمووی: خودای گەورە سڵاوی دەگەیاندی و دەیفەرموو: حاڵت چلۆنە؟ وێڕای ئەوەی خودای گەورە لە خۆمان بە حاڵمان ئاگادارترە، بەڵام دەیەوێ عیززەت و مەزنی تۆ پتر بکات و حەقی ڕێز و ئیحتیرام لەسەر تۆ تەواو بکات و بە خەڵکی بسەلمێنێ و پیشانی خەڵك بدات و ببێتە ڕەوشتێ لەنێو ئوممەتەکەتدا.

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: هەست بە ئێش دەکەم. فەرمووی: مزگێنی دەدەم کە خوای گەورە ئەیەوێ ئەوەی کە بەڵێنی پێ داوی پێشکەشت بکات.

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەی جوبرەئیل! «قابض» هاتبوو و ئیزنی گیان کێشانی لێ داوا دەکردم ـ ئەو باس و خواستانەی کە پێکەوە بوویان باسی کرد بۆ جوبرەئیل ـ.

جوبرەئیل عَلَيْهِ السَّلَامُ فەرمووی: ئەی موحەممەد! خودا تامەزرۆی دیداری تۆیە، مەگەر من پێتم ڕانەگەیاندووە خودا چی بۆت ویستووە؟. بەڵێ ڕاستە پەری مەرگ تا ئێستا ئیزنی لەکەس نەخواستووە و قەتیش ناخوازێ، بەڵام هێندەی هەیە کە خودا ویستوویە ئەم ڕێزە تایبەتیە لە تۆ بگرێ و زۆر بە تاسەی دیداری تۆیە.

پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فەرمووی: کەواتە لێرە مەجووڵە تا "قابض» دێت.

پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ئیزنی دا ژنان بێنە ماڵەوەو فەرمووی: ئەی فاتمە لێم نزیك بەرەوە.

حەزرەتی فاتمەش رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا سەری خستە سەر ڕوومەتی پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ و پێغەمبەریش بە ئارامی لەگەڵی قسەی دەکرد. فاتمە رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا سەری بەرز کردەوە و چاوەکانی پڕ بوون لە ئەسرین و گوڕی قسەکردنی نەمابوو. پاشان پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فەرمووی: وەرە سەرت لێم نزیك بخەرەوە، دیسان فاتمە رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا سەری بردەوە لای ڕوخساری پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ و ئەویش بە سرتە قسەیێکی بۆ کرد و سەری بەرز کردەوە و گەشە و پێکەنینی لێ دەباری و لە خۆشیدا نەیدەتوانی قسە بکات.

ئەم ڕووداوە سەرسامی کردین و پاشان پرسیارمان لە فاتمە رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا کرد. ئەویش فەرمووی: پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ سەرەتا پێی ڕاگەیاندم کە ئەورۆ فەوت دەکات، ئەمنیش خۆم پێ ڕانەگیرا و دەستم بەگریان کرد، پاشان پێی فەرمووم: ئەمن داوام لەخودا کردووە کە لە ناو خزمەکانما هەووەڵین کەس تۆ بخاتە گەڵم و بە منت بگەیێنێ. ئەمنیش لە خۆشیان دەستم بە پێکەنین کرد.

فەرمووی: پاشان عیزرائیل هات و سەلامی کرد و ئیزنی خواست و پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ئیزنی پێ دا و ئەویش هاتە ناو و گوتی: ئەی موحەممەد! چی دەفەرمووی؟

ئەویش فەرمووی: بەخوام بگەیێنە هەر ئێستا.

فەرمووی: بە سەرچاو، هەر ئەمڕۆ، خوداوەندیش زۆر تامەزرۆی تۆیە و بۆ کەسیش ئەم هاتوچووەی منی ئیزن نەداوە جگە تۆ نەبێ و تا ئێستا بەری نەگرتووم لەوەی گیانی کەسێ بکێشم بەخواستی ئەو کەسە، جگە تۆ نەبێ. بەڵام تۆ ساعەت و کاتەکەت لەدەستی خۆتدا بوو. ئەمەی گوت و چووە دەر.

حەزرەتی عائیشە رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا دەفەرمێ: جوبرەئیل عَلَيْهِ السَّلَامُ هاتەپێش و فەرمووی: «سڵاوت لەسەر ئەی پێغەمبەری خودا! ئەمە دوایین سەردانی منە بۆ زەمین. وەحی پێچراوەتەوە تا ئەو ڕۆژەی

دونیا دەپێچرێتەوە ئەمن لە زەمیندا جگە لە تۆ نەبێ هیچ ئەرکێکم بەسەرەوە نەبووە و تەنیا بۆ خزمەتی تۆ هاتووم و ئیدی ئێستاکەش کارێکم بەدەستەوە نەماوە.

سوێند بەو کەسەی کە موحەممەدی بە حەق ناردووە، هێندە ئەو قسانە کە دەبیستران قورس و گەورە بوون و ئێمە کاس و وڕبووین، کەس نەیدەتوانی یەك وشە وڵام بداتەوە، یان بنێرێ بە دووی پیاوەکاندا بێن بۆ ئەوێ.

حەزرەتی عائیشەرَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا دەفەرمێ: هەستام و چوومە خزمەتی پێغەمبەرصَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ تا سەری بنێم بە سنگمەوە و لە ئامێزی بگرم. وردە وردە خەریك بوو لەسەر خۆی ئەچوو و زۆری بۆ دەهات و تەوێڵی عارەقی لێوە دەتکا، عارەقێ کە تا ئێستا کەسم نەدیتووە هێندە بۆنی خۆش بێ. عارەقەکەیم دەسڕی و قەت عارەقی ئاوەها بۆنخۆشم نەدیتبوو. تۆزێکی پێ چوو هاتەوە بەخۆیدا پێم گوت: دایك و بابم و ماڵ و منداڵم بە قوربانت چییە وا هێندە تەوێڵت عارەقی کردووە و ئاوی لێ دەڕژێ؟

فەرمووی: ئەی عائیشە! گیانی مرۆڤی ئیماندار بە تکانی عارەق لە تەوێلیەوە دەردەچێ بەڵام گیانی کافر و ناحەز وەك گیانی گوێدرێژ لە دەمیەوە دەردەچێ.

لەم کاتەدا ترس و خۆف هەموولەشمانی داگرت و ناردمان بە شوێن خزم و کەسەکانماندا، هەوەڵین پیاوێ کە هاتە لامان ـ لەگەڵ ئەوەشدا کە بە خزمەتی پێغەمبەرصَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نەگەیشت ـ براکەم بوو کە باوکم (ئەبووبەکر) بۆ هەواڵ بۆلای منی ناردبوو.

پێغەمبەرصَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فەوتی فەرموو، پێش ئەوەی کەس بێ بۆلامان، بەڵکوو خودا خۆی بەری خەڵکی گرتبوو، چونکە جوبریل و میکائیل بە دەمیەوە بوون. پێغەمبەرصَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لەو کاتەدا کە خەریك بوو گیانی پاکی تەسلیم دەکرد، دەیفەرموو: «بَلِ الرَّفِيقُ الْأَعْلَىٰ».

حەزرەتی عائیشەرَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا دەفەرمێ: پێغەمبەرصَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ڕۆژی دووشەممە، کاتی بەرزبوونەوەی خۆر بۆ نێوەڕاستی ئاسمان و بەنیوەڕۆ گەیشتنی ڕۆژ، فەوتی فەرموو[1].

صَلَوٰاتُ اللهِ عَلَيْهِ وَ عَلَىٰ آلِهِ وَ أَصْحٰابِهِ وَ التّٰابِعِينَ أَجْمَعِينَ

---

١. ابن‌کثیر فی السّیرة النّبویّة: ٤٧٨/٤، طبرانی فی الکبیر: ٢٦١٠ ـ ٢٨٢١ بطوله مع زیادات و نواقصات، بیهقی فی دلائل النّبوّة: ٣١٤٥ ـ ٣٢٥٠، و قد جاءت أجزاء کبیرة من حدیث وفاة النّبیّصَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فی أحادیث صحیحة فی الکتب الصّحاح و السّیرة النّبویّة، فلیراجع.

## کۆچی دوایی ئەبووبەکری سیددیق رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ

لەسەرە مەرگی حەزرەتی ئەبووبەکردا رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ حەزرەتی عائیشە رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا ئەم تاقە بەیتەی بە سەردا خوێندەوە:

«لَعَمْرُكَ مٰا يُغْنِي الثَّرٰاءُ عَـــنِ الْفَتَىٰ إِذٰا حَشْرَجَتْ يَوْماً وَ ضٰاقَ بِهَا الصَّدْرُ»

واتە: «بەگیانت قەسەم کاتێ کە مرۆڤ هەناسە لە سینگیدا بە تەنگ بێت و لرخە لرخی پێ بکەوێ، هیچ ماڵ و دارایی لە مەرگ ناپارێزێ».

ئەبووبەکر رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ ئەمەی کە بیست چاوی بەرز کردەوە و فەرمووی: هیچی وا نییە، بەڵکوو بڵێ: «وَ جٰاءَتْ سَكْرَةُ الْمَوْتِ بِالْحَقِّ ذٰلِكَ مٰا كُنْتَ مِنْهُ تَحِيدُ»[1] واتە: «بەڕاستی کارەساتی مەرگ گەیشتە بەرەوە، ئەمەش ئەو شتە بوو کە تۆ لە دەستی هەڵدەهاتی»[2]

سەیر کەن، ئەم دوو قاتە لیباسەم ببەن پاك بیانشۆرن و لە نێو هەردووکیاندا کەفەنم بکەن، چونکە زیندوو لە مردوو نیازی بە تازە زۆرترە.

حەزرەتی عائیشە رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا لە کاتی مەرگیدا فەرمووی:

«وَ أَبْيَضُ يَسْتَسْقِي الْغَمٰامُ بِوَجْهِهِ رَبِيعُ الْيَتٰامَىٰ، عِصْمَةٌ لِلْأَرٰامِــلِ»

واتە: « (ئەبووبەکر) کەسێکی سپی و نوورانی بوو کە هەور لە ڕوخساری ئەو داوای بارانی دەکرد، ئەو بەهاری هەتیوان و پەناو پارێزەری بێوەژنان بوو».

ئەبووبەکر رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ فەرمووی: نە من ئەوە نیم، بەڵکوو ئەوە پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بوو[3].

خزم و خێڵان هاتنەسەر ئەبووبەکر رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ و گوتیان: حەکیمێك بانگ بکەین بێتە خزمەتت؟

فەرمووی: حەکیم پێشتر هاتووە و گوتوویە: هەرچی کە بتوانم ئەنجامی دەدەم[4].

سەلمان هاتە خزمەتی و فەرمووی ئەی ئەبابەکر! ئامۆژگاریمان بکە. فەرمووی: خودای گەورە دونیای ئاوەڵا کردووە بۆتان، ئێوە وشیار بن بەس بەشەکەی خۆتان وەرگرن. هەرکەس

---

١. ق: ١٩.

٢. طبقات الکبری لابن‌سعد: ١٩٦/٣، احمد بن‌حنبل فی الزّهد: ٥٧٠ بلفظ: «أَعٰاذِلُ مٰا يُغْنِي الْحِذٰارَ عَنِ الْفَتَىٰ ...»، معرفة الصّحابة لأبی‌نعیم الأصبهانی: ٩٦.

٣. احمد: ٢٦، ابن‌ابی‌شیبه فی مصنفه: ١٨١/٦، بزّار فی مسنده: ٥٨.

٤. ابن‌ابی‌شیبه فی مصنّفه: ١٤٦/٨، ابونعیم الأصبانی فی معرفة الصّحابة: ٩٢.

نوێژی سبەینان بخوێنێ لە گرەو و پەنای خودادایە، ئێوەش وریا بن پەیمان و پەیامی خودا بە سووك مەزانن، دەنا بە سەرەوە دەکەونە نێو ئاوری دۆزەخەوە[1].

کاتێ حەزرەتی ئەبووبەکرﷺ نەخۆشییەکەی زۆری بۆ هێنا، خەڵك داوایان لێ کرد کەسێك بکاتە جێگری خۆی، ئەویش حەزرەتی عومەریﷺ کردە جێنشینی خۆی.

خەڵك گوتیان: کەسێکی دڵڕەق و توندت کردە جێنشینی خۆت، وڵامی خودا چ دەدەیتەوە؟

فەرمووی: ئەڵێم: خودایە! ئەمن چاکترین مەخلوقی تۆم کردە جێگری خۆم[2].

رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، آمین!

## کۆچی دوایی عومەری فارووقﷺ

عەمری کوڕی مەیموون دەگێڕێتەوە: ئەمن ئەو بەیانیە کە حەزرەتی عومەرﷺ برینـدار کرا لە پەنایدا ڕاوەستا بووم، بێجگە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسﷺ نەبێ کەسی‌تر لە نێوانماندا نەبوو. عومەرﷺ لە نێوان سەفەکانەوە دەگەڕا، ئەگەر بۆشاییێکی بدیبا، دەیفەرموو: پڕی بکەنەوە و ڕێك بووەستن، کاتێ کە هیچ ناڕێکی نەدیبا، ئەو کات ئەچووە پێشەوە و ئەڵڵاهو ئەکبەری ئەکرد. زۆر جار سوورەتی یووسف، یان نەحل، یان غەیری ئەو دوانەی [پاش ئەلحەمد] لە ڕەکعەتی هەوەڵدا ئەخوێند، تا خەڵك کۆ ببنەوە. ئەو ڕۆژە هەر ئەڵڵاهو ئەکبەری گوت، خێرا بیستم فەرمووی: ئەو سەگە کوشتمی، یان خواردمی، ئەمە لە کاتێکدا بوو کە ئەبوولوءلوء زەرپەتی پێ گەیاندبوو، ئەو کافرە بە خنجەرێ دووسەر، بە چەپ و ڕاست نیشتبووە نێو سەفەکان و بە هەرکەس ئەگەیشت لێی دەدا، تا سێزدە کەسی بریندار کرد، کە نۆیان، یان حەوتیان فەوتیان کرد.

کاتێ یەکێ لە موسوڵمانەکان ئەم کافرە پیسەی چاوپێکەوت پشتەماڵەکەی خستە ملی و گرتی، ئەویش وەختارێ زانی دەرچوونی نابێ، خۆی کوشت[3].

هەروەها دەگێڕنەوە [حەزرەتی عومەرﷺ پاش برینداربوونەکەی] عەبدوڵڵای کوڕی ناردە خزمەتی حەزرەتی عائیشەﷺ و پێی فەرموو: کە عەرزی بکات: کە عومەر ـ نەڵێ

١. بیهقی فی شعب الإیمان: ١٠١١٤، احمد بن‌حنبل فی الزّهد: ٥٧٨.

٢. ابن‌ابی‌شیبه فی مصنفه: ٥٧٤/٨.

٣. بخاری: ٣٤٢٤.

ئەمیرولمؤمنین، چونکە ئەورۆ من ئەمیرولمؤمنین نیم ـ سڵاوت دەگەیەنێ و ئیزنت لێ دەخوازێت کە بهێڵی لە پەنای دوو هاوەڵەکەیدا ئەسپەردە بکرێ. عەبدوڵڵایش ڕۆیشت و سڵاوی کرد و داوای کرد کە بڕواتە ماڵەوە پاشان چووە خزمەتی عائیشە و دیتی دانیشتووە و خەریکە دەگری. ئەمیش پێی گوت: عومەری کوڕی خەتتاب سڵاوت عەرز دەکات و خوازیاری ئیزنی ئێوەیە کە بهێڵن لە پەنای دوو هاوەڵەکەیدا ئەسپەردە بکرێ. عائیشەش فەرمووی: ئەمن بۆ خۆمم ئەویست، بەڵام ئەورۆ ئەو وەپێشی خۆم دەخەم و بۆ ئەو بە باشتری ئەزانم تا خۆم.

کاتێ گەڕایەوە و ڕووی کردە بابی، گوتیان: ئەوە عەبدوڵڵاه هاتەوە، حەزرەتی عومەریش فەرمووی: هەڵم سێنن، پیاوێك ڕاستی کردەوە، پاشان فەرمووی: چیت پێیە؟

گوتی: هەر ئەوەی وا جەنابت حەزی لێ دەکەی، ئەی ئەمیرەلموئمنین! ئیزنی فەرموو.

حەزرەتی عومەرﷺ فەرمووی: سپاس بۆ خودا، هیچ شتێ هێندە بەلامەوە گیرنگ نەبوو. جا ئێستا، هەرکاتێ مردم هەڵم‌گرن و بۆ خزمەتی عائیشەم ببەن، سڵاوی لێ بکەن و بڵێن: عومەر داوای ئیزنت لێ دەکات کە لە پەنای دووهاوەڵەکەیدا ئەسپەردە بکرێ. جا ئەگەر، ئیزنی دا بمبەنە ناو، ئەگەریش نەیهێشت بمگەڕێننەوە بۆ گۆڕستانی گشتی موسوڵمانان[1].

لەم کاتەدا دایکی ئیمانداران حەفسەرضي الله عنها هات و ژنان ئاپۆرەیان بە دەوریدا دابوو، کاتێ کە دیتمان هەستاین و ئەو هاتە سەرینی باوکی و نزیکەی سەعاتێك گریا، پاشان پیاوەکان داوایان کرد بێنە ناو، پاشان هاتنە ناو و لە ناوەوە دەنگی گریانی حەفسەیان دەبیست. وتیان: ئەی ئەمیرەلموئمنین وەسیەت بکە و کەسێك بکە جێگری خۆت. فەرمووی: من بۆ ئەم شوێنە کەسێك شیاوتر لەو کەسانە کە پێغەمبەرﷺ فەوتی فەرموو و لەوان ڕازی بوو، شك نابەم، پاشان ناوی عەلی و عوسمان و زوبەیر و تەلحە و سەعد و عەبدوڕڕەحمانی هێناو هەروەها فەرمووی: عەبدوڵڵای کوڕیشم بێتە نێو کۆڕەکەتانەوە، بەڵام هیچ مافێکی نەبێ[2].

لە ریوایەتدا هاتووە کە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «قَالَ لِي جِبْرِيلُ لِيَبْكِ الْإِسْلَامُ عَلَىٰ مَوْتِ عُمَرَ»[3]، واتە: «با ئیسلام بۆ مەرگی عومەر بگری».

---

١. بخاري: ٣٤٢٤ ـ ١٣٠٥. ٢. بخاري: ٣٤٢٤.

٣. طبراني في الكبير: ٥٩، ابن‌ابي‌عاصم في الآحاد والمثاني: ٩٦، سيوطي في الجامع الكبير: ١٨٣ و في الفتح الكبير: ٨٣٨٩، حرف القاف.

## کۆچی دوایی عوسمانی کوڕی عەففان رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ

قسە و باسی شەهید بوونی حەزرەتی عوسمان رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ مەشهوورە، عەبدوڵڵای کوڕی سەلام رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ ئەڵێت: ئەو کاتە کە ماڵی عوسمانیان گەمارۆ دابوو، من چوومە خزمەتی، فەرمووی: سڵاو براکەم، خۆش هاتی، دوێنێ شەو پێغەمبەرم صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لەنێو ئەم ڕۆچنەوە دیت ـ ئەو ڕۆچنەش تایبەت بەو ماڵە بووکە تێدا بوو ـ فەرمووی: ئابڵۆقەیان داوی ئەی عوسمان! گوتم: بەڵێ، فەرمووی: تینووتیان کردووە؟ گوتم: بەڵێ، دەستی برد دۆڵچەیێکی ئاوی کێشایە خوارەوە، منیش لێم خواردەوە تا تێرم خواردەوە، تەنانەت ئێستاش هەست بە ساردییەکەی لەنێو دوو مەمکەم و دوو شانمدا دەکەم.

پاشان فەرمووی: ئەگەر حەز دەکەی ڕزگارت دەکەم و بە سەریاندا سەرت ئەخەم، ئەگەریش حەز دەکەی لەلای ئێمە بەربانگ دەکەیتەوە (واتە: شەهید ئەبی) ئەوا منیش ئەوەم هەڵبژارد لە خزمەتی ئەودا بەربانگ بکەمەوە. ئەدی هەر ئەو ڕۆژە حەزرەتی عوسمان رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ شەهید کرا[1].

عەبدوڵڵای کوڕی سەلام رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ بەو کەسانە کە لەو کاتەدا حەزرەتی عوسمان رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ بریندار بوو و غەڵتانی خوێن بوو، لەوێ ئامادە بوون، پرسیبووی کە عوسمان چی دەگوت؟ ئەوانیش گوتووبوویان کە سێ جار فەرموو بووی: «اَللّٰهُمَّ اجْمَعْ أُمَّةَ مُحَمَّدٍ» واتە: «خودایە! ئوممەتی موحەممەد یەك بخەرەوە». ئەدی سوێند بەو کەسە کە گیانم بە دەستیەتی، ئەگەر داوای بکردایە کە خودا! هیچ‌کات ئەم ئوممەتە یەك نەگرن، ئەوە تا ڕۆژی قیامەت یەکیان نەدەگرت[2].

## کۆچی دوایی حەزرەتی عەلی رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ

حەنزەلی گوتوویە: ئەو شەوەی کە حەزرەتی عەلی رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ بریندار کرا، ئیبنو تەیاح لەکازیوەدا هاتە سەری و بانگی لێ کرد بۆ نوێژ، کەچی ئەو ڕاکشا بوو و لەشی قورس و گۆت بووبوو، جاری دووهەم هاتەوە و بانگی لێ کرد، دیسان هەر بە لەش‌قورسی و داگیراوی ڕاکشابوو، جاری سێهەم هاتەوە سەری و ئەمجار هەستا و تەشریفی برد و ئەم بەیتانەی دەفەرموو:

---

١. البدایة و النّهایة لابن‌کثیر: ٢٠٤/٧، الرّیاض النّضرة لمحبّ الطّبری: ٢٢٦/١، تاریخ دمشق لابن‌عساکر فی ذکر عثمان بن عفان.

٢. الرّیاض النّضرة فی مناقب العشرة المبشّرة لمحبّ الطّبری: ٢٢٨/١، تاریخ دمشق لابن‌عساکر فی ذکر عثمان بن عفان.

«أَشْدِدْ حَيَازِمَكَ لِلْمَوْ تِ فَإِنَّ الْمَـوْتَ لاقِيكَا
وَلا تَجْزَعْ مِـــنَ الْمَوْ تِ إِذَا حَـلَّ بِوَادِيكَا»[1]

واتە: «پشتوێنەکەت توند ببەستە بۆ مەرگ، بێشك مەرگ تووشیارت دێ».
«هەرکاتێ مەرگ هاتە شیوەکەتان، غەم مەخۆ و مەترسە».

کاتێ کە حەزرەتی عەلیرَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ گەیشتە ناو دەرکە چووکەکەی مزگەوت، ئیبنو مولجەم شمشێرێکی لێ دا و بریندار کرد. خێرا ئوموکولسووم کچی حەزرەتی عەلیرَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ لە ماڵ هاتە دەر و بانگی هەڵدا و گوتی: چی لێهاتووە ئەم نوێژی سبەینانە کە هەم شووەکەم ئەمیرولموئمنین (حەزرەتی عومەررَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) لەم کاتەدا شەهید کرا، هەم باوکم؟![2]

یەکێ لە پیرانی قورەیش دەگێڕێتەوە کە کاتێ کە حەزرەتی عەلیرَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ بە دەستی ئیبنوو مولجەم بریندار کرا، فەرمووی: «فُزْتُ وَ رَبِّ الْكَعْبَةِ»[3] واتە: «سوێند بە پەروەردگاری کەعبە، ڕزگارم بووم».

## بەشی پێنجەم: وتەی چەند کەسایەتییێك لەسەرەمەرگدا

موعاویەی کوڕی ئەبوو سوفیانرَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ لە سەرەمەرگدا گوتی بەوانەی کە لە دەوروبەریدا بوون: دامبنیشێنن، ئەوانیش دایاننیشاند، دەستی بە زیکر و یادی خودای گەورە کرد، پاشان دەستی کرد بە گریان و گوتی: ئەرێ پاش پیری و پەککەوتنت، خەریکی زیکری خودا دەکەیت؟! ئەشیا ئەمەت لە کاتێکدا بکردایە کە لق و پۆپی لاویت هێشتا تەڕ بوو. هێندە گریا تا دەنگی بەرز بووەوە و دەبیسترا. دەیگوت: ئەی پەروەردگارم! بەزەییت بەم پیرە گونەهبارە، دڵڕەقەدا بێتەوە. خودایە! هەڵەو گوناحانم کەم بکەرەوەو لێیان خۆش ببە، بە سەبر و تاقەتی خۆت لەگەڵ کەسێکدا کە هیچ پەنایێکی نییە، جگە تۆ نەبێ و بە کەس باوەڕی نییە جگە تۆ نەبێ، بجووڵەرەوە[4].

---

١. تاریخ دمشق لابنعساکر فی ذکر علیّ بن ابیطالب.
٢. البدایة والنّهایة لابنکثیر: ١٤/٨، تاریخ دمشق لابنعساکر فی ذکر علیّ بن ابیطالب.
٣. اسد الغابة لابنالأثیر: ٣٠٥/٢، تاریخ دمشق لابنعساکر فی ذکر علیّ بن ابیطالب.
٤. السّیرة الحلبیّة لعلیّ بن برهان الدین الحلبی: ٢٩٨/٣.

**مەعازی کوڕی جەبەل لە سەرەمەرگدا گوتوویە:**

خودایە! ئەمن پێشتر لە تۆ دەترسام، بەڵام ئەمرۆ هیوام پێتە.

خودایە! خۆ تۆ ئاگات هەیە کە دونیاو تەمەندرێژیم بۆ ئەوە خۆش نەویستووە تاکوو جۆگە بخەمەڕێ و دار دابنێژم (واتە: خۆش ڕابوێرم)، بەڵکوو بۆ ئەوە خۆشم ویستووە تا تینوویەتی گەرمای سەخت بکێشم و لە تەنگی و سەختییەکاندا ڕەنج بکێشم و هاوڕێی قافڵەی زانایان بکەم[1].

بە زەننوونیان رَحِمَهُ اللَّهُ گوت: حەز لەچی دەکەی؟ فەرمووی: حەز دەکەم پێش مەرگم بۆ یەك ساتیش بووە خودا بناسم.

## بەشی شەشەم: گۆڕ و بۆچوونی گەورەکان سەبارەت بە گۆڕ

زەححاك دەگێڕێتەوە کە لە پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ پرسیاریان کرد: کێ خۆپارێزترین کەسە؟

فەرمووی: «مَنْ لَمْ يَنْسَ الْقَبْرَ وَ الْبَلَىٰ، وَ تَرَكَ فَضْلَ زِينَةِ الدُّنْيٰا، وَ آثَرَ مٰا يَبْقَىٰ عَلَىٰ مٰا يُغْنَىٰ، وَ لَمْ يَعُدَّ غَداً مِنْ أَيّٰامِهِ، وَعَدَّ نَفْسَهُ مِنْ أَهْلِ الْقُبُورِ»[2].

واتە: «هەرکەس کە گۆڕ و پرتووکانی ناوگۆڕی لەبیر نەچێ، ئیش و کاری زیادەی دونیا تەرك بکات، ئەوەی کە هەر دەمێنێتەوە لەوەی کە لەناو دەچێ خۆشتر بوێ، سبەی لە ڕۆژی خۆی نەژمێرێ، خۆی بە ئەهلی ناو گۆڕ بژمێرێ».

حەسەنی کوڕی ساڵح چووە لێو گۆڕستانێکەوە و فەرمووی: ڕواڵەتت چەندە جوانە! کەچی ناو دڵت کارەسات و بەڵایە.

داوودی تایی لە پاڵ پیرەژنێکەوە تێپەڕی کە لەسەر گۆڕێ دانیشتبوو و دەگریا و ئەم بەیتانەی ورتە دەکرد:

«عَـــدِمْتَ الْحَيٰاةَ، فَلا نِلْتَهٰا إِذٰا أَنْتَ فِي الْقَبْرِ قَدْ أَلْحَدُوكَ»

«فَـــكَيْفَ أَذُوقُ لِطَعْمِ الْكَرَىٰ وَ أَنْتَ بِيَمْنٰاكَ قَدْ وَسَّدُوكَ»[3]

---

١. اسد الغابة لابن‌الأثير: ٢١/٣، تاريخ دمشق لابن‌عساكر في ذكر معاذ بن‌جبل.

٢. ابن‌ابی‌شيبه فی مصنّفه: ١٢٧/٨، بيهقی فی شعب الإيمان: ١٠٠٨١ بألفاظ مختلفة.

٣. المجالسة و جواهرالعلم لأبی‌بكر احمدبن‌مروان الدّينوری المالكی: ٣٤٤٨.

واتە: «ئەتۆ ژیانت لەدەست دەرچوو و پێی نەگەیشتی، وەختارێ لەنێو گۆڕدا ئەسپەردەتیان کرد».

«ئەدی من چلۆن تامی خەو بچێژم لە کاتێکدا کە دەستی ڕاستیان کردووە بە سەرین بۆت».

پاشان ئەو پیرەژنە گوتی: خۆزگە بابەگیان! دەمزانی کرم و مۆر لە پێشدا کام کوڵمیان خواردی؟!

داوودی تایی، کە ئەمەی بیست لەجێی خۆی وشك بوو و لەسەر خۆی چوو.

## بەشی حەوتەم: ڕەوشتی دینی لەکاتی مەرگی منداڵ و خۆشەویستان

هەرکاتێ منداڵەکەت، یان خزم و خۆشەویستانت مردن، وای دابنێ کە پێشتر لەتۆ بۆ سەفەرێ ڕێکەوتووە کە تۆش پێویستە بە دوویدا بڕۆی، یان وای دابنێ پێشتر لە تۆ بۆ زێدەکەی گەڕاوەتەوە و تۆش بەمزوانە بۆ ئەوێ دەگەڕێیتەوە. جا ئەگەر باوەڕت وەها بێ کە تۆش بەمزوانە بە ئەوێ دەگەیت، مەرگ و نەمان بۆت سەخت نییە.

پێغەمبەرﷺ دەفەرمێ: «لَأَنْ أُقَدِّمَ سِقْطاً أَحَبُّ إِلَيَّ مِنْ أَنْ أَخْلِفَ مِائَةَ فَارِسٍ كُلُّهُمْ يُقَاتِلُ فِي سَبِيلِ اللّٰهِ»[1].

واتە: «ئەگەر پێش ئەوە بمرم منداڵێکم لەبار بچێ و سەقەت بێ، پێم خۆشترە لەوەی کە سەد کوڕی سوارچاکم هەبێت و گشتیان لەڕێ خودا شەڕ بکەن»[2].

## بەشی هەشتەم: سەردانی گۆڕ

سوننەتە جارجار زیارەت و سەردانی گۆڕ بکرێ. چونکە دەگێڕنەوە کە «نَهَىٰ رَسُولُ اللّٰهِ ﷺ عَنْ زِيٰارَةِ الْقُبُورِ، ثُمَّ أَمَرَ بِزِيٰارَتِهٰا»[3].

---

١. ابن‌ماجه: ١٥٩٦، ابن‌ابی‌شیبه فی مصنفه: ٢٣٤/٣، جامع الکبیر للسیوطی: ١٦٢، حرف اللام جمیعهم بلفظ: «لَسِقْطٌ أُقَدِّمُهُ بَيْنَ يَدَيَّ أَحَبُّ إِلَيَّ مِنْ فٰارِسٍ أُخَلِّفُهُ خَلْفِي».

٢. لە ئیحیاوە نەقڵمان کردووە ـ وەرگێڕ.

٣. حاکم فی المستدرك: ١٣٤١ و بیهقی فی السّنن الکبری: ٧٨/٤ بهذا اللّفظ. و فی لفظ آخر: «كُنْتُ نَهَيْتُكُمْ عَنْ زِيٰارَةِ الْقُبُورِ... فَزُورُوهٰا فَإِنَّهٰا تُذَكِّرُكُمُ الْآخِرَةَ» ترمذی: ٩٧٤، مسلم: ٣٦٥١، نسائی: ٢٠٠٦ ـ ٤٣٥٣ ـ ٤٣٥٤ ـ ٥٥٥٧ ـ ٥٥٥٨ ـ ٥٥٥٩، ابن‌ماجه: ١٥٦٠، احمد: ١١٧٣ ـ ١٣٠٠٠ ـ ٢١٩٣٨ ـ ٢١٩٧٤ ـ ٢١٩٢٥ ـ ٢١٩٢٧ جمیعهم بألفاظ و روایات مختلفة.

واتە: «پێغەمبەری خوداصَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نەهی لە سەردانی گۆڕ کردبوو، پاشان دەستووری بە زیارەتکردنی دا».

ئەبووزەڕرَضِيَ اللهُ عَنْهُ دەڵێ: کە پێغەمبەرصَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فەرموویەتی: «زُرِ الْقُبُورَ تَذْكُرْ بِهَا الْآخِرَةِ وَاغْسِلِ الْمَوْتَى، فَإِنَّ مُعَالَجَةَ جَسَدٍ خَاوٍ مَوْعِظَةٌ بَلِيغَةٌ. صَلِّ عَلَى الْجَنَائِزِ لَعَلَّ ذٰلِكَ أَنْ يَحْزُنَكَ، فَإِنَّ الْحَزِينَ فِي ظِلِّ اللهِ تَعَالَى»[1].

واتە: «سەردانی قەبران بکە، بیری دواڕۆژ دەکەویتەوە، مردوان بشۆرە، چونکە بارە و بارکردنی جەستەیێکی بێگیان و دامرکاو، ئامۆژگارییێکی هەرە گەورەی تێدایە. نوێژ بەسەر تەرمەوە بخوێنە، بەڵکوو ئەوە دڵپڕت کا، چونکە مرۆڤی دڵپڕ لە ژێر سێبەری خودای گەورەدایە».

پێغەمبەرصَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فەرموویەتی: «زُورُوا مَوْتَاكُمْ وَ سَلِّمُوا عَلَيْهِمْ، فَإِنَّ لَكُمْ فِيهَا عِبْرَةٌ»[2]

واتە: «سەردانی مردوانتان بکەن و سەلامیان لێ بکەن، چونکە ئامۆژگاری و پەندی تێدایە بۆتان».

## بەشی نۆهەم: حەقێقەتی مەرگ و بەسەرهاتی ناوگۆڕ

### [یەکەم:] حەقێقەتی مەرگ

بزانە حەقێقەتی مەرگ بەپێی ئایەت و حەدیسەکان و بەپێی عەقڵ، بریتییە لە دەرچوونی ڕۆح لە جەستە، نەك لە نەمان و لە لەناوچوونی هەتاهەتایی ڕۆح.

بەڵگەی قورئانی: خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَلَا تَحْسَبَنَّ الَّذِينَ قُتِلُوا فِي سَبِيلِ اللهِ أَمْوَاتاً بَلْ أَحْيَاءٌ عِنْدَ رَبِّهِمْ يُرْزَقُونَ فَرِحِينَ ...﴾[3]

واتە: «وەها گومان مەبەن ئەوانەی کە لەڕێی خودادا کوژراون، مردوون، بەڵکوو ئەوان زیندوون و لەلای خودادان و بژیویان پێ دەدرێ و شادن ...».

ئەم ئایەت و حاڵەتە بۆ شەهیدانە.

---

١. حاكم فى المستدرك: ١٣٤٤ ـ ٨٠٥٩، بيهقى فى شعب الإيمان: ٨٨٥١ و زادوا: «... فِي ظِلِّ اللهِ يَتَعَرَّضُ كُلَّ خَيْرٍ».

٢. عبدالرّزاق فى مصنّفه: ٦٧١٠، اخبار مكه للفاكهى: ٢٣٧١ بلفظ: «أْتُوا مَوْتَاكُمْ». جامع الكبير للسيوطى: ١٢٩٥٢، حرف الزّاء، طبرانى فى الأوسط: ٥٣٦٧ بلفظ: «أَلا فَزُورُوا إِخْوَانَكُمْ ...».

٣. آل‌عمران: ١٦٩.

بەڵام بۆ خراپەکاران و عاقیبەتشەڕان هەر ئەمە دیسان هەیە!

پێغەمبەرﷺ لە ڕۆژی جەنگی بەدردا کە سەران و سەرۆکانی قورەیش کوژرابوون، دەیفەرموو: «يٰا فُلانُ! يٰا فُلانُ! قَدْ وَجَدْتُ مٰا وَعَدِني رَبِّي حَقّاً، فَهَلْ وَجَدْتُمْ مٰا وَعَدَكُمْ رَبُّكُمْ حَقّاً؟» فَقِيلَ: يٰا رَسُولَ اللهِ أَتُنٰادِيهِمْ وَهُمْ أَمْوٰاتٌ؟! فَقٰالَﷺ: «وَ الَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ إِنَّهُمْ لَأَسْمَعُ لِهٰذَا الْكَلامِ مِنْكُمْ إِلّٰا أَنَّهُمْ لا يَقْدِرُونَ عَلَى الْجَوٰابِ»[1].

واتە: «ئەی فڵانە کەس! ئەی فیسارە کەس! من بە ڕاستی ئەوەی کە خودا بەڵێنی پێم دابوو پێی گەیشتم. ئاخۆ ئێوەش ئەوەی وا خودا بە حەق و ڕاستی بەڵێنی پێ دابوون، پێی گەیشتن؟» عەرزیان کرد: ئەی ڕەسووڵی خودا! ئەدی بانگیان لێ دەکەیت، وێڕای ئەوەی ئەوان مردوون؟! ئەویش فەرمووی: «سوێند بەو کەسەی کە ڕۆحم بەدەستیەتی، ئەوان چاکتر لە ئێوە ئەم قسانەم دەبیسن، بەس هێندەی هەیە ناتوانن وڵام بدەنەوە».

ئەبووئەیووبی ئەنساریرضي الله عنه لە پێغەمبەرەوەﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: «إِنَّ نَفْسَ الْمُؤْمِنِ إِذٰا قُبِضَتْ تَلَقّٰاهٰا أَهْلُ الرَّحْمَةِ مِنْ عِنْدِ اللهِ تَعٰالَىٰ كَمٰا يُتَلَقَّى الْبَشِيرُ فِي الدُّنْيٰا، يَقُولُونَ: أَنْظِرُوا أَخٰاكُمْ حَتَّىٰ يَسْتَرِيحَ، فَإِنَّهُ كٰانَ فِي كَرْبٍ شَدِيدٍ فَيَسْأَلُونَهُ مٰاذٰا فَعَلَ فُلانٌ، وَ مٰاذٰا فَعَلَتْ فُلانَةُ وَ هَلْ تَزَوَّجَتْ فُلانَةٌ؟ فَإِذٰا سَأَلُوهُ عَنْ رَجُلٍ مٰاتَ قَبْلَهُ وَ قٰالَ مٰاتَ قَبْلِي قٰالُوا: ﴿إِنّٰا لِلّٰهِ وَ إِنّٰا إِلَيْهِ رٰاجِعُونَ﴾ ذُهِبَ بِهِ إِلَى الْهٰاوِيَةِ»[2].

واتە: «کاتێ ڕۆحی ئادەمیزادێکی ئیماندار دەکێشری، بەختەوەران و ئەهلی ڕەحمەت لە لای خودای گەورەوە دێنە پێشەوازییەوە، هەر وەك چۆن کەسێ کە مزگێنیهێنەرە پێشوازی لێ دەکرێ، ئەڵێن: دەرفەت بدەن بەم براتانە کە تازە هاتووە، با وچانێ دەربکات، چونکە لە ناو تەنگانەیێکی هەرە دژواردا بووە. پاشان پرسیاری لێ دەکەن: فڵانە ژن و فڵانە پیاو چیان کرد؟ ئاخۆ فڵانەکەس شووی کرد؟ کاتێ سەبارەت بە پیاوێك کە پێش خۆی مردووە پرسیاری لێ دەکەن، دەڵێ: پێش من مردووە. ئەوان ئەڵێن: "ئێمە لە خودا بووین و بۆلای خودا دەگەڕێنەوە"، بۆ دۆزەخیان بردووە».

---

١. بخاری: ٣٦٧٩ ـ ١٢٨١ ـ ٣٧٢٢، مسلم: ٥١٢٠ ـ ٥١٢١، نسائی: ٢٠٤٧ ـ ٢٠٤٨، احمد: ١٧٧ ـ ١٢٢٠٨ ـ ١٢٨١٩ ـ ١١٥٨٢ ـ ١٣٢٧٤ ـ ١٣٥٥١ ـ ١٥٧٦٣ ـ ٢٥١٥٧ بألفاظ مختلفة.

٢. طبرانی فی الکبیر: ٣٧٩١ و الأوسط: ١٥٢، جامع الکبیر للسیوطی: ١٩٤٥ ـ ٢٤٩٣ و الفتح الکبیر: ٩٤٩، حرف الهمزة، حاکم فی المستدرك: ١٢٥٠، ابن‌حبان فی صحیحه: ٣٠٧٨، ابن‌المبارك فی الزّهد والرّقائق: ٤٣٧، نسائی: ١٨١٠ جمیعهم بألفاظ مختلفة.

## [دووهەم:] گفتوگۆی گۆڕ لەگەڵ مردوودا کاتێ کە دەنێژرێت

پێغەمبەری خوداﷺ فەرموویەتی: «يَقُولُ الْقَبْرُ لِلْمَيِّتِ حِيْنَ يُوضَعُ فِيهِ وَيْحَكَ يَا ابْنَ آدَمَ! مٰا غَرَّكَ بِي؟ أَلَمْ تَعْلَمْ أَنِّي بَيْتُ الْفِتْنَةِ وَ بَيْتُ الظُّلْمَةِ وَ بَيْتُ الْوَحْدَةِ وَ بَيْتُ الدُّودِ؟ مٰا غَرَّكَ بِي إِذٰا كُنْتَ تَمُرُّ بِي فَذّاذاً؟ فَإِنْ كٰانَ مُصْلِحاً أَجٰابَ عَنْهُ مُجِيبُ الْقَبْرِ فَيَقُولُ: أَرَأَيْتَ أَنْ كٰانَ يَأْمُرُ بِالْمَعْرُوفِ وَ يَنْهَىٰ عَنِ الْمُنْكَرِ؟ فَيَقُولُ الْقَبْرُ: إِنِّي إِذٰا تَحَوَّلَ عَلَيْهِ خَضْراً وَ يَعُودُ جَسَدُهُ نُوراً وَ يَصْعَدُ رُوحُهُ إِلَى اللهِ تَعٰالَىٰ»[1].

واتە: «کاتێ کە مردوو لەناو گۆڕ دادەنرێ، گۆڕ پێی دەڵێ: هاوار بۆ تۆ ئەی کوڕی ئادەم، چی تۆی لە من هەڵفریواند؟ مەگەر نەتدەزانی ئەمن ماڵی بەڵاو فیتنەم، ماڵی تاریکی و تەنیاییم، ماڵی مارو کرمم؟ چی تۆی لە من هەڵفریواند؟ وەختارێ کە بە دوودڵی بە لاما تێدەپەڕیت؟ جا ئەگەر پیاوە چاکە بێت، وڵامدەری گۆڕ لەباتی ئەو وڵام دەداتەوە: مەگەر نەتدیتووە کە ئەو ئەمر بە چاکە و نەهی لە خراپە دەکات؟ گۆڕ دەڵێ: کەواتە ئێستا من بۆی دەبمە چیمەڵانی و جەستەی ڕووناك دەبێتەوە و ڕۆحی بۆلای خوای گەورە، بەرز دەبێتەوە».

«الفذاذ» بەو کەسە دەڵێن کە دوودڵە و هەنگاوێ بەرەو پێش دەنێ و یەکێ بەرەودوا. ڕاوییەکە ئاوەها لێکی داوەتەوە.

## [سێهەم:] ئەشکەنجەی قەبرو پرسیاری نەکیر و مونکەر

بەرائی کوڕی عازیبرضي الله عنه دەڵێ: لە خزمەت پێغەمبەرداﷺ چووینە دەر تا لەسەر تەرمی پیاوێکەوە لە ئەنسار، نوێژی جەنازە بخوێنین. پێغەمبەرﷺ لەسەر گۆڕەکەی دانیشت و سەری داخست، پاشان فەرمووی:

«خودایە! ئەمن لە ئەشکەنجە و عەزابی قەبر پەنا بە تۆ دەگرم» ـ سێ جار ئەمەی فەرموو ـ پاشان فەرمووی: ئینسانی ئیماندار هەرکاتێ بەرەو دواڕۆژ بڕوات و نزیك بێت بمرێ، خوای گەورە چەند فریشتەیێك دەنێرێ کە ڕوخساریان دەڵێی خۆرە. عەتری خۆشی و کفنیشیان

1. طبرانی فی الکبیر: ١٨٣٧٧، ابی‌یعلی الموصلی فی مسنده: ٦٧٢١، ابونعیم الأصبهانی فی معرفة الصّحابة: ٦١٤١، ابن‌ابی‌عاصم فی الآحاد والمثانی: ٢١٣٦، ابن‌حجر العسقلانی فی المطالب العالیة: ٤٦٦١، جامع الکبیر للسیوطی: ١١٥٠٨، حرف الیاء.

پێیه، دێن لەبەرچاویەوە دادەنیشن، جا هەر کاتێ کە گیانی دەرچوو، هەرچی فریشتە کە لە نێوان ئاسمان و زەمیندا و هەرچییەك کە لە ئاسماندایە، سەڵواتی بۆ دەنێرن. دەرگاکانی ئاسمانی بە ڕوودا دەکرێتەوە، هەرچی دەرگایە حەز دەکات ڕۆحی لەوەوە بڕواتە ناوەوە. جا کاتێ کە ڕۆحی بەرز دەکرێتەوە بۆ ئاسمان دەنگێ دێ کە خودایە! ئەمە عیبادەتی تۆی کردووە.

خوداش دەفەرمێ: بیگەڕێننەوە و بیبەنە سەر ئەو ڕێزو قەدرە تایبەتییە کە ئامادەم کردووە بۆی و پێشتر وەعدەم پێ دابوو کە: ﴿مِنْهَا خَلَقْنَاكُمْ وَفِيهَا نُعِيدُكُمْ وَمِنْهَا نُخْرِجُكُمْ تَارَةً أُخْرَىٰ﴾[1].

واتە: «لە خاك خەلقمان کردوون، بۆ نێو خاك دەتانگێڕینەوە، جارێکیتر لە خاك دەرتان ئەهێنینەوە».

مردوو لە نێو گۆڕدا خشپەی کەوشی خەڵك دەبیسێ کاتێ کە دەگەڕێنەوە، تا لە نێو گۆڕەکەدا پرسیاری لێ دەکەن: فڵانەکەس! کێ خوداتە؟ دینت چییە؟ پێغەمبەرت کێیە؟ ئەویش لە وڵامدا ئەڵێ: خودام ئەڵڵایە، دینم ئیسلامە، پێغەمبەرم موحەممەدە.

ئەو دوو فریشتەیە کە ئەم پرسیارانەیان لێ کرد ڕای ئەوەشێنن کە ئەمە دوایین بەڵا و سەختیەکە کە بەسەر مردوودا دێت، جا کە ئەم وڵامانەی دایەوە، بانگکەرێ بانگ دەکات: ڕاستت گوت. هەر ئەمەشە واتای ئەم فەرموودەی خودای مەزنە: ﴿يُثَبِّتُ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا بِالْقَوْلِ الثَّابِتِ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَفِي الْآخِرَةِ﴾[2].

واتە: «خوداوەند کەسانێ کە ئیمانیان هێناوە، لە سەر ئەو وتە دامەزراوە، چ لە دونیا و چ لە دوارۆژدا، بە دامەزراوی دەهێڵێتەوە».

پاشان کەسێك جوانکەڵە و خۆشسوحبەت و تەڕ و پۆشتە دێ بۆ لای و ئەڵێت: مزگێنی ڕەحمەتی خودات پێ دەدەم و مزگێنی بەهەشت و نیعمەتە نەبڕاوەکانی پێت دەدەم. ئەویش ئەڵێ: تۆ ـ خودا مزگێنی خۆشت پێ بدات ـ کێیت؟

ئەڵێ: من کردەوەی چاکی تۆم، سوێند بەخودا ئەمن دەمزانی تۆ بۆ تاعەت و عیبادەتی خودا بە پەلە بووی و بۆ گوناح و تاوانەکان سست و قورس بووی و نەتدەکردن. خودا جەزای خێرت بداتەوە.

---

١. طه: ٥٥.　٢. ابراهيم: ٢٧.

پاشان جارچییێك جاڕ دەدات کە فەرشێکی لە فەرشەکانی بەهەشت بۆ ڕاخەن و دەرکەی بەهەشتی بۆ ئاوەلآ بکەن.

پاشان ئەم پیاوە دەڵێ: خودایە! زوو قیامەت بەرپا بکە تا بۆلای خزم و خێزانم بگەڕێمەوە.

پێغەمبەرﷺ فەرمووی: «بەڵام کافر ئەگەر ڕوو لە دوارۆژ بکات و بەرەو مەرگ بڕوات، خێرا مەلائیکەی غەزەب کە کراسێ لە ئاورو دەرپێیەك لە قیریان لەبەرە، دێنە بەرچاوی و دەیترسێنن. کاتێك گیانی دەردەچێ هەرچی مەلائیکە لە نێوان ئاسمان و زەمیدایە و هەرچی لە ئاسماندایە، نفرینی لێدەکەن و دەرگاکانی ئاسمانی لێ دادەخرێ و جگە لە دەرکەیێ نەبێ کە بە ناحەزیەوە ئەهێڵێ ڕۆحی ببەنە ناو هیچ دەرکەیێ کراوە نییە. جا کە ڕۆحی بەرز کرایەوە، فڕێ دەدرێ و ئەڵێن: خودایە! ئەو بەندەیەی تۆ نە ئاسمان و نە زەمین وەری ناگرێ.

ئەویش ئەفەرمێ: ببەن با چاوی بەو ئەشکەنجانەی کە ئامادەم کردووە بۆی بکەوێ، چونکە من بڕیارم داوە کە «مِنْهَا خَلَقْنَاكُمْ وَ فِيهَا نُعِيدُكُمْ وَ مِنْهَا نُخْرِجُكُمْ تَارَةً أُخْرَىٰ».

ئەم مردووە کافرە خشپەی پێی خەڵکەکە وەختێ دەگەڕێنەوە دەبیسێ، تا پێی دەڵێن: خودات کێیە؟ دینت چییە؟ پێغەمبەرت کێیە؟ ئەویش ئەڵێ: نازانم و نەشمزانیووە.

پاشان کەسێك دێ بۆلای کە زۆر دزێو و قیزەون و بۆگەن و شڕ و شیتاڵ لەبەرە، بە توورەییەوە ئەڵێ: ئەوا مزگێنی ئاوری دۆزەخ و ئەشکەنجەی خودات لەوێدا پێ ئەدەم.

ئەمیش ئەڵێ: ـ ئەی خوا خرابت بۆ بکات ـ تۆ کێیت؟

ئەڵێ: من کردەوە پیس و خراپەکانی خۆتم. سوێند بەخودا من لە تۆ جگە ئەوە نەبێ کە بە پەلە دەچووی تاوان و گوناحت ئەنجام دەدا و بۆ چاکەکاری زۆر خاو و خلیسك بووی شتێکی‌تر شك نابەم، خودا جەزای شەڕت بداتەوە!.

ئەویش ئەڵێ: خودا جەزای شەڕی تۆش بداتەوە.

پاش ئەمانە، زل و زەبەلاحێکی کەڕ و کوێر و لاڵ کە گورزێکی ئاسنی پێیە ـ کە ئەگەر تەواو جنۆکە و ئادەمیزاد کۆ ببنەوە کە جێبەجێی بکەن ناتوانن و ئەگەریش بە کێوێکیدا بکوتن دەیکاتە خۆڵ ـ دێت و بەو گورزە زەربەتێکی پێ دەگەیەنێ و دەیکا بە خۆڵ، پاشان ڕۆحی لەبەر دەکەنەوە دیسان زەربەتێکی‌تر دەکوتێ بە ناوچاوانیدا کە هەرچی لە ئاسمان و زەمیندایە جگە لە جنۆکە و بەشەر تەپەی دەبیسن. پاشان جارچییەك جاڕ دەدات کە دوو

تەختە ئاوری بۆ ڕاخەن و دەروازەی ئاوریشی بە ڕوودا ئاوەڵا بکەن. خێرا دوو تەختە ئاورەکەی بۆ ڕادەخرێ و دەروازەیێ کە بەرەو دۆزەخ بە ڕوویدا دەکرێتەوە[١].

پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «اَلْمُؤْمِنُ فِي قَبْرِهِ فِي رَوْضَةٍ خَضْرَاءَ وَ يُرْحَبُ لَهُ فِي قَبْرِهِ سَبْعُونَ ذِرَاعاً، وَ يُضِيءُ حَتَّىٰ يَكُونَ كَالْقَمَرِ لَيْلَةَ الْبَدْرِ، هَلْ تَدْرُونَ فِي مَاذَا أُنْزِلَتْ: ﴿فَإِنَّ لَهُ مَعِيشَةً ضَنْكاً﴾[٢]» قَالُوا: اَللهُ وَ رَسُولُهُ أَعْلَمُ، قَالَ: «عَذَابُ الْكَافِرِ فِي قَبْرِهِ، يُسَلَّطُ عَلَيْهِ تِسْعَةٌ وَ تِسْعُونَ تَنِيناً، هَلْ تَدْرُونَ مَا التَّنِينُ؟ تِسْعَةٌ وَ تِسْعُونَ حَيَّةً لِكُلِّ حَيَّةٍ تِسْعَةُ رُؤُسٍ يَخْدِشُونَهُ وَ يَلْحَسُونَهُ وَ يَنْفَخُونَ فِي جِسْمِهِ إِلَىٰ يَوْمِ يُبْعَثُونَ»[٣].

واتە: «مرۆڤی ئیماندار لەنێو گۆڕەکەیدا، لە نێو باغێکی سەوزەڵانیدایە کە حەفتا گەز فەرحانەتی هەیە و هێندە ڕۆشنە کە ئەڵێی مانگی شەوی چاردەیە. ئاخۆ بزانن ئەم ئایەتە سەبارەت بە کێ هاتۆتە خوار: "بێگومان ژیانێکی سەختی هەیە"؟» گوتیان: خودا و پێغەمبەرەکەی ئاگادارن. فەرمووی: «سەبارەت بە ئەشکەنجەی کافرە لەنێو گۆڕەکەیدا نەوەدونۆ "تنین" بەسەریدا زاڵ دەبن. ئاخۆ بزانن "تنین" چییە؟ نەوەدونۆ مارە کە هەر مارێ حەوت سەری هەیە؛ دەیکرێنن و دەیلێسنەوە و بادەکەنە جەستەی تا ڕۆژی قیامەت».

حەزرەتی عائیشەرضي الله عنها فەرموویەتی: پێغەمبەری خوداﷺ فەرموویەتی: «إِنَّ لِلْقَبْرِ ضَغْطَةً وَ لَوْ سَلِمَ أَوْ نَجَا مِنْها أَحَدٌ لَنَجَا سَعْدُ بْنُ مَعاذٍ»[٤].

واتە: «گۆڕ، گۆڕەوشاری هەیە، کە ئەگەر کەسێ لەو گۆڕەوشارە بە سەلامەت دەربچێ، یان ڕزگاری ببێ، ئەوە سەعدی کوڕی مەعازە».

---

١. احمد: ١٧٨٧٢ ـ ١٧٨٠٣ بکماله، عبدالرّزّاق فی مصنّفه: ٦٧٣٦، حاکم فی المستدرك: ١٠٦، الهیثمی فی غایة المقصد: ١٦٤٢/١، بیهقی فی شعب الإیمان: ٣٩٠ و فی إثبات عذاب القبر: ١٨، ابوداود: ٤١٢٧ ـ ٤١٢٦، طبرانی فی الأوسط: ٢٧٣١، ابن‌الأثیر فی جامع الأصول: ٨٧٠٨، نسائی: ٢٠٢٤ جمیعهم بألفاظ مختلفة بعضهم ناقصا و بعضهم مختصراً.

٢. طه: ١٢٤.

٣. ابن‌حبان فی صحیحه: ٣١٨٧، بیهقی فی إثبات عذاب القبر: ٥٥، ابن‌حجر العسقلانی فی المطالب العالیة: ٤٦٦٢، ابی‌یعلی الموصلی فی مسنده: ٦٥٠٦.

٤. اَلحارِثُ فِی مسنده: ٢٧٧، طبرانی فی الکبیر: ١٢٨٠١، ابن‌حبان فی صحیحه: ٣١٧٧، بیهقی فی شعب الإیمان: ٣٩١ و فی اثبات عذاب القبر: ٨٨ ـ ٨٩، تهذیب الآثار للطبری: ٣٢٨، جامع الکبیر للسیوطی: ٣٣٨، حرف اللام.

پێغەمبەرﷺ کاتێ سەبارەت بە نەکیر و مونکەر فەرمایشتی بۆ عومەری کوڕی خەتابرضي الله عنه ئەفەرموو، حەزرەتی عومەر پرسیاری لێ کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! ئاخۆ لەو وەختە هەر وەك ئێستا عەقڵ و هۆشم ئەمێنێ؟

فەرمووی: بەڵێ.

ئەویش گوتی: کەواتە چاریان دەکەم[1].

ئەم حەدیسەش داکۆکی لەسەر ئەوە دەکات کە مەرگ عەقڵ و هۆش لا نابات، هەروەك پێشتر باسمان کرد.

## بەشی دەهەم: فووکردن بە شاخی سوور و ڕووداوەکانی پاشەوەی

تا ئێستا کە ئەمانەت زانیوە: سەختی مەرگ و سەرەمەرگ و مەترسی دوارۆژشەڕی، پاشان ڕەنج و سەختیی تاریکی گۆڕ و کرم و ماری ناو گۆڕ، پاشان دیتنی نەکیر و مونەکەر و پرسیارەکانیان، پاشان ئەشکەنجەی ناو گۆڕ، ئەمانە هەموویان وەختارێ کە مردووەکە عاقیبەت شەڕ بێ.

لەمانە هەموو گرانتر و پڕمەترسیتر ڕووداوی فووی سوور و زیندووبوونەوەی ڕۆژی قیامەت و چوونە خزمەتی خودای بێباك و پرسیار سەبارەت بە ورد و درشتی کردەوەکان و دامەزرانی تەرازوو بۆ کێشانەکردنی کردەوەکان، پاشانەکە پەڕینەوە لە پردی باریك و تیژی «صراط»، پاشان چاوەنواڕی دەرکردنی بڕیاری بەختەوەری، یان عاقیبەت شەڕی. ئەمانە هەمووی ڕووداو و دیاردەگەلێکن کە زانینیان پێویستە و پاشان باوەڕ پێکردنیان بە شێوەی یەقین و دان پێدانانیان واجبە و ئەبێ مرۆڤ تێفکرین و ڕامانیان لەسەر بکات تا لە دەروونیدا ئامادەکارییێك بۆ ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵیاندا ساز بێت.

ئەوەش بزانن کە زۆرینەی خەڵك ئیمان بە دوارۆژ لەناخی دڵیاندا جێگر و بنجبەست نەبووە و لەبەر ڕەشی دڵیان تێدا سەقامگیر نەبووە. بەڵگەی ئەمەش بەوەدا دیارە کە چەندە

---

١. «...قَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ! وَمَعِي عَقْلِي؟ قَالَ: نَعَمْ، قَالَ: إِذًا أَكْفِيكَهُمَا» الحارث فی مسنده: ٢٧٩، ابن‌حجر العسقلانی فی المطالب العالیة: ٤٦٥٥. و فی روایة: «...فَقَالَ عُمَرُرضي الله عنه: أَتُرَدُّ عَلَيْنَا عُقُولُنَا يَا رَسُولَ اللهِ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللهِﷺ: نَعَمْ، كَهَيْئَتِكُمُ الْيَوْمَ، فَقَالَ عُمَرُ: بِفِيهِ الْحَجَرُ» احمد: ٦٣١٥، ابن‌حبان فی صحیحه: ٣١٨٠.

خۆیان بۆ خۆپاراستن لە گەرمای هاوینان و سەرمای زستانان ئامادە دەکەن، هێندە خۆیان بۆ سوورەتاو و گەرمای سەختی دۆزەخ و سەرما و سەهۆڵبەندانی ئەوێ ئامادە ناکەن.

سەبارەت بە "سوور" خودا دەفەرمێ: «وَ نُفِخَ فِي الصُّورِ فَصَعِقَ مَنْ فِي السَّمٰوٰاتِ وَ مَنْ فِي الْأَرْضِ إِلَّا مَنْ شٰاءَ اللّٰهُ ثُمَّ نُفِخَ فِيهِ أُخْرَىٰ فَإِذٰا هُمْ قِيٰامٌ يَنْظُرُونَ».[1]

واتە: «فوو بە شاخی سووردا دەکرێ، خێرا هەرکەس لە ئاسمان و زەمیندایە دەمرێ، جگە لەو کەسانە کە خودا ئەیەوێ [بمێنن]، پاشان کەڕەتێ‌تر فووی پێدا دەکرێ، کەچی هەموو هەستاونەتەوە و دەڕوانن».

مانای «صعق» واتە: مردن. مەبەست بەوانەش کە خودا ئەیەوێ بمێنن: جوبرەئیل، میکائیل، ئیسرافیل و عیزرائیلە. پاش فووکردن بە شاخی سوور، خودای گەورە فەرمان بە عیزرائیل دەدات کە گیانی جوبرەئیل، جا ئیسرافیل، جا میکائیل بکێشێ، پاشانەکەش عیزرائیل بە فەرمانی خودا دەمرێ.

دوای ئەوە هەموو مردن، کەڕەتێ‌تر فوو بە شاخدا دەکرێ، ئەو جار هەموو هەڵدەستنەوە و زاق دەڕوانن، پاشان هەموو بەرەو دەشتی مەحشەر ڕەوانە دەکرێن، هەموویان بە ڕووتەڵی و لنگ ڕووتی و پێ‌پەتیی کە هەرکەسیان بە ئەندازەی گوناحەکانیان شەڵاڵی عارەقن و عارەقیان لێ دەچۆڕێ. بە درێژی ڕۆژی قیامەت بە گوێ‌قوڵاخی و چاوزاقی بە ئەندازەی حیساب و لێپرسینەوەکەیان، ڕادەوەستێنرێن. لە بچووك و گەورە و ورد و درشت پرسیاریان لێ دەکرێ، پاشان بە تەرازوو، چاکە و خراپەیان کێشانە دەکرێ.

لەم کاتەدایە کە هەرکەس حەقی کەسێ‌تر لەلایەوە بێ یەقەی ئەگیرێ و داوای لێ دەکرێ. پاشان دەدرێنە بەر بۆ سەر «صراط» و لەوێدا پرسیاریان لێ دەرکرێ.

خودای مەزن دەفەرمێ: ﴿فَاهْدُوهُمْ إِلَىٰ صِرٰاطِ الْجَحِيمِ ۝٢٣ وَقِفُوهُمْ إِنَّهُمْ مَسْؤُولُونَ ۝٢٤﴾[2]

واتە: «بەرەو ڕێ دۆزەخ بیاندەنە بەر و لە ڕۆخی [دۆزەخدا] ڕایان وەستێنن، ئەوان بە ڕاستی بەرپرسیارن».

---

١. الزمر: ٦٨.

٢. الصافات: ٢٣ ـ ٢٤.

## شەفاعەت:

بزانە وەختارێ کە ئەشکەنجە و عەزابی خودا بەسەر هەندێ لە ئیمانداراندا یەکلا بووەوە، خودای مەزن سەبارەت بەوان تکای پێغەمبەران و پیاوچاکان و زانایان و هەرکەسێ بەلای خوداوە ڕێزی هەبێ، قەبووڵ دەکات.

## حەوزی کەوسەر:

ئەنەس رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ فەرموویەتی: پێغەمبەری خودا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بۆ تاوێ سەری داخست و چاوی نووقاند، پاشان بە بزە و پێکەنینەوە سەری بەرز کردەوە گوتیان: ئەی ڕەسوولی خودا! بەچی پێ‌ئەکەنیت؟ فەرمووی: «آيَةٌ أُنْزِلَتْ عَلَيَّ آنِفاً» واتە: «ئایەتێك ئێستا نازڵ بۆتە سەرم» پاشان ئەمەی خوێندەوە ﴿بِسْمِ الرَّحْمٰنِ الرَّحِيمِ. إِنَّا أَعْطَيْنَاكَ الْكَوْثَرَ...﴾ تا ئاخر خوێندیەوە و پاشان فەرمووی: ئەزانن کەوسەر چییە؟ گوتمان: خودا و پێغەمبەری دەزانن.

فەرمووی: «إِنَّهُ نَهْرٌ وَعَدَنِيهِ رَبِّي ـ عَزَّوَجَلَّ ـ فِي الْجَنَّةِ عَلَيْهِ خَيْرٌ كَثِيرٌ، عَلَيْهِ حَوْضٌ تَرِدُ عَلَيْهِ أُمَّتِي يَوْمَ الْقِيَامَةِ آنِيَتُهُ عَدَدُ نُجُومِ السَّمَاءِ»[1].

واتە: «چۆمێکە خودا وادەی داوە پێم لە بەهەشتدا، خێری زۆری بەسەرەوەیە، ئەو چۆمە حەوزێکی بەسەرەوەیە کە ئوممەتم لە ڕۆژی قیامەتدا دێنە سەری، جامەکانی بە قەدەر ئەژماری ئەستێرەکانی ئاسمانە».

خودایە! بیکەیتە نەسیبمان!

## مەترسییەکان و ئەشکەنجەکانی دۆزەخ ـ خودا پەنامان بدات ـ

بزانە ئاوری دۆزەخ هەمووکەس دەڕواتە سەری.

خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَإِنْ مِنْكُمْ إِلَّا وَارِدُهَا كَانَ عَلَىٰ رَبِّكَ حَتْماً مَقْضِيّاً ﴿٧١﴾ ثُمَّ نُنَجِّي الَّذِينَ اتَّقَوْا وَنَذَرُ الظَّالِمِينَ فِيهَا جِثِيّاً ﴿٧٢﴾﴾[2]

---

١. مسلم: ٦٠٧، ابوداود: ٦٦٦ ـ ٤١٢٢، نسائی: ٨٩٤، احمد: ١١٥٥٨.

٢. مریم: ٧٢ ـ ٧١.

«هەموو کەستان - بە بێگومان و بێجیاوازی - هەر دەبێ بچنە دۆزەخ، بڕیارێکە پەروەردگارت داویەتی و هەر دەبێ جێ بەجێ بکرێ، پاشان ئەوانەی لە خوداترس بوون ڕزگار دەکەین و ستەمگەرانیش دەستەو ئەژنۆ لە ناویدا ئەهێڵینەوە».

بزانە ڕێی ڕزگاربوون لە دۆزەخ تەنها لە خودا ترسانە، هەروەك خودا فەرموویەتی: ﴿ثُمَّ نُنَجِّي الَّذِينَ اتَّقَوا...﴾. چوونە دۆزەخ ڕووداوێکی یەقینیە، بەڵام ئەو تەقواو لە خواترسییەی کە ڕزگاری مسۆگر دەکا، ئیشێکی سەخت و جێی شك و گومانە. کەوابوو ئەی ئەوکەسەی ك دڵت وێرانە! بیر لە خۆف و ترسی ئەو چوونە ناو ئاگرە بکەرەوە، لەو ڕۆژەدا کە خەڵك نوقمەساری ترس و خۆفی ئەو کارەساتانە بوون و تێیدا ڕۆچوون، لەو کاتەدا کە ئاوری دۆزەخ کڵپە دەستێنێ و تاوانباران دادەگرێ و بڵێسە و شەماڵەی بە هەرچی باردا ئەڕوات و سێبەریان لەسەر دەکات و دەنگی قرچە و قرمەی لێوە دەبیستن کە دەزانن چەندە تووڕەیە و قینی پێیە.

ئیدی تاوانباران دڵنیا دەبن و باوەڕ بە ناتەوانی و بێدەسەڵاتی خۆیان ئەهێنن و هەموو بە جارێ وشك دەبن و لەم چارەنووسەی تووشی بوون بەزەییان بە حاڵی خۆیاندا دێتەوە.

لەم وەختەدا جارچییێك سەر لە بڵێسەی ئاورەکەوە دێنێتە دەر و دەڵێ: فڵانەکەسی کوڕی فڵانەکەس کە ئاواتی دوور و درێژی ئەخواست و تەمەنی خۆی لە ئیشی خراپەدا بەسەر ئەبرد، لە کوێیە؟

خێرا قۆڵبەستی دەکەن - خودا پەنامان بدات - و بەرەو دۆزەخ و ئەشکەنجە ئەیدەنە بەر و سەرەوخواری دەکەنەوە بۆ ناو دۆزەخ و پێی ئەڵێن: ﴿ذُقْ إِنَّكَ أَنْتَ الْعَزِيزُ الْكَرِيمُ﴾[1] واتە: «بیچێژە، تۆ نازپەروەردە و ڕێزداری».

## بەهەشت و خۆشییەکانی:

بزانە لە بەرانبەر دۆزەخەوە کە ماڵی ئەشکەنجەیە، بەهەشت هەیە کە جێی حەسانەوەیە. هەر بەو ئەندازەی کە لە یەکێکیان دوور کەویتەوە، لەویان نزیکتر دەبیتەوە.

پێویستە بیر لە ئاوری دۆزەخ بکەیتەوە تا خۆف و ترس بنیشێتە دڵت، هەروەها بیر لە بەهەشت بکەرەوە تا هومێد و هیوات پتر بێ، لەو کاتانەدا کە بە بۆنەی زۆربوونی گوناح و خۆف و ترسەوە شانت قورس بوویێت، تا سووك بێتەوە. خۆ هێندە ئایەت و حەدیس سەبارەت

---

١. الدخان: ٤٩.

بە بەهەشتییان و بە خۆشی و نیعمەت و ئەمنیەت و خورد و خۆراك و میوەجاتی بەهەشت هاتۆتە خوار، کە ئیدی پێویستی بە ڕوونکردنەوە نییە.

حەدیسی زۆر هەیە کە دەلالەت لەسەر ئەوە دەکەن کە بانترین پلەی نیعمەتی بەهەشت دیداری خودای گەورەیە:

جەریری کوڕی عەبدوڵڵای بەجەلی رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ ئەڵێت: ئێمە لە خزمەت پێغەمبەردا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دانیشتبووین، چاوی کەوت بە مانگی شەوی چاردە و فەرمووی:

«إِنَّكُمْ سَتَرَوْنَ رَبَّكُمْ كَمٰا تَرَوْنَ هٰذَا الْقَمَرَ لا تُضٰامُونَ فِي رُؤْيَتِهِ فَإِنِ اسْتَطَعْتُمْ أَنْ لا تُغْلَبُوا عَلَىٰ صَلاةٍ قَبْلَ طُلُوعِ الشَّمْسِ وَ قَبْلَ غُرُوبِها فَافْعَلُوا» ثُمَّ قَرَأَ: «﴿وَ سَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ قَبْلَ طُلُوعِ الشَّمْسِ وَ قَبْلَ غُرُوبِها﴾»[1].

واتە: «ئێوە پەروەردگارتان، بەمزوانە ئەبینن هەروەك چۆن ئەم مانگە ئەبینن. لەم دیتنەشدا کەستان بێبەش وکەمبەش ناکرێن. ئەگەریش توانیتان مل بە فەوتانی نوێژی پێش خۆرکەوتن و پێش‌خۆرنیشتن (واتە: نوێژی بەیانان و عەسران) نەدەن، ئەو دوو نوێژە بخوێنن. پاشان ئەمەی خوێندەوە: ﴿وَ سَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ قَبْلَ طُلُوعِ الشَّمْسِ وَ قَبْلَ غُرُوبِهٰا﴾ واتە: پێش هەڵاتنی خۆر و پێش ئاوابوونی حەمد و ستایشی پەروەردگارت بکە».

ئەم حەدیسە لە سەحیحەیندا هاتووە.

موسلیم لە سەحیحەکەیدا هێناویەتی کە سوهەیب رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ گوتوویە: پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ئەمەی خوێندەوە: ﴿لِلَّذِينَ أَحْسَنُوا الْحُسْنَىٰ و زِيٰادَةٌ﴾[2] واتە: «بۆ ئەو کەسانە کە کاری چاك ئەنجام دەدەن، بەهەشتی ڕازاوە هەیە و زیادەییێکیش».

پاشان فەرمووی: «إِذٰا دَخَلَ أَهْلُ الْجَنَّةِ وَ أَهْلُ النّٰارِ، نٰادَىٰ مُنٰادٍ: يٰا أَهْلَ الْجَنَّةِ إِنَّ لَكُمْ عِنْدَ اللهِ مَوْعِداً يُرِيدُ أَنْ يُنْجِزَكُمُوهُ، قٰالُوا: مٰا هٰذَا الْوَعْدُ؟ أَلَمْ يُثَقِّلْ مِيزٰانَنٰا وَ يُبَيِّضْ وُجُوهَنٰا؟ وَ يُدْخِلْنَا الْجَنَّةَ وَ يُجِرْنٰا مِنَ النّٰارِ؟ قٰالَ فَيَرْفَعُ الْحِجٰابُ، وَ يَنْظُرُونَ إِلَىٰ وَجْهِ اللهِ تَعٰالَىٰ فَمٰا أُعْطُوا شَيْئاً أَحَبَّ إِلَيْهِمْ مِنَ النَّظَرِ إِلَيْهِ»[3].

---

١. طه: ١٣٠. بخاری: ٥٢١ ـ ٥٣٩ ـ ٤٤٧٣ ـ ٦٨٨٢ ـ ٦٨٨٤، مسلم: ١٠٠٢، ابوداود: ٤١٠٤، ترمذی: ٢٤٧٧، ابن‌ماجه: ١٧٣، احمد: ١٠٦٩٧ ـ ١٨٣٩٤ ـ ١٨٤٠٩.

٢. یونس: ٢٦.

٣. مسلم: ٢٦٦، ترمذی: ٢٤٧٥ ـ ٣٠٣٠، ابن‌ماجه: ١٨٣، احمد: ١٨١٧٢، ١٨١٧٧ ـ ٢٢٧٩٩.

واته: «ئەو کاتە کە بەهەشتی دەچنە بەهەشت و دۆزەخی دەچنە دۆزەخ، جارچییێك جار دەدات: «ئەی بەهەشتیان! خودای گەورە بەڵێنێکی پێ دابوون، ئێستا ئەیەوێ بەجێی بهێنێ بۆتان».

دەڵێن: ئەم بەڵێنە چییە؟ مەگەر تەرازووەکەمانی قورس نەکرد و ڕوومانی سپی نەکرد و نەمانی خستە بەهەشت و لە ئاگر ڕزگاری نەکردین؟

فەرمووی: پەردە هەڵدەدرێتەوە و بۆ زاتی خودای مەزن دەڕوانن. تا ئێستا هیچ شتێ خۆشتر لەم دیدارەیان بە خەڵات نەکراوە».

زۆرێ لە سەحابەکان ئەم حەدیسی دیتنی زاتی خودایەیان ڕیوایەت کردووە کە لە ئەوپەڕی جوانی و ئەوپەڕی لەززەت و خۆشیدایە. هەرچیمان لەبارەی لەززەت و خۆشییەوە تا ئێستا گوتووە، لەچاو ئەم دیدارە هیچ نیە و هەر لە بیردا نامێنێ. ئیدی بۆ بەهەشتیان پاش دیتنی زاتی خودا، هەر دوایی‌هاتن بۆ لەززەت و شادییەکانیان نییە. بەڵکوو لەززەتی بەهەشت لە چاو لەززەتی دیداری خودا هەر هیچ نییە. پێش‌تریش لەباسی مەحەبەتدا گۆشەیێکمان لێ باس کرد، بەڵام بە کورتی ئەبێ بڵێین: نابێ بەندە مەبەستی لە بەهەشت و خۆشییەکانی بەهەشت شتێ جگە لە گەیشتن و دیداری خودای مەزن بێ، دەنا باقی نیعمەتەکانی‌تری بەهەشت وەکوو بەردانی مەڕوماڵاتە بۆ سەر لەوەڕگە و دەشت.

بۆ تێگەیشتن لەم باسە تێ‌بفکرە، خێری چاکت دەست دەکەوێ.

# دوا وتەی ئەم کتێبە:

## گەشبینی بە فراوانی بەزەیی خودای مەزن

پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ حەزی بە خۆش‌بینی دەکرد و ئێمەش هومێدەواری ڕەحم و بەزەیی و بەخششی خوداین و هیوامان وایە عاقیبەت و دوارۆژمان بە چاکە بگێڕێ، هەروەك چۆن ئێمە دوایین وتەی ئەم کتێبەمان بەو حەدیس و ئایەتانە نووسییەوە کە وا ڕەحم و بەزەیی و لێبوردنی خودای گەورە دەگەیەنن.

## ئایەتەکان:

خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿إِنَّ اللّٰهَ لا يَغْفِرُ أَنْ يُشْرَكَ بِهِ وَ يَغْفِرُ مادُونَ ذٰلِكَ لِمَنْ يَشاءُ﴾[1] واتە: «خوداوەند لەوە خۆش نابێ کە هاوبەشی بۆ دابنرێ و جگە لەوە لە هەرکەس کە بیەوێ خۆش ئەبێ».

خودای مەزن فەرموویەتی: ﴿وَ مَنْ يَعْمَلْ سُوءاً أَوْ يَظْلِمْ نَفْسَهُ ثُمَّ يَسْتَغْفِرِ اللّٰهَ يَجِدِ اللّٰهَ غَفُوراً رَحِيماً﴾[2] واتە: «هەرکەس خراپەیێك ئەنجام بدات یان غەدرو ستەمێ لە خۆی بکات، پاشان داوای لێبوردن لە خودا بکات، ئەوا بە بەخشەندە و دلۆڤان خودا ئەبینێتەوە». ئێمەش ئێستا کە داوای بەخشین و لێبوردن لە خودا دەکەین لە هەر هەڵەیێ کە ئەم پێنووسەمان بۆی خزاوە.

---

١. النساء: ٤٨.

٢. النساء: ١١٠.

## حەدیسەکان:

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «إِنَّ لِلّٰهِ مِائَةَ رَحْمَةٍ أَنْزَلَ رَحْمَةً وٰاحِدَةً بَيْنَ الْجِنِّ، وَ الْإِنْسِ، وَ الْبَهٰائِمِ، وَ الْهَوٰامِّ، فَبِهٰا يَتَعٰاطَفُونَ وَ بِهٰا يَتَرٰاحَمُونَ وَ بِهٰا تَعْطِفُ الْوَحْشُ عَلَىٰ وَلَدِهٰا وَ أَخَّرَ اللّٰهُ تِسْعاً وَ تِسْعِينَ رَحْمَةً يَرْحَمُ بِهٰا عِبٰادَهُ يَوْمَ الْقِيٰامَةِ»[1].

واتە: «خوداوەند سەد بەش ڕەحم و بەزەیی هەیە، بەشێکیانی ناردۆتە نێوان جنۆکە و ئادەمیزاد و چوارپێیان و گیانلەبەر و وردیلەکان، هەر بەو تاقە بەشەیە کە سەبارەت بەیەك میهرەبان و بە بەزەیین، هەر بەوەشەوەیە کە دڕندەگان ڕەحم بە بێچووەکانی خۆیان دەکەن. خوداوەند نەوەد و نۆ بەشی‌تری ڕەحمەتی خۆی بۆ دوارۆژ داناوە کە پێی لە بەندەکانی خۆش بېێ».

هەروەها ڕیوایەت کراوە: کە کاتێ ڕۆژی قیامەت بەرپا دەبێ، خودای گەورە لە بنی عەرشەوە پەڕاوێك وەدەر دەخات کە تێیدا نووسراوە: «بەزەییم وەپێش تووڕەییم کەوتووە و ئەمن میهرەبانترین میهرەبانانم»، بەم هۆیەوە لە دڵی ئاوری دۆزەخەوە پۆل پۆل خەڵك دێنەدەر و بەرەو بەهەشت دەکەونە ڕێ[2].

پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی: لە ڕۆژی قیامەتدا خودای مەزن بە ڕوویەکی شادەوە دەفەرمێ:

«أَبْشِرُوا مَعْشَرَ الْمُسْلِمِينَ فَإِنَّهُ لَيْسَ مِنْكُمْ أَحَدٌ إِلَّا وَ قَدْ جَعَلْتُ فِي النّٰارِ مَكٰانَهُ يَهُودِيّاً أَوْ نَصْرٰانِيّاً»[3] واتە: «مزگێنی، ئەی چینی موسوڵمانان! بێ‌گومان لەجێگەی هەریەك لە ئێوە نەفەرێك جوولەکە، یان گاورم لە ئاوری دۆزەخ هاویشتووە».

---

١. مسلم: ٤٩٤٤ ـ ٤٩٤٥، ابن‌ماجه: ٤٢٨٣، احمد: ٩٢٣٦ ـ ١١١٠٥.

٢. «...إِنَّ رَحْمَتِي سَبَقَتْ غَضَبِي...» عبدالرّزّاق فی مصنّفه: ٢٠٨٥٨ بکماله. بخاری: ٦٨٧٢ ـ ٦٨٩٩ ـ ٦٩٩٩، ابن‌ماجه: ١٨٥، احمد: ٧١٨٧ ـ ٧٢١٥ ـ ٨٧٩٤ ـ ٩٦٢٣ دون ذکر قوله: «وَ أَنَا أَرْحَمُ الرّٰاحِمِينَ فَيَخْرُجُ مِنَ النّٰارِ مِثْلَ أَهْلِ الْجَنَّةِ».

٣. احمد: ١٨٨٢٤، مسلم: ٤٩٧٠ بلفظ: «لا يَمُوتُ رَجُلٌ مُسْلِمٌ إِلّٰا أَدْخَلَ اللّٰهُ مَكٰانَهُ يَهُودِيّاً أَوْ نَصْرٰانِيّاً»، و فی روایة: «إِذٰا كٰانَ يَوْمُ الْقِيٰامَةِ دَفَعَ اللّٰهُ عَزَّوَجَلَّ إِلَىٰ كُلِّ مُسْلِمٍ يَهُودِيّاً أَوْ نَصْرٰانِيّاً فَيَقُولُ: هٰذٰا مَكٰانُكَ مِنَ النّٰارِ» مسلم: ٤٩٦٩. و فی روایة: «يَجِيءُ يَوْمَ الْقِيٰامَةِ نٰاسٌ مِنَ الْمُسْلِمِينَ بِذُنُوبٍ أَمْثٰالِ الْجِبٰالِ فَيَغْفِرُهَا اللّٰهُ لَهُمْ وَ يَضَعُهٰا عَلَى الْيَهُودِ وَالنَّصٰارَىٰ» مسلم: ٤٩٧١.

هەروەها پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «يَشْفَعُ اللّٰهُ تَعَالَىٰ آدَمَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ مِنْ جَمِيعِ ذُرِيَّتِهِ فِي مِائَةِ أَلْفِ أَلْفٍ وَ عَشَرَةِ آلافِ أَلْفٍ»[1].

واتە: «لە ڕۆژی قیامەتدا خودای گەورە ئادەم دەکاتە تکاکاری سەرجەمی ئەوانە کە لێی کەوتوونەتەوە، لە سەد هەزاران هەزار و لە دە هەزاران هەزار».

پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «يَقُولُ اللّٰهُ عزَّوَجَلَّ: أَخْرِجُوا مِنَ النَّارِ مَنْ ذَكَرَنِي يَوماً، أَوْ خَافَنِي فِي مَقَامٍ»[2] واتە: «خودای مەزن دەفەرمێ: هەرکەس ڕۆژێ یادی منی کردبێ یان لە شوێنێکدا لە من ترسابێ، لە دۆزەخ دەری بهێنن».

پێغەمبەری خوداﷺ فەرموویەتی: «إِذَا اجْتَمَعَ أَهْلُ النَّارِ فِي النَّارِ وَ مَنْ شَاءَ اللّٰهُ مَعَهُمْ مِنْ أَهْلِ الْقِبْلَةِ قَالَ لَهُمُ الْكُفَّارُ: أَلَمْ تَكُونُوا مُسْلِمِينَ؟ قَالُوا: بَلَىٰ، قَالُوا: فَمَا أَغْنَىٰ عَنْكُمْ إِسْلامُكُمْ إِذْ أَنْتُمْ مَعَنَا فِي النَّارِ؟ فَيَقُولُونَ: كَانَتْ لَنَا ذُنُوبٌ فَأُخِذْنَا بِهَا، فَيَسْمَعُ اللّٰهُ ـ عَزَّوَجلَّ ـ مَا قَالُوا، فَيَأْمُرُ بِإِخْرَاجِ مَنْ كَانَ فِي النَّارِ مِنْ أَهْلِ الْقِبْلَةِ فَيُخْرَجُونَ فَإِذَا رَأَىٰ الْكُفَّارُ ذٰلِكَ قَالُوا: يَا لَيْتَنَا كُنَّا مُسْلِمِينَ، فَنُخْرَجُ كَمَا أُخْرِجُوا» ثُمَّ قَرَأَ رَسُولُ اللّٰهِﷺ: «﴿رُبَمَا يَوَدُّ الَّذِينَ كَفَرُوا لَوْ كَانُوا مُسْلِمِينَ﴾»[3].

واتە: «کاتێ کە جەهەننەمییەکان لەنێو دۆزەخدا کۆ دەبنەوە و لەگەڵیاندا هەندێکی زۆریش لە ئەهلی قیبلە هەیە، کافرەکان بە موسوڵمانەکان ئەڵێن: مەگەر ئێوە موسوڵمان نەبوون؟ ئەڵێن: بەڵێ. ئەڵێن: ئەدی ئیسلامەکەتان چ کەڵکێکی بۆتان بووە ئێوە کە ئێستا لەگەڵ ئێمە لە ناو ئاگردان؟! ئەڵێن: ئێمە گونەهبار بووین و سزای ئەوەمان لێ دەستێنن. خودای مەزن ئەم گفتوگۆیە ئەبیسێ و فەرمان دەدات هەرکەس لە ئەهلی قیبلە لە نێو دۆزەخدایە، بیهێننە دەرەوە. خێرا دەریان ئەهێنن. کاتێ کافرەکان ئەمە دەبینن، ئەڵێن: بریا ئێمەش موسڵمان بوایەین! تا وەك ئەوان دەریان ئەهێنایین. پاشان پێغەمبەرﷺ ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿رُبَمَا يَوَدُّ الَّذِينَ كَفَرُوا لَوْ كَانُوا مُسْلِمِينَ﴾ واتە: «زۆر جار ئەوانەی کە کافر بوون خۆزگە دەخوازن کە موسڵمان بوایەن».

---

١. طبرانی فی الأوسط: ٧٠٣٢ بلفظه.

٢. ترمذی: ٢٥١٩، حاکم فی المستدرك: ٢١٧ ـ ٢١٦، بیهقی فی شعب الإیمان: ٧٢٦.

٣. حاکم فی المستدرك: ٢٩٠٨، جامع الکبیر للسیوطی: ١١١٦، حرف الهمزة، بیهقی فی البعث والنّشور: ٧٥، ابن‌ابی‌عاصم فی السنّة: ٧٠٠.

پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: «لَلّٰهُ أَرْحَمُ بِعَبْدِهِ الْمُؤْمِنِ مِنَ الْوَالِدَةِ الشَّفِيقَةِ بِوَلَدِهَا»[1] واتە: «خوداوەند بۆ بەندەکەی لە دایکێ دڵسۆز بۆ منداڵەکەی، میهرەبانترە».

جابری کوڕی عەبدوڵڵاهرضي الله عنه فەرموویەتی: «لە ڕۆژی قیامەتدا هەرکەس کردەوە چاکەکانی لە کردەوە خراپەکانی زیادتر بێ، ئەوە بێ‌گومان بە بێ‌لێپرسینەوە دەڕواتە بەهەشت، هەرکەسیش لەو ڕۆژەدا کردەوەی چاك و خراپی هاوتای یەك بووەستن، ئەوە حیساب و لێپرسینەوەی سووکی لێ دەکرێ، پاشان دەینێرنە بەهەشت. شەفاعەتی پێغەمبەریش تایبەتی ئەو کەسانەیە کە بەدبەخت بوون و پشتیان بە گوناح و تاوان قورس بووە»[2].

دەگێڕنەوە کە خودای گەورە بە حەزرەتی مووساعليه السلام فەرمووی: قاروون بۆ ڕزگاری خۆی پەنای بەتۆ هانی، تۆش یارمەتیت نەدا، ئەدی سوێند بە عەزەمەت و گەورەیی خۆم ئەگەر پەنای بۆ من بهانیایە پەنام دەدا و دەمبەخشی[3].

سەنابیحی دەفەرمێ: چووم بۆلای عیبادی کوڕی سامیترضي الله عنه، لە سەرە مەرگدا بوو، دەستم کرد بە گریان: فەرمووی: بۆچ دەگری، وەڵڵاهی هەر حەدیسێکم لە دەم پێغەمبەرﷺ بیستبێ کە بۆ ئێوە خێرێکی تێدا بووبێت بۆتانم گێڕاوەتەوە، جگە یەك حەدیس نەبێ، ئەوڕۆش ئەوەتان بۆ دەگێڕمەوە و خۆشم بەری کەوتووم. بیستم لە پێغەمبەرﷺ دەیفەرموو:

«مَن شَهِدَ أَنْ لا إِلَهَ إِلَّا اللّٰهُ وَ أَنَّ مُحَمَّداً رَسُولُ اللّٰهِ، حَرَّمَ اللّٰهُ تَعَالَىٰ عَلَيْهِ النَّارَ»[4] واتە: «هەرکەس شایەتی بەوە بدات کە هیچ خودایە جگە لە ئەڵڵاه نییە و موحەممەد نێردراوی ئەوە، ئەوە خودای گەورە ئاوری دۆزەخی لەسەر حەرام دەکات».

١. بخاری: ٥٥٤٠، مسلم: ٤٩٤٧ بلفظ: بعد أن ذکر امرأة من السّبی إذا وجدت صبيًا فی السّبی ... «...لَلّٰهُ أَرْحَمُ بِعِبَادِهِ مِنْ هٰذِهِ الْمَرْأَةِ بِوَلَدِهَا» طبرانی فی الأوسط: ٣١٢٩، بزّار فی مسنده: ٢٨٧، بیهقی فی شعب الإیمان: ٦٧٢٩ ـ ١٠٥٠٦. و فی روایة: «لَلّٰهُ أَرْحَمُ بِعِبَادِهِ مِنْ أُمِّ الْأَفْرَاخِ بِفِرَاخِهَا ...» ابوداود: ٢٦٨٥.

٢. «مَنْ زَادَتْ حَسَنَاتُهُ عَلَىٰ سَيِّئَاتِهِ فَذَاكَ الَّذِي يَدْخُلُ الْجَنَّةَ بِغَيْرِ حِسَابٍ، وَ مَنِ اسْتَوَتْ حَسَنَاتُهُ وَ سَيِّئَاتُهُ فَذَاكَ الَّذِي يُحَاسَبُ حِسَاباً يَسِيراً ثُمَّ يَدْخُلُ الْجَنَّةَ، وَ إِنَّمَا شَفَاعَةُ رَسُولِ اللّٰهِﷺ لِمَنْ أَوْبَقَ نَفْسَهُ وَ أَثْقَلَ ظَهْرَهُ بِكَ مِنْ أَصْحَابِ الْأَعْرَافِ» کنز العمال للهندی: ٣٩٧٥١، فتح الباری لابن‌حجر: ٦٠٥٦، فتح القدیر للمناوی: ٧٥٥٥، کشف الخفاء للعجلونی: ١٥٥٧، المقاصد الحسنة للسّخاوی: ١٣٦/١. و ابوحنیفه فی مسنده: ٢٧٥ بنحوه بلفظ أخری.

٣. «...اِسْتَغَاثَ بِكَ قَارُونُ فَلَمْ تَغِثْهُ وَ عِزَّتِي وَ جَلَالِي لَوِ اسْتَغَاثَ بِي لَأَغَثْتُهُ» و فی روایة: «اِسْتَغَاثَ بِكَ سَبْعِينَ مَرَّةً...» تفسیر طبری فی آیة ٨٠ و ٨١ و ٨٢ من سورة قصص، تفسیر بغوی فی سورة المذکور، تفسیر القرآن العظیم للطّبرانی علی آیة ٨١ من سورة القصص.

٤. مسلم: ٤٢، ترمذی: ٢٥٦٢، احمد: ٢١٦٥٣.

لە عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاسەوە رضي الله عنهما ڕیوایەت کراوە کە: پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی:

«إِنَّ اللهَ يَسْتَخْلِصُ رَجُلاً مِنْ أُمَّتِي عَلَىٰ رُؤُوسِ الْخَلائِقِ يَوْمَ الْقِيٰامَةِ فَيَنْشُرُ عَلَيْهِ تِسْعَةً وَ تِسْعِينَ سِجِلّاً، كُلُّ سِجِلٍّ مِثْلُ مَدِّ الْبَصَرِ، ثُمَّ يَقُولُ اللهُ: أَتُنْكِرُ مِنْ هٰذٰا شَيْئاً؟ أَظَلَمَتْكَ كَتَبَتِي الْحٰافِظُونَ؟ فَيَقُولُ: لا، فَيَقُولُ: أَفَلَكَ عُذْرٌ؟ فَيَقُولُ: لا يٰا رَبِّ، فَيَقُولُ: بَلَىٰ، إِنَّ لَكَ عِنْدَنٰا حَسَنَةً فَإِنَّهُ لا ظُلْمَ عَلَيْكَ الْيَوْمَ، فَيُخْرَجُ بِطٰاقَةٌ فِيهَا: "أَشْهَدُ أَنْ لا إِلٰهَ إِلَّا اللهُ وَ أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَ رَسُولُهُ"، فَيَقُولُ: يٰا رَبِّ مٰا هٰذِهِ الْبِطٰاقَةُ مَعَ هٰذِهِ السِّجِلّٰاتُ؟! فَيَقُولُ: إِنَّكَ لا تُظْلَمُ، قٰالَ: فَتُوضَعُ السِّجِلّٰاتُ فِي كَفَّةٍ وَ الْبِطٰاقَةُ فِي كَفَّةٍ، قٰالَ: فَطٰاشَتِ السِّجِلّٰاتُ وَ ثَقُلَتِ الْبِطٰاقَةُ فَلا يَثْقُلُ مَعَ اسْمِ اللهِ شَيْءٌ»[1].

واتە: «لە ڕۆژی قیامەتدا خوداوەند پیاوێك لە ئوممەتم، لەبەر چاوی سەرجەمی مەخلوقاتەوە جیا دەکاتەوە و نەوەدونۆدانە قەباڵەی بۆ دەکاتەوە، هەر قەباڵەیێکیان تا چاو هەتەر دەکات درێژە، پاشان خودا دەفەرمێ: ئەرێ شتێ هەیە کە بۆت نامۆ بێت؟ ئەرێ کاتبەکانی من غەدریان لێ کردووی؟ ئەڵێ: نەخێر خوایە! خودا ئەفەرمێ ئەدی بیانوێکت هەیە؟ ئەڵێت: نەخێر خوایە! ئەفەرمێ: بەڵێ، هەتە. تۆ چاکەیێکت هەیە لەلای ئێمەوە، ئەتۆ ئەمڕۆ غەدرت لێ ناکرێ. نامیلکەیێکی بۆ دەردەهێنێ کە تێدا نووسراوە: "أَشْهَدُ أَنْ لا إِلٰهَ إِلَّا اللهُ وَ أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَ رَسُولُهُ". ئەڵێ: خودایە! ئەم نامیلکەیە لەچاو ئەم قەباڵانەمدا چییە؟! ئەفەرمێ: تۆ غەدرت لێ ناکرێ. قەباڵەکان هەر هەموو دەخرێنە نێو تایێك لە تەرازووەکە و نامیلکەکەش لەو تاکەی تریدا. کەچی خێرا تای قەواڵەکان سووك دەنوێنێ و تای نامیلکەکە قورس ئەبێ. چونکە لەبەرانبەر ناوی خودادا هیچ شتێ قورس نییە».

**سوپاس و ستایش بۆ خودای تاقانە و درووود بۆ سەر پێغەمبەرەکەی صلى الله عليه وسلم.**

---

١. احمد: ٦٦٩٩، حاکم فی المستدرك: ٩، ترمذی: ٢٥٦٣، ابن‌ماجە: ٤٢٩٠.

**لێرەدا ئەم کتێبە تەواو بوو، سپاس بۆ خودای مەزن**

[سپاس بۆ خودا لە ڕۆژی چوارشەممەی چواری خاکەلێوەی ١٣٩٠ی کۆچی هەتاوی لە وەرگێڕانی ئەم کتێبە بوومەوە، خودا بیکات بە مایەی خێر بۆ خۆم و بنەماڵەکەم و سەرجەمی ئەو کەسانە کە دەیخوێننەوە].

**سەعید کەرەمی**

**سنە ـ سارۆقامیش**

## ناوەرۆك

